# شێخ مەحمودی قارەمان

و

## دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان

بەرگی یەکەم

م. ر. هاوار

م. ر. هاوار

# شێخ مەحمودی قارەمان
و
# دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان

بەرگی یەکەم

لەندەن ۱۹۹.

نامەوێ ژینی ئەسارەت، بەسمە عومری گومەڕەهی
نایکەمە سەرخۆم بەدەستی موددەعی تاجی شەهی
قەت بە ئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرماندەهی

شێخ مەحمود

# پێشەکی

نووسینێکی تێرو تەسەل دەربارەی شێخ مەحمودی نەمرو شۆڕشەکانی ومێژووی سلێمانی‌و باسی ناوچەی خواری کوردستان باسێکی ئێجگار دورو درێژەو گەلێک چمک‌و لکی لێ ئەبێتەوە ئەگەر بویستری بە تەواوی باسی هەموو هەلوێست‌و ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەوسەردەمە بکرێ کەپڕن لە کوێرەوەری‌و دەردی‌سەری و خەم‌و خەفەت و پڕن لەبەسەرهات‌و ڕووداوی پیکاهەلچووی ئالۆزکاو و پڕن لەگرێ کوێرەو باسی نەخشەوپیلانی نەهێنی‌و ئاشکرای ئیمپریالیزم و دەزگاکانی ولاتانی سەرمایەداری چاوچنوک‌و تێرنەخۆر کە ماوەیەکی دووروودرێژ بو چاویان بڕیبوە خێروبێری ناو ولاتی کوردەواری‌و سالەهابو نەخشەی دورو درێژیان کێشابوو بۆ ئەوەی نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان لەناو چوارچیوەی سنوری دەسەلاتی خویان بەلاوازی و پچرپچری بهێلنەوەو ڕیگەی ئەوەی لێ‌بگرن کە هیچ بەشێکی کوردستان لەگەڵ بەشێکی تریدا پێکەوە بلکێ و یەک بگرێ‌و هەمیشە هەولێ ئەوەیان داوە زۆربەی کورد چەوسێنراوو ڕەتینراوو بەشخوراوبێ‌وخەریکی‌کێشەو بێنەو بەرەی ناوخۆی بێ و دڵ کرمێ ببێ بەرامبەر بە میللەتانی دەوروپشتی‌و هەمیشەتۆوی قین و رقەبەرایەتی‌و ناکۆکی‌و گومان لەیەکترکردن لەناو دلی هەموانابچێنن بۆ ئەوەی گەلانی ئەو ولاتانەو گەلی کورد ڕۆژێک لەرۆژان ماوەی ئەوەیان نەبێت بەکۆمەڵو بە هاوکاری هەموان بگەنەراستەرێگەی ئازادبون و هەولی ئەوەنەدەن نارێکیەکانیان بخەنەلاوەو بەهەموان ڕووبەڕووی هێزو دەسەلاتی ولاتە سەرمایەدارەکان‌و دارو دەستەبەکرێگیراوەکانیان ببنەوەو توانای ئەوەیان نەبێت بەرەنگاری چاوچنوکی‌و چەوساندنەوەو دادوشین‌و فێڵ و تەلەکەبازیەکانیان ببنەوەو بیر لەوە نەکەنەوە هەموویان وەکو برا، هەرلایە بە جیا لەناو چوارچیوەو سنوری ولات‌و خاک‌و زەوی‌وزاری خۆی‌دا وەکو پێشینان وتەنی : (براییمان برایی‌و کیسەمان جیایی) بەبێ ژانەسەر و بێ گزی و فزی و چاو برینە یەکتری و مافی یەکتر خواردن و بێ پێچ و پەنا و پاشگەز بوونەوە و هێنانەوەی برو

بیانوی خۆڕایی گوزەران بکەن و هەرلایەیان بە شادی و بە ئاسایش لەناو ولاتی خوی‌دا بژی.

دەربارەی کوردستان‌و میژوی نەتەوەی کورد و شورشەکانی‌و بزوتنەوەی هیزی نەتەوایەتی گەلی کورد هەتا ئیستا زوز باس نوسراوە و هەر نوسەر و میژوونوسیک بەپی‌ی بوچوون‌و بیرو باوەڕ و لیکدانەوەی چینایەتی‌و بە پی‌ی شارەزایی‌و لیهاتوویی‌و ئاگاداربونی خوی بو ئەو باسە چوە و لی‌ی دواوە. ئەو باسانە گشتی‌بووبن یاخود تایبەتی، کورت بووبن یان دریژ، بە تیکرایی دەربارەی میژووی کورد نوسرابن یان دەربارەی قوناغیک لە قوناغەکانی یان دەربارەی شورشیک لە شورشەکانی یا دەربارەی لیکولینەوە و چونە بنج‌و بناوانی ڕوداویک لەروداوەکان، ئەمانە زوریان تومارکراون و ئەوەی دەرفەت‌و ماوەی چاپکردن‌و بلاوکردنەوەی هەبووبی چاپکراوەو بلاوکراوەتەوە و دوورنیە زوز نوسراوو باسی گرنگ‌و بە نرخی تر هەبی کە تائیستا نوسەرەکەی نەی‌توانیوە چاپیان بکاو بلاویان بکاتەوە بەلام هەروژیک دی چاپ بکری‌و بلاوبکریتەوە.

ئەگەر بەووردی سەرنجی ئەو باس و نوسراوانە بدەین بومان دەردەکەوی نووسەرەکانیان دووجورن... جوریکیان بیگانەن (بەدوست‌ونەیارەوە)، جوری دوهەمیش نوسەر و میژووناسی خومالین.

ئەو بیگانانەی دەربارەی کوردو کوردستان‌و شورشەکانی کووردو بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردیان نوسیوە هەریەکەیان بو مەبەستیک و بە نیازیک لە کاتیکی تایبەتیدا باسەکەیان نوسیوە و بلاوکردوتەوە، ئەونوسەرە بیگانانەش دوجورن جوریکیان لەوانەن لەنوسین و بوچونەکانیانا بە ئاشکرا دوژمنایەتی خویان و ژەهراوی ناودلیان وەک ڕەشاوی مەرەکەبی پینوسەکانیان داچوڕاندوەو هەمو هەولو تەقەلایەکیان لەو نوسینانەدا بو ئەوەبوە کە ناوی کورد بزرینن و لەنرخ‌وقەوارەی میژوی سالەهای سال‌و لەخەباتی تیکوشانی بی‌ووچانی کەم بکەنەوەو بو سەرگرتنی ئەوهەولو تەقەلایەیان پەنایان بردوتەبەر هەزاران دروو دەلەسەو دوهەزار ڕاوەڕیوی و بیانویان هیناوەتەوە بوئەوەی کورد لای بیگانە بشکینن و بە میللەتیکی دواکەوتوی پیاوکوژ و چەتەو ڕی‌گرو دژ بەیاسای

بەنەقەلەم و بلاویان کردوتەوە کەقەت کورد هەولی نەداوە لەرێگای شارستانێتیو پێشکەوتنو خوێندەواری و رۆشنبیری‌یەوە بگات بەئاواتی خۆیو چارەنوسی خۆی. هەندێکیان بەوەشەوە نەوەستاون، بەلکو بەئارەزووی خۆیان درۆو دەلەسەی بێ سەروپێیان دژی کوردو مێژوی کورد و زمانی کوردی هەلبەستوەو بەهاندانی دەسەلاتدارانی رەگەزپەرستو دەزگاکانی داگیرکەرانی کوردستان دەستیان کردوە بەنوسینو بلاوکردنەوەی درۆو دەلەسە لەناو رۆژنامەو گۆڤارو کتێبەکانداو هەریەکەیان لەسەر ئاوازێک خوێندویانەو ئەمیان وتویەتی کورد لەبنەچەدا فارسەو هەندێکی تر وتویانەتورکەو تاقمێکی تر فەرمویانەعەرەبەو ئەم بەزمە هەر هی دوێنێو ئیمرۆ نیە،بەلکو لەکۆنەوە ئەو تەقەلایە دراوە، بۆ نموونە شاعیرێکی عەرەبی کۆن خوی بەمیراتگری کورد دا ئەنێ بەرامبەر بەپروپاگەندەی فارسەکان کە ووتوبیان کورد فارسە و ئەو شاعیرە عەرەبە بەوە رازی نەبوە و پیێ وتوون:

لعمرک ماالاکراد أبناء فارس ولکنهم أبناء کرد بن عامر

بەلام بۆچوونەکانی ئەوانە ئەوەندە نەزانیارانەو بێ سەروپێ‌یە کە هەندێکیان زۆرجار لەنوسینەکانیانا تێ‌کەوتونو بەلگەی وایان داوە بەدەستەوە دەربارەی رەسەنێی کورد کەسالەهای سالە هەبوەو هەرەسو لافاوی زەمانە تا ئێستە نەی توانیوە لەناوی ببات. لەونوسەرە بێگانانە هی‌وایان بوە مەبەست لەتۆمارکردنو نوسینەکانیان دەربارەی کوردو کوردستان ئەوەبوە رێگا بۆ پسپۆر و سیاسەتمەداران و کاربەدەستانی خۆیان خۆش بکەن هەتا لەکاتی خۆیا ئەو راپۆرت و باس و نوسراوە ئامادە کراوانە ببن بە رێ نیشاندەرو ببن بە کەرەسەیەکی پوختی ئامادەکراوی بەسودو بەکەلک بۆ رێ‌نمایی‌و شارەزابونو ئاگاداربون لەهەنگاونانی رۆژانەدا بۆ ئەو نوێنەرو کاربەدەستانەیان کە ئەچنە کوردستانو لەژێر تیشکی ئەو زانیاریانەی کەپوختو ئامادەکراون نەخشەی دورودرێژ دەربارەی کوردو کوردستان بکێشنو بتوانن کوردستان بکەن بە کێلگەی تاقی کردنەوەو بیکەن بەمەزرای چاندنی ئەو تۆوانەی کەئەیانەوی

زۆترین دەغلٌوداتی مەبەستی خۆیانی تیادا سەوزوشین بکەن و بیکەن بەخەرمانێکی شەنکراوی پوختەی مفتو هەموو بەرو بوومی ولأت بەتالانی و هەرزان بەکێش بکەن بۆ ولاتی خۆیانو سەرمایەکانیان بەوە پترو کە لەکەتر بکەن.

ئەو جۆرە نوسەرانەی کەدامو دەزگاکانی ئیمپریامیزمو سەرمایەداران بۆ ئەم مەبەستەگوشیان کردون هەروەکو توولەو تانجیی ڕاوچی چەشیان کردون و هەریەکەیان ڕێگەو شوێنێکی تایبەتیان بو دەس نیشان کردونو ئەوانیش جلەویان بۆ ئارەزوی خۆیانو ئاغاکانیان شلکردوەو هەولێکی زۆریان داوە بۆئەوەی بتوانن لەناو جەرگەی کۆمەلگاکانی کوردەواریدا لە کەموکوریەکانی نەتەوەی کورد شارەزا بنو لەهەموکورتیو لاسەنگیو باری لاری ژیانی کۆمەلایەتیو ئابوریو نەخوێندەواریو کوتەپەرستیو خێلایەتیو گۆشەگیری کورد ئاگادار بنو بۆ ئەو مەبەستەبەناوهەمو کەلێنو قوژبنودرزو دەلاقەی ولاتە دواکەوتوەکەمانا هاتوچۆیان کردوەو بەتانوپۆو ڕایەلی تایبەتی خۆیان نەخشەیەکیان چنیوەو هەموشتێک دەست نیشانکراوەکە چۆنو کەیولەکوێوە دەستبکەن بەبەجیٌهێنانی ئەونەخشەو پیلانانەو بۆ سەرگرتنی ئەومەبەستانەیهەلپەیان بۆ کردوە. هەندێ لەنوسینی ئەوجۆرە کەسانەبریتیە لەبیرەوەرییاداشتی رۆژانە، بەتایبەتی لەکاتی ئەوگەشتە نهێنیو ئاشکرایانەی کە نێرراوانی ولاتە سەرمایەدار و ئیمپریالزمەکان بەنیازی ئاگاداربون و شارەزابونو کۆکردنەوەی هەوالٌ وسەرنجدان لە باری کۆمەلایەتیو ئابوری و ئایینیو جوگرافیەوە ئەنێرران بۆکوردستان وەکو ئەو نێرراوا نەی کە شەریکەی هندیئەفریقی ماوەیەک بور لە هیندستانەوە ئەنێرران کەگەشتەکەی (ریچ) نمونەیەکی ئاشکرای ئەو تەقەلایەیە و یاداشت و سەرنجەکانی ئەو میسونیرانەی لە ژێر پەردەی ئایندائەنێرران بۆکوردستان جۆرێکی تر بوە لەو تەقەلایانە. نوسەرانی ئەو یاداشت و ڕاپۆرتانە هەندێ ڕووداوو بەسەرهاتیان لە ناوچەیەکی کوردستانا بەچاوی خۆیان بینیوە و هەندێکیان لەم و لەوەوە بیستوەو دەماودەم پێیان گەیشتوەو کۆیان کردوتەوەو تۆماریان کردوە کەهیچ دوورنیەزۆریان درۆو دەلەسەو دەمهەلبەست بوبن یا دەسکاری کرابنو لێیان لابرابێ یاشتیان

خرابێتەسەر .

ئەوجۆرە تۆمارکراوانە بون بەکەرەسەو سەرچاوەبۆ نوسەرانی تری بێگانەو بگرە هەندێ جار بووشن بەسەرچاوە بۆ نووسەرانی خۆمان، کەلەراستیدا باوو باپیرانمان لەم‌روەوە زۆرکەم‌تەرخەم بون‌و هەولیان نەداوە هیچ نەبێ هەندێ لەروداوەکانی سەردەمی خۆیان تۆماربکەن بۆ بەدرۆخستنەوەو بەرپەرچدانەوەی ئەو درۆو دەلەسانەی کە لەراپۆرت‌و نوسینی بێگانەکانا بلاوکراونەتەوە. بەشێکی زۆری ئەو یاداشت‌و راپۆرت و نوسینانەی کە بێگانەکان تۆماریان کردوە بریتین لەروداوو بەسەرهاتێکی تایبەتی‌و لەکات‌و شوێنێکی تایبەتیدا کەنابێ‌و ناگونجێ ئەو جۆرو روداو و بەسەرهاتانە هەمیشە بکرێن بەکێش و پێوانەیەکی گشتی‌ی هەمیشەیی بو لێکدانەوەو هەلسەنگاندنی هەمو کاروبارو روداوێک لەهەمو کاتێک‌و لەهەمو شوێنێکی کوردستاندا.

مینۆرسکی[٥٢] دەربارەی یاداشت‌و نوسینی هەندێک لەوگەرۆکانەی کەهاتوونەکوردستان ئەلێ:

«هەندێک لەو گەرۆکانە کە بە شێوەیەکی گشتی سەرنجی خۆیان نوسیوە لە کوردستانا، پشت بە زۆریان نابەسترێ چونکە لە شارەزاییەکی تەواوەوە هەلنە گوزراوە و چەند نمونەیەکیان نەهێناوەتە دەربارەی بۆچون و سەرنجەکانیان».

بەشی دوهەمی‌نوسەرە بێگانەکان بریتین لەو شارەزا و مێژوناس و پسپۆرە بێ‌لایەن و زانایانەی کە تارادایەک رێزیان لە خۆیان و لە نوسینەکانیان گرتوەو هەولیان‌داوە بە شێوەیەکی راست‌و زانیارانەو بێ‌لایەنانەو دوور لەقین، روداوەکان و بەسەرهاتەکان‌و سەرنجی خۆیان دەربارەیان تۆمار بکەن و هەولی ئەوەیان نەداوە راستیەکان ئاوەژوو بکەن یا بۆ مەبەستێکی تایبەتی دەسکاریان بکەن‌و بەبست لە چوتیەتی روداوەکان‌و تۆمارکردنیان بەشێوەیەکی راست و دروست‌لایان نەداوە.

لەجۆری ئەم نوسەرانە ئەتوانرێ دەس بۆ هەندێکیان درێژ بکرێ وەکو مینۆرسکی‌و باسیل نیکتین و لازاریف و پ. لرخ و یوسف أبگار و ڤیچ و ئوربیللی و پروفسۆر حەسرەتیان و لاهوتی‌و پروڤسورخالفین و هەندێکی تر کەئیمرۆ نوسینەکانیان وەکو سەرچاوەیەکی باوەر پێکراو پەنای ئەبرێتەبەر و

جێی متمانەن و ئێمەش بەهۆی ئەوانەی شارەزای نوسینی ئەو شارەزایانەن وەکو دکتۆر کمال مەزهەر و دکتۆر عزیز شمزینی‌و هەندێکی تر باسی نوسینەکانیان ئەخوێنینەوە.

ماموستا رەفیق‌حلمی لە پەرتوکێکدا بەعەرەبی بەناوی (مقالات)ە لەوەرامی دکتۆر شوکری صگباندا دێتەسەر باسی (باسیل‌نیکتین) وئەلێ:«٢»

«یەکێکی وەکو باسیل‌نیکتین» بەفرنسزی بۆ یەکێک لە هاورێکانی لە ئوروپادا نامەیەکی ناردبوو ئەلێ:

«ئای چەند خیلافی حقیقت بو ئەوەی کەوا بلاوکرابوەوە کە کورد دڕندەو چەتەن.....لەراستیدا ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە کورد نەتەوەیەکی زۆر لەسەرخۆو سەربەخۆن‌و پاکترین بەشێکن لەئاریەکان»

قدری جەمیل «١٩» لە پاداشتەکانیا گەلێک نمونەی تری لەو جۆرەی هێناوەتەو، لەشوێنی خۆیانا باسیان ئەکەین.

نووسەران‌و مێژوونوس‌و مێژووناسانی خۆشمان ئەوەی راستی‌بێ هیچیان لەوانە نەبون کەبە نیازێکی پیس‌و لەرێگای کرێ‌گرتەییەوە باسێکی ئەوتۆ دژی گەل‌ونیشتمانەکەی خۆی بنوسێت‌مەگەر تاک‌و تەرایەکی وەکو عزیزالحاج قولی‌خان لەکتێبەکەیدا«٤٠» کەتایبەتی بۆ زراندنی ناوی شێخ‌مەحمودو سووک‌کردنی شۆرشەکەی بەرامبەر بەئینگلیزی داگیرکەر رابیسپێراوەو ئەو کتێبەی نوسیوە یا یەکێکی وەک مەحەمەد شوکری صگبان کە لەکاتی خۆیدا کوردایەتیەکی گەرمی کردوەو لەدواییدا لەترسی تورکەکان رای‌کردوتە عیراق و بۆ رازی کردنی تورکەکان‌و بۆ ئەوەی لی‌ی خۆش‌بن لەکوردایەتی لایداوەو چەند نوسینێکی دژی کورد نوسیوە کە ماموستا رەفیق‌حلمی بە نامیلکەیەک وەرامی داوەتەوە.«٢٠»

رەفیق‌حلمی لەوەرامی شوکری صگباندا ئەلێ: «شوکری دوشوکری بوە...یەکەم شوکریی‌کوردی تێکۆشەر بوکورد دوهەم شوکریی پاشگەز بووی لەرێگا لاداو.»

تۆفیق‌وەهبی لەسەرەتای هەشتاکانا لە لەندەن باسی ئەو نوسینانەی شوکری

صگبانی بۆ کردم و وتی کە لە بەغداد بوین چەند جارێک منیش لەگەلیا کەوتمە وتو ویژ بۆ پوچ کردنەوەی بۆ چوونەکانی بەڵام ئەیویست بە هەرنرخێک بێ تورکەکان رێگەی بدەن بگەرێتەوە بۆ تورکیا....شوکری صگبان لە نوسینەکانیا تەواو روخاوبو بەرامبەر بەمیللەتی کوردو داوای کردوەکە کورد خۆی لەناو کۆمەلگای تورکدا بتوێنیتەوە.

سەیر ئەوەیە وەکو مامۆستا رەفیقحلمی وەرامی داوەتەوە ئەو صەگبانە هەتا دوێنی ئەیووت «ئیمەی کورد واز لە زمانی خۆمان ناهێنین بۆ زمانێکی بێگانەو رێگەی ئەوە نادەین هیچ کەسێک یاری و گالتەی پێبکاو دەسکاری بکا.....

شوکری صگبان لەسالی ۱۹۲۳ دا دەربارەی تەقەلاکانی تورک بۆ تواندنەوەی کورد نوسیبوی: -

«بەر لەچوارسەد سالْ تەقەلایەکی زۆردرا بۆ ئەوەی کورد لەناو تورکدا بتوێنریتەوە بەزەبری شیر، بەلام ئەوتەقەلایەسەری نەگرت....ئایا تورکی ئیستەی لاواز، چۆن ئەتوانێت کورد بتوێننتەوە؟ خۆ ئەگەر تەقەلای وا سەری بگرتایە، ئەی بۆچی ئەلمانەکان نەیان توانی پۆلۆنی‌یەکانی ناوچەی(پوزەن) لەناو ئەلمانەکاندا بتوێننەوە لەگەل ئەوەش‌دا کەهەمو قوتابیانی قوتابخانەکان لەوناوچەدا بەئەلمانی ئەیانخوێندوهەرکەسیش بە پۆلۆنی قسەی بکردایەسزا ئەدرا....ئەلمانیا بەو هەمو دەسەلاتەیەوە نەی توانی ئەو ناوچەیە بکا بەئەلمانی، ئەی چۆن تورک ئەتوانێ ئەو تەقەلایەی بەرامبەر بەکورد سەربگرێ.

رەفیق حلمی ئەلێ: ئەگەر موستەفا کەمال سەرنەکەوتایە قەت بروا ناکەم شوکری صگبان بیروباوەری خۆی بەو جۆرە بەرامبەر بەمیلەتەکەی خۆی بگۆرپایە. زۆر بێگانە، هەریەکەیان بە جۆرێک هەولی‌داوە لە نرخی کورد کەم‌بکەنەوەو ناوی بزرێنن... لەسالی سیەکان بەدواوە لەعیراقدا (نادی مثنی)کەکۆمەلگای رەگەزپەرستەکانی عەرەب بو، لەویانەیەدا وەکو قوتابخانەیەکی رەگەزپەرستی،زۆری گۆشکردو پیێ گەیاندن کە هەمویان داخ‌لە دڵو ئاوس بون بەرامبەر بەکورد. أکرم زعێتر بە ئاشکرا لەو رۆژانەدا باسی کوردی وەکو کەمایەتیەک ئەکرد کە کۆسپێکە لە رێگەی یەکگرتنی عەرەب‌دا.

لەسالی شەستەکان بەدواوە ڕەگی ئەو قوتابخانەیە جارێکی ترو بەشێوەیەکی‌تر سەری هەلدایەوەو ئەوجارە هەندێکی وەک‌ومشیل عفلق‌و کلۆ.فیس مقصود مێشکی لاوانی عەرەبیان پرکرد لە ژەنگ‌و ژاری رەگەزپەرستی‌و دوژمنایەتی بەرامبەر بەنەتەوەی کورد ....

ڕێچکەی کاروانی مێژوو ئەرواو هەتاپێنوسێک مابێت کەئامادە بێت خوی بفرۆشیت ئەوبەزمە بەرامبەر بەکورد کۆتایی نایە..رشید الفیل...محمودالدره عبدالعزیز العقیلی وەگەلێکی تری بەکری‌گرتەو ڕەگەزپەرست ئامادەیی خۆیان پیشان‌داوە کە پێنوسەکانیان بۆ ئەو مەبەستەگلاوە تەرخان‌بکەن...بەلام لام‌وایە ئەوجۆرە نوسینانە لەناو سەرەتوێلکی کتیبخانەکان نەبێ جێیان نابیتەوە...

نوسەران‌و مێژوو نوسان‌و رۆشنبیرانی‌کورد، هەریەکەیان بەپێ‌ی‌بۆچون بیرو باوەری خۆی و رادەی شارەزایی‌و پلەی زانیاری‌و خوێندەواریی گەلێک کتێب و یاداشت و باسیان چاپ کردوەو بلاوکردوتەوە... هی‌وایان هەبوە دەسەلاتیان لەناوەرۆکی ئەوباسانەی کەبلاویان‌کردوتەوە زۆر زۆرتربوە، بەلام ماوە نەدان‌و رێگا لێ‌کرتنیان لەلایەن کاربەدەستانی دەزگاکانی داگیرکەرەوە هەمیشە ئەوجۆرە کەسانەیان دەست‌و دەم بەست‌کردوەو ماوەی ئەوەیان نەدراوەتێ کەبەو پەری سەربەستیەوە بەتێرو تەسەلی‌و لەرێبازێکی زانیارانەی بەدلی خۆیان باسەکەیان چاپ بکەن‌و بلاوی بکەنەوە.....زۆرجار مقەستی سەرپەرشتیکەری چاپەمەنی ئەو بەشانەی قرتاندوە کەکاربەدەستان میری بەدلیان نەبوە، بەوجۆرە نوسەری کورد زۆرجار بەناچاری بەو هەنگلەشەلەیە رازی بوەو وتویەتی بلاوکردنەوەی ئیمرۆ لەوەباشترە کەهیچ بلاونەکرێتەوەو ئەوەی لێیان قەدەغەکراوە هەلگیراوە بۆکاتی خۆی.

دەربارەی شێخ مەحمودی قارەمان زۆر لەنوسەران‌و مێژوونوسی بیگانەو خۆمانە شتیان‌نوسیوەو بلاوکردوتەوە (یارەنگە زۆرشت نوسرابی‌و هێشتا ماوەی چاپ‌کردن‌و بلاوکردنەوەیان نەبووبێت)..بەلام هەتا ئێستە باسێکی تێرو تەسەل‌و سەرومری سەربەخۆ تایبەتی دەربارەی شێخ‌مەحمود و شۆرشەکانی جگە لەوانەی مامۆستایان رەفیق حلمی‌و ئەحمەد خواجا و ئەحمەد تەقی نەنوسراوە، ئەگەر نوسرابێت هێشتا ماوەی چاپ‌کردن‌و بلاوکردنەوەیان نەدراوە.

بیرەوەریو یاداشتەکان، بەتایبەتی یاداشتەکانی مامۆستا رەفیق‌حلمی کەبە ناوی شێخ‌مەحمودو شۆرشەکانیەوە بە شەش بەرگ بلاوی کردوتەوە، هەروەها یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیو ئەحمەد خواجە(چیم‌دی)و ئەوەی زیوەرو یاداشتەچاپ نەکراوەکانی شێخ رەئوفی شێخ‌مەحمودو شێخ قادری برای شێخ مەحمودو هەندی باسی ناو گۆڤارو رۆژنامەکانی سەردەمی شێخ‌مەحمودو بەرهەمەمی نوسەرانو شاعیران کەبۆ رەخنەوستایشی حوکمداریەتەکەی شێخ‌مەحمود وتراوە وەکو ئەوەی جەمیل صائب(لەخەوما)و شعرەکانی حەمدی صاحبقران و شێخ مەحەمەدی خالصی تالەبانی و ئەحمەد موختاروشوکری فەزلیوپیرەمێرد ئەمانە هەمویان کەرەسەیەکی ئێجگار بەنرخو سامانێکی گرنگن بۆ شارەزابوونو ئاگاداربون لە رووداوە و هەڵوێستی ئەو سەردەمەی شێخ مەحمود کە نووسەر و شاعیر خۆی لە کۆری بەسەرهات و رووداوەکانا بوەو زۆرشتی بەچاوی خۆی دیوەو بەشداری تیاداکردوە، جگە لەبیرەوەری هەندیکەسی تری وەک شێخ باباعەلی شێخ مەحمود و کاک عەلی کەمال کەهەردوکیان لەوەرامی ئەو پرسیارانەی لێم‌کردون سودێکی ئێجگار زۆرم لێوەرگرتون..هەندی بیرەوەری خۆشم‌لەیاد ماوە کە لە سالانی٩٥٤-٩٥٦ بەر لەکۆچی دوایی شێخی مەزن جاروبار لەگەل شێخ لەتیف‌دا ئەچومە داریکەلی بێجگە لەهەندێ گفت‌وگو لەگەل مامۆستا توفیق وەهبی‌لەلەندەن، ئەمانە هەموی کەرەسەیەکی بەنرخبون بۆ باسەکەم. بێجگە لەوانە نوسین و کتێبەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر و دوکیومێنتەکانی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کەئیمرۆ ماوەی بلاوکردنەوە و خوێندنەوەیان دراوە لەگەل ئەطروحەی دوکتۆراکەی دوکتۆر عەزیز شەمزینی و کتێبەکانی دوکتۆ جەمال نەبەز بەتایبەتی (کوردستان وشۆرشەکەی)کە لە کاتی خۆی‌دا بە ئەلمانی نوسیویەتی و کوردۆ لە سالی ١٩٨٥ دا کردویەتی بەکوردیو چاپی کردوەو بلاوی کردوتەوەلەگەل کتێبەکەی عەلاءالدین السجادی(شۆرشەکانی کورد )وکتێبەکەی مامۆستا جەلال تالەبانی(کردستان‌والحرکه التحرریه‌الکردیه)وکتێبەکەی دوکتۆر عبدالرحمنی قاسملو و نوسینەکانی تر کە لەلیستەی سەرچاوەکانی ئەم باسەدا لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا ناوم هێناون سودم لێ وەرگرتون جگەلەو

گۆڤارو رۆژنامەو کتێبانەی تر کە برای بەڕێزو دلسۆزم مامۆستا مەحەممەدی مەلاکەریم پەیتاپەیتا بۆی ناردوم و دریغی نەکردوە بەرامبەر هیچ داخوازی یەکم.

بەلگەنەهێنەکان (دوکیومێنت)ی ناو ئارشیفەکانی ولاتانی بەریتانیاو فەرەنسەو روسیاو ئەلمانیاو تورکیا پڕن لەو راپۆرت و یاداشتانەی کەئەونەخشەو فروفێل و گزی و دەس بڕینانەی کە بەرامبەر بەکورد کراوە هەموی تیادا باس کراوە هەندێکیان لەهەندێ لادا بەهۆی تێپەبونی چەند سالێک بەسەریا ماوەی خوێندنەوەیان دراوەو بەشێکیان هەربەقەدەغەکراوی ماونەتەوەو تەنها چەند کەسێکی تایبەتی سەربەو ولاتانە رێگەی خوێندنەوەیان هەیە وەکو ئەوانەی ناو ئارشیفی تورکیاو ئەوانەی سۆڤیەت و ئینگلیزەکانیش هەتا ئێستە رێگەی بلاوکردنەوەی ئەو راپۆرتانەیان نەداوە کە دوور نیە ئێستەش حکومەتەکەیان هەر لەسەر ئەو سیاسەتە بروات بەرێوە کە لەناو ئەودوکیومێنتانەدا دەس نیشان کراون و نایانەوێ بۆ کەس ئاشکرابێت.

ئەوەی سەرنج راکێشێت لەناو دوکیومێنتەکانی ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ئەوەیە کەناوەرۆکی زۆریان بریتی یە لە ناوەرۆکی ئەو باس و کتێبانەی لەلایەن کاربەدەستان و ئەفسەرە سیاسیەکانی بەریتانیا (لەکوردستان و لەعیراقدا بون) کەلەکاتی خۆیانا ئەو راپۆرت و یاداشتانەیان ناردوە بۆ کاربەدەستانی خۆیان وەکو ویلسن و مس بیل و ئەدمۆندزو لونگریک و کاپتن های و گەلێکی تر وئەوەی ئەوان لە کتێبەکانیانا باسیان کردوە یارێگەیان نەدراوەتی باسی بکەن هەرئەوانەن کەهێشتا دوکیومێنتەکانیان قەدەغەیە و رێگەی خوێندنەوەو بلاوکردنەوەیان نەدراوە.

ئەوەی کەپالی پێوەنام ئەم باسە سەرومرە دەبارەی شێخ مەحمودو خوارووی کوردستان بنوسم چەند هۆیەک بوو کە بە تایبەتی خۆشەویستیم بەرامبەر شێخ مەحمود و خەبات و شۆرشەکانی دژی هێزی داگیرکەر و ئیمپریالیزمی بەریتانیا و وەرامدانەوەی ئەوپرسیارانەی کە لە مێشکی گەلێک کەسدا پەنگیان خواردبوەوە کەسەردەمێکی زۆرخۆم یەکێک بوم لەوکەسانەو بەرپەرچدانەوەی ئەو نوسین و کتێبانەی کە دوژمنانی شێخ مەحمودو دوژمنانی کورد و کوردستان نوسیویانە و بلاویان کردوتەوەو لەزۆریانا تەقەلای ئەوەیان داوە کەشێخ مەحمود

واپیشانی خوێندەواران بدەن کەئەویو بوەهۆی سەرنەگرتنی دروست بونی حکومەتیکی سەربەخۆ لەکوردستانی خوارودا کەلەم تەقەلایەیاندا تاماوەیەک سەرکەوتو بون‌و زۆرکەس بەهەڵەلەشێخ مەحمود گەیشتبوو کە لەشوێنی خویدا هەمو شتێک لەم بارەوە روون ئەکریتەوە.....

هەندی نەفام‌و گێل لەلایەکی ترەوە واچوبوە مێشکیانەوە کە شێخ مەحمود دەسکەلاو داردەستی ئینگلیز بوەو ئەوەی من ئاگادارم‌و بەچاوی خۆم دیومە شێخ مەحمود هەتامردن بەرامبەر بە ئینگلیزەکان داخ لەدڵبوە کەبەیانی لەخەو هەڵدەستا بۆ نوێژ کردن لەدوای نوێژی بەیانی سەوکلاوەکەی دائەکەندو روەوقیبلە لە خوا ئەپارایەوە و ئەی‌فەرموو: خوایە ئینگلیز کوردی بە چ دەردێک برد لەدوا رۆژدا ئینگلیزیش بەودەردە ببەی..

بێگومان قوتابخانەکەی ئەدموندز بەخوی‌و شاگردەکانیەوە ، هەلویستیان بەرامبەر بەشێخ مەحمودو بەرامبەر بەکوردستان‌و پوچەلکردنی ئەوهەمو تەقەلایانەی کەبەسەرکردایەتی شێخ‌مەحمود درابو بۆ دەسگیربونی مافی رەوای کورد ئەمانە هەموی شتێکی ئاشکراو روونە.

لەباسەکانا بەئاشکرا بۆمان روون ئەبیتەوە کە ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتاوە ویستویانە شێخ مەحمود وەکو (راجا)یەکی هندستانی لەناو کوردستاندا بە کرێ‌بگرن و بیکەن بە داشی‌دامەو چوتیان بوێ بەوجۆرە بیبەن بەرێوە، بەلام کەزانیان شێخ مەحمود ئەوپیاوە نیەکەئەو مەبەستەیان بهێنێتەدی وە بۆیان دەرکەوت کەشێخ مەحمود مەبەستی پێک‌هێنانی کوردستانیکی سەبەخۆیە لەخواروی کوردستاندا کەماموستای ئەو قوتابخانەیە (ئەدموندز٤٥)دانی بەوەداناوەکەشێخ مەحمود لەسالی ١٩٢٢ دا کەلە هندستانەوە هاتەوە، لەسەرەتادا بەئیدارەی ناوچەی سلێمانی قایل‌بوو، بەلام هەرکە گەیشتە کنگربان‌و هەواسافەکەی کوردستان دای لە کەللەی، ئیتر کەوتەوە سەر سەوداکەی جارانی بۆ پێک‌هێنانی حکومەتێکی سەربەخۆی فراوان لەخواروی کوردستان‌دا .

وەکو لەشوێنی خویدا لەباسەکانا لی‌ی ئەدوێین...کە ساتێک ئینگلیزەکان بەهۆی بوردومانی سلێمانیەوە شێخیان ناچار کرد کە شارەکە بەجی‌بهێلێت،

لەناو راپۆرتەکانی ئینگلیزدا بەشادمانیەوە ئاگاداری وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ئەکەن‌و ئەلێن:«بزوتنەوەو سەرگەرمی‌ی هەستی نەتەوایەتی‌کورد لەناوچەی بادیناندا نەماوە، لەشوێنەکانی تر کز بوە، تەنها سلێمانی ماوەتەوە کەسەرگەرمی ئەوهەستەیە،ئەگەر شێخ مەحمودی هارو هاج نەمێنێت‌و لەناو ببرێت ئەوەی سلێمانیش نامینێت»

لەراستیدا وەنەبێ شاگردەکانی قوتابخانەی ئینگلیز بەکردەوەکانی کوتیان ئیتر وازیان لەدوژمنایەتی کورد هێنابێت بەلکو پشتاو پشت هەتا دەسەلاتی دەسکاری کردن‌و لووت تێوەژاندنیان مابێت لە ناوچەکەدا، ئەبێ میللەتی کورد بەپی‌ێ کێش‌و ترازوی کوتیان ئیمرۆش هەروەکو ئەوسا دەست‌وپێ بەسراو ماف خوراوبی.

ئەو کتێب و یاداشت و باسانەی کە لەلایەن سیاسی و کۆنە ئەفسەرەکانی ئینگلیزی ئەو سەردەمە نوسراوە بەشێکی زۆری بۆ ئەوە بوە کە بەو هەموو راوەرێوی‌و ئاوەژووکرنەیان راستی‌ی روداوەکانی ئەو سەردەمە لەخەلک بشارنەوە و بەرامبەر بەو بێ بەلێنی‌و پاشگەزبونەوە بێ شەرمیەیان بەرامبەر بەکورد کەچۆن پەیمانی ئاشتی‌و سیڤەریان پی‌ێشێل کرد و لیژنەکانی عصبە الأمميان لە خشتەبرد و بریارەکانی عصبە الأمميان پشت گوێ خست بەرامبەر بەو تاوانانە چ خویان‌و چ نوکەرەکانیان هەمیشە هەولی ئەوەیان داوە کەگومان بخرێتە بەر رەسەنی‌ی زمانی کوردی‌و مێژووی کورد و واله خەلک بگەیەنرێت کە شێوەکانی زمانی کوردی هەریەکەیان سەر بەزمانێکی بێگانەن کورد (ماد) نەبوە بۆیە هەولی داوە خۆی بگەیەنێتە سەرماد.

بەپێی ئەوەی دوکتور مکنزی وهەندێ نووسەرانی تر بۆی‌چوون، ئەبێ ماد وەکو جنۆکەی ئەفسانەکان لەچاو وون‌بووبێت وەیا هەروەکو بلقی سەرئاو بەفوویەک لەنا وچووبێت،کوردیش لەشوێنی خۆیا وەکو قارچک هەلتۆقیبێت.تەوفیق وەهبی لەکاتی خۆیدا بەئینگلیزی بەناملکەیەک بەناوی The origon of the Kurds لەو رووەوە وەرامی دوکتور مکنزی داوەتەوە.

لەناو ولات دا نوسراوەکان دەربارەی شێخ مەحمود هەرچەند زۆر و پرش و بلاون، بەلام لەگەل ئەوەشدا ئاسانتر دەس ئەکەون وەک ئەوانەی دەرەوەی ولات

که هەندێ جار نووسەر بۆشتێکی بچووک دائەمێنێت و بە ئاسانی ئەوانەی ناو ولاتیش ناگەنە دەست و وابزانم هەر نووسینێک بەبێ ئەو سەرچاوانەی ناو ولات، هەرچی لە دەرەوەی ولات بنوسرێت کەم و کورتی تیادا ئەبێ و نووسەر بە ئاسانی ناگاتە مەبەست و ئامانجی خۆی، ئەمە جگە لە نەبوونی دەزگایەکی چاپەمەنیی پێشکەوتوی کوردی و نەبوونی دەزگایەکی بلاوکەرەوەی چاپەمەنیە کوردی‌یەکان.

هەرچۆنێک بێت خۆشەویستیم و شەیدابوونم بەرامبەر بە شێخ مەحمود و بەرامبەر تێکۆشانو خەباتی شۆڕشگێرانەیو سەردانەواندنی کە هەمو بەلگە نەهێنیەکانی ئینگلیز دانیان بەو راستیەدا ناوە، ئەمانە هەمویان خستمیانە سەر سەودای ئەوەی هەول بدەم شتێک دەربارەی شێخ مەحمودی مەزن بنوسم کەشایانی بێ و وەکو قارەمانێکی میللەتی کوردو تێکۆشەرێکی نەبەردو شۆرەسوارێکی ناو کۆڕی خەباتی میللەتەکەمان.

ئەو سەرچاوانەی لەدەرەوەی ولات دەستم کەوتون شتێکی کەم‌نین، ئەو دوکیومێنتانەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە هەندێکم لە سەرەتادا بەهۆی دۆستێکمەوە (س.فخری) دەسگیر بوو، هاندەرێکی تەواوم بوون و هەلێکی باش‌و لەباریان بۆ رەخساندم‌و پالیان پێوەنام کەدەستو برد بکەم لەنوسینی ئەم باسە،جگەلەوەش بیرەوەریەکانی شێخ‌رەئوفی شێخ مەحمود کەبەعەرەبی نوسیویەتی کەبەهۆی شێخ‌باباعەلی برایەوە دەستم کەوت گەلێک یاداشت‌و بیرەوەری بەنرخی ئەوسەردەمەی تیادایە کەزۆرشتی بۆ روون کردمەوەو شتی وای تیادایە کەبۆ یەکەم جار ئەبیسترێ جگە لەو گفتوگۆ و لێدوان و باسانەی لەگەل شێخ باباعەلی‌دا لە لەندەن کە هەموجارێک بە سوپاسەوە بە دەنگمەوە ئەهات‌و زۆرشتی بۆروون ئەکردمەوە ئەمانە هەموی هاندەری ئەم نوسینەم‌بون بەلام بەداخەوە زۆرسەرچاوەی بەنرخی ترهەیە ئەگەر لەناو ولاتا بوومایە ئەم‌توانی لاپەرەکای رۆژنامەکانی ئەوسەردەمانەی شێخ‌مەحمود بپشکنم‌و لەگەل ئەم سەرچاوانەی دەرەوەدا هەمویان یەک‌بخەم‌و پەناش ببەمەبەر هەندێک لەو پیاوە بەسالاچوانەی کەهێشتا لەناوچەکەدا ماون کەبەوە ئەم‌توانی کارەکەم تێروتەسەلتر و باشتر بهێنمە ئەنجام لەگەل ئەوەشدا وابزانم ئەگەر مروڤ بەتەمای

ئەوەبێ هەمووشتێکی لەبەردەستابێ‌و هەموو پێویستیەکی بەئاسانی بۆ برەخسێت ئەوسا دەست بکات بەنوسین، وابزانم ناگاتە ئەنجام‌و زۆرجار مرۆڤ بەناڕەوا ئەوبەشەی کەئەتوانی بینوسی‌و بلاوی بکاتەوە لەبەر کەم‌تەرخەمی‌و بەبیانوی ئەوەی کەباسەکەی نیوەو نیوەچڵ ئەبێت بەوە ئەو هەمو یادو بیرەوەریەش کەئەی‌توانی بلاوی بکاتەوە ئەوەشی لەکیس ئەچێت‌و ئەو کەسە لەگەل خۆیدا ئەیباتە ناو گڵەوەو خوێندەواران‌و نەوەی ئیستەو دوارۆژ لەو بەرهەمەی بی‌بەش ئەکات..... بۆیە هەرچۆنێک بێت بریارم دا کەسوریم لەسەر کۆکردنەوەی سەرچاوەو باس‌و بەلگەی نەهێنی‌و پرس‌و راوێژکردن لەدۆست‌و برادەران و خوێندەواران‌و گوێم نەدایە ئەوەی خۆم یا خەلک پێم بلێ کەمن مێژوو نوس نیم‌و لەباسی شیعرو ئەدەبەوە بۆچی بازدت داوەتە سەر ئەو بەرزاییە سەختە مێژووییە یا خۆم بەخۆم بڵێم کەئەمە ئەرکی سەرشانی من نیەو کاری مێژوونوسەکانی کوردەوئەوبوارە بۆ ئەوان بەجێ بهێلم... بۆ ئەو مەبەستە پەنام‌بردە بەر هەرسەرچاوەیەک کەبزانم بۆ ئەو باسەی من چوەو هیچ‌دوودل نیم لەوەدا کەلەدوارۆژدا زۆر مێژوونوس و خوێندەوار لەم باسەی من شارەزایانەترو پسپۆرانەترو تێروتەسەلتر گەلێک باس دەربارەی شێخ‌مەحمود ئەنوسن‌و هیوادارم ئەمەی من هاندەرێک بێت بۆ ئەوەی ئەو کەم‌و کوریانەی ئەگەر لێرەدا هەستی پی‌بکری وەکو سەرنجێکی رۆژانە لەلایەن خوێندەواران‌و مێژوونوسانی کوردەوە هەموی دەس‌نیشان بکری.

لەوەختی خۆیدا بەر لەسالی ۱۹۷۰ کەدەستم کرد بەوەی شتێک دەربارەی پیرەمێرد بنوسم (وەکو لەپێشەکیەکەی پیرەمێردا باسم کردوە لەسالی ۱۹۷۰دا چاپم‌کردوە ) ئەمزانی ئەونوسینەی من ئەگەر پەلەی لی بکەم کەم‌و کوری تیادەبێت، بەلام بەیانی ئازارم بەهەلزانی‌و ترسام دەرفەتی لەوە لەبارترم بۆ نەرەخسێت، بۆیە هەرچۆنێک بوو دەست‌و بردم لی‌کردو چاپم‌کردو بلاوم کردەوە وانزیکی ۱۹-۲۰سال بەسەر ئەوەی پیرەمێردا تێپەری کرد، وەکو ئاگادارکرام باسێکی تێرو تەسەل دەربارەی پیرەمێرد ئامادە کراوە کە بێگومان زۆرشتی تیادا راست کراوەتەوە و زۆرشتی تری کە من پەلەم تیادا کردبو هەموی بلاو ئەکرێتەوە.

ئومێدەوارم نوسەران و مێژوونوسەکانمان کەمتەرخەمی نەکەن دەربارەی تومارکردنو چاپکردنو بلاوکردنەوەی مێژووی بەسەرهاتی پیاوەناودارو شۆرشگێرەکانمان وەکو شێخ‌عبیداللەی نهریو شێخ‌سەعیدی پیرانو شێخ عبدوالقادری نەهریو عەبدوالرزاق بدرخان وسمایل ئاغای شوکاک(سمکۆ)و قازی مەحەمەدو موستەفا بارزانی لەهەر دەرفەتێکدا کە ماوەی بلاوکردنەوەیان هەبێت...

ئەو میللەتەی ریز لەتێکوشەرانو خەباتکەرانو شۆرشگێرانو قارەمانانی خوی نەگریٚ دیارەمیللەتێکی بیٚ وەفایە(کەلەراستیدا کورد لەو جۆرەنیە)، ئەوکوردەی بەچاوێکی سووکەوە بروانیتەگەورە پیاوانی میللەتەکەیخوی وابزانم زور بەهەلەدا چوەو ریژگاوو لەخشتەبراوە، چونکە ئەوەی رێز لەگەورە پیاوانی ولاتەکەی خوی نەگری، لام وایەمرۆڤێکی دروزنەو بەهیچ‌جۆرێک شۆرشگێرو خەباتکەرانی میللەتانی تریشی خوش‌ناویٚ.

لەولاتێکی وەک و(سوڤیەت)دا لەگەل ئەوەشدا کەئەزانریٚ (کاترینا)کوشک و قەلاکانی سەردەمی خوی بەئێسکی کەللەسەرو برپراگەی پشتو خشتو دیوارەکان بەخوێنو فرمێسکی چەوسێنراوانی ئەو سەردەمەی ئەو دروست‌کراوە.لەگەل ئەوەشدا لەولاتی روسی ئیمروٚ ناوی(کاترینا) بەخراپ نابریٚو زورجار یادی ئەوبەرهەمانەی ئەکرێتەوەو بەرێزەوەناوی ئەبریٚ.

بەلام سەیر ئەوەیە لایخزمان.....بۆنموونە...لەکۆرێکدا کەلەلەندەن لە١١.١.١٩٨٦دا لەمەلبەندی روشنبیری کوردا بەسرا بەبۆنەی تێپەربونی(٣٠)سالٚ بەسەر کۆچی دوایی شێخ‌مەحمودا (لە٩.١٠.١٩٥٦ دا کوچی دواییکردوە)کە دکتور کەمال فواد لە کورەکەی بوەوە، زورم لا سەیر بوو هی واهەبوو وەکو مەکینەیەکی قورمیش کراو لەوانەی کەوەکو فارسەکان ئەلێن(نیمەمەلادل میبرد...نیمەحکیم جان میبرد)کەوتنە لاقرتیٚ وپێکەنین بەو باسەو، هەبو ئەیووت ئیوەبۆچی باسی پیاوکوژو جەردە ئەکەنوبۆچی باسی (گاورباغی)ناکەن؟ بەلیٚ راستە گاورباغیش ئەهێنێت کوری بۆ ببەستریٚو هەمووکەسێک ئازادەو رێگا لەکەس ناگیرێت بەلام بۆچوونی ئەوجۆرە رێژگاوانەی گوایە بەلای خۆیانەوە لەسەر بناغەیەکی (ریالی)ی دوور

لەبۆچوون‌و لێکدانەوەی (بورجوازی)بوەو وایان پیشان ئەدا کەشێخ مەحمود نوێنەری دەرەبەگ بوەو رووبەرووی سەرمایەداری کوردی ئەوسا بۆتەوە کەئەمەی دواییان چینێکی پێشکەوتوتربوە لەچینی دەرەبەگ بەبێ ئەوەی لێکی بدەنەوە کەئەو چینی سەرمایەداریەی ئەوان بەپێشکەوتوتریان‌دانابو سەرمایەداری خۆولاتی نەبوون بەلکو سەرمایەداری ولاتێکی داگیر کەربوەو لەورۆژانەدا بە هیچ جۆرێک سەرمایەداری لەناو کوردەواری‌دا وەکو چینێکی تایبەتی چەکەرەی نەکردبوو بەدانسقەلەکوردستاندا هەبوە کەووشەی سەرمایەداری بیگرێتەوە. خۆ ئەگەر ئەو رەخنەگرانە لەگۆشەی چاوی ئەو چەند بازرگان‌و جامبازوچەرچی‌و خاوەن پارانەی ئەو سەردەمەوە سەیری هەلوێستی شێخ‌مەحمود بکەن ئەبێ زۆرباش بزانن ئەوانەچینی سەرمایەدار نەبون کەبوترێ بەپێ‌ی سروشتی چینایەتی دژی چینی دەرەبەگ بوبن کە شێخ مەحمودیان بە نوێنەری خۆی دانابێ بەلکو بریتی بون لەتاقمێکی (کومپرادور) کەچارەنوسی خۆیان بەستبۆوەبەمانەوەی ئینگلیزەکان لەکوردستاندا کەسوودو دەسکەوتیان لەمانەوەی ئینگلیزدا بوە نەک لەسەربەخۆی کوردستاندا. هەمو جارێک کەباسی سەربەخۆیی کوردستان ئەهات ئینگلیزەکان ئەو بازرگانانەیان بەوە ئەتۆقاندو پێ‌یان ئەوتن: ئەی باشە ئێوە ئەگەر سەربەخۆبن‌و نەچنەسەر عیراق ئەی توتنەکەتان ئەبەن بۆکوێ ؟

کەواتە کێشە کێشەی نێوان دەرەبەگ‌و سەرمایەداری ناوخونەبوە هەتا بتوانین هەردولایان هەلسەنگێنن‌و چینی سەرمایەدار بە پێشکەوتوتر دابنێ‌ین لەچینی دەرەبەگ‌و ئەگەر بەو پیوانە و بۆچونانەی ئەوان بۆ رووداو وبەسەرهاتی تر بچین پێویستەراپەرینەکانی عەشایرەکانی فوراتی ناوەراست ۱۹۲۰ کە دژی بوونی سەرمایەداری داگیرکەر بوە ئەو راپەرینەش تاوانباربکرێت، لەگەل ئەوەشدا بۆچونێکی زۆر خام‌و نەشارەزاییانەیە کە شێخ مەحمود بەنوێنەری دەرەبەگی کورد دابنرێت لەو شۆرشەی‌دا کەدژی ئینگلیزو دەزگای عیراق کردبوی چونکە لەراستیدا ئەوەی کەکاروبارەکەی شێخ‌مەحمودی تێکدا تەنها هەر ئینگلیز نەبوو بەلک‌و ئەو عەشایرانەبوو کەهەمویان بۆ سودی خۆیان و بەهاندانی ئینگلیز چوون بەگژ شێخ مەحمودا و هەندێکیان خیانەتیان لێ کردو چونە پال ئینگلیز وەکو لە دواییدا لە باسەکانی داهاتوودا دەرئەکەوێ.

لەگەڵ ئەوەشدا وابزانم بۆچونێکی زۆر نەشارەزایانەو خامەکەرووداوو بەسەرهاتەکان‌و رەفتارو بوچوونی شەست‌حەفتا ساڵ لەمەوبەر بەکێش‌و پیوانەی ئیمرۆ بکێشری‌و بپیوری‌و داوا لە شێخ مەحمودی ئەوسەردەمە بکرێ کەئەبوایە وەکو شۆرشگیرێک‌و روشنبیریکی ئەم سەردەمە حسابی بۆ خەباتی چینایەتی بکردایەو داوای لێ بکرێ ئەو هەمو خوو رەوشت‌و یاسایانەی باوبون‌و ساڵەهای ساڵ‌بو بنجیان داکوتابو داوا لەشێخ مەحمود بکرێ سوک‌و باریک هەموی پێ شێل‌بکردایەو گوێ‌ی نەدایەتە هەست‌و ئارەزوی خەڵکی ئەوسەردەمە کە ئەوسا لەو بروایەدابون هەرکەسێک شالێکی سەوزی بەست ئەبوایە دەستی ماچ‌بکرایەو بەوەشەوە نەدەوەستان بەڵکو زۆری وا هەبوئاوی دەس‌نوێژی ئەوکەسانەشیان خواردۆتەوە کەدورنیە باووباپیری هەندێک لەو رەخنەگرانە یەکێک بووبن لەوجۆرە دەست‌ماچ‌کەرانە.

شێخ‌مەحمود لەگەڵ ئەو هەمو بارە نالەبارەی ئەوسەردەمەداو لەگەڵ ئەو هەمو کوێرەوەری‌و دەردی‌سەریەی کەلە ئەنجامی شەری جیهانیدا لەناوچەکەیدا رووبەرووی ئەبوەوە لەگەڵ ئەوەدا باڵی رەشی نەخوێندەواری‌و کۆنەپەرستی ئاسمانی ولاتی داپۆشیبو، لەگەڵ ئەو هەمو کەم تەجرەبەیی‌و نەشارەزاییەی کەهەبو بەرامبەر سیاسەت‌و کەلەک‌و دەس‌برینی سیاسەتمەندارانی ولاتانی ئیمپریالیزم‌و سەرمایەداران، لەگەڵ ئەوهەمو دەردی سەریانەدا شێخ‌مەحمود درێغی نەکردوە لەراوێژ کردن‌و داوای هاوکاری‌کردن لەوانەی کە هاوکاری‌بون‌و دەستی بۆ هەمو لایەک درێژ کردوە کەلای وابوە بەدەنگ‌و هاواری میللەتەکەیەوە ئەچیت...هەر لە ئینگلیزەوە کە بە ڕ والەت ئالای رزگارکردنی میللەتانی بەرزکردبوەوە هەتا تورکەکان کە بنکەیەکیان بەسەرکردایەتی عەلی شەفیق(یوزدمیر) لەرواندوز دا هەبو جگە لەسەروک و سەرکردەکانی عەشایری کورد بەنامەو بەراسپاردە هاواری بردە بەر هەمویان بو یارمەتی‌دانی کوردو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی رووبەرووی دەولەتەکەی بوەوە، بەلام ئەو رۆژانە ئەگەر زەمانە لەگەڵ ئەوو لەگەڵ میللەتی کوردا نەبوبێت ئەوەشتێکی‌تربوەو خڵتەو چلپاو و گوتاو رۆی ساڵەهای سالی رابوردوی میللەتە چارە رەشەکەمان کەهەموی لەکاتی حوکمداریتی شێخ مەحمودا گردبونەوەو بوون بە سەرباری

کێشەو کوسپەکانی تری سەر ڕێگای وابزانم شتێکی نارەوایە کەهەموی بخرێتە گەردەن ئەستۆی شێخ‌مەحمود........

ئیمرۆش وا هەتا ئێستا کورد بەهەنگڵەشەلە و نیوەکوێرانە ڕووەو مەبەست‌و ئاواتەکانی ئەڕوات‌و تا کو ئێستا نەی توانیوە بگاتە راستە ڕێگای رزگاربون‌و نەی‌توانیوە بەشێوەکی جەماوەر رووبەرووی دوژمنەکانی بێتەوەو نەی‌توانیوە هاوکاریەکی ئەوتۆ لەناوخۆیدا سازبکرێ کەتەوژم‌و گوژم‌و تەکانێکی ئەوتۆیدا کەدوژمن ناچاربێت دان بە مافەرەواکانیا بنێت. راستیەکی تری زەق‌و ئاشکرا هەیە کەبریتیە لە جیوپۆلیتیکی کوردستان کەهەر لەکۆتەوە باری میللەتی کوردی لار کردوەو کوردستان لەسەر چەقی ڕێگای میللەتاندا زۆرجار پێ شێل کراوە و مەگەر لەمەودوا بومەلەرزەیەکی سیاسی ئەوتو لەناوچەکەدا ڕوبدات (وەکو ئەوەی لەبالقان رویدا ) کەبەدابێژان‌و تەتەڵەیەکی سیاسی، کورد لە پوش‌وپەلاشی رابوردوی رزگاری ببێ، ئەو لاسەنگی‌یەی کەتوشی باری کورد بوە بەوهەلتەکاندن‌و دابێژان‌و تەتەڵەکردنە بارەکەی راست‌ببێتەوە کەلام وایە ئەبێ کورد دەورێکی سەرەکی‌و گرنگ ببینێت لەو هەلتەکاندن‌و بومەلەرزەیەدا و بەتەمای ئەوە نەبێت بیتاقەیەکی یانسیبی بۆ دەربچێت یاخۆد فریشتەیەک یا پەریزادەیەک دەستی دلسۆزی بۆ درێژ بکات.

تا ئەوکاتەی کورد بەو ئاواتە ئەگا با ئێمەش تۆزێک بەویژدان بین‌و گلەی لەباو باپیرانی خۆشمان بکەین‌و بلێین جا باشە کەشێخ‌مەحمود لەیەکەم حوکمداریەتیدا ئاوارە کرا بۆ هیندستان بۆچ باو باپیری ئێمە ئەو بۆشاییەیان پر نەکردەوە بۆ ئەوەی ئینگلیز ناچارنەبێت جارێکی تر رێگا بدات بە شێخ‌مەحمود لەهیندستانەوە بگەرێتەوە بۆ کوردستان لەدوای ئەوەی هاتەوەو بەیداغی دەولەتی کوردستانی هەلکردو ئینگلیزەکان بەهێزی بۆمبای فرۆکە ناچاریان کرد بداتەشاخ‌و ئەی ئەو چینی سەرمایەدارە کە پێشکەوتوتر بو لە شێخ مەحمود بۆچی خەباتی نەکردو سەرکردایەتی میللەتەکەی نەگرتەدەست؟

بەلێ راستە شێخ مەحمود (تولستۆی) نەبوە کەهاتە سەر حوکم وەکو ئەو هەمو مولک‌و زەوی و زارەکانی دابەش بکات بەسەر جوتیاراندا بەلکو ئەویش وەکو هەمو خاوەن زەوی و زارێکی پێش‌خۆی و ئەو سەردەمەی ئەو رەفتاری

کردوەو خەباتی چینایەتیی بەبیردا نەهاتوەو دوورنیە ئەگەر بۆ یەجگاریش ببوایە بەملکی کوردستان واز لە زەویو زارەکانی نەهێنیوەکو چون مەلیک فەیسەڵ کەبەڕوتوقوتی هاتەعیراق مولکێکی زۆری پێکەوەناو(حاشیە)ی حمدی بابانی برد بۆ خۆیو دەستی بەسەراگرتو چوارباخی پێنجوێنی کرِیو سەری کردە سەرمامەرەشەی(بلکیان) ی پێنجوێن کەبەزۆر بلیکانی پێ بفرۆشێت کەخۆی گرتو پێی نەفرۆشت،بەلام لەگەل ئەوەشدا وەکو پیاوەکانی ئەو سەردەمەی شێخ‌مەحمود باسیان کردوە شێخ‌مەحمود لەپێناوی شۆرشەکەیدا هەرچی پارەو سامانێکی بوە هەموی خەرج‌کردوە.

ئەگەر باری ئەو سەردەمەی کوردستان بەشێوەیەکی گشتیو باری خواروی کوردستان بەشێوەیەکی تایبەتی ئاسایی بوایەو بەرژەوەندی دەولەتە دەسەلاتدارەکان ( بەتایبەتی ئینگلیز) لەو رۆژانەدا لەوەدابوایە مافی کورد پشتگوێ نەخرێو نەخوێندەوارِیو باسای خیلایەتیو ووشکەرِۆیی ئاینی بالی رەشیان بەسەر کوردستاندا نەکێشایە و خلتەی کۆنەپەرستیو دەنگی‌تەپلو دەفو هایوهۆی ناوتەکیەکانو مل بادانی کۆری دەروێش سەریان لە شێخ‌مەحمود تێک نەدایەو برسێتیو گرانیو نەبوونی ئەو رۆژانە زۆر کەسی چاو بەرەوژێری دەسنگەی ئینگلیز نەکردایە، یا ئەگەر ئینگلیز وەکو چۆن بۆ بەرژەوەندی خویان فەیسەلیان هێناو حکومەتێکیان لە عیراقدا بۆ دروست کردو ئەگەربیوستایە بەوێنەی عیراق حکومەتێکی بۆ کوردیش دروست بکردایە، لام وایە ئەگەر شێخ‌مەحمودیش لیهاتوو نەبوبێت بو ئەو کاروبارە ئەتوانرا یەکێکی تر پێش بخەنو پالپشتی بکەن یا کە شێخ مەحمودیان هێنایەوە لە هیندستانو شێخ دلنیا بوایە لەوەی کەئینگلیز دەستی دەستی پێ ناکەنو نایانەوێ تەنها وەکو کرێ گرتەیەک مەبەستەکانی خۆیانی پیبهێننەدی بروانا‌کەم سەرپێچی بکردایە و حکومەتی کوردستانیش سەری ئەگرتو تا ئێستەش هەر ئەمایەوە. ئینگلیزەکان بەر لەهێنانەوەی شێخ مەحمود لەهیندستانەوە لەگەل سەید/طه نەهری و حەمدی بابانیشدا کەوتنە گفتوگۆ بۆ ئەوەی یەکێکیان بکەن بەحوکمداری کوردستان بەلام ئەو پەیوەندی و گفتو گۆیەیان شتێکی ئاشکرابوە کەتەنها بۆ ئەوە بوە لە رێگەی یەکێک لەو دوانەوە کوردی خواروی کوردستان کۆ بکەنەوەو

تورکەکانیان پێ دەربکەن لەرواندوز، بەلام ئەوانیش وەکو شێخ مەحمود مەبەستی ئینگلیزیان بۆ روون بوبووەوە.
کە ئینگلیزەکان باریان شلۆق بوو لەهەمو ناوچەکانی خواروی کوردستاندا کوردەکان بەربونە ویزەی ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیزو هەر رۆژەی یەکێکیان لێ ئەکوژرا ئیتر چاریان نەما شێخ‌مەحمود یان هێنایەوە کە ئەو مەبەستەی خۆیانی پی‌جی‌بەجی‌بکەن.
دوای ئەوەی ئینگلیزەکان لە بەلێنەکانیان پاشگەزبونەوە ئیتر هەر رۆژەی بیانۆیەکیان بەشێخ مەحمود ئەگرت‌و جارێک ئەیان‌وت شێخ‌مەحمود ئەو پیاوەنیە کە کاروباری خواروی کوردستان ببات بە رێوەو عەشایرەکوردەکانیان لێ‌هان‌ئەداو هەندێ جار ئەیان‌ووت جیابوونەوەی کوردستان‌و نەبەستنی بە میسۆپۆتامیاوە ئەبێتە هۆی ئەوەی زیان لەهەردولا بکەوێ‌و کوردستان لەسەر دەریا نیە بۆیە وەکو ولاتێکی گۆشەگیر وایە کە بازارێکی خنکاوی هەیەو چارنیە ئەبێ ببەسترێت بەمسیوپوتامیەوە.... لەراستیدا ئینگلیزەکان ئەوەی بۆ دەست نەئەدان کەچاڵەنەوتەکان لە شوێنێک بی‌و بۆری نەوت بۆ بەکێش‌کردنی نەوت لەشوێنێکی تربێ، جگەلەوە لەنگەری تەرازووی شیعەوسونی کەئینگلیزەکان حسابێکی ووردیان بۆ کردبو کوردی پێ کرایە پارسەنگ‌و نەخشەی ئەوە کێشرا کەکورد لەوتای تەرازوەی ئەوان مەبەستیان بوو نەهێنرێتە دەر ئەمە شتێک نەبوو کەچاوی لێ بپۆشرێ.
ئەدموندزی خوێنەخۆیی کورد دوای ئەوەی گەرایەوەو لەلەندەن نیشتەجێ‌بوو ئیتر وەنەبێ وازی لەناپیاوەتی خۆی هێنا بێت بەرامبەر بەکوردو کوردستان‌و بەهێزبوونی عیراق بەمارەیی دایکی ئەزانی‌و هەمیشەمشوری ئەخوارد و ئەوەبو بێ پێچ وپەناو لەسالی ١٩٦٦دا لەلەندەن لە جەمعیەتی ملکی ئاسیوی وتبووی «٤٦» «ئەو حکومەتی عیراقەی بیەوێ بەتەنگ خۆیەوە بی‌و رێز لەخۆی بگرێ، پێویستە هەمیشە حساب بۆ ئەوە بکات کەقەت نابێ رێگا بدات رۆژێک لەرۆژان کەرکوک بخرێتە سەر کوردستان.....(بێگومان کەوترا کەرکوک نیازی ئینگلیز نەوتە)،
لەولاتی خواپێداوداوو بەختەوەرا بوونی‌کانی مەعدەن‌و نەوت ئەبێ بەمایەی

تیرو تەسەلی‌و گەشەکردنی شارستانیتی‌و رۆشنبیری کەچی بۆکورد لەکوردستاندا بو بە مارو ئالایە گەردەنی. چاوچنۆکی‌ی سەرمایەداری ئەو رۆژە بەبڕکێش کردنی نەوتی کوردستان تێری نەئەخوارد بەلکولی‌ی بوو ملوزم و سواری سەری بوو کورد و کوردستانی بەست بە ولاتێکی بێگانەوە.

ئەو رۆژانەی کە شێخ‌مەحمود راپەری‌و داوای مافی رەوای میللەتی کوردی کرد رۆشنایی هیواو ئاواتێک لەئاسۆی کوردستاندا بەدی ئەکرا بەلام دەرکەوت ئەو رۆشناییە هی ئەستێرەی کاروان کوژەی ئینگلیز بوو، ئەو رەنگە زەردو سورانەی داگیرکەری ئەو رۆژە خۆی پێ رازاندبوەوە دەرکەوت دێوجامەی ئینگلیزی راوچی‌بوو کوردی پێ ڕاو ئەکرد لەکەوبوارا... زۆری پێ‌نەچوو ئەو حوکمداریەی شێخ‌مەحمود هەوری غەزەب رووی ئاسمانی لێ‌گرت... لەگەل ئەو هەمو بارە قورسەی کەلەروژانی رابوردەوە لە سەرپشتی میللەتی کوردا کەلەکەی کردبوو لەزەمانی شێخ‌مەحمودا ئەوەندەی تر باری قورستربوو. هەرکەسە لەو رۆژانەدا لەسەر ئاوازێک ئەی‌خوێند و شێخ کەوتبوە نێوان سێ تاقمی جل‌خوار و (تورکخوا) و وشکەمەلاو شێخەرووتەل و تاقمی سێ‌هەم کەپێ‌ی ئەوترا (مونەوەر) کەلای تاقمی یەکەم‌و دوهەم کافرو فەرمەسوتی ئەگرتەوە.

جەماوەری کوردی ئەوسەردەمەش وەکو مندالی شیرەخۆرە وابوو شتی‌وای بەخۆیەوە نەدیبوو، لەشیر بەولاوە هەرشتێکی تازەی دەرخواردرایە هێلنجی ئەداو ئەرشایەوە.

جارێک تۆفیق‌وەهبی بۆی‌گێرامەوە وتی: راستە شێخ مەحمود تەجروبەی سیاسی نەبوو و گەلێک یاسای عەشایری لەورژانەدا خۆی سەپاندبو نەلەتوانای ئەوو نەلەهی هیچ‌کەسێکی تردا نەبوو بەئاسانی خۆی لێ‌دووربخاتەوە، جگەلەوە هەندێکیش لە ئێمەمانانی خوێندەواری ئەو سەردەمەی وەنەبێ ئێمەش تاوانی وکەمو کورتیمان نەبووبێت هی وامان‌هەبو، بەتایبەتی ئەوانەی لەئەستەمبۆلەوە هاتبونەوە شوولیان لێ‌هەلکێشابوو کفر کردنیان بەشتێکی پێشکەوتوانە ئەزانی، خواردنەوەیان کردبوو بەگالتەو خەلکی ئەو سەردەمەی پر لە ووشکەصوفی‌و کۆلکەمەلاو شێخە روتەل لەو رۆژانەدا کلکیان کلاشەی ئەکردو رقیان لەهەمو شتێک ئەکردەوە کەبۆنی رۆژئاوای لێ‌بێ. ئەوانە بۆ سودی خۆیان ئەو هەلەو

رەفتارانەیان بەهەڵ ئەزانی‌و بۆ سوودی خۆیان ئەوەندەی تریان پێوە ئەناو لای شێخ‌مەحمود لەبەر چاو ئەکەوتن.

جارێکی تر تۆفیق‌وەهبی لەباسی حوکمداریتی شێخ‌مەحموددا کەتۆفیق‌وەهبی خویٰ لەدامەزراندنی دەزگای سوپاییدا بەشداری کردوە بۆی گێرامەوە وتی کە شێخ لە هیندستانەوە هاتەوەو صەدیق پاشا (صەدیق‌القادری) کرا بەموفەتیشی گشتی بەشێخ مەحمودی ووت: قوربان بۆ ئەوەی خەلک چاوترسێن بکرێن‌و سەر بۆحوکمداریەتەکەت دانەوێنین پیوستە چەند کەسێک ئیعدام بکەیت....شێخ‌مەحمودیش لەوەرامدا پیٰی ووت: جا باشەئێمە بۆ خەلک هەلواسین هاتوینەوە یا بۆ ئەوەی کاروباری خەلک چارەسەر بکەین‌و باری خەلک ئاسان‌بکەین ؟!

تاقمی سێهەم لەوانەی باسمانکردن بریتی بوون لەچەند لاوو نیشتمان‌پەروەرێک کەئەیان ویست بەشێوەیەکی سەربەخۆ بۆ کورد و کوردستان تیٰ‌بکۆشن‌و نەلایەنگری تورک‌وین‌و نەهی ئینگلیز بەلام بەداخەوە وەکو مامۆستا رەفیق‌حلمی لەیاداشتەکانیا باسی کردون ژمارەیان کەم‌بوەو ئەوەندە بەهێز نەبوون کەلەگێژاوی نیوانی ئەو دوو تاقمەی پێشودا بتوانن رۆلیکی سەرەکی ببینن.....

شێخ‌مەحمودیش تاڕادەک دلپاک‌و خۆش بروا بووەو زۆرجار ئەوخۆش‌بروایی‌و دلپاکیەی توشی گەلێک شەرەشەق‌و بینەو بەرەو سەربەشەی کردوە بەلام لەگەل هەموو ئەوانەدا راپەرینی شێخ‌مەحمود و شۆرشەکانی بەرامبەر بەهێزی داگیرکەری کوردستان، شۆرشی کوردی بۆ یەکەم جار لەسنوری شەرێکی ناوچەییەوە گواستۆتەوە بو قۆناغیکی نویٰ‌و بۆ پلەیەکی تازە کەکورد بەرامبەر بە دەولەتێکی سەرمایەداری دەس‌رۆیوی ئەوسەردەمە خەباتی کردوەو جەنگاوەو شێخ‌مەحمود وەکو سەرکردەیەکی چاونەترس‌و نەبەرد بەربەرەکانی ئینگلیزی کردوەو خۆی بۆ شل نەکردوە کەوەکو نۆکەرێکی بەکری‌گرتە بۆ مەرامی خۆی بەکاری بهێنی‌و توانی بەو شۆرشانەی گەلی کورد لە کێشەیەکی ناوچەییەوە بگوێزیتەوە بۆ باسێکی گرنگی نیوان دەولەتان کە لەمەدا وەک تۆفیق‌وەهبی نوسراوێکی لەدوای شۆرشی ئەیلولی ١٩٣٠ لەرۆژنامەیەکی بەیروتی‌دا

بلاوکردۆتەوە (لەشۆێنی خۆیدا باسی ئەو نوسینەی تۆفیق وەهبی ئەکەین) کەوتوبوی شۆرشی شیخ‌مەحمود بەرلە شۆرشی عەرەبەکان بوە لەفراتی ناوەراستدا لەسالی ۱۹۲۰ داو دەولەتەکەی شێخ‌مەحمود بەر لەدەولەتی عیراق دامەزراوە. شیخ‌مەحمود بەو راپەرینانەی ئەگەرچی لە ئەنجامدا سەری نەگرت بەلاْم توانی بۆ یەکەم جار لەمیژوی کوردا مەزبەتە بەکورد بکاتەوەو داوا لە شەریف پاشا بکا کەببێت بە نوێنەری کورد بۆ داواکردنی مافی نەتەوەکەی ئەگەرچی ئەو مەزبەتانە بەهۆی فەرەنسەو ئینگلیزەوە نەهێلرا بگاتە شەریف پاشا لەپاریس... جگەلەوە راپەرینەکانی شێخ‌مەحمود هۆیەکی گەورەبوو کەتا ماوەیەک عصبەالامم کێشەی کوردی خستبوە بەرچاوو داوای لە بەریتانیاو عیراق ئەکرد کە مافی نەتەوەی کورد پشت‌گوێ نەخرێت.

شێخ‌مەحمود لەکاتی خوکمداریەتەکەیدا زۆر باش لەمەبەستو نیازی ئینگلیزەکان گەیشتبوو ئەی‌زانی دەستی پی‌ئەکەن‌و جارێک یەکێک لەئینگلیزەکان لەزەمانی میجەرسۆن‌دا لەشێخ مەحمود ئەپرسیت: تیم ناگەیەنیت ئێوە چیتان لەئیمەوە ئەوێ؟

شیخ مەحمود لە وەرامدا پی‌ی ئەلێ: من زۆرباش ئەزانم ئیمەچیمان لەئێوە ئەوێ بەلاْم ئەی تیم ناگەیەنی ئێوە چیتان لەئیمەوە ئەوێ؟

کەشێخ مەحمود بەتەواوی ئومێد براوبوو لە ئینگلیزەکان‌و جاروبار هەندێ کەسی دەورو پشتی ئەیاندا بەگژی‌یداو پی‌یان ئەوت: قوربان تۆزێک نەرمی بنوێنە لەگەل ئینگلیزەکانا بەشکو بیری خۆیان بگۆرن، شێخیش بەم جۆرە وەرام ئەداتەوە:

نامەوی ژینی ئەسارەت، بەسمەعومری گومرەهی
نایکەمە سەرخۆم بەئەمری مودەعی تاجی شەهی
قەت بەئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرماندەهی

هەزاران سلاو لەگیانی پاکی شیخ‌مەحمودی قارەمان‌و ئەو هەمو پیشمەرگە نەبەردانەی لە پێناوی گەل‌و نیشتمانەکەیانا خۆیان بەخت کردوە.

لەندەن- هاوار
۱۹۸۹

# شێخ مەحمود و دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان

لام وایە شێوەیەکی لێڵ و ئاڵۆزکاوو ناتەواوم ئەخستە بەرچاوی خوێنەواران ئەگەر یەکسەر لەم کتێبەدا بچوومایەتە سەرباسی ژیانی شێخ مەحمود و حکومداریەتەکەی و دەوڵەتەکەی بەبێ ئەوەی شتێک دەربارەی ژیانی کورد لە کوردستاندا بە شێوەیەکی گشتی و لە خواروی کوردستاندا بە شێوەیەکی تایبەتی باس نەکەم و بەر لەوەی شێخ مەحمود ببێت بە حوکمدار و لەکاتی حوکمداریتیدا باسی باری چینەکانی کورد و باری ژیانی کۆمەلأیەتی و ئابووری و بازرگانی و پیشەسازی و رۆشنبیری نەکەم. جگە لەوە باسی بنەماڵەی شێخان کە لە دەسەلاتداریتیدا جێگەی باپانەکانیان گرتەوە و پێوەندییان بە عەشایر و بنەماڵەکانی ترەوە شتێکی زۆر پێویست بوو بۆ رونکردنەوەی پێوەندی زۆربەی دانیشتوانی ناوچەی سلێمانی لەوماوەیەدا.

لەم بەرگی یەکەمەدا جگە لەو باسانەی کە لێیان دوام دێمە سەرباسی هەڵگیرساندنی شەری یەکەمی جیهانی و پێوەندی شێخ مەحمود بە ئینگلیزەکانەوە و هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان و دامەزراندنی یەکەم حکومدارێتی شێخ مەحمود لە سلێمانیدا و پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە بەڵێنەکانیان و رووبەروو بوونەوەی شێخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیز لە شاخی گۆیژە و لە تاسلوجە و لە چەمچەماڵ و لە دەربەندی بازیان هەتا بریندارکردنی شێخ مەحمود و بەدیل گرتنی و موحاکەمەکردنی و ئاوارەکردنی بۆ هندستان و باسی رەفتاری ئینگلیز و ئاوارەبوونی خێزانەکان لەوانەی کە بەشداریی شۆرشیان کردبوو تا هاتنەوەیان و لە کۆتایی بەرگی یەکەمدا کورتە باسێکی کەم و کووری و ئەو رەخنانەی لە یەکەم حکومدارێتی شێخ مەحمود گیراوە. باسی ئەکەم و ئومێدەوارم لە بەرگی دوهەمدا (ئەگەر بە بەرگێکی تر بۆم تەواوبێ) باسی هەڵوێست بکەم لە ناوچەکانی خواروی کوردستاندا لە ماوەی دوورخستنەوەی

شێخ مەحمودا بۆ هندستان و باسی ئەو رووداو و پەیمان و کۆنگرە گرنگانەی کە پێوەندییان بە کوردەوە هەبوە وەکو کۆنگرەی ئاشتی و پەیمانی سیڤەر و کۆنگرەی قاهرە و باسی ئالۆزبوونی هەڵوێست لە سەرانسەری خوارووی کوردستاندا و ناچاربوونی ئینگلیز بە هێنانەوەی شێخ مەحمود و دامەزراندنی دوهەم حوکمدارێتی شێخ مەحمود و دوبارە پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز و هۆی پاشگەزبوونەوە و پەیمانی (لوزان) و روو بە رووبوونەوەی شێخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیز و هێزی سوپای عێراق و بەستنی کوردستان بە عێراقەوە لەلایەن ئینگلیزەوە و شۆرشەکانی شێخ مەحمود لە ناوچەکانی سورداش و پێنجوین و شارەزوور و شۆرشی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰ و شەری ئاوریک هەتا ئومێدبرانی شێخ مەحمود بە درێژەپێدانی شەر و نیشتەجێ بوونی لە بەغدا و گەرانەوەی بۆ کوردستان لە ساڵی ۱۹٤۱ لە کاتی هەرای رەشید عالی گەیلانیدا و نیشتەجێ بوونی لە گوندی داریکەلی هەتا کۆچی دوایی لە ساڵی ۱۹٥٦دا و کۆتایی هێنانی ئەم باسە بە بەراوردکردنی هەردوو حکمداریەتەکەی شێخ مەحمود و ئەو رەخنانەی لە شێخ مەحمود و حوکمداریەتەکەی گیراوە لەگەڵ شێخ مەحمود لەتای تەرازووی رەخنە و ستایشی شاعیران و نووسەراندا.

ئەو سەرچاوانەی کە بۆم ئەم باسە سوودم لێوەرگرتون لە پاشگۆی ئەم بەرگەدا و پاشکۆی بەرگی دوهەمیشدا لیستەیەکم بە ناوی هەموویانەوە کردوە و لە باسەکانی هەردو بەرگەکەدا لە جیاتی ناوهێنانی ئەو سەروچاوانە تەنها ژمارەی ئەو سەروچاوەیە لە ناو کەوانەیەکدا دەسنیشان ئەکەم و بەوە ئیتر پێویستی بەوەنەما کە هەموو جارێک ئەو سەرچاوانە لە پەراوێزی لاپەرەکاندا باس بکەم.

# باری چینایەتی لە خوارووی کوردستاندا

ئەگەر بویستریٚ باسی رووداو و بەسەرهاتیٚک بکریٚ یا کیٚش و قەوارە و سەرەنجامی بزوتنەوەیەک یا راپەرینیٚک یا شۆرشیٚک هەڵسەنگیٚنریٚ، یا باسی میٚژووی نەتەوەیەک بە شیٚوەیەکی گشتی یا قۆناغیٚک لە قۆناغەکانی میٚژووی ئەو نەتەوەیە بکریٚ، پیٚویستە بزانریٚ چینەکانی ئەو سەردەمە چ جۆریٚک بوون و هەر چینەیان دەسەڵات و توانای لەو سەردەمەدا تا چ رادەیەک بوە و پیٚوەندی نیٚوانیان چۆن بوە و کیٚشە و بیٚ‌برکیٚیان لەگەڵ یەکتردا چۆن کاری کردۆتە سەر بەسەرهات و رووداوەکانی ئەو سەردەمە و کامیان دەوری سەرەکی بینیوە و کامیان بۆتە هۆی رۆچوونی ئەو بزوتنەوەیە و کامیان هەویٚنی بزوتنەوەکە یاخود هاندەر و خۆراگر و لەخۆ بوردوو کۆڵنەدەر بوە لەکاتی ئەو رووداو و بەسەرهاتانەدا.

وابزانم نەشارەزایی و ئاگادارنە بون لە باری چینایەتی وڵاتیٚک ئەبیٚتە هۆی ئەوەی مرۆڤ بە شیٚوەیەکی باش لە مەبەست نەگاو زنجیرەی خویٚندنەوەی باسەکەی بە لیٚڵی و ئاڵوزکاوی و پچرپچر بیٚتە بەرچاو...... بۆیە وەکو لە پیٚشتریشدا باسم کرد بە پیٚویستم زانی بەپیٚی ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستمدان شتیٚک دەربارەی چینەکانی ئەو سەردەمەی پیٚش شیٚخ مەحمود باسی بکەم.

زۆربەی میٚژووناسەکان و شارەزایان بە تایبەتی رۆژهەڵاتناس و زمان‌ناسەکانی وڵاتی سۆڤیەت کە لە هی هەموولایەک زۆرتر بایەخیان داوە بە لیٚکۆڵینەوەی دوورودریٚژ وەکو چۆن باری چینایەتی ناو وڵاتانی تریان هەڵسەنگاندوە و لیٚی کۆڵیونەتەوە، بەو جۆرەش بایەخیان داوە بە باسی باری چینایەتی لە کوردستاندا و رۆڵی چینەکانی کوردستانیان دەس‌نیشان کردوە لە کۆری شۆرش و خەباتی کوردا و ئەو هۆیانەیان خستۆتە بەرچاو کە هەرەس هیٚنان و رۆچوون و روخاندنی شۆرشەکانی کوردیان سەرئەنجام‌داوە...

بەشیٚکی زۆر لە میٚژووناسەکانی سۆڤیەت و نووسەرانی بیٚگانە لەسەر ئەوەن

که کورد له کوردستاندا به قۆناغی (بەند- کویلە) داریدا نەرۆیشتوه، بەلکو له (کومونەی سەرەتایی) یەوە ملی‌ناوه بەرەو قۆناغی دوای بەندایەتی که بریتی بوه له قوناغی (فیودالی کۆچەری).

بۆ ئەوەی مەبەستەکەمان دەربارەی چینەکانی کوردستان روون بکەینەوه هەولْ ئەدەین قۆناغەکانی دوای (کۆمۆنەی سەرەتایی) له کوردستاندا بکەین بەم بەشانەی خوارەوه:

یەکەم:- چینی فیودالْ

ا- چینی فیودالی کۆچەرایەتی: که له دوای ماوەیەک لکێکی لیْبوەوه که بریتی بوو له چینی فیودالی نیوه کۆچەری و نیوه نیشتەجیْ بوو.

ب- چینی فیودالی خاوەن زەوی و زار:

دوهەم:- چینی پارەدار و بورجوازی که بریتی بوون له خاوەن مولک و زەوی و زاری ناوشار و شارۆچکەکان و بازرگانەکان.

سیْهەم:- چینی کرێکار و رەنجبەر و چەوساوه و بیْسەرمایە.

# یەکەم:- چینی فیوداڵ
## أ- فیوداڵی کۆچەری

لە ئەنجامی ئەو لێک‌ترازاندن و لێک‌پچراندن و کۆمەڵ کۆمەلیەی کە لە دوای کۆمۆنەی سەرەتایی لە کوردستاندا روویداوە ئەنجامەکەی گەیشتوە بەوەی سەرەتای خیلایەتی پەیدابێ و خزمایەتی و کەسایەتی و لەیەکتریەوە نزیک بوون بە هۆی ژن و ژنخوازی‌یەوە دەستە و تاقمێکی لە دەستە و تاقمێکی تر جیا کردۆتەوە و لەناو ئەوانەدا چەند لێهاتوو و دەسرۆیویک، بە هۆی سامان یا ژمارە زۆری کەس و کاری یا بە هوی ئازایەتی و کارامەییەوە دەرکەوتوون و بون بە دەسەلاتدار و دەستیان بەسەر ناوچەیەکدا گرتوە و بە هۆی کەس و کار و دەست و پیوەندەکانیانەوە ئەو دەسەلاتەیان پاراستوە...... بەو جۆرە چینی فیوداڵی کۆچەری چەکەرەی کردوە و وردە وردە ئەودەس ڕۆیوانە دەوری پێشرەوی و سەرکردایەتیان بینوە و وردە وردە ئەو دەسەلات و دەس رۆیشتنەیان مافی ئەوەی داونەتێ کە بریاری کۆچکردن و هەڵبژاردنی هەوار و مانەوەیان لە گەرمیان و کوێستان بدەن و زۆرجار ئەبوون بەناو بژیکەر بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و ناکۆکیانەی لەناو عەشیرەتەکەیانا رووی ئەدا بە ئاشتکردنەوە یا بە خوێن خۆشکردن و جگە لەوەش بریاری چۆنێتی بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی خێڵ و پاراستنی پەز و مەروماڵات و شوێنی لەوەڕی قەدەغەکراو و هێرش بردنە سەر خێڵ و عەشیرەتەکانی تر بۆ سەندنەوەی تۆڵە لەوانەی کە دەس‌درێژی‌یان کردبوونەسەر.

لەم روەوە سوودێکی ئێجگار زۆرم لە کتێبەکەی (عارەبی شەمۆ) وەرگرت کە بە ناوی (حول مسائل الاقطاع بین الکرد) لەلایەن دوکتۆر کەماڵ مەزهەرەوە کراوە بە عەرەبی. عارەبی شامۆ ئەڵێ:«٣٦»

«چەکدارەکانی عەشیرەتەکانی کورد بۆ ریزگرتن لە سەرکردەکانیان زۆرجار

چەکەکانیان لای سەرکردەکانیان دائەنا، کە ئەمە جگە لە ڕێزگرتن لەو سەرکردانە دوو مەبەستی تریشی تیا دابوە یەکەمیان بۆ موسۆگەرکردنی پاراستنی ئەو چەکانە بوە کە نەدزرێن (لە ژێر چاودێری سەرکردەکانا پاسەوان و پیاوی تایبەتی هەبوە بۆ پاراستنی ئەو چەکانە)، دوهەمیش بۆ ئەوەبوە کە ڕێگە لەوە بگیرێت نەوەکو یەکێکی کەللەڕەق و سەرچڵ لە کاتی هەڵچوون و تووڕەبوونێکی کاتی‌دا پەلاماری چەکەکەی بدا لەسەر شتێکی بچووک دژی یەکێک لە هۆزەکەی خۆی».

ئەو سەرکردە و دەس ڕۆیوانە کە دەوری نوێنەری چینی فیودالی کۆچەریان بینیوە (کە هەندێکیان پێ‌یان وتراوە سەرکۆمار) زۆرجار دەوری پێوەندی کردنی نێوان عەشیرەتەکەیان و عەشیرەتەکانی تریان بینیوە و لەگەڵ کاربەدەستانی میری‌دا زۆرجار فیودالێک لەگەڵ ئەو کاربەدەستانەدا لەسەر چۆنێتی کۆکردنەوەی باجی مەڕومالات (قۆچانە) ڕێک کەوتون و هەندێ جار خۆیان ئەو قۆچانانەیان کۆکردۆتەوە و هەندێکیان داوە بە میری و بەشێکیشیان بۆخۆیان گل داوەتەوە.

هەڵپە و بین‌بڕکێ لە نێوان سەرۆک عەشیرەتەکانا بۆ دەسگیربوونی ئەو دەسەڵاتە لە میری زۆرجار بۆتە هۆی شەڕ و نارێکی و هەرایەکی دوور و درێژ (کە لەباسی پێوەندی بنەماڵەی شێخان و جافەکاندا بەشێک لەو جۆرە نارێکیە باس ئەکەین لە شوێنی خۆیدا).

بێجگە لەوە زۆرجار فیودالی کۆچەری (وەکوچۆن فیودالی خاوەن زەوی و زاریش ئەو دەورەی هەر بینیوە) بۆ پەیداکردن و ناردنی سەرباز بۆ ناو لەشکرەکانی دەوڵەت دەورێکی زۆر بالای بینیوە و حکومەتیش لە ئەنجامی ئەو ئەرک کێشانەدا خەلات و بەراتی داوەتێ و دەسەڵاتیان بەپێ‌ی ئەوە فراوان بوە وەکو ئەو خەلاتانەی عوسمانلی‌یەکان دایان بە کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ سەعیدی کورەزای‌وە لە هەندێ ڕووداو و هەلوێستدا لەقەبی پاشایەتی دراوە بە هەندێک لەو سەرکۆمار و سەرکردانە وەکو ئەو لەقەبی پاشایەتیەی کە درابو بە مەحمود پاشای جاف و وەسمان پاشای جاف و بایز پاشای مەنگور و هەندێکی تر کە ئەو لەقەبەیان بە هۆی کارو فەرمانی ناو سوپا و لەشکرەوە دەسگیر نەبوە

بەلکو بەرامبەر بەو خزمەتە بوە کە لەناو خێلەکانی خۆیانا بەرامبەر بە حکومەت و بە سولتان کردویانە.

سوارەی حەمیدیە کە بە (ئێنسترسوار) ناسرابون و لەلایەن سولتان عەبدولحەمیدی عوسمانی‌یەوە لە ساڵی ١٨٩١دا دامەزرێنرابو زۆربەی سەربازەکانی لەو کوردا نەبوون کە فیوداڵەکانی کورد ئەیان‌ناردن و بەشداری ئەو هێزەیان ئەکرد.

زۆرجار کە حکومەت کەم دەسەلأت و لاواز ئەبوو، هەندێک لەو فیوداڵە دەس‌ڕۆیوانە ئەو باجەی کە لە مەڕومالأتی عەشیرەتەکەیان ئەسێنرا خۆیان دەستیان بەسەرا ئەگرت و هیچیان نەئەدا بە حکومەت. لە ئەنجامی ئەوەدا حکومەت کە دەسەلأتی پەیدا ئەکردەوە لەشکری ئەنارده سەریان یا عەشیرەتی تریان لێ‌هان ئەدا و زۆرجار کوشتارێکی زۆر ئەکرا وەکو ئەو سەرپێچیانەی کە هەمەوەندەکان بارەها بەرامبەر بە عوسمانلی ئەیان کرد.

مێجرسۆن کە حاکمی سیاسی بوە لە سلێمانیدا لە راپۆرتێکدا لەناو دوکیومێنتەکانی ناو ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا ژمارە (C.O 730 - 334) ساڵی ١٩١٩ دەربارەی چۆنێتی باج کۆکردنەوەی زەمانی عوسمانلی ئەڵێ:

«لە ناوچەی سلێمانی‌دا لە زەمانی عوسمانی‌یەکان هەتا ساڵی ١٩١٣ باجی ئەو مەڕ و بزنانەیەی کە ئەسێنرا بۆ ساڵێک بریتی بوو لە ٥و٧ عانە بۆ هەر سەرێک وەلەساڵانی ماوەی ١٩١٤- ١٩١٧ دا بە هۆی شەری جیهانی‌یەوە کە عوسمانی پێویستی بە دەرامەد هەبوە ئەو باجەکرا بە ٥و٩ عانە وەلەساڵی ١٩١٨ دا کرا بە دووقات.

لە ساڵی ١٩١٣دا تێکرا پارەی کۆکراوەی قۆچانە گەیشتبوە (١..٢٧٥) روپیە وەلەساڵی ١٩١٧ دا گەیشتە (٣.٤٣٢٥) روبیە، بەڵأم کە ئینگلیزەکان هاتنە سلێمانی هەموو سەرێک کرا بە (٨) عانە و کۆکردنەوەی باج (Kodah) لە مانگی شوباتەوە دەستی پێ ئەکراو لە کۆتایی ئەو مانگەدا تەواو ئەبوو».

لە باسی شێخ مەحمودا کە لە ساڵی ١٩٢٤ بە دواوە رووی کردە چیاکان، چاری نەبوو ئەویش بۆ ژیانی لەشکرەکەی هەولی‌دا وەکو جاران باج لە مەڕومالأتی کۆچەریەکان (بە تایبەتی هی جاف) بسێنێت و ئینگلیزەکانیش بۆ

ئەوەی شێخ مەحمود دەستی کورت بێ کە کۆچەرەکانی جاف لە پایزانا لە کوێستانەوە ئەهاتنە خوارەوە ئینگلیزەکان بە هێزی سوپای خۆیان و بە فرۆکە ئەو کۆچەری‌یانەیان ئەپاراست و هێزەکانی شێخ مەحمودیان بوردومان ئەکرد تا خێلەکان لە سنوری دەسەلاتی شێخ مەحمود تێپەریان ئەکرد و ئەگەیشتنە پێ دەشتەکان- لە شوێنی خۆیدا... لە سالەکانی ١٩٢٤ بە دواوە باسی ئەو کێشەی کۆچەری‌یانە ئەکەین لەگەلْ لەشکرەکەی شێخ مەحمودا.

بێگومان فیودالی کۆچەری هەتاسەر هەمووی لەسەر ئەو بارودۆخەی جارانی ئەمایەوە بەلکو هەندێکیان وردە وردە لە ژیانی کۆچەرایەتی هەمیشەیی بێزار بون، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئالوگۆر و فرۆشتنی بەرهەمەکانیان بە کالای نیشتەجێ بوەکان پەرەی سەند و هەندێکیان بون بە پارەدار و دەولەمەندبون، ئیتر هەولیان‌دا شان بە شانی مەرومالات بەخێوکردن دەست بکەن بە کرین و بەکرێ‌گرتنی زەوی و زاری میری، یا کە خۆیان بەهێز ئەبون و میری لاواز ئەبوو. زۆرجار دەستیان بەسەر هەندێ زەوی و زاردا ئەگرت و ئەو زەوی‌یانە ئەچێنران و بەو جۆرە هەندێ لە کۆچەریەکان چوونە پالْ نیشتەجێ بوەکان و لە ئەنجامی ئەوەدا هەنگاوێکی پێشکەوتووتر نرا بەوەی کە فیودالی نیوە کۆچەری و نیوە نیشتەجێ بو هاتە کایەوە.

کە شێخ مەحمود دەسەلاتی برەوی سەند و بۆ بە حوکمدار لە ناوچەی سلێمانی‌دا، ئەو سەردەمە عەشایری نیوە کۆچەری و نیوە نیشتەجێ بو ماوەیەک بوو گۆڕ و تەوژمی سەندبوو وەزۆریان وردە وردە بەرەو نیشتەجێ بوون ملیان ئەنا.

## ب - فیوداڵی خاوەن زەوی و زار و مولک

لە ئەنجامی وازهێنانی هەندێک لە فیوداڵی کۆچەری و نیشتەجێ بوونیان لەناو گوند و مەزراکاندا، کە ئەو ژیانە تازەیان لەوەی جاران بە ئارام‌تر و خاوێن‌تر بوو، ئەو خاوێنی و ئارامیە وردە وردە فیوداڵی تری هان‌دا کە نیشتەجێ بېن.

(ماکسیم واسیللوڤسکی) کە لە نیشتەجێ بوەکانی کوردی کۆڵیوتەوە ئەڵێ: «٣٦»

«کە کۆچەریەکانی کورد بە یەکجاری نیشتەجێ ئەبن، ئیتر وردە وردە ڕەوشت و خووی دراوسێکانیان پەسەند ئەکەن و تەواوی خێزانەکانیان واز لە کۆچەرێتی ئەهێنن و بە گوند و ئاوایی و کێڵگەکانیانەوە ئەبەسرێنەوە».

لە زەمانی عوسمانلی‌دا حکومەت گەورترین فیوداڵی خاوەن زەوی و زار بوە کە بە پێ‌ی شەریعەتی ئیسلام دەستی گرتبوو بەسەر زۆربەی زەوی و زارەکانی کوردستاندا و ئەو زەویانەیان بەکرێ (لەزمە) ئەدا بە خەڵک بۆ ئەوەی کشتوکالی تیادا بکەن و هەر بەپێ‌ی شەیعەتی ئیسلام مولکانەیان وەرگرتوە.

بەلاّم کە ساڵێک لاواز بون و حکومەت پێویستی بە پارە هەبوە یا دەسەلاتی ئەوەی نەبوە بە شێوەیەکی باش ئەو مولکانانە کۆبکاتەوە ئیتر بە ناچاری دەستی کردوە بە فرۆشتنیان و لە ئەنجامی ئەوەدا پارەدار و سەرەک عەشیرەتەکان دەستیان کرد بە کرینی ئەو زەوی و زارانە و کاربەدەستانی عوسمانلی هەر یەکەیان بۆ پڕکردنی گیرفانی خۆیان لەگەڵیانا ڕێک ئەکەوتن و بەشێکی زۆری بە نرخێکی هەرزان فرۆشرا و ژمارەیەکی زۆر لە ماوەیەکی کەمدا بون بە فیوداڵی خاوەن زەوی و زار.

عوسمانلی‌یەکان لە ساڵی ١٨٥٨دا یاسای (طاپۆ) یان دانا کە ژمارەیەکی زۆر لە فیوداڵەکان بەپێ‌ی ئەو یاسایە زەوی و زارەکانیان طاپۆ کرد و زۆر زەوی واش‌هەبو نەکرابو بەلاّم بە ناوی (لەزمە)وە بە دەستیانەوە بوو. کە ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر عێراقدا گرت، بۆ ئەوەی دەسەلاّتی فیوداڵ بەهێز

بکەن ئەو زەوی و زارانەی کە ماوەیەک بوو بەدەس فیودالّەوە بوو بە ناوی لەزمەوە رێگە درا بە ناوی «تسویە و طاپۆ»وە بە ناوی ئەوانەوە تۆمارکرا.

لە گۆڤاری (زانیاری)یدا کە لە بەغدا لە دوای بەیانی ئازاری ۱۹۷۰ بە کوردی دەرئەچوو باسێکی دوور و درێژ کە بە عەرەبی لەلایەن (م. مجید)ەوە دەربارەی مێژووی زەوی و زار لە کوردستاندا و چۆنێتی طاپۆکردنی ئەو زەوی و زارانەوە نوسیبوی، من لەو گۆڤارەدا کردم بە کوردی. لەو باسە گرنگەدا دەرئەکەوێ کە چۆن لە ئەنجامی چاولێپۆشین و رێکەوتنی کاربەدەستانی ئەو رۆژانەدا لەگەڵ ئەو فیودالأنەی کە ماوەیەک بوو بەناوی (لەزمە)وە دەستیان بەسەر هەندێ زەوی و زاردا گرتبوو لە ماوەیەکی زۆر کورت و کەمدا ئەو زەوی و زارانە طاپۆ کران و قەوالّەکانیان درابە دەست خاوەن زەوی و زارەکان کە سنوری زۆربەی ئەو زەوی و زارانە بەپێی ئەو قەوالأنە لە شاخەوە بۆ شاخ...... لە چەمەوە بۆ گرد هەمووی دەسنیشان کرا و هەندێ جار لە ئەنجامی ئەو گۆترەکاریەدا زەوی و زاری وردە مالکی تریشی ئەگرتەوە و زۆریان تیاچوون.

بێجگە لەوە عوسمانیەکان هەمیشە هەولّیان داوە هەستی ئاینی لەناو خەلّکدا بەهێز بکەن و بە هۆی پیاوە ئاینیەکانەوە رەشە خەلّکەکەیان بەلای سەلّتەنەتی عوسمانلیدا راکێشاوە. بۆ ئەوە پێوێستیان بە چەند شێخ و پیاوێکی ئاینی دەسەلأتدار و بەهێز بوە و لە رێگەی ئەوانەوە زۆرجار فەرمانی غەزای سولّتانەکانی عوسمانلی لەلایەن ئەوانەوە جێبەجێ کراوە و سەرباز و چەکداریان کۆکردتەوە و ناردویانن بۆ غەزا و لە پاداشی ئەوەدا هەندێک لەوانە خەلأت و بەراتی دەولّەتیان بەناوی (وەقف)ی تەکیە و خانەقاکانەوە یا بەناوی (أطعام طعام) تەرخان کراوە بۆیان ئەوانیش دەستیان بەسەرا گرتوە و بە شێنەیی تێکەڵ بە زەوی و زار و مولکەکانی تری خۆیان کردوە.

بۆ نموونە کە عوسمانیەکان داوایان لە کاک ئەحمەدی شێخ کرد لەشکرێک بنێرێت بۆ بەشداریکردنی ئەو غەزایەی لەگەڵ روسەکان کردیان لە سالّی (۱۲۹۳ هـ )دا کە پێی وترا شەری قارص و بایزید (هەندێ لە نووسەرانمان بەناوی شەری قارص و ئەردەهان ناویان بردوە)، کاک ئەحمەد لەسەر ئەو خواستەی سولتان لەشکرێکی لە دەروێش و مریدەکانی کۆکردەوە و

بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی کورەزای ناردی بۆ ئەو غەزایە و لەئەنجامی ئەوەدا جۆگای کاک ئەحمەد (کە لە ئاوی سەرچنار هەڵدەگیرێت) لەگەڵ پێنج گوندی تردا لە شارباژێر تەرخان کرا بۆ خانەقای کاک ئەحمەدی شێخ کە ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی موڵکدارێتی و فیوداڵیتی بنەماڵەی شێخان بوە کە لە زەمانی شێخ سەعید و شێخ مستەفا و شێخ مارفی نەقیب و شێخ مەحمودا زۆرتر پەرەی سەند کە لە شوێنی خۆیا باسیان ئەکەین.

کە شێخ مەحمود پێ‌گەیشت و لە دەسەلاتدارێتیدا جێگەی شێخ سەعید و شێخ مستەفای نەقیب و شێخ مارفی گرتەوە لەو خەلات و بەراتانەی کە لە کاک ئەحمەد و شێخ سەعیدی باوکیەوە بۆی مابوەوە لەگەڵ بەشە موڵکەکانی شێخ مارفی نەقیب (بەشی ئایشەخانی کچی) کە شێخ مەحمود مارەی کردەوە دوای کوشتنی شێخ ئەحمەدی برای و موڵکەکانی شێخ مستەفای نەقیب کە بە هۆی مارەکردنی (بەهیەخانی) ژنیەوە کە شێخ مەحمود دوای مردنی شێخ مستەفا مارەی کرد لەگەڵ ئەو زەوی و زارانەی تر کە خۆی پێکیەوە نابو بەمانە بە هەمووی بوو بە فیوداڵێکی گەورەی خاوەن زەوی و زار، شان بە شانی فیوداڵەکانی تری ئەو سەردەمە، ئەگەرچی شێخ مەحمود بە پێچەوانەی زۆریان نەک هەر زەوی و زارەکانی، بەلکو ئەو پارە و سامانەش کە کۆی‌کردبوەوە بەشیکی زۆری لە پێناوی شۆرشەکەیدا خەرج کردوە و ساتێک خێزان و ماڵ و منداڵەکەی لە ساڵی ١٩١٩دا ئاوارەبوون و رویان کردە کوردستانی ئێران و تورکیا، لە رۆژانەدا لەبەر بێ‌دەرامەدی ناچاربوون پەنایان بردبوە بەر ئەو خێرخوایانەی کە هەریەکە بۆ ماوەیەک گرتنیانە خۆیان وەکو مەحمود خانی دزلی و مەحمود خانی کانی‌سانان و سمکۆ و شێخانی زەنبیل و ئاغاکانی مەنگور (وەکو لە شوێنی خۆیایدا لە باسی ئاوارەبوونی خێزانەکانا بە دوورودرێژی باسی ئەکەین).

دەربارەی رەوشت و کردار و رەفتاری فیوداڵی کورد بە شێوەیەکی گشتی وەکو لە ولاتانی تریشدا هەر بەو جۆرە بوە و بگرە زۆر خراپتریش بوە نووسەرانی بێگانە، ئەوانەی هاتونە کوردستان چ بە نهێنی و چ بە ئاشکرا لێیان دواون و لە نووسینی ئەوانەدا بۆمان دەرئەکەوێ گەلێک بەسەرهاتی ناخۆش لە نێوانی

فیودالْ و جوتیارانی کوردستان لە کۆنەوە روویداوە.

لە هەندێ ناوچەی کوردستانا جاری واهەبوە دەس رۆیویک ئەگەر تەنها پارچەیەک زەوی لە گوندێکدا بکڕیایە ئیتر وردە وردە ریشەی لەو گوندەدا دائەکوتا و دەمی ئەژەندە کاروباری وردە مالکەکان و دەستی بەسەر گونددا ئەگرت و وردە مالک و رەش و رووتیان ناچار ئەکرد کە خانەبێزار ببێ و وازی لە زەویْ و زارەکەیان ئەهێنا و باریان ئەکرد بۆ ناوچەیەکی تر بۆ ئەوەی لەژێر سایەی ئاغایەک یا بەگێک یا شێخێکدا ببێت بە جوتیار و سەپان و وەرزیر و نیوەکار و هی‌واشیان هەبوە یەکجاری سەری خۆی هەلگرتوە و لە ناو شار و شارۆچکەکاندا بوە بە کرێکار یا شاگرد یا دوکاندار و رێگەیەکی تازەی گرتۆتەبەر بۆ دابین‌کردنی ژیانی خۆی و خاوخێزانی.

لەناو جافەکانا خۆیان دەربارەی دلْرەقی محەمەد پاشای باوکی مەحمود پاشای جاف زۆر شتی لیْ ئەگێڕنەوە...... مەولەوی شاعیر یەکێک بوە لەوانەی کە گلەیی لە محەمەد پاشا بوە بە هۆی ئەو رەفتارەی بەرامبەر بە خزمەکانی کراوە و لە ئەنجامی ئەوەدا مەولەوی باری‌کردوە و لە ناوچەی دەسەلاْتی ئەوا نەماوە. وەکو ئەلێن هەرکەسێک سەرپێچی لەگەلْ محەمەد پاشای جاف داکردبێت لە ناوی بردوە...... عەزیز شاوەیسی سەرۆکی هۆزی (کەرەم وەیس) کە ئەویش هەر تیرەیەک بوە لە جاف، محەمەد پاشا دەرمان خواردی کردوە و کوشتۆیەتی.

خزمەکانی عەزیز شاوەیس یەکێکیان ناردوە بۆ تۆلْەی ئەوە محەمەد پاشای کوشتوە و مەحمود پاشای کوری لەشکرێکی ناردۆتە سەر (کەرەم وەیسی) یەکان کە ئەوسا لە گوندی (بەشارەت)ی نزیک هەلْەبجە بون هەمویان بە جارێک لەو ناوچەیەدا لەناوبراون.

هەندێ لە سەرۆکی پژدەری و مەنگوری و مامش لەگەلْ دەست و پێوەندەکانیانا زۆر دلْرەق بوون هەمیشە گێچەلی سەرانە و سوورانە و بێگاریان پیْ‌کردون. ئەیان گێرایەوە کە ئاغای پژدەری واهەبوە ئەگەر مسکینێکی خۆی بکوشتایە ئەی ووت: (لنگ بزاوتنەکەی خۆشە)......

زیوەر لە یاداشتەکانیا«١٣» دەربارەی مەحمود خانی کانی‌سانان کە یەکێک بوە

لە فیوداڵەکانی ناوچەی مریوان ئەڵێ:

«لەدوای گرتنی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیانا لە ساڵی ١٩١٩دا لەگەڵ خێزانەکانی ماڵی شیخان و دۆستەکانیان بە ناچاری روومان کردە ناوچەی (مەریوان) رۆژێک لە گوندێکی مەحمود خانی کانی سانان [کە لە شێخ بابا عەلیم پرسی ناوی ئەو گوندەی هاتەوە بیر و وتی ناوی (دەرزیان) بو] کە خەڵکەکە توتنیان تیادا کردبوو...... لەوێ لە رەنجبەرێکم پرسی: ئەم گوندە ساڵی چەند بار توتنی ئەبێ؟ لەوە راما و وتی: هیچ! منیش لێم پرسی ئەی ئەو هەمو بەراوانەی کە لەبەرچاون و کراون بە توتن ئەوانە چین؟ وتی هی ئێمە نیە و ئێمە بۆ مەحمود خانی ئەکەین...... کە لێم‌پرسین ئایا حەقە ئاوتان ناداتێ (وابزانم زیوەر لەو پرسیارەیدا مەبەستی ئەوە بوە کە بپرسێ ئایا حەقە ئاودانتان ناداتێ یا حەقە رەنجبەریتان نادانێ...... چونکە توتنەوان خاوەن ئاو نەبوە کە حەقە ئاو بسێنێت) لە وارامدا وتی: ساڵی‌پارهیچی نەداینێ... منیش پێم وت: جا باشە کە هیچتان ناداتێ بۆچی توتنی بۆ ئەکەن؟ وتی: کوێر هەتا ئەمرێ هەر بە تەمای چاوە، پار هیچی نەداینێ...... ئەڵێین بەشکو ئەم ساڵ دڵی نەرم ببێت و رەحمی ببزوێت...... یا بەشکو ئەمە خوایە حاکمێک پەیدابێت کە نەتوانێ ئەم غەدرەمان لێ بکات».

مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا «٥٢» باسی جۆرێکی تری فیوداڵ ئەگێرێتەوە لە ناوچەی چیخریکە (سەڵماس) کە ناوی جەعفەر ئاغا بوە [دوکتۆر مارف خەزنەدار لە وەرگەرانەکەیدا بۆ عەرەبی لە پەراوێزەکەیدا ئەڵێ: لە راستیدا ناوی جەوهەر ئاغا بوە نەک جەعفەر ئاغا] کە برای سمایلخانی شکاک (سمکۆ) بوە...... مینۆرسکی ئەڵێ ئەو جەعفەر ئاغایە جار بە جار لە شاخ ئەهاتە خوارەوە و لە دۆڵەکانا تالاٌنی خەڵکی ئەو ناوەی ئەکرد...... بەلاٌم سەیر ئەوەبو دانیشتوە هەژارەکان بە چاوی خۆشەویستیەوە سەیریان ئەکرد چونکە دەوڵەمەندەکانی تالاٌن ئەکرد و بەشێک لەو تالاٌنی‌یەی بەش ئەکرد بەسەر هەژارانی ناوچەکەدا. وەکو ئەگێرنەوە هەندی فیوداڵی تریش هەبوە وەکو حمەئاغای کۆیە کە لەچاو ئەوانی تردا دڵرەق نەبوە و دەست و پێوەندەکانی رقیان لێ‌نەبوە و تارادەیەک خۆشەویست بوە لایان.

له کوردستانیشدا وەکو له زۆر شوێنی تردا وەنەبێ جۆرەکانی چینی فیوداڵ که بەرودوا هاتوون ئیتر ئەو جۆرەی که تازه پەیدابوه وەنەبێ ئیتر بەوه جۆرەکانی پێش ئەوه لەناوچوو‌بیت...... بۆ نموونه که شێخ مەحمود بو به حوکمدار هێشتا چینی فیوداڵی کۆچەری هەمیشەیی و فیوداڵی نیوه کۆچەری و فیوداڵی خاوەن زەوی و زار هەرسێکیان هەبوون که شێخ مەحمود خۆی له جۆری دوایيان بوه.

مێجرسۆن له گەشته نەهێنیەکەیدا «۳۹» باسی سەرپێچی هەمەوەندەکان ئەکا که چۆن زۆرجار خەتی تەلەفۆنی سلێمانی و کەرکوکیان ئەبری و کاربەدەستانی عوسمانلی زۆر به زەحمەت لەو ناوەدا هات و چۆیان ئەکرد یەکێک لەو هۆیانەی که عوسمانلیی ناچار کرد بایەخ بدا به شێخان ئەوه بو بەشکو به هۆی ئەوانەوه بتوانێ ئەو دەسدرێژیەی هەمەوەندکان بنەبڕ بکات.

مێجوسۆن له باسەکەیدا ئەڵێ: بەوجۆره بازرگانەکان که خۆیان و ماڵی بازرگانیيان بەو ناوانەدا هات و چۆیان ئەکرد کەوتنه ژێر رەحمەتی شێخان و هەمەوەندەوه. مێجرسۆن له پێوەندی و ناکۆکی نێوان فیوداڵی کوردی کۆچەری و فیوداڵی نیشتەجێبووی خاوەن زەوی و زاردا باسی ناکۆکی نێوان ئەردەلاّنیەکان و جافەکان ئەهێنیتەوه به نموونه که چۆن هەندی له جافەکانی ناوچەی (جوانرۆ) ناچارکران شوێنەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن پاش ئەوەی که ئەردەلاّنیەکان سێ کوری سەرۆکی جافیان کوشتبوو.

ئەو جافانه ئیتر به ناچاری هاتن بۆ دیوی دەسەلاّتی خەلیفەی عوسمانلی (بەو جافانەی که له ناوچەی جوانرۆوه هاتن پێیان ئەڵێن جافی مرادی چونکه ئەو هاتنەیان له کاتی سولتان مرادی عوسمانلی دابوه و ئەو بوو رێگەی هاتنی دان که بێن بەم دیودا و پیرەمێردی شاعیر لەو شیعرەیدا که بۆ رووخاندنی کۆماری مەهابادی وتوه باسی ئەو عێلی مرادیيەی کردوه) .

بەلاّم جافەکان و ئەردەلاّنیەکان پاش ماوەیەک لەگەڵ یەکتردا ئاشت بوونەوه و وەسمان پاشای جاف (عەدلەخان)ی له بنەماڵەی ئەردەلاّنیەکان مارەکرد. حکومەتی عوسمانلی بەو ئاشت بوونەوەیه و بەو مارەکردنه سەغلەت بوون و زۆریان پێناخۆشبوو چونکه ئەیان ویست عەشایرەکانی کورد- به تایبەتی ئەو دوولا بەهێز و گەورەیەی که هەریەکەیان لەم دیو و ئەو دیوی سنووری

دەسەلاّتی عوسمانلی و عیّراقدا بوون حەزیان ئەکرد هەمیشە لەناوخۆیانا نارێکبن.

لە راستیدا درێژەپێدان بە باسی چۆنێتی پەیدابوونی فیودالّی خاوەن زەوی و زاری نیشتەجێ بوو باسێکی زۆر دور و درێژە و ئەتوانین بلّێین چینی فیودالّی خاوەن زەوی و زار زۆر دەمێکە لە کوردستاندا پەیدابوە و بەر لە دەولّەتی عوسمانلی لەناو زۆربەی ئەمارەتەکانی کوردی کۆندا هەبون کە شەرەفخانی بەدلیسی لە (شەرەفنامەدا و ئەمینی زەکی بەگ لە بەرگی دووهەمی کورد و کوردستاندا کە بۆ ئەمارەتەکانی کوردی تەرخان کرد وە لەگەلّ ئەوانەی حوسێن حوزنی مۆکریانی و نووسەرانی تر باسی فیودالّی خاوەن زەوی و زار و کۆشک و قەلاّ و دیوەخانەکانیان کردون.

# دوهەم- چینی بورجوازی و پارەدار و بورجوازی بچووک

هەر لە زەمانی ئەمارەتە کۆنەکانی کوردەوە، بازار و بازرگانی و پارەدارێتی و خاوەن مانیفاکتۆری بچووک لە ناو شار و شارۆچکەکاندا هەبوە، هەتا رادەیەک ئەو بازرگان و خاوەن مانیفاکتۆرانە توانیویانە پێویستیەکانی خەڵکی ئەو سەردەمە بەکێش بکەن بە نیازی کڕین و فرۆشتنی وەیا دروستیان بکەن.

پارەداری کورد و بازرگانەکان لە چاو پارەدار و بازرگانی وڵاتانی تردا زۆر لەڕ و لاواز بوە و نەی‌توانیوە لە کاتی خۆیدا وەکو چینێکی ئاشکرای بەهێز کە پێ‌ی بوترێ چینی بورجوازی یا سەرمایەدار خۆی دەربخات و بگرە هەتا ئێستەش لە ژمارەیەکی کەم بەولاوە نەیان توانیوە پێ‌بنێنە ئەو قۆناغەوە. لە وڵاتێکی دواکەوتوی وەکو کوردستاندا کە پیشەسازی و کشتوکاڵ و هێنانە بەرهەمی خۆ وڵاتی لە سنوورێکی تەسکدا بوە و رێگەی ئەوەی نەداوە چینێکی سەرمایەداری ئەوتۆ هەبێت کە بتوانێت بە هۆی کەڵەکەکردنی سەرمایەوە چینێکی دەسەلاتداری سەرمایەدارێتی پەیدابیێت کە وای لێ بێ بچێتە کۆری مەیدانەوە و لە توانایدا بیێ بەربەرەکانی دەسەلاتی فیودالی هەبێت.

بەر لە شەری جیهانی یەکەم و لە کاتی تەواوبوونی شەڕ لە خوارووی کوردستانا بە دەگمەن بازرگان و پارەداری واهەبوە کە پێوەندی‌یان بە پارەدار و بازرگانی دەرەوە بە شێوەیەکی فراوان هەبێت لە کاتێکدا بازرگان و سەرمایەدارانی وڵاتانی پێشکەوتوی ئەوروپا بە تایبەتی لە دوای تەقینەوەی بەرهەمی پیشەسازی کەوتنە خولیای دۆزینەوەی بازاری نوێ بو ساغ‌کردنەوە و فرۆشتنی کالاْ و بەرهەمەکانیان لەو بازارانەدا و بۆ ئەوەی کەرەسەی خاوی هەرزان و مفتی وڵاتە پاشکەوتوەکان بە کێش بکەن بۆ وڵاتی خۆیان کە روودان و هەلگیرساندنی شەری یەکەمی جیهانی خۆی لە خۆیدا لە ئەنجامی ئەو بین و برکێ و پەلاماردانەدا رویدا کە هەر دەولەتەی بەجیا هەولی ئەدا دەست بەسەر

زۆر زۆرترین شوێنندا بگرێت و ماوەیەک بوو کاربەدەستان و سیاسەتمەدارانی وڵاتە سەرمایەدارەکان کەوتبونە خولیای دززینەوەی ئەو بازارانە کە کوردستان بەشێک بوە لەو شوێنانەی چاویان تێبڕیوە و بوونی نەوت لە کوردستاندا هۆیەکی زۆر گرنگ بوە کە بایەخ بە خاکی کوردستان دراوە.

بە کورتی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی لە کوردستانی خوارووداا چەند خێزان و بنەماڵەیەکی کەم هەبوە کە بە پارەدار ناسرابون. لە سەردەمی گەنجی و لاوێتی ئێمەمانا لە سی و چلەکانا ئەمان بیستەوە لە زەمانی عوسمانلیدا فلانەکەس لە فلان بنەماڵە ئەوەندە کیسە (تارانی) یا (چەرخی) هەبوە و بە دەگمەن هەبوە کە پێی بوترێ چەند کیسەیەک لیرەی هەبوە.

لە زەمانی شێخ مەحمودا کە بوو بە دەسەڵاتدار و بە حوکمدار لە ناوچەی سلێمانی و دەوروبەریا چەند بازرگان و بنەماڵەیەک هەبوە کە ناسراوبون و تارادەیەک خاوەن زەوی و زاری ناو شار و دوکان و پارەداربون. کێشە لەناو ئەو بنەماڵانە و بنەماڵەی شێخان و بنەماڵەکانی تردا (کە لە شوێنی خۆیدا و لە بەشی پێوەندی بنەماڵە شێخان بە بنەماڵەکانی ترەوە لێی ئەدوێین) لایەک لە نارێکی و بێبرکێی ئەو سەردەمانەمان بۆ دەردەخات کە هەرلایە بۆ خۆی ویستویەتی پێوەندی لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانلیدا و لە دوای ئەوەش لەگەڵ کاربەدەستانی میریدا بەهێز بکەن......

لە باسی باری ئابووری و بازرگانی و پیشەسازیدا باسی ئەو جۆرە بازرگانی و کاسپیانە ئەکەین کە بەر لە شێخ مەحمود و لە سەردەمی دەسەڵاتی شێخ مەحمودا لەو ناوچەیەدا باوبوون.

# سێهەم: چینی کرێکار و جوتیار و ڕەنجبەر

لە کۆنەوە لە کوردستانا شان بە شانی چینی فیودالی دەس‌ڕۆیو لەناو گوندەکانا هەندێ وردە مالک هەبوە کە پارچەیەک زەوی و زاریان پشتاوپشت لە باووباپیریانەوە بۆ مابوەوە و دەستاودەستی کردبو، هەبوو بەشەکەی خۆی ئەفرۆشت یا هی‌تری لە خەلکی‌تر ئەکریەوە ئەوەی بەشەکەی خۆی ئەفرۆشت وازی لە جوتیاری ئەهێنا ڕووی ئەکردە شار و شارۆچکەکان و لەوێ دەستی ئەکرد بە کاسبی یا ئەبو بە کرێکار و بە دەزگیر، هی‌واش هەبوو ئاغا و فیودالی دەس‌ڕۆیوی ناوچەکەی چاوی ئەبریە زەوی و زارەکەی و ناچاری ئەکرد و بێزار ئەبوو ئەو پارچە زەویەی کە هەیبو لە دەستی دەرئەهێنرا و یا ڕووی ئەکردە شار و شارۆچکەکان یا ڕووی ئەکردە گوندی ناوچەیەکی تر لەوێ ئەبوو بە ڕەنجبەر و وەرزێر و سەپان لای ئاغا و خاوەن زەوی و زارێکی‌تر...... بێگومان وەکو لە باسی فیودالدا لێی دواین بەپێی سروشتی چینایەتی وردە مالکی کوردی دەست و پێ سووتاو ناچاربوە ئەرکی بیگار و سەرانە و سوورانەی فیودال بگرێتە خۆی و زۆرجاریش ناچاربوە قەرز و قۆلە و سەلەم لە بازرگان و چەرچی‌ی ناو شارەکان وەربگرێ کە ئەمە زۆر کەوتوە لە سەری و هەموو سالێک ماپە پووچ دورچوە و بە سکێک تێر بوە و بە سکێک برسی بوە. لە بیرم دێ جارێک لە سلێمانی لە مەحکەمەیەکدا لە نێوانی بازرگانێکی حاجی‌ی سوودخۆردا لەگەل کابرایەکی جووتیاری ڕەشورووت، کابرای جوتیار لەبەردەمی حاکمدا سێ‌بەسێ تەلاقی خوارد و وتی: چوار سالە پارەم لەم حاجیە وەرگرتوە بە قەرز بۆ کرینی جووتێک گا و ئەمە چوار سالە هەموو سالێک بەقەدەر پارەی قەرزەکەی خۆی ئەدەمەوە و کەچی قەرزەکەی هەر لە شوێنی خۆیەتی و سەرەرای ئەوە هێشتا ئەوهاتوە شکاتم لێ‌دەکات!

بەو جۆرە ئەبینین لەناو گوندەکانی کوردستانا ژمارەیەکی زۆر جوتیار و سەپان و ڕەنجبەر هەبوە کە وەکو کرێ گرتەیەک لای خاوەن مولک، جوتیاری و

ڕەنجبەری‌یان کردوە و زۆریان بە شوێنێکی تایبەتیەوە نەوەستاون و زۆرجار ناچارکراون و شوێن و گوندەکەی خۆیان بەجێ بهێڵن و لە ئەنجامی ئەوەدا دێهاتی ناو کوردستان خانوەکانی بریتی بوە لە شوێنێکی کاتی و ئەو کرێکار و ڕەنجبەرانە دڵیان بەو شوێنە خۆش نەبوە کە بیر لە دروستکردنی خانویەکی پاک و ڕێک بکەنەوە و زۆرجار کە تەنگەتاوبون وازیان لە کشتوکاڵ هێناوە و ڕوویان کردۆتە شارەکان و بە کولەمەرگی ژیانی خۆیان دابین کردوە.

کە شێخ مەحمود بو بە حوکمدار ئەوە بۆ تازە شەری یەکەمی جیهانی تەواو بوبو خەڵکەکە بە تایبەتی ڕەشە خەڵکەکە زۆر پەریشان و سەرگەردان بون و تۆوی تۆ و ئاسایی دەس‌نەدەکەوت بۆ چاندنی مەزرا و کێڵگەکان و وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین. ئینگلیزەکان ئەو هەلۆیست و بارەیان قۆزتەوە و توانیان بە هۆی هەندێ سەرەک عەشیرەتی کوردەوە ئەو ڕەشورووتە بدەنە پاڵ سەرەک عەشیرەت و دەرەبەگەکان و لە شێخ مەحمودی بکشێننەوە لەگەڵ ئەوەشدا چەکدارەکان و پێشمەرگەکانی شێخ مەحمود بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ کەس کە ڕاستە تا ڕادەیەک لە سەرەتادا هەندێ سەرکردە و فیوداڵ لایەنیان گرت هەتا ئەو سەردەمەی کە بۆیان دەرکەوت ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان ناوێ ئیتر هەموو لێ‌ی تەکینەوە بەڵام ژمارەیەک لە جووتیار و ڕەنجبەرانی ناوچەی شارباژێر و پێنجوین و قەرەداغ و گەرمیان هەتا شەری ئاوبارکیش لەگەڵیان مانەوە.

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا ئەڵی:«٣»

لە دوای ئەوەی هێزەکانی شێخ مەحمود ناچارکران بە هۆی فرۆکەی ئینگلیز و بۆمباباران و تۆپ بارانەوە ئەو ناوە چۆڵ بکەن و لە ئەشکەوتی (جاسەنە) ڕووبکاتە چیاکان، کە گەیشتینە سەر (کەلی دابان) گوێم لە دەنگی کابرایەکی سواربوو بە ئای ئای بە سۆز ئەی وت:

ئەی خوای بانیسەر کوشندەی هەژار تاکەی ئەمانکەی لە گیانمان بێزار
بۆچ نیە لە دنیا بێکەس‌تر لە کورد خۆتی پێ‌بناسیت وەها دەست و برد

ئەحمەد خواجا ئەلێ کە چوومە پێشەوە و لێی نزیک بوومەوە لێم‌پرسی کاکە تۆ خەڵکی کێی؟ لە وەرامدا وتی: ناوم حەمە کوردەی مزگەرە و ماڵمان نزیکی گەرەکی جوولەکانە لە سلێمانی......

جگە لەو حەمە کوردەی مزگەرەی کە ئەحمەدخواجا باسی کردوە، شارەزایانی ئەو رۆژە هەندێ جار بۆیان باس ئەکردین کە خۆشەویستی شێخ مەحمود بەناو رەشورووت و رەنجبەر و جوتیارانی کوردا زۆر زۆرتربوو وەک لای دەرەبەگ و بازرگان و پارەدارەکان و زۆریان هەتا شێخ مەحمود کۆڵی نەدا ئەوان دەس‌بەرداری نەبوون و وازیان نەهێنا......

باشترین نموونە بۆ دەربرینی هەست و هۆش بۆ بەراووردکردنی ژیانی فیوداڵی ئەو سەردەمانە و چینی جووتیار و رەنجبەری چەوسێنراو و ئەم پارچە پەخشانەی پیرەمێرد بلاوئەکەینەوە کە لەدیوانەکەیەوە لاپەرە (٥٦) دا بلاْوکراوەتەوە و لە کاتی خۆشیدا بەرلەوە لە گۆڤاری (گەلاوێژ) دا بلاْوکراوەتەوە:

- موناجاتی ئەرواح-

*هەڵسە وورِیابەرەوە خۆشەویستەکەم، لە خەو هەستە، وارۆحم بانگت ئەکات! لە کوێوە؟...... لەوپەری سەرمەدەوە، لە شاخێکی بڵند و داخێکی بێ‌سنوورەوە، بۆیە واسەرکەوتووم کە دەنگم بتکا تێ‌دایە گیان......*

*توخوا گوێت لێم بێ و منیش گوێم لێت بێ، رۆڵەی هەژارت نزیکە شێت بێ...... ها ئێستە دەنگم بیستی...... لە خۆشیانا لەسەرخۆم چووم، پەری پەڕی باڵی تێ هەڵسووم و هوشیار بوومەوە، داپەڕیم بەناو ئەو درەختانەدا رامکرد، پێ‌خاوسم، پێم و جلەشڕەکانم بە نمی ئاونگ تەڕبوە، وام لەبن دار بەروویەکدا، چۆن بە چاوی خۆم ئەبینم خوا لە جەوت کلاْوی بۆ بەڕوو کردوە، وابەگۆزێی خۆم گوێم لە دەنگتە ئەڵێی واهاتم!......*

*تۆ هەربڵێ: (دێم، بەخوا نایەیت، بەلاْم هیچ نەبێ بدوێ، دایەگیان توخوا بدوێ، دووریش بێت شەماڵ دەنگت دێنێت و دەی‌بیەم، وام بە شاخی (گمۆ) وە، وەک یاران بە (دالاْهۆ) وە، شەوەتاریکە، زیندەوەرم لێ‌تەریکە، لە دوورەوە روحم لەگەڵتا خەریکە، جانەوەر خزاونە ناو لانەوە، چرای ئاوەدانی کوژاونەوە، هەرمن، هەر تەنها من نەنوستووم، شەوبێدارم، ناڵەکارم، پڕ دەردوقارم، گوێم لە*

دەنگتە بدویێ، شارخامۆشە، سەراودێکی بە چارشێوێکی خُمی غەم، بە تویژالێکی دوباوی ئەستوری ئەم سیاپۆشە، فەقیر و هەژار کفتە کەوتەیە بێهۆشە!! دەوری منیش توتنەوان، لەبەرشان و قۆلٚکوتان پرخەی دێت، ژنەکەشی پەلی لە کەمەی بێشکە هەلٚکێشاوە، خۆی لەبرسابێ شیر، منالی بەلایە لایە بۆ ژیر نابێت، هێزی ڕاژەندنی نەماوە، و ملیشی کەوتۆتەلاوە.

دایەگیان!! ئەمە دراوسێکانی (گمۆ)م، والەو بەریشەوە بەری گردەشێن و سوورکێو دەبینم، تروسکەی ئاگرێ دیارە و دەنگی دەستارێکیش دێت، مێرد لە بیگار هاتۆتەوە، برسی‌یەتی، ژنەکەی هەلٚساوە کەردڕ ئەهارێت و ئەیکات بە خەپلە...

ئۆف وەرە بەم شەوە کەردڕ بهارە و بێشێلە و بیکە بە خەپلە!! میرد کە تێری خوارد بەلادا بنوێت، منالی بگری، سبەینێش زوو هەلٚسە گەوڕ بماڵە، ئۆف لەم حالٚە!!

ئاسمان پەردەیەکی زەربەفتی لە شەوقی مانگەشەو تەنی و کێشای بەسەر گمۆدا تاکو لەپێش چاوی ئاغایان شیرین بێت، شەماڵ شنەیەکی پڕ لە بۆنی گوڵ و وەنەشەی هێنا، دای بە بەر کەپر و ساباتی کەلٚەمێرداندا بۆ ئەوەی مێشولەیان لێ‌نەنیشێت، ئەستێرەی سیوەیل لەسەر سیوەیل کوژایەوە، شەوگەردی زۆرداران و گوناهی بەدکاران شاردایەوە، دەنگی بلوێرولاوکی سەحەری سیرەی سەماوە، لەلایەک، دەتووڵەباب هەستە ئەورۆ هەرەوەزە لەلایەک، بە هەردووکیشیان ئەلێن گوزەران.

ئەحمەد خواجا ئەڵێ کە چوومە پێشەوە و لێی نزیک بوومەوە لێمپرسی کاکە تۆ خەڵکی کێی؟ لە وەرامدا وتی: ناوم حەمە کوردەی مزگەرە و ماڵمان نزیکی گەرەکی جوولەکانە لە سلێمانی......

جگە لەو حەمە کوردەی مزگەرەی کە ئەحمەدخواجا باسی کردوە، شارەزایانی ئەو رۆژە هەندێ جار بۆیان باس ئەکردین کە خۆشەویستی شێخ مەحمود بەناو رەشورووت و رەنجبەر و جوتیارانی کوردا زۆر زۆرتربوو وەک لای دەرەبەگ و بازرگان و پارەدارەکان و زۆریان هەتا شێخ مەحمود کۆڵی نەدا ئەوان دەسبەرداری نەبوون و وازیان نەهێنا......

باشترین نموونە بۆ دەربرینی هەست و هۆش بۆ بەراووردکردنی ژیانی فیودالی ئەو سەردەمانە و چینی جووتیار و رەنجبەری چەوسێنراو و ئەم پارچە پەخشانەی پیرەمێرد بلاوئەکەینەوە کە لەدیوانەکەیەوە لاپەرە (٥٦) دا بلاوکراوەتەوە و لە کاتی خۆشیدا بەرلەوە لە گۆڤاری (گەلاوێژ) دا بلاوکراوەتەوە:

- موناجاتی ئەرواح-

*هەڵسە وورپابەرەوە خۆشەویستەکەم، لە خەو هەستە، واڕۆحم بانگت ئەکات! لە کوێوە؟...... لەوپەری سەرمەدەوە، لە شاخێکی بڵند و داخێکی بێسنوورەوە، بۆیە واسەرکەوتووم کە دەنگم بتگا تێدایە گیان......*

*توخوا گوێت لێم بێ و منیش گوێم لێت بێ، ڕۆڵەی هەژارت نزیکە شێت بێ...... ها ئێستە دەنگم بیستی...... لە خۆشیانا لەسەرخۆم چووم، پەری پەڕی باڵی تێ هەڵسووم و هوشیار بوومەوە، داپەڕیم بەناو ئەو درەختانەدا رامکرد، پێخاوسم، پێم و جلەشڕەکانم بە نمی ئاونگ تەڕبوە، وام لەبن دار بەروویەکدا، چۆن بە چاوی خۆم ئەبینم خوا لە جەوت کلاوی بۆ بەڕوو کردوە، وابەگوێی خۆم گوێم لە دەنگتە ئەڵێی واهاتم!......*

*تۆ هەربڵێ: (دێم، بەخوا نایەیت، بەلام هیچ نەبێ بدوێ، دایەگیان توخوا بدوێ، دووریش بێت شەماڵ دەنگت دێنێت و دەیبیەم، وام بە شاخی (گمۆ) وە، وەک یاران بە (دالاهۆ) وە، شەوەتاریکە، زیندەوەرم لێتەریکە، لە دوورەوە روحم لەگەڵتا خەریکە، جانەوەر خزاونە ناو لانەوە، چرای ئاوەدانی کوژاونەوە، هەرمن، هەر تەنها من نەنوستووم، شەوبێدارم، ناڵەکارم، پڕ دەردوقارم، گوێم لە*

دەنگتە بدویٚ، شارخامۆشە، سەراودێکی بە چارشێوێکی خُمی غەم، بە تویژالێکی دویاوی ئەستوری ئەم سیاپۆشە، فەقیر و هەژار کفتە کەوتەیە بیٚهۆشە!! دەوری منیش توتنەوان، لەبەرشان و قۆلٚکوتان پرخەی دیٚت، ژنەکەشی پەلی لە کەمەی بێشکە هەلٚکێشاوە، خۆی لەبرسابیٚ شیر، منالی بەلایە لایە بۆ ژیر نابیٚت، هیٚزی ڕاژەندنی نەماوە، و ملیشی کەوتۆتەلاوە.

دایەگیان!! ئەمە دراوسیٚکانی (گمۆ)م، والەو بەریشەوە بەری گردەشێن و سوورکێو دەبینم، تروسکەی ئاگریٚ دیارە و دەنگی دەستارێکیش دیٚت، میٚرد لە بیگار هاتۆتەوە، برسی‌یەتی، ژنەکەی هەلٚساوە کەردڕ ئەهاریٚت و ئەیکات بە خەپلە...

ئۆف وەرە بەم شەوە کەردڕ بهارە و بیٚشێلە و بیکە بە خەپلە!! میرد کە تێری خوارد بەلادا بنوێت، منالی بگری، سبەینێش زوو هەلٚسە گەوڕ بمالە، ئۆف لەم حالە!!

ئاسمان پەردەیەکی زەریەفتی لە شەوقی مانگەشەو تەنی و کیٚشای بەسەر گمۆدا تاکو لەپیٚش چاوی ئاغایان شیرین بیٚت، شەمالٚ شنەیەکی پڕ لە بۆنی گولٚ و وەنەشەی هیٚنا، دای بە بەر کەپر و ساباتی کەلٚەمیٚرداندا بۆ ئەوەی میٚشولەیان لیٚنەنیشیٚت، ئەستیٚرەی سیوەیل لەسەر سیوەیل کوژایەوە، شەوگەردی زۆرداران و گوناهی بەدکاران شاررایەوە، دەنگی بلویٚرولاوکی سەحەری سیرەی سەماوە، لەلایەک، دەتوولەباب هەستە ئەورۆ هەرەوەزە لەلایەک، بە هەردووکیشیان ئەلٚێن گوزەران.

# باری ژیان لە خوارووی کوردستاندا

یەکێک لەو شتانەی کە پێویستە نووسەر روونی بکاتەوە دەربارەی شۆرشی میللەتێک یا مێژووی میللەتێک بە شێوەیەکی گشتی بێ یا باسی قۆناغێک لە قۆناغەکانی، بریتیە لە شی‌کردنەوەی ژیانی کۆمەلأیەتی و ئابووری و ئاینی و رۆشنبیری ئەو میللەتە لەو سەردەمەدا، چونکە ئەوانە هەریەکەیان ئاوێنەیەکی بالانمای ئەو رۆژانەن کە روونی ئەکەنەوە ئەو میللەتە چۆن و بۆچ پێشکەوتوە یاخود بۆچی تووشی نووچدان و هەرەس و ماڵ‌کاولی بوە و بۆچی لە کاروانی گەلان دواکەوتەوە.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە بیخەینە بەرچاوی خوێندەوارانی خۆشەویست ئەوەیە کە ساتێک شێخ مەحمود بوو بە دەسەلاتدار لە ناوچەی سلێمانی‌دا و دووجار بوو بە حوکمدار و مەلیک، هەردوو جارەکە بە هۆی گەلێک هۆی ناوخۆ و لاوەکی دەرەوە، ئەو هەموو تەقەلاو تێکۆشان و شۆرشانەی شێخ مەحمود و هاوکارەکانی لەو رۆژانەدا کوردی نەگەیاندە ئەنجام و گەلێک رووداوی تاڵ و ترش و ناخۆشی لە دوارۆژدا لی‌پەیدابو، کە هەتا ئیستەش ئێمە هەر لە ژێرباری سەرنەگرتنی ئەو تەقەلایانەدا دەنالێنین.

کە شێخ مەحمود بوو بە حوکمدار و ئالای شۆرشی هەڵکرد و داوای مافی میللەتەکەی کرد، ئەو داواکاری و تەقەلادانە بۆ سەرگرتنی ئەو ئاواتانەی کورد و چەسپاندنی ئەو دام و دەزگایەی کە خۆی و هاوکارەکانی دایان مەزراندبوو شتێکی ئاسان نەبوو، چونکە بەو دەرامەتە کەمەی کە هەبووە و بەو کەرەسانەی کە لەو رۆژانەدا لەبەر دەستدابوە لە تواناداا نەبوە هێزێکی بەرگری‌ی چەکدار و دەزگایەکی رێکوپێک و جەماوەرێکی یەکگرتووی ئەوتۆ پێک بهێنرێت کە لەتوانا دابێ زەمینەیەکی پتەوی قایمی ئەوتۆ خۆش بکرێ کە وەکو بناغەی ژێرخانێکی تازە دارێژراو بەرگەی قورسایی سەرخانەکانی تر بگرێت...... بۆیە لێرەدا بە پێویستم‌زانی بەپی‌ی بۆچوون و پەنابردنەبەر ئەو سەرچاوانەی کە لە

بەردەستمدایە بە شێوەیەکی کورت باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئاینی و رۆشنبیری ئەو سەردەمە باس بکەم بۆ ئەوەی هەلیان سەنگێنین و بزانین بار و هەڵوێستی ئەو رۆژانە تا چ رادەیەک لە باربوە بۆ چەسپاندنی دەزگایەکی دەسەلاتداری سەربەخۆ لە خوارووی کوردستان دا وەیا بزانین کە ئەو دەزگایەی کە خۆی نەگرت و هەرەسی‌هێنا هۆی ئەو هەرەس‌هێنان و ڕوو چوونە چی‌بوە......
وەئایا ئیمرۆش لە پاش سالەهای سال بەسەر ئەو رووداوانەدا هێشتا بار و هەڵوێست هەر وەکو خۆی ماوە یا نا؟!!
زۆر باش ئەزانین کە میللەتانی تریش مێژووی خەبات و تێکۆشان و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئاینی و رۆشنبیری رابوردویان لە رێگای ئەو یاداشت و تۆمارکراوانەوە ئەنوسنەوە و بلاوی ئەکەنەوە و کە لە باوو باووباپیرانیانەوە بۆیان بەجێ‌ماوە. بەلام بەداخەوە باووباپیرانی ئێمە وەکو لە زۆرشتی تریشدا کەمتەرخەمی‌یان کردوە، لەمەشدا کەمتەرخەم بوون و خستویانەتە پشت‌گوێ و دیارە هەموو خولیا و سەودایەکی ژیانیان تەنها ئەوەبوە لە کونجی مزگەوت و خانەقا و تەکیەکانا گوشەگیربون و خۆیان هەڵگرتوە بۆ بەهەشتی دوارۆژ و هیچ بایەخێکیان نەداوە بە دنیا کە بەمە لە زۆر میللەتانی‌تر دواکەوتووتر بوون و لە هەڵپەی نان پەیداکردنی رۆژانە بۆ خۆیان و خاوخێزانیان بەولاوە بیریان لە دنیا و لە دوارۆژ و لە پێک‌هێنانی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووتر نەکردۆتەوە.
ماوەی قۆناغی کوچەرایەتی لە کوردستاندا وەکو لە پێشتردا باسمان کرد ئەوەندە درێژخایەن بوە بە جۆرێک لە کاتێکدا کە میللەتانی تر خەریک بون ئەگەیشتنە چلەپوپەی قوناغی دوای کۆچەرایەتی و وەکو قۆناغی فیوداڵ و سەرمایەدارێتی و بازرگانی، کورد هێشتا لەو کاتانەدا هەر کۆچەری بوە. ئەو رۆژانەی کە شۆرشی پیشەسازی و پەرەسەندنی بازرگانی و کرین و فرۆشتنی کالاو کەرەسەی خاو لەناو بازارەکانی جیهاندا بە لێشاوبوو، هێشتا کوردی کۆچەر لەناو دۆڵ و دەربەند و لاپالی چیاکانی کوردستاندا زۆربەیان دوور لە شارستانێتی و دوور لە گۆرانی باری ژیان و زۆر دواکەوتوانە گوزەرانیان ئەکرد و ئاگایان لە دنیا نەبوە چ باسە!، سامەگەر تاک و لۆکەیەکی خواپێداو بیری لە خوێندەواری کردۆتەوە یا یەکێکی خاوەن پەز و مەڕومالات کالە و پیتاوی

بەستوە و بە سواری ولاغ رووی کردۆتە مەکە و مەدینە بۆ ئەوەی پیٚی بلیٚن بوە بە حاجی و لەو ریٚوبانی هاتوچۆیەیدا ژیانی پیٚشکەوتوو تری لە ژیانی ئەوەی ناوچەکەی خۆی دیوە، یا ئەوانەی بەروبوومی مەڕومالاٌتیان بردۆتە ناو شار و شارۆچکە کە مەکانی کوردستان لەو شویٚنانەدا ژیانیٚکی خۆشتر و لەبارتر و پوختەتر و گوزەرانیٚکی بە ئارامتری بینیوە، ئەوانی‌تر هی‌وا هەبوە لە هەموو ژیانیانا شاریٚکی نەدیوە.

ئیمرۆ بۆ باسیٚکی تیر و تەسەل دەربارەی ژیانی کۆمەلاٌیەتی ناو کوردەواریی سیٚ چوار پشت لەمەوبەر ناچارین پەنا بەرینەبەر ئەو سەرنج و یاداشت و نوسینانەی گەرۆکە بیٚگانەکان دەربارەی کوردستان نوسیویانە لەگەلٌ هەندیٚ لەبەرهەمی شاعیران و ئەو فۆلکلۆر و چیرۆک و قسەی نەستەق و پەندی پیٚشینانەی کە تاقە سامانیٚکی رەسەنی میللەتی کوردن کە شانازی پیٚوە بکەین و ئەوانە وەکو کەرەسەیەک پەنایان ئەبەینەبەر بۆ ئەوەی سوودیان لیٚوەربگرین.

یاداشتەکانی مەلامەحمودی بایزیدی (١٩٧٩-١٨٥٨م) کە بەناوی (عادات و رسوماتنامەی کورد)ەوە تۆماری کردوە تارادەیەک هەندیٚ شتی رەسەنی ئەو سەردەمەی تیادایە، جگە لەوە شەرفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی و گەنجینەی مەردانی زیوەر و تیٚگەیشتنی زانستی‌ی دوکتۆر کەمالٌ مەزهەر «٥» کە دەربارە قۆناغیٚکی گرنگی رۆشنبیری کوردی نوسیوە جگە لە کتیٚبەکەی دوکتۆ عەبدولرەحمان قاسملو «١٦» کە بایەخیٚکی زۆری داوە بە باری ئابووری کوردستان و نوسینەکانی فوئاد حمە خورشید دەربارەی جوگرافیای کوردستان و زنجیرەکانی رشتەی مرواری عەلائەدین سجادی و پەندەکانی پیرەمیٚرد و گەلیٚک نوسین و باسی نووسەرانی‌تر کە لەم دواییەدا بلاٌوکراونەتەوە سەرچاوەی بەنرخن لەم روەوە.

نووسەرانی بیٚگانە هەریەکەیان بە جۆریٚک دەربارەی ژیانی ناوچەیەکی کوردستان سەرنج و یاداشتی خۆیان تۆمار کردوە و بلاٌوکردۆتەوە.

گەشتەکەی (ئەولیا چەلەبی) بە تورکی و ئەوەی (حەسەن عرفە) و گەشتەکانی ریچ و فرایزەر و مینۆرسکی و سۆن و ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایان و نووسەرانی روسیا، ئەوانە ئیمرۆ لەو سەروچاوانە ئەژمیٚردریٚن کە پەنایان

ئەبریتەبەر بۆ نووسینی باسێکی وائەگەرچی هەندێکیان- بەتایبەتی ئەوانەی میسونیرەکانی ئینگلیز و ئەلمان و فەرانسە نووسیویانە پیاو ئەبێ سڵیان لێبکاتەوە و هەمووی بەراست دانەنرێت. باشترین هەڵسەنگاندنی ژیانی کوردەواری لەم چەند دێرەی ئەرنۆلد وێڵس «٣٧»دا دەرئەکەوێ کە ئەڵێ:

«ئەتوانرێ کورد بە باشترین نموونەی عونصری بەشەر دابنرێت لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا و لە زۆر رەوشتیانا لە ئەفغانی‌یەکان ئەچن...... لە ناوچە شاخاوی و دۆڵە قووڵەکانا ئەژین کە هەتا ماوەیەکی زۆر سەربەخۆ بوون و دووربوون لە دراوسێکانیان و لەم دنیایە دوورەپەرێز وەستابون و پێوەندی‌یان بە کەسەوە نەبوە».

بۆ ئەوەی دەربارەی ژیانی خوارووی کوردستان بدوێین ئەتوانین ئەم باسە بکەین بەم بەشانەی خوارەوە:

١- باری کۆمەلایەتی
٢- باری ئابووری و پیشەسازی و بازرگانی
٣- باری ئاینی
٤- باری رۆشنبیری و خوێندەواری

## ١- باری کۆمەڵایەتی لە خوارووی کوردستاندا

لە سەردەمی قۆناغی کۆچەریتیدا، ژیانی خێلایەتی ژیانێکی ئێکجار سەخت و تاڵ بوە و کۆچەر نەی‌توانیوە بە تاقە ناوچەیەکەوە بگیرسێتەوە، بەلکو ناچاربوە بۆ تێرکردنی مەڕوماڵاتەکەی بەپێ‌ی وەرزی ساڵ و گۆڕانی گەرما و سەرما بە دوای شوێنی لەوەڕ و پووش و پاوەنا گەرمیان و کوێستان بکات.

لە زستاندا کە کوێستانەکان سارد ئەبوون و گێژی کریوە و کلیلەی کاوان رێگەی هاتوچۆی ئەبری، ئیتر خاوەن مەڕوماڵات ناچار ئەبوو بارگەوبنەی بپێچێتەوە و رووبکاتە گەرمە سێر و پێ دەشتەکان. بەوجۆرە ژیانی کۆچەرایەتی هەمیشە لە جووڵە و بزووتن‌دا بوە و نەی‌توانیوە لە شوێنێکی هەمیشەییدا چاوگە خانویەک بۆخۆی دروست بکا بۆ ئەوەی ئارامی تیا بگرێ و بەپێ‌ی ئەوەش ژیانی کۆمەڵایەتی و دراوسێتی و پەیدابون و فراوان بوونی شار و شارۆچکەکان لە سنوورێکی زۆر تەسکدابوە و ئەوەش کە هەبوە زۆر بچووک و دواکەوتووبوە و پێوەندی نێوان خەڵک چوارچێوەکەی بە زۆری بریتی بوە لەو کەسانەی کە دەوارەکانیان لێکەوە نزیکی بوە و تەنها خزمایەتی و کەسایەتی و هاوعەشیرەتی لێکی نزیک کردونەتەوە و بە زۆری دوربون لە پێک‌هێنانی شارستانیەتیەکی بەرفراوان و لە پێک‌هێنانی کۆمەڵگایەکی پان و بەرین لە خوارووی کوردستاندا هەروەکو شوێنەکانی تری کوردستان، ژن و پیاو پێکەوە هاوبەشی‌یان کردوە...... پیاو خەریکی مەڕوماڵات لەوەراندن و سەرپەرشتیکردنی هەوار و هەوارگە سازکردن و بردنی بەرهەمەکان بوە بۆ ئاڵوگۆڕیان بە پێویستی‌تر وەکو نوێن و کەل و پەل و جل و بەرگ یا بە فرۆشتنیان بۆ کرینی هەندێ شتی‌تر.

ژنیش وەکو کەیبانوویەکی ناوماڵ خەریکی مەڕ و بزن و مانگا دۆشین و مەڕەبیرە و مەشکە ژەنین و گەوڕ ماڵین بوە و ژنی کورد زۆرجار کە میوان هاتوە و پیاوەکەی لە ماڵەوە نەبوە خۆی وەکو ژنێکی سەربەست بە پیر میوانەوە چوە و خزمەتی کردوە کە ئەمە سەرنجی گەلێک لە گەرۆکە بێگانەکانی راکێشاوە.

ریچ لە گەشتەکەیدا «٤٨» دەربارەی ژنی کورد نووسیویتی:
«ژنانی کوردم چاوپێکەوت لەگەڵ پیاوان پێکەوە ئەچوون بۆ کاروبار بەجێهێنان...... پەچە و رووپۆش لەناویانا نیە».
باسیل نیکیتین لەو روەوە ئەلێ:«٣٨»
«لەناو هەمەوەندەکانا ژن جێی پیاوی ئەگرتەوە کە ئەمە سەرنجی ئەوروپاییەکانی راکێشابو لەو کاتانەدا کە بە ناوچەکانی هەمەوەندا تێپەریان ئەکرد. ژنە هەمەوەندەکان شان بە شانی پیاو ئەجەنگان و چەکیان هەڵدەگرت. ئافرەتی کورد بە شێوەیەکی گشتی سەربەستترن لە ئافرەتی دراوسێکانیان».
لەناو شاری سلێمانی و لەناو خێڵ و گوندەکانا ئافرەت هەمیشە بێ عەبا و پەچە بوە، لەناو شارەکانا لە دەوری عوسمانلیدا هەتا ماوەیەک ژن جۆرە سەرپۆشێکی داوە بەسەریا، بەلاّم لە دواییدا لەناو شارەکانا لە سەرپۆشەوە بوە بە عەبا و پەچە (لە هەندێ شوێندا جووت عەبا هەبوە).
لەناو شاری سلێمانیدا پەچەی رووپۆش نەبوە، بەلاّم کە تەوفیق بەگی طابور ئاغاسی- مدیری پۆلیس- کە باوکی ئەحمەد بەگی تەوفیق بەگ بوە و لە زەمانی عوسمانلیەکاندا بوە بە مدیری پۆلیسی سلێمانی و لە موسلیش ماوەیەک مدیری پۆلیس بوە و لە موسل بە (تەوفیق بەگی دارەکەبێنە) ناسراوە کە دیارە تەوفیق بەگ بۆ دارکاری کردنی تاوانبار بە کوردی وتویەتی «ئادەی دارەکەبێنە» ئەو تەوفیق بەگە لە سلێمانیدا بە زۆر پەچەی بەسەر ژناندا سەپاند و هەر ژنێک پەچەی نەبوایە سزا ئەدرا...... هەر لە زەمانی ئەو تەوفیق بەگەدا بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا خەڵک لە سێدارە دراوە و کە «ناڵە پێپان»ی هەمەوەند بوە... لە دواییدا تەوفیق بەگ کە تەقاعدکرا خەڵکی سلێمانی بە نوکتە و تویانە: «یەکەم حوکمی تەوفیق بەگ پەچەی ژنان بوو...... دوهەم حوکمی ئیعدامی ناڵە پێپان بوو...... سێهەم حوکمی دەس بەگونان بوو... یەعنی تەقاعدکرا». وەکو لەپێشتریشدا باسمان کرد، بەپێی گۆرانی باری ئابووری لە خوارووی کوردستاندا باری کۆمەڵایەتیش گۆراو خەڵک وای لێهات ئیتر بە ژیانی رابردوو قایل نەبیت و هەولی داوە بەپێی دەسکەوت و دەرامەتی تازەی ژیانی رۆژانەی بەرە و باشتر و بەرەو رێکوپێک تریان بەریوە.

هەرچەند ماوەی قۆناغی کۆچەرایەتی لەناو کوردا ئیجگار درێژخایەن بوە لەچاو ئەو قۆناغەی وڵاتانی تردا کە ئەمە وەکو وتمان هۆیەکی سەرەکی بوە بۆ دواخستنی ڕودانی قۆناغەکانی دوای کۆچەرێتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قوناغە نەیتوانی هەتاسەر خۆی بگرێ و کۆچەرێتی وردە وردە گوڕ و تەوژمی جارانی نەما و لە تەنیشت کانیاو و جۆگەکاندا کێڵگەکان دەستی بەسەراگیرا و خەڵک تیا نیشتەجێ بوو دەستی کرد بە کشتوکاڵ و دیهات و شار و شارۆچکەکان زۆربون و پەرەیان سەند و بازار و دوکان سازکرا بۆ کرین و فرۆشتن و بازرگانی و بەرهەمی مانیفاکتۆرەکان هاتنە بازارەوە و بەرگ و پۆشتەنی و پێلاو گۆرینی بەسەراهات و دوای ئەوەی زۆرکەس لە قوڕ و چلپاوی هات و چۆکردنی گەرمیان و کوێستان رزگاریان بو ئیتر لە کاڵە و پیتاوەوە بوو بە کەوش و قۆندەرە و فەرەنجی بوو بە پاڵتۆ و ئەوانەی دەرەوە کە ئەهاتنە ناو شارەکان بۆ فرۆشتنی مەڕومالاَت و بەرهەمەکانیان بۆ کرینی کەل و پەلو بەرگ و پێلاوی خۆیان و خێزانەکانیان چاویان ئەکەوت بە قەڵەبالغی و هاتوچۆی ناو بازار و مزگەوت و حەمام و خواردن و خۆراکی پاکتر لە جاران ئیتر وردە وردە تای تەرازوی کۆچەرێتی سووک بوو دانیشتوانی ناو شارەکانیش بەپێی گۆرانی باری ئابووری دەرامەتیان پەرەی سەند و کەوتنە هەواو سەوداوی گەورەکردنی خانوەکانیان و بەرگ و پۆشتەنی جوانتر و گرانبەهاتر لەوانەی جاران کەوتە بازارەوە و بایەخدرا بە خۆشتن و سابون دروستکردن و ئاوی خواردنەوە بە لوولە (ئەوسا پێیان ئەوت: گونج) راکێشرا و خەڵک کەوتە بوژانەوە.

ریچ لە گەشتەکەی ساڵی ۱۸۲۰دا ئەڵێ: «۴۸»

«لە سلێمانیدا لە گەلێک ماڵدا کەللەگی و هەیوان و پشتەهەیوان هەبوە»

هەروەها باسی جیاکردنەوەی ژوری حەرەمی کردوە لە ژورەکانی تر و ئەڵێ:

«ئەو جۆرە خانوانەی کە لە سلێمانیدا دروستکراون جیاوازن لەوانەی کە لە توکیا دیومن...... لە راستیدا نەخشەی خانوو دروستکردن بە زۆری لەلایەن ئەو بەنایانەوە نەخشەکیشراوە کە لە ئێرانەوە هاتون بۆ سلێمانی، بەو جۆرە شێوەی خانوو لە سلێمانیدا شێوەی نەخشەی ئێرانی بەسەرا زاڵبوە وەک ئەوانەی کە لە تورکیا دان».

لەناو شاری سلێمانی‌دا باسی ژیانی کۆمەڵایەتی و رابواردن و ئاهەنگی ژن‌هێنان و خەتەنە سووران و سەیرانی گوزەرەکان و باسی چەلەبی خانەکەی «حوسێن مەزلوم» و بەزمی ئەحەی کورنو و باسێکی دووردرێژن و نووسینی تایبەتیان ئەوی. ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا «٤٥» باسی ئەو سەیرانانەی کردوە و ئەڵێ:

«سەرۆکی ئەو سەیرانانە هەموو دەسەلاتێکی تەواوی پی‌ئەدرا، هەندێ کەس پیستی مەڕ و بزنیان لەبەر ئەکرد، هەندێ جار پادشای سەیران سواری گا ئەکرا و ئەبوایە فەرمایشتەکانی بێ سێ و دوو جێ‌بەجێ بکرێت و لە کاتی ئەو سەیرانانەدا لەو شوێنانەدا دەسەلاتی حکومەت ئەوەستا و بڕی نەدەکرد».

ئەوەی ئەدمۆندز باسی کردوە، سواری گا لەلایەن پادشای سەیرانەوە لەوەوە هاتوە کە «فەرەیدون» کاتێک «زەهاک- ئەژدەهاک»ی لەسەر تەخت لابرد، خۆی سواری گابوە و بۆ خۆپیشاندان پێشی خەڵکەکە کەوتوە. پیاوە پیرەکانی سەردەمی ئێمە بە دوور و درێژی باسی ئەو سەیرانانەیان بۆ ئەکردین کە هەندێ جار لەسەرچنار و تانجەرۆ و هەندێ شوێنی تردا لە سلێمانی چەند شەو و چەند رۆژێک درێژەی کێشاوە و حوشترێکی زلیان لە لۆکە دروست ئەکرد و پادشای سەیرانیان سواری ئەو حوشتری لۆکەیە ئەکرد و بەسەرشان هەڵیان ئەگرت تاکو ئەگەیشتنە شوێنی سەیران کە سەردەمی خۆی پاشای سەیران «ئەحەی کورنو» بوە و لە دوای مردنی ئەحەی کورنو «فەرەج کوردی»ی بەقاڵ باشی جێ‌ی گرتوەوە و ئەکرا بە پاشای سەیران.

لەناو کۆمەڵگاکانی کوردستانا ئەگەر جیاوازیەکیش بووبێت لە نێوانی دەسەلاتداریتی و پلەی دەرامەتی هەندێ کەسا لەناو شار و لە نێوانی فیودال و جوتیار و رەنجبەران، بەلام لەگەڵ ئەوەشا جیاوازی‌یەکی ئەوەندە زەق و ئاشکرا نەبینراوە وەکو هی ولاتانی تر و ئەو جیاوازیە نەبۆتە هۆی ئەوەی چینە جیاوازەکان لەیەکەوە دوورین و تێکەڵ بەیەکتر نەبن یا بە لووت‌بەرزی‌یەوە سەیری یەکتر بکەن.

بۆ نموونە، ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ «٤٦»:

«جارێک بۆ چاوپێکەوتنێک چوومە خزمەت شێخ مەحمود کە ئەوسا لە

سلێمانیدا حوکمداری کوردستان بو، له مزگەوتی گەورە لەسەر بەردە نوێژەکان لە دوای تەواوبوونی نوێژ چاوم‌پیٚ‌کەوت و هەندیٚ شت هەبو عەرزم کرد».

بەو جۆرە شێخ مەحمود حوکمداری ئەو سەردەمە هەروەکو ئەو خەڵکە لەسەر بەردە نوێژە رەقەکانی مزگەوتی گەورە شان بە شانی ئەو خەڵکە نوێژی کردوە و خۆی لە خەڵکەکە جیانەکردۆتەوە.

مێجرسۆن لە گەشتە نەهێنیەکەیدا باسی شارَی سلێمانی ئەکا لە ساڵی ۱۹۰۹دا و ئەڵیٚ «۳۹»:

«کە چوومە سلێمانی لە خانی غەفورئاغا دابەزیم کە خاوەنەکەی سەرۆکی شارەوانی بو. غەفورئاغا عەبایەکی تووکی حوشتری لەبەردابو، جووتێک کەوشی بەغدادی لە پێدابو خەنجەرێکی بەقەدەوەبو، بە فارسی گفتوگۆی لەگەلاکردم، منیش خۆمم پیٚ‌ناسی کە خەڵکی «شیراز»م...... وتی بەجل و بەرگەکانتا کە جلی ئەوروپاییە لە دوکتۆر ئەچیت؟ وتم نەخێر دوکتۆر نیم...... وتی ئەی بازرگانی؟ وتم رەنگە بازرگان بم...... لیٚ‌ی پرسیم: چی‌ئەکری و ئەفرۆشیتەوە؟ وتم جل و بەرگ و شتی‌تر...... وتی سابونیش ئەفرۆشیت؟ وتم نەخێر...... بەڵام بۆچی ئەو پرسیارە ئەکەی؟ وتی چونکە بیست ساڵ لەمەوپێش بازرگانێک لە موسلەوە هات بۆ سلێمانی سابونی ئەفرۆشت. ئەمە کارێکی باش نییە چونکە منداڵ کە بۆنی سابون بکا بە بۆنی ئەکەویٚ و ئەمرێت! هەروەها وتی: منداڵی سلێمانی لە شیرینی و بۆن ئەترسن چونکە فێری ئەو شتانە نەبوون. ئینجا پرسی: ئەو قۆندەرانەت لە کویٚ کریوە؟ وتم لە کەرکوک...... وتی لێرە شتێکی جوان نییە کە پێلاو قەیتانی هەبێت...... ئەی ئەو سەندوقەت لە کویٚ کریوە؟ وتم: لە لەندەن...... وتی کەواتە لەندەنت دیوە؟

بە کورتیەکەی پیٚ‌ی وتم کە بە جوانی نازانی لە خان دابنیشم کە خانەکەش هی‌خۆی بوو. دوای ئەوە لیٚ‌ی پرسیم: بۆچی ئەلقەت لە دەستدایە؟ (کە رەنگە ئەموستیلەی پەنجە بووبیٚ) چونکە لای ئێمە شتی‌وا بۆ پیاو زۆر شەرمە»

سۆن لە کتێبەکەیدا لەسەری ئەروا و ئەڵیٚ:

«لەناو سلێمانیدا هەندیٚ کریستیانی لیٚ بوو کە لە موسلەوە هاتبون، یەکێکیان ناوی «مەتی» بوو پیٚ‌ی وتم: ئەمە بیست ساڵ ئەبیٚ لە سلێمانیدام

تووشی هیچ شەڕەشەقێک نەبووم (کەچی سۆن لە دواییدا لەو باسە پاشگەز ئەبێتەوە و درۆ بۆ کورد هەڵدەبەستێ و ئەڵێ کوردەکان بە زۆر جلیان بە کریستیانەکان ئەگۆری و بە زۆر ئەیان کردن بە موسڵمان). سۆن ئەڵێ: «مەتی» بردمیە دوکانەکەی خۆی و سیغاری موسل و لۆکەی هەبو لەگەڵ قوماشی لۆکە و خام جاو و هەندێ شتی چنراو لەگەڵ سندوقێکی زلی پڕ لە بزمار کە لە ئەرروپاوە هێنرابوو وادیاربوو ئەو ڕۆژانە بزمار بازاری گەوم بوو. دراوسێکانی «مەتی» دووبارە گاوری موسل بوون، خەڵکەکە فاسی‌یان باش ئەزانی لەلای ئەوان بە «میرزا غولام حوسێنی شیرازی» ناسرام. هەروەها حەبیب بەدری (حبیبە سوور کە هەتا سەردەمی لاویی ئێمەش هەر لە سلێمانیدا مابوو) ئەویش موسلاوی بوو جل و بەرگی عەرەبی بوو بەلاَم فێستی لەسەر ئەکرد، کە بیستبوی من ئەورروپام دیوە هاتەلام و داوای لێ‌کردم کامێرایەکی بۆ داوا بکەم لەگەڵ سابون و قاموسێک لەگەڵ هەندێ شتي تری فرەنجی (ئەوروپایی). سۆن ئەڵێ: کە چوومە سەرا بۆلای لێ‌پرسراوی بازرگانی و پێم وت ئەمەوێ بچم بۆ هەلەبجە بۆلای وەسمان پاشا، پێ‌ی ووتم: پاشا خۆی دێ بۆ ئێرە. کە پاشا هات تماشام کرد کەوایەکی درێژی خەت خەتی هەنگوینی لەبەر دابوو (جاران بەوجۆرە قوماشە ئەوترا شیرداخ کە هەتا زەمانی منداڵی ئێمەش لە ناوچەی سلێمانیدا هەرباوی هەبوو) لەگەڵ سەڵتەیەکدا، خەنجەرێکی بە پشتێنەکەیەوە بوو دەمانجەیەکێش بەلاقەدیا، پێلاوەکەی بریتی بوو لە جووتێک چەکمەی چەرمی سوور. سەری بە گەلێک سەرپێچی ئاوریشم بەستبوو، کە قسەی کرد بە (دیالێکتێک)ی عەشایری و ڕەق قسەی ئەکرد (دیارە شێوەی جافی‌یەکی تەواوی ئەو سەردەمە بوە کە زۆر تێکەڵ بە شێوەی گۆران بوە)، چەند پیاوێکی بە سیمادڕی لەگەڵدا بوو، بەلاَم نەیان ئەتوانی بەشداری بکەن لە گفتوگۆدا».

سۆن باسی ئەو ڕۆژانەی سلێمانی ئەکا و ئەڵێ:

«لە مانگی مایسی ١٩٠٩دا کە گەیشتمە سلێمانی هەڵوێست زۆر ئالۆز بوو بە هۆی شێخەکانەوە. بازرگان دەستیان کردبوو بە کۆکردنەوەی قەرز و قۆڵە و هەندێکیان چوبونە ئێران. خانی غەفورئاغا کە منی لێ‌بوم زۆری چۆڵ بووبوو، پیرێکی عەرەبی تیادامابو خەڵکی (تەرابلس) بوودراوسێ‌ی دوکانەکەم ناوی

(مستەفا بەگ) بوو کە لە کاتی خۆی لە دوورگەی (مالتە) لە دائرەی پۆستەخانە ئیشی کردبوو، هەروەها هەندێ جوولەکەش لە خانەکەدا مابوون».
وادیارە ئەوەی سۆن باسی ئەکا دوای ئەو رۆژانەبوە کە کارەساتەکەی موسل و شەهیدبوونی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودی تیارۆیداوە. شێخان دەربەدەر بوونی شێخ سەعید و ئەو کوشتارەیان لە چاوی هەندێ بازرگان زانیوە کە بوون بە هۆی کردنەوەی مەزبەتە و ئاوارەکردنی شێخ سەعید بۆ موسل. (وەکو لە دواییدا لە باسی کارەساتەکەی موسل‌دا بە دووروودرێژی باسی ئەکەین).
جاران هەتا کۆتایی سەدەی پێشوو لە شوێنێکی وەکو سلێمانیدا تەنها (قاوەخانە) هەبوە تا ئەوسا چا نەبوو لە دواییدا کە چا پەیدابوو لە چاخانەکانا لێنرا ناوەکەی گۆڕاو پیٚ‌ی ئەوترا (چاخانە).
وەکو پیرەکانی سەردەمی ئێمە باسیان ئەکرد (محەمەدی مەلا غەفور) کە بۆ بازرگانی ئەچوو بۆ ئێران لەوێ چای بینیوە و لە جیاتی قاوە خواردنەوە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی بۆ سلێمانی و بە سلێمانیدا بلاٚوبۆتەوە لەوەوە پیٚ‌یان وتوە (مەلا محەمەدی چایی).
قاوەچی باشی‌ی ئەو سەردەمەی سلێمانی- ناوی (سەید عەلی ئەکبەر) «٣٥» بوە کە لەشاری (سنە)وە هاتوە لەگەڵ خۆیا کەرەسەی چاخانە و نێرگەلەی روسی و (چل‌چرا)یەکی لە چاخانەکەیدا هەڵواسیوە و مۆمی کافوری پیادا کردوە (ئەو چل‌چرایە لە دواییدا پێشکەش کراوە بە مزگەوتی کاک ئەحمەدی شێخ).
لە چاخانەکانی ئەوسا داباویوە گۆرانی بێژی دەنگ‌خۆش گۆرانی‌یان تیادا وتوە وەکو (حەمدی ئەفەندی) و (مەلا کەریم)... پاش ماوەیەک لە دوای چرا و فانوس (لۆکس) پەیدابوە و (سالحی وەستا بستە) یەکەم کەس بوە کە لۆکسی هێناوە بۆ چاخانەکەی و زۆر کەس بە تایبەتی بەشەو ئەچون بۆ سەیرکردنی ئەو (لۆکس)ە، جگە لەوە سالحی وەستا بستە زۆرخانەشی لە چاخانەکەیدا کردۆتەوە (هەتا دەوری منداڵی ئێمەش ئەو زۆرخانە و لۆکس هەڵواسینە هەر مابوو).
کلۆدیوس ریچ لە لاپەرە «٢٤»ی کتێبەکەیدا باسی زۆرخانەی سلێمانی کردوە.
لە هەندێ چاخانەدا حکایەت خوان بە شەوان، بە تایبەتی شەوانی رەمەزان حکایەتی رۆستەمیان ئەخوێندەوە (شانامەی فیردەوسی). جگە لە حەمدی

ئەفەندی و مەلا کەریم، سید عەلی ئەسغەر (سەی عەسکەر) کە خەڵکی سنە بوە و (ئەحەی ناسر)یش لە دەنگ‌خۆشەکانی ئەو سەردەمەبون. ئەحەی ناسر (١٨٧٦-١٩٢٣) بە گوللەی وێڵ کوژراوە.

دوای ئەوان (رەشۆل)ی دەنگ‌خۆش کە هەتا شێخ مەحمود مابوو هەر لە شاخی پیرانەوە هەتا شەری ئاوباریک لە خزمەت شێخ دابوو و لە ساڵی ١٩٧٥دا بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردوە.

کۆڵانەکانی ناوشاری سلێمانی جاران زۆر تاریک و نۆتەک و قوڕ و چڵپاو بوە و لە هەندێ راستە رێگای قەڵەبالغدا بە دیوارەکانا چرا و فانوسیان هەڵواسیوە لە ساڵی سیەکان لە (باخی پوورە بەگی) بەرامبەر بە چاپخانەکەی (پیرەمێرد) کە رۆژنامەی (ژین)ی پێ‌دەرئەهێنا مەکینەیەکی کارەبای بچووکیان دانا کە هێشتا خەریکی راکێشانی تەلی کارەباکە بون کە بەسەر چەند دار و دیوارێکەوە دامەزرێنرابون، زۆر کەس لەپڕ و پیرێژن و پیاوانی کۆنی ئەو سەردەمە ئەیان چرپان بە گوێ‌ی یەکدا و بروایان نەدەکرد کە ئەو تەلانە بتوانێت ئەو گلۆپانە داگیرسێنیت کە هەڵواسرابون...... تاک و لۆکە ئەیان ووت: ئاخر زەمانە و ئەوە کاری کافرکردەیە.

جگە لەو گرانی‌یەی کە بە هۆی شەری جیهانی یەکەمەوە روویدا و بوو بە هۆی قات و قری بەر لە دوسێ سەدەی رابردوودا لە ناوچەکانی ئەمارەتی بابان‌دا گەلێک دەرد و بەڵاو نەخۆشی کوشندە بڵاوبۆتەوە کە خەڵکێکی زۆری پێ‌لەناوچوە.

لە ساڵی ١٧٥٧م‌دا رشانەوەیەکی گەورە بڵاوبۆتەوە کە ئەوسا ئەمارەتی بابان هێشتا لە قەلاچۆلان بوە. وەلەساڵی ١٧٧٣دا رشانەوەیەکی تر بڵاوبۆتەوە. لە ساڵی ١٨٠٣دا بوومەلەرزەیەکی گەورە ناوچەی بابانی هەڵتەکاندوە و زۆر خانوبەرەی وێران کردوە، ریچ کە لە ساڵی ١٨٢٠دا چۆتە سلێمانی «٤٨» باسی ئەو بوومەلەرزەیەی کردوە.

بیجگە لەو رشانەوە و بوومەلەرزانە لە ناوچەی سلێمانیدا لە ساڵانی ١٨٨٢ و ١٨٨٥ ١٨٧٧ نەخۆشی‌ی «طاعون» بڵاوبۆتەوە وەلەساڵانی ١٨٧١ و ١٨٨٩ و ١٨٩٤ جگە لەوانەی لە پێشەوە باسمانکردن لە ناوچەی سلێمانیدا نەخۆشی‌ی

رشانەوە بڵاوبۆتەوە «٣٥».

جارێک پرسیارێکم لە تەوفیق وەهبی کرد دەربارەی (گردی گوڵان) وتی: لە زەمانی عوسمانلیدا نەخۆشی‌یەکی زۆرپیس بڵاوبوەوە کە پێی ئەوترا نەخۆشی (گولی) ئەو نەخۆشیە زۆرپیس و کاریگەبوو کەس نەی‌ئەوێرا بەلای مردوەکاندا بچێت لە ترسا خەڵک لاشەی ئەو مردووانەیان لە گردێکی تایبەتیدا ناشت کە ئیمرۆ لە سلێمانی پێی ئەڵێن گردی گوڵان (لە پشت گردی مامەیارەوەیە).

سلێمانی ئەو سەردەمە بە دەگمەن دوکتۆری تیابوە... مێجرسۆن لە گەشتە نەهێنیەکەیدا «٣٩» ئەڵێ: «یەکەم جار دوکتۆرێک هاتۆتە سلێمانی کە لەو کاتەدا نەخۆشیەکی زۆرپیس بڵاوبۆتەوە، بەڵام هەمووی دومانگی پێ‌نەچوو دوکتۆرەکە دەزگا و دوکانی پێچایەوە و چوو بۆ ئێران...... کە ئەو دوکتۆرە شارەکەی بەجێ‌هێشت کەللەی مێشکی بە ووتەی (عەیبە بووکم) ئەزرنگایەوە».

لەو رۆژانەدا عەیبە بووکم بۆ ئافرەت بەکار هێنراوە کە نەدەبوو ژن تێکەڵ بە پیاو ببێت یا رووی خۆی دەربخات، ئیتر ئافرەتی داماو چۆن توانیوێتی دوکتۆر سەیری لەشی بکا و فەحسی بکات!

حوسێن ئەفەندی کوری بەدیع ئەفەندی باباجان کە ئەویش هەر خەڵکی سلێمانی بوە (لە سوپای عوسمانلیدا لە کەرکوک مقدم بوە) خوشکێکی شووی کردوە بە شێخ محەمەدە بچکۆلەی کوری کاک ئەحمەدی شێخ (کە سەید حەسەن و شێخ عمری لێ‌بوە) ئەو دوکتۆر حوسێن ئەفەندی باباجانە جاروبار بۆ سەیرکردنی نەخۆشێکی ناسراو هاتۆتە سلێمانی و جارێک لە هاتنیا بە سواری ولاخ لەسەر ئەسپێکی سەرکێش ئەکەوێتە خوارەوە و ئەمرێ.

باری تەندروستی لە خوارووی کوردستانا زۆر دواکەوتوو بوە و رشانەوە و طاعون و گولی و گرانەتا هەرجارەی وەکو لافاو لەشکرێکی مردووی لوولداوە، دوکتۆر و دەرمان نەبوە، بۆ هەندێ نەخۆشی پەنا براوەتە بەر هەندێ کەس کە پێیان ئەوتن (حەکیم) کە ئەوانە لە باووباپیریانەوە بۆیان مابوەوە فێری ئەوە بوبون لە هەندێ گژوگیا مەرهەمیان دروست ئەکرد بۆ برین، بۆ قاچ گرتنەوە و دەست گرتنەوە زۆرجار نەخۆشی قاچ و دەست شکاو بە ولاخ شارە و شار و دێ

بە دیٚ ئەگێران هەتا قاچ گرەوە یا دەس‌گرەوەیەکیان بۆ ئەو دۆزی‌یەوە. شان بە شانی ئەمانەش خەڵک بڕوایان بە نوشتە و دوعا و دەم نەفەسی شێخ و مەشایخ هەبوە، پەتی لەرزووتا لە هەندیٚ جارا شوێنی دوکتۆر و حەکیمی ئەگرتەوە. چوونە سەر شەخس وەکو پیری شەوکێڵ و پیری کۆکە و پیرمەسور و باڵاتەران زۆرباو بوە و نەخۆشیان براوەتە سەر بە ئومێدی چاک بوونەوەیان (وەکو تەوفیق وەهبی جارێک بۆی باس کردم ئەو پیرانە لە زەمانی سەفەوی‌یەکانەوە بایەخیان پیٚدرا لە کوردستاندا).

هۆی پاکردنەوەی لەش و شتنی جل و بەرگ بریتی‌بوە لە جۆرە سابونێک (کە دیارە وەکو ئەوەی غەفورئاغا بۆ مێجرسۆنی روون کردبوەوە سابونی بۆندار قەدەغە بوو) لە گەرەکی سابوونکەرانی سلێمانی دروست کراوە. لە گوندەکانا کە سابون نەبوە، لەسەرکانی و چەمەکان بە گەڵاکوتک جلیان خاوێن کردۆتەوە و ڕەوگیک هەبوە کە پیٚیان ئەووت (ئەسپۆن) هەتا دەوری ئێمەش هەر مابوو لە دێهاتەکانا بە کاریان ئەهێنا لە جیاتی سابون کە بە گەلاکوتک لەناو جلەکانا لیٚی ئەدرا کەفی لیٚپەیدا ئەبوو و بۆ سەرشتن (گڵەسەر) لەلایەن ژنانەوە بەکار ئەهێنرا جگە لەوە خەنە و وسمەش هەبوە.

حەمام لە سلێمانی و شارەکانی تردا هەبوە گەرماوە گشتیەکەی کە هەموو کەسێک خۆی تیا هەڵکێشاوە (پیٚی ئەوترا خەزنە) مایەی بڵاو بوونەوەی نەخۆشی بوە چونکە ساخ و نەخۆش هەموو مافی ئەوەیان هەبوە خۆی تیا هەڵبکێشن. کە ئینگلیزەکان هاتنە سلێمانی خەستەخانەیەکی بچووکیان لە سلێمانیدا کردەوە و دەرمانیان هێنا...... وەکو مامۆستا ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا باسی ئەکا هاتنی ئینگلیزەکان لەو ڕۆژانەدا بۆ خوارووی کوردستان لەم رووەوە وەکو هاتنی فریشتە وابوە. سۆن لە راپۆرتێکدا ئەلیٚ: کە چوومە سلێمانی خانویەکمان دەسکەوت کە بۆ خەستەخانەبشێت ژورێکی تەرخان کرا بۆ عەملیات و قاوشێکیش جیاکرایەوە بۆ ژنان کە توانرا شوێنی (٢٠) پیاو و (١٥) ژن ساز بکرێت.

لە زەمانی عوسمانلی‌دا وێنەگرتن حەرام بوە خەڵک بۆ پێویستی لە بەغدا و ئەستەمبوڵ «٣٥» توانیویانە وێنەی خۆیان بگرن، بەڵام کە ئینگلیزەکان هاتنە

کوردستان، وێنەگرتن بڵاوبوەوە...... تەوفیق وەهبی بۆی گێرامەوە وتی یەکەمجار کە لە سلێمانیدا کامێرایەکم پێ بوو و هەندێ خەڵک بە چاوێکی نابەدڵییەوە سەیریان ئەکرد. بە داخەوە وێنەگرتن و حەرام بوونی وێنەگرتن شێوەی زۆر ناوداران و شاعیرانی کۆنی کوردی لە کیس داوین و ئەوانەی لە دیوانی شاعیرەکاندا وەکو وێنەی حاجی قادر و نالی و مەحوی هەمووی بە خەیاڵ دروست کراون.

یەکەم وێنەگرێک لە کوردستاندا (حوسێن حوزنی مۆکریانی) بوە لەگەڵ کابرایەکی لوبنانی لە دواییدا شێخ لەتیف دانساز ئەو کامێرایەی حوسێن حوزنی و لوبنانیەکەی کریەوە و شێخ لەتیفیش لە دواییدا فرۆشتیەوە بە (یحیی ئەفەندی) «٣٥».

هۆی حەرامبوونی وێنەگرتن لە کوردستاندا ئەوە بوە خستبویانە مێشکی خەڵکەوە کە ئەو وێنەیە چ بە مەکینە و چ بەدەست رەسم بکرێ رۆژی قیامەت داوای ئەوەت لێ‌ئەکا رۆحی بکەی بە بەرداو تۆش توانای ئەوەت نیە کە ئەبێ بە هۆی بوونی شتێکی بێ رۆح کە ئەوە بە تاوانێکی گەورە ئەژمێررا.

لە زەمانی کۆندا هۆی هاتوچۆکردن و گواستنەوەی مالی بازرگانی بریتی بوە لە ولاغ و ئیستر و گوێدرێژ...... بایەخێکی زۆر دراوە بە ئەسپی چاک و رەسەن. ئەوانەی کە دەسەلاتداربوون (مەیتەر) یشان بوە...... مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا ئەلێ:«٥٢» «ئەبوڤیان کە وەختێک ناوی کورد ئەهێنێت بە شۆڕەسوارەکانی رۆژهەڵات ناویان ئەبا». مینۆرسکی لە باسی سواری کوردا ئەلێ:

«دیارە کوردەکان لەو سوارە دەم و چاومۆن و گرژانەی ئەوروپایی نین، بەلکو زۆر حەز لە گۆرانی ئەکەن».

لە کوردستاندا جگە لە سوارچاکی و غارغارێن و (جریدبازی) و نیشان نانەوە زۆر باوی هەبوە، بەتایبەتی لە زەمانی بابانەکاندا بایەخیان پێدراوە و سالمی شاعیر لە هەندێ شیعریدا باسی رابواردنی ئەو سەردەمەی کردوە. شێخ رەزای تالەبانی لەو شیعرەدا کە بە ناوی (دار الملکی بابان) ەوە وتویەتی باسی جریدبازی کردوە کە ئەلێ:

درێغ بۆ ئەو زەمانە، ئەودەمە، ئەو عەسرە، ئەو رۆژە

که مەیدانی جریدبازی لە دەشتی کانی ئاسکان بوو

شێخ مەحمود لە زەمانی حوکمدارێتیدا وەکو نەریتێکی ئەو سەردەمە بایەخی داوە بە (سپۆرت) وەک رمبازی و غارغارێن و هانی سەیرانکەرانی داوە وەکو جاران بەزم و گۆبەنگی سەیران رێک بخەن و خۆشی لە هەندێکیانا بەشداری کردوە کە هەندێکەس رەخنەی ئەوەیان لێ‌گرتوە کە نەدەبوایە ئەو رۆژانە بەشتی واوە خۆی خەریک بکردایە.

لە ساڵی ١٩١٩ دا مێجرسۆن ئۆتۆموبیلی هێناوە بۆ سلێمانی و شوفێرێکی تەرخان کردوە بۆ ئەوەی خەڵک فێری چاکردنی ئۆتۆمۆبیل بکا و شوێنێک تەرخان کراوە بۆ ئەو مەبەستە. ئەو شوێنە خانووی ئەحمەدی بەگی ساحبقران بوو، بەرامبەر ماڵی حمەئاغای عەبدولرەحمان ئاغا و هەتا زەمانی لاوێتی ئێمەش مابوو پێ‌ی ئەوترا (موهەندیسخانە). موهەندسێک کە ئینگلیز بوە سەرپەرشتیکەری ئەو شوێنە بوە و لە دوایدا وەکو ئەلێن ماجد مستەفا لەجێ‌ی ئەو موهەندیسە دانراوە «٣٥». بەڵام مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەڵێ بەر لە مێجرسۆن (عەلی ئیحسان پاشا) کە قائدێکی عەسکەری تورک بوە ئۆتۆمۆبیلی هێناوە بۆ سلێمانی بەڵام زۆری بە راکێشان و پاڵە پەستۆ بوە.

جگە لەو ئۆتۆمۆبیلەی مێجرسۆن (گوگول جان موگورجی) کە ناوەکەی لە لایەن شێخ قادری حەفید و حەپسەخانی نەقیبەوە کرابو بە (غەفور موگورجی) ئەویش لە زەمانی مێجرسۆندا ئۆتۆمۆبیلێکی هێنایە سلێمانی و کە شێخ مەحمود لە هیندیستانەوە گەرایەوە بۆ سلێمانی ئەو ئۆتۆمۆبیلەی خەڵات کردوە بە شێخ مەحمود بەڵام شێخ مەحمود پارەکەی داوەتەوە و شێخ رۆژی هەینی بەو ئۆتۆمۆبیلە چوە بۆ مزگەوتی گەورە بۆ نوێژکردن و هەندێ سواریش لەم لاولایەوە بوون، هەر بەو ئۆتۆمۆبیلەش بوە کە شێخ مەحمود چوو بە پیر سمایلخانی شکاکەوە (سمکۆ) کە هات بۆ دیتنی شێخ مەحمود وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین.

## ٢- باری ئابووری و پیشەسازی و بازرگانی

ژیان لە کوردستاندا بە شێوەیەکی گشتی زۆر سادەبوە و کورد دوورەپەرێز بوە لەو رووداو و بەسەرهاتانەی کە لە ولاّتانی ئەورووپادا بە هۆی شۆرشی پیشەسازی و تەقینەوەی باری بازرگانی و کەڵەکەکردنی سەرمایەداری‌یەوە رووی دابوو.

ولاّتانی سەمایەدار لەو رۆژانەدا تەنها بەسوود و قانزاجی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی بەرهەمی ناوخۆیان و دەوروبەریان تێریان نەدەخوارد و کەرەسەی خاوی ناو ولاّتەکەی خۆیان بەشی ئەو پیشەسازی و بازرگانیەی نەدەکرد کە ئەوان مەبەستیان بوو، جگە لەوەی کە نرخی ئەو کەرەسە خاوانەی لای خۆیان هەتا ئەهات نرخی گرانتر ئەبوو بۆیە پێویستیان بە بازاری نوێ هەبوە کە ئەو کالاّ و بەرهەمە پیشەسازیەی ناو ولاّتانی خۆیان لەو بازارە تازانەدا بفرۆشن و بە پارەکەی کەرەسەی خاوی هەرزانی ئەو ولاّتە بکرن، یا دەست بگرن بەسەریا و بەکێشی بکەن بۆ کارگە و عەمارەکانی خۆیان کە لە ئەنجامی ئەوەدا پەلاماردان و هەڵپە و بێن‌بڕکێ لەناو ئەو دەوڵەتانەدا پەیدابوو. هەر لایە بۆ خۆی و بەجیا مرخی لە ولاّتێکی دواکەوتوو خۆشکردبوو بۆ ئەوەی وەکو مەڕ دایان‌دۆشن و دەس‌بەسەر بازارەکانیا بگرن کە یەکیک لەو ولاّتانە کوردستان بوە کە زۆریان وەکو روس و ئینگلیز و ئەڵمان هەڵپەی داگیرکردن و دەس‌بەسەرا راگرتنیان داوە (لە پەیمانی سایکس بیکۆدا باس‌کراوە)، بێجگە لەوە پرۆفیسۆر (خالفین) لە کتێبەکەیدا- کێشە لەسەر کوردستان- بە دووروودرێژی باسی کردوە.

ژیانی کوردەواری بە زۆری سادەبوە و جل و بەرگی خۆماڵی بوە وەکو رانک و چۆغە و فەرەنجی و کۆڵە باڵ و پەستەک و کاڵە و پیتاو و خام‌جاو. ناوچەی هەورامان جگە لە رانک و چۆغە بە کلاشی پەرۆش بەناوبانگ بون و لە ئیشی دەستدا وەکو چەقۆ و قەڵەم‌بر زۆر ورد و چالاک بوون. کەوشی رەش و سوور پێلاوی کۆن بوە (جگە لە کاڵە و پیتا و کە زۆر جار بۆ قوڕ و چڵپاو

بەکارهاتوە). ژنی لادێ وەکو پیاو کەوشی لەپێ کردوە بەڵام ژنانی ناوشار – بەوینەی شاری سلێمانی – پاینبەرز کە جۆرە پێلاوێکی ڕەنگاوڕەنگ بوە لەپێیان کردوە.

بەڵام کە وردە وردە کۆچەرییەکان نیشتەجێ بوون و پارەداری و دەس ڕۆین گەشەی کرد و پیشەسازی و بازرگانی تا ڕادەیەک پەرەی سەند، ئیتر دەوڵەمەند و دەس ڕۆیوەکان بە شێوەی جل و بەرگی کۆن قایل نەبوون و سەربەستی ئاوریشم و مشکی و چەفتە کرین پەیدابوە کە زۆربەی لە هیندستانەوە لە ڕێگەی ئێرانەوە ئەگەیشتنە کوردستان و جۆرە عەبایەکی پیاوانە کە نیشانەی دەوڵەمەندی و پارەداری بوە لە لایەن دەس ڕۆیو و دەوڵەمەند و بازرگانەکانەوە دراوە بەشاندا.

لە ناوچە گەرمە سێرەکانا بە زۆری کەواوسەڵتەیان لەبەر کردوە (کە مێجرسۆن لە گەشتەکەیدا لە باسی وەسمان پاشای جافدا باسی جۆرێکی لەوە کردوە). ژنیش کەوا و کراس و دەسماڵ و کوڵوانە وکوڵەنجە و سەربەستەکانیان لە شێوەی کۆنەوە گۆڕاوە و خێزانی دەوڵەمەندکان قوماشی گوروونێ و ئاوریشمیان لەبەرکردوە و بەستوویانە بەسەریانەوە. لە هەندێ ناوچەدا وەکو هەولێر (تاس کڵاو) و (چەکمەی ژنانە)ش هەبوە. وردە وردە کل و کلتور و ئاوێنە و شانە و خەنە و وسمە و بوون بە ئارایشی ژنان و دوکاندار و دەزگیر و چەرچیی ناو شارۆچکەکان فروشتوویانن.

مێجرسۆن لەگەشتەکەیدا دەربارەی کاروانی ئەو کاڵایانەی ئەو کاتەی کە ئەو گەشتەکەی کردوە ئەڵێ «٣٩»:

«بازرگانەکان لە سلێمانی مانگی جارێک کاروانیان ئەچێت بۆ تەورێز و لەوسەرەوە ئاوریشم و قوماشی ئاوریشم و وشتی تر دەهێنن و لە سلێمانیەوە خورما و قاوە (کە هەردوکیان بەرهەمی ناو کوردەواری نەبون بەڵکو بە بازرگانی ئەهێنران بۆ کوردستان) ئەبەن و ئەیفرۆشنەوە جاروبار مس و ئاسنیش ئەهێنن بۆ کوردستان».

جگە لەوانەی کە سۆن باسی کردون، پیاوەکانی سەردەمی ئێمە بۆیان ئەگێڕاینەوە کە لە موسڵەوە پێلاو و خامجاو و بەرماخ و سیغاری جگەرە ئەهێنرا

بۆ ناوچەی سلێمانی و مێجرسۆن لەگەشتەکەیدا باسی چەند گاورێکی موسلی کردوە کە خەریکی ئەو بازرگانیە بوون لەو رۆژانەدا.

بەرهەمی ناوچەکانی خوارووی کوردستان وەکو شوێنەکانی تر، بریتی بوە لە توتن و ئاژاڵ و پێستە و خوری و موو، هەنگوین، بنێشت، کەتیرە، مازوو، کەوڵی رێوی و چەقەڵ و هەندێ شتی تر کە لە شارەکانەوە نێرراون بۆ موسل و بەغدا و زۆر جاریش ئەوشتانە لە ئێرانەوە بەکیش کراوە و لە رێی بێ خوارووی کوردستانەوە نێرراوە بۆ وڵاتانی‌تر. ریچ لە کتێبەکەیدا «٤٨» کە ساڵی ١٨٢٠ چۆتە سلێمانی باسی چاندنی لۆکەی کردوە لە کوردستانا.

بازرگانە کۆنەکانی سەردەمی منداڵی و لاوێتی ئێمە باسی بازرگانی و کاروانی جارانی خۆیان بۆ ئەکردین و جاروبارە لە باسەکانیانا ناوی عروسیات (روسیا) و هەشتەرخان (ئوستراخان) و شاری (پەتری‌پۆت- بطرسبرگ) و تاقەی (کوجەرات) ئەهات کە ئەمەی دواییان ناوچەیەکی بەناوبانگ بوە لە دروستکردنی قوماشی‌دا.

کاروانی جاران ئەوسا هەموی بە ئێستر و بە کەر و بار بوە و بەرهەمی دەستکردی پیشەسازی و کشتوکاڵ و توتن و مالی بازرگانی‌یان لە شوێنێکی وەکو ناوچەی سلێمانی‌یەوە کە بارگە و بارەکانیان لە سلێمانیەوە بەرەو (سەگرمە) ئەرۆیشت و ئەگەیشتنە (خانی ئیبراهیم خانچی) و لەوێوە بۆ بەغدا، بە تایبەتی ئەگەر ناردنی ئەو کاروانانە لە زستاندا بوایە بە شەرەشەق ئەگەیشتنە مەنزل و لە رێگا تووشی هەزار دەردەسەری و شەرەشەق ئەبوون......

ئەم شیعرەی پیرەمێرد کە (ئەدمۆندز) لە کتێبەکەیدا «٤٥» کردوێتی بە (ئینگلیزی باشترین وێنەیە بۆ بەزم و شەرەشەقی کاروانی ئەو رۆژانەی دەوروبەری عوسمانلی بە تایبەتی لە کاتی لاوازبوونیا (مێجرسۆنیش لە گەشتەکەیدا باسی کێشەی هاتوچۆی کەرکوک و سلێمانی کردوە کە چۆن هەمەوەندەکان دەستیان بەسەر ئەو رێگەیەدا ئەگرت و کاروانەکانیان تالان ئەکرد).

جاران دەرۆژ بە هەچە هەچە و بارە بەری‌یەوە
بە گەرماوسەبوون و لیزمەی باران و تەری‌یەوە

ترسی طریدە، پێشکەشی سوار، شەو فرینی دز
دەستیاوی باری کەوتوو لە جێگای خلیسک و خز

ئەرکی گریز و خانە بگیر و مۆریانی نوێن
بۆڵەی کەبانوو، کفری قەتارچی، پلار و جوێن

چنگ سووتەکەی بە ئاو و کەرووی ئێزدوە نانی کۆن
جووتە و لەقەی ناو تەوێلە و هالاوی تەرس و بۆن

ئاگری تەپاڵە، لوکسی گڕگڵ، گەڤینی سەگ
دەستە و پەخەی قەتارچی لەسەرکا شەرەکوتەک

سیخورمەی قەتارچی بۆ هەڵسان و بۆ پەلەی
لۆقە و تریسکەی ئێستر و بازدانی جۆگەلەی

لاسەنگی بار پەدەرەبەر پارسەنگی خوارەکەی
خۆ ووتی: پیت لە خرتکە چوو، لەو دەشتەچی ئەکەی؟

ئینجگار ئەگەر ئافرەتت لە تەکابوو، بە ترسەوە
هەر سوارێک دەرکەوێ ئەلێ‌ی: ئای جەردەیە ئەوە

باج و پیتاکی زەنگتە و، گیروگرفتی جاف
هەرچیکیش کە هاتەرێ هەمەوەند بردی صاف لە صاف

بەم کوێرەوەری‌یە و بەو کولەمەرگیە و بە چلکەوە
سێ‌ بەنگە وەرگەراو بەسەر و ریشی کوڵکەوە

ئەو سادە چوێتە شارەوە ناومالی (عاصمە)
پێت و بنوسرێت نابێتە خۆی‌ی چێشت ئەمەکەمە

ئێستا سواری ئۆتۆمۆبیل بە، بەسێ‌ سەعات
دەتباتە سەر شەمەندەفەر، دەست و برد کە هات

سوارەبە، بنوو، بەیانی لە خەو هەڵسە زوو بە زوو
بەغدایە هات بە پیرتەوە دەی‌بینیت رووبەروو

جاران ئەیان ووت: ئەوە (وەلی) بە طی ئەرز ئەکا
پێچانەوەی زەوی نیە، عیلمەکاری بەرز ئەکا

أنجا کە هات برووسکە خرایە ناو تەلێکەوە
هێنرایە خانەوە لە چرای هەر پەلێکەوە

زۆرتر لە مانگەشەو دەروژوور روناک کرایەوە
تاریکی لاچوو، تێگەیینی ئێمە مایەوە

جارێ‌ ئەبێ‌ بزانین ئەمانە لە کوێوە هات،
چی هەیە چاکترێ‌ لەمانە بۆ بەرزی ولات

لە لای من: خوێندەواریە...... ئاە خوێندەواریە
هەر میللەتێک کە عیلمی نەبێ‌ دەردی کاری‌یە

ئاخ خوێندنیش وەکو ئەوەی من ئارەزوی ئەکەم
بی‌بینم و نەبێتە گرێ‌ کوێرە و قورسی‌ی کفنەکەم

هەتا زەمانی عوسمانلی و بەر لە شەری یەکەمی جیهانی، شاری سلێمانی بە دروستکردنی خەنجەر و تفەنگ و چاک‌کردنەوەی تفەنگ و دەمانچە بەناوبانگ بوە و ئەوانەی خەریکی ئەو پیشەسازی‌یە بون پی‌یان ئەوترا (چەخماخ ساز). مارک سایکس کە لە سالی ١٩٠٥دا چۆتە سلێمانی باسی (١٥٠) کەس ئەکا لە سلێمانیدا کە زۆر شارەزابوون لە تفەنگ دروستکردندا لە جۆری (مارتینی پیبودی) بەلام کە ئینگلیزەکان دوای بە دیل‌گرتنی شێخ مەحمود هاتنەوە ناو سلێمانی ئەو پیشەسازی‌یەیان قەدەخەکرد.

لۆنگریک لە کتێبەکەیدا باسی تفەنگ دروستکردنی ئەو سەردەمەی سلێمانی کردوە و ئەلی:«٤٣»

«مانیفاکتۆرەیەکی کۆن هەبوە کە تفەنگی لە جۆری رووسی تیادا دروست ئەکرا و لەوێوە ئەفرۆشرا بۆ ناوچەکانی تری کوردستان».

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا «٣» ئەلی: (کە مێجرسۆن بوبە حاکمی سیاسی لە سلێمانی، ئەو شوێنەی کە خانووی شارەوانی‌یان تیادا دروست ئەکرا پی‌ی ئەوترا (سەقاخانەی عەسکری)، مێجرسۆن جاری‌دا بە ناو خەلکدا هەرچی چەکی هەیە پێویستە لە ماوەیەکی دیاری‌کراودا بیدا بە حکومەت. خەلکەکەش ئەوەی چەکی کۆنی هەبوو تەسلیمیان کرد و مێجرسۆنیش هەمووی خستە بناغەی ئەو خانوەی شارەوانی‌یەوە کە دروستی ئەکرد).

پیشەسازی لە خوارووی کوردستاندا زۆر دواکەوتوو بوە لەچاو ولاتانی تردا و ئەوەی هەبوە دەستکردبوە. لە دوکانێکدا وەستا خۆی یا یەک دوو شاگردی هەبوە و هەندێ جار لەناو مالانیشدا پیشەساز ژوورێکی مالەکەی ترخان کردوە بۆ ئیشەکەی و دوکانی نەبوە.

جگە لە چەخماخ سازی و شیرگەری، دروستکردنی بەرگ و پێلاو و ژێر راخەر وەکو لباد و بەڕە و فەرش و سەرراخەر وەکو جاجم و پۆپەشمین و لێفە و دۆشەک، ئاسنگەریش گاسنی جووت و پاچ و خاکەناز و بێل و تەور و تەوراس و چەقۆ و قیمەکێشی دروستکردوە لەو ئاسن و پۆلایانەی کە هەمووی لەدەرەوە لە بازرگانی بەکێش ئەکران.

مووتابچێتی لە سلێماندا باوبوە بۆ دروستکردنی گلۆلەی بەن و گوریس و

جەوالْ و توورەکە و ڕەشکە و خەرار (خەرار هەر لە کۆنەوە لە کوردستاندا تووتنیان تیا داگرتوە).

لە گواستنەوەی پایتەختی ئەمارەتی بابان لە قەلاچوالانەوە بۆ سلێمانی، گەلێک لە پیشەسازانی قەلاچوالان لەگەلْ بابانەکاندا دوکانەکانیان پێچایەوە و هاتنە سلێمانی کە مووتابچیەکان بەشێک بون لەوانە و لە دواییدا کریستیانەکانی سلێمانی هەندێکیان بەوەوە خەریک بون.خوخمانەچیتیش ئەورۆژانە لە برە و دابوە بۆ ڕەنگ‌کردنی خام جاو کە قوماشێکی سەرەکی بوە لە جل و بەرگدا... لە هەندێ شوێندا وەکو ناوچەی (هەجیج) کاسە و کەوچک و پنە و تیرۆک و شانە دروستکراوە و بە کۆلْ و بار گێراویانە و فرۆشتویانە. بەنا و کۆلانی شارەکاندا دەزگیر و کۆلْ گیری جوولەکە هەبوە و هەندێکیش کە پی‌یان ئەوتن چەرچی وردەوالەیان بە دیهاتەکاندا گێراوە.

مێجرسۆن لە گەشتەکەیدا «٣٩» کە بۆ ناوچەی سلێمانی کردویەتی دەربارەی دراو «پارە»ی ئەو سەردەمە و نرخی هەندێ خواردەمەنی بەم جۆرە باس کردوە:

«لە سلێمانی‌دا سالْی ١٩٠٩ کولێرەیەکی ئەستوور بە دوو پوولْ بوو کە هەر پوولێک ئەی‌کرد (١/٧ پینی ئینگلیزی)، دوو سەلک کاهوو نزیکەی بە (١/٤ پینی)، هەندێ دۆ یاخود ماستاو لەگەلْ خورمادا بەشی ئێوارەیەکی منی ئەکرد. بەو جۆرە تاقە (١) پینی ئینگلیزی بەشی ژەمێکی منی ئەکرد (بەلاْم باسی ئەوەی نەکردوە کە ئەو پینیە ئەو رۆژانە لەژێر سایەی عوسمانلی‌دا بە ئاسانی پەیدا نەدەکرا).

لە سلێمانی‌دا تا ئەورۆژە هێشتا پارەی ئێرانی ئەچوو ئەگەرچی ئەو پارەی ئێرانیە کۆنیش بوبو، پارەی عوسمانلی جگە لە مەجیدی هیچی تر نەی ئەخوارد و نەئەچوو، پارەی ئێرانی سێ جۆر بوو: ١- پوولی مس. ٢- بێچووی زیو. ٣- پێنج شاهی ئێرانی. دوو قرانی ئێرانی پی‌ی ئەوترا (تارانی)، بەلاْم ئێمە هەندێ جۆری تریشمان ئەبینی وەکو (چەرخی)، (جووتە)، دەپارە، غازی، قەمەری، قران، قرانی ڕەش.

هەموو شتێک بە گوێرەی قەمەری حساب ئەکرا کە ئەیکردە (٤) پوول، بەلاْم بێچوو بە زۆری لە بەردەستدا بوو. بەو پی‌یە یەک تارانی بریتی بوو لە (٣٦)

پوول یاخود نۆ قەمەری، بەڵام سەیر ئەوەبو لە کەرکوک بە بێچوویان ئەوت (قەمەری) و بە (تارانی)یان ئەوت (قران). کە ئەچوومەلای گۆشت فرۆشێک ئەی وت بە (٣٢) ئیتر ئەبوایە تێ‌بگەیشتمایە کە نیازی لە (٣٢) قەمەری‌یە کە ئەمە نرخی یەک حۆقە گۆشت بوو لە سلێمانیدا، (ئەو حوقەیەی کە مێجرسۆن باسی کردوە لە چوار کیلۆی ئێستا شتێک کەمتر بوو).

لە کوردستاندا هەر شوێنە بۆخۆی کێش و سەنگی جیاوازی هەبوە، حۆقەی سلێمانی (٤) حۆقەی پێنجوین بوە و ٥/٤ ی (مەن)ی تەورێزی بوە و ٢/٥ی (مەن)ی هەلەبجە بوە. هەروەها حۆقەی سلێمانی ئەیکردە (دوو حۆقە و نیو)ی ئەستەمول کە ئەمە پێوانەی ئەو سەردەمەی تورکیا بوە.

ماوەیەک لە سلێمانیدا (فیشەک) بۆ کێشی ترازوو بەکار ئەهێنرا (چونکە کێشی فیشەک لە هەموو شوێنێکدا لەو رۆژانەدا سەنگیان وەکو یەک وابوە.))

کە شەری جیهانی دەستی پێ‌کرد کاربەدەستانی عوسمانلی و جەندرمە و زەفتیەکانیان وەکو کوللەو واشە بە هەموو لایەکدا بلاوبونەوە و هەرچی‌یان دەست بکەوتایە لە خواردەمەنی بە ناوی ناردنی ئەو شتانە بۆ کۆری جەنگ و غەزا ئەیان برد. بە زۆر ئەو گەنج و کاسبکارانەی کە نانیان پەیدا ئەکرد بۆ خێزانەکانیان لوولیان دان بۆ ناو کۆری شەڕ و خەڵک کەوتە سەرغلەتیەوە و زۆر خێزان نان پەیداکەری نەمابوو و کارەساتی گرانی بە هۆی نەبوونی خۆراک و جل و بەرگ و پارەوە هەموولایەکی شپرزە کردبوو، پیرەکانی سەردەمی منداڵی و لاویمان بۆیان ئەگێڕاینەوە کە چۆن ژیانی ئەو رۆژانە سەخت و سامناک بوە، کیلۆی ئارد هەندێ جار بە لیرەیەکی ئالتون بوە، نانەوا گوێ رەپ، ئەو نانەوایەی کە حەمدی صاحێبقرانی شاعیر لەسەر زەنشتەکانی شێخ مەحمووددا ناوی هێناوە لە ناو بازاری سلێمانی دا نانەواخانەی هەبوە، لە ملاولای سەری کۆلانانی بازارەکەی ئەو، لە وانەی کە برسی بوون زۆر جار خۆیان حەشار داوە و نانی نان‌کرەکانیان فراندوە. زۆر کەس لە برسا دا بویانە دەشت و کێو و وەکو ئاژەڵ پەلاماری گژوگیایان داوە، زۆر برسی واهەبوە کە لای گران بوە دەست لەم و لەو پان‌بکاتەوە، دەرگای لەسەرخۆی و خاوخێزانی داخستووە و لەناو ماڵا هەموو بە کۆمەڵ لە برسا مردوون. مەگەر یەکێکی وەکو (کەریمی علکە) کە بە

هۆی خوێندەواری‌یەوە کە رۆژنامە و گۆڤاری بە زمانی بێگانە بۆ هاتوە، بە هۆی ئەوانەوە زانیویَتی کە شەر دەستی پیَ‌کرد و درێژەی کێشا قات و قری و گرانی پەیدا ئەبێت و ئەویش زۆر زیرەکانە هەر لەسەرەتاوە دووربینی کردوە و دەغلْ و دانێکی زۆری لە عەمبارەکانیا پاشەکەوت کردوە و هەلی گرتوە و وەکو ئەلێن لەو رۆژە رەشانەدا یارمەتی زۆر خێزانی سلێمانی داوە لە مردن رزگاری کردون..... بە راستی دەستی دوکتور کەمال مەزهەر خۆشبێت وەکو وەفاداری‌یەک کتێبەکەی (چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد)ی «١٠» پێشکەش کردوە بە بنەماڵەی سەربەرزی کەریمی عەلەکە.

وەکو پیرەکان بۆیان ئەگێراینەوە کارەساتی گرانیەکە و برسێتی زەیفی لە خەڵک سەندبوو، هەبوو لەناو خۆیانا تاقم تاقمیان دروست کردبوو و کە ئەوسا پیَیان ئەوترا (ئەلەکە و وەلەکە) کە خەریکی راوو رووتی پارەدار و دەس رۆیوی ئەو رۆژانە بوون. یەکێک لەم سەری کۆڵانەوە خۆی گرتوە و کە پارەدارەکە گەیشتوە ئەوی‌تر بانگی کردوە: ئەلەکە...... یەکێکی تر وتویەتی: وەلەکە بیگرە و رووتی‌کە.

مەلا حمدونی شاعیر بیَ چاو لەچاو ساغێک شارەزاتر باسی ئەو رۆژانەی بە شیعرێک کردوە کە ئەمە چەند دێرێکیتی:

| | |
|---|---|
| ئەم رۆژە چ رۆژێکە کەعالەم شلەژاوە | هەرکەس بە جەخاریَ جگەری قیمە کراوە |
| دنیا پری ئاشوو بە خەلایق بە عمومی | ئاسایشی لیَ‌مەنعە دەلیَ‌ی جونبوشی ئاوە |
| وەک تەرزە دەباریَ بەهەمرو دەم ئەسەفی غەم | هەوری غەزە ب‌ر قەهری خودا توند وبەتاوە |
| ئەم وەزعە کە ناوی بە(سەفەربەر) ئەبەن ئیمرۆ | فەرمانی بەخوێن رشتنی ئەم عالە مەداوە |
| گیرۆدەیە ئەم عالەمە هەرکەس بە سیاقیَ | کەوتۆتە کەشاکەش بە قوماندەی ئومەراوە |
| ژاندرمە ئەسوورێتەوە وەک واشەیی برسی | بۆ لاشەیی میللەت بە فروفێڵی غەزاوە |
| فەوتاوە لەبەر سوخرە کەروێستر و یابوو | حوشتر سەقەت وشەل بوە،گا،پشتی شکاوە |
| کەر شەوقی زەرینی نیە هەتا لە بەهارا | ترسی هەیە نەک بیخەنە ژێر باری قەزاوە |

لەزەمانی لاویتی ئێمەدا هێشتا (تەوفیقی حەمە خێل) مابوو کە لە زەمانی عوسمانلی‌دا تورکەکان دایان نابوو کە هەرچی ولاغ و بارهەڵگر هەبوە لە سلێمانیدا بە بیگار و سوخرە لە خەڵکیان بسێنێت و ئازوقە و خواردنی راو و

رووتکراوی ناوچەکەی پێ بگوێزنەوە بۆ لەشکری عوسمانلی لە کۆری شەرەکانا.
باشترین کەسێک کە شێوەی گرانی و برسێتی ئەو سەردەمی گرانیەی تۆمار کردبێت مامۆستا رەفیق حیلمی‌یە کە لە یاداشتی ژمارە (١)یکدا دەربارەی ژیانی ئەو رۆژانی گرانیە نووسیویەتی و ئەڵێ:
«بە هۆی زوڵم و زۆری کاربەدەستانی عوسمانلی‌یەوە لە کاتی شەردا، خەڵک بە جارێک روویان لە حکومەت وەرگێرابوو، مەئمورەکانی عەسکەری و مەدەنی عوسمانلی هەر جارەی بەناوی شتێکەوە کەوتبوونە راوو رووت و خەڵک رووتاندنەوە جارێک بەناوی (ئیعاشە)ی لەشکرەوە، یا بەناوی (مبایەعە) و (ئیعانە)وە وەکو سەرانە لە خەڵک ئەسێنراو بەشێکی زۆری لەلایەن مأمور و کاربەدەستانی عوسمانلی‌یەوە ئەدزرا. جگە لەوە کردگاریش لەو ساڵانەدا قینی هەڵسابوو، بە هوی شەرەوە هەرچی جوتیار و پیاوی بەکار هەبو نێرران بۆ شەر، کاروباری کشتوکاڵ کەوتبوە دەس پرەپیرێژن و پیری بێ‌هێز، بارانیش چوبوە بەست و خەڵکەکە بە هاتنی ئەو دەرد و بەلایانە ئەوانیش دڵیان رەق بوبو کە بوبوە سەرباری ئەو دڵرەقیەی کردگار، بەو جۆرە قات و قری داکەوت، بە جۆرێک حۆقەیەک ئاردی چوار کیلۆیی تێکەڵ و پێکەڵ بە خاک و خۆڵ چوە لیرەیەک. پاش ماوەیەک، جگە لەوانەی کە دەوڵەمەند بون، یا ئازوقەیان لە میری وەردەگرت، ئەوانی تر هەموو کەوتنە سەغلەتی و مەترسی‌یەوە، بۆ خواردن ئاردە برنج، مێوژی رەش، تووی ووشک، ئەمانە هەمووی تەواوبوو نەما، تاوای لێ‌هات دەست نەدەکەوت، ئینجا کەوتنە خواردنی ئاردی بەروو، پەموانەش بوبو بە خواردن، دیارە کە ئەم حاڵە بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی گەلێک نەخۆشی لە کاتێکدا کە خواردەمەنی، بەلکو هەتا نان و پاقلەی کوڵاویش بوبو بە دەرمان و تەنها خواپێداوەکان- ئەویش بە دەگمەن- دەستیان ئەکەوت. کەس بیری لە دەرمان نەدەکردوە و ئەگەر بەبیریشدا بهاتایە کەس پارەی نەبوو بی‌کرێ لەبەر ئەوە هەموو نەخۆشێک چاوەرێی مردن بو، بەلام مردن باشتر بوو، ئەوانەی بەشی زۆریان هیچ دەردێکیان نەبو بەلام بە هۆی خواردنی خراپ ولاشەی تۆپیوی هەندی باڵندە و مریشک و کەلەشێرەوە یا لەبەر خواردنی ئاردی بەروو یا تووی وشک و پەموو پێش مردنیان بە ماوەیەک تەواو ووشک و رەق ئەبون، ئەوسا

دەم و چاویان دەئاوسا، سەروریش و سمێلی چلکن و ئالۆزکاویان بە رووی دەم و چاوی ئاوساوی چاو بەقوولاً چوویانا ئەهاتە خوارەوە کە نەوەکو نێرینە بەلکو ژنە کەساسەکان و کچە جوانەکنیشیان رووت قووت مابوونەوە و لەشیان بۆ دانەئەپۆشراو بە تەنگ شەرمەوە نەمابوون. کە سەرەتای زستانیش دەرکەوت...... بەلاّم چۆن زستانێک!!. زستانێکی ئیجگار سارد و سۆلە و بە باران بو، بە پێچەوانەی وەرزی ووشکی کاتی دەغلْ و دان، ئەوانەی کە خوا پارروویەک نانی دابوونێ بە کولەمەرگی سکیان تێر ئەکرد، بەلاّم لەبەر هاوار و نووزەی بێ‌هێز و دەنگی پارانەوەی ژن و منداڵ و پیرە مێردە نەخۆشەکانی دەست و پێ ئاوساو لەژێر باران و رەشەباو سەرمای شەوانی زستان لە کۆلاْنەکانەوە ئەهاتە بەرگوێ و بێ دەسەلاْتیش دەستی ئەکرد بە گریان...... بەمەش شوکور...... بەلاّم رۆژ نەبوو شارێکی وەکو سلێمانی لە برسا وەیا لەبەر نەخوشی کە ئەویش هەر لە برسێتیەوە بوو دەکەس نەمرێت. ئیتر شاردنەوەی لاشەی مردوو لە توانای شارەوانی‌دا نەماو خستنە پشت گوێی لاشەکانیش دەستی پێ‌کرد. پیاوم ئەویست روو بکاتە مزگەوتە رووخاوێک یا بە چەپەری کۆلاْنێکدا تێپەرێ وەیا سەربکا بە کەلاوەیەکدا وەیا چاو بە ژوورێکی چۆلْ و تاریک و بۆگەنا بگیریت، بێگومان لە هەموو هەنگاوێکدا لاشەیەکی رووت و قووت و ئاوساو و شین هەلْگەراوی بەرچاو ئەکەوت کە مروڤی ئەترساند و ئەسلْەمیەوە.

چاونووقاندن و راکردن لەم دیمەنە خەفەت پڕێنەرانە کەلْکی نەدەگرت، بە خۆشاردنەوە و دوورکەوتنەوە رزگاری نەدەبوو لەو دیمەنانەی کزەی لە جەرگ ئەهێنا و دلْی هەلْئەقرچاند. رەوشت و خووی بەرز نەوی بوبو، دلْسۆزی و داوێن پاکی لای بەشی زۆری خەلْک هەلْگیرابوو، بە کورتی سروشتی پاک لە قامووسی بەشەردا نەمابوو سڕابوەوە و داوێن پیسی و کەمتەرخەمی لە ناموس‌دا گەیشتبوە رادەیەک کە قەت نەی‌بینێت...... هەر لەم دەورەدا لە ئێرانیشەوە پۆلْ پۆلْ خەلْک بە سوالْکردن و هەلاْتوویی خۆیان ئەگەیاندە سلێمانی و لەمانە بەشێکیان بە فرۆشتنی لەشیان ئەچون بەرێوە و تا ماوەیەکیش بە کولەمەرگی ئەژیان».

بەراستی وەکو مامۆستا رەفیق حیلمی باسی‌کردوە و ئەوانەی لەو سەردەمەدا

ژیابوون و بۆ ئێمەیان دەگێڕایەوە، باری خوارووی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و باری ناوچەی سلێمانی بە تایبەتی ئەوەندە پەریشان و ئالۆزبوە کە خەڵک ویستویانە بە هەر جۆرێک بێت لەو هەورە رەشە رزگاریان ببێت کە بەسەر ئاسمانی وڵاتەکەیانەوە بارانی غەزەبی ئەباران و ئامادەبوون بچنە پاڵ سایە و دەسەڵاتی هەر کەسێکەوە کە لەو کوێرەوەریە رزگاریان بکات.

بەراستی شتێکی زۆر زەحمەت بوە بۆ یەکێکی وەکو شێخ مەحمود کە لە کۆتایی شەری جیهانی و گەرمەی ئەو رۆژە ڕەش و سەختانەدا کە دەرامەتێکی کەم و تەجروبەیەکی سیاسی ئەوتۆی نەبوە کە بەو هەموو دەس کورتیەوە و لەو رۆژانەدا کە خەڵک لەژێر باری برسێتی و رووت و قووتیدا ئەیان ناڵاند بتوانێت هەتا سەر میللەتەکەی لە خۆی گرد بکاتەوە و بتوانێت هەموویان یەک بخاو روو بە رووی دوژمنەکانی کورد و داگیرکەری وڵاتەکەی ببێتەوە و بتوانێت بەرگەی پیلان و نەخشەی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دەوڵەمەندی پارە هەڵڕێژی ئەو سەردەمە بگرێ و دەوڵەتەکەی رزگار بکا و میللەتەکەی بگەیەنیتە رێگەی ئازادی و سەربەستی.

ئەوەبو وەکو لە دواییشدا بۆمان دەرئەکەوێ ئینگلیزەکان ساتێک سیاسەتیان بەرامبەر بە کورد و کوردستان گۆراو و ئیشیان بە شێخ مەحمود نەما، توانیان بە بڵاوکردنەوەی پارە و خەڵات و بەڵێنی دەسەڵاتدارێتی و مووچە و مانگانە و پارە بەشینەوە بەسەر سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردا شێخ مەحمود بێ دەسەڵات بکەن و وای لێبکەن بەرگەی هێرشەکانی ئینگلیز نەگرێ و ناچار بکرێ واز لە شۆرش و خەبات بهێنێت و پروپاگاندەی ئینگلیز و نوکەرەکانی تاماوەیەکی دوور و درێژ بەناو کوردستاندا وایان خستیوە مێشکی خەڵکەوە کە تاوانی روخانی حوکمداریەتیەکەی شێخ مەحمود خۆی بوە و ئینگلیز لەوەدا تاوانی نەبوە هەتا لەم دواییەدا راستیەکان بە ئاشکرا روون بوونەوە و زۆر کەس دانیان بەو هەڵانەی خۆیانا نابوو کە لایان وابوو ئەگەر شێخ مەحمود نەبوایە دوور نیە ئینگلیزەکان حکومەتێک بۆ کورد دروست بکەن.

# ٣- بـــاری ئایینـــی

لە خوارووی کوردستاندا وەکو ناوچەکانی تر، میللەتی کورد هەر لە کۆنەوە ئاینداربوە و پێویستیەکانی ئایینی ئیسلامی وەکو نوێژ و رۆژو و حەج و زەکات و سەرفترە بەجیٚهێناوە و هەمیشە سەرگەرمی ئاینەکەی خۆی بوە و سەری بچوایە نوێژی نەئەچوو لەناو بێگانەکانیشدا ئەم ئایندارییەی کورد سەرنجی راکێشاون و بینیویانن کە ساتی نوێژکردن هاتوە ئەگەر لە کاتی شەریشدابووبن چەکەکەیان لای خۆیانەوە داناوە و نوێژی خۆیان کردوە.

لەناو کوردەواریدا هەر لە کۆنەوە بە چاوێکی پڕ لە ریزەوە سەیری پیاوە ئایینیەکان کراوە و لەناو کۆمەڵگاکانی کوردەواریدا شوێنی تایبەتیان هەبوە و کاربەدەستانی عوسمانلی لە زووەوە لەو راستیە گەیشتبوون بۆیە هەمیشە هەوڵیان داوە پیاوە ئایینیە ناسراوەکان بەلای خۆیانا داشکێنن و هەمیشە دڵیان راگرتون و خەلات و بەراتیان داونەتیٚ و سولتانی عوسمانلی و کاربەدەستانی هەوڵیان داوە لە رێگای پیاوە ئایینیەکانەوە رەشە خەڵکەکەی کوردستان والیٚ بکەن کە بە چاوێکی رێزەوە سەیری خەلیفەی عوسمانلی بکەن و بە چاوی نوێنەر و پارێزەری ئایینی ئیسلام و خاکی ئیسلامەوە تیٚی بروانن و وا لە خەڵک بگەیەنن کە هەر کەمتەرخەمیەک لە بەشداربوونی غەزادا بەرامبەر بە غەیرە دینی ئیسلام بکریٚ بە کفر و تاوان بژمێرریٚ و پێویستە هەمیشە لەژێر ئالاٚی خەلافەتی عوسمانلی‌دا ئامادەبن بۆ گیان و ماڵ بەختکردن و وابزانم نموونەیەکی زۆر زەق و ئاشکرامان لەو روەوە لەبەرچاوە کەساتێک (مەلای خەتیٚ) فتوای‌دا شەرکردن بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانلی کفرە و هەر کەسێک بەشداری بکات تەڵاقی ئەکەویٚ و چۆن بەو جۆرە خەڵک لە (پاشا کۆرە- میر محەمەد)ی رەواندوز کشانەوە و دەستیان نەچوە ئەوەی چەکی بۆ هەڵگرن و ئەمارەتەکەی بپارێزن و بەو جۆرە ئەو تروسکاییەی کورد کوژێنرایەوە.

کورد بە شێوەیەکی گشتی (سونی‌یە و شافعی یا حەنەفی‌یە) و لە تورکیادا

هەندێک شیعە هەیە کە پێیان وتراوە (قزلباش) و لە کوردستانی ئێرانیشدا لە ناوچەی سنە و بەرەوخوار هەتا ناوچەی عیلام شیعەن و کێشەی سونی و شیعە لە کوردستاندا هەندێ جار بوە بە هۆی ئاژاوە و نارێکی و ئەو کێشەیەی لە زەمانی (ئەمان اللەخان)ی والی (سنە)دا لە نێوان شیعە و سونەدا روویداوە و (مەولەوی) شاعیر کراوە بە ناوبژیکەر بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و نارێکیە وەکو مامۆستا عبدالکریمی مدرس لە کتێبەکەیدا دەربارەی مەولەوی باسی کردوە نموونەیەک بوە لەو نارێکیە.

بەر لەوە کێشەی سونی و شیعە لە نێوانی دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانلیدا کە خاکی کوردستان کەوتۆتە نێوانیانەوە، ئاگری ئەو شەرە کوردیشی گرتبوەوە و هەردو دەوڵەتەکە لەو شەرەدا و لە دوای ئەوەش هەوڵیان داوە کورد تێوەئاڵێنن.

دوکتور کەمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا ئەڵێ:[٧] رووسەکانیش هەوڵیاندا هەستی ئایینی کورد بۆ سوودی خۆیان بەکار بێنن لەبەر ئەوە زۆر بایەخیان بە نەجف و کەربەلاداو ئەو تەقەلایە لە یاداشتێکی سەرکردەی هێزی روس لە کرمنشاە (ئوشالوتی) دەرئەکەوێ کەبۆ قونسولی رووسی نوسیوە لە کرمنشاە لە کاتی شەری یەکەمی جیهانیدا ئەڵێ:

«ئەتوانرێ لە عەشایرە شیعەکانی کورد سوود وەربگیرێ و بەکار بهێنرێن بۆ داگیرکردنی کەربەلا و نەجف بۆ ئەوەی ئەو شوێنانە لە دەست تورکەکان دەربهێنرێت، بەم داگیرکردنە تورکەکان ناچار ئەکەین هەندێ لە هێزەکانیان لە سنووری روسیا بکێشێتەوە». ئەوەی راستی بێ لە خوارووی کوردستاندا ئەو کێشەی مەزهەبی شیعە و سونییە نەبوە و زۆر کەم تووشی ئەو ناکۆکیە بوە...

بە شێوەیەکی کورت ئەتوانین بڵێین کە لە خوارووی کوردستاندا ئەگەر سووکە کێشەیەک بووبێت جاروبار لە نێوانی ئەوانەی سەر بە قوتابخانەی نەقشبەندی بوون لەگەڵ قادرییەکانا روویداوە...... جگە لە نەقشبەندی و قادری ئەهلی حەق و یزیدی بوە کە کێشەیان زۆر کەم بوە. کێشەی نەقشبەندی و قادری لە خوارووی کوردستانا ئەگەرێتەوە بۆ ئەو نارێکیەی لە نێوان مەولانا خالیدی نەقشبەندی (لە دوای ئەویش دەروێش و مریدەکانی جێگەیان گرتەوە) و

قادری‌یەکاندا روویدا لە پێشدا لە زەمانی شێخ (مارفی نۆدی) و لە دوای ئەو لە کاتی (کاک ئەحمەدی شێخ)ی کوریدا.

مەولانا خالید نەقشبەندی کە پێشرەوی نەقشبەندیەکان بوە لە عەشیرەتی (جاف) بوە لە تیرەی (مکایلی) بوە و دەربارەی سالی لە دایک بوونی مەولانا خالید و سالی کۆچکردنی ئەمین زەکی بەگ لە مێژووی کورد و کوردستاندا«۱۱» و عەباس عەزاوی «۳۲» هەریەکە بەم جۆرە باسیان کردوە: ئەمین زەکی لە لاپەرە (۳٤۷)ی کتێبەکەیدا ئەڵێ: مەولانا خالید لە سالی ۱۱۹۷هـ = ۱۷۸۳م لە قەرەداغ لە دایەک بوە و لەسالی ۱۲٤۲هـ = ۱۸۲٦م لە شام کۆچی دوایی کردوە بەپێ‌ی ئەو بۆچوونەی ئەمین زەکی، مەولانا خالید تەنها (٤۳) ساڵ ژیاوە.

بەلاَم عەباس عەزاوی دەربارەی مەولانا خالید ئەڵێ: مەولانا خالید لە سالی ۱۱۹۰هـ= ۱۷۷٦م لە قەرەداغ لەدایک بوە (یەعنی حەوت ساڵ پێشتر لەوەی ئەمین زەکی باسی کردوە) وەلەسالی ۱۲٤۲هـ= ۱۸۲۷م لە شام بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی کردوە و لەگەرەکی صالحیە لە لاپالی چیای قاسیون نێژراوە.

بەپێ‌ی ئەو بۆچوونەی عەباس عەزاوی ماوەی (۸) ساڵ جیاوازی هەیە لەتەمەنی مەولانادا لەگەڵ ئەوەی ئەمین زەکی بۆی چوە...... کە دوورنیە ئەوەی عەباس عەزاوی کە تەمەنی مەولانای بە (٥۱) ساڵ داناوە (ئەگەر زۆرتریش نەبوویێت) نزیکتر بێت لە راستی چونکە تەمەنی (٤۳) ساڵ بۆ یەکێکی وەکو مەولانا خالید کە ئەو هەموو شتەی کردوە لە ژیانیا و ئەو هەموو پایە بەرزی‌یەی هەبوە و ئەو هەموو صوفی و مریدانەی کە وەکو ئەڵێن پاشای بابان خۆی قلیان و سەبیلی بۆ تێ‌کردوە و ئەو هەموو صۆفی و مەریدانەی هەبووبێ کە لە هەموو بەشەکانی کوردستانی ژوروو و خواروو وەرۆژهەلاَتدا پەرەیان سەندبو، جگە لەوەی کە لەگەڵ یەکێکی بەتەمەنی وەکو شێخ مارفی نودی‌دا و دوای ئەو لەگەڵ کاک ئەحمەدی کوریدا کەوتۆتە بێنە و بەرەوە وەکو لە باسی شێخ مارف و کاک ئەحمەدی شێخدا لە دواییدا بە دوور و درێژی باسی ئەو نارێکیەیان ئەکەین، ئەوەی عەباس عەزاوی بە راست‌تر دێتە بەرچاو وەک لەوەی ئەمین زەکی بەگ.

بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە باسی مەولانا خالیدیان کردوە، مەولانا لە عەشیرەتی جاف بوە. عەباس عەزاوی ئەڵێ: بە ناوی مەولانا (شیخ ضیاء الدین)ەوە لای خەڵک ناسراوە.

مەولانا کوری ئەحمەد ئاغای کوری (حسێن) بوە... سەرەتای خوێندنی لای مەلاکانی خوارووی کوردستان و کوردستانی ئێران تەواو کردوە. دوای تەواو کردنی خوێندن هاتۆتە سلێمانی و لە ساڵی (١٢١٣هـ- ١٧٩٨م) دا لە سلێمانی دەستی کردوە بە دەرس‌وتنەوە بەپێی حسابەکەی ئەمین زەکی ئەبێ کە دەستی کردبێت بە دەرس‌وتنەوە لە سلێمانی‌دا تەمەنی (١٧٩٨- ١٧٨٣) کە ئەکاتە ١٥-١٦ ساڵ بووبێت بەڵام بەپێی ئەوەی عەباس عەزاوی تەمەنی نزیکی ٢٢-٢٣ ساڵ بوە کە ئەمەیان زۆرتر ری‌ی تی‌دەچێت...... مەولانا لە ساڵی (١٢٢٠هـ= ١٨٠٥م) دا چوە بۆ حەج و لە ساڵی (١٢٢٤هـ= ١٨٠٩م) دا چوە بۆ هندستان و لە شاە عبداللەی دهلوی تەریقەی نەقشبەندی وەرگرتوە و لە ساڵی (١٢٢٦هـ= ١٨١١م) دا گەراوەتەوە بۆ سلێمانی کە بەپێی بۆچوونی ئەمین زەکی تەمەنی بیست و حەوت ساڵ بوە و بەپێی حسابی عەباس عەزاوی تەمەنی (٣٥-٣٦) ساڵ بوە. کە ساتێک گەراوەتەوە بۆ سلێمانی دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی تەریقەی نەقشبەندی وەلەلایەن بابانەکانەوە لەقەبی (رئیس العلما)ی پێ دراوە و لەوێوە لەگەڵ قادری‌یەکانا بە پێشرەوێتی شێخ مارفی نۆدی تێکچوە.

لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیەدا مەولانا لە رەئیس العلمایەتی لابراوە و شێخ مارف لەجی‌ی ئەو دانراوە و مەولانا ناچار کراوە سلێمانی بەجێ‌بهێلێت و روویکاتە بەغدا وەکو لە دواییدا لە باسی شێخ مارف و کاک ئەحمەددا باسی ئەکەین.

کلودیوس ریچ لە گەشتەکەیدا «٤٨» باسی مەولانا خالیدی کردوە و ستایشێکی زۆری کرودوە و بەرپەرچی ئەو درۆ و دەلەسانەی داوەتە کە درابوونە پاڵ مەولانا. ریچ لە لاپەرە (١٤٠)ی کتێبەکەی‌دا ئەڵێ: خەڵکی سلێمانی بە مەولانا خالیدیان ئەوت (حەزرتی مەولانا). دوای روودانی ئەو ناکۆکیە جارێکی تر پاشای بابان مەولانای داواکردۆتەوە بۆ سلێمانی و ریزی لی‌گیراوە بەڵام ئەم جارەیان لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخی کوری شێخ مارف تێکچوە و ناچار

سلێمانی بەجێ‌هێشتوە و چۆتە بەغدا و لە وێوە کۆچی کردوە بۆ شام.

مەولانا وەنەبێ هەوڵی ئەوەی دابێت کە نەقشبەندی هەر لە ناوچەی سلێمانی‌دا بلاوبکاتەوە، بەڵکو دوای ئەوەی ناوبانگی دەرکردوە لە زۆر شوێنی تری کوردستاندا ئەو تەریقەیەی بلاوکردۆتەوە. لە ناوچەی بارزاندا شێخانی بارزان و لە کوردستانی ئێران و تورکیا شێخانی نەهری و شەمزینی و لە هەوراماندا شێخانی بیارە و تەوێلە ئەو رێگەیان گرتۆتەبەر.

ئەوەی کە ئێمە مەبەستمانە لێرەدا ئەوەیە کە کێشەی نەقشبەندی و قادری بە مردنی مەولانا خالید و شێخ مارف و کاک ئەحمەدی شێخ نەبرایەوە، بەڵکو لە دەوری شێخ سەعیدی حەفید و دەوری شێخ مەحمودیشدا لە هەندێ هەڵوێستدا دەرئەکەون......

بۆ نموونە لە کاتی دەسەلاٌتدارێتی شێخ مەحموددا کە نوێنەری قادری بوە (کە بەلای منەوە کوردایەتیەکەی لە ژوور هەمووانە بوە) ئەوەندە لەگەڵ شێخانی بیارە و تەوێلە رێک نەبوە و ئەمانەی دوایی هیچ بەشداری‌یەکان نەکردوە لەو شۆرشانەی کە شێخ مەحمود دژی ئینگلیز کردبوی.. جگە لەوە لەگەڵ شێخانی نەهری و شەمزینی‌دا دۆستایەتی و پێوەندی نەبوە و کە ساتێک شێخ لیٌ‌ی قەوماوە و نێررا بۆ هندستان و خێزانەکان ئاوارەبون بۆ کوردستانی ئێران و تورکیا و لەدوای ئەوەش لە حوکمدارێتی دوهەمیدا کە ناچاربوو رووی کردە چیاکانی سەرسنوور ئەوانە بە هیچ جۆرێک یارمەتی ئەو خێزانانە و شێخ مەحمودیان نەداوە هەر چەند هەندێ سەرچاوە باسی ئەوە ئەکەن کە شێخ ئەحمەدی بارزان هەولی داوە یارمەتی بنێریت بۆ شێخ مەحمود لەکاتی شەری دەربەندی بازیاندا وەکو ئەوەی کاک مەسعود بارزانی باسی کردوە «٢٣».

هەروەها سەید ئەحمەدی خانەقا کە لە کەرکوک دائەنیشت و لە ساداتی ناوچەی سەرگەلووی سورداش بوە لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی بە بنەماڵەی ساداتی بەرزنجە داناوە بەلاٌم لە کاتی حوکمدارێتی شێخ مەحموددا هاوکاری نەکردوە (ئەگەرچی لەدوای هەرای موسل و کوشتنی شێخ سەعید تارادەک دەوری پشتگیری کردنی شێخانی کردوە لەگەرانەوەیانا لە موسلەوە بۆ سلێمانی) کە هۆی ئەو یارمەتی نەدانەی سەید ئەحمەدی خانەقا دوور نیە بە هۆی کێشەی

نەقشبەندی و قادری‌یەوە بووبێت کە سەید ئەحمەد نەقشبەندی بوە و دووریش نیە ئینگلیزەکانیش دەورێکی سەرکی‌یان بووبێت لە نزیک نەبوونەوەی هەردولادا وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین.

بە کورتی جیاوازی نێوانی نەقشبەندی و قادری بۆتە هۆی ناکۆکی و کێشە لە نێوانی پیاوە ئایینیەکانی ئەو سەردەمە و هەردووکیشیان لە ڕیٚ‌ڕەوی بەربەرەکانی کردنی یەکتریدا بۆ بین‌برکیٚ لەگەلٚ یەکتریدا و بۆ بە کێش‌کردنی زۆر ترین دەروێش و سۆفی و مرید بەلای خۆیانا هەریەکەیان بە جۆرێک بەربەرەکانی سەرەتای بزوتنەوەی ئەو رۆشنبیریەیان کردوە کە پزیسکی چەخماخە بوون بۆ بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی و هەر لایەیان بۆ دەربرینی دلٚسۆزی خۆیان بەرامبەر بە کاربەدەستانی عوسمانلی کە دژی هەموو جۆرە رۆشنبیری و هەستی نەتەوایەتی‌یەکی کورد بوون، زۆر جار بەرەنگاری مرۆڤی رۆشنبیر و خوێندەوار و بگرە هەندیٚ جار روو بە رووی هەندیٚ مەلای خوێندەواریش بونەوە. فەقیٚ و مەلا کە زۆربەیان خۆیان لە رەشە خەلٚکەکە جیا نەکردۆتەوە و زۆرکەمیان لایەنگیری میری و فیودالەکان بوون و بگرە لە هەندیٚ هەلٚوێستانا بەلای خەلٚکی چەوساوە و رەش و رووتا دەیان‌کشاندوە چونکە ئەوانیش خۆیان بەشێکی زۆریان جووتیار بوون و زۆریان بە رەنجی شان نانی رۆژانەی پەیداکردوە. حاجی قادری کۆیی نموونەیەکی ئاشکرای ئەو مەلا و رۆشنبیرانەی سەردەمی خۆی بوە کە هەستی نەتەوایەتی بزواوە و بە هۆی بوونی لە شوێنێکی وەکو ئەستەمبول دا ئاگاداری زۆرشتی ئەو سەردەمە بوە و یەکێک بوە لەوانەی کەبیٚ سل‌کردنەوە پەلاماری ئەوانەی داوە کە سوودی خۆیان خستۆتە پێش سوودی میللەت و نیشتمانەکەیان و لە شوێنێکی وەکو کۆیەشدا (مەلای گەورە) تا رادەیەک جیٚی رەخنەی ئەو کەسانە بوە کە حەزیان بە خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانە نەکردوە.

فەقیٚی ئەو سەردەمە کە دەوری قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی کوردیان بینیوە هەتا ئەبون بە مەلا خۆیان تەرخان ئەکرد بیٚ بە پێش‌نوێژی مزگەوتی شارێک یا گوندێک هەتا ئەگەیشتنە پلەی مەلایەتی هەمیشە کۆلٚ بە کۆلٚ بوون و مزگەوتا و مزگەوت ئەگەران بە شوێنی مەلایەکی بەناوبانگی شارەزادا کە

دەرسێکی تایبەتیان پێ بلێنت... لەو مەلایانە هی وایان هەبوە پلەی زانیاری بەرز بۆتەوە و چۆتە ریزی پیاوە ئایینیە ناسراوەکانەوە کە بەم جۆرە وتراوە (شێخی بەرماڵ) کە ئەمانە خۆیان بەوەچەی سادات نەزانیوە و زۆرجاریش کێشە لە نێوانی شێخی بەرماڵ و شێخی ساداتدا روویداوە کە زۆرجار ئەوەی پێشویان لە زانیاری و خوێندەواریدا شارەزاتر و پێشکەوتووتر بوون.

کورد هەر لە کۆنەوە دەست و پێ بەست بوە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام و هەمیشە راستگۆ بوە و بە بست لێی لانەداوە...... نموونەیەکی زەقی ئەو وابەستەییەی کورد بە ئایینی ئیسلامەوە ئەوەیە لە زۆر شوێنی کوردستاندا هەندێ گۆری کۆن هەیە پێی ئەوتری (ئەسحابە کوژ) کە کوردی ساویلکە هەتا سەردەمی لاوێتی ئێمەش ئەگەر بەلای ئەو گۆرەدا بڕۆیشتبایە ئەبوایە وەکو رەجم کردن بەردێکی بۆ بهاویشتایە و لەولاشەوە گۆرێکی تر ئەبینرا کە ووشکە کەڵەکی بۆ کراوە و دارێکی گەورەی لە تەنیشتەوە رواوە و پێی وتراوە داری شەخس و هەندێ پەرۆی رەنگاورەنگی پێداکراوە بە حساب ئەوە ئەسحابەی ئیسلام بوە و هاتۆتە کوردستان ئایینی ئیسلام بلاوبکاتەوە و لە پێناوی ئایینەکەیدا لەو شوێنە شەهید بوە، بەو جۆرە کورد بە داگیرکەرە بێگانەکەی وتوە (ئەسحابە) و ریزی لێ گرتوە و بە کوردیش کە هەولی داوە ولاتەکەی لە داگیرکەر بپارێزێت پێی وتراوە (ئەسحابە کوژ).

دوژمنانی کورد زۆرجار ئەم سەرگەمیەی کوردیان دژی کورد لە نووسینەکانیاندا بلاوکردۆتەوە و کوردیان بە میللەتێکی وشک و رەق و دەمارگیری ئایینی لەقەلەم داوە. بۆ نموونە مێجرسۆن لە کتێبەکەیدا «٣٩» هەولێکی زۆری داوە والە خوێندەواری کتێبەکەی بگەیەنێت کە کوردە موسلمانە دلرەقەکان هەولیان داوە زۆرکەسی گاور و جولەکە بە زۆرەملی بکەن بە ئیسلام و بە زۆرەملی وایان لێ کردون جل و بەرگی خۆیان بگۆرن و بیکەن بەجلی کوردی کەچی نەی توانیوە ناوی تاقە گاورێک بهێننەوە کە لەلایەن کوردەوە کرابێ بە موسلمان. بۆ بە بەدرۆخستنەوەی ئەو درۆیەی مێجرسۆن، هەمووی چەند سالێکی پێ نەچوو بەسەر ئەو گەشتەیدا کە لە سالی ١٩.٩ دا کردبوی شێخ مەحمود لە حوکمداریتی دووهەمیا لە سالی ١٩٢٢ دا (خواجا

کەریمی عەلەکە)ی کرد بە وەزیری دارایی خۆی کە ئەوە نیشانەی ریز لیٚگرتنی بوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی کە کریستیان بوون لە ناوچەی سلیٚمانیدا ژمارەیان کەم بوە. کورد هەمیشە بەچاوی ریزەوە سەیری گاور و جوولەکەی کردوە بە هیچ جۆرێک دەستدریٚژی نەکردۆتە سەریان و بە زۆرەملی هیچ شتیٚکی نەسەپاندوە بەسەریاندا.

میٚجرسۆن لە شویٚنیٚکی تری کتیٚبەکەیدا هەرخۆی خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە لەوەدا کە ئەڵیٚ: «چوومە سلیٚمانی لە ساڵی ۱۹۰۹دا لەو خانەی کەمن لیٚی دابەزیبوم لە ناو بازاردا گاوریٚکی موسل «مەتی» بۆی باس کردم کە ئەمە ماوەی بیست ساڵە لە سلیٚمانیدا خەریکی کاسبی و بازرگانیە و تا ئەوکاتە تووشی هیچ گیٚچەڵ و سەریەشەیەک نەبوە».

میٚجرسۆن لە کتیٚبەکەیدا باسی هەندیٚ گاوری تری موسلی کردوە وەکو (حەبیبە سوور) کە بیٚگومان ئەگەر یەکیٚکیان گلەییان لە کوردە موسلمانەکان ببوایە میٚجرسۆن ئەی قۆزتەوە و ئەوەندەی تریشی پیٚوە ئەنا.

تورکەکان دوای ئەو هەموو تاوانەی بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان کردیان هەوڵیان دا دەستە خویٚناویەکەی خۆیان بەسەر کوردا بسرن و تەقەلایەکی زۆریان دا رای گشتی ئەوروپای ئەوسا تیٚبگەیەنن ئەو تاوانەی لە ئەرمەنی کرابو، کورد کردبوی نەک تورک، دوکتور کەمال مەزهەر لە کتیٚبەکەیدا «۷» باسی راپۆرتی ئەو لیٚژنەیە ئەکا کە بۆ چارەسەرکردنی کیٚشەی «ولایەتی موسل» دانرابو لەلایەن عصبە الامەوە. ئەو راپۆرتە ئەڵیٚ:

«گاورەکان لەپیٚش شەری یەکەمدا زۆر بەختیارانە لە کوردستاندا ژیاون».

هەروەها (ف. گردلیڤسکی) لەو رووە ئەڵیٚ «۷»:

«قەت جیاوازی ئایینی لە نیٚوان کوردە موسلمانەکان و ئەرمەنی و کریستیاندا دەوری نەبینیوە». گردلیڤسکی باسی ئەوە ئەکا کە چۆن ئەرمەنیەکان ئەچون بۆ مزگەوت و موسلمانەکانیش ئەچون بۆ کەنیسە و ئەو چوونەلای هەردووکیان شتیٚکی ئاسایی بوە (بیٚگومان ئەوەی گردلیڤسکی باسی کردوە ئەو چوونەی هەردولا لە کاتی جەژن و پرسە و جەنازەی مردوو بردندابوە).

بلەچ شیٚرکۆ لە کتیٚبەکەیدا «۱۸» دەربارەی بەرپەرچ دانەوەی درۆ و دەلەسەی

تورکەکان کە تاوانی کوشتارەکەی ئەرمەنی ئەدەنە پاڵ کورد ئەڵێ:

«دوای وەستاندنی شەر و موتارەکە (هدنە)- کە نیازی رێکەوتنی موداراس بوە- تورکەکان بەربوونە وێزەی ئەرمەنیەکان و دەستیان کرد بە کوشتاریان. دوای ئەوەی ولاتانی ئەوروپا بێزاری خۆیان بەرامبەر بەو تاوانە دەربری، سەدری ئەعزەم کە تەوفیق پاشا بو لە دوای (هدنە) لەو کۆنگرەیەی لەندەن‌دا گیرا وتی: ئەوانەی ئەرمەنیەکانیان کوشتوە کوردەکان بوون، حکومەتی تورک لەبەر شەڕ ئاگای لەو تاوانانە نەبوە و فریای ئەوە نەکەوتوە کە رێگا لە روودانی ئەو تاوانە بگرێت.

بلەچ شێرکۆ لە کتێبەکەیدا وەرامی سەدری اعظم ئەداتەوە و ئەڵی:«١٨»

«ئەوەی باش بوو کە ئەرمەنیەکان خۆیان دانیان بەوە دانا کە کوردەکان لە کاتی شەری یەکەمی جیهاندا خزمەتێکی گەورەی ئەرمەنیەکانیان کرد بەوەی کە نزیکەی « ٥٠ » هەزار ئەرمەنی‌یان پاراست و تەسلیمی لەشکری روس و هێزی ئەرمەنیەکانیان کردن کە لەشکری ئەو دوولایە لە دوای دەست‌پێکردنی شەر چوبوونە ناو کوردستانەوە...... کلیمەنسۆی سەرەک وەزیرانی فرنسە هەر لەو رۆژانەدا بێزاری خۆی بەرامبەر بە تورک و بەرامبەر بە کردەوەکانیان بەم جۆرەی خوارەوە دەربریوە:

- بەناوی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانەوە ئەڵێم کەوا تورکەکان دەریان خست بە هۆی کردەوە نارێک و خوارەکانیانەوە توانای ئەوەیان نەبوە کە ئیدارەی کاروباری غەیری تورک بکەن، لەبەر ئەوە نابێ هیچ میللەتێکی تر لەژێر دەسەلاتی تورکدا بمێنێتەوە-.

گەلێ بەڵگەی تر هەیە جگە لەوەی بلەچ شێرکۆ کە لە کاتی خۆیدا باسی ئەکرێ هەمووی ئەو پروپاگاندە و درۆ و دەلەسانەی تورک بە درۆ ئەخەنەوە. ئیمرۆ کە وائێمە لە ساڵەکانی هەشتاکانداین، پاش تێپەربوونی حەفتا ساڵ، ئەرمەنیە رۆشنبیر و سیاسیەکان بە باشی و بە بەڵگەی ئاشکرا بۆیان دەرکەوتوە کە کێ‌بوە بە هۆی ئەو کوشتارە و لە هەموو لایەکی جیهانەوە خۆیان بەرامبەر بەو تاوانەی تورک دەرئەبرن.

# ٤- باری رۆشنبیری و خوێندەواری

وەکو چۆن نەمانتوانی لە باسی چینەکان و باسی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایینیدا هێڵ و سنوورێکی تایبەتی دەست نیشان بکەین لە نێوانی خوارووی کوردستان و لە بەشەکانی تری کوردستان جیای بکەینەوە، بەو جۆرەش لە باسی رۆشنبیریدا هەوڵدان بۆ لێک جیاکردنەوەیان تەقەلایەکی خۆرایی و بێ هوودەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ ئەدەم بەپێی توانا زۆرتر بچینە بنج و بناوانی باری رۆشنبیری لە خوارووی کوردستاندا لەگەڵ هەڵسانگاندنی پلەی خوێندەواری و رۆشنبیری و لە هەر شوێنێکدا و لە هەر مەبەستێکدا کە جەمسەری باسەکە بەبەستێتەوە بە باری رۆشنبیری و خوێندەواریی بەشەکانی تری کوردستان ئەوا وەکو شتێکی ناچاری ئەبێ بە شێوەیەکی گشتی لەو باسە بدوێین.

بۆ نموونە، شوێنێکی وەکو ئەستەمبوڵ کە بریتی بوە لە کۆمەڵگای ئەو هەموو کوردانەی لە پایتەختی عوسمانلیدا بوون و لە شوێنەکانی جیاجیای کوردستانەوە روویان تێکردبوو بۆ خوێندن یا کار و فەرمان و بەپێی هەستی نەتەوایەتی لەو کۆمەڵگایەدا پێوەندییان لەگەڵ یەکتردا بوە و بەکۆمەڵ بەشدارییان کردوە لە بزوتنەوە و چالاکی ناو ئەو کۆمەڵگایە و (یانە) و قوتابخانەیان پێکهێناوە و رۆژنامە و گۆڤاریان دەرکردوە و ئەوانەی بەشدارییان کردوە بریتی بوون لەو کوردانەی لە هەموولایەکی کوردستانەوە روویان کردۆتە ئەستەمبوڵ. بۆیە ناتوانرێ ئەو باری رۆشنبیری و خوێندەواریەی ئەوێ بدرێتە پاڵ بەشێک لە بەشەکانی کوردستان.

بە شێوەیەکی گشتی باری رۆشنبیری لە خوارووی کوردستاندا لە پاش لەناوچوونی ئەمارەتی بابان هەتا شەری یەکەمی جیهانی وەکو بەشەکانی تری کوردستان لەچاو وڵاتانی تردا زۆر دواکەوتوو بوە و حکومەتی عوسمانلی و ئێران کە بە جووتە دەستیان بەسەر کوردستاندا گرتبوو و هیچ جۆرە بایەخێکیان نەداوە بە خوێندەواری لەناو میللەتی کوردا و هەوڵیان داوە هەر تەقەلایەک لەو

رووەوە بدرێ هەمووی پووچەڵ بکەنەوە. سالمی شاعیر لەو شیعرەیدا کە بۆ وەرامی شیعرەکانی (نالی) وتوە باسی ئەو سەردەمەی ناوچەی بابانی داگیرکراوی کردوە کە چۆن کەوتۆتە ژێر باڵی رەشی عوسمانلی‌یەوە و خوێندەواری و رۆشنبیری پشت‌گوێ خراوە.

وەکو چۆن لە دوای روخاندنی ئەمارەتی بابان لەلایەن عوسمانلی‌یەکانەوە ئیتر خوێندەواری کەوتە کزی و شوێنی خوێندن و فێرگەکان بێ‌ناز مانەوە و سەرپەرشتیکەرێکی خەمخوار و دڵسۆز و دەسەڵاتداری ئەوتۆ نەبوە کە پەرە بە خوێندن بدات، هەر بەو جۆرەش لە کوردستانی ئێراندا لە دوای روخاندنی ئەمارەتی ئەردەلان، خوێندەواری و شوێنی خوێندگاکان لاواز بوون و مایە وەسەرتاک و لۆکە هەرکەس بە جیا مشووری خۆی و منداڵی خواردوە و خوێندن و خوێندەواری لەناو چەند کەسێکی کەمدا ماوەتەوە و شێوەی (گۆران) کە شێوە زمانێکی رەسمی ئەردەلانیەکان بوە، وردە وردە بەکارهێنانی کەم بۆتەوە. بەڵام لە دوای مەشروتیەتی ئێران و تورکیا کوردیش لەهەردولا کەوتنە خۆی و هەندێ لەو کوردانەی تورکیا کە پێوەندی‌یان بە ناوچەی ژووروی خۆرئاوای ئێرانەوە بوە و شێوەی زمانەکەیان لەگەڵ هەندێ ناوچەدا لەیەک چوە، توانیویانە لەناو هەندێ شاردا چالاکی‌یەکی رۆشنبیری و خوێندەواری بنوێنن. لە کۆتایی سەدەی پێشوو بە دواوە لە خوارووی کوردستانیشدا روشدی مولکی و روشدی عسکری کە لە سلێمانیدا لە ساڵی ١٨٩٣م کراوەتەوە گیانێکی تازەی بەخشیوە بە ناوچەکە و ژمارەیەک خوێندەواران لە (ئەرێ بابە)ی ناو مزگەوتەکان رزگاریان بوە و بەمنداڵی چوونەتە ئەو قوتابخانەیە و لەدوای چەند ساڵێک لەوانە ژمارەیەک ئەفسەر و خوێندەوار و رۆشنبیر پێگەیشتن کە توانیان لە دوای شەری جیهانی یەکەم بە دواوە رۆڵێکی ئاشکرا ببینن (روشدی عەسکەری سەعید پاشای خندان لە سلێمانی دای‌نابوو) وەکو لە هەندێ شوێنی تریشدا باسمانکردوە خوێندن جگە لەو دوو قوتابخانەیە، شوێنەکانی تر بریتی بون لە خانەقا و ژووری مزگەوتەکان کە چەند مەلایەکی زرنگ و وریا و چەند شاعیرێکی تیادا هەڵکەوتوە کە ژیانی ئەوانە لە سەرەتاوە هەندێ جار هەتا مردنیش زۆر سەخت و گران بوە و تا فەقێ بوون ناچار بوون بە ژیانێکی مەمرە

و مەڕی قایل بێن و بەبار بوو یارمەتی هەندێ خێرخواو دەرودراوسێی مزگەوت و بە (راتووی فەقێ) و بە (دەقنەی فەقێ) ژیانی رۆژانە و جل و بەرگ و ئەگەر بۆیان کرابێت هەندێ کتێب چ نوسراوە بووبێت یا دەسخەت کریویانە هەتا گەیشتونەتە پلەی دوازدەعیلم. ئەوسا هەریەکە هەوڵی داوە لە مزگەوتێکدا دامەزرێ و تارادەیەک ژیانێکی تۆزێ باشتری لەوەی سەردەمی فەقێتی بۆخۆی موسۆگەر بکات.

لەدوای مەشروتیەتی ئێران و عوسمانلی هەندێ کەس تۆزێک چاوی کرایەوە و بە وشەی یاسا و ئازادی و سەربەستی و هەندێ بیروباوەری تر گوێی زرنگایەوە کە ئەمانە هەمووی پێکەوە زەنگی مەترسی و هەرەس هێنانی بۆ دەزگا کۆنەکان لێ ئەدا و نوخشەی هاتنی قۆناغێکی نوێی تیابەدی ئەکرا.

کێشەی نێوان ئیتحاد و تەرقی و ئەوانەی سەربە سولتان بوون و دژی هەموو جۆرە گۆڕینێکی یاساو کەم کردنەوەی دەسەڵاتی خەلیفە بوون بوو بە هۆی کەف و کوڵێکی بە جۆش و ئاسمانی وڵاتانی عوسمانلی هەرلایە بە جیا بە جۆرێک تیشکی خۆرێکی تازەی تیابەدی ئەکرا کە تا رادەیەکیش وڵاتی کوردستانی گرتەوە و ئەو دروشمانەی ئیتحاد و تەرقی بەرزیان کردبووە بوون بە تیزی تفەنگ لەناو کۆمەڵگای کوردا بە تایبەتی لە ئەستەمبوڵ و چاوی خەوالو و ئالۆزی ئەوانی کردەوە ئەگەرچی زۆری پێ نەچوو ئەو دروشمانەی کە ئیتحاد و تەرەقی بەسەر زاری بۆی تێ ئەکۆشان و بەناو خەڵکیدا بڵاویان ئەکردەوە دەرکەوت هەمووی رواڵەت و درۆ بوە و رەگەزپەرستەکانی تورک ئەو دروشمانەیان تەنها بۆ سەرگرتنی مەبەستەکانی خۆیان ویستوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باس ئەکرێت.

ئەستەمبوڵ کە شوێنی کۆمەڵگای کوردەواری بوە لە کاتی ئەو کەف و کوڵەدا ژمارەیەک لە کوردی رۆشنبیر لەوانەی کە لە سوپای عوسمانلی دابوون یا فەرمانبەر بون یا قوتابی ناو قوتابخانەکان بون یا کاسب و بازرگان بون، وەکو چۆن تورکەکان ئیتحاد و تەرەقی یان بۆخۆیان سازکرد (ئەگەرچی کوردیش لەو ئیتحاد و تەرەقی یەدا بەشداری کردوە و لەسەرەتادا رۆڵێکی زۆر گەورەی بینیوە لە چالاکی ئەو رێکخراوەدا) و کوردە رۆشنبیرەکانیش دەستیان کرد بە

کردنەوەی قوتابخانەی کوردی بۆ فێرکردنی منداڵان و کۆمەڵ و ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری هاتە کایەوە و توانیان لە کۆبوونەوە و کۆنفرانس و کۆنگرەکاندا نوێنەریان دەورێکی گرنگ ببینێت.

جەلیلی جەلیل لە کتێبەکەیدا بە ڕوسی کە (باقی نازێ و د. ولاتو) کردوێتی بە عەرەبی و لە ساڵی ١٩٨٦دا لە بەیروت چاپکراوە بە دووروودرێژی باسی گەشەکردن و بوژانەوەی روشنبیری نەتەوەی کوردی کردوە و ناوی ئەو کوردانەی یەکەیەکە هێناوە کە چالاکییان بوە لەو ڕووەوە.

قەدری جەمیل بەگ (زنار سلوپی) «١٩» دەربارەی چالاکی هەندێ لە کوردەکانی ئەو سەردەمە ئەڵێ:

«خەلیل خیالی» کە لە عەشیرەتی «مودان» بو لە ناوچەی بتلیس لەسەر دەستوری زمانی کوردی گەلێک باسی نوسیوە و قاموسێکی کوردی ئامادەکردوە (ئاخۆ ئەو بەرهەمانە هیچ شوێنەوارێکیان مابێ یا لە چ کتێبخانە و لای چ کەسێک دەست ئەکەون؟) و یەکێک بوە لەو ڕۆشنبیرە کوردانەی لە دامەزراندنی کۆمەڵی (تعالی و تەرەقی)ی کوردی و (نشر معارف جمعیتی)دا بەشداری کردوە».

قەدری جەمیل بەگ لە لاپەرە (٢٧)ی کتێبەکەیدا باسی (بدیع الزمان) ئەکا (بدیع الزمان خەڵکی شاری سنەی کوردستانی ئێران بوە) کتێبێکی دەرکردوە بە ناوی (شهادە حول نکبة مدرستین) لە لاپەرە (٤٤)ی ئەو کتێبەدا بدیع الزمان دەربارەی خەلیل خیالی بەم جۆرەی خوارەوەی نوسیوە:

«خلیل خیالی سەرەتای پیتی ئەبجەدی و دەستوری زمانی کوردی داناوە، دەرکەوتنی ئەو نیشتمانپەروەرە لە کوردستاندا وەکو ئەستێرەیەکی درەوشەدا دار وابوە، وەنەبێ خلیل خیالی هەر ئەو جۆرە باسانەی بە شێوەی کرمانجی بەجێ هێشتبێ، بەڵکو یەکێک بوە لە هەرە نیشتمانپەروەرەکانی کورد لە دوای ئەحمەدی خانی شاعیری مەزن».

لە ڕاستیدا وەکو تەوفیق وەهبی و پیرەمێرد باسیان ئەکرد، بدیع الزمانیش خۆی لە خۆیدا زانا و خوێندەوارێکی بەرز بوە و لەو ڕۆژانەدا لە ئەستەمبول دەورێکی گرنگی بینیوە.

جارێک بیرەمێرد باسی بدیع الزمانی کرد کە مرۆڤێکی زۆر بلیمەت و رێز لیٚگیراو بوە و بە شێوەی (گۆران) گەلێک شیعری وتوە.
پیرەمێرد لە شیعرێکیدا بە ناوی (نەعرەتەی دێوانە) باسی بدیع الزمانی بەم جۆرە کردوە کە دیارە بدیع الزمانیش لە جەوری تورکەکان رزگاری نەبوە:

کاک ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا — زۆرکەس لە سایەی تۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ — هەرتۆی سەربەرزیی قەومەکەت ئەوێ
کە لە زیندانیان تێک خزاندبووین — سێدارەیان بۆ، داچەقاندبوین
تۆ چوبویتەلای (بدیع الزمان) — مژدەت دابوویە بە ژیان و مان
فەرموبوت: ئێوە نامرن ئەمێنن — تاسەر ئازادی گەلتان ئەسێنن

قدری جەمیل بەگ «۱۹» لە یاداشتەکانیدا باسی گەلێک نووسەر و زانای ئەو سەردەمە ئەکا وەکو میری کاتب زادە جمیل بەگ کە لە رۆژنامەی کوردستاندا بە ناوی م. جەمیل،وە، شتی بلاٗوکردۆتەوە، (کوردی زادە- ئەحمەد رامز بەگ) کە خەڵکی ناوچەی دیاربەکر بوە لەساڵی ۱۹۰۰دا لە کۆمەڵی (العزم القوی... جمعیە الصمود الکردستانی) بەشداری کردوە و بوە بەسەرپەرشتێکەری ئەو مەعهەدەی کە کۆمەڵی (نشر معارفی کورد)ی لە ئەستەمبول پێک هێنابو.
جەلادەت بەدرخان (بلەچ شێرکوە) «۱۸» دەربارەی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە ئەلیٚ:
«کە کۆمەڵی (تعالی و ترقی کورد) لە ئەستەمبول دامەزرێنرا، ئەوانەی کە بەشداری‌یان تێداکردبو بریتی بوون لە: ئەمین ئالی بەدرخان، فەریق شەریف پاشا (نیازی لە شەریف باشای خندانە کە خەڵکی سلێمانی بوە و لە کۆنگرەی ئاشتیشدا بو و بە نوێنەری کورد)، شیخ عبدالقادری شهید، داماد ئەحمەد ذو الکفل و هەندێکی تر و شان بەشانی ئەوە کۆمەلێکی ئەدەبی دروستکرا بە ناوی (جمعیە نشر المعارف الکردیە) کە قوتابخانەیەکی کوردی‌یان لە (چمبرلی طاش) کردبوەوە بۆ ئەوەی ئەو منالاٗنەی کە لە ئەستەمبول بون فێری خوێندن بکرێن...... بەلاٗم کە ئیتحادی‌یەکانی تورک هاتنە سەرکار هەردوکیان داخست.
لە ساڵی ۱۹۱۰دا کۆمەڵی (هیڤی) کوردی دروست بو لەو قوتابیە کوردانەی

ئەورۆژە لە ئەستەمبول بون کە عومەر ئەفەندی و قەدری جەمیل بەگ (لە ئەعیانی دیاربەکر) و فواد تمر بگ الوائلی و زەکی بەگ پێکیان هێنابو بە چاودێری و سەرپەرشتیکردنی خەلیل خەیالی. بلەچ شێرکوە دەربارەی بلاوکراوەکانی ئەو سەردەمە ئەلێ:

«رۆژی کورد، ئۆرگانی کۆمەڵی هیڤی بو، جگە لەوە حەمزە ئەفەندی و مەمدوح بەگ و کەمال فەوزی بەگ رۆژنامەی (ژین)یان دەردەهێنا. لەدوای ئەوە (ثریا بەدرخان) لە قاهیرە (جمعیتی استقلالی کوردستان)ی دانا و لە ئەستەمبول شێخ عبدالقادری شمزینی و ئەمین ئالی بدرخان و مراد محمد علی و خلیل رامی و کامەران و فواد پاشا و حکمت وحوسنی و شکری و فواد محمود و عەلی (لە بابانەکان) و سید عبدالله و رمزی بەگ خربوط و ئەکرم جمیل پاشا و نجم الدین حسین و ممدوح سلیم و حسن حامد و ئەمین زەکی و خەلیل بەگی دەرسیملی‌ی و میر ئالای و محمود ندیم و فەریق مصطفی پاشای سلێمانی (یامولکی) و فەریق حمدی پاشا و محمەد ئەمین زەکی خەڵکی سلێمانی و شێخ علی شێر و شەفیق ئەفەندی ئەمانە هەموویان لەناو خۆیاندا جمعیتی تعالی و ترقی کردستانیان دامەزراند.

دوکتور عەزیز شمزینی دەربارەی رۆشنبیری ئەو رۆژانە ئەلی: «١٤»

«لەو رۆژانەدا کە مامۆستا خەلیل خیالی لە کوردستانی تورکیا دا بەوپەری دڵسۆزی‌یەوە سەیری خوێندەواری ئەکرد لەناو کوردستاندا نەخوێندەواریی بە یەکێک لە دەردەکاریگەر و کوشندەکانی کورد داناوە، هەر لەو سەردەمەی خەلیل خیالی‌دا عبدالرزاق بدرخان لە کوردستانی ئێران جیّ‌ی مامۆستا خەلیل خیالی گوتبوەوە لە کوشش و تەقەلادان بۆ بلاوبوونەوەی خوێندەواری. عبدالرزاق بدرخان لە ساڵی ١٩١٣دا لە شاری (خوی) کۆمەڵەی رۆشنبیری دامەزراند و یەکەم قوتابخانەی کوردی لەو شارەدا کردەوە. بەرلەوەش بە هۆی قونسولی رووسەوە داوای لە رووسەکان کردبوو رۆژهەلاتناسی بەناوبانگ (ئۆربیللی) بنێرن بۆ کوردستان بۆ دانانی (رێزمان) و فەرهەنگ بە زمانی کوردی و وەرگێرانی ئەدەبی رووسی بۆ کوردی و داوای لیّ‌کردبوون کە بەشێکی کوردی لە دەزگای رۆژهەلاتناسی‌ی پترۆگراد دامەزرێنرێت».

لەو رۆژانەدا کە ئەو جۆرە چالاکیانە هەبوە لە ئەستەمبولدا هەندێکی تری وەکو مستەفا یامولکی دەورێکی زۆریان بینیوە...... جارێک تەوفیق وەهبی باسی کوردەکانی ئەو سەردەمەی ئەستەمبولی بۆ کردین کە چۆن (یانە)یەکی کۆمەڵایەتیان دامەزراندبوو، لەو هەڵبژاردنەدا مستەفا یامولکی هەڵبژێررا بە سەرۆکی ئەو یانەیە. مستەفا یامولکی بۆ هەڵبژاردنی خۆی ژمارەیەکی زۆری کورد لە کرێکاران و شاگرد و حەمالی ناوبازاری ئەو رۆژانەی کە لە ئەستەمبولدا بون کۆیکردنەوە و هەموشیان بە قسەیان کرد و دەنگیان بۆدا و تەوفیق وەهبی کردی بە پێکەنین و وتی: مستەفا پاشا لەپێش هەڵبژاردندا چوە سەر مێزێک و باسی مێژووی کۆنی کوردی کرد و وتی: دجلە و فورات هەر لە کۆنەوە هی‌ناو خاکی کوردەواری بون...... دیجلە یەعنی تیکەڵە کە لە تێکەڵ بوونی هەردو زێ پێک دێن و (فرات)یش لە (فرِ...هات)ەوە پەیدا بوە کە لەشاخەکانەوە دێنە خوارەوە...... حاجی تەوفیقی پیرەمێرد چاکەتەکەی گرت و وتی: پاشا وەرەخوارەوە، ئەوانەی هێناوتن هەمرو دەنگ بۆتۆ ئەدەن ئیتر خۆت بە تاریخ و جوگرافیاوە ماندوو مەکە.

جگە لەوە تەوفیق وەهبی هەمیشە باسی کەریم بەگی حاجی عەبدوللای حەمە کەرکوکی ئەکرد و ئەی‌وت: لە کوردە زۆر چالاکەکانی ئەستەمبول بوو و کوردایەتیەکی گەرمی ئەکرد و گۆڤارێکی بە کوردی و بە تورکی دەرئەهێنا و خۆی تیایا بەشداری نووسینی ئەکرد و لەسەر هەندێک نووسینی ناو ئەو گۆڤارە (رۆژی کورد) تورکەکان گرتیان و حەپسیان کرد بەڵام بابانەکانی ئەستەمبول ناسراو بوون بۆی تێ‌کۆشان و لە زیندان دەریان هێنا...... کەریم بەگ گەرایەوە بۆ کوردستانی خواروو ماوەیەک محامی بوو ماوەیەکیش کرا بە (حاکمی مونفەرد).

قەدری جەمیل بەگ «١٩» دەربارەی ئەو رۆژانە ئەلێ: (هیڤی) گۆڤارێکی هەفتانە بوو لە ساڵی ١٩١٣دا بە کوردی و تورکی دەرئەچوو گۆڤاری (رۆژی کورد) کە سەرنووسەرکەی کەریم بەگی کەرکوکی زادە بوو. پرۆفیسۆر ئیسماعیل حەقی بابان زادە کە لە جامعەی ئەستەمبول دابوو، (ئەو ئیسماعیل حەقی بابانە جگە لەوە خاوەنی گۆڤاری «ئیجتهاد»یش بوە کە لە بەشی کوردی

ئەو گۆڤارەدا عبدالله جودت و ممدوح سالمی خەڵکی وان و ضیاء بتلیسی و کەمال فەوزی بەگ و گەلێکی تر بەشداری‌یان تیادا کردوە)، بەلاٰم بەشی کوردی‌یەکەی گۆڤاری (رۆژی کورد) بریتی بوە لە نجم الدین حسین بەگ (کەرکوکی) و عبدالله بەگ (خەڵکی سلێمانی) و حمزە بەگ خەڵکی (مامیکیس) و هەندێ کەسی تریش بەشداریان کردوە.

قدری جمیل بەگ دەربارەی گۆڤاری رۆژی کورد ئەڵێ: «۱۹»

«مەبەست لە دەرچوونی ئەو گۆڤارە بلاٰوکردنەوە و پێشخستنی رۆشنبیری بوو لەناو کوردەکاندا و هەوڵی ئەدا نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردی بلاٰوبێتەوە، لەناو ئەو نووسەرانەدا عبدالله جودت هەوڵێکی زۆری دا کە بە پیتی لاتینی چەند نووسینێک بلاوبکرێتەوە و یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە فایزبەگی دیاربەکر کە ئەوسا فرمانبەر بوو لە ئەستەمبوڵ ئەو تەقەلایەی دا. (پیرەمێردیش کە هاتەوە سلێمانی و خەریکی رۆژنامەدەرهێنان بوو تەقەلایەکی لەو جۆرەی دا و لە رۆژنامەکەیدا چەند نووسینێکی بە پیتی لاتینی بلاٰوکردەوە، لە دیوانەکەی پیرەمێردا باسی ئەو تەقەلایەم کردوە). دوای ئەوەی حکومەتی عوسمانلی گۆڤاری- رۆژی کورد-ی داخست، حمزە بەگ گۆڤاری (هەتاوی کورد)ی دەرکرد و چەند کەسێک لە لاوانی کوردی ئەو سەردەمە بەشداری نوسینیان تیادا کرد کە لەناو ئەوانەدا نووسینەکانی (عبدالرحمن حکاری) سەرنجی خوێندەوارانی راکێشابو وەئەو شیعرە ناسراوەی کە بەناوی (ناڵینا رەبەندەکی) کە لە ساڵی ۱۹۱۱دا لەلایەن ئەکرەم جەمیل پاشاوە رێکخرابو لەو گۆڤارەدا بلاٰوکرایەوە.

قەدری جەمیل بەگ لە یاداشتەکەیا لە سەری ئەروا و ئەڵێ: کە شەری جیهانی یەکەم دەستی پی‌کرد، تورکەکان بۆ ئەوەی کۆمەڵی هیڤی لاواز بکەن داوایان کرد لەگەڵ ئەوەی مەرکەزی تورکی‌دا، بیکەن بە یەک و بەو جۆرە هەردوکیان پێکەوە لکێنران. (سەیر ئەوەیە ئیمرۆ ئەڵێ‌ی دوێنی‌یە...... لە عێراقیش کە میری هەر کاتێک غەزەب لە کورد بگرێ، ئیتر لە بریار و بەڵێنەکانی پێشووی پاشگەز ئەبێتەوە و بە هەمان بەزمی تورکیای ئەوسا، ئەویش یەکێتی نووسەرانی کورد و کۆری زانیاری و رێکخراوە کوردی‌یەکانی تر

هەمووی ئەلکێنتەوە بە ڕێکخراوەکانی عێراقییەوە).
کە تورکە عوسمانلییەکان کەوتنە ڕاونانی ڕۆشنبیرانی کورد، ئیتر بەشی زۆریان بە ناچاری- وەکو بنەماڵەی بەدرخان- ڕوویان کردە دەرەوە و مەڵبەندی ڕۆشنبیرییان گواستەوە بۆ قاهیرە و لەدواییدا بۆ شام و بۆ بیروت. بەر لە شەری جیهانی و لەکاتی شەریشدا لە شاری (لۆزان) لە سویسرە هەندێ قوتابی کورد چالاکییان بوە و قەدری جەمیل بەگ لە کتێبەکەیدا «١٩» بە دووررودرێژی باسی هەمووی کردوە کە لە شوێنی خۆیدا لێیئەدوێن.
گۆڤاری کۆری زانیاری لە بەغدا- بەرگی یەکەم...... بەشی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ لە لاپەرە ٣٩٤ هەتا ٣٩٧ باسی چالاکی بنەماڵەی بەدرخان و چۆنێتی دەرچونی ڕۆژنامەی کوردستان کراوە کە لەلایەن مقداد بەدرخان-وە لە ١٨٩٨/٤/٢٢دا دەرچوە کە چەند ژمارەیەکی لە (جنێڤ) و هەندێکی لە (لەندەن) و بەشێکی تری لە شاری (فولکستوت)ی بریتانیا دەرچوە...... ئەمین زەکی بەگ و محمد علی عەونیش لە پێشەکی خولاسەی مێژووی کورد و کوردستاندا ئەلێن: هەندێ ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیە لە ئەستەمبولیش دەرچوە.
بەراستی حوسێن حوزنی موکریانیش (داماو) ماوەیەک لە سوریا (حەلەب) چالاکیەکی چاپەمەنی تەواوی هەبوە و لە دواییدا کاروباری گواستەوە بۆ ڕواندوز کە ئەرشیبالد هاملتن «٤٤» لە کتێبەکەیدا باسی حوسێن حوزنی کردوە وەکو نموونەیەکی بێهاوتاو تاک لە جیهانی چاپەمەنیدا کە خۆی چاپخانەکەی بردوەبەرێوە و خۆی پیتەکانی ڕێکخستوە و خۆی نووسینی تیابڵاوکردۆتەوە.
گیوی مۆکریانی باسی گەلێک کتێبی کردوە کە (داماو)ی کاکی بڵاوی کردۆتەوە وەکو:
١- مەم و زین لە ساڵی ١٩١٥دا.
٢- مێرگەی دڵان لە ساڵی ١٩٢٠دا.
٣- گەوهەرییەکان لە ساڵی ١٩١٦ دا بڵاوی کردۆتەوە...... جگە لەوە گیو باسی خونچەی بەهارستان و گەلێک باسی لە گۆڤاری کوردستان، بۆتان، چیا کرمانجی، دیاربەکر، سۆران و ئارارات ئەمانەی هەموو چاپ کردوە (تۆ بڵێی ئێستا ئەو بەرهەمانە مابن؟).

له خوارووی کوردستانا، له زه‌مانی ئه‌ماره‌تی بابان و له دوای رووخاندنی، گه‌لێک زانا و خوێنده‌وار هه‌بون وه‌کو محه‌مه‌د ابن الحلاج و مه‌ولانا خالیدی نه‌قشبه‌ندی و شێخ مارفی نۆدی (که قاموسێکی کوردی عه‌ره‌بی به شیعر بۆ کاک ئه‌حمه‌دی کوری وتوه به ناوی ئه‌حمه‌دی‌یه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی فێری عه‌ره‌بی بکات) و مه‌لا عبدالرحمنی نۆتشه‌یی ومه‌لا مه‌حمودی دێلێژه‌یی باوکی مه‌لای چاوماری به‌ناوبانگ و، کاک ئه‌حمه‌دی شێخ و مه‌لا سه‌عیدی زلْزلْه‌یی و زاناکانی بیاره و ته‌وێله و جه‌لی زاده (مه‌لای گه‌وره له کۆیه) و گه‌لێک زانا له کوردستانی ئێران که پێوه‌ندی‌یه‌کی زۆریان به خوارووی کوردستانه‌وه بوه و هه‌ندێک له زاناکانی (مه‌ردۆخی ناوچه‌ی سنه) هاتونه ناوچه‌کانی خوارووی کوردستان و ده‌وری خۆیان بینیوه (وه‌کو شێخ بابا عه‌لی) له سلێمانیدا.

له کۆتایی سه‌ده‌ی پێشوودا رشدی مولکی و له دوای ئه‌و رشدی عه‌سکری که له شاری سلێمانیدا به ته‌قه‌لای سه‌عید پاشای خندان له سالی (۱۳۱۱هـ-۱۸۹۳م)دا کراوه‌ته‌وه ده‌ورێکی زۆر گرنگیان بوه و ژماره‌یه‌کی باش خوێنده‌واریان پێ‌گه‌یاندوه که بوون به ئه‌فسه‌ر له سوپای عوسمانلی‌دا و پایه‌ی به‌رزیان بوه و که گه‌راونه‌ته‌وه بۆ کوردستان له دوای شه‌ری جیهانی یه‌که‌م هه‌ندێکیان له حوکمداریه‌ته‌که‌ی شێخ مه‌حمودا هاوکاریان کردوه و هه‌رچه‌ند ئه‌وانه له دواییدا به هاندان و به هه‌ره‌شه‌ی ئینگلیزه‌کان له شێخ ته‌کینه‌وه و چونه ناو ده‌زگاکانی عێراقیه‌وه.

ته‌وفیق وه‌هبی جارێک باسی ئه‌وه‌ی بۆکردین و وتی: له‌و پێنج که‌سه‌ی که مکتبی عه‌سکه‌ری‌یان له به‌غدا داناو خه‌ریکی رێک و پێک‌خستنی کاروباری سوپای عێراقی بوون له ده‌ست‌پێ‌کردنیا سێ که‌س له‌وانه کورد بوون (که نیازی یاسین هاشمی و ئه‌مین زه‌کی و خۆی بوه).

له باسی یاسین هاشمی‌دا ته‌وفیق وه‌هبی ئه‌یوت: ئێمه که له تورکیا بوین قه‌ت به یاسینی هاشمی‌مان نه‌بیستبوو چونکه یاسین هاشمی کاکه‌یی بوو، به‌لام وادیاره له دواییدا کاکه‌یشی به سه‌ید دانابو بۆیه که هاته‌وه ناوی خۆی گۆری به هاشمی به‌تایبه‌تی که بنه‌ماله‌ی هاشمی بون به ده‌سلاتدار ئیتر زۆری تری وه‌کو ئه‌و بون به هاشمی و به عه‌ره‌ب.

تەوفیق وەهبی لە باسی ئەو جۆرە کەسانە ناوی (بهاءالدین نوری) هێناوتی وەختی خۆی لە ئەستەمبول دەورەیەکی رشاش کرایەوە بهاء الدین نائب ظابط بوو من چاودێری و سەرپەرشتی ئەو دەورەیەم ئەکرد ئەوسا بە بهاء الدین کوری شێخ نوریم ئەزانی کەچی کە هاتینەوە بەغدا رۆژێک لە دەورەیەکی عەسکری‌دا چادرێکی هەڵدابوو لی‌ی‌نوسیبو: اولاً: الرب وثانیاً: العرب. لێم پرسی (بەها) تۆ کوری شێخ نوری نەبویت...... لە وەرامدا وتی من کوری (خدای نابتم)...... بەڵام لە دواییدا لە ناوەراستی چلەکانا بایداوە بەرەو کوردایەتی.

تەوفیق وەهبی لەباسی رشدی عەسکری‌دا باسی (حاجی قلندر)ی بۆ ئەکردین کە کابرایەکی زۆر زیرەک بوە و باش فەراشی ئەو مەکتەبە بوە، بەڵام کە مامۆستایەک نەچوایەتە پۆلەوە ئەو جێگەی ئەگرتەوە و قوتابی‌یەکان ئەوەندەیان خۆش ئەویست خواخوای ئەوەیان بوو هەموو رۆژێک مامۆستایەکیان نەچێتە پۆلەوە و تەوفیق وەهبی لە (دەنگی گیتی) دا زۆر باسی ئەو حاجی قەلەندەرەی کردوە. دەربارەی (ئەمین فەیزی بەگ) تەوفیق وەهبی ئەیوت: زیرەک و بلیمەتی وامان کەم بوە و وتی هێشتا من لە ئەستەمبول بوم نەگەرابومەوە بۆ کوردستان ئەمین فەیزی لە بەغداوە گەرایەوە بۆ ئەستەمبول و مسوەدی کتێبەکەی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)ی لەگەڵ خۆی هێناوپێش چاپکردنی پیشانی داین.

زۆربەی سەرچاوەکانی ئەو سەردەمە ئەڵێن خوێندن لە قوتابخانەکاندا بە تورکی بوە و نامە نووسین لەگەڵ یەکتردا بە زۆری بە فارسی بوە، تاک و لۆکە یەکێکی وەکو کاک ئەحمەدی شێخ کە بە کوردی دەرسی وتوتەوە لای هەندێکەس ئەوە جێگەی رەخنە بوە و حاجی قادری شاعیر لە شعرێکیدا باسی کوردێکی لای خۆیانی کردوە کە لە کۆیەوە چووە بۆ ئەستەمبول و گلەیی لەوە کردوە کە کاک ئەحمەد بە کوردی دەرس ئەڵێتەوە و حاجی قادریش بە شیعرە ناسراوەکەی لی‌ی توورە بوە و پی‌ی وتوە: «هێشتا لەسەر کەری ماوی...... چاک بوو مستێکم نەدا لەنێوی چاوی».

لەناو ئافرەتی کوردا خوێندواری زۆرکەم بوە و یەکێکی وەکو مەلای گەورە کە دەس‌پێشکەری کردوە لە هاندانی ئافرەت بۆ خوێندن لەلایەن هەندێ کەسەوە

رەخنەی لیٚگیراوە. خویٚندەواری بە شیٚوەیەکی گشتی لە کوردستاندا زۆر کزولاواز بوە، لەبیرم دیٚ هەتا سەردەمی مندالٚی‌ی ئیٚمەش لە شویٚنیٚکی وەکو شاری سلیٚمانی‌دا هەندیٚ جار یەکیٚک ئەگەر نامەیەکی لە شویٚنی دورەوە بۆ بهاتایە، یاخۆی نامەیەکی بنوسیایە گەرەکا و گەرەک ئەگەرا بە شویٚن خویٚندەواریٚکدا کەنامەکەی بۆ بخویٚنیٚتەوە یا نامەیەکی بۆ بنوسیٚت.

مینۆرسکی شتیٚکی زۆر خۆش لەم بارەوە ئەگیٚریٚتەوە و ئەلیٚ: «٥٢»

«جەعفەر ئاغای شکاک- برای سمایلخانی شکاک- سمکۆ- کە دوکتۆر مارف خەزنەدار لە پەراویٚزی تەرجمەی عەربیەکەیدا ئەو ناوەی راست کردۆتەوە کە جەعفەر ئاغا نەبوە بەلٚکو ناوی جەوهەر ئاغا بوە و مامۆستا عەلاءالدین-یش لە نامیلکەی هەمیشە بەهارەکەیدا باسی کردوە، ئەو جەعفەر ئاغایە پیٚویستی بە سکرتیٚریٚک هەبوە کە زمانی فارسی بزانیٚت- کە زمانی باوبوە لەو رۆژانەدا و دیارە جەعفەر ئاغاش خویٚندەوار نەبوە. بۆ ئەوە بە نەهیٚنی شاعریٚکی فارسی بە سالأچووی بانگ ئەکرد و ئەو نامانەی کە بە فارسی بوی ئەهات بۆی ئەخویٚندەوە یانامەی بە فارسی بۆ ئەنووسیٚ... بەلأم سەیر ئەوە بوە ئەو شاعیرە فارسە لە هەمان کاتیشدا سکرتیٚر وپەیام نیٚری والی فارسەکانیش بوە. ئەو میرزایە (جاران بەو جۆرە کەسانەی کە ئەیانزانی بنوسن پیٚ‌ی ئەوترا- میرزا) وەلأمی نامەکانی جەعفەر ئاغای بە جۆریٚک ئەدایەوە کە بەلای ئەو مەبەستەدا نەدەچوو کە جەعفەر ئاغا رای ئەسپارد، لەگەلٚ ئەوەشدا بۆ چارەرەشی ئەو شاعیر و نووسەرە کلۆلە، پیاوەکانی والی جاریٚک لەهات و چۆیەکی نەهینیدا بۆلای جەعفەر ئاغا ئەیگرن و سزایەکی سەختی ئەدەن».

وابزانم شتیٚکی بی‌سوود نیە ئەگەر نووسینی دووکەسی شارەزای ئەو سەردەمە لیٚرەدا بهیٚنینەوە بۆ نموونە کە هەر نووسەرە لەکانیٚکدا و بە جۆریٚک خەفەت و جەخاری دلٚی خۆی دەربریوە بەرامبەر بە نەخویٚندەواری و دواکەوتوویی میللەتی کورد لەو رۆژانەدا.

## سکاڵای یەکەم:

بریتی‌یە لەو نووسینەی کە مستەفا پاشا یامولکی کە خاوەنی رۆژنامەی (بانگ کوردستان) بوە لە ژمارە (١)ی رۆژی ١٩٢٢/٨/٢دا بلاوی کردۆتەوە. دەقی ئەو ئیملای نوسینە راستەوخۆ لەو رۆژنامەی (بانگی کوردستان)ەوە بلاوئەکەمەوە.

(السلام علیک، أی کردان، أی قوم قدیم پهلوی، گوێ بگرن لە (بانگ کوردستان). أم بانگە بۆ خبرداری همو کوردانە، بو هشیاری شیرانە، بوبیستنی دایک و باوکانە، گوی بگرن أم بانگە چی تیادایە، أم هاوارە بو چیە، قصەی پروپوچ کولانان درو هەلبستن ریژگاوان بسیە تماشای عالم بکن لە صنعت و معرفتدا لە ایمە پاشکوترتر هدیە...... کالایکمان نیە بو سترت عورت کافی بی... درزی و دزویکمان نیە کە دستکرد ولاتمان بی نیشانە عظمت و خاندانیش کە ایستا عبارت لە شکرو چایە أوانەیش هی کوردستان نیە لە جیگایان دوور دیتن، پارچە کاغزی کە بو نوشتە چورو شیرین بی اویش لە فرنگستانەوە دیت، لەصدا چوارمان تیانیە کە کاغزی کس بوکس وکاری شریکی محرمی بو عائلەی خوي بنوسی. مشکی و میزەرمان لە ایران و فرنگستان و گورونی گل اوقەیمان لە هندستان، عبای کورە کورەی نازدارانمان لە عربستان، کفن مردومان لە اوروپاوە، ملوتکەی مندالمان لە افریقاوە دیت».

## سکاڵای دوهەم:

دوای ئەوەی حاجی مستەفا پاشا دێتە سەر نووسینێکی پیرەمێرد کە لە دوای تێپەربوونی چەند ساڵێک بەسەر ئەوەی مستەفا یامولکی‌دا لە رۆژنامەکەیدا داخی دڵی خۆی بە جۆرێکی تر دەربریوە کە ئەڵێ:

«لە دەوری پێشوودا کە رۆژنامەیەکمان دەست ئەکەوت هەرچی خوێندەوار بو

لیٰی گرد ئەبوونەوە، وەکو هەنگوینیان لە کلورەی دارا دۆزیبێتەوە دەستا و دەستیان پیێ ئەکرد، هەرچەند باشیش تیٰی نەدەگەیشتین چونکە بە تورکی بو (نووسینی زۆربەی خەڵک و خوێندەواری‌یان هەر بە فارسی بوە)، زمانی تورکیش ئەو سالەم شارەدا یەکێکی وەکو (ئەحمەد ئەفەندی‌یە خرە)ی ئەرضوحالچی (وابزانم مەبەستی لە باوکی بلەی ئەحەی یاسین بوە کە تا سەردەمی لاوێتی ئێمەش ئەو کورەی ئەحمەد ئەفەندی هەر ئەرزوحالچی بوە) و بەکر ئەفەندی کاتب ئەیان زانی. کە لە ئەستەمبولەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی، شارێکی وێران کراو، قەومێکی سەرگەردان و پەریشان...... نەخەستەخانە...... نەقوتابخانە...... نەمامۆستا و نەهیچی تیادا نەبوو...... زیوەر و مەلا سەعیدی کابان بیێ پارە و پوول بون، دەدوازدە منداڵیان کۆکردبوەوە دەرسیان پیێ ئەوتن. تەنها لەگەرمەی دەسەڵاتی شێخ مەحمودا کە ئاڵای سەربەخۆیی هەلکردبوو، لەبەر کەم دەرامەتی و وزەوتوانای جولانەوەی خوێندەواری هەر ئەوە بو کە بتوانریٰ چوار قوتابخانە هەبێت. بە لە ناوچوونی فەرمانرەوایی شێخ مەحمود گوڕ و تەوژمی خەڵکی بۆ پەرەپێدانی خوێندەواری و گەشەکردن خاوبوەوە و هاتە کزی چونکە زۆری خوێندەواران و رۆشنبیران چارەنووسی خۆیان بە شێخەوە بوو کە ناچار لەگەڵیا هەڵاتن و بەم‌لاولای وڵاتدا بڵاوبونەوە.

دیارە شێواندنی جولانەوەی نیشتمانی بە دوای‌خۆیا باری چالاکی‌ی زۆر شتی تریشی بیێ نازکرد.»

ئا ئەمەبوە رادە و پلەی خوێندەواری و رۆشنبیری لە خوارووی کوردستاندا بە شێوەیەکی گشتی، کە شێخ مەحمود هاتە سەر ئەوەی فەرمانرەوایی و حکومداریەتیەکەی بکا بە بناغەیەک بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ، ئەو رۆژانەی ئەو، کورد لە خوارووی کوردستاندا لەو گێژاوە سەختە دابوە کە مامۆستا رەفیق حیلمی باسی برسێتی و گرانیەکەی کردوە و مستەفا مولکی و پیرەمێرد باسی خوێندەواری و رۆشنبیریەکەیان کردوە. ئەوەی جێگای داخە ئەو هەموو زانا و رۆشنبیر و خوێندەوار و ئەفسەرە گەورانەی کورد کە ناویان لە یاداشتەکانی قەدری جەمیل بەگ و بلەچ شێرکۆدا هاتوە، ئەگەر بەشێکی کەم لەو کەسانە لە خۆیان ببووردنایە و روویان بکردایەتە لای شێخ

مەحمود وەکو چۆن فەیسەڵ لە دوای دۆراندنی دەوڵەتەکەی لە سوریا و هێنانی بۆ عێراق ژمارەیەکی زۆری لێ کۆبوەوە و ئینگلیزەکان تەقەلایەکی زۆریان دا کە لایەنگری بۆ پەیدا بکەن، ئەگەر شێخ مەحمودیش هەندێک لەو میرئالای و قوماندان و قائمقام و ئەفسەرە گەورە خوێندەوار و شارەزایانەی کوردی ئەو رۆژانەی بگەیشتایەتیٰ (بێگومان ئەوانەش زانیویانە کە ئینگلیزەکان راست و پاک نەبون لەگەڵ شێخ مەحمودا و یەکێکی وەکو شێخ قادری شمزینی کە بە ئەحمەد تەقیٰ وتوە ئینگلیزەکان درۆیان لەگەڵ شێخ مەحمودا کردوە و لەگەڵ ئێمەشدا هەر درۆیان کردوە شتێکی خۆرایی نەبوە و ئەوانە هەموو ئاگادار بوون لە مەبەستی ناپاکی ئینگلیز بۆیە نەچوونەلای شێخ مەحمود)، بێگومان هەڵوێست لە خوارووی کوردستاندا ئەگۆڕا و با ئەو رۆژانە شێخ مەحمودیش لە سیاسەتدا خام و نەشارەزابووبێت، ئەتوانرا بە هۆی ئەو شارەزایانەوە راستە رێگەیەکی بۆ دابنرێت و لەگەڵ ئەوەشدا وەکو رەخنە لە شێخ مەحمود ئەگیریٰ و نەعلەت لە ئینگلیز و لە سیاسەتی ئینگلیز کرا و ئەکریٰ پێویستە رەخنەش لەو هەموو ئەفسەرە گەورە کوردانەی ئەو سەردەمە بگیریت کە ئەبوایە هەر چۆنێک بوایە لە خۆیان ببوردنایە و پێوەندی‌یان بە شێخ مەحمودەوە بکردایە و ریٰ و شوێنێکی راستی بۆ دانێن.

رەنگە هەبیٰ بڵیٰ: جا کیٰ ئەڵیٰ ئەگەر ئەوانە بچوونایە لای شێخ مەحمود پێشوازی‌یان لیٰ‌ئەکرا و رێگەیان پیٰ‌ئەدرا دەوری خۆیان ببینن؟ لام وایە بۆ وەرامی ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە شێخ مەحمود دەستی بۆ هەموو کەسێک درێژ کردوە کە لای روون بووبێت ئەوانە بە مەبەستێکی پاک لیٰی نزیک ئەبنەوە و زۆری وەکو تەوفیق وەهبی و سالح زەکی صاحبقران و عیزەت مەدفەعی و گەلێکی تر هەتا ئەو کاتەی لایان وابوو ئینگلیزەکان دژی شێخ مەحمود نین ئەوانە لە شێخ نزیک بوونەوە و شێخیش هەموو راوێژێکی پیٰ‌ئەکردن و دەوری خۆیان بینیوە هەتا ئەو کاتەی ئینگلیزەکان لە ژێرەوە فریویان دان و لە شێخیان دوورخستنەوە. ئەو پێوەندی‌یەی شێخ مەحمود بە سەید ئەحمەدی خانەقاوە لە کەرکوک کە داوای لیٰ‌کردبوو بچێتە سلێمانی و کاروباری ناوچەکە بگرێتە دەس‌نیشانەیەکی ترە بۆ دڵسۆزی شێخ مەحمود بۆ میللەتەکەی کە دەری‌خستوە

ئەو تەقەلا و خەباتەی بۆ سوودێکی کوێرانەی خۆی نەبوە.

ئەوەی راستی بێ باری نالەباری کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و نەبوونی دۆستێکی راستەقینە بۆ میللەتی کورد و مێردەزمەی کۆنەپەرستی و نەخوێندەواری و دەرەبەگێتی و کەس بەکەس رازی نەبوون ئەمانە هەموی هۆی سەرەکی بوون کە نەک هەر شێخ مەحمود بەلکو بە باوکی شێخ مەحمودیش بە ئاسانی چارەسەر نەدەکرا...... ئێستەش پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوانەی رابردوو لە دەوری شێخ سەعیدی پیران و بەدرخانی‌یەکان و قازی محەمەد و مستەفا بارزانی، ئەوا هێشتا لە جاران خراپتر لە گێژاوی نەخشەی بێگانەدا ئەخولی‌ینەوە و شەپۆلی رووداوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست و کەڵەک و فێلی دەوڵەتە گەورەکان هەر جارەی کەشتیی کورد بەرەو کەناری دەریایەکی پڕ لە هەڵدێر و پر لە شەپۆل و گێژاو ئەبەن کە نازانرێ ئەنجامی بەجێ ئەگات.

# مێژووی شاری سلێمانی

## دارالمولکی بابان: شێخ رەزای تالەبانی

لەفیکرم دێ سلێمانی کە دارالمولکی بابان بوو
نەمەحکومی عجم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

لەبەرقاپی سەرا صەفیان ئەبەست شێخ و مەلا و زاهید
مەطافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو

لەبەر طابوری عەسکەر رێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
صدای موزیقەو نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بوو

دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەودەمە، ئەو عەسرە، ئەو رۆژە
کە مەیدانی جرید بازی لە دەشتی کانی ئاسکان بوو

بە زەربەو حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کرد و تێ‌ی هەڵدا
سلێمانی زەمان راستت دەوێ، باوکی سلێمان بوو

عەرەب ئینکاری فەضلی ئێوە ناکەم، ئەفضەڵن ئەمما
صلاح الدین کە دنیای گرت لە زومرەی ئالی بابان بوو

قبوری پر لە نوری ئالی بابان پر لە رەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان، وەک ئەبری نیسان بوو

کە عبدالله پاشا لەشکری والی‌ی سنەی شڕکرد
(رەضا) ئەو وەقتە عومری پێنج و شەش طفلی دەبستان بوو

یەکەم جار ئەم شیعرە لە (ئەنجومەنی ئەدیبان)ی ئەمین فەیزی بەگدا بڵاوکراوەتەوە کە لە ساڵی ۱۹۲۰دا لە ئەستەمبول چاپی کردوە.

شاری سلێمانی...... پایتەختی بابان و پایتەختی حکومدارێتی و دەوڵەتی شێخ مەحمودی قارەمانی مەزن...... ئەوەی کە دوژمنانی کورد پێی ئەڵێن (رأس الافعی) و لە راستیدا هەمیشە چقلی چاوی دوژمنان بوە...... سلێمانی...... شاری هەڵمەت و قوربانی لەگەڵ ئەوەش‌دا کە مێژووی دروست بوونی تۆزێک لە دووسەد ساڵ پترترە، توانیویەتی لەم ماوەیەدا رۆڵێکی مێژوویی گرنگ ببینێت لە خەباتی میللەتی کورددا. پێویستە زۆرشت دەربارەی ئەو شارە بزانین کە شێخ مەحمودی مەزن توانی پاش روخانی ئەمارەتی بابان لە سلێمانیدا (سالی ١٨٥١) سەرلەنوێ ئالای کورد هەڵ بکا و رووبەرووی درندەترین و بە دەسەلاتدارترینی دەوڵەتی ئیمپریالیزمی ئەو سەردەمە ببێتەوە و دانیشتوانی ئەو شارە، ئەوەی کە ئیمانی بەسکەی روپیەی ئینگلیز نەهێنا بوو هەتا دوارۆژ لەگەڵ شێخ مەحمودا بوون، پێویستە ئەو شارە بزانین چۆن دروست کراوە و بۆچی دروست کراوە و کێ دروستی کردوە.

# ١- هۆی دروست بوونی شاری سلێمانی

جێی شاری قەلاچوالانی جاران کە پایتەختی ئەمارەتی بابان بوە ئەکەوێتە دامێنی ئێستای چوارتا لەسەر چەمی قەلاچوالان. شوێنی شارەکە شوێنێکی تەسک بوە و بەر بەرەڵلا و فراوان نەبوە. زۆرجاریش لافاو و هەڵسانی ئاوی قەلاچوالان بوە بە هۆی بارێکی قورس و گران لەرێی هاتوچۆی قەلاچوالان و شوێنەکانی تردا کە پردی ئەو ساوەکو ئێستە ئەوەندە بە هێزنەبوە بۆ رێگەی هاتوچۆ جگە لەوە هێرشی ئێرانیەکان بۆ سەر قەلاچوالان زۆربوە و بە ئاسانی بەربەست نەکراوە.

دوای ئەوەی باری ئابووریی ناوچەکە گۆڕراوە و خەڵکێکی زۆر هەوڵیان داوە لەو شارەدا نیشتەجێ بن، بەتایبەتی کە دەسەلاتی سولتانەکانی عوسمانلی کزبوە و پاشاکانی بابان جێی دەسەلاتی ئەوانیان گرتۆتەوە و سنووری دەسەلاتیان فراوان بوە و بایەخ بە خوێندەواری و رۆشنبیری و دروستکردنی

مزگەوتی گەورە بۆ خوێندن و خانوی باشتر و گەورەتر لەجاران لەگەڵ دروستکردنی بنکە بۆ سوپای ئەمارەتەکە، ئەمانە هەموویان وایان لە بابانەکان کردوە کە بیر لە شوێنێکی فراوانتر و لەبارتر و بەربلاوتر بکەنەوە کە بیکەن بە پایتەختی ئەمارەتەکەیان.

شوێنی ئێستای سلێمانی کە ئەوسا چەند گوندێکی تیادابوە، ئاوی کانێسکان و کارێزەکانی تر کە ئێستا هەموویان داپۆشراون، ئەوسا ئەمانە هەموویان سەربەرەڵابوون و بەو دەشت و لێژاییانەدا ئەهاتنە خواری و لەگەڵ ئاوی سەرچناردا یەکیان ئەگرت و تانجەرۆ پەیدا ئەبوو کە ئەکشا بەرەو دواوان.

دەوری ئەو کارێز و ئاوانە هەمووی بریتی‌بوە لەمێرگ و میرغوزار و بێگومان دەوری دەشتی‌کانی ئاسکان ئەبێ ئاسکی تیادابووبێت..... بەو جۆرە میرەکانی بابان بیریان لەوە کردۆتەوە کە شوێنی سلێمانی ئێستا ئاوەدان بکەنەوە. ئەوەبوو لە پێشدا مەحمود پاشای بابان کە مامی ئیبراهیم پاشای دروستکەری شاری سلێمانی بوو لە پێشدا لە نزیکی مەڵکەندی (کە ئەوسا شوێنی گوندێک بوە بەو ناوەوە) سەرایەکی دروست کرد بۆ ئەوەی ببێت بە قەلایەک بۆ پاراستنی ئەو ناوچەیە لەو هێرشانەی کە روو بە رووی ئەمارەتەکەیان ئەبوەوە لە باشووری ئەمارەتەکەیانەوە و لە دەشتی شارەزوورەوە. ئەمین زەکی بەگ باسی هۆی گواستنەوەی قەلاچوالان بۆ سلێمانی ئەداتە پاڵ ئەوەی کە ئیبراهیم باشا لە بەغدا زۆر ژیاوە و لەوێ گەورە بوە بۆیە حەزی بە ژیانی شارستانێتی کردوە و قەلاچوالانی بە شایان نەزانیوە بۆ پایتەختی ئەمارەتی بابان بۆیە هەولیداوە شارێکی رێکوپێکتری وەکو سلێمانی دروست بکات.

# مێژووی شارەزوور و ناوچەی سلێمانی

ریچ لە گەشتەکەیدا «٤٨» کە لە ساڵی ١٨٢٠دا چۆتە سلێمانی دەربارەی ئەو رۆژانەی سلێمانی ئەڵێ:

«ناوچەی ئەمارەتی بابان کە لە دواییدا شاری سلێمانی کرا بە پایتەختی، ئەو

ئەمارەتە بەرلەوەی کە ویلایەتی موسل ناوی بێتە مەیدانەوە و ئەو ویلایەتە لەلایەن عوسمانلی‌یەکانەوە پێک‌هات، وشەی (شارەزوور) وەکو ناوێکی رەسمی وابوە بۆ ولاتی بابان و کەرکوک کە قەزاکانی کەرکوک لەو سەردەمەدا بریتی بون لە ئەربیل، رانیە، رواندوز، کویسنجق وصلاحیە (کفری)، شارەزووری مێژوویش کە شارەزووری ئێستایە خرایە سەر سلێمانی لە شێوەی قەزایەکدا».

تەوفیق وەهبی دەربارەی شارەزوور و مێژووی شارەزوور باسێکی گرنگی دوور و درێژی هەیە لەناو دەسخەتە چاپ نەکراوەکانیدا، ماوەیەک بەو مسوەدانەوە ماندوویوم کە لە چەند فایلێکی پرش و بلاو و تێکەل و پێکەلا دانرابوون هەمووم جیاکردنەوە بەلام بەداخەوە لە دوای مردنی خۆی لای کوردەکانی لوول دراون تاوانێکی گەورەیە ئەوانە لەناوچن و بلاونەکرێنەوە (ئەگەرچی لە کاتی خۆیدا هەندێکی لە گۆڤاری (سۆمر)دا بلاوکردۆتەوە).

ریچ لەلاپەرە (٨١)ی کتێبەکەیدا ئەلێ: کەرکوک وەختی خۆی پایتەختی ناوچەی هەموو شارەزوور بوە... وشەی شارەزوور وشەیەکی زۆر کۆنە و کتێبە کۆنەکان باسیان کردوە. وشەی شارەزوور بەر لە داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن لەشکری داگیرکەری ئیسلامەوە ئەو ناوەی هەربوە.

یاقوت الحموی لە کتێبەکەیدا (معجم البلدان) لەلاپەرە (٣٤٢)دا باسی شارەزووری کردوە و شعرێکی (ابا المبارک) کوری حسنی شهرزوری بلاوکردۆتەوە کە ئەلێ:

وعدت بان تزوري بعد شهر    فزوري قد تقصى الشهر زوري
وموعد بيننا نهر معلي    الى بلد المسمى شهرزور
فاشهر صدک المحتوم حق    ولکن شهر وصلک شهرزور

ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا مێژووی سلێمانی «١٢» دەربارەی ئەوەی کە ابن الفقیە وتویەتی: گوایا عەرەب لەپێش رووداني ئیسلام دا و لە دەوروبەری ساسانی‌یەکاندا هاتۆتە شارەزور. ئەمین زەکی لەوەرامی ئەوەدا ئەلێ: شتەکە وانیە، بەلکو لە زەمانی عومەری خەلیفەدا سالی (٢١هـ) عزره بن قیس لە

«حلوان»ەوە ویستی شارەزوور بگرێت بەلاّم نەیتوانی و لە دوای ئەو (عتبە بن فرقد) داگیری کرد».
ئەمین زەکی لە هەمان کتێبدا دەربارەی مێژووی چۆنێتی دروستکردنی سلێمانی ئەلیٚ:
«سلێمانی لە زەمانی ئیبراهیم پاشای باباندا لە نزیک گوندی (مەلکەندی)دا دروستکراوە، ئەو گردەی مەڵکەندی کۆنە شارێک بوە لەکاتی خۆیدا مەحمود پاشای مامی ئیبراهیم پاشای بابان لە ساڵی (١١٩٧هـ)دا سەرایەکی دروستکردوە، لەکاتی هەڵکەندنی ئەو سەرایەدا گەلێک ئێسقان و پارچە کووپەی تیا دۆزراوەتەوە، بەلاّم نووسینەکانی کەس بۆی نەخوێندرابوەوە. لەساڵی ١٧٨٤م دا دروستکردنی شارەکە تەواو بوە و ئەمارەتی بابان لە قەلاچوالانەوە گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی».
کە شاری سلێمانی تەواو ئەبێت پاشای بابان جگە لە دانیشتوانی قەلاچوالان داوا لە دیهات و لە عەشایرەکانی ئەو ناوچانە ئەکا کە هەرلایە ژمارەیەک خەڵک بنێرن بۆ ئەوەی لە سلێمانیدا نیشتەجیٚ بن و زۆرکەس بەدەم ئەو داخوازییەی پاشای بابانەوە ئەچن و هەتا هەندێکیش لە کوردستانی ئێرانەوە بەرودوا وەکو دانیشتوانی همدان (کە بنەماڵەی ئاغا تەها هاتنە سلێمانی و گەرەکی دەرگەزینیان بەناوی گەرەکی دەرگەزینەوە ئاوەدان کرد) و لە سنە و سابلاغ و ناوچەی بانە-شەوە هەندێک رویان تیٚکردوە «کە قەزازەکان لەوانەی سابلاخ بون.
دەربارەی ناونانی شارەکە بە (سلێمانی) چەند روایەتێک هەیە: ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا (مێژووی سلێمانی) ئەلیٚ بەناوی سلێمان پاشای والی بەغدا ناونراوە کە بە (بویوک سلێمان) ناسراوبوە بەناوی ئەوەوە ناونراوە سلێمانی.
بەلاّم ئەمین زەکی لە هەمان کتێبدا ئەلیٚ: حوسێن نازم بەگ لە کتێبە چاپ نەکراوەکەیدا (بەداخەوە هەتا ئێستا ئەو کتێبە نازانریٚ ماوە یا نەء، وەلەلای کیٚیە. حوسێن نازم موستەشاری شێخ مەحمود بوە و یەکێک بوە لە رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە و ئاگاداری لە زۆر شت هەبوە) حوسێن نازم لەو کتێبەیدا وتویەتی لە هەڵکەندنی بناغەی سەرای سلێمانیدا مۆرێکی (سلێمان) دۆزرایەوە و

ئیبراهیم پاشا لە خۆشیی ئەو مۆرە شارەکەی بەناوی (سلێمان)ەوە ناوناوە (کە ئەوەش هەرجیێی پرسیارە و ئایا ئەو مۆرە چی بەسەر هاتوە کە هیچ سەرچاوەیەکی تر جگە لەوەی حوسێن نازم باسی نەکردوە).

ئەمین زەکی دەربارەی لەناوچوونی ئەمارەتی بابان ئەلێ:

(نامق پاشا کە والی تورک بوە لە بەغدا ساڵی ١٨٥١ عبداللە پاشای بابانی بانگ کردە بەغدا و بەدەس بەسەری ناردی بۆ ئەستەمبوڵ وەمیر لیوایەکی تورکی نارد بۆ سلێمانی کە ناوی «ئیسماعیل پاشا» بو بۆ ئەوەی کاروباری ناوچەکە ببابەرێوە بەو جۆرە لەو رۆژەوە ئەمارەتی بابان تیاچوو وەبەتەواوی کەوتە ژێر دەسەلاتی تورکەوە).

دەربارەی کاروباری ئەمارەتی بابان ریچ لە گەشتەکەیدا «٤٨» کە ئەوسا سلێمانی هێشتا پایتەختی ئەمارەتی بابان بوە و ریچ لە ساڵی ١٨٢٠م چۆتە سلێمانی باسی ئەو ئەمارەتە و کاروباری بە دووردرێژی ئەکا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مەحمود پاشای میری باباندا، ریچ داوای سەرکەوتن و بەهێزبوونی حکومەتی بابانی کردوە و مەحمود پاشاش لەوەرامدا پێی ئەلێ: ئەو داخوازییەی تۆ کاتێک دێتە دی کە خوا تاعونێک بخاتە ناو ئەمیرەکانی بابانەوە کە هەموویان بمرن و تەنها هەر یەکێکیان بمێنێتەوە، ئەوسا ئەتوانرێ ئەم ئەمارەتە ببرێتە بەرێوە).

لە راستیدا ئەو دەردەی کە ئەو رۆژانە مەحمود پاشا گلەیی لێکردوە وەنەبێ هەر تەنها داخوازی مەحمود پاشا بووبێت، بەڵکو ئەمیر و کاربەدەستە دەسترۆیوەکانی تریشمان لەناو ئەمارەتەکان تریشدا لەناو خۆیاندا هەمیشە نارێک بون و زۆرجار بۆ ئەوەی مەبەستەکەی سەرکەوێ میرێکی وەکو بابان بۆ نموونە چۆتە پاڵ ئێران و داوای یارمەتی لێکردوە و بە هێزی لەشکرێکەوە هاتۆتە سەر ئەمارەتەکەی خۆی و داگیری کردوە، میرێکی ئەردەڵانیش هەر بەو جۆرە پەنای بردۆتە بەر عوسمانلی یا بابانیەکان و بە یارمەتی هێزی ئەوان پەلاماری ئەمارەتی ئەردەلانی داوە و داگیری کردوە کە لە ئەنجامدا خوێنێکی زۆری کەس و کاری خۆی و هی خەڵکی وڵاتەکەی خۆشی رشتوە کە مرۆڤ مێژووی هەندێ لەو ئەمارەتانە ئەخوێنێتەوە کە لە هەندێکیاندا کار ئەگەبشتە

چاو هەڵکۆلینی یەکتری بۆی دەرئەکەوێ کە بۆچی کورد هەتا ئێستا یەکی‌نەگرتوە و بەم جۆرەی ئێستا ماڵی کاوڵ بوە.

## باسی ناوشاری سلێمانی
## و ژمارەی دانیشتوانی و گەرەکەکانی

ئەمین زەکی بەگ دەربارەی دانیشتوانی سلێمانی ئەڵێ:«١٢»

«ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی لەو رۆژانەدا کە بابانەکان لە قەلاچوالانەوە گواستیانەوە بۆ سلێمانی نازانرێ چەند بوە، بەلاّم مستر Huart ئەلێ: لەساڵی ١٨٢٠دا (یەعنی لە دوای -٣٦- ساڵ تەواوبوونی سلێمانی) ژمارەی دانیشتوانی نزیکی (١٠) هەزار کەس بوە و ژمارەی ماڵەکان (٢١٤٤) ماڵ بوە کە لەوانە (١٣٠) ماڵی جوولەکە و (٩) ماڵی کلدانی و (٥) ماڵ ئەرمەنی بوە و پێنج مزگەوتیشی تیابوە).

ئەوەی «هارت» کە ئەمین زەکی باسی کردوە هەر ئەو ساڵە ئەگرێتەوە کە (ریچ) گەشتەکەی کردوە و ماوەیەک لە سلێمانیدا ماوەتەوە.

ئەمین زەکی بەگ لەو بۆچوونەی (هارت)ەوە ئەچێتە سەرباسی یەکێکی تر کە ناوی (Lucky Lama) بوە کە لەساڵی ١٨٦٨دا یەعنی (٤٨ ساڵ دوای ئەوەی هارت و لە دوای روخاندنی ئەمارەتی بابان بە (١٧) ساڵ شاری سلێمانی بە (٦٠٠٠) خانووی ماڵی کورد و (٣٠) ماڵ کلدانی و (١٥) ماڵ جوولەکە داناوە (ئینسکلوپیدیای ئیلامیش هەر بەو جۆرە باسی سلێمانی کردوە). بەلاّم Lucky Lama هەر ناوی ماڵەکانی هێناوە و ژمارەی دانیشتوانی باس نەکردوە.

بێجگە لە ریچ جێمس بیلی فرایزەریش لە ساڵی ١٧٨٣دا چۆتە کوردستان و باسی بابانی کردوە.

سلێمانی لە زەمانی عوسمانلی‌دا (٥) قەزا بوە:

١- چمچماڵ- کە ئەوسا پێ‌ی وتراوە قەزای بازیان.

٢- قەزای هەڵەبجە.
٣- قەزای شارباژێر.
٤- قەزای پژدەر.
٥- قەزای مرکز.

ریج لەگەشتەکەیدا ژمارەی خانوەکانی سلێمانی بە (٢٠٠٠) خانوو داناوە لەوانە (١٣٠) ماڵ جوولەکە و (٩) ماڵ کلدانی و (٥) ماڵ ئەرمەنی بوە و (٦) کاروان سەرا و )٥) حەمام و (٥) مزگەوت هەبوە.

مێجرسۆن دەربارەی ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی لە راپۆرتی سالانەیدا (سالی ١٩١٩) کە لە دۆکۆمێنتی ناو ئارشیڤی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ژمارەی دۆکۆمێنت (C.O.730/3-3341) بە دوورودرێژ باسی کردوە و ئەلێ:

«ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی لە سالی ١٨٣٠دا (١٠) هەزار کەس بوە - کە وابزانم ئەو ژمارەیەی لە ریچەوە وەرگرتوە- وەلەدوای ئەوەی توانرا هەمەوەندەکان لە سالی (١٩١٤) دا سەرکوت بکرێن و خەڵک کەوتنە بووژانەوە و ئارامیان گرت، شارەکە ژمارەی گەیشتە (٢٠) هەزار کەس، بەلاٚم لەکاتی شەری جیهانی‌دا بە هۆی گرانی و برسێتی و ناردنی گەنج و لاوان بۆ کۆری شەر و مردنێکی زۆر بە هۆی برسێتی و گرانیەوە و چۆلکردنی شارەکە لەبەر بێ دەرامەتی خەڵک، دانیشتوەکان زۆر کەم بوونەوە و ژمارەیان گەیشتە (٢٥٠٠) کەس).

مێجرسۆن لەهەمان راپۆرتدا لە باسی گەرەکەکانی سلێمانیدا ئەلێ:
(لەو رۆژانەدا شاری سلێمانی لە (٦) گەرەکی سەرەکی پێک هاتبوو:
١- گوێژە. ٢- چوارباخ. ٣- جوولەکان. ٤- سەرشەقام. ٥- کانیسکان. ٦- دەرگەزین.

درێژایی ئەوسای سلێمانی ١٠١/٤ میل بوە و پانایی ١/٢ میل بوە کە ئێستا زۆری چۆل و وێرانە).

بەلاٚم سەیر ئەوەیە هەر مێجرسۆن خۆی ئەلێ لە ٣١/دیسەمبەری سالی ١٩١٩دا کە خۆی حاکمی سیاسی بوە لە سلێمانیدا- دوای ئاوەرەکردنی شێخ مەحمود ئەلێ: ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی گەیشتە (٩٧٢٨) کورد و (٥٧٢)

جوولەکە و (٦٠) کلدانی وەژمارەی دوکانەکان گەیشتە (١٢٠٠) دوکان و بە دووروودرێژی هەر لەو راپۆرتەی پێشوودا باسی خانو و مزگەوت و دوکان و چایخانە و گەرماوەکانی ئەو سەردەمەی کردوە کە خۆی لە سلێمانی دابوە، کە بەم جۆرەی خوارەوە بوە و سەرژمێری‌یەکی تەواوی ئەو بازار و دوکانانەی کردوە لە ساڵی ١٩١٣ و ١٩١٨ هەریەکە بەجیا وەکو خوارەوە:

| | ژمارەی ساڵی ١٩١٣ | ژمارەی ساڵی ١٩١٨ | ئەوانەی چۆڵ و وێران بوون |
|---|---|---|---|
| مزگەوت | ٢٩ | ١٠ | ١٩ |
| تەکیە | ٣ | ٠ | ٣ |
| خانەقا | ٢١ | ٢٠ | ١ |
| خانوو | ٣٢٠٥ | ١٣٩٣ | ١٨١٢ |
| دوکان | ٧٦٠ | ٣٣٨ | ٤٢٢ |
| چایخانە | ٣١ | ١٥ | ١٦ |
| حەمام | ١١ | ٦ | ٥ |
| ئاشی ئاو | ٢٤ | ١٩ | ٥ |
| دوکانی دەباغی | ١٨ | ٥ | ١٣ |
| قەیسەری | ٦ | ٢ | ٤ |
| دوکانەکانی ناو قەیسەریەکان | ٣٩٩ | ١٣٤ | ٢٦٥ |

لە باسی شارەوانی ئەو سەردەمەدا لە هەمان راپۆرتدا ئەڵێ: شارەوانی (٥٠) دوکانی خۆی هەبوە کە ئەوانەی بەپێوە مابون و کرێیان وەرئەگیرا تەنها (٢٢) دوکان بوە لەگەڵ ٣/١ی بازاری داخراو (وابزانم نیازی لە خان و قەیسەری بوە) کە (١١٦) دوکانی تیادابوە.

مێجرسۆن دەربارەی دەرامەتی شارەوانی ئەڵێ:

شارەوانی دەرامەتی لە مەڕ و بزن و گا و مانگا سەربرین و کرێی قەپانچێتی و باجی بازار (کاسبانە)، باجی شتی فرۆشراو لەناو بازاردا، باجی ریخۆڵە، باجی خانو، باجی ولاغی بەرزە و ئیجازەی خانووکردن وەرگرتوە کە لەو رۆژەدا بە هۆی فەرمانبەری شارەوانی‌یەوە کۆئەکرایەوە.

دەربارەی قەیسەرییەکانی سلێمانی مێجرسۆن لە هەمان دۆکیومێنتدا ئەلێ: «جگە لە خانی غەفور ئاغا، (لە راستیدا خان جیابوە لە قەیسەری چونکە قەیسەری هەر دوکانی تیابوە، بەلاَم خان جگە لە دوکان و مەخزەن شوێنی بەستنەوەی ولاغی کاروانیشی تیادابوە کە مالی بازرگانیان هێناوە بۆ سلێمانی یا لە سلێمانییەوە بردویانە بۆ دەرەوە)، خانی عەجەمیش هەبوە کە مێجرسۆن لەگەشتەکەی سالَی ۱۹۰۹دا چەند گاورێکی موسلی لێبینیوە وەکو لە پێشدا باسمانکرد».

قەیسەری وەسمان پاشا لەپێش قەیسەری نەقیب دا دروستکراوە. قەیسەری وەسمان پاشا بە پارەی وەسمان پاشای جاف و بنەماڵەی کەریمی عەلەکە دروست کراوە و شێخ مستەفای نەقیب (مامی شێخ مەحمود) بۆ بەربەرکانی ئەو قەیسەرییە ئەویش قەیسەرییەکی دروست کردوە کە بە قەیسەری نەقیب ناسراوە.

وەکو پیرەکانی سەردەمی لاوێتی ئێمە ئەیانوت قەیسەرێکی تریش هەبوە لە سلێمانیدا بەناوی قەیسەری مەحمودی (کە لە دواییدا بوە بە مەیدانی برنج فرۆشتن و گوایا ئەو قەیسەرییە لەسەرەتای دەستپێکردنی شەری یەکەمدا دروست کراوە) «۳۵»، بەلاَم ئێستا هیچ شوێنەوارێکی دیارنییە.

جگە لە بازار و دوکان و قەیسەری چەند گەرماویکیش بوە کە بە نۆرە بۆ ژنان و پیاوان تەرخان کراوە...... جارێک تەوفیق وەهبی بۆی گێرامەوە وتی: لە سالَی ۱۹۳۰دا، کە کرام بە متصرفی سلێمانی توانیم حەوزە گەرمەکەی کە هەموو کەس خۆی تیادا ئەشت هەتا متصرف بووم قەدەغەی بکەم چونکە مایەی نەخۆشی بوو، ساغ و نەخۆش خۆیان تێهەلْ ئەکێشا بۆیە دام خست و قفلم لێدا.

پیاوەکۆنەکان و ژنە کۆنەکانی ئەو سەردەمە باسی بەزمی حەمام و قۆزرخ کردنی حەمامیان بۆ ئەگێرانەوە و ئەیانوت ئەوسا پارەکەم بوو زۆر ژن کە ئەچوە حەمام لە جیاتی پارە هێلکەی ئەدا بە حەمامچیەکە.

دەربارەی خانەقا و تەکیە و مزگەوتە کۆنەکان و ئەوانەی ماون کە شوێنی خەلْوەتگا و کۆری زیکر و تەهلیلە و خوێندنەوەی حەدیس بون، وەئەو شوێنانەی

که لەو مزگەوتانەدا تەرخان کرابون بۆ خوێندنی فەقێ، ئەکرەمی سالحە رەشە«٣٥» باسێکی دوورودرێژی لە کتێبەکەیدا (سلێمانی) تەرخان کردوە بۆ ناو و شوێن و مێژووی دروستکردنی ئەو تەکیە و خانەقایانە و پێویست ناکا ئێمە لێرە دووبارەیان بکەینەوە.

مزگەوتی گەورە کە لە زەمانی ئیبراهیم پاشای باباندا دروستکراوە (کە لە دواییدا ناوی نرا بە مزگەوتی کاک ئەحمەدی شێخ) لەسەرەتادا ئەو مزگەوتە کە دروست کراوە مەولانا خالید لەلایەن ئەمیری بابانەوە کراوە بە (رئیس العلما) و دەرسی تیادا وتۆتەوە، دوای ئەوەی مەولانا خالید ئاوارەکرا شێخ مارفی نۆدی کرا بە (رئیس العلما) لە جیاتی مەولانا خالید کە بەرودوا مەولانا و شێخ مارف، ئیمام و مدرس بون لە مزگەوتی گەورەدا و پێش نوێژی‌یان کردوە و دەرسیشیان وتۆتەوە.

لە دوای شێخ مارف کاک ئەحمەدی کوری (١٢٠٨هـ-١٣٠٥هـ) بوە بە ئیمام و مدرسی مزگەوتی گەورە.

مەلا مەحمودی دێلێژە کە باوکی (مەلا ئەحمەدی چاومار بوە) یەکێک بوە لە زاناکانی ئەو سەردەمە کە ئەڵێن (٤٨) کتێبی داناوە- بێگومان زۆربەیان بە فارسی بوە- لەوانە کتێبی (أی شده) کە بەپێی حروفی هجاء ستایشی پێغەمبەری کردوە و لە ساڵی (١٢٥٠هـ)دا کۆچی دوایی کردوە«٣٥». وەلە دوای کاک ئەحمەدی شێخ مەلا عبدالرحمن پێنجوینی (١٢٥٠هـ- ١٣١٩هـ) بوە بە ئیمام و مدرسی مزگەوتی گەورە. منارەی مزگەوتی گەورە لە زەمانی سوڵتان عبدالحمید دا دروست کراوە.

خانەقای مەولانا- نیاز لە خانەقای مەولانا خالیدە- لە زەمانی مەحمود پاشای باباندا دروست کراوە.

لە مزگەوتە ناسراوەکان مزگەوتی شێخ بابا عەلی (لەسەر چیمەن) کە لە پێشدا بە مزگەوتی شێخ ابوبکر ناسراوە لە زەمانی عبدالرحمن پاشای باباندا دروستکراوە و مزگەوتی حاجی شێخ ئەمین- باپیری شێخ محەمەدی خاڵ- لە سەردەمی ئیبراهیم پاشای باباندا کە خەریکی دروستکردنی شاری سلێمانی بوون داروپەردوی خانوی مزگەوتێکی قەلاچوالان هەمووی گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی و

ئەو مزگەوتەی حاجی شێخ ئەمینی پێ دروستکراوە.

مزگەوتی (حاجی حان) کە بە حوجرەی مەلا سەعیدی زلْزلْەیی ناسراوە (ئەکرەمی سالحی رەشە لە کتێبەکەیدا- سلێمانی- بە هەڵە بە مەلا عەزیزی زلْزلْەیی ناوی هێناوە).

مەلا سەعیدی زلْزلْەیی زانایەکی ناسراو بوە دەرسی بە زۆرکەس وتۆتەوە لەوانە حاجی تەوفیقی پیرەمێرد (کە لە دیوانەکەیدا باسم کردوە) و خواجا ئەفەندی و زۆرکەسی تر لای ئەو خوێندویانە، مامۆستا عەلادین سجادیش لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا هەر بەناوی مەلاسەعیدی زلْزلْەیی ناوی هێناوە.

خانەقای مەحوی لە سالْی ١٨٩١م دا لەلایەن سولتان عەبدولحەمیدەوە (...١) لیرەی ئالْتون بۆ چاک کردن و فراوان کردنی ئەو مزگەوتە تەرخان کراوە«٣٥»، مەلا عوسمانی بالْخی کە باوکی (مەحوی) شاعیر بوە ئیمام و مدرسی ئەو خانەقایە بوە لە دوای مەحوی مەلا خالید ئینجا مەلا ئەسعەدی محوی کوری ئیمام و مدرسی خانەقابوون.

جگە لەو مزگەوت و خانەقایانەی کە باسمان کردن وەکو لە پێشتریشدا باسمان کرد سەعید پاشای خندان برازای (سلێمان بەگی قواس) و باوکی شەریف پاشای خندان کە لە کونگرەی ئاشتیدا بوو بە نوێنەری کورد، ئەو سەعید پاشایە خزمەتێکی ئیجگار گەورەی ناوچەی سلێمانی کرد کە ئەوسا نائیبی سەدری ئەعزەم بوە لە حکومەتی عوسمانلیدا (وەبووشە بە وەزیری دەرەوە و وەزیری ناوخۆش).

لە راستیدا سلێمانی هەتا کردنەوەی ئەو دوو قوتابخانەیە، عوسمانلی‌یەکان بە جارێک ئەو ناوچەیان پشتگوێ خستبوو، هیچ قوتابخانە و شوێنی دەرس وتنەوەیەکی رەسمی تیادا نەبوە، جگە لەو مزگەوت و خانەقایانەی کە زانایان خۆیان بەو کارە هەلْساون و ناوچەی خواروی کوردستان لە چاو شوێنەکانی تردا زۆر بێبەش بوە لەچاودێری کردنی عوسمانلی...... بەلاّم بە کردنەوەی رشدیەی مولْکی و رشدی عەسکری خەلْکەکە تۆزێک ئاهیان پیاهاتەوە و سەریان کردە سەر خوێندن.

تەوفیق وەهبی گەلێک جار باسی ئەو دوو قوتابخانەیەی بۆ ئەکردین و

ئەیووت: کە رشدیەی عەسکری کرایەوە ئیتر رشدیەی موڵکی باوی نەما کەم کەس دەچوە ئەوێ بۆ خوێندن.

کە ئینگلیزەکان هاتنە سلێمانی دوای ئاوارەکردنی شێخ مەحمود هەر دوو قوتابخانەکەیان داخست و لەجیێی ئەوە قوتابخانەی (نموونەی سەعادەت)یان کردەوە کە لە خانوەکەی نەجیب ئەفەندی دابوە، دوای ئەوە ئەو قوتابخانەیە گوێزراوەتەوە بۆ (دەبۆ-قشلە). ئەکرەم سالحی رەشە لە کتێبەکەیدا «٣٥» ناوی (١٦٦) کەسی ناسراوی تۆمار کردوە کە بوون بە ئەفسەر لە سوپای عوسمانلیدا و پلەی زۆریان بەرز بۆتەوە و هەندێک لەوانە تا ماوەیەک لە هەردوو حکومەتەکەی شێخ مەحمودا بەشداری کارویاریان کردوە و چەند کەسێکیان دوای ئەوەی کە خوارووی کوردستان بە زۆرەملی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لکێنرا بە عێراقەوە لە دەزگاکانی عێراقدا کار و فەرمانی گەورەیان بێسپێردراوە.

دوکتۆر کەماڵ مەزهەر لە کتێبەکەیدا «٥» ئەلێ: فێرگەی رشدی عەسکری لە ساڵی ١٨٩٣دا لە سلێمانی کرایەوە. ئەوانەی لەو قوتابخانەیەوە دەرئەچوون ئەنێران بۆ بەغدا بۆ تەواوکردنی (اعدادی عەسکری) وەپاش ئەوە ئەچوونەوە ئەستەمبول و لەوێ خوێندنی عەسکرییان تەواو ئەکرد و ئەبوون بە ئەفسەر.

ژمارەی قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە (١١٠) کەس بوون جگە لەو (٧٠) قوتابییەی کە لە فێرگەی ناوەندی موڵکیدا ئەیان خوێند.

# بنەماڵە شێخانی بەرزنجی

آ- لەو بنەماڵەیە:

١- شێخ مارفی نۆدێ
٢- کاک ئەحمەدی شێخ
٣- شێخ مارفی نەقیب
٤- شێخ مستەفای نەقیب
٥- شێخ سەعیدی حەفید :-

آ- ژیانی شێخ سەعید
ب- کارەساتەکەی موسل:

١- چۆنێتی ئاوارەبوونی شێخان بۆ موسل
٢- هۆی ئاوارەبوون
٣- ئەنجامی ئاوارەبوون

٦- شێخ مەحمود و ژیانی شێخ مەحمود

ب- پێوەندی بنەماڵەی شێخان لەگەڵ عەشایرەکانی ناوچەکە.

١- پێوەندی‌یان لەگەڵ هەمەوەندەکاندا
٢- پێوەندی‌یان لەگەڵ عەشایری جاف‌دا.
٣- پێوەندی‌یان لەگەڵ تاڵەبانیەکاندا.
٤- پێوەندی‌یان لەگەڵ پژدەری‌یەکاندا.
٥- پێوەندی‌یان لەگەڵ مەنگوریەکاندا.
٦- پێوەندی‌یان لەگەڵ هەورامی و ناوچەی مەریوان.
٧- پێوەندی‌یان لەگەڵ شکاک.
٨- پێوەندی شێخان لەناوخۆیاندا

ج- پێوەندی بنەماڵە شێخان لەگەڵ بنەماڵەکانی تردا.

١- لەگەڵ بنەماڵەی بابانەکاندا.

٢- لەگەڵ بنەماڵەی قواس (غواص).

٣- لەگەڵ بنەماڵەی ئاغا تەها.

٤- لەگەڵ بنەماڵەی حاجی ئەولای حمە کەرکوکی.

٥- لەگەڵ بنەماڵەی مەسرەف.

٦- لەگەڵ بنەماڵەکانی تردا.

# بنەماڵـــەی شـێخان

لەدوای لەناوبردنی ئەمارەتی بابان و داگیرکردنی ناوچەی سلێمانی لەلایەن هێزی عوسمانلی‌یەوە لەساڵی ١٨٥١دا، ئیتر کاروباری ناوچەکە یەکسەر بەسرا بە بەغدادەوە و لەوێوە کاربەدەستی بۆ ئەنێنررا و بابانەکان ئەوانەی کە لە سلێمانیدا مابوون هەموو ئاوارەکران و لە سلێمانی دووخرانەوە و زۆریان چونە ئەستەمبوڵ و لەوێ لەناو کۆمەڵگای کوردەواری ناو ئەستەمبوڵدا بوون بە هاوکاری ئەو کوردانەی لەوێ ژیاون و تێکەڵ بەو کوردانەی تر بوون کە لەناوچەکانی تری کوردستانەوە لە ئەستەمبولدا نیشتەجێ بوبون (کاک عەلی کەمال ئەلێ قواسەکان لەگەڵ بابانیەکاندا هەندێکیان چوونە ئەستەمبول و لەوێ پێگەیشتن).

دوای ئەوەی بابانەکان لە سلێمانی دوورخرانەوە، شێخانی بەرزنجە کە لە زەمانی شێخ مارفی نۆدی‌وە لەناو خەڵکدا لەپێشدا بە پشتگیری بابانەکان و لە دوای ئەوان بە هۆی خەلیفەکانی عوسمانلی‌یەوە وەکو بنەماڵەیەکی ئایینی دەس رۆیو ڕێزیان لێ‌گیراوە و لەناو خەڵکدا ناوبانگیان دەرکردوە بە تایبەتی لەدوای دورخستنەوەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی زۆرتر مەیدانیان بۆ چۆڵ بوە و لەو ناوچەیەدا بنەماڵەیەکی دەس‌ڕۆیوی تری وانەبوە کە ڕێگا لە پێشکەوتن و دەسەلاتدارێتیان بگرێت بەو جۆرە بە هۆی ئەو خەلات و بەراتانەی کە لەلایەن سولتانەکانەوە پێ‌یان درابوو و خۆشیان موڵکی زۆریان کریوە یا دەستیان بەسەر موڵکی تردا گرتوە- بەتایبەتی لەوانەی کە بە هوی لەزمەوە لە زەوی و زاری میری دەسگیریان بوو- ئیتر توانیان لە زەمانی کاک ئەحمەدی شێخ بە دواوە لە بنەماڵەیەکی ئایینی و شێخێتیەوە بەرەو فیوداڵی خاوەن زەوی و زار و موڵک و بەرەو دەسەلاتدارێتی سیاسی ملیان نا بۆ پێشەوە وایان لێ‌هات خەلیفەی ئیسلام لە ئەستەمبول لەو ناوچەیەدا هیچ شتێکی نەدەکرد کە پرسی و ڕای ئەوانی تیادا

نەبێت و خەلیفەی عوسمانلی بۆ دانانی سنوورێک بۆ ئەو ئاژاوە و ڕێگرتنەی کە هەمەوەندەکان لە ناوچەی بازیان و چەمچەماڵدا وایان لە حکومەت کردبوو کە دەسەلاتی هات و چۆکردنی نەمێنێت و خەڵکی سلێمانی بەجارێک لەو کردارەی هەمەوەند بێزار بوبون، سوڵتانی عوسمانلی بۆ بەربەستکردنی ئەوە پشتگیری شێخانی کرد و پلە و پایەی بەرزکردنەوە و خەلات و بەراتی بۆدانان خەڵکیش کە ئەو پشتگیریەی خلافەتی عوسمانلی یان دیٚ بۆ شێخان ئیتر هەندێکەس بوون بە دەست و پێوەندیان و هەندێکیشیان دۆستایەتی لەگەڵ بەهێز کرد و هەندێکیش پیٚیان ناخۆش بوە.

دەربارەی بنەماڵەی شێخان و پیاوە ناودار و ناسراوەکانیان زۆرکەس لەسەریان نووسیون و هەندێکیش کتێبی تایبەتیان دەربارەیان نووسیوە و بلاوکردۆتەوە لەوانە:

١- ئەمین زەکی بەگ لە مێژووی سلێمانیدا باسی کردون.

٢- مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرس لە کتێبەکانیدا (بنەماڵە زانیاری) چاپی ساڵی ١٩٨٤ و کتێبی (مکتوباتی کاک ئەحمەدی شێخ) چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٤ و لە یادی مەردانا باسی کردون.

٣- شێخ محەمەدی خاڵ- لە کتێبەکەیدا (الشیخ معروف النودهی) باسی کردون.

٤- عبدالمنعم الغلامي- لە کتێبەکەیدا (الضحایا الثلاث) چاپی ساڵی ١٩٥٢ باسی هەندێکیانی کردوە.

٥- مەلا عەبدوللا- (زیوەر ئەفەندی) لە گەنجینەی مەردانا باسی کردون.«١٣»

٦- یاداشتە چاپ نەکراوەکانی شێخ رئوفی شێخ مەحمود «٢١» و باسەکەی مامۆستا جەمیل بەندی رۆژبەیانی وەگفتوگۆکەی حزبوز (نوری ثابت) «٢٨» و یاداشتەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجا و ئەحمەد تەقیٚ و کتێبەکانی دوکتۆر کەمال مەزهەر و دوکتۆر جەمال نەبەز و دوکتۆر عەزیز شەمزینی و جەلال تالەبانی و هەندیٚ کتێب و یاداشتی تر کە و زۆر هەرکەسە بە جۆرێک باسی کردون.

# مێژووی بنەماڵەی شێخان

هەندێ مێژوونووس و نووسەران لەسەر ئەوەن کە بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە ئەچنەوە سەر شێخ عیسی و شێخ موسی کە هەردوکیان کوری (سید باباعلی هەمەدانی) بوون و لە ساڵی (٧٦٠هـ) دا هاتونەتە ناوچەی (سروچک-بەرزنجە) لە قەزای شارباژێر و لە گوندی بەرزنجە نیشتەجێ بوون (هەندێکیش ئەڵێن باباعلی باپیریان هەمەدانی نەبوە). شێخ مستەفا کە باوکی شێخ مارفی نودێ بوە، لە گوندی (بەرزنجە) لەدایک بوە، بەڵام لە دواییدا چوەتە گوندی نودێ کە هەر لە شارباژێرە و لە ساڵی ١١٦٦هـ شێخ مارفی کوری لە نۆدی لە دایک بوە.

بەپێ‌ی یاداشتەکانی شێخ رەئوفی شێخ مەحمود،«٢١» مامی باپیرە گەورەیان کە شێخ عەلی کۆسە بوە چۆتە گوندی (دۆڵ‌پەموو) لە ناوچەی (سروچک-بەرزنجە) وەئەوانی تر لە بەرزنجەدا مابوونەوە و دوای ئەوە شێخ مستەفا باوکی شێخ مارف چوەتە (نۆدی). لە پاش ئەوەی وەچەکانیان زۆربوون و پەرەیان سەند و لکیان لێ‌بوەوە هەندێکیان چوونە ناوچەی قەرەداغ و سەنگاو و ناوچەی کەرکوک و قادر کەرەم (کە ئەمانە هەموویان لەوەی نۆدی‌یەوە لکیان لێ‌بوەوە.

هەندێکی تر لەو بنەماڵەیە چونە گوندی عەبابەیلی لە نزیکی هەڵەبجە و تاقمێکی بۆ رانیە و پژدەر و هەولێر...... بەو جۆرە بە زۆر شوێنی خوارووی کوردستاندا بڵاوبوونەوە.

ئەمین زەکی بەگ لە لاپەرە (٢٢٠)ی کتێبی مێژووی سلێمانیدا ئەلێ:«١٢»

«کاتێ خۆی لە دەس‌نووسێکی لای شێخ مەحمووددا دیومە (بەداخەوە ئەوانە هیچیان نەماون یا دیارنین) کە شێخ مارفی نۆدی بە (١٣) پشت ئەچێتەوە سەر سەید عیسی کوری سید باباعلی هەمەدانی کە ئەو باباعلی‌یە کوری شێخ شهاب الدین یوسف برای بابا تاهیری هەمەدانی (شاعیر) بوە».

ئەمین زەکی لە کتێبەکەی تریا (مێژووی کورد و کوردستان)«١١» ئەلێ: (بابا

تاهیری هەمەدانی «کە نیازی لە بابا تایری عوریانی شاعیر بوە) کە مامی باباعلی هەمەدانی بوە و لە ساڵی ٤.١ هـ -١١.١م‌دا کۆچی دوایی کردوە).

بەلاٌم شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبەکەیدا (الشیخ معروف النودهی- چاپی عەرەبی) ئەلیٚ:

(ئەو باباعەلی‌یە کە باوکی شێخ عیسی و شێخ موسی بوە ئەو بابا عەلی‌یە نییە کە برازای بابا تایری هەمدانی (شاعیر) بوە چونکە باباعلی‌ی باوکی شێخ عیسی و شیخ موسی (هەروەکو شێخ رەئوفیش لە یاداشنەکانیدا هەروای بۆچوە و ئەلیٚ لە (ختلان) لە کەنار ئاوی روباری (جەیحون) لە ساڵی ٧٨٦م دا کۆچی دوایی کردوە).

بەوپی‌یە باباعلی هەمەدانی برازای بابا تایری هەمەدان (بابا تایری عوریانی) و باباعلی باوکی شێخ عیسی و شێخ موسی نزیکی لە (٣٨٥) ساڵ جیاوازی هەبوە، هەرچەند ئەگەر جیاوازیی تەمەنی مام و برازایەتیش حیساب بکەین و بیخەینە بەرچاو هێشتا ئەو جیاوازیە ناگاتە ئەو جیاوازیە زۆرەی کە نزیکەی (٣٨٥) ساڵ بووبێت.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود کە زۆر ئاگاداری (شجرە)ی بنەماڵەی خۆیان بوە و لەکاتی خۆیا زۆر بایەخی پی‌ئەدا هەر ئەوەی شێخ محەمەدی خاڵی پەسەند کردوە و لای وایە ئەمین زەکی بویە لەوەدا بە هەڵەدا چوە چونکە ئیعتمادی کردۆتە سەر نسخەیەکی ناتەواوی (بحر الانساب) کە لەوەدا وتراوە باباعلی هەمەدانی برازای بابا تایری هەمەدانی بوە.

شێخ رەئوف ئەلیٚ: ئەو بابا علی هەمەدانی‌یەی کە ئەمین زەکی بەگ بە برازای بابا تایری هەمەدانی داناوە خوشکەزای بوە نەک برازای.

## ١- شێخ مارفی نۆدیٚ

ئەمین زەکی لە مێژووی سلێمانیدا«١٢» ئەلیٚ: شێخ مارف لە پێشدا ناوی (سید محەمەد) بوە بەلاٌم لە دواییدا چۆن بوە بە شێخ مارف نازانریٚ). ئەگەرچی

ئەمین زەکی بەگ بەڵگەیەکی وای بەدەستەوە نەبوە یا نەی خستۆتە روو کە شێخ مارف لە سەرەتادا چۆن ناوی سەید محەمەد بوە).

عەباس عەزاوی لە باسەکەیدا «٣٢» دەربارەی شێخ مارف ئەڵێ: (شێخ مارف ناوی شێخ محەمەد بوە (دوورنیە عەزاوی لە ئەمین زەکی یەوە وەری گرتبێ هەرچەند ئەو بە سەید و ئەم بە شێخ ناوی بردوە کە زۆر لە نێوانی دووبراشدا لەناو شێخاندا ئەوە هەبوە وەکو وتراوە شێخ سەعید...... شێخ مەحمود کەچی بە ئیبراهیمی کوری شێخ سەعید و برای شێخ مەحمود وتراوە سەید ئیبراهیم) و شێخ مارفی نۆدی کوری شێخ مستەفایە و لە ساڵی ١١٦٦هـ دا لە گوندی-نۆدی- لە شارباژێر لە دایک بوە کە ئەو ساڵی هجریە ئەکاتە (١٧٥٢م) وە لەساڵی (١٢٤٥هـ- ١٨٣٨م)دا کۆچی دوایی کردوە. بەڵام ئەمین زەکی بەگ لە کتێبی مێژووی سلێمانیدا «١٢» ئەڵێ لە ساڵی ١٢٥٢هـ دا کۆچی دوایی کردوە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە لاپەرە (٣٤٨)ی کتێبەکەیدا (بنەماڵەی زانیاری) ئەڵێ:

(شێخ مارف تەنها کورێکی بوە ناوی کاک ئەحمەد بوە، شێخ مارف کە کاک ئەحمەدی بوە تەمەنی شەست ساڵان بوە و دایکی کاک ئەحمەدیش تەمەنی پەنجا ساڵ بوە). بەڵام سەیر ئەوەیە مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە کتێبێکی تریدا (مەکتوباتی کاک ئەحمەدی شێخ چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٤ لە لاپەرە (٣)ی ئەم کتێبەی دواییدا ئەڵێ: کاک ئەحمەد لە ساڵی ١٢٠٨هـ دا لە دایک بوە.

بەپێی ئەوەی ئەمین زەکی و عەباس عەزاوی کە باسمانکرد کە هەردووکیان لەسەر ئەوەن کە شێخ مارف لە ساڵی ١١٦٦هـ دا لە دایک بوە، کەواتە کە ساتێک کاک ئەحمەد کە لە ساڵی ١٢٠٨هـدا لە دایک بوبێ ئەبێ جیاوازی تەمەنی باوک و کور بریتی بووبێ لە ١٢٠٨-١١٦٦= ٤٢ ساڵی هیجری نەک شەست ساڵ وەکو مامۆستا عەبدولکەریم بۆی چوە.

وەکو ئەوتری شێخ مارفی نۆدی منداڵی نەدەبوو، هەر بە تەمای ئەوەبوە کە کورێکی ببێت و ناوی بنێت (ئەحمەد) و بەر لە دایک بوونی کاک ئەحمەد،

شێخ مارف بە شیعر نیمچە قاموسێکی بە عەرەبی و کوردی بۆ ئامادە کردوە بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو کورەی بوو، فێری عەرەبی ببێت و کتێبەکەی ناوناوە (ئەحمەدی). ئەو کتێبە لە سالی ۱۹۳٦دا جارێکی تر لە سلێمانی چاپ کراوەتەوە.

ئەمین زەکی دەربارەی خوێندنی شێخ مارف ئەلێ:

(قەلاچوالان کە هێشتا پایتەختی ئەمارەتی بابان بوە، شێخ مارف لە قوتابخانەی ئایینی- غەزائیە- خوێندویەتی و ماوەیەک لەگوندی هەزارمێرد کە گوندێکە بە شاخی «بەرانان»ەوە بەرامبەر بە شاری سلێمانی لە لای (مەلا محەمەدئەمین الحلاج)ی بە ناوبانگ خوێندویەتی لەگەلْ مەلا عەبدوللای بێتووشیدا ئاشنایەتی پەیداکردوە (ئەو رۆژانەی کە شێخ مارف لای ئیبن الحلاج خوێندویەتی سلێمان پاشا میری بابان بوە).

دەربارەی شێخ مارف ئەمین، زەکی باسی هەندێک لە نووسین و بەرهەمەکانی شێخ مارف ئەکا وەکو:

١- مبتدئە علی قافیە من نغمات کردیە.

٢- فارسیە علی نغمات کردیە.

٣- علی نغمات کردیە.

شێخ محەمەدی خالْ لە کتێبەکەیدا بە دوور و درێژتر باسی زانایی و بەرهەمەکانی شێخ مارفی کردوە.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا دەربارەی شێخ مارف ئەلێ:«٢١»

(ساتێک ئیبراهیم پاشای بابان فەرمانی دەرکرد کە شاری سلێمانی لەجێی ئیمرۆیدا دروست بکرێت شێخ مارف لەو کەسانە بووە کە لە قەلاچوالانەوە لەگەلْ میری باباندا هاتۆتە سلێمانی و نیشتەجێ بوە. شێخ مارف بە کاروباری ئایینیەوە خەریک نەبوە، بەلْکو خەریکی نووسین و دەرس وتنەوە بوە بە خەلْک و گەلێک کتێبی زانیاری و ئایینی ئەدەبی داناوە کە (مصنفات)ێکی زۆری هەیە کە لە پێشەکیەکەیدا (تخمیسی قەسیدەی بردیە) ناوی ئەو مصنفاتانەی هێناوە.

ئەمین زەکی لە مێژووی سلێمانیدا باسی ئەوە ئەکا کە ئەو تخمیسی قەسیدەی

(بردیه) لەلایەن شێخ مەحمودەوە کاتێک کە دەس بەسەربوە لە بەغدا چاپ کراوە.

دەربارەی ژیانی شێخ مارفی نۆدی شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیدا «٢١» ئەلێ:

(شێخ مارف وتویەتی کە ساتێک لە (نۆدی) بوم و دەرسم ئەوتەوە بە خەڵک، خزمێکم هەبوە ئیشی بۆ ئەکەردم، رۆژێک ئەو خزمەم پێی وتم ئامۆزاکانت نایەڵن دارت بۆ بهێنم، منیش لەو کاتەدا زۆر دەست کورت بوم، ئەو خزمەم پێی وتم: بۆچی ناچیت بۆلای کاربەدەستانی بابان لە قەلاچوالان، بەلکو مووچەیەکت بۆ ببڕرێتەوە، ئەوسا بە ئاسانی ئەتوانیت خۆت بۆ نووسین و زانیاری و دەرس‌وتنەوە تەرخان بکەی؟، لەسەر پێشنیازی ئەو خزمەم هەردوکمان پێکەوە چوینە قەلاچوالان و یەکسەر چوومە خزمەتی میری بابان کە لە دیوەخانەکەی دابو، منیش جل و بەرگێکی پەڕپوتم لەبەردابوو، پاشای بابان نەی‌دەزانی من کێم لەبەر ئەوە زۆر بایەخی پێ‌نەدام. ئەوسا من تصنیفی (کتاب روض الزهر)م کردبوو بە فارسی و لێکم دابوەوە (شەرحم کردبو بە فارسی)، پاشای بابان کەچوومە خزمەتی لە دیوەخان نسخەیەک لەو کتێبەی منی لەبەردەمابوو هەندێ مەلا و عولەما لە دەوری دانیشتبون ئەو کتێبەی منیان بۆ لێک ئەدایەوە، بەلام دیاربوو باش لێی تێ‌نەدەگەیشتن.

پاشای بابان لێی پرسیم: لە کوێوە هاتووی کە عەرزم کرد لە نۆدی‌وە هاتوم لێی‌پرسیم شێخ مارف لە کوێیە؟ منیش عەرزم کرد بۆچی ئەحوالی ئەپرسیت؟ فەرمووی چونکە (کتێبی روض الزهر)ی نصنیف کردوە و هەندێ باسی تیادایە لێی تێ‌ناگەم (ئەمە مانای ئەوەبوە پاشای بابان بایەخێکی ئیجگار زۆری داوە بە خوێندەواری) و شێخ محمەدی خاڵ لە کتێبەکەیدا (شێخ معروف النودهی) ئەلێ: (میری بابان کە لە قەلاچوالان بوە نزیکی ٦٠٠ کتێبی دەس‌نووسی لاهەبوە)، منیش پێم وت: من شێخ مارفم کە لەبەردەستدام. پاشا هەستا و بردمیە تەنیشت خۆیەوە و زۆر رێزی لێ‌گرتم و زەکاتی گوندی (نۆدی)ی پێ بەخشیم لەگەڵ مزگەوتەکەی نۆدی کە دەرسی تیادا بوترێتەوە، ئیتر لەو ساوە وازم لە کاروباری دنیایی هێنا و خۆمم تەرخان کرد بۆ نووسین و خوێندەواری).

شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیدا ئەلێ: (کە ئەمارەتی بابان لە قەلاچوالانەوە

گوێزرایەوە بۆ سلێمانی، شێخ مارفی (نۆدی)ش لەگەڵ پاشای باباندا هاتۆتە سلێمانی و لە ساڵی (١٧٨٥م)دا بوە بە مودەریسی مزگەوتی گەورە کە لەگەڵ ئەوا مەلا مەحمودی دیلیژەیی باوکی (مەلا محەمەدی چاومار)یش هەر لەو مزگەوتەدا دەرسی وتۆتەوە (مەلا مەحمودی دیلیژەیی ساڵی ١٢٥٠هـ کۆچی دوایی کردوە)، هەرچەند شێخ مارف خۆی خەریک نەدەکرد بە کاروباری دنیاییەوە حەزی لە ئاژاوە نەدەکرد لەگەڵ هیچ کەسێکدا، بەڵام زۆر کەس دژی وەستاون، بە تایبەتی لە دوای ئەوەی سەرکردایەتی (رئیس العلما)ی قبوڵ کرد لە شوێنی مەولانا خالید (وادیارە لایەنگرانی مەولانا خالید دوای ناچارکردنی مەولانا کە سلێمانی بەجێ بهێلێت و شێخ مارف لەجیٚی ئەو دانرا، ئەو لایەنگرانە دوورخستنەوەی مەولانایان لە شێخ مارف ناسیوە و لە ئەنجامی ئەوەدا ناحەزی و ناکۆکی لە نێوان نەقشبەندی و قادری دا پەیدابوە کە ئەمە سەرەتای کێشەیەک بوە تا ماوەیەک درێژەی کێشا).

## کێشەی نێوان قادری و نەقشبەندی

تەریقەی قادری ئەگەرێتەوە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە لە ساڵی ١٠٧٧م لە (گیلان) لە دایک بوە و لە ساڵی ١١٦٦م دا لە بەغدا کوچی دوایی کردوە. بەلام تەریقەی نەقشبەندی ئەگەرێتەوە بۆ شێخ محەمەدی نەقشبەندی کە لەناو کوردەواریدا بە (شای نەقشبەند) ناو ئەبرێ، لە ساڵی ١٣١٧م لەدایک بوە و ١٣٨٩م دا کۆچی دوایی کردوە. لە کۆشکی هندوانی عارفان نزیکی شاری بوخارا لە ئۆزبەکستان نێژراوە.

شێخ عبدولقادری گەیلانی خۆی بە نەوەی پێغەمبەر داناوە بەڵام شێخ محەمەدی نەقشبەندی لە رێگەی عیبادەتەوە بوو بە شێخ کە لە کوردستاندا بەو جۆرە شێخانە ئەوترێ «شێخی بەرماڵ».

سەرەتای بلاوبوونەوە و پەرەسەندنی تەریقەی نەقشبەندی لە کوردستاندا بە هۆی مەولانا خالیدەوە بوە بەڵام تەریقەی قادری لە زەمانی شێخ مارفی نۆدیٚدا وەلەناوچەی سلێمانیدا پەرەی سەند (ئەگەرچی تەریقەی قادری بەر لە شێخ

مارفی نۆدێ هەر هەبوە بە تایبەتی لەناوچەی بەرزنجەدا و لە هەندێ شوێنی تریشدا هەر هەبوە).

ئەمین زەکی بەگ لە کتێبی مێژووی سلێمانیدا «١٢» لەم روەوە ئەلێ:

(بەپێی وتەی مەلا محەممەدی قزلجی، شێخ مارف نۆدێ تەریقەی قادری لە (شێخ عەلی دۆڵپەموو) وەرگرتوە کە ئەویش لە شێخ ئیسماعیلی قازانقایەوە (گوندێکە لە ناوچەی قەرەداغ) ئەو تەریقەی‌یەی وەرگرتوە.

کێشەی نێوانی شێخ مارفی نۆدێ و مەولانا خالید لە سەرەتادا و لە دوای ئەوەش لە نێوانی مەولانا خالید و کاک ئەحمەدی شێخدا روویداوە و مەولانا خالید ناچار بوە بۆ جاری دووهەم سەری خۆی هەڵبگرێ و سلێمانی بەجێبێڵێت و نەگەرێتەوە بۆ کوردستان. ئەو ئاوارەبوونەی مەولانا خالید بوە بە هۆی درێژەپێدانی کێشە و رێک نەبوون لە نێوانی خەلیفە و مرید و دەروێش و سۆفی‌یەکانی هەردولادا (کە لەبەشی باری ئایینی‌دا بە کورتی لی‌ی دواین و ئەمانەوەی لێرەدا زیاتر روونی بکەینەوە).

عەباس عەزاوی لە باسێکیدا «٣٢» دەربارەی ناکۆکی نێوان هەردولادا بە دوور و درێژ باسی کردوە و ئەلێ:

(دوای ئەوەی مەولانا خالید و شێخ مارفی نۆدێ تێکچون و مەولانا ناچار کرا بچێتە بەغدا، شێخ مارفی نۆدێ بە نووسین هێرشێکی توند و تیژی بردۆتە سەر مەولانا خالید و(رسالە)یەکی بە ناوی (تحریر الخطاب في الرد علی خالد الکذاب) بلاوکردۆتەوە. ئەو (رسالە- نامە)یەی ناردوە بۆ والی بەغدا کە (سەعید باشای سلێمان پاشا)بوە. شێخ مارف بەوەش وازی لە مەولانا نەهێنا بەڵکو لەناو خەڵکدا مەولانای بەوە تاوانبار کرد بۆ کە رێگەی (کفروالحاد)ی گرتۆتە بەر و لە رێگەی ئایینی ئیسلام لای‌داوە. لە ئەنجامی ئەو نامەیەدا، ئەوانەی سەربە قادری بون لایەنی شێخ مارفیان گرتوە و پروپاگەندەیان دژی مەولانا خالید کردوە.

سەعید پاشای سلێمان پاشای والی بەغدا بۆ لێکۆڵینەوە و چوونە بنج و بناوانی ئەو نامەیەی کە شێخ مارف ناردبووی (علامە شێخ یحیی المزوري) ئەنێرێ بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی لە رەفتاری مەولانا خالید ئاگادار بێ، شێخ

یحیى المزوری دوای ئەوەی ئەچێتە سلێمانی و دەست ئەکات بە لێکۆلینەوەی نامەکەی شێخ مارف، نامەیەک ئەنێرێت بۆ والی بەغدا و ئاگاداری ئەکا کە مەولانا خالید لە هەموو کردەوەکانیدا بەپێ‌ی شەرعی شەریف و ئایینی ئیسلام رەفتاری کردوە و بۆ پشتگیری کردنی ئەو نامەیەی شێخ یحیى مزوری (شێخ محمدامین صالح الطبقچلي) کە ئەو سەردەمە موفتی بوە لە شاری حلە لاینگریی مەولانا خالیدی کردوە و بەرپەرچی نامەکەی شێخ مارفی داوەتەوە.

وادیارە هەر ئەو لایەنگیریە بەهێزە بوە کە وەکو عەباس عەزاوی باسی کردوە، دوای ئەوەی کە شێخ مارفی نۆدێ مرد و کاک ئەحمەدی کوری بوە بە جێگری، ئەمیری بابان جارێکی تر مەولانا خالیدی بانگ کردۆتەوە بۆ سلێمانی و تکای کردوە کە بگەرێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

کلودیوس ریچ لە گەشتەکەیدا «٤٨» باسی ئەو رۆژانە ئەکا کە لە سالی ١٨٢٠دا چۆتە ناوچەی ئەمارەتی بابان کە لەو رۆژانەدا ناکۆکی نێوان لە قادری و نەقشبەندیدا گەرم بوە، دەربارەی ئەو نارێکیەی مەولانا خالید لە لایەک و شێخ مارف و کاک ئەحمەدی شێخ کوری لەلایەکی ترەوە ئەلێ:

«کە بۆ جاری یەکەم مەولانا خالید لە زەمانی شێخ مارفی نۆدێ‌دا ناچارکرا سلێمانی بەجێ‌بێلێت. (لە لاپەرە ٣٢٠-٣٢١ی کتێبەکەیدا ئەلێ مەولانا لە ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٨٢٠دا رایکرد و سلێمانی بەجێ‌هێشت، گوایا هۆی ئەو بەجێ‌هێشتنەی ئەوە بوە پادشای بابان کورێکی نەخۆش ئەکەوێ و ئەیبەنە لای مەولانا خالید بۆ ئەوەی بزانێت پاشەرۆژی ئەو کورەی چۆن ئەبێت، گوایا مەولانا خالید لە وەرامی ئەو پرسیارە دا ئەلێ: چاوم لێ‌یە ئەم کورە تاجی سەلْتەنەتی کردۆتە سەری، بەلاَم دوای ئەوە کە ئەیبەنە لای شێخ مارف، شێخ مارف لە وەرامی هەمان پرسیاردا ئەلێ تەنها خوا عیلمی غەیب ئەزانێت- دوای ماوەیەک کورەکەی پاشای بابان ئەمرێ و لەوەوە پاشای بابان رقی لە مەولانا خالید هەلْدەستێت (دیارە بۆ ئەوە بوە کە کەراماتەکەی راست نەبوە)، وەلە ئەنجامی ئەوەدا مەولانا خالید لە رئیس علمایەتی لائەبا و شێخ مارفی نۆدێ لەجێ‌ی ئەو دائەنێت و مەولانا ناچار ئەکرێ سلێمانی بەجێ‌بێلێت و رووبکاتە بەغدا).

بەلای مستر ریچەوە ئەو روایەتە بەشتێکی راست نازانێ و لای وابوە کە ئەو

جوره پروپاگەندانه و گەلێکی تریش دەربارەی مەولانا خالید کە گوایا ڕەوشتی پیس و ناپاکی لەناو خێزانی بابانەکاندا بڵاوکردۆتەوە یا دەس‌درێژی کردوە لە کاروباری بابانەکاندا، لەگەڵ هەندێ درۆودەڵەسەی تر، ئەمانە هیچیان ڕاست نەبوون و هەمووی بێ سەروپێ بوە و ریچ ئەڵێ: ئەو مەولانا خالیدەی کە پاشای بابان دەستی بۆ بەسنگەوە گرتوە و پاشا خۆی قلیان و سەبیلی بۆ تێ‌کردوە و پاشا خۆی بە مریدی مەولانا زانیوە ئایا چۆن وەلەبەرچی وابە ئاسانی لە مەولانا خالید دڵگیربوە و ناچاری کردوە خۆی و خێزانەکەی بە پەلە پروسکێ و بە نهێنی سلێمانی بەجێ بهێڵێت؟

ریچ کە ئەوسا قونسولی بریتانیا بوە لە بەغدا، لە یاداشتەکانیدا وای نیشان داوە کە ئەمانە هەمووی هەڵبەست و نارەوا بوون و هوی ڕاستی‌ی ئەو تێکچونەی پاشای بابان و مەولانا خالید لەبەر ئەوەبوە کە مەولانا ناوبانگی لەناو خەلکدا لە زۆر شوێندا بلاوبوەوە و ژمارەیەکی زۆر بوون بە مرید و سۆفی و لایەنگیری. لەبەر ئەوە بۆ پاشای بابان دەستی نەئەدا کە یەکێکی ناوداری وا لە ناوچەکەدا هەڵبکەوێ. ریچ ئەلێ لەگەڵ ڕاکردنی مەولانا خالید یوسف بەگی حاکمی ناوچەی پژدەریش ڕایکرد.

شێخ ڕئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا دەربارەی ئەو نارێکی‌یە ئەلێ:«٢١»

«دوکتور عەلی ئەبونوار لە کتێبەکەیدا (داود پاشا) لە باسی مەولانا خالیدا وتوویەتی: مەولانا لەو ڕۆژانەدا ناوبانگی زۆر بڵاوبووبوەوە و بەناو خەڵکدا و حکومەتی عوسمانلی لەوە ئەترسا کە مەولاناش مەزهەبێکی تایبەتی لە کوردستاندا دامەزرێنێ و بلاوی بکاتەوە وەکو ئەو مەزهەبەی (شێخ ئەحمەد الاحسائی) یا وەکو ئەوەی (وەهاب)ی‌یەکان دایان نابوو کە ئەویش مەترسی هەبێت بۆ بەرژەوەندی عوسمانلی‌یەکان لە کوردستاندا کە ئەمە هۆی سەرەکی بوە لە دوورخستنەوەی مەولانا خالید (کە ریچیش هەر باسی ئەوەی کردوە)، لەلایەکی تریشەوە عوسمانلی‌یەکان سەیریان کردوە بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە خەلکێکی زۆریان لە گەلایە و ئەوان دەسەلاتدارترن لەکار و باری دنیاییدا، بۆیە سوودیان لەوە دابوە کە لایەنگیری شێخانی بەرزنجەبن و بەلای خۆیانا دایانشکێنن».

هەر چۆنێک بێ، چ ئەو هۆ و بۆچوونەبێ کە ریچ یا دوکتور عەلی ئەبونوار وەکو شێخ رەئوف باسی کردوە، یاهۆی تریش بووبێت، بێگومان بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە بە هیچ جۆرێک ئەوەیان پێخۆش نەبوە کە دەسەلاتدارێکی تری ئایینی لەناوچەکەیاندا هەڵبکەوێ کە بەربەرەکانی دەسەڵاتی ئەوان بکا و وەکو لە پێشتریشدا باسمان کرد ئەو ناکۆکیە لە نێوانی هەردوولادا هەر بە زەمانی مەولانا خالید و شێخ مارف و کاک ئەحمەدەوە نەوەستا بەڵکو هەتا ماوەیەکی زۆرتر پەرەی سەند و لە زەمانی حوکمدارێتی شێخ مەحمودیشدا ئەگەر بەسەر زاریش ئەو ناکۆکیە دەرنەکەوتبێ بەلاّم لایەنگیری هەردولا هەر لەگەڵ یەکتر نارێک بوون.

## ٢- کاک ئەحمەدی شێخ

بەپێی کتێبەی ئەمین زەکی- مێژووی سلێمانی- «١٢» کاک ئەحمەدی شێخ لەساڵی (١٢٠٧هـ) لە شاری سلێمانی لەدایک بوە و لە ساڵی ١٣٠٥هـ دا کۆچی دوایی کردوە و لەو مزگەوتەدا کە لە دواییدا بە مزگەوتی گەورە ناوبراوە نێژراوە.

بەلاّم مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس لە هەردوو کتێبەکەیدا (بنەماڵەی زانیاری- چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٤ و مکتوباتی کاک ئەحمەدی شێخ چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٤) ئەلێ: کاک ئەحمەدی شێخ لە ساڵی ١٢٠٨هـ دا لەدایک بوە و لەگەڵ ئەمین زەکی بەگدا لەوەدا یەک ئەگرێتەوە کە ئەلێ لە ساڵی ١٣٠٥هـ دا کۆچی دوایی کردوە.

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس لە کتێبەکەیدا (بنەماڵەی زانیاری) ئەلێ: کاک ئەحمەدی شێخ دوو کوری هەبوە یەکێکیان ناوی باباعلی بوە کە بەگەنجی مردوە و ژنی نەهێناوە، کوری دوهەمی ناوی شێخ محەمەد بوە (کە بە شێخ محەمەدە بچکۆلە) ناسراوە.

شێخ محەمەدی خاڵ دەربارەی شێخ محەمەدە بچکۆلە ئەلێ:

(پیاوێکی ئاینداری دەروێش مەشرەب و گۆشەگیر بوە و بە گەنجی مردوە کە بەپێی حیسابی شێخ محەممەدی خاڵ تەمەنی (٢٦) ساڵ بوە کە مردوە و (٧) کوری هەبوە کە بریتی بوون لە: ١- شێخ سەعید (کە لەدواییدا بە شێخ سەعیدی حەفید ناسراوە) ٢- شێخ مارفی نەقیب (بە شێخ مارفە کەرە ناسراوە) ٣- شێخ مستەفا نەقیب ٤- سەید حەسەن ٥- سەید عومەر ٧- سەید ئەحمەد ٧- سەید عیسی.
بەڵام مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس لە بنەماڵەی زانیاری‌دا ئەڵێ: شێخ محەممەدە بچکۆلە هەشت کوری هەبوە: ١- ئەحمەد ٢- محەممەد ٣- شێخ سەعید ٤- شێخ مارف (شێخ مارفی نەقیب) ٥- مستەفا (شێخ مستەفا نەقیب) کە ئەم پێنج کورەی لە کچی شێخ محەممەدئەمین قازانقایە بوە، دوانەکەی تر حەسەن و عومەر لەکچی باباجان بوە (نیازی لە کچی بەدیع ئەفەندی باباجان بوە کە باوکی حوسێن ئەفەندی باباجانی دوکتور بوە) وەکوری هەشتەمی کە ناوی (عیسی) بوە لە ژنێکی مەسیحی بوە کە بوە بە ئیسلام و مارەی کردوە.)
ئەو ناوبانگەی کە شێخ مارفی نۆدێ بۆ ئەو بنەماڵەی پێکهێنا، لە زەمانی کاک ئەحمەدی کوریا ئەو بنەماڵەیە زۆر ناوبانگیان بڵاوبوەوە و خەڵک لە جاران زۆرتر ریزیان لێ‌ئەگرتن.
کاک ئەحمەدی شێخ وەکو پیاوێکی ئیجگار زانا و خوێندەوار و شارەزا لە ئایینداوای لەکاربەدەستانی عوسمانلی کردبوو کە حیسابێکی زۆر تایبەتی بۆ ئەو بنەماڵەیە بکەن، لەگەڵ ئەو زانایی و ئایینداریەیدا، کاک ئەحمەد وشک و رەق و مێشک داخراو نەبوە، بەڵکو هەمیشە لە کۆری دانیشتنەکانیدا خەڵک بەوپەری سەربەستیەوە بیر و باوەر و سەرنجی خۆیان لە روویا دەربریوە. بۆ نموونە: وەکو پیاوە پیرەکانی سەردەمی لاوی ئێمە ئەیان گێرایەوە، (خواجا حەنەنیا) کە یەکێک بوە لە جوولەکە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی، زۆرجار چوەتە خزمەتی کاک ئەحمەدی شێخ و بەشداری کردوە لەو گفتوگۆیانەی کە لە دانیشتنەکانیدا کراوە...... جارێک کاک ئەحمەد بە خەواجا حەنەینا ئەڵێ: خەواجا تۆ پیاوێکی زۆر چاکیت بۆچی نابیت بە ئیسلام؟ ئەویش

له وەرامدا پیٚی ئەلیٚ: قوربان، ئەگەر ئیسلامەتی ئەوەبیٚ کەتۆ ئەیکەی، ئەوە بارێکی زۆر قورس و گرانە و بەمن هەڵناسیٚت، خۆ ئەگەر ئەوەش بیٚ کە لە هەندیٚ موسولمانی تری ئەبینم وابزانم جوولەکەیەتیەکەی خۆم باشترە......

کاک ئەحمەد بە پیٚکەنینەوە پیٚی ئەلیٚ: ئارەزووی خۆتە و لااکراه في الدين. (بەراستی ئەمە یەکیٚکە لەو راستیانەی کە زۆری وەکو میٚجرسۆن بە درۆ ئەخاتەوە کە لە یاداشتەکانیدا وتویەتی کوردەکان بە زۆر کریستیانەکانیان ئەکرد بە ئیسلام و بە زۆر جلی کوردی‌یان پیٚ لەبەر ئەکردن).

مامۆستا رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا «٢» دەربارەی کاک ئەحمەدی شیٚخ ئەلیٚ:

«خۆشەویستی‌ی کاک ئەحمەد لەناو خەڵکدا ئیجگار زۆربوە و ئەو خۆشەویستی‌یە لەناو خەڵکدا بۆ کورەکانی مایەوە بە تایبەتی شیٚخ مستەفای نەقیب و شیٚخ سەعید، (رەفیق حیلمی ناوی شیٚخ مارفی نەقیبی نەهیٚناوە) کە وەکو زۆر کەسیش باسیان کودوە شیٚخ مستەفا و شیٚخ مارف کەللە رەق بون و حەزیان لە مولکداری کردوە و هەوڵیان داوە دەست بەسەر زۆرترین مولکدا بگرن و لە ئەنجامی ئەوەدا دلی خەڵکی‌یان لیٚ رەنجاوە بە پیٚچەوانەی ئەوانەوە زیوەر لە یاداشتەکانیدا زۆر ستایشی کردون «١٣». هەروەها شیٚخ رەزای تالەبانیش بە شیعر ستایش کردون وەکو لە باسی شیٚخ مارفی نەقیب و شیٚخ مستەفادا باسی ئەکەین.»

ئەمین زەکی لە میٚژووی سلیٚمانیدا «١٢» ئەلیٚ: کاک ئەحمەد (١٢٠) نامەی بە فارسی نوسیوە. مەلا عەبدولکەریمی مودەرس لە کتیٚبی (مکتوباتی کاک ئەحمەد) دا ئەلیٚ:

(کاک ئەحمەد تەدریسیٚکی زۆرباشی کردوە و گەلیٚک خویٚندەواری خاوەن بەهرەی پیٚ گەیاندوە و سفرەوخوانیٚکی بیٚ درێغی بوە بۆ نانداني مرید و میوان و خەڵکی ولاٚت، بە تایبەتی بۆ فەقیٚ و حافظی قورئان، جگە لەوە هەمیشە هەولی داوە ئەوانەی لەناو خۆیانا نارێک بون، چ خەڵکی شار و چ خەڵکی دیٚهاتی لەگەڵ یەکتردا ئاشتی کردونەتەوە و بۆ چارەسەرکردنی کیٚشەی کاروباری خەڵک لەناو دائرەکانی میری ئەو سەردەمەدا هەولی داوە).

بەلام دەربارەی (مکتوبات- نامە)کانی کاک ئەحمەد، مەلا عەبدولکەریم ئەلی: (وازانراوە کە (٩٩) نامەی نوسیوە و ناردویتی بۆ ئەملاوئەولا(ئەونامانەی کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم باسی کردون و لە کتێبەکەیدا بلاوی کردونەتەوە، بەپێی سروشت و یاسای ئەو سەردەمە هەمووی بە زمانی فارسی نوسراوە- کە زمانی نووسینی ئەدەبی ئەو سەردەمە بوە).

کاک ئەحمەدی شێخ جگە لەوەی کە زانایەکی ئایینی و خوێندەوار و نووسەرێکی بەرزی ناسراوی ئەو سەردەمە بوە، بەوەش ناسراوە کە هەمیشە هەولی داوە بە کوردی دەرس بە قوتابیەکانی بلێتەوە و بایەخی بە زمانی کوردی داوە (بێگومان زەمانی بابانیش بایەخێکی زۆر دراوە بە زمانی کوردی و ئەو زمانی ئەدەبی یەککگرتووەی کە ئێستا لە خوارووی کوردستاندا خۆی چەسپاندوە بریتی‌یە لە تەواوکردنی رێبازی قوتابخانەکانی ئەو سەردەمە کە لەبەرهەمی شاعیرانی ئەو سەردەمە و دوای ئەوانیش گەیشتۆتە پۆپەی وەکو شیعرەکانی نالی و سالم و کوردی و مەحوی و حاجی قادر و وەفایی و شێخ رەزای تالەبانی و هەندێکی تر.

حاجی قادری شاعیر لە شیعرێکیدا پەلاماری کابرایەکی کۆیی داوە لەسەر ئەوەی کە رەخنەی لە کاک ئەحمەدی شێخ گرتوە کە بە کوردی دەرسی بە قوتابیەکانی وتۆتەوە...... حاجی قادر رەخنەی کابرای کۆیی بەم جۆرە دەگێرێتەوە...... کابرا وتویەتی:

کەس نەماوە بە غەیری کاک احمد — شێخی مەعروف و عالمی ئەرشد
چاکە، ئێستا دەکا لە بۆ کوردان — تەرجەمەی شەرع و ئایتی قورئان
واقیعەن خزمەتی لە بۆ خودایە — چ دەبوو گەر بە کوردی نەبایە؟!

حاجی قادری کۆیی خۆی ئاسایای لە کابرا رائەپەری و بە تووڕەییەوە پێ ئەلێ:

هەرکەوای ووت وەها موکەدەر بوم — وام دەزانی کەوا لە دین دەرچوم
گوتم: ئێستاش لەسەر کەری ماوی — چا بۆ مستم نەدا لە نێو چاوی
لە قزی کوردی بلاونەبوو گرد بوو — وا لە مابەینی ئێمەدا تێ چوو

زیوەر لە یاداشتەکەیدا دەربارەی کاک ئەحمەدی شێخ ئەلێ:«١٣»

(کاک ئەحمەد پیر بوبو، توانای سەفەری نەمابوو، بۆ ژیانی خۆی و خدمەتی ئایندە و رەوەند و مریدانی تەنها وارداتی ئاشێکی هەبوو لە گوندی (سەیدئاوا)، بۆ ئەوە کچەزاکەی خۆی کە شێخ محەممەدی شێخ عەلی بوە (لێرەدا وادەرئەکەوێ کە کاک ئەحمەد جگە لە دوو کورەکەی کچیشی هەبوە کەچی هیچ سەرچاوەیەک باسی ئەو کچانەی نەکردوە و هەروەها شێخ محەممەدە بچکۆلەی کوریشی جگە لەو هەشت کورەی کە باسمان کردن کچیشی بوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین و لەوە ئەچی نووسەرانی ئەوسامان هەر بایەخیان بە نێرینە داوە و حسابیان بۆ ئافرەت نەکردوە) ئەنیرێ بۆ خزمەتی سوڵتان لە ئەستەمبول و نامەیەکیشی پیادا ئەنێرێت، شێخ محمەد لە ئەستەمبول لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە لە موسافیرخانە قبوڵ ئەکرێ و سوڵتان فەرمانی زەکاتی پێنج گوند دەرئەکا کە بدرێن بە کاک ئەحمەدی شێخ کە بریتی بون لە (نۆدێ، عازەبان، بزەینیان، وێڵەدەر، خەراجیان- کە دیارە ئەمانە هەمووی مولکی میری بوە) و نامەیەک ئەنیرێ بۆ کاک ئەحمەد کەوا ئەم گوندانە هەمووی ئەبن بە (وەقف)ی دەرگای کاک ئەحمەد بۆ مەسرەفی میوان و دەروێش و پیرانی و معاش بۆ شێخ محەممەدی خوشکەزای کاک ئەحمەد ئەبریتەوە و سوڵتان نامەیەکی تر بە شێخ محمەددا ئەنێرێت بۆ کاربەدەستانی عوسمانلی کە دەس بەرداری زەکاتی ئەو پێنج گوندە بن (لە باسی شێخ مارفی باوکی کاک ئەحمەدا باسی ئەوەمان کرد کە میری بابان زەکاتی گوندی نۆدێیان دابو بە شێخ مارف، وادیارە لە دوای نەمانی بابان، عوسمانلییەکان ئەو خەڵات و بەراتەیان تازە کردۆتەوە و داویانە بە کاک ئەحمەد) بەو جۆرە ئەتوانین بڵێین ئەمە سەرەتای مولکداری بنەماڵەی شێخان بوە کە لە دواییدا هی تریشی خراوەتەسەر.

ئەمین زەکی بەگ لە مێژووی سلێمانیدا بە جۆرێکی تر باسی ئەو خەڵاتکردنەی سوڵتان ئەکا بۆ کاک ئەحمەد و ئەلێ: (سوڵتان ئەو پێنج گوندەی لە خەڵاتی ئەوەدا تەرخان کردبو بۆ کاک ئەحمەدی شێخ کە لەو شەرەی لە نێوانی عوسمانلی و رووسدا لە ساڵی (١٢٩٣هـ)دا روویدا کە بەو شەرە ئەوترا

شەڕی قارص و بایزید (هەندێ نووسەران بە شەری قارص و ئەردەهان ناویان بردوە)، لەسەر داواکردنی سوڵتان، کاک ئەحمەدی شێخ لەشکرێک لە مرید و دەروێشەکانی کۆ ئەکاتەوە و بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی کورەزای ئەی‌نێرێ بۆ بەشدارکردن لەو غەزایەدا. بە بەشداری بوونی ئەو لەشکرەی کاک ئەحمەد ئەوەندەی تر پایەی شێخانی بەزنجە لای عوسمانلی پێ بەرز بوەوە و زۆرتر رێزیان لێ‌گیرا).

شێخ محەمەدی خاڵ لەو روەوە ئەلێ (ئەو شەرەی کە لەشکرەکەی کاک ئەحمەد تیادا بەشداری کرد لە ساڵی (۱۸۷۵م-۱۸۷٦م) دابوە کە بە شەری قەفقاس ناسراوە بەڵام عیزەت کاکەیی وەکو لە یاداشتەکانیدا کە بە تورکی نوسیوێتی و شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتە چاپ‌نەکراوەکانیدا باسی ئەکا «۲۱» (عیزەت کاکەیی سکرتێری تایبەتی شێخ سەعیدی حەفید بوە) ئەلێ ئەو شەرە لە ساڵی ۱۸۷۷دا روویداوە.

بەڵام کاک ئەحمەد جگە لەو پێنج گوندەی کە باسمانکردن (جۆگای کاک ئەحمەد)یش هەر بە ناوی ئەوەوە بوە (کە جۆگایەکی گرنگ بوە لە جۆگای ئاوبارە و بەکرەجۆی رۆژئاوای سلێمانی هەڵگیراوە) کەوا دیارە عوسمانلی‌یەکانیش ئەو جۆگایەیان خەڵات کردوە.

وەختی خۆی پیرەمێردی شاعیر نامیلکەیەکی بەناوی (کراماتی کاک ئەحمەدی شێخ)ەوە بڵاوکردۆتەوە، ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا«٤٤» باسی ئەو نامیلکەیەی پیرەمێردی کردوە. کە گوایا کاک ئەحمەدی شێخ نامەیەکی ناردوە بۆ (ملکە ڤیکتۆریا)ی ئینگلیز بۆ ئەوەی لە (راجا)یەکی هیندی خۆش ببێت کە دیارە تاوانبار بوە و گوایا ملکە ڤیکتۆریا لەسەر ئەو نامەیەی کاک ئەحمەد لە کابرای راجای هیندی خۆش ئەبێت و وەرامی نامەکەی کاک ئەحمەدیش ئەداتەوە (هیچ سەرچاوەیەک باسی ئەو نامەیە و باسی دەقی ئەو دوو نامەیەی نەکردوە و بڵاونەکراوەتەوە).

پیرەمێرد لەو نامیلکەیەیدا کە نزیکی (۸۰) لاپەرە بوە هەندێ چیرۆکی فارسی کردوە بە کوردی و ئەو چیرۆکانە لە کاتی خۆیدا بە دەسخەتی (خواجا ئەفەندی) نوسراوەتەوە و پیرەمێرد لە شوێنێکی ئەو نامیلکەیەدا باسی

گوللەبەندەکەی کاک ئەحمەدی شێخی کردوە کە گوایا لە دواییدا بۆ شێخ مەحمود مابوەوە (ئەی ئەگەر ئەمە راستە بووبێت شێخ مەحمود چۆن لە شەری دەربەندی بازیان‌دا بریندار کرا، یا وا دیارە ئەو گوللەبەندە پێ نەبوە؟)، بەپێ‌ی ئەو نامیلکەیەی پیرەمێرد گوایا شێخ مارفی نۆدێ لە کاتی سەرەمەرگ و گیانەلادا بە کاک ئەحمەدی کوری ئەڵێ کە بچێت بۆ حەج و لەوێ چاوەرێ‌ی پیاوێکی گەورە بکات کە کلیلی حروفی ئەبجەدی سیحری پێ‌یە، کاک ئەحمەد بەو هیوایە ئەچێت بۆ حەج و لە مەکە سێ ساڵ ئەمێنێتەوە (هیچ سەرچاوەیەک باسی ئەو سێ ساڵەی کاک ئەحمەدی نەکردوە کە ئەو ماوە دوورودرێژە لە سلێمانی دوور کەوتبێتەوە) هەتا ئەو پیاوەی کە کاک ئەحمەد بە تەمای بوە لە (مراکش)ەوە چوە بۆ مەکە و کاک ئەحمەد دیوێتی و کەراماتی لەوەوە وەرگرتوە و ئەو تەلیسمەی کە دەستی کەوتوە لە پێشدا لە خۆیدا تاقی کردۆتەوە.

وەکو پیرەمێرد لەو نامیلکەیەیدا باسی کردوە کە بە هۆی ئەو تەلیسمەوە کاک ئەحمەد گوللەبەندیکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ناردوە و جارێک سوڵتان بە هۆی ئەو گوللەبەندەوە لە مردن رزگاری بوە کە ساتێک ئەرمەنیەکان بۆمبایان بۆ داناوە و نزیکی سەد تا دووسەد کەس بەو بۆمبایە کوژراو و بریندار بون بەلاٌم عەبدولحەمید دلۆپێک خوێن لە لەشی نەرژاوە (دوکتۆر جەمال نەبەزیش باسی ئەو گوللەبەندەی کاک ئەحمەدی کردوە).

وەکو ئەوترێ سولتان عەبدولحەمید خۆی بە مریدی کاک ئەحمەدی شێخ دابوە قەڵەم کە بەمە پایەی شێخان ئەوەندەی تر لەناو خەڵکدا بەرز بوەوە هەر چەند ئەو پایەبەرز بوونەوەشیان بوو بە هۆی ئەوەی کە زۆر ناحەزیان بۆ پەیدا بێت وەکو لە باسی شێخ سەعیدی کورەزای کاک ئەحمەدا باسی ئەکەین.

لە دوای وەفاتی کاک ئەحمەدی شێخ، ئەوانەی کە لەو بنەماڵەیە ناسراو بوون زۆر بوون بەلاٌم ئەوانەی کە لەم باسەی ئێمەدا مەبەستمانە جگە لە شێخ مارف و کاک ئەحمەد ئەتوانین بە تایبەتی باسی شێخ سەعید و شێخ مستەفا نەقیب (کورانی شێخ محمەدە بچکۆلە) و شێخ مەحمود کوری شێخ سەعید بکەین کە ئەمەی دواییان (شێخ مەحمود) مەبەستی سەرەکیمانە لەم باسەدا.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە شیعرێکیدا لە باسی شێخانی ئەو سەردەمەی خۆیدا تەنها ناوی ئەو سێ کوڕەی شێخ محەمەدە بچکۆلەی هێناوە کە تویەتی:

شێخ سەعید سەرداره، شێخ مارف هەتا حەزکەی نجیب
بۆ جەوانمەردی و شەجاعەت بەینی بین الله نقیب

شێخ سەعید هەر لە زەمانی کاک ئەحمەدی باپیرەیەوە لە هەموو کوڕەکانی تری زیاتر ناوبانگی دەرکردوە و عوسمانلی‌یەکان دوای مردنی کاک ئەحمەد پێوەندی‌یان لەگەڵ شێخ سەعید بە هیز کردوە، شێخ سەعید کە کوڕەزای کاک ئەحمەد بوە نازناوی (حەفید)ی بەسەرا براوە کە (کوڕەزا) ئەگرێتەوە و لەوساوە زۆربەی ئەو بنەماڵەیە نازناوی (حەفید)یان لە خۆیان ناوە.

## ٣- شێخ مارفی نەقیب

وەکو وتمان شێخ مارفی نەقیب کە بە شێخ مارفە کەڕە بەناوبانگ بوە، باوکی حەپسەخانی نەقیبی ژنی شێخ قادری برای شێخ مەحمود بوە لەگەڵ ئایشەخان کە لە پێشدا ژنی شێخ ئەحمەدی برای شێخ مەحمود بوە و لە دوای کوشتنی شێخ ئەحمەد لە کارەساتەکەی موسل، شێخ مەحمود مارەی کردوە. ئایشەخان لە شێخ ئەحمەد تەنها شێخ جەلالی بووە و لە شێخ مەحمودیش تەنها شێخ لەتیفی بوە. شێخ مارف پیاوێکی دەس ڕۆیوو بە زەبروزەنگ بوە و زەوی و زارێکی زۆری پێکەوە ناوە.

دەربارەی وتەی (نەقیب)، زیوەر لە یاداشتەکانیدا ئەلێ:

«وتەی نەقیب لە زەمانی عوسمانلی‌دا بۆ ئەو کەسە دانراوە کە یەکێک لە بنەماڵەی سادات بۆ پاراستنی مافی سەیدەکان لە مەجلیسی ئیدارەی لیوادا دائەنرا. ئەو کەسەی ئەکرا بە نەقیب لەلایەن سولتانەوە فەرمانی بۆ دەرئەچوو وەمووچەی تایبەتی بۆ تەرخان ئەکرا و پێ‌ی ئەوترا (نقیبی ئەشراف) کە ئەم

نازناوه له شوێنەکانی تری سوڵتانی عوسمانلیشدا هەر بووه (وەکو ئەوانەی بەغدا و بەسره). ئەوەی که ئەکرا بە نەقیب پێویست بوو له بنەماڵەی سادات بوایه بۆ ئەوەی ئەو کەسە له بریتی سادات پێوەندی بە میرییەوه بکردایه بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک وەیا بوونی هەر کۆسپێک که ئەهاته رێگایان».

جگە لەوەی که مامۆستا زیوەر باسی کردوه، بەر لەوانەی که لەناو بنەماڵەی شێخاندا بوون بە نەقیب، له زەمانی بابانەکانیشدا ئەو نازناوە دراوه بە هەندێ کەسی لیٚهاتوو وەکو شێخ مەحمودی کوری شێخ حەسەنی گلەزەردە (۱۲۰۰هـ= ۱۲۷۵هـ) که کراوه بە نەقیب و که مردوه له گردی سەیوان نێژراوه. «۳۵»

هەروەها وشەی (موفتی)یش هەر بۆ ئەو کەسانه بەکار هێنراوه که بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئایینی و راوێژکردن و لێکدانەوەی باسێک یا رووداوێک دانراوه که پێوەندی بە ئایین و بریاری ئاینەوه بێت لەسەر کێشەیەک. ئەو کەسەی که ئەکرا بە (موفتی) ئەویش لەلایەن سوڵتانەوه فەرمانی بۆ دەرئەچوو.

## ٤- شێخ مستەفا نەقیب

وەکو زیوەر له گەنجینەی مەردانا باسی کردوه، شێخ مستەفا پیاوێکی زۆر کاسب بوه و حەزی له کشتوکاڵ کردوه و پیاوێکی زۆر دەس‌بڵاو و بە تەبیعەت بوه. شەوانی رەمەزان زۆر کەسی بەسەر ئەکردەوه و ئەڵێن هەر (۳۰) شەوەی رەمەزان هەر شەوه تاقمێکی له خەڵکی شاری سلێمانی بانگ کردوه (له زەمانی لاوێتی ئێمەشدا باسی ئیبراهیم ئاغای خۆبیلەی کاکەییان ئەکرد دەربارەی دەس‌بڵاوی و ئەیان وت بە تایبەتی شەوانی هاوین له سەربان لەبەر مانگەشەو هەرچی میوەی ئەو رۆژانه هەبوه کریوێتی و بۆ میوانی داناوه).

جارێک تەوفیق وەهبی بۆی گێرامەوه وتی: شێخ مستەفا بۆ چاولێکەری و بەربەرەکانی قەیسەری وەسمان پاشا ئەویش قەیسەریەکی لەناو بازاردا دروست کرد که نزیکی مالی ئەمینی عەتا بووه، لەکاتی دروستکردنی ئەو قەیسەرییەدا چاوی بە بەهیەخانی کچی ئەمینی عەتار ئەکەوێ و مارەی ئەکا. بەڵام شێخ مستەفا مندالی نەبوو له دوای مردنی شێخ مستەفا له حجاز، شێخ مەحمود

بەهیەخانی مارە کردەوە.

زیوەر لە گەنجینەی مەردانا ئەلێ: «وەختی خۆی حاجی تەوفیق (پیرەمێرد) بەرلەوەی کە بروا بۆ تورکیا باشکاتبی مەحکەمە بوە لە سلێمانی، بەلاْم شێخ مستەفا داوای لێکرد کە واز لەو کارەی بهێنێت و بردیە لای خۆی و کردی بە سکرتێری خۆی و هەمان مووچەی دایە کە لە میری وەری ئەگرت و کە شێخ مستەفا چوە تورکیا و لەوێوە چوە بۆ حەج و لە (مەکە) مردوە پیرەمێردیش لەگەلا بوە، بەلاْم دوای مردنی شێخ مستەفا ئیتر پیرەمێرد نەگەراوەتەوە بەلکو لە ئەستەمبول مایەوە هەتا لە ماوەی شۆرشی شێخ مەحموددا گەرایەوە بۆ سلێمانی».

شێخ مستەفا جگە لە بەهیەخانی کچی ئەمینی عەتار، بەهیەخان ناوێکی تریشی مارەکردوە کە خوشکی سەعید بەگی قواس بوە (کە زیوەر و هەندێکی تر لەسەرسروشتی فارسەکان وتویانە غواص) بۆ ئەوەی پێوەندی بنەماڵەی شێخان لەگەڵ ئەو بنەماڵەیەدا بەهێز بکات..... بەلاْم سەیر ئەوەیە ئەو تەقەلایە بێ‌سوود بوە چونکە وەکو لە کارەساتەکەی موسڵدا باسی ئەکەین، هەندی لە بنەماڵەی قواس درێغیان کردوە لە رزگارکردنی شێخ سەعید و هەڤالەکانیدا لە موسل لەگەڵ ئەوەشدا کە دەس‌رۆیوو کاربەدەست بوون لە موسل. لەوەش سەیرتر ئەوەیە بەر لەوە تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی کە لەو بنەماڵەیە لەو چوونەی شێخ سەعید کە سوڵتان دەعوەتی کردبو و ئەویش بەشدار بوە لەگەڵ شێخ سەعیدا چوە بۆ ئەستەمبول کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی موسڵدا یەک ناگرێتەوە.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا «٢١» باسی شێخ مستەفای کردوە کە چۆن لەلایەن شێخ سەعیدی حەفیدەوە کراوە بە سەرکردەی ئەو لەشکرەی لەگەڵ تاڵەبانیەکاندا شەری کردوە (لە پێوەندی شێخان و تاڵەبانیەکاندا بە دوور و درێژی باسی ئەو شەرە ئەکەین).

# ٥- شێخ سەعیدی حەفید

## آ- ژیانی شێخ سەعید

لە دوای کاک ئەحمەدی شێخ، لەناو بنەماڵەی شێخاندا شێخ سەعید لە هەموویان زۆرتر ناوبانگی دەرکردوە و شوێنی باپیری گرتۆتەوە و تارادەیەک ئەوبوە کە دەستی گرتوە بەسەر ئەو زەوی و زارانەی لەلایەن عوسمانلی‌یەکانەوە بە ناوی خەڵات و بەراتەوە درابون بە شێخ مارفی نۆدێ و کاک ئەحمەدی شێخ (کە جاران بەو خەڵات و موچانەی کە بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراوە وتراوە: طعامی أطعامی) جگە لەو زەوی و زارانەی تر کە لە ماوەی ژیانیا پێکیەوە نابوو.

مێجرسۆن لەم روەوە ئەڵێ «٣٩»: (لە ساڵی ١٨٧٦دا سوڵتان عەبدولعەزیز سوڵتانی عوسمانلی بوو، شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود کە سەرۆکی تاقمی بنەماڵەی شێخان بوو لە زەمانی ئەو سوڵتان عەبدولعەزیزەدا شێخ سەعید گەلێک مولکی دەسگیربووە).

ئەو رۆژانەی کە شێخ سەعید پێ‌گەیشتوە و هاتۆتە ناوەوە و برەوی پەیدا کردوە لەناو خەڵکدا ئەو رۆژانە بوە کە عوسمانلی‌یەکان لاواز بوبون، بۆیە هەولیان ئەدا چەند کەسێکی دەس‌رۆیوو بە توانا بکەن بەلایەنگیری خۆیان کە شێخ سەعیدی حەفید یەکێک بوە لە وانەی عوسمانلی‌یەکان بایەخیان پێ‌داوە و پێوەندی‌یان لەگەڵدا کردوە. ئەو رۆژانەی شێخ سەعید، جگە لە لاوازبوونی دەسەلاتی سیاسی عوسمانلی، باری ئابووریشیان ئاڵۆز بوە و نەیان توانیوە بە باشی وارداتی مولکە ئەمیریەکان کۆبکەنەوە و کاربەدەستانی خۆشیان لە کۆکردنەوەی باج و مولکانەدا سەر راست نەبوون و بەراست و چەپدا بۆخۆیان بردوە و بۆیە عوسمانلی‌یەکان ناچار بوون بەشێکی زۆر لە زەوی و زارەکانی ئەمیری بدەن بەکرێ (لزمە) و یاخود بە مەزاد فرۆشتویانە وەکو لە شوێنی تریشدا باسمان کرد و لەو دەرفەتەدا شێخ سەعید و براکانی مولکێکی زۆریان بەکرێ گرتوە یا کریویانە یا دەستیان بەسەردا گرتوە و بەو جۆرە بوون بە

فیودالی خاوەن زەوی و زار و مولک.

شێخ سەعید جگە لەو بەشداربوونەی لە غەزای (قارص و بایزیدا)، وە بێجگە لەو ڕووداو و نارێکیانەی کە لە نێوانی شێخان و عەشایری دەورودراوسێ و بنەماڵەکانی سلێمانیدا بەشداری کردوە کە لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین، جگە لەوەش لە ژیانیدا دوو ڕووداوی تر هاتۆتە پێشەوە.

یەکەم: دووجار چوونی شێخ سەعید بۆ ئەستەمبول یەکێکیان بە داواکردنی بوە لە دوای شەری تالەبانی و شێخان (کە لە پێوەندی شێخان و تالەبانیەکاندا باسی ئەکەین) و جاری دوهەم شێخ سەعید خۆی و ژمارەیەک لە هاورێ و دۆست و دەست و پێوەندی بە شێوەیەکی رەسمی دەعوەت کراون بۆ ئەستەمبول کە بەو چوونەی شێخ پلەی بەرز بوە وەلای کاربەدەستانی عوسمانلی و لەبەرچاوی خەڵکیش.

دوهەم- ئاوارەکردنی بۆ موسل و شەهیدبوونی خۆی و تاقمێک لە کارەساتەکەی موسلدا وەکو بە دووروودرێژی باسی ئەکەین.

## یەکەم: چوونی شێخ سەعید بۆ ئەستەمبول

### ١- جاری یەکەم:

شێخ لەو چوونەی یەکەم جاردا وادیارە عوسمانلی‌یەکان لەسەر گلەیی تالەیانیەکان و گەلەیی هەندێ ناوچەی تر بەرامبەر بەسەرگەرمی شێخ سەعید بۆ بنەبڕکردنی ئەو گلەیی و شکاتانە، شێخ سەعیدیان بانگ کردوە بۆ ئەستەمبول کە سەرچاوەکان زۆرکەم دەربارەی ئەو چوونەی یەکەم جاریان نوسیوە. لە باسی پێوەندی شێخان و تالەبانیەکان باسی ئەکەین.

### ٢- جاری دوهەم:

دەربارەی چوونی دوهەمی شێخ سەعید بۆ ئەستەمبول زۆر نووسەر لە کتێب و یاداشتەکانیاندا بە کورتی یا دووروودرێژی باسیان کردوە.

لەوانەی کە باسیان کردوە شێخ مەحمودی کوری بوە کە لەو گفتوگۆیەی حیزبوز «٢٨» لە بەغدا لە گەلیدا کردوە باسی کردوە، هەروەها زیوەر لە گەنجینەی مەرداندا کە خۆی بەشداری کردوە لەو چوونەیدا بە دووردرێژی باسی کردوە، جگە لەوانیش مامۆستا رەفیق حیلمی و شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیاندا باسیان کردوە. پیرەمێردی شاعیریش جاروبار باسی ئەو چوونەی ئەکرد. غەفور میرزا کەریم لە گۆڤاری (بەیان) ژمارە (١٣١)ی ساڵی ١٩٨٧دا باسی ئەو چوونەی شێخ سەعیدی کردوە کە ئەمانەی خوارەوە تیایا بەشداربون:

١- شێخ سەعیدی حەفید
٢- شێخ عومەری برای شێخ سەعید
٣- شێخ مستەفا نەقیب
٤- تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی
٥- رەشید پاشا
٦- عەبدولرەحمان بەگی محەمەد بەگی خالید بەگ
٧- شێخ ئەحمەدی شێخ سەلام
٨- حاجی مەلا عەلی کانی کەوە
٩- شێخ مەحمود
١٠- پیرەمێردی شاعیر
١١- زیوەر

زیوەر لە گەنجینەی مەرداندا لەو رووەوە ئەڵێ:«١٣»

(ئەوانەی لەو چوونەدا بەشداری‌یان کردبو بریتی بون لە ئەشراف و موعتەبەر و عولەما، منیش بە هۆی شێخ مەحمودەوە کە ئیلتفاتی لەگەڵ مندا هەبوو بەشداریم کرد، هەموو پارەی رێگا لەسەر حکومەت بوو، کە گەیشتینە موسڵ تەشریفی شێخ سەعید بە تەنها لای والی دیاربەکر بوو. ئەوانی تر هەمووی لای نەقیبی دیاربەکر میوان بون. کە لە موسڵەوە بەرەو ئەستەمبول رۆیشتین خەڵک لە رێگا و لە ناو شارەکاندا ریزیان لێ ئەگرتین).

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا دەربارەی ئەو چوونە ئەڵێ:«٢١»

(کە باپیرم ئەو جارە چوە ئەستەمبول خەڵکێکی زۆر بو دوعاخوازی هەتا

ماوەیەک لەگەلیدا رۆیشتن، بەلاّم هەندێک لەوانەی کە بە رێگای کۆیسنجەقدا گەرانەوە بۆ سلێمانی، بە راسپاردەی حماغای کۆیە لەناو مزگەوتەکەی کۆیەدا ئابلۆقەدران بەلاّم عەشایری شوان و شێخ بزەینی فریایان کەوتن و رزگاریان کردن. هۆی ئەو نارێکیەش ئەوە بوە کە ساتێک سەید ئەحمەدی بابا رەسول کە لە بنەماڵەی شێخان بوە لە زەمانی عوسمانلی‌دا کرابوو بە قائمقامی کۆیە، حماغا ئەوەی پێ‌ناخۆش بوە و گرتبوەیە دڵی (سەیر ئەوەیە ئەو ناکۆکی‌یە جارێکی تریش لە کاتێکی زۆر ناسکدا لە نێوانی حماغای کۆیە و شێخ مەحموددا روویدا کە لە باسی حوکمدارێتی شێخ مەحمودا باسی ئەکەین کە چۆن کۆییەکان بە هاندانی ئینگلیز ئەو قائمقامەی کە شێخ مەحمود لە کاتی حوکمداریەتیەکەیدا بۆ کۆیەی ناردبوو کۆییەکان دژی وەستان).

زیوەر دەربارەی تەواوکردنی باسی چوونی ئەو تاقمە بۆ ئەستەمبول ئەلێ:«۱۳»

که گەیشتینە ئەستەمبوڵ شێخ سەعید و براکانی وەئەشرافەکان لە ماڵی سەید ئیبراهیم ئەفەندی وەکیلی (فراشەت) میوان بون کە فراشەت لە زەمانی عوسمانلی‌دا بەو کەسە وتراوە کە لێ‌پرسراو و سەرپەرشتێکەری جێگا پیرۆزەکان (عتبات مقدسه) بون وەکو مەکە و مەدینە و شوێنەکانی تر و سوڵتان لەبەر پیرۆزی و گرنگی ئەو ئەرکە گەورەیە خۆی بە فراشی گەورە ناوبراوە، ئەوانەی شارەکانیش وەکیلی فراش بوون. ئەو خەڵکەی تر هەمووی نێررانە موسافیرخانەی (نیشان داش).

لە یاداشتەکانی مامۆستا زیوەردا دووشتمان بۆ روون ئەبێتەوە:

١- زیوەر ئەلێ شێخ سەعید و ئەشرافەکان لە ماڵی وەکیلی فراشەت دابەزیبون کەچی لەو گفتوگۆیەی حزبوز لەگەڵ شێخ مەحموددا وتراوە کە لە کۆشکی (یلدز) میوانداری کراون کە مامۆستا رۆژبەیانیش لە باسەکەیدا«۲۷» هەر ئەوەی خستۆتە بەرچاو.

٢- زیوەر لە یاداشتەکانیدا ئەلێ: کە لە ئەستەمبول بوین کوێرێکی حافظ القرآن هاتە خزمەت شێخ سەعید و تەوقەی لەگەڵدا کرد، تومەز ئەو کوێرە (مەلا عوسمانی موسلی) بو. (مەلا عوسمانی موسلی یەکێکە لەو دەنگ خۆشە بەناوبانگانەی کە بە عەرەبی گۆرانی وتوە و بایەخی بە مقامات داوە).

مەلا عوسمان تورکی زۆرباش ئەزانی و نەختێکیش کوردی زانیوە... وەکو زیوەر ئەلێ لەو بینینەی شێخ سەعید و مەلا عوسمان ئەو شیعرەی بۆ شێخ سەعید وتوە:

لبني الخضراء قد وافى الهنا　　وسليمانية الفضل المزيد
حين باليُمن أتى أسعدهم　　دار سعد قصرها العالي المشيد
بيت ابراهيم اذ انحل به　　وكلا الفردين من بيت مجيد
صار محبوب القلوب اذ غدا　　فرع طه المصطفى الهادى الرشيد
كيف لا وهو ابن (كاكا احمد)　　«بهناء قدم الشيخ سعيد»

لە دێری سێهەمی ئەو شیعرەی مەلاعوسماندا دوبارە دەرئەکەوێ کە شێخ سەعید لە مالی ئیبراهیم ئەفەندی دابەزیوە کە زیوەر بە (وکیلی فراشه) ناوی هێناوە. جگە لەوە لەنیوە دێری دوابەیتی شیعرەکەدا دەرئەکەوێ بە حیسابی ئەبجەد ئەو نیوە دیرە ئەکاتە (١٣١٩هـ = ١٩٠١-١٩٠٢م) کە ئەوە سالی چوونی شێخ سەعید بوە بۆ ئەستەمبول.

زیوەر لە یاداشتەکانیدا ئەلێ: (لەو چوونەماندا ماوەی سێ مانگ لە ئەستەمبول ماینەوە، دوای ئەوە شێخ سەعید ئارەزوی زیارەتی کەعبەی کرد، بەلام شێخ عومەری برای شێخ سەعید و شێخ مەحمود گەرانەوە بۆ سلێمانی و منیش لە خزمەت شێخ مەحمودا گەرامەوە بۆ سلێمانی. ئەو سێ مانگەی کە لە ئەستەمبول ماینەوە، شێخ سەعید هەر خەریکی بەجێهێنانی ئیش و کاری موسولمانان بوو).

کەچی لەو گفتوگۆیەی حیزبوزو«٢٨» ئەو یاداشتەی شێخ قادری برای شێخ مەحمود«٢٧» واباسکراوە کە شێخ مەحمود وتویەتی سالێک و دوومانگ ماینەوە...... بەلای منەوە ئەو سێ مانگە کە زیوەر باسی کردوە بریتی بوە لە ماوەی مانەوەی شێخ مەحمود (کە زیوەریش لەگەلدا بوە). بەلام ئەوانی تر وەکو شێخ سەعید و تاقمەکەی تر بەو چوونەی کەعبە هەتا گەرانەوە سالێک و دوومانگی پێچووبێت.

مامۆستا رەفیق حیلمی لە بەرگی یەکەمی یاداشتەکانیدا دەربارەی ئەو چوونەی شێخ سەعید بۆ ئەستەمبول ئەڵێ:

(سوڵتان عەبدولحەمید هەروەکو لە دوورەوە ناوبانگی کاک ئەحمەدی بیستبوو و خۆشەویست بوولەلایەوە کە ئەو بنەماڵەیە لە خۆی نزیک بکاتەوە و پێش گەرانەوەی شێخ سەعید هەر یەکێک لەو دەستە و داریەرەیەی کە لەگەڵی‌دا بوون لەلایەن سولتانەوە مووچە یا بەراتی دەست کەوت، بێجگە لەوەش سوڵتان شفرەی موخابەراتی نهێنی خۆی‌دا بە شێخ سەعید کە لە کاتی پێویست و تەنگانەدا بەپێی ئەو شفرەیە بە تەلگراف سوڵتان ئاگادار بکات کە ئەمە گەورەترین نەوازشێک بوە کە سولتان لەگەڵ رەعیەتی خۆیدا بیکات).

لەگۆڤاری بەیان ژمارە (١٣١) ساڵی ١٩٨٧دا غفوری میرزا کریم ئەڵێ:

(بەر لەوەی شێخ سەعید و شێخ مستەفا لەگەڵ هاورێکانی تریدا بچنە مەکە و مەدینە بۆ حەج کردن، شێخ مستەفا ئەم چوونەی بە دڵنابێت بۆ حەج وەداوا لە شێخ سەعیدی برای ئەکا کە لە چوونی ئەو سەفەرەی بۆ مەکە و مەدینە بی‌بەخشێت، گوایا شێخ مستەفا وتبوی: کاک ئەحمەدی باپیرم فەرمویەتی: رۆڵە مستەفا...... یاخوا بچیت بۆ حەج و شوێنی (معلیٰ)ت بە نسیب بێت لەبەر ئەوە لام وایە ئەگەر من بچم بۆ حەج مەعنای ئەوەیە ناگەرێمەوە و دوعاکەی باپیرم لیٚ‌گیرا ئەبیٚ... بەلاٌم شێخ سەعید و هاورێکانی زۆر لە شێخ مستەفا ئەکەن کە لەگەڵیان بچێت و لەویٚ نەخۆش ئەکەویٚ و لە (مەکە) کۆچی دوایی ئەکات و لەویٚ ئەنێژریٚ. ئەڵێن لە دوای مردنی شێخ مستەفا کە جل و بەرگەکانی دائەکەنن، کلاٌوەکەی نوشتەیەکی پێوە ئەبێت کە ساتێک ئەو نوشتەیە ئەکەنەوە بە فارسی لیٚ‌ی نووسراوە:

(وقف مستەفا فرزندم کەانشاء الله بر حج میرود و درْ مُعلاٌمی مانند).

ئەوانەی لەگەڵیا بون لەو حەجەدا شاهێد و ئاگاداری ئەوەبون و لەوانەی متمانە بە قسەکانیان ئەکرێت و باسیان کردبوو: شێخ مستەفا عەبدولسەمەد قازی و سەید ئەحمەدی خانەقا و شێخ عارفی سەرگەلوو، حاجی حمە ئاغای مەحمود ئاغا و شێخ عومەری برای شێخ سەعید و پیرەمێردی شاعیر ئەمانە هەموو ئەوەیان تأییدکردوە (لام وایە شێخ عومەر لە دواییدا ئەمەی بیستبێتەوە لە

وانەی کە لە مەکە بون و گەراونەتەوە، کە چونەتەوە سلێمانی لەوێ ئەو نوشتەیەیان دیبێ چونکە شێخ عومەری برای شێخ سەعید نەچوە حەج و لە ئەستەمبولەوە گراوەتەوە بۆ سلێمانی وەکو زیوەر لە یاداشتەکەیدا باسی کردوە، وەهەندێکی تریش لەوانە سەرچاوەکان باسیان نەکردوە کە لەگەڵ شێخ سەعید و شێخ مستەفادا چوبن بۆ حەج دوورنیە ئەوانیش لە دواییدا ئەوەیان بیستبێتەوە یاخۆیان هەر لە سلێمانی‌یەوە یەکسەر و بەجیا چون بۆ حەج و لەوێ یەکتریان دیوە- وەکو سەید ئەحمەدی خانەقا).

مردنی شێخ مستەفای نەقیب کارێکی زۆری کردۆتە سەر شێخ سەعیدی برای و شیعرێکی بۆ وتوە و زۆرکەس ئەو هۆنراوەیەی شێخ سەعید کە بۆ شێخ مستەفای برای وتوە بوە بەویردی سەردەمیان لەو رۆژانەدا و لەدوای شەهیدبونی شێخ سەعید لە موسل جارێکی تر ئەو شیعرەی شێخ سەعید تازە بۆتەوە (ئەو شیعرەی شێخ سەعید لە کەشکۆڵە دەستخەتەکەی مەحمود پاشای جافدانووسرابوەوە و کە ماوەیەک لای پیرەمێرد بوە و لە دواییدا بە هۆی مستەفا صابئی خوشکەزایەوە درایەوە بە حسن بەگی عەلی بەگی مەحمود پاشای جاف. حەسەن بەگی جاف جارێک بە بەغدا لە مالی خۆیان ئەو کەشکۆڵەی پیشاندام کەمن و مامۆستا عەلائەدین چوینەلای) بەلای منەوە ئەو شیعرەی شێخ سەعید لەو کەشکۆڵەدا بە دەسخەتی مەحمود پاشا نەنوسراوەتەوە بەلکو لەو ماوەیەدا کەلای بیرەمێرد بوە و بەرلەوەی بدرێتەوە بە حەسەن بەگی جاف نوسراوەتەوە.جگە لەوە حەپسە خانی نەقیب لە دەستخەتێکی تایبەتیدا لای هەبوو (ئەو شیعرە وەکو لێرەدا بلاوی ئەکەینەوە لە هەمان گۆڤاری- بەیاندا- بلاوکراوەتەوە کە باسمان کرد.

مردنە بیٚ‌تۆ ژیانم، زیللە بیٚ‌تۆ عیزەتم
دەردە خۆراکم بەبیٚ تۆ، ژەهری مارە شەربەتم
تۆش وەکو من قوڕ ئەپێوی گەر بزانی عیللەتم
وێلی سەحراکەی نەهاتی غوربەتی پر میحنەتم
ئیرسی مەجنونە خەلاتم، لەیلەکەم وون کردوە
چیم لە جاهو حیشمەت و ئیقباڵە، بۆ چیمە حەشەم

وەک جەهەنەم وایە جەنەت، (وەیل)ە گولزاری ئیرەم
قەت نیە و نابێ فەرەح بێ، دڵ هەتا رۆژی عەدەم
دڵ لە ناری فیرقەتا وەک غونچە تەنگ و پڕ لە غەم
کوا نەسیمی وەصلەکەم خۆی بۆ حەشر هەڵگرتوە؟

غەم دەوامی زۆرە، زوو ئەڕوا لە دڵ سەیر و صەفا
عومری(عەمرە)م کورت، بوو، بێ مروەت بوو بۆم مەروە و صەفا
ئولفەتم گرتوە لەگەڵ دەرد، قەت نیە چارە و شیفا
بەرد ئەبارێنێ بەسەرما چەرخی بێ رەحم و وەفا
نەونیهالی ئەحمەدی و سەروی قەدی موصطەفا
زوو بە سەرچوو، چی‌بکەم حوکمی قەدەر وای کردوە!

سەیر ئەوەیە ئەو بێنج خشتیەکیەی دوایی بوە بەشەش و لە پێنج خشتەکی دەرچوە...... ئایا ئەوانەی پێشوش هەر شەش بوون و لێیان لادراوە یا ئەمەی دوایی خراوەتە سەری یا هەرخۆی لە خۆیدا وابوە؟

## ب- کارەساتەکەی موسل

### ١- چۆنێتی ئاوارەبوونی شێخ سەعید و هەوالەکانی بۆ موسل

دەربارەی ئاوارەکردن و بە زۆرناردنی شێخ سەعید و خزمەکانی بۆ موسل گەلێک سەرچاوە باسیان کردوە و هەریەکەی بە جۆرێک بۆیچوون.

مامۆستا رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا- ژمارە یەک«٢» ئەلێ:

(کە شێخ سەعید چوبۆ ئەستەمبوڵ و خەلیفەی عوسمانلی ئەو هەموو ریزەی لە خۆی و هاورێکانی گرت، کە گەرایەوە بۆ سلێمانی چ متەسەرفی سلێمانی و چ ئەو سەرکردانەی لەشکری عوسمانلی کە لە سلێمانیدا بوون لە قین و غەزەبی شێخ سەعید زۆر ئەترسان. بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن خۆیان خستە ژێر دەسەلاتی شێخ سەعید و هەتاکو کار گەیشتە رادەیەک هەندێ لەوانە بەبێ پرس و رای شێخ سەعید پەنجەیان نەدەکرد بە ئاوا..... لێرەدا تاقمی مأمورە بچووکەکان بۆ قازانجی خۆیان و بۆ مەرامی خۆیان ئەبوون بە بازیچەیەکی شێخان و بەشی رەشۆکی خەڵک بۆ مەرام و قازانجی خۆیان بەبێ مووچە و بەرات ئەچوونە ریزی نۆکەران و خزمەتکارانەوە. بەڵام توجار و ئاغاکان دوژمنی ئەم خانەوادەیە بوون و لەژێرەوە شیروتیریان لێ ئەسوون. بەڵام ساتێک ئیتحاد و تەرەقی لە ساڵی ١٩٠٨دا دامەزرا، لە سلێمانیش لە ناحەزانی خانەوادەی شێخ سەعید لقی ئیتحاد و تەرەقی دامەزرا، واتە لە توجارەکان و هەندێ لەو ئەفسەررانەی کە تازە لە مەکتەبی حەربیە دەرچووبون و مەیلی ئازادی و بەربەرەکانی خاوەن نفوذەکانیان ئەکرد، ئەو لقی ئیتحاد و تەرەقی‌یە پێک هاتبوو، لەبەر ئەوە ئەوانە لەگەڵ شێخاندا کەوتنە دوژمنایەتی و دەستیان کرد بە هاندانی حکومەتی عوسمانلی و کاربەدەستانیان لە ئاستی شێخان. زۆری پێ‌نەچوو کە بەکەین و بەینی لقی ئیتحاد و تەرەقی و ئەو کاربەدەستانەی لەو کۆمەڵە دابوون بیانویان بۆ شێخان دۆزی‌یەوە و شێخ سەعیدی حەفید و کەس و کار و دەستەودایەرەی لەگەڵ شێخ مەحموددا لەژێر چاودێری هێزی حکومەتدا نێرران بۆ موسل).

شێخ مەحمود دەربارەی ئەو ئاوارەبونە لە گفتوگۆکەی لەگەڵ حیزبوزدا

وتویەتی:«٢٨»

(لە ساڵی ١٣٢٤هـ = ١٩٠٦-١٩٠٧م، لەگەڵ باوکم بە نەفیکراوی نێررایین بۆ موسل کە ئەمەش بە هۆی ئەوە وەبوە کە (٣٠٠٠) لیرەی حەمیدییە وەکو بەرتیل درابو بە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە- شێخ مەحمود لە گفتوگۆیەکەیدا ئەلێ: نامەوێ لەم شەوە مویارەکەی رەمەزاندا ناوی کەس بێنم، ئەوە بو کارەساتەکەی موسل روویدا).

بێگومان ئەوەی لەو گفتوگۆیەدا دەس‌نیشان کراوە کە گوایە شێخ مەحمود وتویەتی ئەو کارەساتە لە ساڵی ١٩٠٦-١٩٠٧م دا روویداوە لەگەڵ مێژووی راستی رووداوەکەدا یەک ناگرێتەوە وەکو لە سەرچاوەکانی تردا باسی ئەکەین کە ئەو کارەساتە لە دوای ئیعلانی (مەشروتیەت) روویداوە کە لەلایەن (ئیتحادی‌یەکانەوە لە ساڵی ١٩٠٩ دابوە.

شێخ مەحمود کە نەیویستوە لەو گفتوگۆیەدا ناوی کەس بهێنێت کە مەبەستی بوە، هەندێ سەرچاوەی تر باسی ئەو کەسە ئەکەن کە مەحمود پاشای جاف بوە وەکو شێخ رەئوفی کوری لە یاداشتەکانیدا بە ئاشکرا ناوی مەحمود پاشای هێناوە وەکو سەرۆکی لقی ئیتحاد و تەرەقی لە سلێمانیدا کە بە هۆی کۆنە قینی بنەماڵەی جاف لەگەڵ شێخاندا و بە هاوکاری بازرگانەکانی سلێمانی پیلانی ئەو ئاوارەکردنەی شێخ سەعید و هاورێکانی سازکراوە، و هەندێکی تر باسی تەوفیق بەگ و عەلی سەعید بەگ ئەکەن لە بنەماڵەی قواس کە لە کارەساتەکەدا لە موسل بوون.(لە راستیدا عەلی سەعید بەگ تورک بوە و پێوەندی بە بنەماڵەی قواسەوە نەبوە).

زیوەر لە گەنجینەی مەرداندا لەو روەوە ئەلێ:«١٣»

( کە شێخ سەعید لە ئەستەمبوڵ گەرایەوە، دۆستان و خزمان و دەوروبەری هەلپەرست هەوای لە خۆ بایی بوونیان چوە کەللەوە و کەوتنە لاف و گەزاف لێدان بەسەر خەڵکی‌تردا و گوێ‌یان نەئەدایە دەسەلاتدارانی حکومەتی عوسمانلی لەناو شاردا. دوژمنانی بنەماڵەی شێخانیش ئەمەیان بە هەل زانیوە و خۆیان داوەتە پاڵ حکومەت و کەوتنە چاوورِاو و پروپاگاندە دژی شێخان و کۆمەڵی ئیتحاد و تەرقی کەوتنەکنەکردن).

بەلاّم شێخ قادری برای شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا «٢٧» وەکو مامۆستا ڕۆژبەیانی باسی کردوە ئەڵێ:

(لە نێوانی بازرگانە گەورەکانی سلێمانی و ئاغا و بەگلەران لەگەڵ شێخاندا رقە بەرایەتی هەبوە، کاربەدەستانی ناوچەی سلێمانیش حەزیان لە شێخان نەدەکرد و شێخ سەعیدیان بە شێخی سوڵتان عەبدولحەمید دەناسی (بە تایبەتی کە زانیبویان سوڵتان شفرەی نهێنی خۆی دابو بە شێخ سەعید). ئیتحاد و تەرەقی داوایان لە شێخ سەعید کردبوو کە خۆی یا یەکێک لە کورەکانی سەرۆکایەتی دیوی دەرەوەی لقی ئیتحاد لە سلێمانی بگرێتە ئەستۆ، بەلاّم شێخ سەعید ئەمەی بە خیانەت داناوە، ئەمانە هەمووی بوە بە هۆی ئەوەی کە دوژمنانی شێخ سەعید و دەستەی پاشای جاف (نیازی لە مەحمود پاشای جاف بوە) وەهەندێک لە بازرگانەکان و ئاغا و بەگلەران لەگەڵ متەسەرفی سلێمانیدا کەوتنە پیلان گێران و بە هۆی دەست و پێوەندکانیانەوە بۆ نانەوەی ئاژاوە کەوتنە تەق و تۆق کردن لە ناوشاردا بۆ بەدناوکردنی شێخان، لەلایەکی تروە میرزا غەفوری پیاوی شێخ سەعیدیان لە خشتە بردبوو (کە مۆرهەڵگری نهێنی شێخ سەعید بوە)، مۆرەکەی شێخانیان لەو میرزا غەفورە وەرگرتوە و تەلگرافێکیان بە ساختە بە ناوی شێخ سەعیدەوە ناردوە بۆ موسل بۆ والی عوسمانلی کە فریای بکەوێ و لە مەترسی ئاژاوە رزگاری بکات و دەستوور بدات بە زۆرترین کات لە سلێمانیەوە بیگوێزنەوە بۆ موسل کە بتوانێت لەوێ نیشتەجێ بێت و بە ئاسایش بژی. بەلاّم هیچ کەس لە شێخان و دۆستەکانیان ئاگاداری ئەم کەین و بەینە نابن، والی موسل کە خۆی ئەندامی کۆمەلی ئیتحاد و تەرەقی بوە باش ئاگاداری رێکخستنی ئەم پیلانە بوە و دەسبەجێ دەستوور ئەدا لە سلێمانی بە سەرکردەی ئیسترسوار کە ئیبراهیم ئەدهەم بوە (بە قامچی رەش ناسراوە) بچێت شێخ سەعید بیات بۆ موسل کە ئیبراهیم ئەدهەم ئەچێتە لای شێخ سەعید و تەلگرافەکەی موسلی پیشان ئەدا شێخ سەعید سەری‌سڕ ئەمینێت و سەرلەم کەین و بەینە دەرناکا و بەبێ ئەوەی سەرپێچی بکات ئەم خزمەمانەی لەگەڵ خۆیدا ئەبا بۆ موسل: شێخ مارفی نەقیبی برای، سەید ئەحمەدی بابا رسول، شێخ سالحی موفتی، هەر سێ کورەکەی خۆی (شێخ

ئەحمەد و شێخ مەحمود و شێخ قادر) وەچەند کەسێکی تر لە پیاوماقولان و دەست و پێوەندی خۆیان و ڕۆژی پێنجی مانگی مارت لە سلێمانی دەرئەچن و شەو لە تەینالْ ئەبن و لەوێوە بەسێ ڕۆژ ئەگەنە موسل و ئەچنە لای والی و پێشوازی‌یەکی گەرمیان لێ‌ئەکرێ و لەسەر حسابی خۆیان خانوویەکی گەورەی نزیکی سەرای موسل بۆ بەکرێ ئەگرن و ماوەی (٤٠) ڕۆژ لەو خانوەدا بەسەر ئەبەن).

بەلاّم عەبدولمونعم ئەلغولامی (کە خۆی لەو ڕۆژی کارەساتەکەدا لە موسل بوە) لە کتێبەکەیدا ئەلێ: «٣٤»

(شێخ سەعیدی بەرزنجی دەسەلاّتێکی زۆری هەبوە و ناوبانگی نەک هەر لە ناوچەی سلێمانی‌دا بەلکو لە ناوچەی کەرکوکیشدا بلاّو ببوەوە و سولْتان عەبدولحەمید شێخ سەعیدی لە خۆی نزیک کردەوە بەرلەوێش لەگەلْ کاک ئەحمەدیشدا هەر وابو. هەر کەسێکیش ناوبانگی بلاّوببوایەوە ئیتر خەلْکی وا پەیدا ئەبو کە حەسوودی پێ‌ببەن و بەربەرەکانی بکەن بۆ ئەوەی بی‌شکێنن.

باشترین هەلْ بۆ شکاندنی شێخ سەعید ئەوەبوو کە ساتێک لە سالْی ١٩٠٨دا ئیعلانی دەستور (مەشروتیە) کرا، ئەوانەی کە ناحەزی شێخ سەعید بون لە سلێمانی‌دا مەزبەتەیان دژی شێخ سەعید کردەوە و ئیمزای خەلْکیان کۆکردەوە و ناردیان بۆ ئەستەمبولْ و بۆلای والی موسل.

بابی عالی (سولْتان) لەو ڕۆژانەدا زۆر کز و بێ‌دەسەلاّت بوو بەرامبەر بە ئیتحادیەکان و سەری‌سڕمابوو نەی‌ئەزانی چی بکات و ناچار کرا فەرمان دەربچێت شێخ سەعید شاری سلێمانی بەجێ‌بێلێت و بچێتە موسل دابنیشێت. شێخ سەعید بۆ ئەوەی گێچەلْ پەیدا نەبێت چوە موسل کە ئەیتوانی نەچێت و ئەنجامەکەشی نەدەزانرا بەچی ئەگەیشت. کە شێخ سەعید گەیشتە موسل لەگەلْ ئەو خزم و دەست و پێوەندەیدا کە هێنرابون بۆ موسل لە خانوی حاجی محەممەد پاشای سابونچی (کە لای کورد بە حەمە قەدۆ بەناوبانگ بوە) دانیشت کە کەوتبوە سەرجادەی سەرا بەرامبەر قوتابخانەی (ئیعدادی شەرقی و نزیک مالی خدر هەمەوەند کە لە هۆزی ڕەشاوەندی هەمەوەند بوە)، وەپیاوەکانی شێخیش لە خانێکی نزیکی ئەو مالْەدا نیشتەجێ بون کە ئەویش هەر هی حاجی

محەمەدی سابونچی بوو.

شێخ ڕەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا «٢١» دەربارەی هۆی ناردنی شێخ سەعید و تاقمەکەی بە جۆرێکی تر باسی کردوە و کە ئەو باسەی لە یاداشتێکی (عیزەت کاکەیی)ی باوکی قطب الدینی دوکتوری بەیتەرییەوە وەرگرتوە کە عیزەت کاکەیی کاتی خۆی سکرتێری شێخ سەعید بوە و ئەو یاداشتەی لە ساڵی ١٩١٠دا بە تورکی نوسیوە و عیزەت کاکەیی بەپێی یاداشتەکەی شێخ ڕەئوف ئەڵێ:

(دوای ئەوەی بنەماڵەی بەرزنجی ناوبانگیان دەرکرد، ئەوانەی کە رقیان لێیان بوو لە هەل و دەرفەت ئەگەڕان و ساتێک دەسەلاتی عەبدولحەمید کز بوو ئیتر ئیتحادییەکان هەولیان‌دا دەسەلات و توانای ئەو کەسانە کەم بکەنەوە کە سەر بە عەبدولحەمید بوون، بۆ ئەمە لە هەموو ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی‌دا لقی ئیتحاد و تەرەقی دانرا و لە ناوچەی سلێمانیشدا لقێک پێک هات و ئەندامەکانی دژی بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەیی بوون بە تایبەتی دژی شێخ سەعید. مەحمود پاشای جاف سەرکردەی ئەو لقەی سلێمانی بوو، دەستیان کرد بە ناردنی ئەخباریاتی پڕ لە درۆ و دەلەسە و بە مەزبەتەکردنەوە دژی شێخان و دۆست و دەست و پێوەندەکانیان. شێخ سەعید و کوڕەکانی و سەید ئەحمەدی بابا رسول و شێخ سالحی موفتی بانگ کران بۆ سەرا. لە سەرا هەموویان دەسبەسەرکران لەلایەن پۆلیس و سەربازی تورکەوە و بازرگانەکان چوونە پۆستەخانە و تەلگرافیان بۆ شکات دژی شێخان و نارەزایی لێدا. لە هەمان کاتدا دوکتور ضیاء و ئەفسەرێک (فەهمی) کە خەڵکی سلێمانی بوو لەگەڵ (تۆڵ ئاغاسی)دا چونە ناو بازار و بەناو خەڵکدا بلاویان کردەوە کەوا حکومەتی عوسمانی شێخانی گرتوە و ئێوەش پێویستە لەسەرتان هەمووتان هەڵسن و بچنە بەردەمی سەرا کە لەوێ فەرمانی شاهانە دەربارەی ئەوگرتنە ئەخوێنرێتەوە و هەرکەسێک دوکانەکەی دانەخات و نەچێت بە پیسترین جۆر سزا ئەدرێ. بەو جۆرە ناوشار خرۆشا و شێخانیان بە هێزی سوپا و بەزۆر نارد بۆ موسل و کاربەدەستان خەڵکیان هان ئەدا پەلاماری ماڵەکانیان بدەن و دەسدرێژی بکەنە سەر کەس و کاریان. لەو ڕۆژانەدا ڕۆژنامەی (ارشاد) لە موسل هەروەها

رۆژنامەی (بغداد) لە شاری بەغدا بە راسپاردەی ئیتحادی‌یەکان گەلێک درۆ و دەلەسەیان بلاْوکردەوە، رۆژنامەی بەغدا کە خاوەنەکەی (مراد سلێمان) بوو لە ژمارە (٢)ی مانگی مایسی ١٣٢٥ی رومیدا لە ژێر ناوی: (الحاله في كردستان وفاجعه السليمانيه) شتێکی بلاْوکردبوەوە کە بە گەلێک بوختان و درۆ و دەلەسە شێخ سەعیدی تاوانبار کردبوو و جنێوێکی زۆر پیسی بە شێخ سەعید دابوو).

عیزەت کاکەیی لە یاداشتەکانیدا لەسەری ئەروا و ئەلێ: (شێخانی بەرزنجە زۆر خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردوە و شێخ سەعید لە شەری (قارص و ئەردەهان)دا دژی روسی قەیسەری وەستاوە و لەشەری (١٨٧٧م)دا بەشداری کردوە و لە پاداشتی ئەوەدا سولْتان دووجار شێخ سەعیدی تەقدیر کردوە و دەعوەتی کردوە بۆ ئەستەمبولْ کە ساتێک مەشروتیەت (دەستور) بلاْوکرایە و شێخ سەعید لایەنگیری ئەو دەستورە بوو بەلاْم دژایەتی خۆشی پیشان نەدا بەرامبەر بە سولْتان عەبدولحەمید لەبەر ئەوە دوژمنەکانی ئەو هەلْوێستەیان والەقەلْەمدا کە هێشتا سەر بە سولْتانە و لە ئەنجامی ئەوەدا گەلێک درۆ و دەلەسە و پیاوکوشتن درایە پالْ شێخ سەعید و لایەنگیرەکانی و ئیتحادی‌یەکان بە ئاشکرا لەناو شاری سلێمانی‌دا ئیهانەی دەست و پێوەندی شێخانیان ئەکرد و لەو کاتەدا کە شێخان بران بۆ سەرا و دەسبەسەرکران، دەوری مالْەکانیان بە پۆلیس و جەندرمە گیرا بە بیانووی ئەوەی کە قەرزاری حکومەت بون و پارەی حکومەتیان لەسەر بوە و نەیان داوە. شێخ عەلی سەرکار کە نەخۆشی ناوجێگا بوو عەسکەرەکانی تورک بە زۆر لە مالْ بە کێشیان کردە دەرەوە و بۆ ئەتک بەناو شاردا گێرایان. لە دوای ئەوە بە (٣٥) رۆژ کارەساتە جەرگیرەکەی موسل روویدا.

خەلْکی کەرکوک و هەولێر کە ئەم کارەساتەیان بیست ویستیان تۆلْەی شێخ سەعید و هاورێکانی بکەنەوە، بەلاْم ئەو هەولْ و کۆششتەی شێخ مارفی نەقیب و سەید ئەحمەدی بابا رەسول دایان خەلْکی هێواش کردوە و چاوەروانی تەحقیقی حکومەتیان کرد.

## ٢- چۆنێتی روودانی کارەساتەکەی موسل:

دوای ئەوەی ئەو پیلانانەی لەلایەن ئیتحادی‌یەکانەوە سازکرابوو جێبەجێ‌کرا و شێخ سەعید و هاورێکانی دوورخرانەوە بۆ موسل، ئینجا قۆناغی دوهەمی ئەو پیلانە دەس‌پێ‌کرا کە نووسەران چ بێگانە و چ خۆمانە هەریەکە بە جۆرێک باسیان کردوە.

شێخ مەحمود خۆی یەکێک بوە لەوانەی کە ئەو پیلانە دژی سازکرابوو لەو گفتوگۆیەی حبزبوز «٢٨» لەگەلیدا کردوە زۆر بە کورتی باسی شەهید بوونی باوکی و هاورێکانی کردوە، بێگومان ئەو گفتوگۆیە لە ئەنجامی بینینێکی سەرپێ‌یی دابوە و شێخ مەحمود هیچ جۆرە یاداشت و نووسینێکی خۆی لە بەردەستدانەبوە کە بە وردی باسی ئەو کارەساتە بکات، هەروەها یاداشتەکەی شێخ قادری براشی کە مامۆستا رۆژبەیانی خۆی لە باسەکەیدا نابەدلی پیشان داوە بەرامبەر بە یاداشتەکەی و زۆر شتی بەدل نەبوە و نەی‌ویستوە بلاویان بکاتەوە (ئەوەی من ئاگادارم شێخ قادر یاداشتەکانی لە سالأنی دوایی ژیانیدا ئەنوسیەوە و لە بیرمە جاروبار یەکێکی وەکو قادر ئەفەندی شارباژێری دائەنا و هەندێ شت کە بەبیریا ئەهات پێ‌ی ئەنوسیەوە و وابزانم یەکێک لەو دوو یاداشتە دەس‌خەتەی کە رۆژبەیانی بۆ باسەکەی پەنای بردۆتە بەریان ئەوەیە کە بە دەسخەتی قادر شارباژێری نووسراوەتەوە).

شێخ قادر لە یاداشتەکانیدا ئەلێ:«٢٧»

(کە گەیشتینە موسل، عەلی سەعید بەگی ئەرکانی حەرب کە برای ژنەکەی متەسەرفی ئەو سەردەمە بوە لە سلێمانیدا و لە هەموو بیلانەکانی دژی شێخان بەشداری کردوە و ئاگای لەو هەموو کەین و بەینەبوە، ئەو عەلی سەعید بەگە لە موسل دەستی لێمان بەرنەدا و کەوتە هاندانی لقی ئیتحاد و تەرەقی لە موسل دژی شێخان و بە دزی‌یەوە شێخ ئەحمەدی (کوری شێخ سەعید و برای شێخ قادر)ی خولک کردوە بۆ مالی خۆی و داوای لی‌کردوە کە خۆی و شێخ

مارفی نەقیب بە ناوی (حەج)ەوە موسل بەجێ‌بێڵن و کەمێک دەوری شێخ سەعید چۆڵ بکەن. کە شێخ ئەحمەد ئەمە بۆ شێخ مارفی نەقیبی مامی ئەگێڕێتەوە شێخ مارف پی‌ی ئەلێ: وادایارە تەڵەکەبازیەکی تر لە مەیداندایە، خۆ گیانی من و تۆ لە گیانی شێخ سەعید زیاترنیە، ئێمە ژیان و مردنمان هەریەکە ئیتر چۆن بەجی‌ی بیڵین؟).

وەکو شێخ قادر ئەیگێڕێتەوە ئەلێ: (لەیەکەم رۆژی جەژندا سەرلەبەیانی والی موسل هاتە خزمەت شێخ سەعید و پی‌ی وتبوو لە ئەستەمبولەوە تەلگراف هاتوە کە تۆ بگەری‌تەوە بۆ سلێمانی و ئێمە هەتا ئاڵتون کۆپری بەرێتان ئەکەین. تەلگرافەکەش ئەداتە دەست شێخ سەعید و باوکم ئەفەرموێ: سەفەرەکەمان ئەخەینە دوای جەژن (سەیر ئەوەیە لە هیچ سەروچاوەیەکی تردا باسی هاتنی ئەو تەلگرافە نەکراوە)، جگە لەو راپۆرتەی قونسولی بەریتانیا لە موسل کە لە دواییدا باسی ئەکەین.

رۆژی دوهەمی جەژن سەرلەبەیانی لە سلێمانیەوە تەلگرافێک هات کەوا شێخ عەزیز بەرەو موسل هات، هەر لەو رۆژەدا رێکەوتی ۲۷/ئەیلولی/۱۳۲٤ی رومی هێزی ئینسترسواریش کە هەموو کورد بون رژانە ناو شاری موسلەوە و لە خانی حەمە قەدۆ (خانی حاجی محەمەدی سابونچی‌ی مەبەست بوە) دابەزین کە بیاوەکانی شێخیش هەر لەو خانەدا بوون (لەو حاجی محەمەدی سابونچیەوە هەر کەسێک دەوڵەمەند بوویێت پی‌ی وتراوە ئەلی‌ی حەمە قەدۆیە).

لە رۆژی دووهەمی جەژندا سەرلەبەیانی خەڵکی موسل بۆ بەزم و رەزم و سەیرانی جەژن هەموو لە ماڵ دێنەدەرەوە و ئافرەتەکان کەوتنە سەرشەقامەکان و سەرباز و جەندرمە و تاقمی ئینسترسواریش شەریان پی‌دەفرۆشن و پلاریان تی‌ئەگرن و ژنەکانیش لی‌یان دێنەجواب و لە ئەنجامی ئەوەدا لەگەڵ خەڵکی موسلدا ئەبێ بە شەر و هەرا و کوشتار دەست پی‌ئەکا کە هەتا سەعات سی‌ی شەو درێژەی‌کێشا (کەدیارە مەبەستی سەعات سی‌ی شەوی عەرەبی بوە کە جاران بەکار ئەهات)، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەس لە شێخان لەماڵی خۆیان نەچوونە دەرەوە.

بەیانی رەشید ئەفەندی عومەری هاتەلای باوکم و لە یەکەم هۆدەوە بە

ژوورەکاندا گەڕا هەتا گەیشتە ژوورەکەی شێخ سەعید کە لەو کاتەدا خەریکی خوێندنی قورئان بوو، دوای دانیشتن و قاوە خواردنەوە ڕەشید عومەری ڕووی‌کردە باوکم و وتی: بۆ خاتری ئەم کەلامی قەدیمە (قورئان) لەگەڵمدا وەرە پێکەوە بچینە لای والی کە ئەو پیاوکوژانەمان بداتە دەست، شێخیش لە وەراما پێ‌ی ئەلێ من دەخلم بەسەر خەڵکەوە نیە بەڵام لەبەر خاتری کەلامی قەدیم دێم بۆ لای والی و بانگ ئەکاتە (ڕەزا دەباغ)ی پیاوی کە قورئانێک هەڵگرێ و لە پێشەوە ئەڕوا و شێخ سەعید و میوانەکانیشی بە دوایا ئەکەونە ڕێ و چەند سەربازێکیشان بە دواوە ئەبێ. ڕوو ئەکەنە سەرای دەوڵەت و کە ساتێک نزیکی دەرگای سەرا ئەبنەوە پاسەوانەکان دەرگای سەرا پێوە ئەدەن و نایکەنەوە و ڕێگای شێخ سەعید نادەن کە بچێتە ژوورەوە بۆ لای والی، لەو کاتەدا کابرایەک لە پشتەوە بەردێکی زل دەمالێت بە کەللەی سەری شێخ سەعیدا و ئەکەوێ و یەکێکی تریش بە گوللە ڕەزا دەباغ ئەکوژێت و خوێنیان ئەڕژێت بەسەر قورئانەکەدا......

شێخ قادر پرسیار ئەکات و ئەلێ: وەفدەکەی والی (نیازی لە ڕەشید عومەری بوە) چی لێهات و تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی کە خۆی کورد بوو بە دارەکەبێنە ناسرابو وەپژدەری بوو (شێخ قادر لەوەدا بە هەڵەداچوە چونکە تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی پژدەری نەبوە بەلکو لە بنەماڵەی قواس-غواص بوە) ئەو لەبەرچی دەرگاکەی سەرای بە ڕووی شێخدا داخست؟ ئایا ئەمە هەرلەبەر دوژمنایەتی خۆی بوو لەگەڵ شێخان یاخود بە فەرمانی والی و کۆمەلی ئیتحاد و تەرەقی بوە؟).

لە ڕاستیدا یاداشتەکەی شێخ قادر ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەلی تیادایە، لە لایەکەوە گلەیی لە تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی ئەکا کە ئەو بوو دەرگای سەرای بە ڕووی شێخ سەعید داخستوە لەلایەکی ترەوە ئەلێ عەلی سەعید بەگ دەرگای داخست و تەفیق بەگی تاپۆ ئەغاسی تکای لێکرد کە دەرگا بکاتەوە بەڵام هەر نەیکردبوەوە و عەلی سەعید بەگ وتبوی: شێخ سەعید ئەو پیاوەیە لەسەر ئەهالی چنگیان مەحمود پاشای مدیری سروچک شاربەدەرکا (هەر چەندم کرد کەس نەبوو تأییدی ئەوەی شێخ قادر بکا کە مدیری سروچک مەحمود پاشا

ناوێک بوه و ئەو عەلی سەعید بەگەش کە باسی کردوە گوایا لەسەر ئەو مەحمود پاشای مدیری سروچکە هەلی دابویە کورد نەبوە و ژن برای متەسەرفی سلێمانی ئەوسا بوە لە بنەماڵەی قواس نەبوە و لەوە ئەچێت کوردیش نەبوەبێت...... دوورنیە تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی تکای لەو عەلی سەعید بەگە کردبێت کە بە حیسابی ئەوەی ئەو ئەرکانی حەرب بوە لە موسلدا و هەمووشتێک بەدەست ئەوبوە وەکو شێخ ڕەئوفی شێخ مەحمود ئەلێ ئەگەر چی موسل والی لێبوە بەڵام کاروبار هەربەدەست ئەو عەلی سەعید بەگەوە بوە کە دوورنیە عەلی سەعید بەگ لە تاقمی ئیتحاد و تەرەقی بوە و پیلانی کوشتنی شێخ سەعید و تاقمەکەی ئەو ڕێکیخستبێت وەکو لە دواییدا شێخ ڕەئوف لە یاداشتەکانیدا باسی ئەکا و ئێمەش لێی ئەدوێن.

شێخ قادر لە یاداشتەکانیدا ئەلێ: شێخ سەعید سەعات (٣)ی پاش نیوەڕۆ کۆچی دوایی ئەکا و تاقمی شەرفرۆش شالاو ئەبەنە سەر ئەو خانوەی کە دەست و پێوەندی شێخانی لێبوە و زۆریان ئەکوژن و دوای ئەوە رووئەکەنە ئەو خانوەی شێخ سەعیدی لێبوو و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەدی شێخ عەزیز ئەکوژن و سەید ئەحمەد تاوئەدا شێخ مەحمود ئەکا بەژێر دەرابەیەکی گەورە و پێ ئەلێ: ئەم فیتنەیە هەمووی بۆتۆیە، هەموو عالەم بەسەرتا بڕۆن لەچێی خۆت مەجولێرەوە دوای ئەوە نەوت ئەکەن بەسەر (سالح......نەیوتوە کام سالح بوە) دا و شێخ مارف و شێخ سەعید ئەفەندی عوسمان ئاغا و حەسەنی دەروێش سەعید و محەمەدی مەلاقادر و فەتاحی قاوەچی و زۆری تر بریندار کران و هەولیان دا بمخەنە شەتەکەوە بەڵام جەندرمە فریام کەوت و رزگاریان کردم و دوای ئەوەی شێخ مەحمود خۆی گەیاندە مالی مەحمود خدر هەمەوەندی).

جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی تێهەڵکێشی ئەو یاداشتەی شێخ قادر ئەلی: کاتی خۆی بیستبوم یەکێک لە بنەماڵەی کەریمی عەلەکەی خەڵکی سلێمانی کە لە موسل بوە شێخ مەحمودی رزگار کردوە (هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی ئەوەی نەکردوە).

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا باسی چۆنێتی ڕوودانی کارەساتەکەی موسل بەم جۆرە کردوە:«٢»

دوهەم رۆژی جەژنی قوربان کە ڕێکەوتی ساڵی ١٩٠٨ی بەرامبەر ساڵی ١٣٢٦هـ ئەو کارەساتە ڕوویداوە، عەشایری کورد بە بیستنی کوشتنی شێخ سەعید جۆش ئەسێنن و دێنە خرۆش و گۆرانی (شەهیدی کورد) بەسەر هەموو زمانێکەوە بوە، لە هەموولایەک شاعیران چ کوردی و تورکی و فارسی گەلێک شیعری شین و لاوانەوەی زۆر بە کوڵیان هۆنیوەوە و قوتابیان و منداڵان ئەو شیعرەیان لەبەرکرد بوو ئەیان خوێندەوە. کە شێخ مەحمود لە گەرانەوەیدا نزیکی کەرکوک بوەوە بە هەزاران ژن و پیاو و کوڕ و کچ، ئەفەندی، مەلا، شێخ، کاسبی ناوبازار، مأموری حکومەت هەزاران دەف و بەپداخیان ئامادەکرد بۆ بەپیرەوەچوونی و من لەو رۆژانەدا لە حوجرەی (مەلاتەقی) قوتابی بوم مامۆستاکەم شاعیر بوو مەرثیەیەکی دوور و درێژی بە تورکی پێ‌لەبەر کردم و پێش گەیشتنی شێخ بۆ کەرکوک بۆ هەزاران کەسم خوێندبوەوە، تەکیەی شێخ عەلی تاڵەبانی و خانەقای سەید ئەحمەد میوانەکانی دابەشکرد، شێخ مەحمود چوە تەکیەی تاڵەبانی (کەوابزانم ئەوەش حسابێکی تیادابوە بۆ ئەوەی ئەو کۆنە دوژمنایەتیەیان بەمە سازکرد کە لە شوێنی خۆیدا باسی نارێکی شێخان و تاڵەبانی ئەکەم) و شێخ قادری برای شێخ مەحمود ئەچێتە خانەقای سەید ئەحمەد. لەم کاتەدا ڕەشید پاشا کرا بە والی موسل لە جیاتی زەکی پاشا (کە خەڵکی حەلەب بوو) و زەکی پاشا یەکێک بوە لە ئەندامانی کۆمەڵی ئیتحاد و تەرەقی.

بەپێی بۆچوونی مامۆستا ڕەفیق حیلمیش شێخ مەحمود هەر چۆتە ماڵی خدر هەمەوەند و عەبدولنعم غلامیش هەر وای باس کردوە وەلەوێوە چۆتە ماڵی حاجی محەمەدی چەلەبی جادر.

کە شێخ لە کەرکوکەوە لەگەڵ ڕەشید پاشای والی تازەدا گەرایەوە بۆ سلێمانی ئەوەندەی تر ناوبانگی بەناو خەڵکدا بڵاوبوەوە).

مامۆستا ڕەفیق حیلمی باسی هەڵوێستی ئەورۆژانەی سلێمانی ئەکا و ئەڵێ: (دوژمنانی شێخان هەر چەند دەستیان گرتبوو بە کلاوەکەی خۆیانەوە و بەسەرزاری لێ‌ی بێدەنگ بون، بەڵام لە ژێرەوە وازیان لێ‌نەهێنابوون و هەمیشە کنەیان تیادا ئەکرد.

که ساتێک عەبدوڵلا ئەفەندی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی کوژرا (باوکی بەهائەلدین که له موسل بوبو به هۆی ئەو کارەساتە) عەبدوڵلا ئەفەندی خەلکی کفری بوه و سەرپەرشتێکەری (اراضي سنية) بوه و بەهای کوری که له موسل بوه مأموری ریژی (دائرەی توتن) بوه، هەر چەند شێخ مەحمود ئاگای لەو کوشتنە نەبوه، بەلام تاوانی کوشتنەکه دراوەته پاڵ شێخ مەحمود و ئەو پیلانەش هەر بۆ ئەوەبوه که جارێکی تر تووشی هەرای بکەن و بۆ ئەوەی گێچەلێکی تر پەیدا نەبێت، شێخ مەحمود شاری سلێمانی بەجێ دەهێڵێت و رووئەکاته ناوچەی (مەریوان) وەلەپاشمله کاربەدەستانی عوسمانلی شێخ مەحمود به (٣) ساڵ حوکم ئەدرێ و شێخ مەحمود نزیکی ساڵێک له دەرەوه مایەوه (شێخ رەئوفی شێخ مەحمود له یاداشتەکانیدا ئەلێ دوو ساڵ مایەوه) بەلام شێخ مارفی نەقیب که دۆستی ئیبراهیم فەهمی ئەرنائۆتی بوه که متەسەرفی سلێمانی بوه توانیی بۆ متەسەرف روون بکاتەوه و دڵنیای بکا که شێخ مەحمود هیچ تاوانێکی نەبوه لەو کوشتنەی عەبدوڵلا ئەفەندی باوکی بەهائەلدین‌دا و متەسەرف لێ‌خۆشبون له ئەستەمبولەوه بۆ شێخ مەحمود وەرئەگرێ و ئەگەرێتەوه سەر دێهاتەکانی خۆی).

بەلام عیزەت کاکەیی له یاداشتەتورکیەکەیدا وەکو شێخ رەئوفی شێخ مەحمود ئەیگێرێتەوه«٢١»، دەربارەی چوونی شێخ مەحمود بۆ مەریوان به جۆرێکی تر ئەیگێرێتەوه و ئەلێ: (شێخان بۆیان دەرکەوت که مانەوەیان له سلێمانی ئەبێته هۆی خوێنرشتنێکی تر لەبەر ئەوه بریاریان دا که بچنه خاکی ئێرانەوه و بەپێشرەوی شێخ مەحمود چوونه مەریوان و نیشتەجێ بوون و خەڵکی ئەو ناوچەیه ریزیان لێ‌ئەگرتن).

عەبدولمنعم الغلامی له کتێبەکەیدا (الضحايا الثلاث) که له کاتی کارەساتەکەی موسلدا مناڵ بوه و لەوێ بوه و له ساڵی سیەکاندا لەگەڵ مامۆستا رەفیق حیلمی پێکەوه له موسل مامۆستای قوتابخانه بون. له ساڵی ١٩٥٢دا ئەو کتێبەی چاپکردوه که سێ رووداوی تیادابوه یەکێکیان ئەو کارەساتەی موسله (وابزانم چ مامۆستا رەفیق حیلمی و چ شێخ رەئوف هەردوکیان له یاداشتەکانیان سوودیان لەوەی عەبدولمنعم غولامی وەرگرتوه).

عەبدولمنعم غولامی باسی چۆنێتی رووداوەکه ئەکا و ئەلێ:«٣٤»

(دوهەم رۆژی جەژنی قوربان خەڵکێکی زۆر لە باب الطوب کۆبوونەوە، پیاو و ژنی عەبابەسەر بەوناوەدا هات و چۆیان ئەکرد و منداڵان سواری چەرخ و فەلەک و کورسی کورسی ئەبوون و گەنجەکان بە خۆشی و شادی‌یەوە بە جادە و کۆڵانەکاندا ئەرۆیشتن و کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئاژاوە و پشێوی و ناخۆشی رووبدات کە ژمارەیەکی بێ‌تاوانی بە خۆرایی تیاچوو..

لەگەڵ هەندێ کورانی گەرەکی خۆمان ئەو بەیانی‌ی جەژنە بە باب الطوب‌دا ئەرۆیشتین کە تەمەنمان ئەوسا نزیکی هەشت ساڵان ئەبوو، بە بەردەرگای حەپسخانەدا تێپەرمان کرد روانیمان خەڵک رائەکەن و هەندێکیان هاواریان ئەکرد و ئەیان ووت راکەن بگەرێنەوە ماڵی خۆتان و لەو کاتەدا جەندرمە و خەڵکەکە بەربوونە یەکتر و هاوارێک بەرزبوە وەئەیوت: ئەهلی عەشیرەت...... ناموس...... ئەوە بۆچی وائەکەن؟ ئەم شەرە خۆراییە بۆ ئەکەن؟ لەو کاتەدا شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی برای لەگەڵ بەهائەدین ئەفەندی، ئەمانە هەموو گەنج بون، لە ماڵی مستەفا بەگی قائمقامی عەسکری مێوان بون کە ئەو ماڵەش هەر لە (باب الطوب) بوو، خانوەکە تارمەیەکی هەبوو و بەسەر خەڵکەکەدا ئەیروانی، هەموویان لەو تارمەیە دانیشتبون و سەیری ئەو خەڵکەیان ئەکرد. دوای ئەوە کەلەو ماڵە چوونە دەرەوە و بەسەر جادەدا لەسەرخۆ ئەرۆیشتن لەوە ئەچوو کە بەهائەدین ئەفەندی سەرخۆش بووبێت لەرێگا تواڵجێک ئەگرێتە ئافرەتێک و ئەویش هەتا تیابوو قیژاندی و هاواری کرد: خەڵکینە فریام کەون...... ژنان بەو دەنگەوە کۆبوونەوە و خەڵکی تریش هاتن و کە زانیان بەهائەدین ئەفەندی ئەو کارەی کردوە کە ئەوە تاوانێک بوو لێ‌خۆشبوونی نەبوو، بەهائەدین و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بە ناچاری گەرانەوە بۆ ئەو خانوەی کە بۆیان تەرخان کرابوو و چەند گوللەیەکیان بە ئاسماندا تەقاند بۆ ترساندنی خەڵکەکە کە لێ‌یان دوور بکەونەوە. لەو کاتەدا هەندێ جەندرمە لە چایخانەی (ابوعباس) دانیشتبون هەڵسان و رووبەرووی ئەو خەڵکە بوونەوە کە لە ساحەی (باب الطوب) کۆبوونەوە و دەسکرا بە بەردەباران کردنی یەکتری و بەو دار و تەختەی پێچکەی ناعوور و دەرابەی دوکانی ئەوناوە هەموو بەربوونە وێزەی یەکتری و لەو کاتەدا دەوریەیەکی ئێسترسوار پەیدابوون (شێخ رەئوفی شێخ

مەحمود لە یاداشتەکانیدا ئەڵێ ئەو ئێسترسوارانە خەڵکی کەرکوک و سلێمانی بوون و بەرگەکانیان تێکەڵ بوە لە جلی عەسکەری و کوردی).
عەبدولمنعم لە باسەکەیدا لەسەری ئەروا و ئەڵێ: (ئەو ئێسترسوارانە ولاغەکانیان بردە (تاولەی ضبطیە) و خۆیان گەڕانەوە و رووبەرووی ئەو خەڵکە بوونەوە و بوو بەشەڕە دەمانچە و تفەنگ و نزیکی (٤٠) جەندرمە لەم هەرایەدا بەشداری‌یان کرد و چەند کەسێکی بێ‌چەک کوژران و بریندارکران. کە ساتێک ژمارەیەکی تری چەکدار لە خەڵکەکە هاتنە ئەو شەڕەوە جەندرمەکان خۆیان کرد بە (تاولەی ضبطیە) و خەڵکەکە بۆیان کەوتنە سەریان و سەربانی ضبطیەیان کون کرد و چوونە خوارەوە و فایلاتی حکومەتیان سوتاند و نزیکی (١٠) جەندرمە لەوێدا کوژرا و هەرا هەتا نیوەشەو دەوامی کرد و ئیتر گەڕانەوە مالی خۆیان.
رۆژی سێ‌هەمی چەژن کە خەڵکەکە تماشایان کرد جەندرمەکان رایان کردبوە سەرای حکومەت ئیتر روویان کردە سەرا و داوایان لە وەکیلی والی (فەریق زەکی پاشا چەلەبی) کرد کە ئەو جەندرمانە تەسلیم بکا. کە ئەو داخوازیەیان قبول نەکرا داوایان کرد کورانی شێخ سەعید و بەهائەدین تەسلیم بکەن. وەکیلی والی پێ‌یان ئەڵێ ئەوانە لای ئێمەنین ئەتوانن خۆتان بچن بگەڕێن و بیاندۆزنەوە. بەو جۆرە خەڵکەکە روویان کردوە ئەو خانوەی کە شێخ سەعیدی لێ‌بوو و دەورەیان گرت. والی کە ئەمەی بیست ناردی بە شوێن رەشید ئەفەندی عومەری و شێخ ئیبراهیم ئەفەندی رومی و عەلی ئەفەندی ئیمامی مزگەوتی (نەبی شیت) وەداوای لێ‌کردن کە بچنە لای شێخ سەعید و راسپاردەکەی والی‌یان پێ‌گەیاند و دڵنیایان کرد کە هیچی بەسەرنایە. شێخ سەعیدیش بەنابەدڵی قورئانێکی بەدەستەوە بوو جبەیەکی سەوزی بەشانە بوو لەپێش و لەدوایەوە چەند جەندرمەیەک ئەڕۆیشتن و خەڵکیش دوایان کەوتن تا گەیشتنە شوێنی (سەبیلخانە) کە نزیکی بەردەرگای سەرابوو و لەوێ تماشایان کرد بە ئەمری تەوفیق بەگی تابوور ئاغاسی دەرگای سەرا داخراوە، کە ساتێک شێخ سەعید لەبەردەرگای سەرا راوەستا بوو زەلامێک بەردێکی زلی دابەسەر شێخ سەعیدا و هێرش برایە سەر پیاوەکەی (وەکو شێخ رەئوف باسی ئەکا رەزا دەباغ

بوه).

لێرەدا عەبدولمنعم غلامی ئەپرسی و ئەڵێ: (بۆچی دەرگای سەرا بەرووی شێخدا داخرا؟ هەر خۆی وەرامی خۆی ئەداتەوە و ئەڵێ: وادیارە ئەمەش بە خۆرایی نەبووە هەر چۆنێک بووبێت خوێنی شێخ سەعید بە ناڕەوا رژاو گیانی رووی کردە خواو شکاتی خۆی کرد.

رۆژی دوایی خەڵکی موسل وازیان نەهێنا بەڵکو هێرشیان بردەسەر ئەو ماڵەی کە شێخ سەعیدی لێ‌بوە لەوێ شێخ ئەحمەدی کوری شێخ سەعید کوژرا بەڵام شێخ مەحمود چوبوە ماڵی چەلەبی (نیازی لە حاجی محەمەدی جادر بوە) و لەوێوە دەربازیان کرد، تاقمێکی تریش چوون بۆ خانی سابونچی کە (یحی چاوش) لە پێشیانەوە بوو دەرگای خانەکەیان شکاند و هەندێک لەدەست و پێوەندەکانی شێخ سەعیدیان لەوێ کوشت وەهەرچی لەو ماڵ و خانەی حاجی محەمەدی سابونچی (حەمە قەدۆ)دابوو هەموویان تالان کرد و بردیان بەڵام بەهانەدین ئەفەندیان نەدۆزیەوە چونکە خۆی شاردبوەوە).

عەبدولمنعم غولامی لەسەر باسەکەی ئەروا و ئەڵێ:

(ئەوانەی ئەو دەسدرێژیەیان کردە سەر شێخ سەعید و کوشتیان تاقمێکی کەم بون لە خەڵکی موسل و زۆربەی خەڵکی تر لە ماڵی خۆیان دانیشتبون و چاوەروانی حکومەتیان ئەکرد کە ئاو بکات بەو ئاگرەدا کەچی حکومەت بوبو بە سەیرکەر و ماوەبەرەللا بوبو بۆ ئاژاوە و لام وایە ئەو خەڵکەی تری موسل کە لە ماڵەوە بون و نەهاتبونە دەرێ ئەگەر بیانزانیبانە شێخ سەعید شەهید ئەکرێ ئەهاتنە دەرەوە و پشتگیریان ئەکرد و نەیان ئەهێشت ئەو تاقمە گێرەشێوێنە ناوی موسل بەدناو بکەن و بی‌زرێنن (لە راستی‌دا ئەو دوژمنایەتیە لەگەڵ موسلدا زۆر درێژەی کێشا)، بەڵام تازە دوای ئەو کارەساتە خەم‌خواردن و گریان و شین هیچ سوودی نەبوو یاسا و دادگاش رێگەی راستی نەگرتەبەر)).

کە هەواڵ گەیشتە کەرکوک و سلێمانی هەموو لایەک راپەرین و عەشیرەتی هەمەوەند و دەروێش و مرید و دۆستەکانی شێخان کە ئەیانویست تۆڵەی شێخ سەعید بسێننەوە، پاش ئەوەی کە بیستیان شێخ مەحمود و ئەوانەی لەوێ ماون هێشتا لە موسل دەس‌بەسەرن، تەلگرافیان لێ‌دا بۆ والی و داوای بەردانیان

کردن و ئەگەر بەرنەدرێن هێرش ئەبەنە سەر موسل، بەو پێیە والی ناچارکرا بە شەو شێخ مەحمود و ئەوانەی لەگەڵیدا مابوون، بەرەو کەرکوک بەرێ بکرێن. کە شێخ مەحمود گەیشتە کەرکوک عەشایرەکان هەموو راست بوونەوە و والی موسل تەلگرافی نارد بۆ متەسەرفی سلێمانی کە بە پەلە سلێمانی بەجێ بێلێت و بچێتە بەغدا...... بەلاّم لە رێگا عەشایر هەرچی شتومەکی متەسەرفی سلێمانی هەبوو هەموویان تالاّن کرد و خۆشیان ناچارکرد بگەرێتەوە بۆ سلێمانی.

هەڵوێست بەو جۆرە مایەوە تا رەشید پاشای والی تازە گەیشتە موسل و تەنها تاقە رۆژێک لە موسل مایەوە و چوە کەرکوک و شێخ مەحمودی لەگەڵ خۆیدا بردەوە سلێمانی و بەو جۆرە خەڵکەکە بێدەنگ کران.

کە رەشید پاشا لە سلێمانیەوە گەرایەوە بۆ موسل، ناو موسل هێشتا هەر ئاڵۆزبوو، هەندێکەس موسلیان چۆڵ کردبوو چوبوونە بەغدا، رەشید پاشای والی تازە چەند کەسێکی گرت کە لەوانە رەشید ئەفەندی عومەری و شێخ ئیبراهیم ئەفەندی رومی و عەلی ئەفەندی ئیمامی مزگەوتی نەبی شیت و(تیش)ی دەلاّل و (شمس)ی برای و گەلێکی تربوون.

لەدوای تەحقیقات زۆریان بەردران هەر رەشید ئەفەندی عومەری و شێخ ئیبراهیم رومی و عەلی ئەفەندی ئیمامی مزگەوت و (تیش) و (١٣٠) کەسی تر لە بەندیخانەدا مانەوە کە لەناو ئەوانەدا (١٣) ژنی تیادابوو.

حکومەتی ئەستەمبوڵ موحەقق (کە ئەوسا پێی ئەوترا مستنطق)ی نارد بۆ موسل و محاکەمە ساڵ و نیوێکی خایان و لە ئەنجامدا بریار دەرچوو بە حەپسکردنی (٥٠) کەس بۆ ماوەی (٣) ساڵ و حوکمی ئیعدام بەسەر (١٣) کەسدا کە لەناو ئەوانەدا مەحمود العزاوی کە بە أبوجانگیر ناسرابوو لەگەڵ یحیی کوری ئەیوب چاوش و تیشی دەلاّل، بەلاّم ئەو بریارانە کە نێرران بۆ ئەستەمبوڵ هەمووی هەڵوەشێنرایەوە تەنها مەحمود العزاوی لە بەندیخانەدا مرد.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود دەربارەی ئەو (تیش)ەی کە عبدولمنعم غولامی ناوی هێناوە لە یاداشتەکانیدا ئەڵێ:«٢١»

(لەدوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە (تیش) چۆتە بەغدا و رۆژێک لەگەرەکی (سابونچی) لە بەغدا سەرخۆش ئەبێت بە کەش و فشێکەوە

ئەڵێ من شێخ سەعیدم لە موسل کوشت، حەمەی فەتاح کە پیاوی شێخ قادری مامم بوو گوێی لەوە دەبێت و پاش چەند ڕۆژێک تیش ئەکوژێت.

شێخ ڕەئوف لە یاداشتەکانیدا ئەلی: شێخ سەعید لەگەڵ شێخ ئەحمەدی کوریا هەردوکیان لە تەنیشت یەکەوە لە گۆرستانی (نەبی شیت) نێژراون.

شێخ ڕەئوف دەربارەی گەڕانەوەی ئەوانەی کە لە موسلدا مابون ئەلێ:

(لەسەر تکای مەحمود خدر هەمەوەند، شێخ قادر لەگەڵ چەند سوارێکدا بە دزیەوە دەرباز ئەکرێت بۆ کەرکوک و لەوێ لە خانەقای سەید ئەحمەد ئەمێنێتەوە و شێخ مەحمودیش بە هێزێکی جەندرمەوە بەرەو کەرکوک بەرێ ئەکرێ).

دەربارەی گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە موسلەوە، شێخ باباعەلی شێخ مەحمود بۆی گێڕامەوە وتی لەدوای تەواوبوونی شەری جیهانی دوهەم، بالیوزخانەی بەریتانیا دەعوەتێکی گەورەیان کرد و منیش لەو دەعوەتەدا بوم و نوری سەعیدیش لەوێ بوو و پیی وتم: ئەو ساڵەی کە باوکتیان لە موسلەوە ناردەوە من ئەوسا لە موسل ملازم بوم لە لەشکری عوسمانلیدا و یەکێک بوم لەوانەی لە موسلەوە لەگەڵ جەندرمەدا هەتا شاری هەولێر باوکتمان بەرێ‌کرد و لەگەڵی چوین.

کە دەگەنە کەرکوک دەروێشەکان لە کەرکوک بە تەپڵ و دەفەوە هاوار ئەکەن:

هەی گوڵ...... هەی گوڵ، تۆم بە گوڵزانی شێخم، شێخ سەعیدشای سلێمانی

لەبیرم دێ هەتا سەردەمی منداڵی ئێمەش لە هەندێ مناسەبەتدا دەروێشی قادرییەکان کە کۆریان ئەبەست حالیان لێ‌ئەهات، یا جاربەجارە دەروێشێکی دەف‌زەن بەناو بازاردا ئەگەرا ئەی‌ووت:

ئاغام شێخ مەحمود شێخ سەعید کوانێ؟

شێخ ڕەئوف لە یاداشتەکانیدا باسی یاداشتەکانی عیزەت کاکەیی ئەکا دەربارەی کوشتنی شێخ سەعید کە بە تورکی نووسیوێتی و ئەڵێ:

(شێخ عەبدولقادر شەمزینی کە سەرۆک مەجلیسی ئەعیان بو (مێجەر سۆن لە کتێبەکەیدا «٢٩» گەلێک هێرشی نارەوای بردۆتە سەر شێخ عەبدولقادر) توانی

حکومەتی عوسمانلی ئیقناع بکا کە تەحقیقێکی «عادلانە بکرێت لەو کارەساتەی موسلدا، بەلاّم ئیتحادی‌یەکان ئەو هەوڵەیان پووچەڵ کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ عەبدولقادر کە سەرۆکی کۆمەڵێکی کوردی بوو لە ئەستەمبول توانی حەقایقێکی تەواو کۆبکاتەوە و ئەندامانی ئەو مەجلیسەی دڵنیا کرد لەوەی کە شێخ سەعید لەو کارەساتەی موسلدا بە تاوانبار نەژمێررێت.

ئەو تەحقیقاتەی شێخ عەبدولقادر کارێکی گەورەی کردەسەر سوڵتان و لە ئەنجامی ئەوەدا متەسەرفی سلێمانی لەکار لابرا و تەحقیقات درایە دەس والی موسل.

ئەوانەی دژی شێخان بون دەستیان کرد بە بلاْوکردنەوەی پروپاگاندە لەناو خەڵکدا گوایا شێخان خۆیان کۆکردۆتەوە و خەریکن هێرش بیەنەسەر دەزگاکانی حکومەت و کاربەدەستانی عوسمانلی و دوژمنانی شێخان خەڵکیان هان ئەدا خۆیان چەکدار بکەن بۆ ئەوەی خۆیان لە شێخان بپارێزن. لە ئەنجامی ئەو کێشەیەدا والی موسل هاتە سلێمانی و هەرچی بەڵگە هەبوو هەمووی خرایە بەردەستی والی، ئەویش لە خەڵکی گەیاند کە میری خەریکە تەحقیق بکات لەو روەوە).

مێجرسۆن لە کتیبەکەیدا «٣٩» دەربارەی ئەو تەحقیقاتە وهاتنی والی ئەلێ:

(بەر لەوەی والی بگاتە سلێمانی، لە چەمچەماڵ هەندێک لە بازرگانەکانی سلێمانی خۆیان گەیاندە والی و بەدزی‌یەوە پێوەندیان لەگەڵدا کرد بەلاّم بۆیان دەرکەوت کە هیچیان لە والیەوە دەسگیرنابێت و کە والی گەیشتە سلێمانی بۆ ماوەی (٢٤) سەعات کۆبوونەوەکراو بەر لەو کۆبوونەوەیە والی هەولی‌دا کە بازرگانەکان و شێخان هەموویان لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداری بکەن و هەرلایە بەجیا گلەیی و نارەزایی خۆی دەربرێت...... نوێنەری شێخان چون و لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوون، بەلاّم بازرگانەکان نەچوون و لە جیاتی ئەوان مەلاکان و پیاوە ئاینیەکان چونە پێشەوە و گلەیی خۆیان بەرامبەر بە بازرگانەکان دەربری و هۆی ئاوارەبوون و کوشتنی شێخ سەعیدیان هەمووی دایەپاڵ بازرگانەکان... پاش ئەوەی والی پارەیەکی باشی خرایە گیرفانەوە، گەرایەوە بۆ موسل و بریاری دا کە شتێک نەکات دڵی شێخانی لی‌بره‌نجێت).

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە وەرامی تایر العمری لە کتێبەکەیدا (مقدرات العراق السیاسیه) کە ئەلێ ئەو هەرایەی موسل ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان ڕوویدا و سێ شەو و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا. وەرامی ئەوتاهیر العمری‌یە ئەداتەوە و ئەلێ:(ڕەفیق حیلمی) من خۆم لە شێخ مەحمودم بیستوە کە ئەو لەو کارەساتەدا نەبوە و لە هەرای (باب الطوب) و هەرای بەردەرگای سەرا کە دەرگا لە شێخ سەعید داخراو و شێخ سەعید شەهید کراوە، شێخ مەحمود لەوناوەدا نەبوە و ئەلی نووسەری کتێبی (مقدرات العراق السیاسیه) دوژمنایەتی شێخانی بوە بۆیە باسەکەی واهێناوەتەوە ئەوان تاوانبار بکات (بێگومان تاوانبارکردنی ڕەشید ئەفەندی عومەری و گرتنی لەسەر ئەو کوشتارە هۆیەکی گەورەبوە بۆ خاوەنی ئەو کتێبە کە هەردولایان لەیەک بنەماڵەبوون تاوانی ئەو کوشتارە بداتە پاڵ شێخان).

بەڵام سەیر ئەوەیە وەکو لەو سەرچاوانەی پێشوە وەدەرئەکەوێ کە هەریەکەیان بە جۆرێک باسیان کردوە و مێژووی ڕووداوەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز دەسنیشان کردوە.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئەلی: کارەساتەکە لە ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ۱۹۰۹ک ڕوویداوە کە ڕێکەوتی ۱۳۲٦هـ بوە... شێخ قادری برای شێخ مەحمود ئەلێ لە ۲۷/ئەیلول کە ڕێکەوتی ساڵی ۱۳۲٤ی ڕومی بوە ڕوویداوە... عەبدولمنعم الغولامی ئەلێ لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۰۹م دا کە ڕێکەوتی ساڵی ۱۳۲٦هـ بوە ڕوویداوە.

بەلای منەوە کاتی ڕوودانی ئەو کارەساتە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لەو ڕاپۆرتەی قونسولی بەریتانیا لە موسل کە ناردوێتی بۆ سەفیری بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ لە هەموویان ڕاست ترە چونکە ئەو ڕاپۆرتە لە کاتی خۆیدا نووسراوە بە پێچەوانەی کتێب و یاداشتەکانی تر کە هەموویان لە دوای ماوەیەک نووسراونەتەوە و بلاوکراونەتەوە جگە لەو فەرقەی کە لە لێکدانەوەی ساڵی میلادی و هیجریدا دێتە پێشەوە.

ڕاپۆرتی قونسولی بەریتانیا لە موسل ژمارە (FO. 195-2308) ڕۆژی ۱۹۰۹/۱/۱٤ کە بۆ سەفیری بەریتانیا لە ئەستەمبول (G.A. Lawther)ی ناردوە

لەلاپەرە (٣٩)ی ئەو راپۆرتەدا ئەلیٚ:

(لە نیوەرۆی رۆژی سیٚشەمەی ریٚکەوتی کانوونی دوهەم ١٩٠٩/١/٥دا ئەو هەرایە روویداوە و باسی ئەوە ئەکا چۆن (بەها- بەهائەلدین ئەفەندی) کە خەڵکی کفری بوە و لە ماڵی (مستەفا بەگ) میوان بوە لەگەڵ شیٚخ مەحمود و چەند کەسیٚکی تردا ئەو (بەها)یە بۆتە هۆی نانەوەی ئەو ئاژاوەیە بە وەی کە گوایا سەربازیٚکی ئیٚسترسوار لەوانەی کە لە کەرکوکەوە هاتبون ئەو سەربازەی ناردوە کە ژنیٚکی داویٚن پیس کە بەوناوەدا تیٚپەریوە بانگی بکاتە لای خۆی و ئەویش نەچوە لەوەوە بوە بە هەراو ئەو بەزمەی لیٚقەوماوە کە زۆربەی سەرچاوەکانیش هەربەو جۆرە باسیان کردوە و (بەها ئەفەندی)یان داناوە بە ئاگری بن‌کا).

قونسولی بەریتانی لە راپۆرتەکەیدا ئەلیٚ: ئەو رۆژەی کە هەرا و کوشتارەکەی تیادا روویدا من لای (والی) ئەگەرامەوە ئیٚسترسوارەکان لە مەلبەندی عەسکەری موسل دەسبەسەر کران و ژمارەی ئەوانەی لەو رۆژەدا کوژران ٣٠-٥٠ کەسیٚک ئەبوون. والی و قائدی عەسکەری و قازی لەگەڵ میرئالای (ئەنیس بەگ) کە سەرکردەی هیٚزی سوارە بووە بیمباشی عەلی سەعید بەگ کە سەرۆکی ئەفسەرەکان بوو لەگەڵ یوزباشی (ناطق ئەفەندی)ی و گەلیٚک پیاوی ئایینی و ئەشرافی موسل کۆبوونەوە، بەڵام سەیر ئەوە بوو هیچیان نەکرد بە هیچ و نەیانتوانی ئاگربڕی ئەو هەرایە بکەن!

رۆژی دوایی پیاوە ئایینیەکان چونە سەر والی و داوایان کرد ئەو ئیٚسترسوارانەیان تەسلیم بکریٚ کە محاکەمەیان بکەن بەڵام دیاربوو والی ریٚگەی ئەوەی نەدان و ئاژاوەچیەکان کە دوای علما ئایینیەکان کەوتبون لەژیٚر سەرکردایەتی (ابوجاسم)دا بریاریاندا هیٚرش بیەنەسەر ئەو ماڵەی کە شیٚخ سەعیدی تیادابوو، بەیداغی سەوزیان هەڵکرد و لە دەهۆڵ درا و ئەبوجاسم بوو بە پیٚشرەوی خەڵکەکە، هیٚزی سوپایی و کاربەدەستان چ عەسکەری و چ ئیداری هەموو خۆیان کیٚشایەوە بۆ ناو حامیەی عەسکەری...

سەیر ئەوەبوو پیٚش ئەوەی هەرای رۆژی دوهەم لە ١٩٠٩/١/٦دا دەست پیٚبکاتەوە بۆ ماوەی (١٢) سەعات ناوشار هیٚمن و بیٚدەنگ و خامۆش بوو،

ئایا چ هۆیەک بوو پاش ئەوە هەرای رۆژی دوهەم هەڵبداتەوە و کێ هانی ئەو ئاژاوەچیانەی‌دا ئەوە شتێکی ئاشکرا نەبوو، جگە لەوە نەشزانرا ئەو کۆبوونەوەیەی کەکرا باسی چی‌کرا و چ بریارێک درا.

وەکو ئەڵێن ساتێک پیاوە ئایینیەکان (علماء) چوونە لای (والی) والی پی‌ی‌وتبون بە ئارەزوی خۆتان چی ئەکەن بیکەن، عالمەکانیش خەڵکیان راسپارد و هانیان دان کە بچن چەکەکانیان لە ماڵەوە بێنن و والیش بەرامبەر بەوە هیچی وای نەکرد کە شێخ سەعید بپارێزێت لەماڵی خۆیدا لەگەڵ ئەوەشدا خانووەکەی نزیکی (٤٠) یارد دوور بوو لە خانوەکەی والی.

لە راستیدا کوشتنی شێخ سەعید بەو شێوەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە پیاوێکی بەساڵاچووی ناسراو و ئایندار‌بوو...... بە خۆی و قورئانێک بەدەستەوە کە بەرەو حامیە چووبوو، ئەبێ چی وای لەو ئاژاوەچیانە کردبێ کە شێخ سەعید بکوژن لەگەڵ ئەوەشدا چەند زەفتیەیەکی (پۆلیس) لەگەڵدا بوە...... ئەوە شتێکی سەیرە و لەوەئەچێت بە پیلانێکی رێکخراو و ئەنجامی ئەو بەسەرهاتە بریاری لەسەردرابێت.

کە هێرش برایە سەر ماڵی شێخ سەعید (١٣) کەس لە پیاوەکانی کوژران کە یەکێک لەوانە شێخ ئەحمەدی کوری بوو، بەلام شێخ مەحمود بەبریندارکراوی خۆی دەربازکرد کە شێخ مەحمود تەمەنی (٢٣) ساڵەیە... خەڵکەکە دوای ئەو کوشتارە هەموو ماڵەکەیان تالان کرد کەهی ماڵی (سابونچی) بووە، ئەو سابونچیە (نیازی لە حاجی محەمەدی سابونچی-حەمە قەدۆ) وەختی هۆی یە هۆی شێخ سەعیدەوە کە لە ئەستەمبول بوە سوڵتان لەقەبی پاشایەتی بەخشیوە بە سابونچی. ژمارەی کوژراوەکان لەهەردوولا نزیکی (٧٠) کوژراوە و بریندارەکانیش (١٠٠) کەسێک ئەبن.

شێخ مەحمود دوای ئەوە بە برینداری و بەدەسبەسەری لەژێر چاودێری حکومەت دابو بەلام خەڵک ئەچوونەلای و زیارەتیان ئەکرد.

کونسوڵی بریتانی لە راپۆرتەکەیدا لەسەری ئەروا و ئەڵێ: سەرەرای ئەو هەموو کوشتار و برینداری و تالانیەی کەکرا حکومەت بە ئاشکرا دەستەوسان راوەستا و هیچی نەکرد بۆ بەربەرستکردنی ئەو ئاژاوەیە.

لە رۆژی ١٩٠٩/١/٥دا تەلگرافێک لە ئەستەمبولەوە هاتبوو کە شێخ سەعید ئازادە و ئەتوانێت بگەڕێتەوە شوێنی خۆی لە سلێمانی، بەلاّم وادیارە بیلانەکە بۆیە ڕێکخرا بوو بۆ ئەوەی شێخ سەعید نەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی (لەسەرچاوەکانی تردا تەنها شێخ قادری برای شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا باسی هاتنی ئەو تەلگرافەی کردوە).

راپۆرتەکەی قونسولی موسل سەرنجی خۆی دەربارەی ڕووداونی ئەو کارەساتە بەم جۆرە دەربڕیوە کە ئەڵێ:

(زۆربەی خەڵک لەسەر ئەوەن ئەوەی کە خەڵکی موسل کردیان تەنها بۆ شکاندن و ناو زڕاندنی والی موسل بوو، بەر لەوەش چەند جارێکی تر ئەو خەڵکە دژی والی هەرا و پشێوی و جموجۆلی تری وایان کردوە و هەمان (ابوجاسم) لەو هەرایانەی پێشوودا پێشڕەوی ئەو ئاژاوەچیانە بوە، بەلاّم ئەنجامی ڕووداوی هیچ جارێک وەکو ئەمەی ئەم جارە کاریگەر نەبوو (ئەمە پێچەوانەی بۆچوونی زۆر لەو سەرچاوانەیە کە لایان وابوو والی سەر بە ئیتحاد و تەرەقی بوە و ئەو ئەم هەرایەی هەڵگیرساندوە، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئیتحادییەکان خۆیان هەلیان گیرساندوە بۆ لابردنی والی).

قونسولی بەریتانی لە راپۆرتەکەیدا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێ:

(حکومەت لە موسل دا (٨٥٠) سەربازی هەیە ئەیتوانی بەو هێزە ڕێگای لە ڕوودانی ئەو کوشتارە بگرتایە...... دانانی یەکێکی وەکو زەکی پاشا بۆ والێتی موسل هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو بە تایبەتی کە کێشەی ئیتحاد لە ئارادایە. ماوەتەوە سەر ئەوەی چاوەڕێ بکەین و بزانین ڕەفتاری حکومەتی ئەستەمبول دەربارەی ئەم کوشتارە چۆن ئەبێت و لەوە ئەچێ ئەمانەی خوارەوە بکرێ:

١- لابردنی قائدی عەسکەری موسل.

٢- موحاسەبەی تاوانبارەکان.

٣- دەرکردن و دوورخستنەوەی (٦) عالمی ئایینی و ئەشرافی موسل.

٤- دانانی والییەکی بەهێز.

لە راپۆرتێکی تری قونسولی بەریتانی لە موسل بۆ سەفیری بەریتانیا لە ئەستەمبول بە راپۆرتی ژمارە (FO. 195-2308-351) رۆژی ١٩٠٩/٢/٦ لە لاپەرە

(٣٥٢)ی ئەو راپۆرتەدا ئەلیٚ:

(شیٚخ مەحمود، ئەوەی لە هەراکەی موسل رزگاری بوو، لە ١٩٠٩/١/٦دا لە ژێرچاودێری حکومەتدا لە (حامیە) مایەوە، بەلاّم لە هەفتەی پیٚشوودا (یەعنی لە کۆتایی مانگی کانوونی دوهەمدا) لەلایەن کاربەدەستانەوە بەرەللاکرا و بەبیٚ دەنگی بەرەو کەرکوک رۆیشت.

هۆی ئەو بەربوونەی شیٚخ مەحمود وەکو ئەلیٚن گوایا لە هەرەشەی کوردەکان ترساون و متەسەرفی کەرکوک تەلگرافی ناردوەبۆ والی موسل پیٚی راگەیەنیٚت ئەگەر شیٚخ مەحمود بەرنەدریٚت و رەوانەی سلیٚمانی نەکریٚتەوە ئەوا خۆی بە بەرپرسیار نازانیٚت لەهەر رووداو و بەسەرهاتیٚکدا کە لە ناوچەکەیدا روودەدات، جگە لەوە دەنگ بلاّوە ئەو موسلاویانەی لە کەرکوک ئەژین هەموویان هەرەشەیان لیٚکراوە و مەترسی ئەوە هەیە کە تۆڵەی کوشتارەکەی موسل لەوان بکریٚتەوە.

رۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ زۆر بە کورتی باسی ئەو رووداوەیان کردوە و ئەلیٚن: گوایا ئەو رۆژەی کە ئەو هەرایەی تیادا قەوماوە، لەو رۆژەدا هیٚرش براوەتە سەر بەندیخانە کە لە راستیدا شتیوا رووی نەداوە).

لە راپۆرتیٚکی تری قونسولی بەریتانی لە موسل ژمارە (FO. 195- 2308) رۆژی ١٩٠٩/٢/١٣دا باسی ئەوە ئەکا کە چەند کاربەدەستیٚکی حکومەتی عوسمانلی هاتون بۆ موسل بۆ ئەوەی لە هۆی ئەو کوشتارە بکۆڵنەوە و هەواڵ وا ئەگەیەنیٚت کە زەکی پاشای والی ئەگویٚزریٚتەوە و لە جیاتی ئەو والی (بتلیس) ئەبیٚ بە والی موسل (کە هەندیٚ سەرچاوە ناوی ئەو والییە تازەیان بردوە کە ناوی رەشید پاشا بوە).

ئەلیٚن حکومەت دەستی کردوە بە لیٚکولینەوە بەلاّم تا ئیٚستا هیچ ئەنجامیٚک دەرنەکەوتوە).

## ٣- هۆی ئاوارەبوون و هۆی کارەساتەکەی موسل

کە بنەماڵەی شێخان وردە وردە لە خێزانێکی ئایینیەوە بون بە دەسەڵاتدار و بوون بە خاوەن مولک و پارە و ئەو بۆشاییە سیاسیەی کە بابانەکان لە ناوچەی سلێمانیدا بەجێ‌یان هێشتوو، پڕکردنەوەی لەلایەن بنەماڵەیەکی ترەوە وەکو بنەماڵەی شێخان شتێکی ئاسان نەبوو، بە خۆڕایی نەئەچوو سەرو گەلێک کۆسپ و بەرهەڵستی و بەربەرەکانی بەهێز ئەهاتە ڕێ کە بە سووکی بۆیان چارەسەر نەدەکرا وەکو هەموو ئەو بەربەرەکانی کردن و ناکۆکیانەی لە نێوان چینی فیوداڵدا لەناو خۆیاندا ڕووئەدا وەیا لە نێوانی دەستەیەک لە چینی فیوداڵ لەگەڵ دەستەیەکی تری پارەدار و بازرگان کە لەرێ‌رەوی ژیانی ڕۆژانەدا و لە پەلەقاژە و هەڵپەی دەسگیربوونی دەسەڵات و کەڵەکەکردنی پارە و سەرمایە و زۆرکردنی مولک و سامان و زەوی و زاردا ڕووئەدا.

دوای ئەوەی شێخ سەعیدی حەفید جێگەی کاک ئەحمەدی شێخی گرتەوە و بە هۆی ئازایی و لێ‌هاتوویی خۆیەوە توانی لە شێخانی تر زۆرتر دەسەڵات پەیدابکا و خەڵک ڕیزی لێ بگرێ یاخود لێ‌ی‌بترسێ و سوڵتانی عوسمانلی بۆ بەرژەوەندی خۆی بایەخێکی زۆری‌دا بە دۆستایەتی شێخ سەعید و لە خۆی نزیک کردەوە و خۆی و تاقمێک لە خزمان و دۆستانی بانگ کرد بۆ ئەستەمبوڵ، ئەمانە هەمووی بوون بە هۆی ئەوەی سەرەتای دەسەلاتدارێتی بنەماڵەیەکی تر کە بتوانێت جێگەی دەسەلاتی بنەماڵەی بابان بگرێتەوە هاتە کایەوە و ببێت بە شۆرەسواری مەیدان لەناو بنەماڵەکانی تردا......

لەلایەکەوە هەندێک لە فیوداڵی ناوچەکە ئەوەیان پێ‌ناخۆش بوە کە تاقمێکی تازەی تر جگە لە خۆیان لەناوچەکەدا پەیدابێت کە بتوانێت زاڵ بێت و دەسبەسەر هەڵوێستدا بگرێ و پەرەبسێنێت و لەنرخی ئەوان کەم بکاتەوە، وەکو لەو باسەی کە تەرخانمان کردوە بۆ پێوەندی و کێشەی نێوان شێخان و عەشایر و

بنەماڵەکانی سلێمانیدا بە دووروودرێژی باسی ئەکەین و هەندێک لە ناکۆکیانە روون ئەکەینەوە کە هەموویان لە ئەنجامدا بە تایبەتی لە کاتی حکومدارێتی شێخ مەحمود و لەو رۆژە ناسکانەدا کە ئاڵای کوردستان هەلکرا چۆن ئەو ناکۆکی و نارێکی و بێنبرکێ‌یانە بوون بە هۆی لاوازکردنی ئەو حوکمداریەتە و بێگانەی داگیرکەر چۆن توانی یاری بە میللەتەکەمان بکا و هیوای دوارۆژمان زیندەبەچاڵ بکات.

ئەمە لەلایەک و لە لایەکی ترەوە، بە هۆی ئەو دەسەلاتە فراوانە زۆرەی کە بۆ شێخان رەخساو زروفی ناوخۆ و لاوەکی یارمەتی ئەوەی دان لە بنەماڵەکانی تر زۆرتر ناوبانگیان بلاوبێتەوە و کاربەدەستانی عوسمانلی بایەخیان پێ‌بدا و ریزیان لێ‌بگرێ کە لە ئەنجامی ئەوەدا شێخان دەست و پێوەندێکی زۆریان پێوەلکا و خەلکێکی زۆریان لێ‌کۆبوەوە و بوون بە لایەنگریان کە ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی تر لە دوژمنانیان بۆ پەیدابوو، ئەو دەست و پێوەندانەی کە زۆریان بۆ سوود و مەبەستی خۆیان لێ‌یان گرد بوونەوە و هەندێ لەو شێخە رووتەڵ و هەڵپەرستانەی کە ئەوەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو، بەکردەوە و رەفتاری نالەباریان بوون بە هۆی ئەوەی کە دوژمنێکی زۆر بۆ بنەماڵەی شێخان پەیدابکەن کە بوو بە مایەی گێرە و کێشە و سەربەشە و شەرەشەقێکی زۆر کە بە ئاسانی چارەسەر نەدەکرا و لەکاتی حوکمدارێتی شێخ مەحموددا دوژمنانی کورد زۆر بە ئاسانی توانیان ئەو دەردی‌سەریە ئەوەندەی تر پەرەپێ‌بسێنن و هیچ دەرفەت و هەلێک لەکیس خۆیان نەدەن کە لەو رێگەوە ناوی شێخان بزرنێن کە مەبەستی سەرەکیشیان لەوەدا هەر زراندن و کەم‌کردنەوەی نرخی حوکمدارێتی شێخ مەحمود بوە وەکو لە باسەکان و لە شوێنی خۆیدا بۆمان دەرئەکەوێ.

یەکێکی وەکو مێجرسۆن کە نوێنەرێ راستەقینەی ئیمپریالیزمی ئەورۆژە بوە و بە خوێنی سەری کورد و شێخ مەحمود تینوبوە لە یاداشتەکانیدا «٣٩» دانی پیادائەنێ و ئەلێ: لەو رۆژانەدا (گەشتەکەی سالی ١٩٠٩) هەر کەسێک بکوژرایە، خەڵک لەبەر بووره ئەیان ووت پیاوەکانی شێخان کوشتویانە یا دەستی ئەوانی تیادابوە.

مامۆستا زیوەری شاعیر کە مەلایەکی ئەو سەردەمە بوە و هاوڕێی شێخ مەحمود بوە و حەزی بە سەرکەوتنی شێخ کردوە و گەلێک شیعری بۆ کورد و کوردستان وتوە، لە یاداشتەکانیدا (گەنیجنەی مەردان)«۱۳» دان بەو ڕاستیە تاڵەدا ئەنێ و ئەلێ: (کە شێخان ناوبانگیان بلاْوبوەوە و خەڵک زانیان سوڵتانی عوسمانلی ڕێزیان لێ‌ئەگرێ، لەدوای هاتنەوەی شێخ سەعید لە ئەستەمبول دەست و پێوەندی شێخان هەوای لەخۆبایی بوونیان کەوتە کەللەوە و خۆیان بەزل ئەزانی و لە هەموو کاروبارێکدا دەستدرێژیان ئەکرد کە ئەمانە هەمووی سەریەشەیەکی زۆریان بۆ شێخان نایەوە).

یاداشتەکانی زیوەر و ڕەفیق حیلمی هەردوکیان باسی ئەوە ئەکەن چۆن ئەو مووچەخۆر و فەرمانبەرانەی ناو سلێمانیش بۆ سوودی خۆیان و بۆ ئەوەی شێخان لەلابردن و دەرکردن لە کاروبار بیان‌پارێزن هەریەکەیان بە جۆرێک خۆیان دابوە پاڵ شێخان و لە سایەی ئەوانا گەلێک شتی ناڕەوا و بێ‌جێ‌یان کردوە کە گۆتاورۆکەی بەسەر شێخاندا چۆڕاوەتەوە و هەموو خراپەکان رووی ئەوان بۆتەوە.شتێکی ئاساییە لە هەموو کاتێکدا هەڵپەرست لە دەسەلاتدار کۆئەبێتەوە و زۆرجار کردەوەی ناڕەوا بە ناوی ئەو دەسەلاتدارەوە ئەکا کە نموونەیەکی زەق و ئاشکرای ئەوە هێشتا لەبەرچاوە کە چۆن زۆرجار ئەندامانی پارتێک یا ڕێکخراوێک هەندێکیان کردەوەی ناڕەوا و بێ‌جێ ئەکەن کەچی لەکەی ئەوکارە ناڕەوایانە شانی پارت و ڕێکخراو و سەرکردەکان ئەگەرێتەوە و دەسەلاتیش نیە و هەروا بە ئاسانی ئەو هەڵپەرستیە بەربەست ناکرێت.

یەکێک لەو ئەنجامە کاریگەرانەی کە شێخان ڕووبەڕووی بوونەوە بریتی بوو لەو پێوەندی‌یەی کە سوڵتانی عوسمانلی و کاربەدەستان لەگەڵ شێخاندا (کاک ئەحمەد و شێخ سەعید تا کاتی شێخ مەحمود) بەستیان. ئەو پێوەندی‌یە وەکو ئاشکرایە بوو بە هۆی ئەوەی ژمارەیەک لە سەرۆک عەشیرەت و بازرگانەکان مەترسی ئەوەیان لێ‌نیشت ئەو پێوەندی‌یە لە دەسەلاتی ئەوان کەم بکاتەوە بە تایبەتی کە زانرا سوڵتان عەبدولحەمید شفرەی موخابەراتی نهێنی خۆی داوە بە شێخ سەعید ئیتر خەڵک شێخانیان بە شێخی سوڵتان ئەدایە قەڵەم و هەمیشە لە دەرفەتێک ئەگەڕان سووکیان بکەن و لە نرخیان کەم بکەنەوە، بۆیە کە

کۆمەلی ئیتحاد و تەرەقی پێکهات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کۆمەڵە رێکخراوێکی گومان لیٚکراوبوە و هەرچەند کوردەکان ساویلکانە لەسەرەتادا بەشداری‌یان تیادا کرد و بوون لە لایەنگری ئیتحاد و تەرەقی دژی سوڵتان، بەلاٚم لە دواییدا دەرکەوت دەستێکی نهێنی ئەو کۆمەڵەی پێکهێنابووو تورکیزمەکان مەبەستی سەرەکی‌یان ئەوە بوو دەسبگرن بەسەر دەوڵەتی عوسمانلی‌دا و حیساب بۆ هیچ نەتەوەیەکی تر نەکەن، بەلاٚم لەگەڵ ئەوەشدا لە شوێنێکی وەکو ناوچەی سلێمانی‌دا لقێکی ئەو کۆمەڵە کرایەوە و وەکو ئەلێن مەحمود پاشای جاف سەرۆکی ئەو لقەبوە و بازرگانەکان هەندێکیان لە رقی شێخان چوونە ئەو لقەوە و توانرا بە پیلانی ئیتحادی‌یەکان نارێکی و پشێویەکی سەخت لە نێوان شێخان و بنەماڵەکانی تری ناوچەی سلێمانیدا پەیدا بکەن کە ئەوە یەکێک بوە لە مەبەستە سەرەکیەکانیان و ئەو دروشمانەی کە بلاٚویان دەکردەوە وەکو ئازادی و سەربەستی و دانانی دەستوور، هەمووی بۆ ئەوە بوە خەڵکی پی‌ٚچەواشە بکەن.

یەکەم بەرهەمی تەقەلای ئیتحادی‌یەکان لە خوارووی کوردستاندا ئەوەبوە کە بنەماڵەی شێخان بەدناو بکەن و لەناویان ببەن کە لە راستیدا توانی‌یان هەر بە کورد شێخ سەعید و تاقمەکەی ئاوارە بکەن بۆ موسل و لەوێش ئەو کوشتارە سازبکەن کە لە کارەساتەکەی موسلدا بە دوور و درێژی باسمان کرد.

بە هاتنەوەی شێخ مەحمود لە دوای کوشتارەکەی موسل وەنەبیٚ دەستەی شێخان ئیتر لەناوچووبن بەلکو بە پێچەوانەوە زۆری پی‌ٚنەچوو خەڵکێکی زۆریان لی‌ٚکۆبوەوە، بەلاٚم ئەو کارەساتەی موسل کە شێخ مەحمود و شێخانی تر سوور ئەیانزانی هەندی سەرۆک عەشیرەت و بازرگان و پارەدارەکانی سلێمانی لە ئاغالەر و بەگزادە دەستێکی تەواویان هەبوە لە سەرگرتنی ئەو پیلانەی کە ئیتحاد و تەرەقی سازی کردبوو لەبەر ئەوە ئەو خوێنرشتنەی موسل و کوشتنی شێخ سەعید و کەس و کار و دەست و پێوەندەکانی هەروا بە ئاسانی لەبیر نەدەچوەوە.

کە شێخ مەحمود گەرایەوە بۆ سلێمانی و زۆربەی زۆری خەڵکی سلێمانی بە تایبەتی خەڵکی رەشۆکی لی‌ٚی گردبوونەوە و تەعزی‌ٚیەکی قورس گیرا بۆ کوژراوانی موسل. هەندیٚ لەو بازرگانانەی کە خۆیان لایان ئاشکرابوو دەستیان

لای شێخ مەحمود کەوتۆتە روو، بەلای ئەو پرسە و تەعزی‌یەدا نەچوون کە ئەمە شێخ مەحمودی زۆر دڵگیرکردبوو.

ئەو بازرگان و ئاغالەرانەی کە ئەو کارەساتەی موسلیان پی‌خۆشبوە و لەو پرسە گەورەیەی کە هەموو شاری سلێمانی بەشداری‌یان تیادا کردبوو، ئەوانە هیچ لایەکیان نەچوبون بۆ ئەو پرسەیە و بەوەش وازیان نەهێنابوو بەلکو کۆمەڵی ئیتحاد و تەرەقی رایانسپارد بوون کە لەماڵان و قاوەخانەکاندا ئاهەنگیان ئەگێرا و قەوانیان لی‌ئەدا......

جارێک لە خزمەت شێخ مەحموددا لە داریکەلی لەباسی دەنگ خۆشەکانی ئەو سەردەمە و گۆرانی و قەوانی ئەورۆژانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شێخ مەحمود هەمیشە مێملی دەنگی خۆش و پیاوی دەنگ خۆش بوە فەرمووی: (دوای گەرانەوەمان بەدڵشکاوی و بەو کۆستە گرانەی ئەو رۆژانە لێمان کەوتبوو، ئەوانەی نەیار و ناحەزی ئێمە بوون لە جیاتی ئەوەی هیچ نەبێ بێدەنگ بن، بە پێچەوانەوە خەڵکیان هان‌ئەدا و رایان‌ئەسپارد کە ئاهەنگ و قەوان لێدان لە چایخانەکاندا زۆرتر بکەن کە ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی هەندێک لە گەنجەکانی ئەورۆژانەی شاری سلێمانی لەگەڵ ئەوانەی خۆیان بە دۆستی ئێمە ئەزانی پەلاماری ئەو چایخانە و قاوەخانانە بدەن و هەندێ گرامەفۆن و قەوانیان شکاندبوو، وەئەو هەڵوێستە هەتا ماوەیەک بوو بە ژان لەدڵماندا (لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود بەوە ناسراو بوە کە زۆر دڵپاک بوە و هیچی نەگرتۆتە دڵ و زۆر زوو لە ناحەزەکانی خۆشبوە).

مێجوسۆن لە گەشتەکەی ساڵی ۱۹۰۹یدا بۆ سلێمانی «۳۹» کە رێکەوتی ئەو سەردەمەبوە کە کارەساتەکەی موسلی تیا روودابوو، باسی شکاندنی ئەو گرامەفۆن و قەوان و ئاڵەتی مۆسیقایانە ئەکا کە لەو رۆژانەدا لە قاوەخانەکان شکێنرابوون.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود دەربارەی کوشتارەکەی موسل ئەلی:«۲۱»

هەرچەند لەکاتی کوشتارەکەی موسلدا (زەکی پاشا) والی موسل بوو بەلام دەسەلاتی راستی بەدەست عەلی سەعید بەگەوەبوە ئەگەرچی ئەو عەلی سەعید بەگە لە دواییدا لای ئەحمەد تەقی لە ئەستەمبول سوێندی خواردبوو کە ئەو

پێوەندی بەو کوشتارەوە نەبوە و هەروەها لای خالە فەتاحم (فەتاح بەگی ئەمین عەتار) سوێندی خواردبوو وەپاکانەی کردبوو بەڵام لە دواییدا لای (مەحمود نەدیم پاشا) کە لە بنەماڵەی (کەتانە) بوە عەلی بەگ دانی بەوەدا نابوو کە پیلانی کوشتنی شێخ سەعید و هەواڵەکانی بەدەستی ئەو رێکخراوبوو چونکە بەجێ‌هێنانی ئەو پیلانە یەکێک بوە لە بریارەکانی کۆمەڵی ئیتحاد و تەرەقی کە ئەبوایە بەجێ‌بهێنرایە.

شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیدا لەسەری ئەروا و ئەڵێ:

(بێجگە لەو دانپیانانەی عەلی سەعید بەگ لەلای مەحمود نەدیم پاشا، جارێکی تریش عەلی سەعید بەگ لە دواییدا کەبوە بە والی‌ی (صنعاء)، لەوێ خەزووری فەتاح بەگی ئەمین عەتار (ژن‌برای شێخ مەحمود) لەو کاتەدا لە سەنعا متەسەرف بوە لە تێکەڵاوی و بەسەریەکەوە بوونی عەلی بەگ لەگەڵ متەسەرفی سەنعا کە خەزووری فەتاح بەگ بوە (دیارە تورک بوە)، لە دانشتنێکیدا، عەلی بەگ دانی بەوەدا ناوە کە ئەو بیلانی کوشتنەی موسل ئەو رێکیخستبوو چونکە ئەوە بریاری ئیتحاد و تەرەقی بوو ئەبوایە بهێنرایەتەدی).

لێرەدا ئەوانەی سەرنج رائەکێشی ئەوەیە کە دیارە ئەو کارەساتە بە پیلانی تاقمی ئیتحاد و تەرەقی کراوە کە ئەو عەلی بەگی سەعید بەگە کە ئەرکانی حەربی موسل بوە و هەمووشتێکی بە دەست بوە، والی ئەو سەردەمە دیارە لە تاقمی ئیتحاد و تەرەقی نەبوە و هەروەکو لە راپۆرتەکەی قونسولی بەریتانی لە موسل کە بۆ سەفیری بەریتانی ناردوە لە ئەستەمبول دەرئەکەوێ کە بەشێک لەو پیلانەی کوشتارەی موسل بۆ ئەوە بوە کە ناوی (زەکی پاشا)ی والی موسل بزڕنیریت کە دیارە لەگەڵ ئەواندا نەبوە.

## ٤- ئەنجامەکانی ئاوارەبون

وەکو باسمان کرد کوشتارەکەی موسل ئەگەرچی بوو بە هۆی ئەوەی شێخ سەعید و تاقمێک خزم و کەس و کار و دەست پێوەندی تیادابچێت، بەڵام وەنەبێ بەوە دەسەڵاتی شێخان کزبووبێت ئەگەرچی ماوەیەک شێخ مەحمود خۆی

له سلێمانی دوورخستەوە ئەوەکو گێچەڵیکی تریش بەو بکەن... بەڵام زۆری پێ‌نەچوو گەڕایەوە و خەڵکی زۆری لی‌کۆبوەوە و توانی وەکو سەرکردیەکی ناسراوی کورد بێتە کۆرەوە و عوسمانلی‌یەکان تکای بەشدابوونی شەری لی‌بکەن و ئەوەبو ئەویش لەشەری شوعەیبەدا رووبەرووی ئینگلیز بوەوە کە لەشکری عوسمانلی لەو شەرەدا شکا و شێخ مەحمود بریندار کرا و گەڕایەوە جارێکی تریش لەسەر خواستی عوسمانلی‌یەکان لەلایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە مەترسی ئەوە هەبوە کە رووسەکان شاری سلێمانی داگیر بکەن و وەکو ناوچەکانی تری داگیرکراو ئەویش وێران و تالآن بکەن، لەبەر ئەو دوو هۆیە لەشکرێکی کۆکردەوە و سەرچاوەکان لەو رووەوە هەموو باسی ئەوە ئەکەن چۆن شێخ مەحمودتوانیبوی بەربەستی هێرشی رووسەکان بکا......

ئەو دوو بەشداربوونەی شێخ مەحمود زەمینەیەکی پتەوی تازەیان بۆ شێخ مەحمود خۆش کرد کە بتوانێت جێگەی شێخ سەعیدی باوکی بگرێتەوە و خەڵکی زۆر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و خەلکیش رێزێکی زۆری لی‌بگرن و کە عوسمانلی‌یەکان لە رۆژانی دوایی شەری یەکەمی جیهانی‌دا لە ناوچەکەدا هەرەسیان هێنا و ئینگلیزەکان بون بە داگیرکەر و دەسەڵاتداری ناوچەکە، ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان وەکو سەرکردیەکی دەس‌رۆیوی ناوچەکە ئەدا لەقەلەم و کە هاتنە ناوچەکەوە کەسی تری لەویان کارامەتر و لی‌هاتووتر نەبینی کە پێوەندی پێوە بکەن بۆیە شێخ مەحمودیان کرد بە حوکمدار.

هەندێ لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکە، بە تایبەتی ئەوانەیان کە بە ئاشکرا دژی شێخان بوون و دەستیان هەبوو لە پیلانی ئاوارەکردنی شێخ سەعیددا لەگەڵ ئەو بازرگانانەی کە هەمیشە حسابیان بۆ بازار وبازرگانیەکەی خۆیان کردوە، جارێکی تر خۆیان لە هەڵوێستی تازەدا بینی، جاران کە عوسمانلی ریزی لە شێخان ئەگرت، وائیمرۆش ئینگلیزی دەس‌رۆیو ریز لە شێخ مەحمود ئەگرێ و بۆ سوودی خۆی ئەیەوێ بە سەرکردایەتی ئەو قایل بن لە ناوچەکەدا هەتا ئەو کاتەی جێ پێی‌خۆیان ئەچەسپێنن و لەوە دڵنیا ئەبن کە ئیتر تورکەکان توانای ئەوەیان نامێنێت بگەرێنەوە ئەو ناوچەیە...

وەکو وتمان ئەو جۆرە، بە فیوداڵ و بە بازرگانەوە هەمیشە حسابیان بۆ سوود و

بەرژەوەندی خۆیان کردوە... تا عوسمانلی مابوو چوبوونە پاڵ کۆمەڵی ئیتحاد و تەرەقی تاکو ئامانجەکانی خۆیان لە رێگەی ئەوە وەدەس بێنن، کە ئینگلیز هات و ریزی لە شێخ مەحمود گرت ئەوانە هەندێکیان خۆیان بێدەنگ کرد و هەندێکیان لە ژێرەوە کنەیان ئەکرد و هەندێکیان سلێمانی‌یان بەجێ‌هێشت بە ئومێدی ئەوەی گۆرانێکی تازە دێتە کایەوە، هەر کە زانیان ئینگلیز لە شێخ مەحمود وەرگەراوەتەوە و شێخ گلۆلەی کەوتۆتە لێژی ئیتر وردە وردە جەوهەری ئەوانە دەرکەوت و بەئاشکرا و بەنهێنی بوون بە لایەنگیری ئینگلیز تەنها بۆ ئەوەی لە شێخ مەحمود رزگاریان بێت.

دووبارەی ئەکەمەوە کە رەنگە واهەبێ ئەو جۆرە بازرگانانە (لەگەڵ هەندێ سەرۆک عەشیرەتدا هاوکاربوون) بە چینێکی پێشکەوتووتر دابنێت لەوەی کە لایان وابوە شێخ مەحمود نوێنەری بەشێک لە چینی فیوداڵ بوە...

بۆ وەرامی ئەوە: جاری ئەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە ئەو بازرگان و پارەدارانە وەکو لە باسی چینەکانیشدا لیٚ‌ی دواین، وەنەبێ وەکو چینێکی پی‌گەیشتوو گەیشتبنە ئەو قۆناغانەی هێز و دەسەلاتی چینی سەرمایەداریان هەبێت کە بتوانن لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا وەکو سەرمایەدارێکی نیشتمانی خۆیان بچەسپێنن و سوودی گەل و ولاتەکەش فەرامۆش نەکەن، بەلکو لە شێوەی وردە بورجوازی‌دا چارەنووسی خۆیان بەستبوو بە مانەوەی ئەو بێگانە دەسەلاتدارەی کە سوودی ئەوانی موسۆگەر ئەکرد وەکو (کۆمبرادۆر). ئینگلیزەکان ئەم راستیەیان زۆرباش ئەزانی و بەوپەری زیرەکی‌یەوە بەکاریان هێنابوون و توانیویان گیانێکی بێگانەپەرستی لەناو هەندێک لەوانەدا بەهێز بکەن و وایان لیٚ‌بکەن کە مان و نەمانیان ببەستنەوە بەمان و نەمانی ئینگلیزەکان لە کوردستاندا...

ئەورۆژانەی کە شێخ مەحمود بە خەباتێکی سەخت و تێکۆشانێکی بی‌وچان لەگەڵ هاوکارەکانیدا ئینگلیزی ناچارکردبوو بۆ رواڵەت‌دان بە هەندێ مافی کوردا بنێت و وەکو تاکتیکێکی تایبەتی بۆ گەیشتن بە ستراتیژی خۆی و زۆرکەسی بۆژۆکردبوو کە ئینگلیز یەکێک لە مەبەستەکانی ئەوەیە کە کورد سەربەخۆبێت وەکو ئەگێرنەوە...... ئەلێن لەگێژاوی ئەورۆژانەدا کە هەندێک لە

بازرگانەکان مەترسی ئەوەیان لیٚ نیشتبوو کە ئینگلیز بەجیٚیان ئەهیٚلیٚت یەکیٚکیان لەناو کۆمەلیٚک خەلْکدا تاتیانەبیٚ هاوار ئەکا و ئەلیٚ:

(کورە خەلْکینە ئەلیٚن وا ئینگلیز ناچارە ئیستقلال بدات بە کورد...... ئینگلیز کافر و مالْسە کە بریاری شتیٚکی دا ئەیباتەسەر و ئیستقلال ئەدا بە کورد. فریای خۆتان بکەون هەتا زووە چیتان هەیە ئەوی بە بار سووک و بە نرخ گرانە بیٚ پیٚچنەوە و بارکەن و برۆن با لەو ئیستقلالە رزگارتان بیٚت).

ئینگلیزەکانیش زۆلٚ و زیرەک بوون، دەمیٚک بوو بەو بازرگانەیان وتبوو: باشە ئەگەر کورد ئیستقلالی وەرگرت ئەی ئیٚوە توتنەکانتان بۆ کویٚ ئەبەن؟ ئەوە بوو ژمارەیەک لەو بازرگانانە باریان کرد و هەندیٚکیان چوونە کەوکوک و بەغدا، هەندیٚکی تریشیان بەملاولەولادا بلاْوبوونەوە هەتا ئینگلیز دلْنیای کردنەوە ئەوسا هاتنەوە.

# ٥- شێخ مەحمود

بەر لە شێخ مەحمود باسی شێخ مارفی نۆدێ و کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ سەعیدی حەفید و شێخ مارف و شێخ مستەفای نەقیبمان کرد وەلەباسی شێخ سەعیددا باسی ئەوەمان کرد کە لەدوای کوشتنی شێخ سەعید ئیتر شێخ مەحمودی کوری توانی ببێت بە جێگری باوکی چ لە رووی ئایینی و چ لە رووی سیاسیەوە، کە ساتێک شەری جیهانی یەکەمیش روویدا شێخ مەحمود توانی ئەو بۆشای‌یە پرپکاتەوە کە بە لاوازبوونی عوسمانلی لە ناوچەکەدا پەیدابوو و شێخ مەحمودی ئازا و چاونەترس و بزێو کەوتە هەوای ئەوەی لە بەشێک لە نیشتمانەکەیدا دەوڵەتێک دامەزرێنێت کە لەژێر ئالای ئەو دەوڵەتەدا هەوڵیدا کوردیش وەکو میللەتانی تر لە سنووری خاکی نیشتمانەکەیدا بە ئاسوودەی و شادمانی بژی.

بەلام بە داخەوە رووداوەکانی ئەو رۆژانە و دوارۆژ هیچیان لەگەڵ شێخ مەحمود و لەگەڵ کوردا نەبوون، بەڵکو سوود و بەرژەوەندی ئینگلیزی داگیرکەری بەهێز و دەسەلاتدار و دەوڵەمەند، بەفێل و درۆ و کەڵەک و تەلەکەبازیان بەرامبەر بە کورد بریارێکی ئێجگار سەخت و تالی بەسەر خواروی کوردستاندا سەپاند و میللەتی کوردی کلۆڵی چارەرەشی لە باوەشی حکومەتی عوسمانلی و تورک هێنایە دەر و خستیە باوشی رەگەزپەرستێکی تر کە رۆژ لە دوای رۆژ کورد لە ژێر بالی ئەشکەنجە و ئازاریدا ئەنالێت.

ژیانی شێخ مەحمود باسێکی دوورودرێژە و ناتوانین هەمووی لەم چەند لاپەرەیەی ئەم بەشەدا باسی بکەین تەنها هەوڵ ئەدەین لەم بەشەدا لە سەرەتای لە دایک بوونیەوە هەتا سەرەتای شەری یەکەمی جیهانی باسی ژیانی بکەین و بەشەکانی تری کە بریتی‌یە لە باسی ژیانی سیاسی شێخ مەحمود لەگەڵ رووداوەکانی رۆژانەدا و لەگەڵ هەڵوێست و بەسەرهاتەکانی ناو کوردستاندا خۆیان ئەنوێنن و باسیان ئەکەین.

دەربارەی لە دایک بوونی شێخ مەحمود لە شاری سلێمانیدا هەموو لە سەر ئەوەن کە لە سلێمانی لە گەڕەکی کانێسکان لە دایک بوە و ئامینەخانی دایکی لە بنەماڵەی بابارەسول بوە.

دەربارەی سالی لە دایک بوونی، نوری ثابت (حبزبوز) «٢٨» لەو گفتوگۆیەی لەگەڵ شێخ مەحمووددا کردویتی ئەلێ: شێخ مەحمود خۆی وتویەتی لە سالی ١٣٠٢ھ کە بەرامبەری ١٨٨٤م ئەکا لە دایک بوە، بەلاّم شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبە عەرەبیەکەیدا (الشيخ معروف النودهي) لە لاپەرە (٢٠٠)دا ئەلێ: شێخ مەحمود لە سالی ١٢٩٨ھ لە دایک بوە کە ئەکاتە سالی ١٨٨١م کە ئەویش ئەلێ هەر لە خۆیم بیستوە.

زیوەر لە گەنجینەی مەرداندا «١٣» لە لاپەرە (١٢٩) دا ئەلێ: شێخ مەحمود لە سالی ١٣٠٠ھ لە دایک بوە کە ئەکاتە ١٨٨٢-١٨٨٣م.

راپۆرتەکەی قونسولی بەریتانی لە موسل کە لە کارەساتەکەی موسلدا بە دووروودرێژی باسمان کرد کە لە مانگی کانوونی دوهەمی سالی ١٩٠٩دا ناردویتی ئەلێ تەمەنی شێخ مەحمود (٢٣) سالە بەپێ‌ی ئەو راپۆرتە ئەبێ شێخ مەحمود لە ١٩٠٩-٢٣=١٨٨٦م دا لە دایک بوە کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی حبزبوز و شێخ محەمەدی خاڵ و زێوەر باسیان کردوە لەگەڵ هیچیان یەکناگرێتەوە و جیاوازی‌یەکی ئاشکرا هەیە لە ساڵی دایک بوونی شێخ مەحمووددا لەو سەرچاوانەدا. هەرچەند هەندێ لە هۆی ئەو جیاوازی‌یانە ئەگەڕێتەوە بۆ فەرقی نێوانی سالی میلادی و هیجریدا.

مامۆستا زیوەر لەگەنجینەی مەرداندا ئەلێ: (کە شێخ مەحمود تەمەنی گەیشتە شەش حەوت سالأن لای مامۆستای تایبەتی دەرسی قورئان و هەندێ کتێبی خوێندوە، ئەوسا لە سلێمانیدا هەریەک قوتابخانە هەبوە (دیارە نیازی قوتابخانەی رشدی بوە کە دیارە شێخ مەحمود لەو قوتابخانەیەدا نەی‌خوێندوە)، خوێندنی ئەو رۆژانە بە فارسی و تورکی بوو کە ساتێک شێخ مەحمود پێ‌گەیشت حکومەتی عوسمانلی دەسەلأتی نەمابوو، حکومەت هەر بەناو هەبوو، مأمورانی ئەو سەردەمە خۆیان خستە پاڵ شێخ مەحمود بۆ ئەوەی لە دەرکردن بیانپارێزێت و خەڵکی ناوشاری سلێمانی وردە وردە بوون بە لایەنگیری شێخ و

ئەویش دریغی نەدەکرد لە پاراستنیان لە دەسدریژی زۆردار و عەشایر، بە تایبەتی عەشایری هەمەوەند کە ئەو سەردەمە دەسەلاتیان زۆربوو، جگە لەوە شیخ لەگەلْ عەشایری دەوروپشتیدا پیوەندی پەیداکرد و ناوبانگی بلاو بوەوە و دەسەلاتداران دیاری و خەلات و بەراتیان بۆ ئەنارد).

شیخ مەحمود دوو ژنی هیناوە، یەکەم بەهیەخانی کچی ئەمینی عەتار بوە کە لە پیشدا ژنی شیخ مستەفا نەقیبی مامی بوە و مندالی لە شیخ مستەفا نەبوە، کە شیخ مستەفا کۆچی دوایی کرد شیخ مەحمود بەهیەخانی مارەکردوە کە شیخ رەئوف و شیخ باباعەلی و حەلاوەخانی لیبوە.

دوهەم ژنی شیخ مەحمود ئایشەخانی کچی شیخ مارفی مامی بوە، ئایشەخان لە پیشدا ژنی شیخ ئەحمەدی برای شیخ مەحمود بوە (شیخ جەلال لە شیخ ئەحمەد و ئایشەخان بوە)، لە دوای کوشتنی شیخ ئەحمەد لە کارەساتەکەی موسل، شیخ مەحمود ئایشەخانی مارەکردوە و تەنها شیخ لەتیفی لیبوە.

شیخ محەمەدی خالْ ئەلی: شیخ مەحمود بە مندالی لای زیوەر ئەفەندی فیری خویندن بوە، بەلام وەکو مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش لە پیشەکی یاداشتەکانی زیوەردا«[١٣]» روونی کردۆتەوە، مامۆستا رۆژبەیانیش لە باسەکەیدا هەروای بۆچوە، شتیکی نەگونجاوە کە زیوەر مامۆستای شیخ مەحمود بووبیت. زیوەر خۆی لە یاداشتەکانیدا ئەلی: شیخ مەحمود لە تەمەنی حەوت سالیدا لای مامۆستای تایبەتی دەرسی خویندوە (نەی ووتوە من دەرسم پیوتوە یا لای من خویندویەتی)، جگە لەوە تەمەنی زیوەر و شیخ مەحمود (٩) سالیان جیاوازبوە، کەواتە شیخ مەحمود کە لەتەمەنی (٧) سالیدا چووبیتە قوتابخانەی تایبەتی ئەبی زیوەر ئەوسا تەمەتی (١٦) سالْ بووبیت کەجیی گومانە مرۆڤ لە و تەمەنەدا بووبیت بە مامۆستای قوتابخانەی تایبەتی. راستیەکەی ئەوەیە(کەمن لە کاتی خۆیدا لە دەمی پیرەمیردی شاعیر و تەوفیق وەهبیم بیستوە کە شیخ مەحمود لای خواجا ئەفەندی باوکی ئەحمەد خواجا خویندویەتی (کە خواجا ئەفەندی و پیرەمیردی شاعیریش هەردووکیان لای مەلا سەعیدی زلزلەیی لە مزگەوتی (حاجی حان... یا حاجی ئەحان) خویندویانە، لەگەلْ ئەوەشدا دوورنیە ئەو جیاوازیەی تەمەنی زیوەر و شیخ مەحمود کە (٩) سالْ بوە وای لە زیوەر

کردبێت کە بە ماوەیەک بەر لە شێخ مەحمود خوێندویەتی و بەرلەو بوە بە خوێندەوار و شێخ مەحمود سوودی لە زیوەر وەرگرتبێت بەڵام نەک وەکو مامۆستایەک لە قوتابخانەیەکی تایبەتیدا بەڵکو وەکو هاورێیەک یا دۆست و ناسیاوێک کە ئەوسا بە هۆی شێخ سەعیدەوە زۆرکەس خۆیان لە شێخان نزیک کردۆتەوە کە بێگومان زیوەر یەکێک بوە لەوانە.

هەر ئەو دۆستایەتی و هاورێیەتی و ناسیاویەتی بوە کە ساتێک شێخ مەحمود لەگەڵ شێخ سەعیدی باوکیدا چوە بۆ ئەستەمبوڵ لەسەر دەعوەتی سوڵتان عەبدولحەمید، شێخ مەحمود زیوەریشی لەگەڵ خۆیدا بردوە وەکو زیوەر خۆی لە یاداشتەکانیدا ئەڵێ: شێخ مەحمود ئیلتفاتی لەگەڵمندا هەبوو بە هۆی ئەوە منیش ئەو سەفەرەم کرد.

شێخ مەحمود جگە لە کوردی بەتورکی و فارسی و عەرەبیش دەرسی خوێندوە، زمانی تورکی لەو سەردەمانەی لاوێتی ئەودا زمانی رەسمی حکومەتی عوسمانلی بوە کەکاروباری رۆژانەی رەسمی پێبراوە بەرێوە و لە دائرەکاندا بەکارهێنراوە، زمانی فارسیش وەکو زمانێکی ئەدەبی زمانی باوبوە لەو رۆژانەدا کە خوێندەواران و شاعیران هەموو پێویستیان بە زانینی زمانی فارسی بوە و شارەزای شاعیرە بەناوبانگەکانی فارس بون وەکو فیردەوسی و حافزی شیرازی و سەعدی و کلیمی هەمەدانی و قاٲانی و بیدل و گەلێکی تر و زۆر لە شاعیرەکانمان بە فارسی شیعریان وتوە یا شیعری فارسییان کردوە بە پێنج خشتەکی و یا شیعری فارسییان تێهەڵکێشی شیعری کوردی خۆیان کردوە......
نامەکانی کاک ئەحمەدی شێخ بە فارسی کە مامۆستا عەبدولکەریمی مودەرس بڵاوی کردونەتەوە لەگەڵ نامە و شیعری شاعیرانیتر دەری ئەخەن کە لە دوای رووخاندنی ئەمارەتی بابان بەدواوە زمانی فارسی زمانی نووسین و ئەدەب بوە ئەگەرچی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی ئیمرۆمان قەرزاری ئەو رۆژانەی زەمانی بابانەکانە کە شاعیرانی وەکو نالی و سالم و مەحوی و گەلێکی تر ئەو سامانانەی خۆیان بە کوردی بۆ بەجێهێشتوین، جگە لەو تەقەلایەی کاک ئەحمەدی شێخ کە بە کوردی دەرسی بە قوتابیەکانی وتۆتەوە وەکو لەو رەخنە و چەند شیعری حاجی قادری کۆییدا دەرئەکەوێ کە لە پێشتریشدا باسمان کرد.

بە هۆی دۆستێکمەوە فۆتۆکۆپی‌ی (١٣) نامەی شێخ مەحمودم لە (سەقز)ەوە وەدەسکەوت کە بە ئیمزای شێخ مەحمود لە نێوانی سالأتی ١٩٢٢ هەتا سالی ١٩٤٧ لەلایەن شێخ مەحمودەوە نیرراون بۆ شێخ عەبدولقادری جەنەدەرە کە لە هەندێکیاندا ئەلیٰ شێخ عەبدولقادری جنت‌درە وەلەهەندێکیدا ئەلیٰ سەید عەبدولقادر جەنەدەرە یا شێخ عەبدولقادر ئەفەندی جنت‌دەرە یەک دوو کاغەز لەوانە بەدەسخەتی (مەلا کاکە حەمە) نووسراون و شێخ ئیمزای کردون (مەلا کاکە حەمە هەتا دەوری لاوێتی ئێمەش لە چوارتا ئیمام و مودەرسی مزگەوتی چوارتا بوو) ئەوانی تر خەتی خۆیەتی و هەندێکی بە فارسی‌یە و هەندێکی بە کوردی (بە داخەوە بۆم روون نەبوەوە ئەو عەبدولقادری درەجەنە کیٚبوە!). وا لە پاشکۆی ئەم بەرگەدا فۆتۆکۆپی چوار نامە لەو نامانە بلأو ئەکەینەوە کە نامەی یەکەم لە ٧/مارت/.١٣٤ بە فارسی نووسراوە و بەناوی (مەلکی کوردستان)ەوە ئیمزای کردوە.

نامەی دوهەم بە کوردی نوسراوە بەلأم لە خەتی خۆی ناچێت کە بە مێژووی ١٩٤١/١٢/٢١ ناردوێتی، کە دیارە پاش گەرانەوەی دوای هەرای رەشید عالی ناردوێتی بەلأم خۆی ئیمزای کردوە. نامەی سیٚهەم بە فارسی نوسراوە لە ١٩٤٢/٥/٢٤دا نیردراوە بۆ شێخ عەبدولقادر.

نامەی چوارەم بە فارسی نووسراوە و لە ١٩٤٧/٤/٣دا نیردراوە بۆ هەمان شێخ عەبدولقادر. بێگومان شێخ لە سەرەتای خوێندنیدا سوودی لە (ئەحمەدی)یەکەی شێخ مارفی باپیرەگەورەی ورگرتوە و ئەو هەموو نوسراو و کتێبانەی کە لە شێخ مارف و کاک ئەحمەد و زەمانی شێخ سەعیدەوە لە کتێبەخانەکەی مزگەوتی گەورەدا مابوونەوە سەرچاوە بوون بۆ ئەو زۆرکەسی تر، هەرچەند شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا ئەلیٚ کە شێخ مەحمود گیرا لە دەربەندی بازیاندا و مێجرسۆن هاتەوە بۆ سلێمانی ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و دەسخەت کە وەختی خۆی لای شێخ مەحمود بوە هەمووی سوتاندوە و لەناوی بردوە.

شێخ مەحمود جگە لەوەی کە سەرکردیەکی سیاسی بوە، شان بە شانی ئەوەش حەزی لە شیعر و ئەدەب کردوە و ریزی لە شاعیر و نووسەران گرتوە و مێملی

گاڵتە و گەپ بوە و لە دانیشتەکانیدا بەشداری گاڵتە و گەپ و قسەی نەستەق کردوە و حەزی لە قسەی خۆش و گۆرانی خۆش کردوە و ریزی لە دەنگ خۆش گرتوە، یەکێکی وەکو (رەشۆڵ)ی دەنگخۆش هەتا شەری ئاوباریک لە خزمەت شێخدابوە و لیٚی جیا نەبۆتەوە. لە دوای هەرای رەشید عالی سالی ١٩٤١ کە شێخ لە پێشدا گەرایەوە بۆ (سیتەک) و لەدواییدا لە گوندی (داریکەلی) بۆ ئیجگاری نیشتەجیٚ بوو، زۆر لە شاعیران و دەنگخۆش و خاوەنی قسەی نەستەق ئەچوونە خزمەتی و ژمارەیەکی ئیٚجگار زۆر شیعری فارسی و کوردی لەبەر بوو. بەندەش وەکو دۆستێکی شێخ لەتیفی کوری لە سالانی ١٩٥٢-١٩٥٦دا چەند جارێک لەگەڵ شێخ لەتیف دا چوومە خزمەتی شێخ مەحمود لە (داریکەلی) و لە نزیکەوە بە خزمەتی شادبوم و جاروبار بیرەوەری خۆی کە لە هەندستان بوە لەگەڵ شێخ حەمە غەریبی زاوایدا و بۆ کوێت و بەغدا و لە وێوە بۆ کوردستان ئەگێرایەوە...... بیرم دیٚ جارێکیان فەرمووی تا لە هەندستان بوین کە شوێنێکی زۆر گەرم و رتوبەتاوی بوو شێخ حەمە غەریب زوو لەشی تێک ئەچوو کۆلنجی ئەکرد و تووره ئەبوو، ئەیووت: شێخ مەحمود هەستە بمشێلە من ئەگەر بە هۆی تۆوە نەبوایە چی وای لیٚئەکردم دەربەدەری ئەم وڵاتەبم.

جارێکی تریش فەرمووی کە گەیشتینە بەغدا و چاوم بە مەلک فەیسەل و مەندوبی سامی کەوت، مەندوبی سامی لەبەرچاوی فەیسەل پیٚی ووتم: وائەم جارەش ئەگەریٚیتەوە بۆ کوردستان و ئومیٚد ئەکەین ئەوەی جاران رووی دابوو جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە و بۆ یارمەتیدانت موستەشارێکت بۆ دائەنیٚین......

کە لیٚم پرسی ئەرکی سەرشانی من چیە و هی موستەشار چیە لە وەرامدا بۆم دەرکەوت لە زۆر شتدا دەست و پیٚبەست ئەبم، منیش کردمە گاڵتە و پیٚم ووتن: جا باشە من بکەن بە موستەشار و ئەو موستەشارەی کە ئەیٚنیٚرن ئەو بکەن بە حوکمدار...

زۆرکەس لە دوژمنانی شێخ مەحمود هەولی ئەوەیان داوە رووپۆشێکی پەست و تارێک بدەن بە روخساری شێخ مەحموددا و هەرکەسە بە جۆرێک و بۆ مەبەستێک ئەو پروپاگاندانەیان بلاٚوکردۆتەوە، ئینگلیزەکان و ئەوانەی سەر بە

ئینگلیز بوون ئەو پروپاگاندانەیان بۆ ئەوە بوە پاکانە بکەن بۆ ئینگلیز و لەو هەڵوێست و رەفتارە نارێکەیان بەرامبەر بە شێخ مەحمود و بەرامبەر بە کورد و کوردستان نواندویانە و کردویانە و بۆ بەرژەوەندی و سوودی تایبەتی خۆیان لە بەڵێنەکانیان پاشگەز بوونەوە و هەولیان داوە بیانووی سەرنەگرتنی دەوڵەتەکەی شێخ مەحمود هەمووی بخەنە ئەستۆی شێخ مەحمودەوە و بڵاویان ئەکردەوە ئەگەر شێخ مەحمود نەبوایە ئینگلیز کوردستانێکی سەربەخۆی دروست ئەکرد و ئەگەر شێخ مەحمود بەربەرەکانی ئینگلیزی نەکردایە کورد و خوارووی کوردستان بەو جۆرەی لێ‌نەدەهات کە بە زۆرەملی بلکێنرێت بە عێراقەوە.

ناحەزانی شێخ مەحمود بلاویان ئەکردەوە کە شێخ مەحمود زۆر وشکە ئاییندار بوە و دەمارگیریی ئایینی وای لێ‌کردوە کە زۆر دەرفەتی لە خۆی و لە کورد لەکیس داوە و وایان بڵاوئەکردەوە کە وشکە ئایینیەکەی شێخ بە جۆرێک بوە کە ئەگەر بە ناچاریێ هەندێ جار تەوقەی لەگەڵ ئینگلیزێکدا کردبێت دەم و دەست چوە دەستی شتوە بۆ ئەوەی گلاوی دەستی پاک بکاتەوە...

لە راستیدا ئەو پروپاگاندە و درۆ و دەڵەسانە وەنەبێ تەنها هەر دوژمنەکانی شێخ مەحمود بلاویان کردبێتەوە بەلکو هەندێ وشکە مەلا و شێخە رووتەڵ و دەست و پێوەندی هەلپەرستیش بۆ سوودی خۆیان ئەوەندەی تریان ئەنایە سەر ئەو پروپاگاندانەی دوژمن کە شێخ مەحمود دوژمنی غەیرە دین بوە و حەزی لە چارەی کەس نەکردوە کە موسولمان نەبووبێت.

یەکێکی وەکو مێجرسۆن و ئەدمۆندز و ویلسن لە کتێب و یاداشتەکانیاندا و لە راپۆرتە نەهێنیەکانیاندا هەمیشە شێخ مەحمودیان وەکو پیاوێکی کەللە رەقی دوژمن بە (غەیرە دین) ئەدایە قەلەم کە لە شوێنی خۆیدا بەرپەرچی ئەو درۆ و دەلەسانە ئەدرێتەوە و لێرەدا دوو بەڵگەی ئاشکرا و زەق ئەخەینە بەرچاوی خوێندەواران بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو پروپاگاندانە یەکێک لەوانە ئەوەیە کە ساتێک شێخ مەحمود بۆ جاری دوهەم بوو بە حوکمدار و دەوڵەتەکەی دامەزراند و هەیئەتی وەزیرانی دانا لەناو ئەوانەدا (خواجا کەریمی عەلەکە)ی کرد بە وەزیری دارایی خۆی کە کریستیان بوو. بەڵگەی دوهەم ئەوەیە، لەگەڵ ئەو هەموو درۆ و دەلەسانەی ئەوسا کە ئینگلیزەکان بلاویان ئەکردەوە کە

بۆلشەڤیکەکانی وڵاتی سۆڤیەت خەڵکی ئایندارییان پان ئەکردەوە و دژی هەموو خواناسێک بوون و درۆ و دەلەسەی وایان بڵاوئەکردەوە کە پیاو لە وڵاتی بۆلشەڤیکدا فەرقی ژن و خوشک ناکا و ژیانی وڵاتی سۆڤیەت وەکو تەگە و بەران وایە و بەرەللایە، لەگەڵ ئەو هەموو پروپاگاندانەی کە دژی شۆرشگێرەکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری سالی ۱۹۱۷ بلاوکرایەوە، شێخ مەحمود گوێی نەدابوە هەمووی و نامەی بۆ ناردبون وەکو لە حوکمدارێتی دوهەمی شێخ مەحموددا باسی ئەکەین و شێخ ئەو شۆرشگێرانەی بە رزگارکەری میللەتان داناوە و داوای یارمەتی لێ‌کردون بۆ کورد.

ستیڤن مساعدی پروفیسۆر لە جامعەیەکی ئەمریکا «٥٧» لە کتێبەکەیدا دەربارەی شێخ مەحمود ئەلێ:

(شێخ مەحمود خۆی زۆر بە گەورەتر ئەزانی لەوەی کە وەک سەرەک عەشیرەتێک حیسابی بۆ بکرێت. بەلکو حکومەتێکی دروست کرد لە هەشت ئەندام، پوولی تایبەتی خۆی هەبوو، گومرگی هەبوو باجی دانا بۆ دەرامەتی دەولەتەکەی، (ئۆرگان- رۆژنامەی) خۆی هەبوو و کە زمانی حالی حکومەتەکەی بوو، ساتێک کە شێخ مەحمود دەسەلاتی هەبوو زۆربەی عەشایرەکانی کوردی ئەو ناوچەیە لەگەلیدا بوون، بەلام وەکو یاسا و رەوشت و سروشتی عەشایری، کە شێخ مەحمود توشی نوشوستی و نەهامەتی هات ئەو عەشیرەتانە یەکە یەکە وردە وردە لێی ئەکینەوە بە هاندانی ئینگلیزەکان).

ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان باش ناسیبوو، ئەیانزانی ئەو پیاوە نیە کە بە دەهۆڵ و زورنای ئەوان هەڵپەرێت، ئەوان شێخ مەحمودیان ئەویست وەکو بابەکری سەلیم ئاغا و شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم و هەندێکی تر پیاوی خۆیان بێت. شێخ مەحمودیش ئینگلیزی باش ناسیبوو کە خۆیان لە میللەتان کردبوو بە فریشتەی رزگارکەر و وایان بڵاوئەکردەوە کە ئەیانەوێ میللەتە چەوسێنراوەکانی ژێر دەستی عوسمانلی رزگار بکەن، رووی دووهەمیان ئەو رووە راستیە بوو کە بە دوو چنگی خوێناوی‌یەوە و بێ بەزەیی فرۆکەکانیان ئەنارده سەر شار و گوندەکانی کوردستان و ژن و مندال و پیری بێ‌تاوان و بێ دەرەتانیان پێ‌قەلاچۆ ئەکرد کە جەواهیرلال نەهرۆ لە کتێبەکەیدا باسی

تاوانباریی ئینگلیزی کردوە بە رامبەر بە کورد.
یەکێکی وەکو ئەدمۆندز ئەو ڕوە راستەی خۆی و ئینگلیزەکانی تر ناشارێتەوە و لە کتێبەکەیدا بە ئاشکرا ئەلێ خۆم هەندێ جار لەناو ئەو فرۆکانەدا بووم کە هەندێ شوێنی کوردستانیان بوردمان ئەکرد و لە هەندێ جارا خەفەتی ئەوەی خواردبوو کە بۆردمانی ئەو رۆژەیان کاریگەر نەبوە و تەنها دوکەڵ هەڵساوە کە بلێسەی ئاگری بە دوادا نەهاتوە.
ستیڤن لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا ئەلێ: (شێخ مەحمود بۆیە لە ئینگلیزەکان هەڵگەرایەوە چونکە ئەیویست پیاوی ئەوان نەبێت، بەڵکو ئەیویست پیاوی خۆی و میللەتەکەی بێ).
مامۆستا رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا ئەلێ:«٢» (بلیمەتی شێخ مەحمود لە مندالی‌یەوە دەرکەوتبوو، ناوبانگی بەناو دێهات و عەشیرەتەکانی کوردا بلاوبوبوەوە، لەبەر ئەوە لەسەرەتاوە بە بزێوی و گورجی و ئازایی هاتبوە پێشەوە، لەناوبانگ و شۆرەتی باو و باپیر و خانەوادەکەی زۆر کەڵکی وەرگرتوە و سوودمەندبوە و گەیشتۆتە پلەیەکی بەرزی سەرکردایەتی، شێخ مەحمود وردە وردە هاتە ناوەوە و هەتا لە دنیای سیاسەتیشدا کەم و زۆر ناسرا و ناوی کەوتە سەرزمان. هێشتا لاوێکی تازە پێ‌گەیشتوو بوو کە جارێک چوو بە گژ عەشیرەتی گەورەی جاف‌دا، جارێکیش بەگژ عەشیرەتی هەرە دڕ و ئازای هەمەوەند (لە شوێنی خۆیدا لە پێوەندی بنەماڵەی شێخان و عەشیرەتەکاندا لەوانە ئەدوێن). بە کورتی چ لە رووی ئازایی و چ لە رووی لەشکرگێری و بە هۆی دەسەلاتی ئایینی باو و باپیریەوە دەسەلاتی دنیایی و ئایینی شێخ مەحمود هەتا ئەهات لە پەرەسەندنا بوو، ئەستێرەی بەختی رۆژبەرۆژ لە بلندی و بەرز بوونەوە دابوو).
جگە لەوەی کە مامۆستا رەفیق حیلمی باسی کردوە و جگە لەو دەسەلاتەی کە شێخ مەحمود لە هەردوو حوکمداریەتەکەیدا هەیبوە، وەنەبێ دوورەپەرێزیش بووبێت لەو رووداو و هەلوێستە دەولەتیانەی کە پێوەندی‌یان بە ناوچەکەوە هەبوە، بەشداری کردن لەشەری شوعەیبە دژی ئینگلیزەکان و بەشداری کردنی لە ناوچەی پێنجوین و مەریوان‌دا دژی لەشکری روسیای قەیسەری نیشانەی ئەو

راستیەیە.

شێخ قادر لە یاداشتەکانیدا وەکو مامۆستا رۆژبەیانی باسی کردوە«٢٧» باسی پێوەندی شێخ مەحمود و مینۆرسکی بەم جۆرە تۆمارکردوە:

(کە ساتێک هەرا لە نێوانی دەوڵەتی عوسمانلی و ئێراندا لەسەر کێشەی سنوور روویدا (ئەو کێشەیە لەو رۆژانەدا بوە کە بەریتانیا و فەرەنسا و روسیا خەریکی سەرەتای نەخشەکێشان و گفتوگۆ و ئامادەکردنی پەیمانی سایکي پیکو بوون)، تاقمێکی ناوبژیکەر لە نوێنەرانی ئینگلیز و فەرەنسا و رووس هاتنە سەرسنووری ئێران و عوسمانلی بۆ دەس‌نیشانکردنی هێڵی سەرسنوور. ئەو ناوبژیکەرانە بە میوانی ئەچنە سلێمانی (وەکو مینۆرسکی خۆشی باسی کردوە ئەو نوێنەری رووس بوە لەو لیژنەیەدا و وای نیشان داوە کە ئەو لیژنەیە لە سالی ١٩١٣دا چوە بۆ سەرسنوور)«٥٢»... شێخ مەحمود بە نهێنی خۆی ئەگەیەنێتە لای ئەو لیژنەیە و ئەوانیش پێ‌ی‌ئەڵێن: ئێرە جێگەی گفتوگۆکردن نیە، ئێمە خۆمان دێ‌ینەماڵەوە بۆلات و لە دواییدا شێخ مەحمود نوێنەرانی ئەو لیژنەیە ئەبینێت و پێ‌یان ئەڵێ: یارمەتیم بدەن با حکومەتی عوسمانلی لەم ناوچەیە دەرکەم. ویلسن (دیارە نوێنەری بەریتانیا بوە لەو لیژنەیەدا) بە شێخ مەحمود ئەڵێ: بریاری بەشکردنی ناوچەکە دراوە، عێراق (میسوپوتامیا) بەر ئینگلیز کەوتوە، سوریە بۆ فەرەنسا، جەزائر بۆ ئیتالیا (شێخ قادر لەوەدا بەهەڵە داچوە چونکە جەزائریش بۆ فەرەنسا بوە) ولایەتی موسلیش وادیارە بەر رووس کەوتوە (ئەوەی ویلسن ئەگەر راست بوو‌بێت بەو جۆرەی ووتبێت وادیارە هێشتا پەیمانی سایکس بیکویە تەواوی گەلاڵە نەکراوە چونکە پەیمانی سایکس بیکو باسی ئەوەی نەکردوە کە ولایەتی موسل بدرێ بە رووس بەلکو رۆژهەلاتی تورکیا (کوردستانی رۆژهەلات) دانرابوو بۆ روسیا و ولایەتی موسلیش بۆ فەرەنسا دانرابوو لە دواییدا ئینگلیزەکان بۆخۆیان مسۆگەریان کرد)، لەبەر ئەوە ویلسن بە شێخ مەحمود ئەڵێ تۆ ئەبێ داوای یارمەتی لە رووس بکەی......

مینۆرسکیش بە شێخ مەحمود ئەڵێ: من ئەگەڕێمەوە بۆ ئێران، لە کرمانشاه لە دەوروبەری ماڵی (داود خانی کەلهور) کەبابخانەیەک دائەنێم (کە ئەمەش بە ئاسانی ناچێتە مێشکەوە کە مینۆرسکی‌یەکی ناسراو کەبابخانە دابنێت و نەخۆی

و نەهیچ سەرچاوەیەک لە باسی مینۆرسکیدا لە شتیوا نەدواون)، کە گەرامەوە با باوەڕپێکراوەکەت بێت بۆ کرمانشان و لەوێ چەک و جبەخانەی ئەدەینێ و ئێوەش دەس بە شەری خۆتان بکەن لەگەڵ عوسمانلیدا.

شێخ مەحمود بۆخۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی چەکدار ئەچێتە ناوچەی سورداش لەو کاتەدا متەسەرفی سلێمانی بەیرام فەهمی (تۆ بڵێی ئەو بەیرام فەهمییە هەر ئەوە بووبێ کە مامۆستا رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا باسی ئەکا کە دۆستی شێخ مارفی نەقیب بوە و داوای لێخۆشبوونی شێخ مەحمودی لە ئەستەمبول وەرگرتبێ دوای کوشتنی باوکی بەها ئەفەندی وەکو لە گەرانەوەی شێخ مەحمودا دوای کارەساتەکەی موسل باسمان کرد؟)، ئەنێرێت بە شوێن شێخ مەحموددا و پێی ئەلێ: لەسەر داخوازی و فەرمانی دەوڵەتی عوسمانلی پێویستە دەم و دەست لەشکرێک کۆکەیتەوە بۆ غەزا دژی ئینگلیز لە خوارووی عێراقدا...... شێخ قادر ئەلێ: بێگومان مەبەستی تورکەکان لەوەدا ئەوەبوە کە شێخ مەحمود لە کوردستان دووربخەنەوە نەوەکو شۆرشێک بەرپا بکات لە کوردستاندا و جگە لەوەش ویستیان سوود لە هێزی کوردەکان وەربگرن لەو شەرەدا دژی بەریتانیا. شێخ مەحمود بەرلەوەی بەخۆی و لەشکرەکەیەوە رووبکاتە خوارووی عێراق بۆ بەشداری کردنی شەر، ویستی دەم و دووی رووسەکان تاقی بکاتەوە و بۆ ئەوە عەبدوللا ئاغای حاجی حەمە سەعید (خەلکی سلێمانی) ئەنێرێ بۆ کرمانشاه بۆ ئەو مەبەستە و عەبدوللا ئاغا لە ماڵی داودخانی کەلهور دائەبەزێت و بە نهێنی وەکو شێخ قادر ئەلی لەگەڵ مینۆرسکیی خاوەن کەبابخانەدا کۆئەبێتەوە و داوای بەجێهێنانی بەڵێنەکانی لێئەکات دەربارەی یارمەتیدانی کورد (مینۆرسکی سیاسی و مێژووناس و شارەزای کورد لە ساڵی ١٨٧٧دا لە ژووروی مۆسکۆ لەدایک بوە و لە ساڵی ١٩٦٦دا لە لەندەن کۆچی دوایي کردوە)، مینۆرسکی لە وەرامی ئەوەدا بە عەبدوللا ئاغای نوێنەری شێخ مەحمود ئەلێ: لەپێشدا بریار وابوو کە ولایەتی موسل بەر رووس بکەوێ بەلاَم ئەو بریارە تێکچوو چونکە ئینگلیزەکان ولایەتی موسلیان قۆزتەوە (لەراستیدا هەتا ئەو سەردەمەش ئەگەر مینۆرسکی راست بووبێ ئەوەی ووتبێت، لەگفتوگۆکانی پەیمانی سایکس بیکودا هەتا کۆتایی

هاتنی شەری یەکەم ولایەتی موسل هەر بۆ فەرەنسا بوە، بەلاّم لە دواییدا کە رووسی سۆڤێتی لە پەیمانی سایکس بیکۆ خۆی کێشایەوە ئیتر ئینگلیز ترسی ئەوەی نەما کە ببێت بە دراوسێی رووس بۆیە ولایەتی موسلی لەدەس فەرەنسیەکان دەرهێنا)، ئێستا ئینگلیز ئەوا لە بەسرە شەری دامەزراندوە دژی عوسمانلی و هێزی ئێمە لە (قەزوین)ە، نیازمان وایە ئێمەش لە خانەقینەوە بگەینە بەعقوبە، بۆیە ئەبێ داوای یارمەتی لە ئینگلیز بکەن.

بەو جۆرە عەبدوللا ئاغا بە نائومێدی ئەگەرێتەوە و هەندێک یارمەتی چەک و پارەی ئەداتێ و داودخانی کەلهوریش دیاری ئەنێرێ بۆ شێخ مەحمود (شێخ باباعەلی شێخ مەحمود ئەلێ شتێکم لەبیرماوە دەربارەی ئەو دیاریەی ئیبراهیم خانی کەلهور کە لای باوکم مابوو کە بریتی بوو لە شێرێک).

باسی پێوەندی شێخ مەحمود و مینۆرسکی بەو جۆرەی کە شێخ قادر باسی کردوە ئەگەر بەو جۆرەبێت ئەوە باسێکی تازە بیستراوە و هەتا هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی نەکردوە.

مینۆرسکی خۆی لە کتێبەکەیدا (کورد) «٥٢» بە هیچ جۆرێک باسی ئەو پێوەندیەی نەکردوە کە شێخ مەحمود یا عەبدوللا ئاغای نوێنەری شێخ مەحمودی دی‌بێت لە سلێمانی یاخود لە کرمانشاە.

زیوەر لە یاداشتەکانیدا «١٣» باسی جۆرە پێوەندیەکی تری شێخ مەحمودی کردوە لەگەڵ رووسەکاندا کە ئەوە دوای گەرانەوەی بوە لەشەری شوعەیبەدا و لەو رۆژانەدا بوە کە رووسەکان گەیشتنە ناوچەی مەریوان و خەڵکی ئەو ناوچەیە (هەروەها لە خانەقینیش رووسەکان تاوانێکی زۆریان کردبوو لە خەڵکی ئەو ناوچەیە و کە چوونە رەواندوزیش لەوێ تالاّنی و کوشتاری رووسەکان ناوی رووسی ئیجگار بەدناو کرد بۆ لای کورد) تووشی زیانێکی زۆر بوون و شێخ مەحمود بە خۆی و لەشکریەوە رووبەرووی لەشکری رووس وەستا بۆ ئەوەی رێگەی ئەوەیان لێ‌بگرێت کە بچنە ناو شاری سلێمانیەوە و وەکو خانەقین و ناوچەی رەواندوز و مەریوان کوشتار بکەن و تالاّنی بکەن. زیوەر ئەلێ لەو رۆژانەدا رووسەکان کاغزیان نارد بۆ شێخ مەحمود و شێرێکیان بە خەلاّت بۆ نارد و بەڵێنی زۆرشتی تریان دا بە شێخ مەحمود بە مەرجێک لەو شەرەدا

بەشدار نەبێت، بەلاّم شێخ مەحمود ئاینەکەی ڕێگەی ئەوەی نەدا باوەر بە رووسەکان بکات (کە ئەمەی زیوەر لەگەڵ ئەوەی شێخ قادر یەک ناگرێتەوە).

دوکتۆر کەمال مەزهەری پسپۆر و شارەزای ئارشیفەکانی سۆڤیەت دەربارەی کورد لە کتێبەکەیدا- کوردستان لە ساڵەکانی شەری جیهانی‌دا «٧» دەربارەی مینۆرسکی ئەلێ:

(فەرماندەی سوپای رووس لە قەفقاس بە دڵێکی خۆشەوە پێشنیارەکانی مینۆرسکی وەرگرت و سەر مەشقی بۆ هەندێک لەکاربەدەستان و لێ‌پرسراوانی ئەو ناوچانە دانا بۆ ئەوەی لەگەڵ دەسەلاتداران و دەسرۆیوەکانی کوردا لە یەکتری بگەن و ئەم لەیەک گەیشتنە لەگەڵ زۆر کەسدا دەستی پێکرد کە شێخ مەحمود سەر ئامادەیان بۆ هەروەها لە نێوان شێخ مەحمود و قونسولی رووس لە بەغدا (ئەرلوف) و قونسولی رووس لە موسل (گیرسانوف) پێوەندی هەبوە).

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا «٢١» باسی ئەو پێوەندی‌یەی کورد و رووس کردوە کە لە باسی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردا لێ‌ی ئەدوێ‌ین.

حوسێن حوزنی مۆکریانی لەو یاداشتانەی‌دا کە بەدەسخەتی خۆی لە ساڵی ١٩٣٤دا نووسیوێتی- لە گۆڤاری رۆشنبیری کورد لە بەغدا ژمارە ١٢. ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨ باسی کردوە و ئەلێ: رۆژی جومعەی ١٩٤٣/٩/٢٩ مینۆرسکی هاتە سلێمانی و بوو بە میوانی ئەحمەد بەگی تەوفیق بەگ و لە ماڵی ئەحمەد بەگ چوومەلای مینۆرسکی و پێکەوە چوینە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی کە رەشید کابان مودیری مەعارف بوو، مینۆرسکی لیستەی قوتابخانەکان و قوتابیانی لە رەشید کابان وەرگرت. فایق بێکەس و مەحمود جەودەت و حاجی تەوفیق بەگ (پیرەمێرد) و شێخ سەلام کۆبوونەوە و مینۆرسکی هەریەکەیان غەزەلێکی فارسی لێ‌پرسین کە خۆی بە فارسی نووسیبویەوە).

لام وایە مینۆرسکی ئەو جۆرە پێوەندیەی کە شێخ قادر باسی کردوە لەگەڵ شێخ مەحموددا ئەگەر شتی وابووبێت یەکێکی وەکو حوسێن حوزنی بروا ناکەم بەسەریا تێپەری بکردایە و لەوێدا باسی نەکردایە...

ئەگەر بە چاوێکی بێلایەنیەوە سەیری شێخ مەحمود و خەباتی شێخ مەحمود و شۆڕشەکانی بکەین وابزانم لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ کەموکوری هەبوە و وەکو زۆر لە نووسەرانی شارەزای ئەو سەردەمە وەکو رەفیق حیلمی و ئەحمەد تەقیٚ کە هەردووکیان بە جووتە رەخنەیان لە شێخ مەحمود گرتوە، بەلاٚم وابزانم ئەبیٚ بەکێش و پێوانەی ئەو سەردەمە هەڵیانسەنگێنن و نابیٚ ئەوەمان لەبیر بچێت کە بەر لە هەموو شتێک شێخ مەحمود لە بنەمالەیەکی ئاینی بوە و ناوبانگی لەو رێگەیەوە بەناو خەڵکدا بلاٚوبۆتەوە و خەڵکێکی زۆر لە سایەی بروا و ئاینیدا لەو بنەماڵەیە و لە شێخ مەحمود نزیک بوونەتەوە و پشتیگیریان کردوە و لەو رۆژانەدا هەستی دین بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ بوە و هەستی نەتەوایەتی ئێجگار ساوا بوە و تازە چەکەرەی کردوە و جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت لەو رۆشنبیر و خوێندەواری ئەو سەردەمە کە هەستی نیشتمانیان تیادا بە هێز بوە و بە هۆی رۆژنامەو گۆڤارو هاتوچۆکردن و بوونیان لە ئەستەمبوڵ و پێوەندی‌یان بە خوێندەوار و رۆشنبیری بێگانە شتێک دەربارەی سەربەستی و ئازادی و نیشتمان پەروەری و سەربەخۆیی فێربوون، زۆربەی خەڵکی تر هێشتا لە گێژاوی خەو و خەیالی دوارۆژی بەهەشت و دۆزەخ و قیامەتدا وورێنەیان ئەکرد و هێشتا بڕواکردن بە نوشتە و دوعا و پەتی لەرزوتا و بە کەراماتی شێخ و ئەولیا و گوللەبەند و بەدەم و نەفەسی پاک و ناوچەوانی نوورانی شێخ و مەشایەخ لەق نەبوبو، گرمەی تەپڵ و خرنگەی ئەلقەی دەفی ناوکۆڕی تەکیە و خانەقاکان زاڵ بوون و دەنگ نەبوو و بتوانیٚ ژوور ئەو دەنگانە بکەویٚ، لەبەر ئەوەی زۆربەی میللەتی کورد لە شارستانێتی و خوێندەواری‌دا هێشتا وەکو منداڵێکی شیرەخۆرە وابوە و لە شیری گوانی ئاینکاری و لە ئاوی پیرۆزی پاشماوەی دەسنوێژشتنی هەندیٚ شێخ بەولاوە هەرچێکی تری دەرخوارد بدرایە هێلنجی ئەدا و ئەرشایەوە، لەبەر ئەوە تەقەلا و هەڵپەی تاکە تاکەی رۆشنبیرانی ئەو رۆژانە و پەلەقاژەی هەندێکیان بۆ بلاٚوکردنەوەی زانیاری و باسکردنی خولانەوەی زەوی و مانگ و باسی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی و ئازادی و سەربەستی کە ئەمانە هەمووی بەگەراو میکرۆب و هەوێنی کفر و ئیلحادی مونەوەرەکان کە بە (فەرمەسۆن) ناو ئەبران کارێکی ئاسان نەبوو چەند کەسێکی وەکو جەمال عیرفان کە ئەو

ئالأیەیان هەڵکردبوو بە هێزی چەند کەسێکی نەزانەوە کوژران و شێخ مەحمودیش لەوناوەدا تیامابوو نەی‌ئەتوانی بە ئاسانی خۆی لەو کۆت و زنجیرەی ئەو رۆژانە دوور بخاتەوە و نەی‌ئەتوانی بە ئاشکرا ببێت بە لایەنگیرانی ئەو (مونەوەرانە) و بە ئاسانی دەس بەرداری ئەوانەش بێت کە لە رێگەی ئاینەوە ئامادەبوون سەرومالی خۆیان فیدا بکەن.

بەو جۆرە شێخ مەحمود لەو دووریانەی ئەورۆژەدا کە بەسەر هەڵدێرێکی هەزار بە هەزارا ئەیروانی و نەی‌ئەتوانی لەنگەری دەسەلأت و حوکمداریەتەکەی رابگریٚ و ناڵەباریی رۆژگارو هەڵکەوتی چەوتی کوردستان کە هەموو شارەزایانی سیاسەت بە (ماساتێکی جیوپۆلتیک)ی دائەنێن. جگە لەکەم تەجروبەیی شێخ مەحمود لە دنیای سیاسەت و راوەرێوی و تەڵەکەبازیی دەوڵەتان ئەمانە هەموویان وایان لە شێخ کردبوو کە نەتوانیٚ خۆی لەو گێژاوە دەرباز بکا و ئەوانەی کە لە دەوری شێخ مەحمود کۆبوونەوە ئەوانەی کە دڵسۆزی راستی بوون و شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبوو ئەو مەلەوانە نەبوون کە بتوانن بە سەولی لێکدانەوەی ورد و دووربینی کەشتی‌ی دەوڵەتەکە بگەیەننە کەناری رزگاربوون و لەو گێژاوە سەختەی ئەو رۆژانە دەربازی بکەن ئەگەرچی میللەتی کورد ئێستەش هەر لەژێر ئەو بارە ناڵەبارەدا ئەناڵێنیت و بەداخەوە ئەو هەموو کوێرەوەری و دەردی سەریانەی جاران نەبوە بە پەند و بە دەرس بۆمان کە راستەی رێگەی ئازادی و سەربەستی بدۆزینەوە و ئەگەر وەکو ئەڵێن شێخ مەحمود ئەوسا کەم تەجروبە بوە لە دنیای سیاسەتدا خۆ ئیمرۆ سیاسەتمەداری کورد سەدان تاقی کردنەوەیان دیوە کە ئەبوایە لەهەر یەکێک دەرسێک وەربگیرایە.

لێرەدا با یادی ئەو رۆژانە بکەینەوە کە هەندیٚ لە دەنگخۆشەکان، چ بە گۆرانی و چ بە سروود گۆرانیان بەسەر شێخ مەحمود و بەسەر شۆرشەکانیدا ئەووت... لەبیرم دیٚ لەسەرەتای چلەکاندا بۆ ماوەیەک قوتابی بووم لە بەغدا لەبەری کەرخ نزیکی گازینۆی بیروتی کابرایەکی پیری سەروسنگ و ریش سپی لەژێر داری (نەبک)یکی گەورەدا بەرەبابە جارویار بە عەرەبی گۆرانی‌ی بەسەر شێخ مەحمودا ئەووت (ئەبو رئوف) ئەو پیاوە ناوی عگار بوو باسی ئازایەتی و مەردایەتی شێخ مەحمودی ئەکرد لە شۆرشەکاندا.

هەروەها لە کاتی لاوێتی و منداڵیمان بە قەوان گوێمان لە دەنگەخۆشەکەی (کاوێس ئاغا) ئەبوو کە بە لاوک گۆرانی بەسەر شێخ مەحمود هەڵدابوو، لەم رۆژانەدا بەکاسێت ئەو گۆرانیەم دەست کەوتەوە وابۆ یادگار و بۆ یادی ئەو قارەمانە شۆرشگێرەی کورد ئەو گۆرانیە لێرەدا بڵاوئەکەمەوە:

دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ
دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ...... هۆهۆ شێخی زراف

دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ...... بەهارە بسەری سلێمانیا کەتیە
محەلێ شەران وێلا لە عاسمان خۆش دێ گرینی تەیاران و
شرقینی مەترەلۆزان، رەقینی بۆمبا و شینی وان ترومبێلا
گازەگازی نۆ بەدارا
بەلێ شاهۆ...... شەهیدی شێخ مەحمود...... کاکی شێخ قادر...... بابی لەتیف
گەلە گەلە...... بە هەرسێ دەنگان گازدەکا، کەریمی فەتاح بەگ،
گەلی عەگیدان...... ئەورۆ دەست هەڵێنانەکی بکەن
چ گۆ دەست و دەمە داری جامبیزارێ، بکرم شاری

دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ
دەلۆی لۆ...... دەلۆی لۆ...... هۆهۆ شێخی منۆ

## پێوەندی بنەماڵەی شێخان لەگەڵ
## عەشایری ناوچەکە و لەگەڵ خەلکی سلێمانیدا

باسی پێوەندی شێخان لەگەڵ عەشایرەکانی خوارووی کوردستاندا بە شێوەیەکی گشتی و لەگەڵ عەشایری ناوچەی سلێمانی و دانیشتوانی شاری سلێمانی بە شێوەیەکی تایبەتی شتێکی زۆر پێویستە بۆ ئەم باسە، چونکە ساتێک شێخ مەحمود بوو بە حوکمدار و دەسەلاتدار و بە ناچاری ڕوویەڕووی ئینگلیز بوەوە و بە زۆر شەری بەسەرا سەپێنرا و دەستی کرد بە خەبات دژی داگیرکەر، هەر لە ئەشکەوتەکاتی جاسەندوە هەتا ناوچەی پێنجوێن و دەشتی شارەزور و قەرەداغ و گەرمیان هەتا ئاوباریک پێوەندی شێخ لەو ڕۆژە ناسکانەدا لەگەڵ عەشایر و خەلکی ناوشار ڕەنگی دابوەوە و ئەو نارێکیەی کە لە نێوان شێخ مەحمود و ئەوانەدا هەبوە و ئینگلیز ئەوەندەی تر ئاگری ئەو نارێکیەی خۆش کردوە، ئەمانە ڕۆلێکی زۆر گەورە و سەرەکی‌یان بینیوە بۆ لاسەنگی و بارخواری ئەو دام و دەزگایەی کە شێخ مەحمود و هاوکارەکانی دایان مەزراندبوو بە ئومێدی ئەوەی ببێتە بنکەیەکی بە هێز و پتەو بۆ دروست بوونی کۆمەڵگایەکی سەربەست و ئازاد لە خوارووی کوردستاندا بە هیوای ئەوەی ئەو بەشە رزگاربوو ئازادبوە لەگەڵ دەستە خوشکەکانی تریا کە لەدوا ڕۆژدا ئازاد ئەبن، هەموویەک ئەگرن و میللەتی کوردیش وەکو میللەتە بەختەوەرەکانی تر لەژێر ئالای ئاشتی و ئازادی و سەربەخۆییدا ئەژی.

یەکێک لەو دەردە هەرە کوشندە جەرگبڕانەی کە تووشی میللەتی کورد بوە و لە کۆنەوە هەتا ئێستا لەژێر باریا ئەنالێنین و دوژمنانی کورد زۆرباش ئاگاداری ئەو دەرد و نەخۆشیەی کورد بون و بە ئارەزوی خۆیان بەناو ئەو هەموو کەلێن و دەلاقە زلانەی کە بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە لە لەشی کورد و ولاتەکەماندا پەیدابوە ئەو دوژمنانە بە ئارەزوی خۆیان هاتوچۆیان کردوە و بارەها مەلۆتکەی

ئاواتی کوردیان لە منداڵدانی دایکی نیشتماندا لەبار بردوە کە ئەویش بریتی‌یە لە نەخۆشی خێڵایەتی کە بە داخەوە نەک هەر شێخ مەحمود بەڵکو لەدوای ئەویش زۆری وەکو سمایلخانی سمکۆ و قازی محەمەد و مستەفا بارزانی‌ی تێکۆشەر نەیان توانیوە چارەسەری بکەن و بەسەریدا زاڵ بن. ئەو نەخۆشی‌یە هەروەکو شێرپەنجە هەر جارەی بە جۆرێک و بە رەنگێک خۆی ئەنوێنێت و هەموو جارێک لە ئەنجامدا کورد تووشی هەرەس‌هێنان و رۆچوون و ماڵکاولی ئەبێت و هەموو جارێکیش کە خەباتێکی تازە دەست پی‌ئەکرێتەوە هەمان کارەسات و ماڵوێرانی رووئەداتەوە وەبەبێ ئەوەی جارێک لە جاران دەرس لە رابردوومان وەربگرین.

تاقی‌کردنەوەی جارەهای جار و تاڵی و سوێری و کوێرەوەری ئەو هەموو دەردی‌سەریانەی کە بەسەر کوردا هاتوە، مەگەر یەکێک خۆی لی‌گێل بکات ئەگینا سوور ئەزانێت جگە لە باڵی رەشی کۆنەپەرستی و وشکە ئاینی ئەو سەردەمە و کەم دەرامەتی و دواکەوتن لە رووی رۆشنبیری و خوێندەواری و نەشارەزابون لە سیاسەت و لە باری دەوڵەتان ئەمانە هەمووی بوونەتە سەرباری دەردەسەریەکەی کورد کە بریتی بوە کە هەستی خێڵایەتی و دەمارگیری و کەللەرەقێتی عەشایری و خۆگێل کردن لەو راستیە بریتیە لە خۆ خەلەتاندن و خۆ لە خشتەبردن چونکە سوور ئەزانرێ سەرۆک عەشیرەتی هیچ وڵاتێک ئەگەر لە خەباتی میللەتەکەیدا بۆ مەبەستێک یا بە ناچاری لە قۆناغێکدا بەشداری بکا، ئەوا زۆرکەم جار ئەو بەشداری‌یەی هەتا سەر ئەبێت و لەهەر قوناغێکدا کە زانی و هەستی پێکرد سوود و پەرژەوەندی خۆی کەوتۆتە مەترسی‌یەوە ئیتر گێڕی گۆریوە و سوود و پەرژەوەندی خستۆتە بەر لە هەمووشتێک ، زۆرجار ئامادە بوە لەگەڵ دوژمنی میللەت و نیشتمانەکەشیدا رێک بکەوێ هەر تەنها بۆ ئەوەی خۆی تووشی زیان نەبێت.

بەڵێ راستە سەرۆک عەشیرەتی واهەبوە لەناو کوردەواریدا هەتا ماوە لە ژیاندا خۆی بۆ خەباتی میللەتەکەی و بۆ سەرکەوتنی شۆرشەکەی تەرخان کردوە و بە بست لەو مەبەستە لای نەداوە و هەتا مردن دوورنەکەوتۆتەوە لە

میللەتەکەی لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە لە هەندێ هەڵوێستی خێڵایەتیدا بۆ سەرگرتنی ئەو بۆچوونە خێڵایەتیەی هەندێ زیانیشی دابێ و ئاگری خێڵایەتی خۆش کردبێت، بەڵام قەت نەچۆتە ڕیزی دوژمنانی میللەتەکەیەوە.

بۆ نموونە بارزانیەکان لەگەڵ ئەوەشدا وەکو شێوە عەشیرەتێک لە ڕێچکەی خێڵایەتی خۆی لای‌نەداوە و پێوەندی ناوخۆیان بریتی بوە لە هەمان پێوەندی جارانیان و بەهەمان چاویلکەی خێڵایەتی سەیری عەشیرەتەکانی تریان کردوە کە زۆرجار ئەم هەڵوێستە زیانێکی گەورەی بە خۆی گەیاندوە و شۆڕشی کوردیشی تیا زەرەرمەند بوە و ئەتوانرا ئەو زەرەرە و زیانە بەربەست بکرێ ئەگەر کێش و پێوانەی عەشایرێتی بخرایەتە لاوە...... بەڵام لەگەڵ ئەو کەم و کوریەشدا هێشتا لە بزوتنەوەی میللەتی کوردا عەشیرەتێکی وەکو بارزانی ڕووی نەداوە کە بە درێژایی ئەم هەموو ساڵانە هەمیشە وەکو سەربازێکی لە خۆبوردو ماڵوێران کراوە و ئاوارە و دەربەدەرکراوە و بە هەزارانیان لێ شەهید بوە و کوژراوە، هەزاران پەت پەتێنیان دیوە، هەر لە بۆردومانی زەمانی ئینگلیزەوە هەتا بەشداری کردن لە کۆماری مەهابادا و پەڕینەوە لە ئاوی ئاراس و گەڕانەوە بۆ کوردستان و خەباتی چەکدارانی بێ‌ووچان هەتا ئەمڕۆ کۆڵیان نەداوە، بەڵام تاکە نموونەیەک و تاکە شتێک نابێ بکرێ بە نموونەی هەموو شتێک و ئەگەر میللەتی کورد و پێشڕەوی پارتە سیاسیەکان و خەباتکەران بیانەوێ لەو دەردە کوشندەیە ڕزگاریان ببێت پێویستە ئەو ڕاستیە ببێت بە مەبەستێکی سەرەکی و هەوڵ بدرێت ئەو نەخۆشیە بنەبڕ بکرێت و بۆ ئەوە کورد پێویستی بە گۆڕینێکی تەواو هەیە لە عەقلیەت و لێکدانەوەیدا و ئەو توێژەی کە وەکو کاژ لەدەوری لەشی کوردا ئاڵاوە پێویستە داماڵرێ و سەرەتایەکی تازە لەسەر بناغەیەکی پتەو بۆ میللەتەکەمان دابنرێت کە نەک هەر تەنها چەکی ناو سەنگەرەکان بە هەموو شتێک دابنێت وەکو جارەها ئەبیسترا کە ئەوترا (تەنها چەکی ناوسەنگەرەکان بریار لەسەر هەموو شتێک ئەدەن و چارەنووسی دوارۆژی میللەتەکەمان دەس‌نیشان ئەکەن...... بەلکو پێویستە حیساب بۆ چەکی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنیش بکرێت. بەلێ ڕاستە خەباتی چەکدارانە شتێکی سەرەکی‌یە لە

ڕێڕەوی خەباتی هەموو میللەتێکدا بەڵام وابزانم چەکێکی کاریگەری تریش هەیە کە هەتا ئێستا پشتگوێ خراوە ئەویش چەکی ڕۆشنبیری و چەکی ڕاگەیاندن و چەکی پێوەندی کردنە لەگەڵ هەمولایەکدا کە بتوانرێ وای لێ بکرێ سەیری کورد وەکو دۆستێک بکات نەک وەکو کرێگرتەیەک.

ڕەنگە هەبێ کە بڵێ ئەمانە هەمووی ڕاستن بەڵام هەموویان هەر ئاواتی نووسین و سەرکاغەزن و هێنانە دیی ئەو ئاواتانە بە نووسین و بە قەڵەم نایەتە دی... بەدان پیانانی هەندێ لەسەرکردەی پارتەکانمان، دوای ئەوەی کە بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو پێکهات، دانیان بەوەدا ناوە کە خەڵک لەو ڕۆژەوە ڕێز لە کورد و لە کێشەی کورد ئەگرێ کە پارتەکانی لەناوخۆیاندا یەکیان گرتوە...... مژدەیەکی خۆشە...... بەڵام بە داخەوە بۆمان دەرکەوت کە ئێمە لە کاتی لاوازیدا و لە دوای هەرەس هێنان و ڕۆچوون و دۆڕاندن بیر لەیەکگرتن ئەکەینەوە و ئەو ڕۆژانەی کە خۆمان بە بەهێز ئەزانین هەر لایە لەسەر ئاوازێک ئەخوێنێت...... ئومێدەوارین ئەم ڕاستیەیان لەبەرچاوبێ و ڕێگە نەدرێ کەس بە ڕێگا سەختەکەی جاراندا بڕواتەوە. ئەم هەموو داخ و زووخاو هەڵڕشتنە بۆ ئەوەیە کە بڵێم ئەو سەردەمەی شێخ مەحمود کە پۆیەی نارێکی نێوان عەشیرەتەکانی کورد و کۆستە کۆستەی هەر عەشیرەتێک بە جیا بۆخۆی سەری لە کورد و لە شێخ مەحمودیش تێکدابوو، شێخیش بەو دەست و بردیە و دوای ئەو هەموو برسێتی و ڕەش و ڕووتیەی کە لە کوردستاندا بە هۆی شەڕی جیهانی‌یەوە بڵاوبوبوەوە نەی‌توانی ئەو ئەرکە قورسەی کە کەوتبوە سەرشانی بە تەواوی بەجێ بهێنێت و ئەو دەسمایە و پارە زۆرەشی نەبوە کە بەریەرەکانی ئینگلیزی پێ بکا بۆ دەمکوت کردن و دەمچەورکردنی ئەو سەرۆک عەشیرەتە کوردانەی دەمیان لیکی ئەکرد بۆ لیرە و بۆ بانقەنوتی ئینگلیز.

دەربارەی بنەماڵەی شێخان، ئەگەرچی وەکو عەشیرەتێک حیسابیان بۆ ناکرێت چونکە عەشیرت نەبوون و هەندێکیان بە هۆی ئەو هەل و دەرفەتانەی بۆیان ڕەخسابوو توانیبویان ببن بە فیوداڵێکی خاوەن زەوی و زار و پارەدار و خاوەن دوکان و خاوەن قەیسەری و هەندی کەسی هەڵکەوتوویان توانیویان لە دوای

روخاندنی ئەمارەتی بابانەوە ئەو بۆشاییە پربکەنەوە کە بابانەکان بەجێیان هێشتبوو، وەلەدوای روخاندنی دەوڵەتی عوسمانلی و لاوازبوونی هێزەکانیان لە خوارووی کوردستاندا شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەکی سیاسی هاتەپێشەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ رەوشت و یاسای کۆنی ئەو سەردەمە وەکو لە پێشتریشدا باسمان کردن، تارادەیەک شێخ مەحمودیان دەست و پێ بەست کردبوو وەنەیتوانی بە ئاسانی لەو کۆت و زنجیرە خۆی دەربازبکا و پاڵ بە کۆمەڵگاکەوە بنێت کە هێشتا رۆلی ووشکەرویی ئاینی و دەمارگیری و عەنعەنایتی کۆن و کەللەرەقی و هیوای گەرانەوەی سوڵتانی عوسمانلی کە بە نوێنەر و پارێزەری ئیسلام دانرابوو ئەمانە هەمووی شتێکی ئاسان نەبوو و شێخ مەحمودیش وەکو وتمان خاوەنی تاقیکردنەوەیەکی سیاسی نەبوە و ئەوانەش کە لە دەوری گردبوبونەوە زۆربەیان فەریک و خام بون و سوودیان لە تاقیکردنەوەی میللەتانی تر وەرنەگرتبوو، بە ئاشکرا زەمانە و رووداوەکانی ناوچەکەش لەگەڵ کورد و شێخ دانەبووە، بەلاْم لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود توانیبوی بەشێک لە ئەلقەکانی ئەو کوت و زنجیرە بپسێنیت و هەندێ گرێ کوێرەی کردەوە و، بۆ دەوڵەتێکی زەبەلاحی سەرمایەداری ئەو رۆژە کە بەریتانیا بوو روونی کردەوە کە ئەو نۆکەر و بەکرێگیراوە نەبوە کە ئەوان بۆی ئەگەران و لە ئەنجامی دەرکەوتنی ئەو راستیەدا ئینگلیز ناچارکرا بە حیسابە کۆنەکانیدا بچێتەوە و ئەگەرچی بۆ رواڵە تیش بووبێت لە هەندێ هەڵوێستی پاشگەز بۆتەوە و حسابێکی تری تازەی بۆ راپەرین و شۆرشی شێخ مەحمود کردوە و هەموو دۆکیومێنتە نهێنیەکانی ئینگلیز دانیان بەوەداناوە کە شێخ مەحمود ئەو پیاوە نەبوە کە ئەوان مەبەستیان بوە بۆیە نەیان توانیوە بیخەنە لیستەی پیاوەکانی تریانەوە وەکو کاپتن بابەکر (بابەکری سەلیم ئاغا) و (شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرم) و ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی تر کە هەر کاتێک ئارەزویان بکردایە ئەیان هێنایە ژێر بارو رکێفی خۆیانەوە.

کاربەدەستانی ئینگلیز بۆیان دەرکەوتبوو ژیلەمۆی ئاگری سەرەتای ئەو راپەرین و شۆرشەی شێخ مەحمود لە سالی ١٩١٨-١٩١٩دا لە ناوچەی سلێمانیدا

هەڵی‌گیرساندبوو هەروا بە ئاسانی نابێ بە خوڵەمێش بۆیە ناچاربوون شێخیان لە ساڵی ١٩٢٢دا لە هیندستانەوە هێنایەوە بۆ کوردستان بە ئومێدی ئەوەی ئەم جارە لە ڕێبازی ئەوان لاناداو هەتا ئەوکاتەی مەبەستەکانی خۆیان دێتە دی و شێخ مەحمود ئەکەن بە گژ تورکدا و لە دوای ئەوە هەر ئەو حیسابەیان بۆ ئەکرد کە لە پێشەوە بڕیاریان دابوو ئەویش نەمانی شێخ مەحمود بوو لەگەڵ بەستنی کوردستان بە عێراقەوە.

چ ئەدمۆندز و چ ویلسن لە باسەکانیاندا ئەڵێن کە شێخ مەحمود هێنرایەوە و لە بەغدا گفتوگۆی لەگەڵدا کرا، دوورنەبوو ئەوکاتە تەنها بە حوکمدارێتی ناوچەی سلێمانی قایل بووبێت...... بەڵام هەرکە گەیشتە کنگربان و هەوا ساف و خاوێنەکەی کوردستانی هەڵمژی ئیتر کەوتەوە خولیاکەی جارانی بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە هەموو خوارووی کوردستاندا و ئەو شێخ مەحمودە نەبووە کە ئێمە ئەمان ویست بەو جۆرەی ئێمە ئەمانەوێ ڕەفتاربکات...

ڕاستە لە زەمانی شێخ مەحمود چ بە هۆی هەڵە و سەرچڵی و نەبوونی تاقی کردنەوەیەکی سیاسی‌یەوە بووبێت وەکو هەندێکەس ڕەخنەیان لێ‌گرتوە، یاخود بە هۆی گیرەشێوێنی و ناکامی و نەشارەزایی دەستە و دایەرەکەیەوە بووبێت، لەمانە گلەیی و ڕەخنە لە هەمووی بوە و هەیە، بەڵام دوبارە وابزانم شتێکی ڕاست نیە کە وەکو لە شوێنی تریشدا باسمان کردوە، هەڵوێست و ڕووداوی شەست حەفتا ساڵ لەمەوبەر بە کێش و پێوانەی ئیمڕۆ هەڵسەنگێنین و داوا لە شێخ مەحمود بکرێ کە وەکو شۆڕشگێڕ و خەباتکەرێکی ئەم سەردەمە ڕەفتاری بکردایەوبوترێ ئەبوایە شێخ مەحمود خەباتی چینایەتی بکردایە و بەوە تاوانبار بکرێ کە شێخ مەحمود شۆڕشگێڕ نەبوە چونکە مەرجەکانی شۆڕشگێڕێتی بەپێ‌ی کێش و پێوانە و بۆچوون و لێکدانەوەی ئیمڕۆی تیادا نەبوە...... ئەبێ ئاخۆ لە دوارۆژدا بە مانەی ئیمڕۆ چی بوترێ و بەکام کێش و پێوانە هەڵسەنگێنرێن؟...... وا ئەوسا ئەوترا شێخ مەحمود سیاسی نەبوە و ڕاوێژکەری شارەزا و لێ‌هاتووی دڵسۆزی نەبوە، ئەی ئەم هەموو سیاستمەدار و ڕۆشنبیر و خاوەن دوکتۆرا و ماستەر ودیپلۆم و خوێندەوارە زۆرەی ئیمڕۆمان چین و بەچی

ناوئەبرێن؟؟

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیرەمێرد وتەنی (نائومێدی کفرە) و ئومێدەوارین رۆژێکیش بێت کورد بگات بە مافی خۆی و ئەو بەسەرهاتە سەخت و تاڵانەی کە ساڵەهایە بەسەر میللەتی کوردا دێت هەمووی تۆمار بکرێ بۆ وەچەی دوارۆژ.

وەکو لە پێشەوە لێی دواین والێرەوە دەس‌ئەکەین بە رونکردنەوە و باسی پێوەندی بنەماڵەی شێخان لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەی سلێمانی و دەور و بەریا جگە لە پێوەندی ئەو بنەماڵەیە لەگەڵ هەندێک لە بنەماڵەکانی سلێمانی بۆ ئەوەی ئاگاداری سنووور و رادەی ئەو پێوەندی‌یانە ببین و بزانین چەند کاریان کردۆتە سەر هەڵوێست و رووداوەکانی سەردەمی حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود.

شتێکی روون و ئاشکرایە ئەو ناکۆکیانەی لە نێوان بنەماڵەی شێخان و عەشایر و بنەماڵەکانی تردا لێیان ئەدوێین وەنەبێ لەناو عەشیرەتەکانی‌ترلەناو خۆیاندا نەبووبێت بەڵکو زۆرجار ناکوکی ئەوان لەناوخۆیاندا بە شێوەیەکی گشتی پتر بوە وەک ئەوەی لەگەڵ شێخان کە ئەوە باسێکی دوور و درێژە و لێرەدا لە مەبەستەکەمان دوورمان ئەخاتەوە.

## ١- پێوەندی لەگەڵ هەمەوەندەکاندا

مێژووی هەمەوەندەکان لە زەمانی عوسمانلیدا پڕە لە باسی شەڕی چەتەگەری لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانلیدا و جگە لەوە لەگەڵ عەشیرەتەکانی تریشدا ڕێک نەبوون. ناکۆکی نێوان جاف و هەمەوەند و شەڕەکانیان هەندێ فۆلکلۆری کوردی لێ پەیدابوبو.

هەمەوەند وەکو عەشیرەتێکی دڕی ئازا و چاونەترس سەرنجی هەندێک لە گەڕۆکەکانی بێگانەیان ڕاکێشابوو، وە بە عەشیرەتێکی دڕی شەڕکەر و ئازا و کۆڵنەدەر باسیان کراوە. باسیل نیکیتین لە کتێبەکەیدا «٣٨» باسی ئەوەی کردوە کە چۆن ژنە هەمەوەندەکان چەک هەڵگر بوون و شان بە شانی پیاوەکانیان چۆنەتە کۆڕی شەڕەوە.

کاربەدەستانی عوسمانلی تووشی گەلێک دەردیسەری و شەڕەشەق بوون لەو ناوچانەدا کە هەمەوەندی تیادا بوە و زۆرجار ڕێگای هاتوچۆکردنی کەرکوک و سلێمانیان بەستوە و جاروباریش ڕێی کەرکوک بۆ بەغدا یا سلێمانی بۆ بەغدایان خستۆتە مەترسییەوە و سەرانە و باجیان لە کاروانچی و بازرگانەکان سەندوە و حکومەتی عوسمانلی چەند جارێک ئەو هەمەوەندانەی ئاوارە کردوە، جارێک بۆ ناوچەی زەهاو و جارێک هەندێکیشیان ئاوارە کراوە بۆ ژووروی ئەفریقا بەڵام هەموو جارێک گەڕاونەوە ناوچەکەی خۆیان و خۆیان دامەزراندوە کە فەقێ قادری هەمەوەندی شاعیر یەکێک بوە لە وانەی ئاوارە کراوە بۆ ناوچەی لیبیا و لەوێ کۆچی دوایی کردوە و نێژراوە، (نالە پێپان) کە یەکەم کەس بوە لە ناو شاری سلێمانیدا بە دارا هەڵواسرێت لەو کاتانەدا کە تەوفیق بەگی تاپۆ ئاغاسی (لە بنەماڵەی قواس) مودیری پۆلیسی سلێمانی بوە ئەو نالە پێپانە هەمەوەند بوە.

کاک عەلی کەماڵ کە یەکێکە لە شارەزایانی ئەوڕۆژە و ئیمڕۆ تەمەنی خۆی داوە لە (٩٠) ساڵ و بەرەوژوورتر لە گفتوگۆیەک لەگەڵیدا باسی دڕی و ئازایی

چاونەترسی هەمەوەند بۆ کردم و ئەلیٚ کار لەو ریٚ و بانی کەرکوک و سلیٚمانیدا بە تایبەتی لە ناوچەی (بانی مەقان) دا ئەگەیشتە رادەیەک کە ریٚبوار بە ئاسانی بەو ناوەدا نەیئەتوانی گوزەر بکا و کاروانی بازرگانی ئەبوایە ژمارەیەک چەکدار ئامادە بکا هەتا لەو ناوچەیەدا لە هەمەوەندەکان بیپاریٚزیت و زۆر جار کاروانەکانی عوسمانلی کە بە ولاغ هاتوچۆیان کردوە ئەو کاروانانەشیان رووت ئەکردوە تا گەیشتە رادەیەک هەمەوەندکان نزیک بوونەوە لە دەس‌دریٚژی کردن بۆ سەر ناوچەی سلیٚمانی و بۆسەر گوندەکانی دەوروپشتی و کەساتیٚک خەلْکی سلیٚمانی بیستیانەوە هەمەوەندەکان خەریکن بیٚنە ناو سلیٚمانی‌یەوە بۆ تالاٚنی، ئەوانەی چەکدار بوون لەسەربانەکانی مالْەکانەوە خۆیان دامەزراند و شیٚخ مەحمود کە ئەویش چاونەترس و ئازا بوو فریای خەلْکی سلیٚمانی کەوت و بەرەنگاری هەمەوەندەکان بوەوە و نەی‌هیٚشت بیٚتە ناو شاری سلیٚمانی‌یەوە کە بەمە شیٚخ مەحمود لای خەلْک خۆشەویست بوو ریٚزیان لی‌ئەگرت.

میٚجرسۆن لە گەشتەکەی سالْی ۱۹۰۹ی دا لەو روەوە ئەلیٚ:«۳۹»

(کە ویستم لە کەرکوکەوە بچم بۆ سلیٚمانی ئەبوایە بە ناوچەی هەمەوەندکاندا تیٚپەرم بکردایە بۆ ئەوە هەر کاروانیٚک کە بەو ناوەدا تیٚپەری بکردایە ئەبوایە هیٚزیٚکی عەسکری لەگەلْدا بوایە بۆیە ئەو کاروانەی لەگەلْیا چوم بۆ سلیٚمانی هەر لەژیٚر سایەی هیٚزیٚکی عەسکری تورکدا توانی بگاتە سلیٚمانی).

لەو رۆژانەدا هەمەوەندەکان دەسەلاٚتیٚکی ئیٚجگار زۆریان هەبوە بەسەر ئەو ریٚگا و بانەدا و بازرگانەکان کە مالْی بازرگانیان ئەگواستەوە لە نیٚوانی شارەکانی بەغدا و سلیٚمانی و کەرکوک وکەرکوک و سلیٚمانی و موسلدا بە تەواوی لەو دەسدریٚژیانەی هەمەوەندیەکان بیٚزار بوبون و لای والی عوسمانلی لە بەغدا شکاتیان کردبوو ئەویش هیٚزیٚکی گەورەی ناردە سەر هەمەوەندەکان و ناچاریان کردن رەشمالْ و بار و بارگەیان بپیٚچنەوە و لەترسا خۆیان گەیاندە ناوچەی (شەرف بەیانی) لە بەری ئیٚران- کە ئەکەویٚتە ئەوبەر سیروانەوە- دەسدریٚژی کردنی هەمەوەندکان بۆسەر کاروان و ریٚبوارانی ئەو ناوچەیە و هیٚرش

بردنیان بۆسەر سلێمانی، عوسمانلی‌یەکانی ناچارکرد کە بایەخ بدەن بە شێخانی سلێمانی بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوانەوە بەربەستی‌ی دەسدرێژی هەمەوەندەکان بکرێت.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا لەو رووەوە ئەلێ:«٢١»

(هەتا شێخ مستەفای نەقیب (مامی شێخ مەحمود) مابوو کە شێخ مستەفا وەزنێکی تایبەتی هەبوە و شەرکەرێکی زۆر ئازا و چاونەترس بوە، تا ئەو مابو هەمەوەندەکان توانای ئەوەیان نەبوە دەسدرێژی بکەنە سەر مولک و ماڵ و زەوی و زاری بنەماڵەی شێخان لەو ناوچەیەدا، بەڵام کە شێخ مستەفا لە (حەج) ئەمرێ ئیتر هەمەوەندەکان کەوتنە تەقەلای ئەوەی دەس‌بەسەر ئەو موڵک و زەوی و زارانەدا بگرن، شێخ سەعیدی باپیرم تەماشای کرد چارنیە ئەبێ رووبەرووی هەمەوەندەکان ببێتەوە بۆ ئەوەی سنوورێک بۆ دەسدرێژی‌یان دابنێت، بۆ ئەوە ناردی بە شوێن شێخەکانی بەرزنجە و قەرەداغ و سەنکاودا جگە لە هەندێک گەنج و لاوی ئازای ناوشاری سلێمانی و خەڵکی دێهاتی دەوروپشتی سلێمانی لەگەڵ هەندێک پژدەری و جافدا و چون بە گژ هەمەوەندکاندا و لەو شەرەدا دوکەس لە شێخان کوژران (شێخ نوری و شێخ نەجمەدین) کە هەردوکیان خەڵکی گوندی (کانی کەوە)ی قەزای چەمچەماڵ بون. بەڵام کە هەمەوەندکان بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن بەسەر شێخ سەعید و لەشکرەکەیدا سەربکەون داوای ئاشت‌بوونەوە و رێکەوتنیان لە شێخ سەعید کرد و لەو ساوە ئیتر زۆریان بوون بە دۆستێکی تەواوی شێخان، یەکێکی وەکو (حەمە رەشیدی جوامێری هەمەوەندی) کە پیاوێکی زۆر ناسراو و ئازابوو لەناو هەمەوەندەکاندا لەکاتی حوکمدارێتی شێخ مەحمودا بوو بەلایەنگری شێخ مەحمود دژی ئینگلیزەکان راوەستا و بوو بە راوێژکەری شێخ مەحمود و لە یەکەم شەری رووبەروو بونەوەی شێخ مەحمودا، حەمە رەشیدی جوامێر مەردانە چەکی هەڵگرت و لەشەری تاسلوجەدا کە ئینگلیزەکان خەراپ شکێنران ئەو حەمە رەشیدی جوامێرە شەهیدبوو، زۆری تری وەکو کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیری کوری هەتا مابوون هاوکار و دۆست و لایەنگری شێخ مەحمود و شۆرشەکەی

کورد بوون (کاپتن بوندو، ماکانت) هەردوکیان کە ئەفسەری ئینگلیز بوون بە دەستی ئەو یاوک و کورە کوژران).

کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیری کوری دوای ئەوەی شێخ لەشەری دەربەندی بازیاندا بە دیل کیرا، ئەوان خۆیان نەدابەدەستەوە و چەکیان فرێ‌نەدا و هەمیشە بەرامبەر بە ئینگلیزەکان شەریان ئەکرد (هەردوکیان پەرینەوە بۆ ناوچەی رانیە و سەید محەمەدی جەباریشیان لەگەلدا بوە و خۆیان گەیاندۆتە لای تاقمەکەی یوزدمیر لە ناوچەی رەواندوز)، کە ساتێک شێخ مەحمود لە هەندستانەوە هاتەوە یەکەم کەس بوون کە چوونە پاڵ شێخ مەحمود و بە لایەنگریْ شێخ مەحمود مانەوە تالە دواییدا کەریمی فەتاح بەگ لە گوندی (قەرەنامور)ی چەمچەمال کوژرا).

شێخ رەئوفیش لە یاداشتەکانیدا باسی ناپیاویی (موشیری حەمەی سلێمان)ی هەمەوەندی کردوە وەکو زۆر نووسەرانی تری وەکو ئەحمەد خەواجا و دوکتۆر جەمال نەبەز و گەلێکی تر کە چۆن خیانەتی لە شێخ مەحمود کرد و رێگەی پیشانی ئینگلیزەکاندا کە لە پشتەوە هەڵکشێنە سەر بەرزاییەکانی دەربەندی بازیان و لەوێوە دەورەی شێخ مەحمودیان داو بریندارکرا و بەدیل گیرا......

## ٢ـ پێوەندی شێخان لەگەڵ بنەماڵەی(جاف)دا

عەشیرەتی جاف یەکێک بووە لە هەرە عەشیرەتە گەورەو دەسەلاْتداری خواروی کوردستان و لە زەمانی عوسمانلی دا وەزنێکی تایبەتی هەبوە و ئینگلیزەکانیش کە هاتنە کوردستانەوە بە هەمان چاو سەیری جافیان کردوەو گەرۆک و شارزاکانیان باسی تایبەتیان بۆ ئەو عەشیرەتە تەرخان کردوە لە نوسینەکانیانا لەگەڵ ئەوەشدا جافەکان لەکاتی خۆیدا رێزیان لە شێخ مارفی نۆدێ و کاک احمدی شێخی کوری گرتوە بەهۆی پایەی ئایینی و پلەی خوێندەواری و زانیاری یانەوە، بەلاْم کە ساتێک شێخ سعیدی حەفید و شیخ مارفی نقیب و لە دوای ئەوانیش شێخ محمود بوون بە خاوەن زەوی زارو عوسمانلی یەکان بۆ سودی خۆیان کەوتنە ئەوەی بایەخێکی تایبەتی بدەن بە شێخان، ئیتر وردە وردەجافەکان وەکو هەندێ عەشایری تری ناوچەکە کەوتنە بەربەرەکانی کردنی شێخان و حەزیان بە بوونی دەسەلاْتیان نەدەکردو و پێ یان خۆش نەبوە کە لە ناو خەڵکدا ناوبانگیان بلاْوببێتەوە .

وەکو لە کارەساتەکەی موصل دا باسمان کرد کە گوایە محمود پاشای جاف سەرۆکی لقی کۆمەڵی ( اتحاد و ترقی) بووە لە سلێمانی (شێخ رەئوفی شێخ محمود لە هەموان زۆرتر سوور بووە لەسەر ئەوە) لەگەڵ هەندێ لە بازرگانەکانی ناو شاری سلێمانیدا کەوتنە ساز کردنی ئەو پلانەی کە شێخ سعیدو خزم و کەس و کارەکانی ئاوارەکران بۆ موصل و لقی اتحاد و ترقی موصلیش ئەو کارە ساتەی سازکرد کە لە شوێنی خۆیا بە دوورو درێژ باسمان کرد، ئەو هەڵوێستەی محمود پاشا بەرامبەربە شێخان بوو بە هۆی درێژەپێدانی ئەو نارێکیانەی کە بەر لە وە لە نێوان جاف و شێخان دا هەبووە.

شێخ رەئوفی شێخ محمود لە یادداشتەکانیا دەربارەی پێوەندی شێخان و جاف ئەڵێ:«٢١»

خەڵکی ناوچەی عەربەت و شارەزوور خۆیان بە مرید و دەرویشی کاک احمدئەزانی، عەشایری جاف بەتایبەتی هۆزی(مکایلی)لە کۆچ و باری گەرمیان و کوێستانیان دا بە ناوچەی عەربەت و شارەزووردا تێپەریان ئەکرد و لە ڕێ‌ڕەوی کۆچ و باردا مەڕو ماڵاتەکانیان زیانێکی زۆریان لە کشت و کاڵی خەڵکی ناوچەی عەربەت و شارەزوور ئەدا ( وا باو بووە لەو ڕۆژانەدا کە ئەو خاوەن زەوی و زارانە لە خاوەن مەڕو ماڵاتەکان ئەپاڕانەوە کەنەیەڵن مەڕو ماڵاتەکانیان بکەوێتە ناو کشت وکاڵەکانیانەوە، لە وەرامدا پێ یان ئەوتن : برام تۆ کاڵی خۆت وەگوێزە) .خەڵکی شارەزوور و عەربەت لە ئەنجامی ئەو زیان لێ کەوتنەدا پەنایان بردە بەر شێخ سعید بۆ ئەوەی لای محمود پاشای جاف تکای ئەوەیان بۆ بکا کە سەر عێڵەکان راسپێرێ و فەرمان بدا رێگە نەدەن بە بەخشینی ئەو زیانە لەکاتی هات و چۆی گەرمیان ، کوێستان دا.

شێخ سعید بۆ ئەو مەبستە نامەیەک ئەنوسێت بۆ محمود پاشای جاف و بە حاجی سید حسن‌ی برایا و بە سید عبداللەی کوری حاجی سید حسن دا ئەو نامەیە ئەنێرێت بۆ لای محمود پاشا .کە ئەگەنە ئەوێ و پاشا نامەکەی شێخ سعید ئەخوێنێتەوە، بە تووڕەییەوە بە حاجی سید حسن ئەڵێ: برۆ وە شێخ سعیدی برات بێژە دەست نەخاتە ناو کارو باری خەڵکەوە و وەنوێژکردنی خۆیەوە خەریک وێت.

کە حاجی سید حسن ئەگەرێتەوە بۆ سلێمانی لە ڕێگا لە گوندی (خەراجیان)ەوە نامەیەک ئەنێرێت بۆ شێخ سعیدو وەرامەکەی محمود پاشای پێ ئەگەیەنێت، شێخ سعیدیش تووڕە ئەبێ و ئەمر ئەکا بە خزم و دۆستان لە ناو عەشایرەکاندا چەکدار کۆ ئەکاتەوە کەلە ناو ئەو چەکدارانەی سەر بە شێخ سعید دا هەندێ لە عەشایری جافیش بە پیریەوە ئەچن ( بەزۆری روغزاییەکانی جاف و سمایل عوزیری و بێ سەری کە هەموو جاف بوون لایەنگری شێخان بوون )، کە ساتێک محمود پاشا بە هەواڵی ئەو چەکدارکۆکردنەوەی شێخ سعید ئەزانێ چاری نامێنێ بە ئاشتی و بە خۆشی کێشەکە لەگەڵ شێخ سعید دا چارەسەر ئەکا بەلاّم ئەو هەڕەشەیەی شێخ سعید بوو بە گرێ یەکی گەورەلە دڵی محمود پاشاو تاقمەکەیدا، کە ساتێک کۆمەڵی اتحادو ترقی لقێکی لە سلێمانی کردەوەبە هاندانی هەندێ لە

بازرگانەکانی سلێمانی، محمود پاشا کرا بە سەرپەرشتیکەری ئەو لقەی سلێمانی و دەست کرا بە ناردنی اخبارياتی پڕ لە درۆودەلسە و کۆکردنەوەی مەزبەتە دژی شیخ سعید کە ئەنجامەکەی لە باسی شێخ سعید و کارەساتەکەی موصلدائاشکرایە).

جگە لەوەی کە شێخ رەئوف باسی کردوە کە بۆتە هۆی ئەو ناکۆکیەی نێوان شێخان و جاف، شێخ بابا علی شێخ محمود هۆیەکی تریشی بۆ باس کردم کە زۆر کاریگەر بوە بۆ خۆشکردنی ئاگری ناکۆکی و بەربەرەکانی کردن لە نێوان هەردولادا .شیخ بابا علی لە باسی ئەو هۆیە دا ئەڵێ:

« سوڵتان عبدالحمید مووچەیەکی تایبەتی بریبوەوە بۆ شێخ سعیدی حفید کە ئەو مووچەیەی بە لیرەی ئاڵتون ئەدرایە، شێخ سعید بەوە بوبو بە پارەدار، لەو سەردەمەدا هەندی لە تیرەو هۆزەکانی جاف کە سەر بە شێخان بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە عەشیرەتی جاف بوون، بەلام محمود پاشا هەموو ساڵێک کە قۆنتەراتی کۆکردنەوەی باجی مەڕو ماڵاتی لە عوسمانیەکان وەرئەگرت، ئەو جافانەی کە دۆستی شێخان بوون گلەیی ئەوەیان هەبوو لە محمود پاشا کە باج(قۆچانە)یەکی زۆریان لیٚ ئەسەنیٚت و بۆئەوەی لەو ئەرکەی پاشای جاف رزگاریان بیٚت پەنا ئەبەنەبەر شیٚخ سعید کە فریایان بکەویٚ . شیٚخ سعیدیش بە پیر ئەو داخوازیانە چوە لای عوسمانلی یەکان و قۆچانەی ساڵانەی لەسەر محمود پاشا زیاد کردەوەو هەر بەقەد ئەو پارەی قۆنتەراتەی کە دابووی بە کار بە دەستانی عوسمانلی داوا لەوانە ئەکا کە پارەکە کۆ بکەنەوە کە ئەوەی بەم جۆرەی دوایی داویانە زۆر کەمتر بووە لەوەی کە جاران محمود پاشا لیٚ ی ئەسەندن بەوە محمود پاشا پارەیەکی زۆری ساڵانەی لە کیس چوەو لە ئەنجامی ئەوەدا لە شیخ سعید دڵگیر بوەو ئەوەی گرتۆتە دڵی کە بۆتە سەرباری ئەو هەرەشەیەی کەلە پیٚشتر دا لە لایەن شیٚخ سعیدەوە لیٚ ی کرابوو هەروەکو شیخ رووف باسی کردوە).

دەربارەی ئەوانەی کەلە ناو جافەکاندا لە دەوری حوکمدارێتی شیخ محمودا، لەگەڵ شێخ مەحموددابوون لە گفت و گۆیەکی تردا لەگەڵ شیخ باباعلی شیخ

محمود دا ووتی:

جافەکان زۆریان لەگەڵ شێخ محمود دابوون، بەتایبەتی روغزایی(خەلیفە یونسی روغزایی یەکێک بووە لەو جافانەی کەلە ساڵی ۱۹۲٤بە دواوە هاوکاری کردوە لەگەڵ شیخ محموددا و لەو شەرانەدا کەلە ناوچەی شارەزوور دا لە بەینی هێزەکانی ئینگلیزو عێراقدا لەلایەک و پێشمەرگەکانی شێخ محمود لە لایەکی ترەوە بەشداری کردوەو دەوری ئازایانەی زۆر دیوە)و سمایل عوزێری(کەبە زۆری لە ناوچەی سورداش و دۆڵی هەناران دا بوون)، بێ سەری کە لە ناوچەی شارباژێر دا بوون)کە زۆریان لە شەرەکانی شیخ محمود دا بەرامبەر بە داگیر کەران بەشداریان کردوە ئەمانەش جافی سەر بە شیخ محمود بوون.

حامید بەگی جاف کەلسەرەتای دەسەلاتدارێتی شیخ محمود دا کە حوکمدار بوە لەگەڵ شیخ محمود دا بوە ، بەلاَم لە دواییدا لێ ی جیابۆتەوە و ئینگلیزەکان کردویانە بە معاونی قائمقامی هەلەبجەو احمد بەگی وەسمان پاشای شاعیر کراوە بە قائمقام... خانمی ژنی وەسمان پاشا (عدلە خانم)هەرچەندە کە شێخ محمود اعلانی حوکم دارێتی دوهەمی کرد لە سلیمانیدا خانم بۆ پیرۆزبایی کردن لە شیخ محمود هاتە سلێمانی بە خۆیی و دەستەو دایرەوە بەلاَم ئەو هاتنەو ئەو پیرۆزباییەی بە دڵ نەبوو، شتێکی رووکەش و سەرزاری بوو) .

زیوەر لە گەنجینەی مەردانا«۱۳» باسی ئەوە ئەکات کەچۆن لە خزمەت شیخ محمود و ۳۰ سواردا بۆ سەرخۆشی کردن لە محمود پاشای جاف بە هۆی مردنی وەسمان پاشای برای چونەتە هەڵەبجە، بەلاَم وادیارە ئەو گرێ یەی کەلە زەمانی شسخ سعیدی باوکی شیخ محمود دا وەکو باسمان کرد هەر لە دڵی محمودپاشای جاف دا ماوە و دڵی لە شێخان پاک نە بۆتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە احمد موختاری جاف و حامید بەگ لە شیخ محمود جیابونەتەوە و شیخ محمود ماوەیەک احمد بەگی موختاری شاعیری گرتوە کەبە شیعرێک گلەیی لە شیخ محمود کردوە لەو روەوە بەلاَم ئیتر وەنەبوو بێ وەکو وتمان هەموو بەگزادەکانی تری جاف لەگەڵ شیخ محمود دا نەبوو بن .

بۆنمونە داود بەگی جاف ( لە بەگزادەکانی کەلار بووە) لە شەری ( ئاو باریک

دا هاوکاری شیخ محمود بوەو شان بەشانی ئەو شەری کردوەو شیخ باباعلی ئەڵێ : هەموو جارێک باوکم ئەی ووت : داود شێرە... جگە لە داود بەگی جاف ( کریم بەگی جاف )یش لە کەلار بە زۆری لەگەڵ ئینگلیزو حکومەت دا رێک نەبووە. لە بەرگی دووهەمدا لە باسی ئاڵۆزبوونی هەڵوێستی ناوچەی سلێمانیدا باسی ئەکەین.

دەربارەی هەڵوێستی جافەکان بەرامبەر بە شێخ محمود ، ئەو کتێبەی کە دائرەی حاکمی گشتی بەریتانیا بە ئینگلیزی چاپیان کردووەو فوادی حمە خورشید وەری گێراوە بۆ عەرەبی و لە چاپخانەی ( الحوادث )ساڵی١٩٧٩لە بەغدا چاپی کردوەو بڵاوی کردۆتەوە لەو روەوە ئەڵێ:جافەکان لەو رۆژانەدا دوو بەش بوون...

١ـ بەشی یەکەم بەسەرکردایەتی عادلە خانم ( خانمی ژنی وەسمان پاشا )و هەردوو کورەکەی( احمد بەگی شاعیر و عزەت بەگ) کە ئەمانە دژی شیخ محمود بوون و پاڵ پشتێکی بە هێزی ئێمە بوون لە ناوچەی سلێمانی و گەرمیاندا و چەکدارەکانیان یارمەتی موخابەراتی ئێمەیان ئەداو دەنگ و باسیان ئەگەیاندە ئێمە و ئاگاداریان ئەکردین کە کام عشیرەت ئەبوون بە پاڵپشتی شیخ محمود، گەورەترین خزمەتێکی ئەوانە بۆ ئێمە ئەوەبوو کە یارمەتی ئەفسەری سیاسیی ئێمەیان دا لە هەڵەبجە ( ملازمی فرۆکەوان ج . م . لیز )کە یەکەم ئەفسەری سیاسیمان بوو کە ناردیوومان بۆ هەڵەبجە لە ساڵی١٩١٩دا ( ناردنی ئەو ئەفسەرە لە دوای ئەوەبوو کە ئینگلیزەکان بریاریان دا هەڵەبجە لە سلێمانی جیا کەنەوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین )وە توانیان ئەو ئەفسەرەمان دەرباز بکەن و رزگاری بکەن.

خانمی ژنی وەسمان پاشا لە ساڵی ١٨٥٩ لە دایک بووەو لە ساڵی١٩٢٤ لە هەڵەبجە مردوەو لە گۆرستانی عەبابەیلێ نێژراوە، ئینگلیزەکان لەتەمەنی شەست ساڵەیی خانمدا بەرامبەر بەو چاکەیەی خانم لەقەبی ( خان بهادور )یان پێ بەخشیوە.

٢ـ بەشی دووهەمی جافەکان: حامید بەگی مجید بەگی کوری وەسمان پاشا (مجید بەگ لە عدلە خانمی ژنی وەسمان پاشا نەبووە بەڵکو لە ژنێکی تری

وسمان پاشابوو)، تائێره له کتێبه‌که‌ی حاکمی گشتی به‌ریتانیاوه وه‌رگیراوه.
به‌لاّم ده‌رباره‌ی حامید به‌گ وه‌کو ئه‌گێڕنه‌وه، له‌وسه‌رده‌مه‌دا که‌لایه‌نگری شیخ محمود بوه‌و هێشتا نه‌کرا بوو به معاونی قائمقامی هه‌ڵه‌بجه ، ئینگلیزه‌کان دوای ئه‌وه حامید به‌گ هه‌ڵه‌بجه‌ی به‌جێ هێشتبوو، فرۆکه‌کانی ئینگلیز ئه‌و شوێنانه‌یان بۆردومان کردوه که حامید به‌گی تیابووه به‌تایبه‌ت گوندی عه‌بابه‌یلێ.

# ٣ـ پێوەندی شێخان و تاڵەبانیەکان

ناکۆکی نێوان شێخان و تاڵەبانیەکان لە کۆنەوە هەتا شەری ئاو باریک کەلە ساڵی١٩٣١دا روویدا درێژەی کێشاوە.

دەربارەی هۆی ئەو ناکۆکیە دوو سەرچاوەمان بەدەستەوەیە، یەکەمیان یاداشتە چاپ نەکراوەکانی شیخ رووفی شیخ محمود«٢١» دوهەم ئەو گفت و گۆیەی کە لەگەڵ شیخ باباعلی شیخ محمود دا کردومە لەم روەوە.

چ شیخ رەئوف و چ شیخ باباعلی هەردوکیان لەوەدا یەک ئەگرنەوە کە ئەو ناکۆکیە لە ساڵێکی تووش و نەهاتی و نەبوونی دەغڵ و دان دا بووەو تاقمێک لە شێخانی بەرزنجە رویان کردۆتە ناوچەی تاڵەبان بۆ دەغڵ و دان کرین و لەوێوە هەردوو لا تێک چون .

شیخ باباعلی ئەڵی: ( ئەو بێ دەغڵو دانیە لە ناو شێخەکانی ناوچەی بەرزنجەدا رویداوە کە شێخانی ئەو ناوچەیە ساڵێک لەبەر بێ بارانی و بڵاوبونەوەی کوللەهەرچیکیان بووە هەمووی لەناو چوە و ئەوانیش ناچار بوون هەچی ئاڵتون یاخود مەرو ماڵاتیان هەبووە فرۆشتویانە و روویان کردۆتەناوچەی تاڵەبان بۆ کرینی گەنم و جۆ..بەڵام لەجیاتی ئەوە گەنم و جۆیان پێ بفرۆشن هەرچی پارەکانیان ئەبێ هەموویان لێ ئەسێنن و بە دەستی بەتاڵ ئەگەرێنەوە ماڵی خۆیان... بەرزەنجەییەکان لە تۆڵەی ئەوەدا لەشکرێک لە خزم و کەس و کاری خۆیان کۆئەکەنەوەو ئەچنە سەر تاڵەبانیەکان و شەر لە نێوانی هەردوو لا ئەقەومێ و بەرزنجیەکان تۆڵەی خۆیان لێ ئەکەنەوە، ئەمە بووە هۆی ناکۆکیەکی دوورو درێژ لە نێوانیاندا ( وابزانم لە دواییدا لە ساڵانی چلەکاندا بە ژن هێنانی شیخ باباعلی لە تاڵەبانیەکان ئەو ناکۆکیە نەما و بوون بە دۆست ).

بەڵام شیخ رووفی شیخ محمود لە یاداشتەکانیا لەم روەوە ئەڵێ: ساڵێکی گرانی هەندێک لە گەنجەکانی ناوچەی سەنگاو و قەرەداغ ئەچنە ناوچەی داودە بۆکرینی گەنم، بەڵام تاڵەبانیەکان رێگەیان پێ ئەگرن و ئەبێ بە شەرو هەراو لەو شەرەدا

یەکێک لە سەرۆکی تاڵەبانیەکان ئەکوژرێ ( کە ناوی نەهێناوە کێ بووە)، تاڵەبانیەکانیش یەکێک لە شێخان ئەکوژن لە گوندی ( مەملەحە ) لە ناوچەی سەنگاو و ئەم کوشتنە بوو بە هۆی ئەوەی ساداتی بەرزنجە زۆر لە شێخ سعیدی حفید بکەن لەشکرێکی زۆر کۆکاتەوەو تۆڵەی ئەوە لە تاڵەبانیەکان بکاتەوە کە بەشێکی لەشکرەکەی شێخ سعید جگە لە خزمانی خۆی بریتی بووە لە جافە رەشکەولە عەشیرەتی ( شیلانە ) کە ئەوانە لە ناوچەی ( مەرگە )دان لەگەڵ هەندێک خەڵکی سلێمانی و ناوچەی پشدەر و هەندێک جاف و هەمەوەند .

شێخ سعید سەرکردایەتی ئەو لەشکرە ئەداتە دەست شیخ مصطفی نقیب (برای شیخ سعید) و پەلاماری تاڵەبانیەکان ئەدەن و هەندێ دێهاتیان ئەسوتێنن . لەئەنجامی ئەوەدا شیخ علي گەورە( نیازی لە شێخ علي برا گەورەی شیخ رەزای تاڵەبانی بووە) تەلگرافێک ئەنێرێت بۆ سوڵتان و شکات لە شێخ سعید ئەکاولە ساڵی (١٣١١ هـ)دا لە لایەن حکومەتی عوسمانلییەوە شیخ سعید داوا ئەکرێ بۆ ئەستەمبوڵ( کە هەندێ سەرچاوەی تر بە جۆرێکی تر باسی ئەو داوا کردنە، یا چونەی شیخ سعیدیان کردوە وەکو لە باسی شیخ سعید دا لیی دواین) .

شیخ رەئوف لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەروا و ئەڵێ : کە شیخ سعید ئەگاتە ئەستەمبوڵ بە پێچەوانەی ئەوەی کە چاوەرێ ئەکرا ، شیخ سعید وەکو گیراوو دەست بەسەرێک سەیر نەکراوە بەڵکو وەکو میوانێک ریزی لێ گیراوەو لە بیلاطی شاهانەدا بۆ ماوەی ( ٥ ) ساڵ ئەهێڵرێتەوە و دوای ئەوەی رێگەی ئەدرێتی بگەرێتەوە بۆ سلێمانی و لە گەرانەوەیدا سوڵتان پیاوێکی تایبەتی لەگەڵا ئەنێرێت بۆ ئەوەی بزانی شیخ سعید تا چ رادەیەک لەناو خەڵکدا ریزی لێ ئەگیرێت و دەسەڵاتی چەندە.

کە شیخ سعید ئەگاتە هەولێر و خەڵکێکی زۆر بە پیریەوە ئەچن کە هەتا ئەو رۆژە ئەو ناوچەیە شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو ، هەروەها لە کەرکوک/یش بەو جۆرەپێشوازی ئەکرێ و ئیتر ئەوەندەی تر پلەو پایەی شیخ سعید وشیخانی بەرزنجە بەرزبووەوە لەلای سوڵتان .

لەو یاداشتەی شیخ رەئوف دا ئەوەی سەرنج رائەکێشێت دەربارەی ناردنی یا

چونی شیخ سعید بۆ ئەستەمبوڵ ئەوەیە:

١ـ هیچ کەسێکی تر ئەو چونەی شیخ سعیدی بۆ ئەستەمبوڵ بەو جۆرە باس نەکردوە کە شیخ سعید ماوەی ٥ ساڵ لە ئەستەمبوڵ دا مابێتەوە .

٢ـ بێگومان ئەو چونەی شیخ سعید بۆ ئەستەمبوڵ کە شیخ رووف باسی کردوە یەکەم چوونی بوە بۆ ئەستەمبوڵ کە زیوەر لە گەنجینەی مەرداندا «١٣» بە جۆرێکی تر باسی کردوە کە لە شوێنی خۆی لیٚ دواین، جگە لەوە نە شێخ محمود لە گفت و گۆکەیدا لەگەڵ حبز بوز ، نە شیخ قادر لە یاداشتەکانیا کە مامۆستا رۆژبەیانی باسی کردووە هیچیان باسی ئەو چونەی شیخ سعیدیان بەو جۆرە نەکردوە کە شیخ رەئوف لیٚی دواوەو ئەگەر راست بوو بێت ئەو ماوە دوورو درێژە لە ئەستەمبول مابێتەوە و هێشتنەوەکەی لە ئەنجامی ئەو شەرەدا بوو بیٚ کە لەگەڵ تاڵەبانیەکاندا کردویەتی دیارە ئەوە جۆرە دەس بەسەریەک بوە ئەگەر چی دوور نیە عوسمانیەکان بۆ سودی خۆیان لە دوا رۆژدا رێزیان لیٚ گرتبێت .

زیوەر لە یاداشتەکانیان باسی ئەو چونەی بە جۆرێکی تر کردوە کە ئەڵیٚ:(وەختی خۆی سوڵتان داوای لە کاک احمدی شیخ کردبوو کە بە زیارەت بچێت بۆ ئەستەمبول بەلاٚم لەبەر پیری خۆی نەیتوانی بچێت و لە جیاتی خۆی شیخ محمدی موفتی نارد بۆ ئەستەمبول . بەلاٚم سوڵتان بەو چونەی شێخ محمدی موفتی وازی نەهێنا بەڵکو داوای لە شیخ سعیدی حفید کرد کە جیٚ نشینی کاک احمدی باپیری بوو بچێتە ئەستەمبوڵ) ، کە ئەو باسەی زیوەر زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیا باسی کردوە.ئەو شەرەی نێوان شێخان و تاڵەبانی کە شیخ علی برا گەورەی شێخ رەزای تاڵەبانی دیارە بەشداری تیاکردوە لە کاتی خۆیدا ئەو شەرە رقی شیخ رەزای هەڵساندوەو بە چوار خشتەکیەک نارەزای خۆی دەربریوە کە بەو پەری رقەوە بە فارسی بە شێخانی بەرزنجەی ووتوە:

شاه حسین از خواب دیدم در ملا
گفتم ای شاه شهیدی کربلا
سید برزنجه از نسل تو اند

قـــال لا واللـــه هــذا مفــتـــرى

لەوە ئەچێ لەو شەڕەدا (ڕەبات)یەکانیش لایەنگری شێخان بوون دژی تاڵەبانیەکان بۆیە شیخ ڕەزا لە شوێنێکی تری دا پلاری گرتۆتە ئەوانیش و ووتویەتی:

ئەگەر بەرزنجەیی غەدریش بکەن هەر نەیسە ساداتن
خدر ئاغای ڕەباتی دایکە خۆ گێ ئێوە بـــۆ هاتـــن؟

ئەو تووڕە بوونەی شیخ ڕەزا بۆ سەر شێخان بێگومان تووڕە بوونێکی کاتی بووە چونکە شیخ ڕەزا هەر خۆی لە شیعرێکی تریدا وتویەتی:

مربوطـه حیاتم بـــه ســلێمانی وخـــاکی
خۆزگەم بەسەگی قاپیەکەی احمدی کاکی
بۆ دەست وعەسا ناسکەکەی داخە دەرونم
قوربانی ئەبم سۆل وعەساودەست وسیواکی

لە دوای ئەو شەڕە بە ماوەیەک یاخود بەر لە چونی دوهەم جاری شیخ سعید بۆ ئەستەمبول لەسەر دەعوەت کردنی سوڵتان ، شێخان بەسەرکردایەتی شێخ سعید بۆ ئاشت بوونەوە تاقمێکیان چوونەتە لای تاڵەبانیەکان و لەگەڵیانا ئاشت بوونەتەوە و شێخ ڕەزا بۆ ئەو ئاشت بوونەوەیە شیعرێکی بە فارسی وتوە (١٤) دێڕ بوە ، پیرەمێردی شاعیر لە ژمارە ٨٤٣/ی ساڵی ١٩٤٦/ی ڕۆژنامەی ( ژین )دا ئەم دوو دێڕەی لەو شیعرە فارسیەی شێخ ڕەزای هەڵبژاردوەوکردوێتی بە کوردی:

مانگی ڕەمەزان تێپەڕی، ئەوسا دەمی عیدە
هێشتا ڕەمەزانە کەچی عیدێکی سەعیدە
مقصد ،لەمن وایە کە دەڵێم جەژنە لەلامان
تەشریفی حەفیدێکی سەعید کە شیخ سعیدە

بەڵام ئەو تەقەلایەی شیخ سعیدو ئەو ئاشت بوونەوەیە وەنەبێ کۆتایی هاتبێ بەڵکو ماوەیەکی دورو درێژتر درێژەی کێشاو ئەوەبوو لە شەڕی ئاوباریکدا ساڵی ١٩٣١ تاڵەبانیەکان وەکو هێزێکی سەر بە حکومەت بەشداری شەڕیان کرد دژی

شێخ محمود ، کە شێخ محمود لەو شەڕەدا شکاو دوای ئەوە چاری نەما وازی هێنا .

حمدی صاحبقران/ی شاعیر لە شیعرێکیدا باسی ئەو بەشدار بوونەی تاڵەبانیەکانی کردوە، ئەڵێ:

یەک فەوج جەیشی عەرەب ، حەوسەد نەفەر پۆلیسی تورک
پێشرەوی دوو سەد سوارەی تاڵەبانی بو جەدەل
دەنگی شەست تیرو تەیارە، قرچەیی تۆپ و تفەنگ
ڕۆژی حەشرێ بوو ئەباری هەروەکو تەزرە ئەجەل

لە کاتی خۆیدا شیخ محمد خالص/ی کوری شیخ ڕەزای تاڵەبانی کە لە لایەن حکومەتەوە، کرابوو بە قائمقام ، شیخ محمود لەسەر ئەوە لەگەڵ ئەویشدا تیکچو و شیخ محمد خالص/یش وەکو احمد موختاری جاف بە شیعرێک دوورو درێژ گلەیی لە دام و دەزگاکەی شیخ محمود کردوە کە ئەویش لە بەرگی دوهەمی ئەم کتێبە دا لە بەشی شێخ محمود لە تەرازووی ڕەخنەو ستایشی شاعیراندا لەگەڵ شیعرەکانی حمدی صاحبقران و هەندیکی تریش باسیان ئەکەین.

# ٤ـ پێوەندی شێخان لەگەڵ پشدەری یەکاندا

دانیشتوانی ناوچەی پشدەرو مەنگور زۆریان لەکاتی شێخ مارف/ی نۆدێ و کاک احمدی شێخا خۆیان بە دۆستی بنماڵەی شێخان زانیوە و ناوبانگی هەردوکیان بە ناوێژدەر و مەنگوردا بڵاو بوەوە و لە هەندێ رووداوا لایەنگری شێخان بوون.

لە ناکۆکیەکدا کە لە نێوانی پشدەریەکان و مەنگوردا رووی دابوو شێخان پشتگیری پشدەریەکانیان کردبوویەلام کە شێخ محمود بوو بە حوکمدار و ئینگلیزەکان کەوتنە ئەوەی عشایرەکان لە شێخ مجمود هەڵگێرنە بابکری سلیم ئاغای پشدەری کە یەکێک بووە لە سەرۆکە بە هێزەکانی پژدەر دژی شیخ محمود وەستاوەو کۆمەکی ئینگلیزەکانی کردوە کە ئینگلیزەکان هەندێ جار لەناو دوکیومێنت و راپۆرتەکانیان بە (کاپتن بابکر) ناویان هێناوە.

بابکری سلیم ئاغا بەرامبەر بەو خزمەتەی بۆ ئینگلیزەکان هەتا ماوەیەک مانگانەو موچەی لە ئینگلیزەکان وەرگرتوەو مەدالیایەکی تایبەتیان داوەتی و هەتا ماوەیەکی زۆر ناوچەی پشدەر وەکو ناوچەیەکی تایبەتی وابوە کە ئیدارەی حکومەتی عێراقی تیادا بە هێز نەبووە و سەربازیان نەداوە بە حکومەت .

بەلاّم هەباسی محمود ئاغا و هەندی لەو پشدەریانەی کە سەر بەو بوون هەڵوێستیان جیاواز بوە لەوەی بابکر ئاغا و لە زۆر هەڵوێست و رووداودا هاوکاریان لەگەڵشێخ محمود دا کردوەو دژی ئینگلیزەکان وەستاون ( کە هەندی لەو هەڵوێنستە ئەگەرێتەوە بۆ سروشتی عەشایری کە لە ناو خۆیانا نارێک ئەبن و لایەک سەربەلایەک ئەبێ ئیتر ئەوی تر بۆبەربەرەکانی ئەچێتە پاڵ لاکەی تر کە پشدەریەکان لەوەدا رابوردویەکی زۆریان هەبووە) .

یەکێک لە بەڵگە نهێنی یەکانی ئارشیفی بەریتانیا ( لە دوەهەم حوکمدارێتی شێخ محمود داباسی ئەکەین) ئەڵێ بابکری سلیم ئاغا هاتنەوەی شیخ محمود لە هیندستانەوە بۆ کوردستان بە شتێکی باش و راست نازانێت و ئەڵێ ئەگەر شێخ محمود بگەرێتەوە هەموو ناوچەکە ئاڵۆز دەبێ ( بە پێچەوانەی توفیق وەهبی کەلە هەمان کاتدا ئەڵێ شێخ محمود پیویستە بهێنرێتەوە بەڵام دوای ئەوەی هەموو دەزگاکانی بۆ ساز بکرێ ئەوسا رێ بدرێ بگەرێتەوە) .
لە بەرگی دوەهەمی ئەم کتێبەدا نارێکی شێخ محمود لەگەڵ بابکری سلیم ئاغاودۆستایەتی لەگەڵ هەباسی محمود ئاغا لە رێرەوی رووداوەکانی ئەو سەردەمەدا بە دورو درێژ باسی ئەکەین و پێویست ناکا لێرە دووبارەی بکەینەوە

هەروەها لەکاتی ئاڵۆز بوونی هەڵوێست لە خوارووی کوردستان دا بە تایبەتی کە تورکەکان بە هۆی (یوزدمیر)ەوە لە رەواندز دەسەڵاتیان پەیدا کرد ، ئینگلیزەکان ویستیان بە هۆی بابکری سلیم ئاغاوە سمایل خانی سمکۆ وا لێ بکەن کە بەگژ تورکەکاندا بچێت . لە بەرگی دوەهەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەو چالاکیانەی بابکر ئاغا ئەکەین کە هەوڵی داوە لەگەڵ سمکۆدا پێوەندیەک بکرێت کە دژی تورک راپەرێت کە ئەمانە بە دورو درێژی لە دوکیومێنتەکانی ناو ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا وەکو دوکیومێنتی ژمارەC.O.730-6-1607 ساڵی ١٩٢١و دوکیومێنتی ژمارە C.O.730-8 رۆژی ١٩٢١/١٢/١ و گەلێکی تر باسی کراوە .

## ٥ـ پێوەندی شێخان لەگەڵ مەنگوڕی یەکاندا

لە باسی پشدەریەکاندا ووتمان کە شێخان لایەنگری پشدەریەکان بوون لەو ناکۆکیانەی کە لە نێوانی مەنگورو پشدەردا روویداوە.

لە گفت و گۆیەکدا لەگەڵ شیخ باباعلي شێخ محمود باسی ئەوەی کرد کەلە زەمانی شێخ سعیدی باپیریا هەندێک لە ئاغاکانی مەنگوڕ زۆر دەست درێژی ئەکەنە سەر خەڵکی ناوچەکەیان و رەش و رووت و رەشە خەڵکەکەی ئەو ناوەش زۆریان خۆیان بە دەروێش و مریدی شێخ سعید زانیوە و بۆ بەربەستی ئەو دەست درێژیەی ئاغایانی مەنگور پەنا ئەبەنە بەر شیخ سعید و داوای چارەسەرێکی لێ ئەکەن ، لەو رۆژانەدا شیخ محمود پێ گەیشتوو ئەبێت بە شیخ سعیدی باوکی ئەڵێ: یارمەتیدانی ئەوانەی کە هاواریان هێناوەتە بەرتۆ تەنها بە کاغەزو هەرەشە سەر ناگرێ بۆیە شیخ محمود هێزێکی چکداری کۆکردۆتەوە کە حاجی سید حسنی مامیشی لەگەلا بوەو روویان کردۆتە مەنگور و توانیویانە ئاغاکان بێ دەنگ بکەن و وازیان پێ لێ بێنین لەو رەفتارەی کە جاران لەگەڵ ئەو خەڵکە دا ئەیان کرد ، بەلام مەنگوریەکان دەستیان کردوە بە شکات کردن لای خەلیفە لە ئەستەمبوڵ و بەناویئاغاکانی مەنگورەوە مەزبەتەیان دژی شیخ سعید کۆ کردۆتەوە.

بەلام سەیر ئەوەیە لە گفت و گۆکانی شێخ باباعلي دا وا دەرئەکەوی کە ساتێک شێخان لێ یان قەوماو لە دوای ئاوارە کردنی شیخ محمود بۆ هیندستان خێزانەکانیان ناچار کران بە ئاوارەیی روو بکەنە کوردستانی ئێران و لە وێوە بۆ تورکیا،لە دوا قۆناغی ئاوارە بوونیان دا روو ئەکەنە ناوچەی مامش و مەنگور ، مامشەکان زۆر لایان لێ ناکەنەوە و یارمەتی یان نادەن ، بەلام مەنگورەکان بەسەرۆکایەتی حسن ئاغا ( باوکی علي حسن ئاغای شەروێت) زۆر خزمەتیان ئەکەن . لە باسی ئاوارە بوونی بنەماڵەی شێخاندا باسی ئەوە ئەکەین کە چۆن حسن ئاغای مەنگور بە کاکە حەمەی ئەمینی عەتار ( ژن برای شێخ

محمود)ئەڵێ: ئێمە نزیکی ..٣ تفەنگچیمان هەیە، ئەگەر ئێرانیەکان هاتنە ئەم ناوچەیە بە نیازی خراپەکردن لەگەڵ ئێوەدا هەتا دوا تفەنگچیمان مابێت ڕیگەی ئەوە نادەین هیچ دەست درێژیەکتان بکرێتە سەر.

## ٦ـ پێوەندی بنەماڵەی شێخان
## لەگەڵ هەورامیەکان و ناوچەی مەریوان دا

ناوچەی هەورامان دوو بەشە ، بەشی یەکەم پێ ئەڵێن هەورامانی تەخت کە ئیمڕۆ کەوتۆتە ناو خاکی ئێرانەوە ، بەشی دوهەم هەورامانی لهۆن کە لە ڕۆژئاوای هەورامانی تەختدایە کە ئەمڕۆ بەشێکە لە خواروی کوردستان. هەورامی بە ئازاو زرنگ و ووریا ناسراون بەڵام لە ڕێرەوی مێژوو دا زۆر گۆشەگیر بوون ( تۆفیق وەهبی ئەو گۆشەگیری و سەختی ناوچەی هەورامانی بە هۆیەکی سەرەکی دائەنێ کە شێوەی زمانی هەورامی تا ئێستەش لە شێوەکانی تری زمانی کوردی نزیکترە لە زمانی کۆنی کورد کە ماد بوو ).

لەسەرەتای بزووتنەوەکانی شیخ محمود دا ، لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و دامەزراندنی یەکەم حومدارێتی شیخ محمود کە ساتێک شیخ بۆی دەرکەوت ئینگلیزەکان دەستی پێ ئەکەن و ئەیانەوێ وەکو کرێ گرتەیەک سەیری بکەن ویستی لە ئینگلیزەکان بگەیەنێت ئەو نۆکەرە نیە کە ئەوان بە شوێنیا ئەگەڕێن و وەکو ستیڤن«٥٧» باسی شێخ محمودی کردوە، شیخ محمود ئەیویست پیاوی خۆیی و پیاوی میللەتەکەی بێ ، بۆ ئەوە دەستی کرد بە ناردنی نامە بۆ دۆستەکانی کە یەکێک لەوانە محمود خانی دزلی بوو.

محمود خانی دزلی ناوی محمود خانی عزیزی کوری بارام بەگی دزلی بووە لە ناوچەی هەورامانی تەخت لە ساڵی ١٨٧٠ز لە ئاوایی دزلی لە دایک بووە ، جگە لەوەی کە محمود خان خۆی و هێزێکی زۆر بەشداری کردووە لە شۆڕشەکەی شیخ محمود دا دژی ئنگلیز لە تاسلوجەو دەربەندی پەنجوین و گەلێ شوێنی تر، ساتێک کە خێزانی شێخان و ئەوانەی بەشداریان کردبوو لەو شۆڕشەی کوردا ئاوارە بوون و روویان کردۆتە ناوچەی مەریوان، ئەو خێزانانە لەناو ئاوایەکانی محمود خانی دزلی دا حەسانەوە و یارمەتیان داون.

بیجگەلە محمود خانی دزڵی لە وانەی کە یارمەتی خێزانەکانی ئاوارەبوەکانیان داوە محمود خانی کانی سانان بووە کەلە ناوچەی مەریواندا خزمەتی ئەو خێزانانەی کردوە و داڵدەی داون ئەگەرچی ئەو وەکو محمود خانی دزڵی هاوکاری و بەشداری شۆرشی زۆر نەکردوە .

لەوکتێبەی کەلە لایەن ئیدارەی حاکمی گشتی بەریتانیا لە ساڵی١٩١٩ دا بەناوی Notes ontheTribes of sothern Kurdistan between great Zab and Dilal. کە فوادی حەمە خورشید کردویەتی بە عەرەبی و ئەڵێ:

( جعفر سوڵتان کە سەرۆکێکی گەورەی هەورامی بووە و ماوەیەک ئەویش لەگەڵ ئێرانیەکاندا لە کێشەدا بووە لە نێوان ١٩٣١-١٩٣٢) بە هیچ جۆرێک هاوکاری نەکردوە لەگەڵ شیخ محمود، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر بە گەرمی هاوکاری لەگەڵ کاربەدەستانی ئنگلیز دا کردوە .

لە ئەنجامی هاوکاری کردنی محمود خانی دزڵی لەو شەرانەی شیخ محمود دا و یارمەتیدانی محمود خانی کانی سانان بۆ خێزانە ئاوارەبووەکان ، کە ساتێک دوای شکاندنی شیخ محمود ئینگلیزەکان کەوتنە تۆڵە سەندنەوە لەوکسانەی کە هاوکاری شیخ یان کردبوو یا یارمەتیان دابوو ، محمود خانی دزڵی و محمود خانی کانی سانان لەوانە بوون کە ئینگلیزەکان داوایان لە ئێران کرد کە هەردووکیان بگرێت و تسلیمیان بکات ، ئێرانیش هەردووکیانی گرت لە ساڵی ١٩١٩دا و داینە دەست ئینگلیزەکان و محمود خانی دزڵی لە بەندیخانەی ( هنێدی) تێکەڵ بە حەپسە دزو پیاو خراپەکان کراوەو خراوەتە ژێر ئەشکەنجە و ئازارەوەو وەکو کرێکارێک خشتی کاڵیان پێ بڕیوە ! .

بەڵام لەبەر ئەوەی محمود خانی کانی سانان بەشداری شەری نەکردبوو تەنها بەوە وازیان لێهێنا کە ماوەیەک لە بەغدا دەست بەسەر بێت بۆ ئەوەی لە ناوچەکەی دوور بکەوێتەوە ... لە دواییدا بەروو دوا هەردوکیان بەردران و گەرانەوە شوێنی خۆیان .

محمود خانی دزڵی لە دوای گرانەوەی بۆ ناوچەی هەورامان ئیتر وەنەبێ وازی هێنابێت مندوبی سامی سێر برسی کۆکس لە دوکیومێنتی ژمارە C.O.730-19

رۆژی ۱۹۲۲/۲/۹ وەزارەتی مستعمراتی بەریتانیای ئاگادار کرد کە محمود خانی دزڵی بەتەمایە پێوەندی لەگەڵ مصطفی کمال دا بکات بۆ ئەوەی هەرایەک لە ناوچەی هەڵەبجە و هەوراماندا بنێتەوە لەبەر ئەوە داوا ئەکا کە نابێ ئەو مەترسییە پشتگوێ بخرێت. لەم بەرگە و لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا لە رووداوەکانا زۆرجار ناو مەحمود خانی دزلی دێتە ناو باسەکان.

# ٧ـ پێوەندی شێخ محمود لەگەڵ عەشایری شکاک دا

سمایل خانی شکاک ( سمکۆ) یەکێک بووە لەو شۆڕەسوارانەی کوردستانی ئێران کەماوەیەکی دوورو درێژ دژی عوسمانلی و ئێرانیەکان شۆڕشی کردوەو هەوڵێکی زۆری داوە دەسەلاتی خۆی بەسەرناوچەیەکی فراوانی کوردستانی رۆژهەلاتدا بلاوبکاتەوە.

بەراستی سمکۆ ئەوە ئەهێنێت کە باسێکی تایبەتی لەسەر بنوسرێت چونکە لە راستیدا رۆڵێکی زۆر گرنگی دیوە لەوسەر سنوورانەی ولاتانی تورکیاو ئێران و روسدا بەلام بە داخەوە، شۆڕشەکانی و بزوتنەوەکانی وەکو شورش و بزوتنەوەکانی کوردی ئەوسەردەمە، کەوتۆتە ناو گێژاوی عەشایری و ناکۆکی لەگەڵ دراوسێکانیاو گوێ ی نەداوە بەبوونی رێکخراوێکی سیاسی و دەزگایەکی ئیداری کە سەرپەرشتی کارو باری شۆڕشەکەی و ئەو ناوچانە بکات کەلە ژێر دەسەلاتیا بووە .

سمکۆ تووشی گەلێک هەڵەی زەق بووە کە هەر جارەی بڕواو متمانەی بە لایەک کردوە لە دەوڵەتانی ئەوسەردەمە بەتایبەتی تورکیا کە هیچیان نەدۆستی ئەوو نە دۆستی کورد بوون ، دوو هەڵەی تری ئیجگار زەق و ئاشکرای بووە یەکەمیان ئەوەبوو کە ساتێک چوو بەگژ هێزەکانی دەوڵەتی ئێرانا لە ناوچەی سابلاغ توانیبوی هێزی ئێران دەرپەڕێنێت، هەوڵی ئەوەی نەدابوو کە رێگا لە هێزەکانی بگرێت لە ناوچەی سابلاغ و لەناو شارەکەدا دەست درێژی نەکەنە سەر خەڵک کە لە ئەنجامی ئەوەدا کورد کوردی کوشت و خەڵکی مەهاباد و دەورو بەری تووشی زیانێکی زۆری گیانی و مالی بوون کە ئەمە بوو بە هۆی نیگەرانی خەڵکی ئەو ناوچەیە لە سمکۆو بە خۆڕایی هەندی کەسی کرد بە دوژمنی خۆی ( لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین ) .

هەڵەی دوهەمی ئەو پەلاماردانەی بوو بۆ سەر ئاسوریەکان و کوشتنی مارشمعون

که تەنها ئەوەی سودی لەو کردارە وەرگرت تورکەکان بوون کە کوردو ئاسوریان بەیەکتر بە کوشت ئەدا و بە خۆڕایی ئەو ئاسوریانەی لەخۆی ئاڵۆزاندو بەڵگەیەکی خۆڕایشی دا بە دەست دۆستەکانی ئاسوریەوە کە هەمیشە دژی بوەستن ، جگەلەوە ئەو ئاسوریانەی کە ئاوارەکران و لە لایەن ئنگلیزەکانەوە نیشتەجی کران و بە هاندانی تورکەکان سمکۆ ڕێگەی گەرانەوەی ئەو ئاسوریانەی نەدا کە بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان لە ناوچەی ( هەکاری)ئەو ڕێ لێ گرتنە و ئەو نیشتە جێ بوونەی ئاسوریەکان بوو بەهۆی ئەوەی ئینگلیزەکان لە خوارووی کوردستانا ئەو ئاسووریانە چەکدار بکەن و بیکەن بە کوتەکی دەستیان بۆ پان کردنەوەی شورشەکانی شیخ محمود و ڕاپەرینەکانی ناوچەی بادینان وەکو ئەوەی ناوچەی بارزان و شوێنەکانی تر لە ناوچەی سورچی و ڕواندز وەکو لە شوێنی خۆیدا بە دورو درێژ باسی ئەو ڕوویەڕوو بونەوەی ئاسوری و کوردەکان ئەکەین .

مصطفی یامولکی لە دوای ئەوەی ئنگلیزەکان ڕێگەیان دا لە ئستەمبولەوە بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی ( کە هاتەوە شیخ محمود ئاوارە بوو لە هیندستان)، مصطفی یامولکی کە گەورەترین دوژمنی تورکە کمالی یەکان بوەو تورکەکان ناویان نابوو (مصطفی نمرود) یامولکی لە کوردستاندا هەمیشە تەقەلای ئەوەی ئەدا کە بە هیچ جۆرێک تورکەکان دەسەلات پەیدا نەکەن و ویلایەتی موصل نەدرێتەوە بە تورک ، لەبەر ئەوە بەشوێن ئەوەدا ئەگەڕا کە دوژمن بۆ تورک زیاد بکات و خەڵک هان بدا دژی تورک کەلەو ڕووەوە هەندێ لەجل خوارەکان مصطفی یامولکی یان بە پیاوو ڕاسپێرراوی ئینگلیز دانابوو. مصطفی یامولکی لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی دابوو بە ئینگلیزەکان کە شاری سلێمانی بەبێ ئاگاداری ئەوان بەجێ نەهێلێت ، بەلاّم بە نهێنی سلێمانی بەجێ هێشتوەو خۆی گەیاندۆتە لای سمکۆ بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاسووریەکانا ڕێکیان بخات و بەمە دوژمن بۆ تورکیا زیاد بکات بەلاّم کوشتنی (مارشمعون) و ئاوارە کردنی هەزاران ئاسوری و ئاوارە بوونیان و نیشتەجێ بوونیان لە ناوچەی بادینانذا ئەوتەقەلایەی پوچەڵ کردبوەوەو بە خۆرایی ئاسوریەکانی کردبو بە دوژمنی خۆی و بە دوژمنی کوردو نیشتەجێ بوونی ئاسوریەکان لە خوارووی کوردستاندا و ڕێگە نەدانیان بەگەرانەوە بۆ شوێنی

خۆیان لە ناوچەی هەکاری چ لەلایەن تورکەکانەوەو چ لەلایەن سمکۆوە هەر بە هاندانی تورکەکان هەلێکی لەباری بۆ ئینگلیزی دوژمنی کورد رەخساندو توانی ئەو ئاسوریانە بقۆزێتەوەو تاماوەیەک بیانکا بە کوتەکی دەستی خۆی بۆ لێدانی شێخ محمود و راپەرینەکانی ناوچەی بارزانو بادینان و سورچی و شوێنەکانی تری کوردستان .

سمایل خانی شکاک یەکێک بووە لەو دەسەلاتدارانەی ناوچەیەکی گەورە ، کەساتێک خێزانەکانی شێخان و خزم و کەس و کاریان لێ یان قەوماوئاوارە بوون و چونە خاکی ئێرانەوە سمکۆ بۆ ماوەیەک ئەو خێزانانەی گرتە خۆی و خزمەتی کردن و کەساتێک سمکو شکاو لێی قەوماو ناچار رووی کردە کوردستانی تورکیا، خێزانە ئاوارە بووەکانیش چاریان نەماو لە زستانێکی زۆر سەختدا روویان کردە کوردستانی تورکیا ئەو خزمەت کردنەی سمکۆ بوو بە هۆی پەیدا بوونی دۆستایەتی لە نێوان شێخ محمود و سمکۆ دا کە ساتێک شێخ محمود لە گورو تەوژمی دەسەلاتی حوکمدارێتی دوهەمیا بوو، سمایل خان هاتۆتە کوردستان و شێخ محمود دەعوەتی کردوە بۆ سلێمانی و کە چووە بۆ سلێمانی وەکو سەرۆکی دەولەتێک پێشوازی لێ کراوەو تۆپی بەخێرهاتنی بۆ تەقێنراوەو شێخ خۆی چووە بە پیریەوە وەکو لە بەرگی دووهەمدا باسی ئەکەین.

بەلام ئەوەی جێگەی داخە ئەوە بوو کەلەگەل ئەوەشدا کە سمایل خان ئەو رۆژانەی کە هاتبووە سلێمانی راستە لەر رۆژانەدا تووشی شکست بو بو لەلایەن ئێرانیەکانەوەو تورکەکان دەستیان بریبوو هیچ یارمەتیەکیان نەدابوو ، بەلام لەگەل ئەوەشدا سمایل خان لە ناوچەی خۆی ناسراو بو پاش ماوەیەک گەرایەوەو ژمارەیەکی زۆری لە خەلک کۆکردەوەو تواناو دەسەلاتێکی باشی پەیدا کردەوە کە ئەیتوانی بەو تواناو دەسەلاتەوە هاوکاری لەگەل شێخ محمود بکاو بە هەردو لا خواروی کوردستان بکەن بە بنکەیەکی بە هێزو پتەوو بیکەنە بناغەی دامەزراندنی دەولەتێکی کوردی سەربەخۆ کە بەو زوانە ئەو دەولەتەی شێخ محمود لەناو نەدەچوو و هەلوێست لە ناوچەکەدا ئەگۆڕاو دوور نەبوو ئنگلیزیش والێ بکا بە حسابە کۆنەکانیا بچێتەوە، بەلام جگە لە یارمەتی خێزانە ئاوارەبوەکان بە هیچ

جۆرێک لەشەردا یارمەتی شێخی نەداوە وەکو لە شوێنی خۆیا دەرئەکەوێ. بەوجۆرە دووبارە بەداخەوە وەکو هەموو جارێکی تر، هەرلایەک بە جیا بۆ خۆی تەقەلای داوەو تواناو دەسەلاتی هیچ لایەک نەخراوەتە سەر تواناو دەسەلاتی ناوچەیەکی تری کوردستان، کە دوژمنانی کورد بە ئاسانی توانیویانە یەک بەیەک لەناویان ببەن.

مصطفی یامولکی وەکو وتمان بە نهێنی خۆی گەیاندبووە لای سمکۆ ئەگەرچی ئینگلیزەکان لە هاتنەوەیدا مەرجێکیان بۆ دانا بوو کە بەبێ پرسی ئەوان لە سلێمانی نە چێتە دەرەوە بەلاَم وادیارە گوێی نەدابووە ئەوە ( کە گەرایەوە ئینگلیزەکان ئەیگرن و تەحقیقاتێکی دوورو درێژیان لەگەلاَ کردبوو) ، لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەو راپۆرتەی مصطفی پاشا یامولکی ئەکەین کە دەربترەیئەو چوونەی بۆ لای سمکۆ تۆماری کردوە .

# ٨ـ پێوەندی شێخان لەناو خۆیاندا

شێخانی بەرزنجە، لەناو یەکتر دا ئەگەرچی خزمایەتیەکەشیان دوور بکەوتایەتەوە بەلاّم هەر خۆیان بە خزم و کەسو کارو سەرو بنی یەکتری زانیوەو زۆر جار لە لێقەومان و ناخۆشی و تەنگانەدا یەکتریان بەسەر کردوەو فریای یەکتری کەوتوون وەکو ئەو هاوکاریەی کە هەموان کردبویان دژی تالّەبانیەکان، کەبەر لەمە بە دوورو درێژی باسمان کردو جگەلەو هەرەشەیەی کەلە محمود پاشای جاف کراو بۆ تەمیّ کردنی مەنگوریەکان لەشکریان پێکەوە ناو بە کۆمەلّ چوون بە گژ هەمەوەندەکان و بێدەنگیان کردن کە لە دواییدا زۆریان بوون بە دۆستیان، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لە ژێرەوە هەندێکیان لەگەلّ یەکتردا نارێک بوون ، بە تایبەتی کە شێخ محمود ناوبانگی دەرکردو بوو بە دەسەلاّتدارو حوکمداری ناوچەکەو اعلانی دەولّەتەکەی کرد ، هەیان بووئەو دەسەلاّتداریەی شێخ محمودی بیّ خۆش نەبوو ، ئینگلیزەکانیش سودیان لەوە وەرگرتوەو بۆ نمونە توانیبویان سید احمدی حاجی مامند و شیخ یوسفی شەدەلّە لە شێخ محمود هەلّگێرنەوەو سید احمد بکەن بە مدیری ناحیەی سروچک و شیخ یوسفی شەدەلّە بکەن بە مدیری ناحیەی سورداش( لە حوکمدارێتی دووهەمدا ) .

یاداشتەکانی شێخ رووفی شیخ محمود«٢١»وەکو لە بەرگی دووهەمدا باسی ئەکەین بۆمان دەر ئەخا کە شێخ قادری برای شیخ محمود و حەپسەخانی نەقیبی ژنی، هەردوکیان ئەگەرچی بەسەر زاری لەگەلّ شیخ محمود دا بوون ، بەلاّم لە دواییدا لەگەلّیا نەبوون .

لە یاداشتەکانی شیخ قادرا وەکو مامۆستا رۆژبەیانی باسی کردووە«٢٧» ئەو یاداشتانەهەندیّ رەخنەو توانجی نارەواویّ سەرو پێی ئەوتۆی تێدایە دژی شیخ محمود کە رۆژبەیانی بە ناشایستەی داوەتە قەلّەم و شایانی ئەوە نەبووە کە باسیان بکا یاخود لیّ یان بدویّ.

شیخ باباعلی شیخ محمود باسی هەندێک لە شێخەکانی بەرزنجە بەم جۆرەی خوارەوە ئەکاو ئەڵێ:

«شیخ علي قەڵبەزە هەمیشە لەگەڵ شیخ محمود دابوە ، شیخ عبدالقادری گۆپ تەپە ( بە گوللە نەبڕ ناسراوە ) خۆیی و کورەکانی لەگەڵ شیخ محمودو شۆرشەکەیدا بوون ، بەلاّم شیخ عبدالکریمی قادر کەرەم کەلەلای ئینگلیزەکان بە کاپتن کریم ناسرابوو ( وەکو چۆن بابکری سلیم ئاغای پشدەریشیان هەر بە کاپتن بابکر ناو ئەبرد ) پیاوێکی زۆر دوو ڕوو بی بار بوو »

باباعلي نمونەیەکی بێ باری شیخ عبدالکریمی هێنایەوە و ئەڵێ «لەگەڵ ئەوەشدا بەسەر زاری خۆی بە دۆست و ئاشنا و خزمی گیانی بە گیانی شیخ محمود پیشان ئەدا بەلاّم کە وەختێک شیخ محمود دوای شکاندنی لە شەری ئاوباریکدا لە گەرەکی (اعظمیە)لە بەغدا نیشتەجێ کرا، ماوەیەکی زۆری پێ چوو باوکم بێزار بوو لە بەغدا ئەیویست بگەرێتەوە بۆ کوردستان و هەندێ کوردی دڵسۆزو دۆستی شێخ محمود وەفدێکیان پێکەوەناو چوونە لای یاسین الهاشمي کە سەرۆکی وەزیران بوو بۆ ئەوەی ریگا بدرێ شێخ بگەرێتەوە بۆ سلێمانی ، لە وەرامدا یاسین الهاشمي بە وەفدەکە ئەڵێ:

من تێ ناگەم و زۆرم لاسەیرە ئێوە هاتوون داوای گەرانەوەی شێخ محمود ئەکەن بۆ سلێمانی لە کاتێکدا شێخ عبدالکریمی قادر کەرەمی خزمی ئەڵێ ئەگەر شێخ محمود بگەرێتەوە بۆ کوردستان جارێکی تر ئەو ناوچەیەتان دووبارە لێ ئەشێوێنێتەوە.

شێخان هەر لە کۆنەوە لە سلێمانیدا لە ناو خۆیاندا دوو بەش بوون ، نەوەی کاک احمدی شێخ و نەوەی بابارسولّ .

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئامینە خانی دایکی شێخ محمود لە نەوەی بابا رسولّ بوو، بەلاّم ئەو دوو بەرەیە زۆر جار لەناو خۆیاندا نارێک بوون. جارێک تۆفیق وەهبی بەگ بۆی گێرامەوە ووتی شێخ محمود کەرەتێک رقی لە خزمانی دایکی هەڵساو لەسەر منارەی مزگەوتی گەورەوە کە هێشتا تازە لاو بوو تەقەی لە ماڵی بابا رسولّ کردوە کە ئەوسا ماڵی بابا رەسولّ لەو خانوەدا بوون کە لە پاشدا بوو بە

ماڵی مصطفی ئەفەندی مدیری معارف نزیکی ماڵی شێخ قادرو بەرامبەر مزگەوتی گەورە بوو .

شێخ روفی شیخ محمود لە یاداشتەکانیا«٢١» باسی ساردی نێوانی باوکی و سید احمدی خانەقای کردوەو ئەڵێ: کە باوکم بوو بە حوکمدار سید احمدی خانەقا کەلە کەرکوک دائەنیشت زۆر لایەنگری باوکم نەبوەو لەگەڵیا سارد بوە، باوکیشم حاجی سید حسنی مامی و سید عبداللەی کوری حاجی سید حسن ئەنێرێت بۆ لای سید احمد کە هۆی ئەو ساردیە تێ بگا و حاجی سید حسن رائەسپێرێت کە داوا لە سید احمد بکات بچێتە سلێمانی و لە جیاتی ئەوکاروباری ناوچەکە بیات بەرێوە و شێخ محمودیش ئامادەیە لە ژێر سەرکردایەتی ئەوا بێ ، بەلاّم سید احمد وەرامی ئەو داخوازیە ناداتەوە و نەش توانرا بزانرێ هۆی ئەو نەهاتن و قبوڵ نەکردنە چی بوە! ئایا هەر خۆی نەیویستوە یا بەراسپاردەی ئینگلیزەکان بووەو نەی ویستوە دانی پیا بنێت .

لە گفت و گۆیەکدا لەگەڵ کاک علی کمال دا کە شارەزای ئەوسەردەمەی شیخ محمودە باسی نارێکی نێوان شێخ محمود و شێخ صالحی نقیبی کرد کە ماڵی ئەوشیخ صالحە بەرامبەر بە ماڵی باوکی توفیق وەهبی بوە لەو سەردەمەدا ... لە رۆژێکی جەژندا لێ یان ئەبێ بە هەراو لەو شەرەی کەلە نێوانیاندا روو ئەدا کورێکی صوفی صالحی خفاف ئەکوژرێ کە پیاوی شێخ محمود بووە . ئەو کوشتنە بوو بە هۆی نارێکی یەکی زۆر کە ئاماوەیەک درێژەی کێشا .

جارێک توفیق وهبی بگ باسی هەندێک لەو ناکۆکیەی نێوانی بەرەی نەقیب و باباڕەسولی کرد کە شێخ رەزای تاڵەبانی لایەنگری بەرەی نەقیب بووەو بەرەی بابا رسول ئەو لایەنگریەی شێخ رەزایان پێ خۆش نەبووەو وەستا احمدی خەیات ( کە ئەویش شاعیر بووەو لە بنەچەدا خەڵکی سنەبوە) دیارە هێرشی بردۆتە سەر شێخ رەزا ، ئەوە بوو شێخ رەزاش بە شعرێک بەو وەستا احمدی خەیات ئەڵێ:

تۆزیچ لێمان بووگی وەشاعیر ئەی حەرام زادەی سنە
بوو چەشانێک ناخەفێنی،مەسرەفی چەس ئەی تنە

## ٩ ـ پێوەندی شێخانِ لەگەڵ بنەماڵەکانی شاری سلێمانی دا

جگە لە بنەماڵەی شێخان، لەناو شاری سلێمانیدا گەلێک خێزان و بنەماڵەی ناسیاوی تر هەبوون کە لەکاتی خۆیدا هەریەکەیان بەجۆرێک ناسراوو دیار بوون ؛ کاک علی کمال بەگ کە خۆی خەڵکی سلێمانیەو ماوەیەکی زۆر ئەندامی پارلەمانی عێراق بووە و لەگەڵ ناسراوەکانی بنەماڵەکانی تردا لە کۆنەوە پێوەندی هەبووەو لە زۆر هەڵوێستی کوردایەتی دا دەورێکی باشی بوەو یەکێک بوە لەو کوردانەی کەلە روشدیەی عسکری سلێمانی خوێندویەتی و لە ئەستەمبول لە مەکتەبی عسکریدەرچوەو بووە بە ئەفسەر و کەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان لە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٣ داکراوە بە معاونی مدیری پولیسی کۆیە و لەو رۆژانەدا کە شێخ محمود لە بەغدا دەست بەسەر بوە کاک علی کمال مدیری پۆلیسی بەغدا بوەو هەمیشە هات و چۆی شێخ محمودی کردووەو دۆستی بووە ئەڵێ من یەکێک بووم لەوانەی کەلە ساڵی ١٩٤١ دا لە هەرای رەشید عالی گەیلانی دا هانی شێخ محمودم دا بگەڕێتەوە بۆ کوردستان.هەروەها کاک علی کمال لەگەڵ ئەوەشدا ئیمرۆتەمەنی خۆی داوە لە نەوەدساڵ و بەرەو ژورتر بەڵام بیرەوەریەکانی کۆنی لە یاد ماوەو بە سوپاسەوە وەرامی هەندێک لەو پرسیارانەی دامەوە کە دەربارەی بنەماڵەکانی سلێمانی لێم کردبوو و سودێکی باشم لەسەرنجەکانی دەربارەی هەندێکیان وەرگرت .

### ١ــ بنەماڵەی بابانیەکان

کۆنترین بنەماڵەی سلێمانی بریتیە لە بنەماڵەی بابان کە ساتی خۆی لە قەلاچوالانەوە هاتونە سلێمانی و کردویانە بە پایتەختی ئەمارەتی بابان و دانیشتوانی ئەو سای قەلاچوالانیان لەگەڵ خۆیانا هێناوەتە سلێمانی و داوایان لە

عەشایرو ناوچەکانی تر کردوە کە خەڵک هان بدەن و بێنە سلێمانی نیشتەجێ بن.
لە دوای روخاندنی ئەمارەتی بابان لە ساڵی ١٨٥١ داو هاتنی لەشکری عوسمانی بۆ ناو شاری سلێمانی ئیتر ژمارەیەکی زۆر لە بابانەکان پەرەوازە بوون و چونە بەغداو لە ئەستەمبوڵ ژمارەیەک لەو بابانانەی کە وەکو دەست بەسەر بەزۆر لە ئەستەمبوڵ نیشتەجێ کرابون لە دواییدا رۆڵێکی زۆر گەورەیان بینیوە لەناو کۆمەڵگای کوردی لە ئەستەمبوڵدا کە زنار سلوپی( قدری جمیل بەگ) لە یاداشتەکانیا باسی زۆریانی کردوە «١٩».
لەنەوەی ئەوانەی لە بەغدا گیرسابونەوە ، جمال بابان بوو کە لە ساڵی ١٩١٤ دا رۆژنامەیەکی بە کوردی و بە تورکی دەرکردوە، حمدی بابان یەکێک بوو لەو کوردانەی کەلە ئەستەمبوڵەوە هاتەوەو کە شێخ محمود ئاوارە کرا بۆ هیندستان لەو ماوەیەدا گەرابوەوە بۆ بەغداو کە هەڵوێست لە کوردستاندا ئاڵۆز بوو ، ئینگلیزەکان ناچار بوون بیر لە دانانی کوردێک بکەنەوە کە بیکەن بە حوکمداری خوارووی کوردستان حمدی بابان یەکێک بوو لەو سێ کەسەی کە ئینگلیزەکان بەبیریانا هات و وەکو مامۆستا رفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ : وادیارە حمدی بابان لەو ئیمتیحانەی کە ئینگلیز بۆیان دانابوو دەرنەچوو بو چونکە کوردی باش نەزانیوە و ماوەیەک بو دوور بوە لە کوردستان لەبەر ئەوە خەڵک بەئاسانی سەرکردایەتی ئەویان قبوڵ نەکردوە وەکو لە باسێکی تایبەتی دا روونی ئەکەینەوە لە بەرگی دووهەمدا.
لە نەوەی ئەو بابانانەی کەلە زەمانی عوسمانلی دا لە بەغدا جێگیر بوبون لەسەردەمی حکومەتی مەلەکی عێراقدا گەلێک پیاوی ناسراویان لێ هەڵکەوت وەکو احمد مختار بابان و جلال بابان جگەلە جمال بەگی بابان کە لە پێشتردا باسمان کردو عزمی بەگی بابانیش لە تورکیاوە هاتەوەو لە سلێمانی دا جێگیربوەوە ؛ لە ساڵی ١٩١٤ دا حکمت بابان بوو بە نوێنەری سلێمانی لە مەجلسی مبعوثاندا لە ئەستەمبوڵ.
بنەماڵەی بابان لە دەوری حوکمداریتی شێخ محموددا هیچ دەورێکیان نەبینیوەو بەشداریان نەکردوە و لە یاداشت و لەو نوسینانەی کە پێوەندیان بەو رۆژانەی

حوکمدارێتی شێخ محمودەوە بووە ناوی هیچ کەسێکیان نەهاتووەو ئەوانەش کەلە ئەستەمبوڵ ماونەتەوە دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی کمالی یەکان ئیتر نەوەی ئەو بابانانەی کە لەوێ ماونەتەوە وورده وورده لەناو کۆمەڵگاکانی تورکیا تواونەتەوەو ئیتر ئەمرۆ کەسێکی وانیە کە بەناوی خێزان و بنەماڵەی ئەویوە وەکو کوردێک ناوی بزانرێت.

## ٢ـ بنەماڵەی ( قواس ـ غواص )

سەرەتای ناسراوی و بەناوبانگ بوونی ئەم بنەماڵەیە ( قواس ـ غواص ) لە(سليمان بەگی قواس)ەوە دەست پێ ئەکا کە مانای دەست راستیە لە نیشانە پێکاندا بە فارسی ووشەی(ق) ئەکرێ بە (غ) لەبەر ئەوە قواس بووە بە غواس و هەندێ لە نووسەرانی ئەو دەمە (وەکو ئەوەی زیوەر لە یاداشتەکانیا باسی کردوە)کە ناوی ئەو بنەماڵەیە هاتوە بە (غواص)یان تۆمار کردوە.

ئەو بنەماڵەیە لە کۆنەوە بە زۆری خوێندەوارو رۆشنبیر بوون و لە کارو باری دەولەتیدا لە زەمانی عوسمانلی دا زۆریان پێشکەوتوون و دەست رۆیوو بوون سەیر ئەوەیە لە دوای سليمان بەگ ئەوانەیان کە لەناو سوپای عوسمانلی دا کاروباریان کردووەیاخود لە ئەستەمبوڵ بوون بە ( خندان) ناسراون وەکو سعید پاشای خندان کە برازای سليمان بەگی قواس بوو و شریف پاشای خندان کە کوری سعید پاشا بوە بەلاٌم ئەوانەی تر کە لە کوردستان و لە کاروباری سوپایی و ئیداری و ناوچەی ویلایەتی موصل دا بوون هەر بە قواس ماونەتەوە.

سعید پاشاکە باوکی شریف پاشای خندان بووە ، ماوەیەک نائبی صدری اعظم بووەکە مانای نائبی سەرۆک وەزیرانی ئەو سەردەمە بوە جگەلەوەی ماوەکیش وەزیری دەرەوەو ناوخۆ بووە؛ سعید پاشا وەکو لە باسی رۆشنبیریدا ناومان هێنا لە سالی ١٨٩٢ ـ ١٨٩٣ مەکتەبی روشدیەی عسکری لە سلێمانیدا کردۆتەوە کە بەوە خزمەتێکی ئێجگار گەورەی سلێمانی و ناوچەکەی کردوە و ژمارەیەکی زۆر

له کاربەدەستان و ئەفسەرانی کورد لەو مەکتەبە دەرچوون ؛ جگەلەوە وەکو جارێک تۆفیق وەهبی باسی کرد، ئەو سعید پاشایە دەورێکی زۆری بووە لە دانی لەقەبی «پاشا»یەتی بۆ هەندێ کوردی ئەو سەردەمە وەکو محمود پاشاو وەسمان پاشاو بایز پاشای مەنگورو هەندێکی تر .

شریف پاشای خندان ( کوری سعید پاشای خندانە خێزانەکەی کچی خدیوی میصر ـ خدیو اسماعیل ) بووە و ماوەیەک سەفیری دەولەتی عوسمانلی بووە لە ستۆکهۆلم و لە دواییدا کراوە بە وەزیری دەرەوەی عوسمانلی و لە دوای وەستانی شەر بەپێی پەیمانی ( مودراس )و بەستنی کۆنگرەی ئاشتی، شریف پاشا وازی لە فەرمانبەرێتی و نوێنەرایەتی عوسمانلی هیناوەولەو کۆنگرەیەدا ئاشکرای کردووە کە خۆی بە نوێنەری میللەتی کورد ئەزانێ و پێوەندی بە عوسمانیەوە نەماوە و لەو کۆنگرەیەداو لە دارشتنی مادەکانی ٦٢و ٦٣و ٦٤ ی پەیمانی سیڤەردا کە پێوەندیان بە کوردەوە هەبوو دەورێکی ئێجگار گەورەی هەبوەو توانیویتی مسەلەی کورد لە باسێکی ناوچەییەوە پالْ پێوە بنێت بەرەو پێشەوەو بۆ یەکەم جار لە کۆنگرەیەکی جیهانیدا باسی مافی کوردو سەربەخۆیی کورد دەست نیشان بکرێت کەلە باسی کۆنگرەی ئاشتی و لە پەیمانی سیڤەردا لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا بە دوورو درێژی باسی ئەکەین و باسی شریف پاشای خندان ئەکەین.

جگەلە سلیمان بەگ و سعید پاشاو شریف پاشای خندان قادر پاشا مدیری ناحیەی سروچک بوەو تۆفیق بەگی طابور ئاغاسی چ لە سلێمانی و چ لە موصلْ دا کە بە ( دارەکەبێنە) ناسراوە مدیری پۆلیس بووە لە سلێمانیدا و لە موصلْدا کە شێخ رووف و شێخ قادر هەردوکیان باسی ئەوەیان کردووە کە ئەو بووە دەرگاکەی لە رووی شیخ سعید دا داخستوەو لە لایەن ئاژاوە چیەکانی موصلْەوە کوژراوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسمان کرد.

تۆفیق بەگی طابور ئاغاسی لە پێش شەری یەکەمدا خانە نشین کراوە بەلاّم کە شەری جیهانی دەستی پێ کردەوە یەکسەر جلە عەسکەریەکانی لەبەر کردوەو چوە بۆ شەری جیهانی و لە شەری روس و عوسمانلی دا بەشداری کردوەو لەو شەرەدا

کوژراوە وەکو جارێک دکتۆر کماڵ فواد بۆی گێرامەوە جلەکانی توفیق بەگ و شیرەکەی تۆفیق بەگی طابور ئاغاسی لە دوای کوشتنی هێنراوەتەوە بۆ سلێمانی و ماوەیەک لەماڵی کریم بەگی باوکیا ( فواد ) هەرمابوو.

احمد بەگی کوری تۆفیق بەگی طابور ئاغاسی لە دوای باوکی هاتۆتە پێشەوەو کە شەر برایەوەو ئینگلیزەکان هاتنە کرکوک و لە پاش ماوەیەک چۆڵیان کرد و بۆ چەند رۆژێک تورکەکان کرکوکیان گرتەوە شیخ محمودیان گرت و ناردیان بۆ کرکوک و لەوێوە بۆ موصلْ (وەکو لە شوێنی خۆیدا بە دوورو درێژی باسی ئەکەین) جگەلە شیخ محمود چەند کەسێکی تریش لە خەڵکی سلێمانی لەسەر ئەوە گیراون کە یەکێک لەمانە احمد بەگی توفیق بەگ بووەوە دوای ئەوە شیخ محمود گیراو ئاوارە کرا بۆ هیندستان، هەندێ کۆمەڵو رێکخراو لە سلێمانیدا پێک هاتوەو یەکێک لە تەقەلاکانی ئەو کۆمەڵە داواکردنی هێنانەوەی شیخ محمود بوە لە هیندستان کە احمد بەگی تۆفیق بەگ ئەندامی ئەو کۆمەڵە بووە و کە ئینگلیزەکان بەر لەوەی شیخ محمود لە هیندستانەوە بگاتەوە سلێمانی شاری سلێمانیان چۆڵکرد و کاروباری شارەکەیان دایە دەست ئەو مجلسی ئیداریەی کە خەڵکەکە هەڵیان بژارد بوون ، احمد بەگ یەکێک بووە لە ئەندامانی ئەو مجلیسە.

احمد بەگ لە دواییدا کرا بە متصرفی سلێمانی و لە بیرم دێ هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی دابووم لەسەرەتای ساڵی سیەکانا احمد بەگ زۆر جار ئەهاتە قوتابخانەکەمان ( قوتابخانەی فیصلیە)و سەیری کاروباری قوتابخانەکەی ئەکردو لە کۆبونەوەی گشتی قوتابخانەدا بە مامۆستاو قوتابیەوە هاواری ئەکرد: بخوێنن ... دوا رۆژی میللەتەکەتان بەوەوە بەندە ، پرەمێردی شاعیر لە رۆژنامەکەیدا زۆر ستایشی احمد بەگی کردووە کە لە راستیدا احمد بەگ خزمەتێکی ئێجگار گەورەی کردوە بەکردنەوەی قوتابخانەی(زانستی شەو) کەبە باروبوو یارمەتی خەڵکی سلێمانی براوە بەرێوە.

لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێی بەغدا ژمارە/ ۱۲۰ ی کانونی یەکەمی ساڵی ۱۹۸۸باسێکی تیا دایە بە پێنووسی د. کوردستان( کچی گیو موکریانی) باسی

یاداشتێکی حسین حوزنی موکریانی مامی ئەکا(داماو)کە بە پێنوسی خۆی لە سالی ١٩٣٤ دا تۆماری کردوە کە وتویەتی لە کۆتایی شەری یەکەمی جیهانیدا پەیمانێک لە نێوان شێخ محمود و احمد بەگی توفیق بەگ دا کراوە کە شێخ محمود بۆ ئەوە چۆتە لای احمد بەگ و داوای لێ کردووە بە جوتە لەناو خۆیانا پەیمانێک ببەستن کە لە دوا رۆژدا هەر کسێکیان دەسەلاتی پەیدا کردو دەستی رۆیشت ئەوی تری لەبیر نەچێتەوە و شیخ محمود بە احمد بەگ ئەلێ:

« لە دەوری باوکم دا ـ شێخ سعید ـ باوکم و مامم دوژمنی باوکی تۆبون ومن بە پەنهانی و بە تاریکی شەو خۆم گیاندە باوکت و کۆمەکی ئەوم کرد کە احمد بەگ لە شێخ محمود ئەپرسێت چی بەدەستەوەیە، شێخ وەرامی ئەداتەوەو ئەلێ: ئەوا تورک ئەروات و حکومەتی تورک ناچارە ئەم ئیدارەو کاروباری ئێرەی بدرێتە دەست ئێمە، بۆ هەر کامێکمان هەلسورا با ئەوی تر لە یاد نەکا ... ئەمە بوو بەلێن و پەیمانی هەردوو لا ».

بەلأم ئەوەبوو شێخ محمود بوو بە دەسەلأتدارو حوکمدار ... ئایا شێخ محمود احمد بەگی بەیاد نەکردەوە یا هۆیەکی تایبەتی هەبوە کە احمد بەگ نەی ویستوە خۆی لە شێخ محمود نزیک بکاتەوەو بەشداری لەگەلأ نەکات وەکو ئەو بەشداری نەکردنەی سید احمدی خانەقا کەلە پێشتر دا باسمان کرد؟

## ٣ـ بنەمالەی ئاغا طە

ئەو بنەمالەیە وەکو بنەمالەیەکی کۆنی شاری سلێمانی کە دیارە هەرلە کۆنەوە پارە دار بوون و بە دەولەمەندی هاتبوونە سلێمانی و هەندێک ئەلێن لە ئەنجامی ئەو بانگەوازەی کە ئیبراهیم پاشای بابان نارد بووی بۆ زۆر لایان کە بەشداری بکەن لە ئاواکردنەوەی سلێمانیدا ، ئەوبنەمالەیەش لە وەختی خۆیدا لە گەرەکی (دەرگەزێن )ی هەمدانەوە هاتونەتە سلێمانی و گەرەکی تازەیان ئاوەدان کردۆتەوە بە ناوی گەرەکی دەرگەزێنەوە ، ئەگەرچی تۆفیق وەهبی لەو رووەوە بۆچونێکی

تری هەیە و لەوباسەی کە دەربارەی قەلاچوالان/ەوە بلاوی کردبوەوە لە رۆژنامەی (التآخی) ژمارە ١٤٥٤ی رۆژی ١٩٧٣/١/٨ کە باسی ئەوەی کردوە وەختی خۆی لە قەلاچوالانیش گەرەکێک هەر هەبووە بەناوی (دەرگەزێن)ەوە کە ئەو بنەماڵەیە هاتونە سلێمانی و گەرەکی دەرگەزێنیان ئاوەدان کردۆتەوەو تیا نیشتەجێ بوون و هەر چۆنێک بێ چ ئەوو چ هەندی نووسەری تر لەسەر ئەوەن کە نەک هەر ئەوانەی کە روویان کردۆتە دەرگەزێنی قەلاچوالان یا سلێمانی بەڵکو لە بەغداش هەبووە بەناوی (دەرگەزەلی) ئەوانەش هەر لەو بنەماڵەیە بوون و زۆر کەس لە کۆنەوە لەو بنەماڵەیەدا ناسراو بوون بە بازرگان و بە پارەدار وەکو ئاغا طە و حاجی ئەولاغاو حاجی علي ئاغاو مارف ئاغاو حاجی سعید ئاغا و حاجی مەلامحی الدین کە حاجی سید ئاغا لە دەوڵەتی عێراقدا چەند جارێک بووە بە ئەندامی مجلسی ( ئەعیان) و غفور ئاغای ئامۆزایان ماوەیەک سەرۆکی شارەوانی بووە لە سلێمانیدا کە میجرسۆن لە گەشتەکەیدا باسی کردوەو ئێمەش لە باسی کۆمەڵایەتی دا گفت وگۆی غفور ئاغاو میجرسۆنمان بلاوکردەوە وەکو چۆن خۆی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە «٣٩» بەلای هەندی کەسەوە کە کاک علی کمال یەکێکە لەوانە، ئەوبنەماڵەیە بەزۆری لەگەڵ حکومەتی دەست رۆییو دابوون بەتایبەتی لە زەمانی عوسمانلی داو لە خەباتی نیشتمانی دا دوورە پەرێز بوون و هەندێ کەس وایان باس ئەکەن کە ئەوان بوون کە بەهۆی نارێکیانەوە لەگەڵ شێخاندا داوایان لە عوسمانلییەکان کردوە لەساڵی ١٨٥١م دا بێنە ناو سلێمانیەوە و داگیری بکەن و سالمی شاعیر لە شیعرێکدا هەجوی کردون و بەو جۆرە ئەمارەتی بابان لەناو براوە، ئەو کێشەیەی نێوانی ئەوان و شێخان لە کارەساتەکەی موصڵ دوای ئاوارەکردنی شێخان روویداوە کە ئەو ئاوارەبوونە بە پیلان و دەسیسەی کۆمەڵی اتحادو ترەقی بوە کەلە لقی سلێمانی پێک هاتبوو محمود پاشاو بازرگانەکان بەشداریان تێدا کردبوو ، شێخان ئەو رقەیان هەر لە دڵا بوو کە شێخ محمود بوو بە حاکمدار ئەوبنەماڵەیە بە هیچ جۆرێک لە چالاکی نیشتمانیدا بەشداریان نەکردوە ؛ وەکو کاک علی کمال بۆی باسکردم ، غفور ئاغای ئامۆزای حاجی سعید ئاغاو حاجی مەلا محی الدین و کورانی مارف ئاغا

له کۆنەوە لەگەڵ شێخاندا نارێک بوون و غفور ئاغا چەند پیاوێکی چەکداری دڕی بوە یەکێک لەوانە ( علی سنەیی) بوە کە پێی وتراوە (علي ئاغای حەبیب) ئەو علی سنەییە رشیدی لاوەی پیاوی شێخ محمودی کوشتوە بە هاندانی غفور ئاغاو شێخ محمودیش ناردوێتی تەقەیان لە ماڵی غفور ئاغا کردوە و بەوە ئاگری نارێکی و دووبەرەکی دووبارە خۆشکراوە .

وەکو وتمان لە دەوری حوکمدارێتی شێخ محمود دا هیچ بەشداریەکیان نەکردوەو خۆیان وا پیشان داوە کە جگەلە بازرگانی و کاسبی نایانەوێ بە هیچی ترەوە خۆیان خەریک بکەن ؛ هەرچۆنێک بێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەوبنەماڵەیە زۆر ناسراوو دەست رۆیوو پارە دار بوون و شوێنی خۆیان هەبوەو رێزیان لێ گیراوەو زۆریان بێ وەی بوون و خێرەو مەند بوون و زیانیان نەبووە بۆکەس.

## ٤ـ بنەماڵەی حاجی ئەولاَی کەرکوکی

ئەو بنەماڵەیە هەرچەند بە کەرکوکی و کەرکوکلی زادە ناسراون بەلاّم لە راستیدا خەڵکی سلێمانی بوون و بۆیە ناوی کەرکوکیان بەسەردا براوە چونکە بازرگانی و ئاڵوگۆریان بەزۆری لەگەڵ شاری کەرکوکدا بوە جگە لە حەمە کەرکوکی خۆی حاجی ئەولاَی کوری و حاجی مەلا سەعیدو کریم بەگ و احمد ئاغای کەرکوکلی و حاجی صالح ئاغاوحسێن ئاغا لە کورانی حاجی ئەولاَ لە ناسراوەکانی ئەو بنەماڵەیە بوون .

حاجی مەلا سعید خوێندەوارێکی باش بووەو دوجار کراوە بە ئەندامی مجلسی مبعوسان لە ئەستەمبول جاری یەکەم لە ١٩٠٨/١٢/١٧دا بوەکە ئەو رۆژانە کۆمەڵی اتحاد و ترقی لە گورو تەوژمی دەسەلاّتداریدا بوون و ئەوجارە لەگەڵ ئەودا (عبدالله صافی) نوێنەری کوردەکانی کەرکوک بووە لە مجلسی مبعوثاندا(لە بەرگی دووهەمدا باسی عبدالله صافی ئەکەین لەو تەقەلایانەی کە دابووی بۆ داخوازی مافی کورد و هەر ئەو عبدالله صافی یەش بووە کە تورکەکان

له سالی ۱۹۱۸وه چونەتەوە کرکوک و داگیریان کردووە ئەو نامەیەی کە شێخ محمود ناردبووی بۆ ئینگلیزەکان لە کەرکوک لە لایەن عداللە صافیەوە لە جیاتی بدرێ بە ئینگلیزەکان دابووی بە تورکەکان کە شێخ محمود لەسەر ئەوە گیراو محاکمە کرا وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین .

جاری دووهەم کە حاجی مەلا سعید لە سالی ۱۹۱٤ دا بووە بە ئەندامی مجلسی مبعوثان وەکو نوێنەری شاری سلێمانی کە ئەمجارە ( حکمت ) بابانیش هەرنوێنەری سلێمانی بووە لەگەڵ حاجی مەلا سعید دا.جارێک توفیق وەهبی باسی ئەوەی بۆ کردین کە حاجی مەلا سعید کرا بە ئەندامی مجلس وچووە ئەستەمبول شوکری فەزلی شاعیریشی لەگەڵ خۆیدا بردوە بۆ ئەستەمبول کە تورکیەکی زۆر باشی زانیوەو ، توفیق وەهبی ووتی شوکری فەزلی لەوێش بێدەنگ دانەنیشت و زمانی خۆی نەدەپاراست ، تورکەکان گرتیان و خستیانە بەندیخانەوە بەلاّم بەرێکەوت من مدیری پۆلیسی ئەستەمبولم ئەناسی و چومە لای و شوکری فەزلیم بەرەڵلاّ کرد .

کریم بەگ کەلە کۆمەڵگای کوردەکانی ئەستەمبولدا بە کریم بەگی سلێمانی ناسراو بوو کوردێکی زۆر چاک و رۆشنبیر بوو و لێپرسراوی گۆڤاری ( رۆژی کورد )بوولە ئەستەمبولْ زنار سلوپی ( قدری جمیل بەگ) لەیاداشتەکانیا دەربارەی کریم بەگ ئەڵیٚ۱۹:

کریم بەگ ئەندامی کۆمەڵی هیڤی بوەو سەرنووسەری گۆڤاری رۆژی کورد بوەکە هەموو هەفتەیەک بە زمانی کوردی و تورکی دەرچوە و لە باسی رۆشنبیریدا بە دوورو درێژی باسی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەمان کردووە( کەبەداخەوە ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە لە هیچ شوێنێک دەسگیر نابن کە وەکو سەرچاوەیەک پەنای بیرێتە بەرو هەواڵی ئەو رۆژانەو چالاکیەکانی ئەو رۆژانەیان لیٚ وەربگیریٚ) .

جارێک توفیق وهبی باسی کریم بەگی کرد ، ووتی یەکێک بووە لەهەرە چالاکەکانی کوردی ئەو رۆژانە کە رۆڵێکی زۆر گەورەی بینیوە لەناو کوردەکانی ئەستەمبوڵدا و بەهۆی نوسینە توند و تیژەکانیەوە کەلە گۆڤاری رۆژی کورد دا بلاّوی کردبوەوە حکومەتی عوسمانلی گرتیان و خستیانە زیندانەوە بەلاّم

بابانەکانی ئەستەمبولْ بۆی تێکۆشان و توانیان لە بەندیخانە بیهێننە دەرەوە. لە دوای روخانی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی کمالیەکان ، گەراوەتەوە بۆ خوارووی کوردستان و ماوەیەک محاماتی کردووە و ماوەیەکیش بووە بە حاکمی منفرد احمد ئاغای کرکوکیش یەکێک بووە لە ناسراوەکانی ئەوبنەماڵەیە و هەمیشە بە پارەدارو بە بازرگان ناسراوەو لە بەغدا نیشتەجێ بووە.

مامۆستا رفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:«٢»

کە ساتێک مێجەرنۆئیل هاتە سلێمانی و بەشێوەیەکی رەسمی بلاْوی کردەوەکە شێخ محمود کراوە بە حوکمداری کوردستان لە (١ی تشرینی دوهەمی ساڵی ١٩١٨دا) بۆ ئێوارەی ئەورۆژە پیاوە ناسراوو ناودارەکان و خوێندەوارانی سلێمانی و ناوچەکە هەموو لە ماڵی شێخ محمود کۆبونەوەو (بەیعەت)یان بە حوکمدارێتی شێخ محمود کردو من و احمد ئاغای کرکوکلی پێکەوە چوین و بەشداریمان کرد لەو بەیعەتەدا. لەسەردەمی لاوێتی ئێمەدا هەندێک لە پیرەکانی ئەوسەردەمە باسی ئەو نارێکیەی شیخان و هەندی لە ئاغاو بەگلەران و بازرگانەکانیان بۆ ﮊەکردین کە ساتێک شێخ مارفی نەقیب ئەمرێ ئەوانەی کە نارێک بوون لەگەڵ شێخاندا هەنێکیان ئەوەیان بە هەل زانیوەو بۆ ئاشت بونەوە تاقم تاقم چون بۆ پرسەی شێخ مارف و سەرخۆشیان لە کەس و کاری کردوە ، یەکێکیان جارێک بە پێکەنینەوە وتی: احمد ئاغای کرکوکلیش یەکێک ئەبێ لە وانەی کەبریار ئەدات بچێت بۆ ئەو پرسەیە ، کە ئەگاتە بەر ماڵی شێخ مارف تەماشا ئەکا قورێکی خست گیراوەتەوەو زەلامێک بە خاکەنازێکەوە وەستاوە هەرچی ئەچێتە ژوورەوە سووکەخاکەنازێک قورِ ئەسون بەشانیا،کە احمد ئاغا ئەوە ئەبینێت پاشەو پاش ئەگەرێتەوە و ناچێ بۆ سەرخۆشی کردن .ئەو نەریتە کۆنە لەناو زۆربەی عەشیرەتەکانی کوردا هەتا ماوەیەک لەمەوبەر هەرمابوو.

## ٥- بنەماڵەی مسرەف

---

بنەماڵەی مسرەف یەکێکن لە بنەماڵە ناسراوەکانی سلێمانی کە هەرلە زەمانی بابانەوە خاوەن موڵک و دەسەلاْتدار بوون ، کلۆدیس ریچ لەگەشتەکەیدا «٤٨»

باسی بنەماڵەی مسرەف ئەکاو کە چۆنسلێمانی لە ساڵی ۱۸۲۰دا دۆستایەتی لەگەڵیانا پەیدا کردووەو ریچ ئەڵێ : کە چومە سلێمانی محمود ئاغای مسرەف کە باوکی عزیز ئاغای مسرەف بوو سەرۆک وەزیرانی میری بەبە بوو ، بەرلەوەی لە سلێمانی یەکتر ببینین ، لە بەغدا ناوبانگیم لە هەندێ کس بیستبووکە چوومە سلێمانی دەعوەتی کردم وپێکەوە چوین بۆسەیری شەرە کەوێک کەلای کوردەکان زۆر باو بوو جگەلەوە باسی محمود ئاغای مسرەف ئەکا وەکو پیاوێکی سپۆرت و لێهاتوو لەو ئیدارەیەی میری باباندا .

کاک علی کمال بەگ کە شارەزای زۆربەی بنەماڵەکانی سلێمانیە ئەڵێ لەدوای محمود ئاغاو عزیزئاغای مسرەف، (رەحەی ئەولاغا) نیازی لە ئەورەحمان ئاغای باوکی حەماغا بووەپیا وێکی لێ هاتوو بوە .

شێخ رەئوفی شیخ محمود لە یاداشتەکانیادەربارەی ئەوبنەماڵەیە ئەڵێ:«۲۱»

ئەوبنەماڵەیە لە خێزانە ناسراوەکانی ئەوسەردەمەی سلێمانی بوون، عزیزی مسرەف و محمودی مسرەف هەردوکیان لەکاتی خۆیدا وەزیری دارایی بابانەکان بوون و کاروباری دەرامەدی ئمارەتەکەیان بردووە بەرێوە .

ئەوبنەماڵەیە لە بنەچەدا لە عەشیرەتی بلباس بوون و لە زەماني بابانەکاندا دوای ئەوەی ابراهیم پاشا شاری سلێمانی ئاوەدان کردو پایتەختەکەی لە قەلاچوالانەوە گواستەوە بۆ سلێمانی ئەو بنە ماڵەیش لەگەڵ میری باباندا هاتنە سلێمانی و نیشتەجێ بوون .

شێخ رووف لە یاداشتەکانیان ئەڵێ: لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ناکۆکی لە نێوان ئەو بنەماڵەیەو شێخاندا هەبوو ،( بێگومان بەربەرەکانی و نارێکی هەر لەسەر زەوی و زار بووە کە هەردوو لا لە جۆگای کاک احمدو ئاوبارەو بەکرە جۆ دا موڵکیان بووە تا ساڵی چلەکانیش کێشەیان لەسەر بووە)بەلاٚم لەگەڵ ئەوەشدا حەماغای عبدالرحمن ئاغا کەلە زەمانی شێخ محمود دا پیاوێکی ناسراوو دەست رۆیو بوە، شێخ محمود کە کرا بە حوکمدار حماغاشی کرد بە وەزیری خۆی(لە حوکمدارێتی دووهەمیا کردبووی بە وەزیرو جگەلەوە لە حوکمدارێتی یەکەمیشدا ، کە شێخ رووی کردە دەربەندی بازیان و لە سلێمانیدا لێژنەیەکی دانا بۆ

کاروباری ناو شار حماغا یەکێک بووە لەوان وەکو لە باسی روو بەروو بوونەوەی ئینگلیزەکاندا باسی ئەکەین) بە پێچەوانەی هەندێ کسی موڵکداری ترەوە حماغاهەتا سەر بەپاکی مایەوەو نەچوە پاڵ ئینگلیزەکان و هەڵوێستی وای نەبووە کە دوژمنایەتی تیادا بەدی بکرێ دژی شێخ محمود ، بەڵکو هەمیشە هەڵوێستی نیشتمانی هەبووەو لە کوردایەتی لای نەداوەو یەکێک بووە لەوانەی لە شۆرشی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰ دا گیراو درا بە دادگا.

کاک علی کمال لەباسی حماغا دا ئەڵێ: کە شێخ محمود لە کاتی هەرای رشید عالی دا بەغدای بەجێهێشت و هاتە سیتەک ، بە راسپاردەی ئەمین زەکی بەگ کە ئەوسا لەو رۆژانەدا لە شەقلاوە بوو من و حماغاو میرزا توفیق قەزازو حمەعلی روستەم چوینە لای شێخ محمود بۆ سیتەک بۆ ئەوەی هەوڵ بدەین هێزێک کۆبکەینەوە کە دەسەلاتی کورد لە ناوچەکەدا پیشان بدەین ، بەڵام ئەو تەقەلایەمان سەری نەگرت و وادیار بوو کە شێخ محمود لە ساڵی ۱۹٤۱ دا کە گەرایەوە ئیتر بریاری دابوو هیچ جۆرە چالاکیەکی سیاسی نەنوێنێت .

## ٦ـ پێوەندی شێخان و شیخ محمود لەگەڵ بنەماڵەو ناسراوەکانی تردا

بێجگەلە لەو بنەمالانەی پێشوو کە باسمان کردن گەلێک پیاوی ناسراوو خێزانی ناسراوی تر هەبوە وەکو صاحبقران و بنەماڵەی کەریمی عەلەکە و قەزازەکان حاجی ئیبراهیم ئاغا و ئاغالەر و بەگزادەو یامولکی و ئیبراهیم ئاغای خوبیلەی کاکەیی و ئاغای سیوەیلی و خێلی فەرخەو گەلێک بنەماڵەی زانیاری و مەلازادەو شێخی بەرماڵ وەکو شێخانی نەقشبەندی لە تەوێڵەو بیارەو مەردۆخیەکانی قەرەداغ و سلێمانی و مەلا دێلێژەیی و خواجا ئەفەندی و مەلا سعیدی زلزلەیی و حاجی شێخ ئەمین و هەندێکی تر کە هەریەکەیان کە بەجۆرێک دەوریان بینیوەو کەم و زۆر پێوەندیان بە شێخانەوە هەبووە .

لە سلێمانیدا جگەلەوانەی کەلە حوجرەی مزگەوتەکاندا پێگەیشتون و بوون بە

خوێندەوار، ئەوانەی لە مەکتەبی رشدی عسکەری دەرچوون ژمارەیەکیزۆریان بوون بە کاربەدەست و ئەفسەروله زەمانی عوسمانلی و لە دوای رووخاندنی و لەکاتی حوکمدارێتی شێخ محمود داو لەناو دەزگاکانی حکومەتی عێراقدا جێگەیان دیاری بوەو ناسرا بوون وەکو ئەمین زەکی بەگ و توفیق وەهبی و پرەمێردو حاجی مصطفی پاشا یامولکی و صالح زەکی صاحبقران و محمود جەودەت و رشید جەودەت و جمال عیرفان و عارف صائب و گەلێکی تر کە زۆریان لەم کتێبەدا ناویان دێ و هەندێکیان دەوری رۆشنبیری یان بووە یا بەشداری کاروباریان کردووە لە حوکمداریەتەکەی شێخ محمود دا.

بەرلە حوکمداریتی شێخ محمودو لەدەوری حوکمدارێتی ئەویشدا کێشەیەکی زۆر هەبووە لە نێوانی خوێندەواران و رۆشنبیران لەلایەک و کۆنەپەرست و وشکە مەلا و صوفی و شێخی کەلله رەقدا .

کە شێخ محمود لەو رۆژە ناسکانەی دوای شەری جیهانی جلەوی شۆرشگێرێتی میللەتەکەی گرتە دەست و لە ئەنجامدا ناچارکرا روو بە رووی ئینگلیزەکان بوەستێتەوە بە چوار دەوری خۆیا چاوی ئەگێرا لە ژمارەیەکی کەم خوێندەوارو رۆشنبیری دڵسۆزو خەباتکەری دڵسۆز بەولاوە ئەوانی تر زۆربەیان باسی نیشتمان پەروەری و مافی میللەتی کورد و سیاسەتیان نەزانیوە.

جارێک تۆفیق وەهبی بۆی گێرامەوە ووتی مەلاکان لەکاتی شەری یەکەمی جیهانیداو بەرلەوەو لەدوای ئەوەش هەمیشە بەربەرەکانی ئەوجۆرە خوێندەوارانەیان ئەکرد هەر کەسێک ئەگەر لە رێرەوی بیرکردنەوەی تەسکی ئەوان لای بدایە و لە باسی بەهەشت و دۆزەخ و شەرحی قورئان و تەفسیری حەدیس و ئەو کتێبە ئاینیانەی کە لەو رۆژانەدا باوو بوون و تێ هەڵکێشیش شیعری فارسی و داستانی رۆستەم و شانامەی فیردەوسی و شیعری حافزی شیرازی و گولستان و بوستانی سعدی بەولاوە هەر شتێکی لە سنووری زانیاری و مێشکی ئەوان تێپەری بکردایە بە کفر و خۆلادانیان ئەزانی و باسی جوگرافیاو خولانەوەی زەوی و رۆژو ، ئەمانەیان بەتاوانێکی گەورە ئەزانی و بەرلە شەری جیهانی مەلاکان لەناو خۆیاندا لیستەیەکیان کردبوو بەناوی ئەوانەی ( مونەوەر، فەرمەسۆن،

ئەفەندی بۆیمباغ لەمل) بۆ ئەوەی یەکە یەکە بەناوی پارێزگاری لە ئایینی ئیسلامەوە بیان کوژن و ( هەرکەسێکیش ئەوانەی بکوشتایە دەستی سەوز ئەبوو) ووتی منیش ناوم لەو لیستەیەدا هەبوو رۆژێک حاجی مەلا رسولی دیلێژەیی لە رێگا بویمباغەکەی گرتم و توند لە ملمی ئالاند و هاواری کرد ئەم بەچکە کافرانە کە ئەیانەوێ کفرو خوانەناسی بەناو خەڵکدا بلاو بکەنەوە ، بەلاْم باش بوومامۆستاکەی جارانم (مەلا مصطفی کوردە) کە مەلاو زانایەکی ناسراوو رێز لێ گیراوبوو فریام کەوت و زرگاری کردم بەلاْم یەکێکی وەکو جمال عیرفانی زیرەک و دانا گوێی نە ئەدایە و سەرە رۆ بوو بە ئاشکرا و سڵی نەئەکردەوە و هەرچیەکی ئەزانی دەربارەی زانیاری هەمووی لەناو خەڵکدا ئەوت کە لە ئەنجامی ئەوەدا لە دواییدا بەدەست کابرایەکی کەللە رەق کوژرا ( لەلایەن پیاوەکانی حەمەبچکۆلی علی ئاغای پشدەری یەوە کوژرا کە لە دواییدا بوو بە خزمی ماجد مصطفی)

بێگومان گەلێک نموونەی تری وەکو جمال عیرفان هەیە کە توفیق وەهبی بەگ باسی کردن یەکێکی تری وەکو عارف صائب ئەویش بەدەستی کابرایەکی سەرەرۆو سەرچل کوژرا ( شێخ محمدی سیدە بچکۆلە لە گوندی قەرە چتان کوشتویەتی) کە ماوەیەک لە شۆرشدا لەگەڵ شیخ محمود دا بوو ئەویش بەبێ تاوان کوژرا ، شێخ رووفی شێخ محمود لە یاداشتەکانیا دەربارەی کوشتنی عارف صائب «٢١»ئەڵێ:

عارف صائب یەکێک بوو لەوانەی کە زۆر مخلصی باوکم بوو ، هەموو جارێک کەباسی کوشتنی عارف صائب ئەکرا باوکم خەفەتی ئەخواردو ئەی ووت چۆن بە خۆرایی ئەو پیاوە راست و باشەمان لە کیس چوو، بێجگەلەوەی کە شێخ رووف لە یاداشتەکانیا باسی کردووە دەربارەی عارف صائب جارێک لە پێش کۆچی دوایی شێخدا لە داریکەلی لە خزمەت شێخدا باسی ئەوکوشتنەی عارف صائب کراو شێخ فەرمووی خوا شێخ محمد بگرێ بە خۆرایی ئەو دۆستە دڵسۆزەی لەکیس داین، لە دیوانەکەی پیرەمێردی نەمردا کەلە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠ دا چاپم کرد باسی ئەو گفت و گۆیەی شێخم باس کردوە پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی

بکەمەوە.

بەکورتی نارێکی نیوان عەشیرەتەکانی کوردو بنەماڵەکانی ناو شاری سلێمانی و شارەکانی تر وەنەبێ هەرلە ناکۆکی نێوان شێخان و بنەماڵەکانی ناو شاری سلێمانی و شارەکانی تردا رەنگی دابێتەوە بەڵکوهەر لە کۆنەوە ئەو نارێکیەی خشت بە بالأی کورد براو بۆتە هۆی یەک نەگرتن و سەرنەکەوتنی، دوژمنی کورد هەمیشە توانیویەتی بە ئارەزووی خۆی یەک لەدوای یەک لێیان بداو ماڵ وێران و سەرگەردانیان بکات.

نارێکی نێوان ئەمارەتەکانی کورد وەکو لاپەرەکانی مێژوو باسیان ئەکا هەمووی پرە لە خەم و خەفەت و دەری ئەخا کە بۆچی ئەو میللەتەی کەلە زەمانی مادەوە کە ساسانیەکان توانیان بەسەریا زاڵ بێن هەتا ئیمرۆ خۆی نەگرتۆتەوە و رۆژێک یەکگرتنی بەخۆیەوە نەدیوە.

کام ناوچەی کوردستان ئەگریت و سەیری ئەکەی هەر عەشیرەتەو هەر بنەماڵەیە بەربونەتە وێزەی یەکتری و یەکتریان لاواز کردوەو وایان لێهاتووە خۆیان بەرامبەر دوژمن رانەگرن؛ ناکۆکی نێوان ئەردەلان و بابان ناکۆکی نێوان شکاک و عەشیرەتەکانی ناوچەی موکریان؛ ناکۆکی جاف و هەورامی و هەمەوەند؛ مەنگورو پشدەر؛ بارزانی و زێباری نارێکی حەوێزی و غفوری لە کۆیە ... پیاو ئەگەر تەزبێحێک دانێ و سەر ژمێریان بکا وابزانم بە دوو تەبێح و سێ تەزبێح دوایی نایێ!.

پیاو هیچی بۆ نامێنێتە لەباسی ئەو نەخۆشیەی کە وەکو شێرپەنجە تووشی کورد بوە ناچار شعرەکەی حاجی قادری کۆیی بێنێتەوە یاد کە فەرمویەتی :

هەتا وەک ئارگری بن کان لەگەڵ یەک
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەک
لەبەر حیزە بەخـــۆیی و ناتـــــەبایی
لەژێر حـــیزی حـــیزانا بوینە دۆشـــەک

# بزووتنەوەی هەست و هێزی نەتەوایەتی کورد

بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەتا شەری جیهانی و دوای ئەو شەرەش ، باسێکی دوورو درێژەو ئەگەر بویستریٚ باسی قۆناغی شورشەکان و خەباتی هەموو بەشەکانی کوردستان یەک بە یەک بکەین پێویستیمان بە نوسینی کتێبێکی تایبەتی هەیە ، بۆیە هەولٚ ئەدەین لێرەدا بە کورتی باسی بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد بە شێوەیەکی گشتی بکەین کە بوو بە هەوێنی خەبات و شۆرشەکانی بەشەکانی کوردستان لە رۆژهەلاٚت و لە ژووروی کوردستاندا و لە خوارووی کوردستاندا لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە دەست پیٚ بکەین هەتا کاتی راپەرین و شۆرشەکانی شێخ محمود لە سالٚی ۱۹۱۸/۱۹۱۹دا هەتا کاتی نیشتەجیٚ بوونی لە بەغدا سالاٚنی ۱۹۳۱/۱۹۳۲.

بێگومان خەباتی میللەتی کورد لە هەموو بەشەکانیا وەکو چەند ئەلٚقەیەکی لێک پچراوی زنجیرێک وایە کە دەمێکە ئەو زنجیرەیە لێک پچراوەولەو ساوە کە ساسانیەکان توانیبویان (ماد) بخەنە ژێر دەسەلاٚتی خۆیانەوە ، ئیتر لەو ساوە کوردستان بەش بەش بووەو هەربەشەی لایەک دەستی بەسەرا گرتووەو نەرێکەوت و هەلٚکەوت دەرفەتی داوە یەک بگریٚ و نە کوردیش سەرکردایەتی و رێبەرایەتێکی بە هێزوکارامەی ئەوتۆی بووە کە ئەو ئەلٚقەی زنجیرە لێک پچراوانە بکاتەوە بەیەک و هەولٚ و تەقەلا ئەدان بۆ یەکخستنی هاوکاری نێوان شۆرشگێران و خەباتکەرانی میللەتەکەمان ( کەلە راستیشدا شتەکە ئاسان نەبوەو بەسەرهاتەکانی مێژووش رێی بۆ ئەوە خۆش نەکردوە) لە هەموو بەشە داگیر کراوەکانی کوردستاندا هەتا ئێستە زەمینەیەکی ئەوتۆی خۆش نەکردووە کە بتوانریٚ بنکەیەکی بە هێزو پتەوی ئەوتۆ لە بەشێک لە بەشەکانی کوردستاندا سازبکریٚ کە ببێت بە بناغەی پێک هێنانی حکومەتێکی کوردی کە مشووری بەشە

داگیرکراوەکانی تر بخوا !

ئەبیٰ دان بەوە دابنرێت کەخەباتی میللەتی کورد لە کۆنەوە هەتا ئەم سەردەمەش بەزۆری لەناو چوارچێوەیەکی ناوچەییدا ماوەتەوەو شۆرشیٰ کەلە ناوچەیەکی کوردستاندا رووی دابێت ناوچەکانی تر بەشداریان تیادا نەکردوە، لە ئەنجامی ئەو گۆشەگیری و کەم تەرخەمی و لە یەک نەپرسینەوەیە دوژمنی دەسەلاتدار توانیویێتی بە خۆی و بە دۆستەکانی شۆرشی ئەوبەشەی کوردستان دامرکێننەوە.

ئەگەر بویستری ئەلقەکانی ئەو زنجیرە لێک پچراوانە یەک بخریٰ وبکرێن بەیەک زنجیرە، پێویستە بەر لە هەموو شتێک تەقەلایەکی ژیرانەو دلسۆزانەو زانیاریانە بدریٰ بۆ ئەوەی جەمسەری ئەو ئەلقانە دەست نیشان بکریٰ و نەخشە بکێشریٰ و هەنگاو بنرێت بۆ پێوە لکاندنی ئەو جەمسەرانەو خەباتی کورد، لە قۆناغی کۆستە کۆستەیی و لێک پچراویەوە دەرباز بکرێت بۆ قۆناغێکی نویٰ کە کوردی هەموو کوردستان بەشداری تیادا بکەن.

بێگومان گەیشتن بەو قۆناغەو دەسگیربوونی ئەو هیواو ئاواتانە بە خۆزگەو بە کاشکی و خەیالٰ و بە نووسین و قسەی رووت نایەتە دی بە لکو نەخشەو لێکدانەوەو شارەزایی و رۆشنبیری و وریایی و لەخۆبوردنێکی تەواوی ئەویٰ کەبەر لە هەموو شتێک بریتیە لە واز هێنان لە تەقەلای ناوچەگەرێتی و من منەو خۆ خۆیی و تەسک بینی عەشایرێتی و نەهێشتنی قین و پاک کردنەوەی دلٰ و دەروون لەیەکتری و ریسوا کردنی هەرکەسێک کە ئاگری دووبەرەکی و نارێکی خۆش بکا کە یەکێک لەوانە ئەوەیە رۆشنبیران و خوێندەواران و تێکۆشەران دلیان لە یەک پاک بکەنەوە ، وابزانم کەی توانیمان بگەینە ئەو رۆژەی بەرەیەکی یەکگرتوو لە هەموو بەشەکانی کوردستان پێک بیٰ و تاکتیک و ستراتیژی خەباتی کورد دەست نیشان بکریٰ و هەنگاو بە هەنگاو مەبستەکان بهێنرێتە دی و سەرپەرشتی هێزو پارت و رێکخراوە نیشتمانیەکانی هەموو بەشێک لەبەشەکانی کوردستان بە ئەرکێکی سەرشانی بزانین وابزانم ئەوسا ئەتوانریٰ سەرەتای قۆناغێکی نویٰی میللەتی کورد دەست پیٰ بکا و هیوای ئازادی و سەربەخۆیی تیادا بەدی بکریٰ ؛بۆگەیشتن بەو بەرەی یەکگرتوەی هەموو بەشەکانی کوردستان

، بێگومان بەرلەوە پێویستی بە بوونی بەرەیەکی یەکگرتوو هەیە لە هەر بەشێک لەبەشەکانی کوردستان کە هەر لایە بەپێی زروف و توانای خۆی زەمینە بۆ ئەو بەرەی یەکگرتووەی سەرتاسەری کوردستان خۆش بکاو لە ڕێرەوی خەباتا دەستی یارمەتی بۆ بەشەکانی تری کوردستان درێژ بکات .

تاقیکردنەوەکانی رابردوو بۆی روون کردوینەوە کەچینی فیودال و دەستەی کۆنەپەرست و هەل پەرست هەمیشە بونەتە هۆی ژانە سەری و لەریٚ لادان و خۆفرۆشتن کە زۆر کەوتوە لەسەر کوردو زۆرجار هەندێک لەوانە دوژمنایەتیەکی زۆر توندو تیژتریان کردوە بەرامبەر هێزی خەباتکەری کورد لەوەی دوژمنەکانی کورد کردویانە ، بەداخەوە پشت گۆیٚ خستنی ئەم راستیە زۆر جار بۆتە هۆی ئەوەی تەقەلاو خەبات و شۆرشی کورد وەکو کورتانەکەی جەجاڵی لیٚ بێت و لە بنەرەتا هەڵوەشێت و کورد رەنج بە خسار بێت و ئەو هەموو قوربانی و لە خۆ بوردنەی کە دابووی هەمووی بە فیرۆ بڕوات .

هەرچەندە وەکو بۆمان دەرکەوتوە لەدوای هەموو هەرەس هێنان و ماڵ وێرانی و دۆراندنێک، هەڵوێست ناچارمان ئەکا دەست بۆیەکتری درێژ بکەین و بکەوینە ئەوەی بیر لە یەکگرتن و نزیک بونەوە لەیەکتری بکەین ، بەلاٚم کەلایەک تۆزێک هەست بەهێزو دەسەلاٚت و توانا ئەکا ئیتر ئەو رۆژە رەشەی جارانی لەبیر ئەچێتەوە!!

مێژوی رابوردوی کورد بەسەرهاتەکانی زەمانە بۆی دەرخستوین کە هەڵکەوتی شوێنی کوردستان و خێرو بیرو سامانی ولاٚتەکەمان هەمیشە بۆتە هۆی ئەوەی بێگانەکان ، بەسەرمایەدارانی ئیمپریالیزم و بە رژێمە داگیر کەرەکانی کوردستانەوە چاو ببرنە کوردستان و بەسەدان نەخشەیان کێشاوە کە کوردستان بە پارچە پاچەیی بهێنێتەوەو هەرپارچەیەکیش بە زۆرە ملیٚ بخرێتە ژێر دەسەلاٚتی رژێمیکی بێگانەی سەربەخۆیان .

لەو ڕوەوە پرۆفیسۆر(خاڵفین)ی نووسەری بەناوبانگی روس کە یەکەم نووسەرێکە بە شێوەیەکی راست و دروست بیٚ پێچ و پەناو بە شێوەیەکی زانیاریانە بەناوی(کێشە لەسەر کوردستان)کتێبێکی بەنرخ بلاٚو بکاتەوە کەلەو باسەیدا چۆتە

بنج و بناوانی چۆنێتی و هۆی بایەخدانی وڵاتە ئیمپریالیزم و سەرمایەدارە دەست ڕۆیوەکان بەکوردستان.

لەسەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە، لە ئەنجامی بەرەو لاواز بوونی دەوڵەتی عوسمانی و گەندەڵ بوونی دەزگاکان و هەرەس هێنانی باری ئابووری و ئاشکرابوونی دیوی ئەودیوی ئەوپەردەیەی کەساڵەهای ساڵ بوو بەناوی ئایینی ئیسلامەوە بۆماوەی چوار پێنج سەدە میللەتی کوردی چەوساندبوەوە و رێگەی پێشکەوتنی لە کورد گرتبوو، جگەلەوەش دەرکەوتنی سەرەتای کزبوون و لاواز بوونی سیستەمی چینی فیوداڵی کۆچەرایەتی و وریابونەوەی سەرەتای دەستەی بۆرجوازی و هەست کردن بە سودی رۆشنبیری و خوێندەواری و شارستانێتی و پەیدا بوونی پارەداری و بازرگانێتی کە ئەمانەی دوایی کەوتنە بێ برکێ لەگەڵ دەسەڵات و توانای فیوداڵ دا ، وردە وردە ئەمانە هەمووی بوون بە هەوێنی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردو ( ئەگەرچی لەچاو هی میللەتانی تردا زۆر درەنگ دەستی پێ کرد)ڕاپەرین و هەڵگیرساندنی شۆرش دژی داگیرکەران و بۆ گەیشتن بە مافی رەوای کورد پێی نایە قۆناغێکی تازەوە. لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لەخواروی کوردستاندا ، زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوەن کە ڕاپەرینی شێخ عبدالسلامی بارزانی دژی عوسمانلییەکان بە یەکێک لە سەرەتای بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد ئەژمێردرێت لە ناوچەی بادینان دا ؛ عبدالمنعم الغلامی لە کتێبەکەیدا ( الضحايا الثلاث )باسی خەباتی عبدالسلام و خنکاندنی لەلایەن عوسمانلییەکانەوە بە دوورو درێژی کردوە.«٣٤»

شێخ عبدالسلام بەرلەشەری یەکەمی جیهانی چەند نامەیەکی ناردبوو بۆ هۆزەکانی کورد کە هەموو یەک بگرن و بە هەموویان حکومەتی عوسمانلی ناچار بکەن واز لە سیاسەتی پشت گوێ خستنی کوردستان بهێنێت ، ناوچەی بادینان لەساڵی ١٩١٤ دا دژی حکومەتی عوسمانلی یاخی بوو ، بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا باج و سەرانەو ڕاوو رووتی کاربەدەستانی عوسمانلی گەیشتبوە ئەوپەری و خەڵکی تەواو بێزار کردبوو.

شێخ عبدالسلام بۆئەوەی بتوانێت بەربەرەکانی عوسمانلییەکان بکات هەوڵیداوە

پێوەندی لەگەڵ روس و ئینگلیزدا بکات بۆ ئەوەی پشتگیری داخوازیەکانی بکەن بەڵام هیچ لایەکیان فریای نەکەوتن و عوسمانلییەکان توانیان لە مانگی حوزەیرانیساڵی ١٩١٤ دا ئەو بزوتنەوەیە دامرکێننەوەو عبدالسلام ناچار بوو لەگەڵ هەندێ لە هاوکارەکانی پەنا ببەنە بەر ئێران و ماوەیەک لە ورمێ جێگیر بوون بەڵام عبدالسلام لە دواییدا گیراو لە موصل لە ١٩١٤/١٢/١ لە سێدارە درا.

لەدوای لە سێدارەدانی عبدالسلام بارزانی ئیتر وەنەبێ ناوچەی بادینان بێدەنگ بووبێت بەڵکو کەوتە کەف و کوڵ و جۆش سەندن و هەر ئەو جۆش سەندن و راپەرینەش بوو کەلە زەمانی داگیرکردنی کوردستاندا لەلایەن ئینگلیزەوە شێخ ئەحمەدی بارزانی دژی ئینگلیزەکان راوەستاو ئێستەش ئەو خەباتە زنجیرەی نەپساوەو درێژەی کێشاوە.

لەدوای ناوچەی بادینان ، ناوچەی «بتلیس» لە ژێرووی کوردستان جۆشی سەند دژی تاوانی عوسمانلییەکان و تورکەکان بۆ چاوترساندنی کورد مەلا سلیمی بتلیسی کە دژی عوسمانلییەکان راپەریبوو بە ناچاری لەناو کۆنسوڵخانەی روسیا لە بتلیس خۆی حەشار دابوو ، تورکەکان هێرشیان بردۆتە سەر ئەو کۆنسوڵخانەیەو مەلا سلیمیان دەرهێناوەو بەبەر چاوی خەڵکەوە کوشتویانە «١٤»

لە ساڵی ١٩١٥ دا بۆ درێژە پێدانی دەربرینی ئەو بێزاریەو بەرامبەر بەو تاوانانەی کەتورکەکان دژی عبدالسلام و ملا سلیم کردبویان لە ناوچەی بۆتان و دەرسیم پەلاماری چەکیان داو روو بەرووی عوسمانلییەکان بوونەوە، بەڵام تورکەکان توانییان بەهۆی هەندی دەرەبەگ و سەرەک هۆزی خۆفرۆشی ئەو ناوچانەوە ئەو راپەرینە لەناو ببەن .

بەرلە شەری یەکەمی جیهانی هەندێ لەو دروشمانەی اتحاد و ترقی بەرزیان کردبوەوە کوردیشی وریا کردبوەوە (ئەگەرچی دەرکەوت ئەو کۆمەڵە زۆر ناپاک بوون لەگەڵ کورددا) کەساتێک شەری یەکەمی جیهانی تەواو بوو مادە/١٢ی وودرو ویلسنی سەرکۆماری ئەمریکا دەربارەی مافی میللەتانی ژێردەستی عوسمانلی یەکێک بوو لەو هۆیانەی چاوی میللەتی کوردی کردبوەوە ، هەروەها

ئەو بەیانە دووقۆڵیەی نێوانیحکومەتی بەریتانیاو فەرەنسا دەربارەی میللەتانی ژێر دەستی عوسمانلی لە ساڵی ١٩١٨ دا ئەمانە هاندەرێکی تەواو بوون بۆ میللەتی کورد کە لە هەموو لایەکەوە داوای مافی رەوای خۆی بکات کە ساتێک شێخ محمود لە دەربەندی بازیان گیراو محاکمە کرا ئەو مادە ١٢/یەی ویلسن و ئەو بەیانە دوو قۆڵیەی بەریتانیا و فەرەنسای کردبوو بە کوردی لەناو بازی بەنگەکەیدا. لە کاتی چوونی ویلسن حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا بۆلای شێخ محمود لە خەستەخانە و لە پاش ئەوەش لە مەحکەمەدا هەردووکیانی بۆ ویلسن و ئەندامانی مەحکەمە خوێندبووەوە و پێی وتبوون : من چەتەو رێگر نەبووم ... من پیاوکوژ نەبووم وەکو ئێوە ئەتانەوێ بەسەر منیا بسەپێنن ، بەڵکو من بەپێی ئەو دوو بەڵگەیە داوای مافی رەوای میللەتەکەم کردووە و ئێوە لەبەر ئەوە مافی ئەوەتان نیە کە محاکمەی من بکەن .

شان بەشانی ئەوەش کۆنگرەی ئاشتی و پەیانی سیڤەرو پیشنیارەکانی لیژنەی عصبەالامم کە چوبوو بۆ کوردستان بۆ سەرنجدان لە ئارەزووی کورد ، ئەمانە هەمووی هاندەرێکی بەتین بوون بۆ میللەتی کورد .

لەکوردستانی تورکیا لە دوای شەری جیهانی و لەپاش ئەوەی مصطفی کمال بوو بە دەسەڵاتدار لە تورکیاداو دوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەک دەستی دەستی بە کورد کردو بەڵێنی ئۆتۆنۆمی دابوو کورد و بە مافی کورد، بەڵام هەرکە وڵاتی تورکیای بۆ تەخت بوو و توانی بەهۆی کوردەکانەوە یۆنانیەکان بشکێنێت ئیتر کاری بە کورد نەماو دەستی کرد بە لەناو بردنیان؛ بەوجۆرە دوای دەست برینی تاقمی اتحادو ترەقی و لەپاش ئەوانیش تورکە کمالییەکان ، کورد ناچار بوو بکەوێتە خۆی و داوای مافی خۆی بکات ( بەڵام لەپاش چی ... وەکو ئەڵێن لە پاش باران کەپەنک ! ) .

سید طەنهری کە لەو رۆژانەدا وەکو دەست رۆیوێکی ئاینداری لە ناوچەی خۆیدا ناسراو بوو لە کاتی دوور خستنەوەی شێخ محمود بۆ هیندستان ئینگلیزەکان ویستیان ئەویش بکەن بە دار دەستی خۆیان بۆ ئەوەی بیکەن بەگژ ئەو تورکانەی کە هاتبونە ناوچەی رواندز ، بۆ ئەو مەبستە داوایان لێ کرد کە بچێتە بەغدا ،

بەلاٌم سید طەگەلێک داخوازی هەبوو بەرامبەر بەوە کە داوای لە ئینگلیزەکان کردبوو لە کوردستاندا حکومەتێکی کوردی دابنێن و ئەوەی بۆ حکومەتی عەرەبی بەغدا کردبوی هەمان یارمەتی و پشتگیریش بۆ کورد بدا بەلاٌم دیارە ئینگلیز ئەوەی بۆ دەست نەدابوو وازیان لە سید طە هێنا .

لە کوردستانی ئێراندا کە سمکۆ دەستی کرد بە شۆرشەکانی دژی حکومەتی ئێران ، پەنای بردە بەر هەندێ لە عەشیرەتەکانی کورد کە هاوکاری لەگەلاٌ بکەن بەلاٌم کەس بەدەنگ و هاواریەوە نەچوو ( هەرچەند هەلٌەی خۆشی یەکێک بوو لەو هۆیانەی کە عەشایرەکان لایەنگرییان نەکردوە) ماوەیەک تورکەکان هەلٌیان خەلٌەتاند و ئینگلیزەکان لەرێی بابکری سلیم ئاغاوە پێوەندیان لەگەلاٌ کرد ( وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین )بەلاٌم لە ئەنجامدا لەبەرکورت بینی و لێک نەدانەوە، ئیرانیەکان بە پیلانێک کوشتیان.

شێخ محمود لە دوای شەری جیهانی ئومێدێکی زۆری بە ئینگلیزەکان هەبوو کە وەکو چۆن کاروباریان لە بەغدا رێک خستبوو بە پارەو بە چەک و بەچاودێری و حکومەتی عێراقیان گۆش کردو پاراستیان و وایان لە تورکەکان کرد دەست بەرداری ویلایەتی موصلٌ بێن و تورکیان والیٌ کرد کەدەست درێژی نەکاتە سەر عێراق وعێراقیان لە عصبەالامم دا کرد بە ئەندام ، شێخ محمودیش ئومێدی ئەوەی بە ئینگلیزەکان هەبوو کەلە خواروی کوردستاندا حکومەتێکی کوردی لە ژێر سایەو ئینتیدابی خۆیاندا پێک بێت بەلاٌم کە بۆی دەرکەوت ئینگلیز لە سیاسەتیانا نیە کە کورد سەربەخۆ بێت و مافی رەوای خۆی دەسگیر بێت ئیتر ناچار بوو روو بە رووی ئینگلیز بوەستێتەوە و ناچار بوو پێوەندی لەگەلٌ تورکەکان و یوزدمیر بکات لە رواندز ، داوای هاوکاریی لە سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد کرد بەلاٌم ژمارەیەکی کەم نەبێت نەچوون بە دەنگیەوە، نامەی بۆ شۆرشگیرانی سۆڤیەت نارد هیچیشی لەوان دەستگیر نەبوو، لەوروژانەدا کەلٌەک و زۆلٌێتی کمالی یەکان رووسیان بۆ زۆ کردبوو چەک و یارمەتیەکی زۆریان لە روسەوە دەسگیر بوبو تا ئەوکاتە جێی پێی خۆیان قایم کرد .

بە کورتی کورد چاوی کرابوەوە و هەوڵی دابوو پێوەندی لەگەڵ هەموو لایەکدا بکات کە بۆنی دۆستایەتی و هاوکاری لێ بێت بەڵام رۆژگارو هەڵوێستی ناوچەکە لەگەڵ کورد دا نەبوو بۆیە هەموو تەقەلاکان یەک لە دوای یەک سەری نەگرت و هیوای میللەتی کورد وەکو گوڵی ناو ئینجانە لەبەر بێ ئاوی لەژێر گڕەی گەرمای ستەم و جەوری داگیرکەراندا ژاکاوو سیس بوو و هەڵوەری .

لینین لە باسەکەیدا « مسائل في السياسه القوميه والامیه البرولیتاریا » کە باسی قۆناغی راپەرینی میللەتان ئەکا ، ئەڵێ: (ئەو قۆناغە بریتیە لە جوڵانەوەی هێزی رزگاریخوازی نیشتمانی وبووژاندنەوەی گیانی نەتەوایەتی و تێکۆشان دژی هەموو جەورو ستەم و ئەشکەنجەی نەتەوایەتی و هەوڵدان بۆ پێک هێنانی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی سەربەخۆ) .

بەڵێ کورد لە شەری یەکەمی جیهانی بە دواوە و لەو رۆژەوە کە لینین باسی مافی پێک هێنانی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی سەربەخۆی کردوە و لەو قۆناغەدا بووە کە هەوڵی رزگار بوونی نیشتمانەکەی و میللەتەکەی بداو داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆ بکا (لە دواییدا دێینەوە سەر ئەم باسە) بەڵام بەداخەوە لەو رۆژانەدا نەخۆی ئەو ئەرکەی پێ جێ بەجێ کراو مأساتی جیۆپۆلیتیکی وڵاتەکەش یارمەتی ئەوەی نەدا وەکو چۆن ئینگلیز عێراقی دروست کرد ئەگەر باری جیۆپۆلتیکی کوردستانیش بۆ ئینگلیز وەکو ئەوەی عێراق لەبار بوایە بێگومان کوردستانیش دروست ئەکرا و تورک و عێراقیش ناچار ئەکران دان بە سەربەخۆیی کوردا بنێن، یا ئەگەر شۆرشی ئۆکتۆبەر وای لە سۆڤیەت نەکردایە کە دەست بەرداری بەشەکەی خۆی بێت لە پەیمانی ( سایکس پیکۆ) دا کە رۆژ هەڵاتی تورکیا ( کوردستانی ژوورو) بۆ رووس دانرابوو ئەوا ئینگلیزەکان کوردستانی خواروویان ئەکرد بە حکومەت بۆ ئەوەی ببێتە پەردەیەک لە نێوانی میسۆپۆتامیادا کە ئەمەی دوایی بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ بۆ ئینگلیز دانرابوودوور نەبوو ئەو حکومەتەی خوارووی کوردستانی ئەوسا کە دروست ئەبوو ئێستە کاری بکردایەتە سەر هەموو بەشەکانی تری کوردستان، هەموو سەرچاوەو بەڵگە تەهێنیەکان لەسەر ئەوە یەکن کە ئینگلیز هیچ کات حەزی بەدراوسێتی روس نەکردوەو نەی‌ویستوە دەسەڵاتی

لەگەڵ سنوری دەسەلاتی روس لە یەک بدا ، بەلام کە سۆڤیەت وازی لە رۆژهەلاتی تورکیا هێنا ئیتر ئینگلیز ئەو ترسەی نەما و لە نەخشەو پیلانیا ئەوەی خستە بەرچاو کە پێویست ناکا حکومەتێکی کوردی لە خواروی کوردستاندا پێک بێت و ئەو نەخشەیەشی بە تەواوی بردە سەر وەکو لە دوایدا بۆمان روون ئەبێتەوە کە چۆن کوردستانیشی لەدەست فەرەنسادەرکێشاو خستیە سەر میسۆپۆتامیا.

ئەوەی زۆر روون ئاشکرایە ئەوەیە لە کوردستانا هەستی ئایینی زۆر بە هێزو کاریگەر بووە و هەر جۆرەراپەرین و خەباتێک لە ناوچەیەک لە ناوچەکانی کوردستاندا رووی دابێت زۆرجار دەسەلاتدارێکی ئایینی توانیوێتی سەرکردایەتی ئەو راپەرینە بگرێتە دەست یا هیچ نەبێ بەشداری تیا بکا بەلام حکومەتی عوسمانلی کە بەناو نوێنەری خیلافەتی ئیسلام بوو توانیوێتی چەند عەشیرەت و سەرکردەیەک لە شۆرشگێران هان بداو ئەو شۆرشەی هەر بە کورد لەناو بردوە ؛ زۆر جاری وا هەبووە بزوتنەوەی هەستی ئایینی و هەستی نەتەوایەتی کە هەندێ جار هەردوکیان لە شۆرشێکدا بەشدار بوون بە دوو رێگای جیاواز دا ملیان ناوەو میللەتی دوا کەوتووی کورد بەزۆری هەستە ئایینیەکەی بەسەردا زاڵ بووە و هەستی نەتەوایەتی لاواز بووە و لەرێرەوی شۆرشەکەدا پاشەکشەی کردوەو سەرکردایەتی ئایینی زاڵبووە و جڵەوی گرتۆتە دەست کە بەداخەوە سەرکردەکانی هەردولایان زۆرجار تێکۆشان و راپەرینەکەیان تا قۆناغێک بڕی کردوەو کە هەستیان کردوە بەرژەوەندییان ئەکەوێتە مەترسییەوە وردە وردە جڵەوی ئەو سەرکردایەتیە شل بووە و پاشەکشە کراوە و تەنها رەش و روتەکەی تیا سەرگەردان و ماڵ وێران بوە .

هەتا ئەوکاتەی دەولەتی عوسمانلی ئالای ئایینی ئیسلامی هەڵکردبوو بەشێکی زۆری کوردرێزیان لەو ئالایە ئەگرت و پارێزگاریان لە دەوڵەتی عوسمانلی ئەکرد و هەستی نەتەوایەتی کورد بە هۆی ئەو دڵسۆزیەوە بۆ ئیسلام لە مێشک و دڵی زۆر کەسدا وەکو بەنجکراوی لێ هاتبوو بەلام کە دەستی ئەو ئالا هەڵگرە درۆزنانەکەوتە روو ، ئالای ئیسلامەتیان شۆر کردەوە و وردە وردە پێچایانەوەو وتیان ئێمە طۆرانین و عوسمانلی نین کە ئالا هەڵگری ئیسلام بوو ئەوسا ئیتر

کوردیش چاری نەماو ئەبوایە بی وتایە ئیمەش کوردین ... بەلام لەپاش چی ! پاش ئەوەی ئەو خۆ بەخت کردنە کوێرانەیە لە پێناوی خیلافەتی عوسمانلی دا زۆر کەوت لەسەر کوردو ئیمڕۆ هێشتا لەم سەردەمی ئازاد بوونەی میللەتاندا باجی ئەو سەردەمەی باوو باپیرانمان ئەدەینەوە ! .

ستیڤن لە کتێبەکەیدا دەربارەی لایەنگری کورد بۆ خلافەتی ئیسلامی عوسمانلی و بۆ سولتانی عوسمانلی ئەلێ:«٥٧» «لە سالی ١٩٢٢ دا مصطفی کمال دەستی کردبوو بە راپەرین و جولانەوەکەی، گەرۆکی ناسراوی تورکی ئەو سەردەمە ـ حسن عرفە ـ کە بەناوی عەشیرەتە کوردەکاناتەگەرا ، یەکێک لەو سەرۆک عەشیرەتانە لە حسن عرفەی پرسیبوو: بیستومانە لەشکری سەرکەوتوی تورک چوەتە ئەستەمبولەوە... ئەویش لەوامدا پێی ئەلێ :کە من لە ئەستەمبول بووم هێشتا شارەکە لەژێر دەسەلاتی ئینگلیز دا بوو... حسن عرفە لە یاداشتەکانیانا ئەلێ : عەشایرەکان هەموو بەو وەرامە بێدەنگ بوون بەلام یەکێکیان پرسی کردو ووتی : ئاخۆ کێ ئەکرێ بە سولتان ؟ حسن عرفەلە وەرامدا پیێ ئەلێ : سولتان و خلافەت نەماوەو ولات بوە بە جمهوری... حسن عرفە ئەلێ هەرچەندم کرد نەمتوانی بیخەمە مێشکیانەوە جمهوریەت چیەو مانای چیە! لە کۆتاییدا ووتیان هەرچۆنێک بێ ولات بەبێ سولتان ناتوانێت بژی! بێگومان سولتان لای کورد رەمزی پارێزگاری ئیسلام بوە لای ئەوان و مادام ئیسلام ماوە ئیتر ئەبوایە سولتانیش هەر هەبێ کە خەلیفەو نوێنەری ئیسلام بوە».

تورکیزمە کمالییەکان دوای ئەوەی بەتەواوی دەسەلاتیان گرتە دەست ئیتر بەهەموو هێزو توانای خۆیانەوە بەرهەلستی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردیان کردو بە پرۆپاگاندەو بە رۆژنامەکانیان هەولی ئەوەیان داوەکە لە خەلکی بێگانە بگەیەنن کورد کێوی یەو لە کۆچ و بار بەولاوە هیچی تری نەزانیوەو هەستی نەتەوایەتیان تیا نیە.

سێر ئەرنۆلد تۆینبی مێژوو ناسی بەناوبانگ لەو رووەوە ئەلێ:{ هەمیشە وام لە تورکەکان ئەبیست کە کورد لە حالەتی کۆچەریتی هەمیشەییدان لەبەر ئەوە زۆر دورن لەوە بگەنە رادەی یەکگرتنێکی ئەوتۆ کە بتوانن یەکێتیەکی نەتەوایەتی

پێک بهێنن } وەکو تورکەکان خۆیان هیچ تاوانێکیان نەبوو بێت لە هێشتنەوەی میللەتی کورد لە شێوەی کۆچەرایەتی و فیودالی دوور لە خوێندەواری و شارستانێتی.

ئەرنۆلد ویلسن لە کتێبەکەیدا «۳۷» لەو رۆژانەی کە حاکمی گشتی بووە لە بەغدا ئەڵێ:« لە گفت و گۆیەکدا لەگەڵ سەرکردەکانی عەرەبی عێراق دەربارەی کورد و هەڵسەنگاندنی کورد لە ناو ویلایەتی موصڵدا ئەو عەرەبی عێراقیانە لایان وایە کوردەکان وەکو جوتیارێک وان کە تەنها بەهۆی سەرکردەکانیانەوە ئەتوانرێت بێدەنگ بکرێن».

لەراستیشدا ئینگلیزەکانیش هەر بەپێی ئەو بۆچونە لەگەڵ کوردا هەڵس و کەوتیان کردوەو توانیویانە لە رێگەی سەرۆک عەشیرەتەکانەوە بە مووچەو خەڵات و بەرات عەشیرەتەکانیان لە شێخ محمود و لە شۆرشی کورد دابڕ بکەن و لێی بتەکێننەوە .

گۆڤاری (مطالعات)ی فارسی لە ژمارە ٤/ی سالی سێ هەمیدا کەلەئەنستیتۆی کورد لە پاریس دەرچووە باسێکی تەرجەمەکراوی تیایە بۆ فارسی کە لەلایەن (مارتین . وان . برۆنسین)ەوە نوسراوەو ئەڵێ:

«جولانەوەی هێزی نەتەوایەتی کورد لەسەرەتادا بزووتنەوەی ئەرمەنیەکان لەراپەرینەکانیانا دژی حکومەتی عوسمانلی کاری کردۆتە سەر کوردەکانیش ، لە دوای ئەوە بزوتنەوەی کۆمەڵەی اتحادو ترەقی ئەو هەستەی بەهێز کردووە لای کوردەکان ، بەلام چ رووسیای قیصری و چ ئینگلیزەکان ئەمەیان پێ خۆش نەبووە چونکە ئەیان ویست هێزی نەتەوایەتی کورد تەنها ئەو رێبازە بگرێ کە دژی دەوڵەتی عوسمانلی بەکار بهێنرێت نەک بۆ سوودی نەتەوەی کورد».

بێگانەکان بەتایبەتی ئەوانەی دوژمنی کورد بوون بە چ جۆرێک سوودی خۆیانی تیادا بوو بێت بەو جۆرە هەستی نەتەوایەتی کوردیان هەڵسەنگاندووە. بزووتنەوەی کورد ئەگەر بزوتنەوەی ئەرمەنی یا بزوتنەوەی کمالییەکان لە سەرەتادا کاری تێکردبێت بەلام وەنەبێ تەنها ئەو دوو هۆیە بووبێ کە بوونەتە هۆی بزوتنەوەی کورد ، راستە بزوتنەوەی ئەرمەنی دژی عوسمانلی تارادەیەک کاریگەر بووە بەلام

له هەمان کاتیشدا بزووتنەوەی ئەرمەنیەکان بەجۆرێکی ترو لە قۆناغێکی تردا کە هەڵوێستیان بەرامبەر بە کورد پڕ بوە لە هەستێکی رەگەز پەرستی، دژی کورد بووەو روسیای قیصری رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەوەی کە هەستی ئایینی ئەرمەنیەکان بۆ سودی خۆیان بەکار بێنن کە ئەو هاندانە نەک هەر تەنها دژی عوسمانلی بووە بەڵکو زۆر جاریش مەترسیان خستۆتە دڵی ئەو کوردانەوە کە لە سنوورەکاندا تێکەڵاو بوون لەگەڵ یەکتردا و گەلێک جار بەپاڵپشتی روسیای قیصری هەرەشەیان لە کورد کردوەو دەست درێژیان کردۆتە سەریان کە بۆتە هۆی نیگەرانی کورد. شاعیرێکی وەک حاجی قادر کەلسەردەمی ئەوا ئەومەترسی یەی ئەرمەنی پەرەی سەندبوو لە شیعرەکانیا هاواری کردو ەو وتویەتی : کوردینە ، ئەگەر ئاگاتان لە خۆتان نەبێت کوردستان ئەکرێ بە ئەرمەنستان .

بیجگەلەوە گەلێ هۆی تر هەبووە بۆ بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد ، بۆ وێنە ئەو کوردە خوێندەوارو رۆشنبیرانەی کە لە ئەستەمبولدا کۆمەڵگایەکی کوردیان پێک هێنا بوو ، بەهۆی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ خوێندەوارو رۆشنبیری ئەو وڵاتانەی کەلە کەڵەمە و زۆردارێتی عوسمانلی رزگاریان بوبو وەکو بولغارو یۆنان و رۆمانیاو ئەلبانیا، ئەو کوردانەی ئەستەمبوڵ بەهۆی ئەو گۆڤارو رۆژنامەو کتێبانەی کە دەربارەی راپەرینی ئەو وڵاتانە بلاْوئەکرانەوە ، کوردەکان ئاگاداری ئەو هەواڵ و باسانە بوون و پزیشکی هەستی نەتەوایەتی و بیری ئازادی و سەربەخۆیی میللەتانی ئەو وڵاتانە لە مێشکی کوردەکانی ئەستەمبۆلیشدا شەپۆلی ئەداو ئەوانیش کەوتونە خۆیان و کۆمەڵ و یانەیان پێک هێناوە ،گۆڤارو رۆژنامەیان دەرکردوەو داوای مافی رەوای کوردیان کردوە .

لە دوای سەرکەوتنی شورشی ئوکتۆبەرو هەڵکردنی یەکەم ئالاْی سۆسیالیستی کوردەکان وەنەبێ دوورە پەرێز وەستابن بەرامبەر بە ئەنجامەکانی ئەو شۆرشە بەڵکو چ لەکوردستانی ئێران و چ لە کوردستانی تورکیا و چ لە خوارووی کوردستاندا هەرلایەک بە جیاو بەجۆرێک سەیری ئەو شۆرشەی کردووە و هیوای یارمەتی دان و پێوەندییەکی دۆستانەیان تیا بەدی کردوە و زۆر لە سەرکردەکانی کورد هەوڵیان داوە پێوەندی بەکاربەدەستانی سۆڤیەتەوە بکەن ئەگەرچی ئەو تەقەلایانەیان هیچی

سەری نەگرتووەو سۆڤیەت راپەرینی کوردەکانی فەرامۆش کردوە.

لەو کۆنگرەیەی کە لە۱/۹/۱۹۲۰دا لە شاری باکۆدا گیراو بۆ یەکەمجار ژمارەیەکی زۆر لە ئاشتیخوازان و رۆشنبیران و نیشتمان پەروەران لەو کۆنگرەیەدا بەشداریان کردبوو کە لەناو ئەواندا ۸ نوێنەوری کوردی تێدا بوو کەبەرامبەر بەوە تەنها ۷ نوێنەر لە ولاّتە عەرەبیەکانەوە بەشداریان تیادا کردوە.«۹»

دکتۆر عەزیز شەمزینی دەربارەی هەستی نەتەوایەتی کورد لای رۆژهەلاّتناسەکان ئەڵێ:«۱٤» «رۆژهەلاّتناسەکان هەندێکیان بەباشی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردگەیشتبوون و لێی کۆلیونەتەوەو بە کێش و پێوانەو بۆچون و بەدڵ و دەرونێکی پاکەوە هەڵیان سەنگاندووە بەلاّم زۆریشیان بوختانیان بۆ کورد کردوەو هەموو بزوتنەوەکانی کوردیان سەرتاسەر بە جولانەوەیەکی دواکەوتوی ئایینی ژماردووە و سەرکردەو رابەرانی شۆرشی کوردیان بە نۆکەرو بەکرێگیراوی دەوڵەتە بێگانەکان داوەتە قەڵەم، دکتۆر عەزیز لەباسەکەیدا ناوی گەلێک لەونەیارانەی کوردی هێناوە وەکو کێرک ،کنتزۆل ، چرچل ،یکی زارۆف ، ئاڤریانۆف ، ف.هـ.هرتز». لام وایە جگەلەوانەی کە دکتۆر شەمزینی ناوی بردوون زۆري تریش هەیە کەبە مەبستێکی ناپاک باسی کوردیان کردووەو هەندێکیان قینی خۆیان و دەوڵەتەکەیان بەرامبەر بە کورد و شۆرشەکانی بە ئاشکرا دەربریوەو کوردیان لەکەدار کردووە و ناویان زڕاندووە وەکو مس بێل و میجرسۆن و ویلسن و ئەدمۆندزو گەلێکی تر کەلە دواییدا هەندی لە نووسەرانی رەگەزپەرستی نۆکەری دام ودەزگا کانی داگیرکەری کوردستان ئەونوسینانەیان کردوە بە بەڵگە دژی کوردو خۆشیان ئەوەندەی تریان ناوەتە سەر .

ماوەیەکی زۆر چیرۆکێکی خەیاڵی کەلەلایەن (کارل)مای بە ئەلمانی نوسراوە، ئەوکارل مایە هەرکوردستانی نەدیبوو لەژیانیا ! بەلاّم هەرلەخۆیەوە هەزارو یەک قسەی قۆرو بێ سەرو پێی دەربارەی ژیانی ناو کوردەواری نوسیوە کە تاماوەیەک ئەوچیرۆکە سەرچاوە بوە بۆ نوسینی هەندی بێگانە و هەندی لە رۆژئاواکان لە ناوەرۆکی ئەو چیرۆکەوە سەیری ژیانی کوردیان کردوە.

زنارسلوپی ( قدری جمیل بەگ) لە کتێبەکەیدا باسی ئەوە ئەکا کە چۆن بێگانە

له کورد گەیشتبوو بەهۆی پڕپاگاندەی دوژمنەکانیەوە ، ئەڵێ:«١٩» « لەپێش شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە شاری لۆزانی سویسرا قوتابی بووم رۆژێک خاوەنی قوتابخانەکە لەلای خاوەنی رۆژنامەی (گازێت.دي لۆزان)کە ناوی (جاک) ئەبێت باسی منی بۆ ئەکا و پێی ئەڵێ قوتابیەکی کورد لەقوتابخانەکەمدا ئەخوێنێت، کابرای رۆژنامەچی پێی ئەڵێ من بە گومانم لەوەی کە کوردی وا هەبێ لە شوێنی وەکو قوتابخانەکەی تۆدا بخوێنێت ، دیاربوو پروپاگەندەی زۆر خراپ دژی کوردبڵاو بوبوەوە بەڵام کە جاک هاتە قوتابخانەکەو منی بەجل و بەرگی رێک و پێکەوە چاو پێکەوت ، کێشای بە ناوچەوانی خۆیداو ووتی:ئەو پڕۆپاگەندەی ئەرمەنیەکان دژی ئێوەی کورد بڵاویان کردۆتەوە بۆم دەرکەوت هەمووی درۆیە!»
لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا قدری جمیل ئەڵێ:
کەلە لوزان بووم ، لەو رۆژانەدا کەشەڕی یەکەمی جیهانی لەساڵی ١٩١٤ دا دەستی پێ کردبوو لە رۆژنامەیەکی لۆزاندا چاوم بە هەواڵێک کەوت کە خوێندمەوە ئەڵێ: (میسیونیر)یکی ئەمریکی کەماوەیەک لە کوردستاندا ژیاوە لە یەکێک لە کەنیسەکاندا بە جلی کوردی یەوە محازەرەیەک ئەدا ... من و ئەکرەمی جمیل بەگ هەردووکمان زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی کاتی هاتنی ئەو رۆژو سعاتەبووین و کە چوینە کەنیسەکە تەماشامان کرد کابرایەک تۆزێک ئەشەلی و بە جل و بەرگی کوردی یەوە بە ئینگلیزیەکی نارێک و شکستە وای لە خەڵک گەیاندبوو کە ئەمریکیە، دەستی کرد بە درۆودەلەسە دژی کورد و ووتی هەموو درندەو شاخاوی و پیاوکوژن و باوەڕ بە هیچ ئایینێکی تر ناکەن جگەلە ئایینی ئیسلام نەبێت ! کابرا دەستی برد ئینجیلێکی لە بن باخەڵی دەرهێناو ووتی بۆئەوەی ئەم ئینجیلە بەناو کوردا بڵاو بکەمەوە پێویستیم بە پارە هەیە ، تومەز کابرای ساختەچی ئەیویست بەو فرو فێڵە پارە لە خەڵک بکێشێتەوە ...کە بۆمان دەرکەوت کابرا ئەمریکی نەبوو بەڵکو ئەرمەنی بوو ، کە هاتە دەرەوە رێگەمان پێ گرت و پێمان ووت : تۆ هیچ شەرم ناکەی درۆی وازل دەربارەی کورد ئەکەی؟ ئایا ئەزانی ئەمرۆ کورد لە ئەوروپادا هەیە ؟».
قدری جمیل نمونەیەکی تر ئەهێنێتەوە لەو بەزمە و ئەڵێ ، جارێکی تر لە ساڵی

١٩١٤ دا ( میسیو.بیوردۆ)رۆژنامەیەکی بە فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی دەرئەکرد، دیسان خاوەنی قوتابخانەکەمان پێی وتبوو کە کوردێک لە قوتابخانەکەمدا هەیە ئەویش لە وەرامدا پێ ئەڵێ : ئەرمەنی و کورد زۆر لەیەکەوە نزیکن کەچی نازانین بۆچی ئەوەندە سزاو ئەشکەنجەی ئەرمەنیەکان ئەدەن ؟!.

قدری جمیل بەگ لەباسی ژیانی قوتابیێتی خۆیدا لە لۆزان ئەڵێ: « کە قوتابی بووین لە لۆزان تاقمێک قوتابی تورکیشی لێ بوو لەناو ئەوانەدا نعمان منمنجی ئۆغلو بوو هەمیشە ئەو تورکانە ئێمەیان بەوە تووڕە ئەکرد کە ئایان ووت: کورد چییە ؟ کوا کورد هەیە ؟» ئەو نعمانەی قدری جمیل بەگ باسی کردوە لە دواییدا سەردەمێک بوو بە وەزیری دەرەوەی تورکیا .

لە خوارووی کوردستانیشدا زۆر لە کاربەدەستانی ئینگلیز لەوانەی لە عێراقدا یا لە خوارووی کوردستاندا کاربەدەست و ئەفسەری سیاسی بوون هەمیشە لە راپۆرت و کتێب و نوسینەکانیان کوردیان بە میللەتێکی دوا کەوتوو و کێوی لەقەڵەم داوە و راپەرین و شۆرشەکانی کوردیان وا هەڵسەنگاندوە کە بریتی بوون لە بزووتنەوەیەکی عەشایری و بۆ ئەوەی پینەی تاوانەکانی خۆیان بکەن و پاکانە بۆ سیاسەتی حکومەتەکەیان بکەن لەو پاشگەزبوونەوەیەی بەرامبەر بەمافی میللەتی کورد کردویانە ، هەمیشە هەوڵیان داوە وابیخەنە مێشکی خەڵکەوە کە کورد و شێخ محمود خەتای خۆیان بووە کە نەگەیشتون بە ئامانجی خۆیان و هەر خۆشیان بوون لەقەیان لە پاشە رۆژی خۆیان داوە .

میجرسۆن و ئەدمۆنز و ئەو قوتابخانە تایبەتیەی ئیگلیزی ئەوسەردەمەو دوای ئەوەش ئەوەندە داخ لە دڵ بوون بەرامبەر بە شێخ محمود و بەرامبەر بەکورد هەرجارەی بەجۆرێک پروپاگاندەیان دژی کردوە بۆ زراندنی ناوی شێخ محمود و کورد .

جارێک کوردیان بەوە تاوانبار کردوە کە میللەتێکی کێوی و درندەیە و ئیسلامێکی کەللە رەق و دەمارگیرن و رقیان لە هەموو ئاینێکی تری غەیری ئیسلامە، کەچی میجرسۆن و هاوبیرەکانی لە هەموو کەس باشتر ئەیانزانی شێخ محمود ئەو کەللە رەق و دەمارگیرو کوێرانە نەبووە بۆ ئیسلام چونکە کە بوو بە

حوکمدارو دەسەڵاتی کەوتە دەست یەکێکی وەکو خواجا کەریمی عەلەکەی کرد بە وەزیری دارایی خۆی کە کریستیان بوو ، کە ئینگلیزەکان بە هێزی فرۆکە شێخ محمودیان لە سلێمانی دەرپەراند و هاتنەوە ناو سلێمانی ئەوان بوون کەریمی عەلەکەیان گرت و بەزۆر دووریان خستەوە بۆ کەرکوک و ئیهانەیان کرد .

میجرسون لە کتێب و راپورتەکانیا وەکو لە هەندێ شوێنی تریشدا باسم کردوە ئەڵێ: شێخەکانی سلێمانی و بازرگانەکانیان ئەکوشت بۆ ئەوەی پارەکانیان ببەن بۆ خۆیان کەچی نەیتوانیوە لە هەموو راپۆرتەکانیا باسی بازرگانێکی کوژراو بکا بە دەستی شێخەکان!.

درۆیەکی تری میجرسۆن ئەڵێ:

کەچوومە سلێمانی و لە خانی غفور ئاغا دابەزیم لەوێ ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەوگاورانەدا پەیدا کرد کە چەند ساڵێک بوو لە سلێمانیدا کاسبی و بازرگانیان ئەکرد ، یەکێک لەوانە ناوی (متی) بوو ووتی ماوەی بیست ساڵە لە سلێمانیدا ئەژیم تا ئێستە تووشی هیچ شەرە شەقێک نەبووم کەچی هیچ شەرم ناکا لە شوێنێکی تردا ئەڵێ کوردەکان بەزۆر گاورەکانیان ئەکرد بە موسلمان و بەزۆر جلەکانیان پێ ئەکردن بە کوردی .

مێجرسۆن بە هەمولایەکدا هەڵپەی ئەوەی کردووە قینی خۆی بەرامبەر بە کورد دەرببرێت. لە لاپەرە ۲۳۷ ی کتێبەکەی کە فواد جمیل کردویەتی بە عەرەبی، ئەڵێ :

شاری سلێمانی بریتی بوو لە هەزار(. . . ۱) ماڵ ، کەلەو ماڵانە (. . ۸)یان تورکمان بون و ژیان لە سلێمانیدا زۆر نا ئارام بوو ... چی لەو درۆیەی میجرسۆن زل ترە لەوەی کە هەر خۆی لە راپۆرتی ساڵی ۱۹۱۹ دا ژمار[C.O.773*/10-3341 } کە بە نهێنی بۆ کاربەدەستانی خۆی ناردووەو لەناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا هەیە ئەڵێ :

« شاری سلێمانی بەرلە شەری یەکەمی جیهانی، دانیشتواتی زۆربووە( خۆی لە ساڵی ۱۹.۹ دا چۆتە سلێمانی بەناوی حاجی میرزا حسینی غلامی شیرازی) لەساڵی ۱۸۳.دا ژمارەیان ۱. هەزار کەس بووە ، بەلاّم لە دوای سەرکوتکردنی

عەشیرەتی هەمەوەند لە ساڵی ۱۹۱۱ دا ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی پەرەی سەندو گەیشتە ۲۰ هەزار کەس ، کە ئینگلیزەکان چوونە سلێمانی ژمارەی ئەوانەی لە سلێمانیدا مایونەوەلە مێژووی ۱۹۱۹/۱۲/۳۱دا بریتی بووە لە (۹۷۲۸) کوردو (۵۷۲) جولەکەو (٦۰)کریستیان» ئەی باشە ..۸۰ماڵە تورکەکان چییان لیٚ هات ؟ وادیارە ئەو سەربازانەی عوسمانلی کەلە سلێمانیدا بوون و لە ناوچەکەدا بوون ئەوانەی هەموو بە تورکمانی ناو شاری سلێمانی داناوە.

میجرسون لەگەشتەکەیدا دەربارەی زمانی کوردی ئەڵیٚ : زمانێکی رەق و ناخۆش و بێزارکەرە (کەچی هیچ مێژوو ناسێک و هیچ زمان ناسێکی شارەزا بە زمانی کوردی ، زمانی کوردی یان بە رەق و وشک دانەناوە . بێجگەلەوەش میجرسون لە دوای ئاوارەکردنی شێخ محمود بۆ هیندستان کە خۆی بوو بە حاکمی سیاسی سلێمانی بۆ رواڵەت و خەڵک لە خشتە بردن ئەت ووت باوو باپیری کورد بووە ئەوەندە دەربەسی زمانی کوردی بوەو چەند کتێبێکی لەسەر زمانی کوردی نوسیوە کەلەباسی میجرسۆندا باسیان ئەکەین !.

میجرسۆن بەرلەوەی بچێتە کوردستان لە ساڵی ۱۹۱۷-۱۹۱۸ دا رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) بە کوردی لە بەغدا دەرهێناوە کە بوش بە حاکمی سیاسی رۆژنامەی(پێشکەوتن)ی لە سلێمانی دەرهێناوەو خەڵکی هان داوە بە کوردی پەتی شت بنوسن ، وەکو چۆن لە بەغدا نووسەرە عەرەبەکانیشیان هان داوە کە زمانی عەرەبی لە ووشەی تورکی پاک بکەنەوە .

سەیر ئەوەبوو وەکو پیرەمێردی شاعیرو چەند کەسێکی تری سەردەمی لاوێتی ئێمە بۆیان ئەگێڕاینەوە ، تورکە کمالییەکانیش کە کاروباریان گرتەوە دەست توکیزمەکان دەستیان کرد بە پاکژکردنی زمانی تورکی لە ووشەی عەرەبی و لەناو رۆژنامەو گۆڤارەکانیانا داوایان لە نووسەرانی خۆیان کرد کەلە خڵتەی زمانی عەرەبی خۆیان بپارێزن و وێنەی حوشتریان لە گۆڤارەکانیاندا بڵاوکردۆتەوە کە تەپاڵەی حوشترەکەیان لە شێوەی پیتی (ع.ق.ط)دا کردوە و لە ژێریا نووسیویانە « هەیدی ... هەیدی عەرەبستان گیتی ».

هیچ گومان لەوەدانیە کە دوژمنانی کورد ، بەتایبەتی کاربەدەستانی ئینگلیز لە میسیوبۆتامیا و ئەفسەرە سیاسیەکانیان لە کوردستاندا درێغیان نەکردووە لە تەقەلادان بۆ زراندنی ناوی میللەتی کورد .

راپۆرتە نهێنییەکانی بەریتانیاو کتێبەکانی کاربەدەستانی ئینگلیز باسی سەیری وایان تێدایە کە پیاو تێ ناگا بۆچی ئەو هەموو رق و قینەیان لەکورد بووە ؟ بۆنمونە ویلسن حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا ئەڵێ:«٣٧» ئەورۆژانەی ئێمە لە میسیوبۆتامیادائەمانویست ئیدارەیەکی تایبەتی بۆ عەرەبەکان دامەزرێنین ، رۆژنامەکانی لندن (کە بەزۆری لە ژێر دەسەڵاتی جولەکەدابوەو نەیان ئەویست حکومەت بۆ عەرەب دامەزرێنرێ، هەروەها لە پارلەمانیشدا لایەنگری وایان هەبوو کە دژی عەرەب بوون)، بۆ ئەوەی بەڵگە نەدەین بەدەست ئەوانەوە، لە راپۆرتەکانا هەر بەدکاریەکی عەرەبمان بدیایە ئەمان دایە پاڵ کوردەکان و ووشەی عەرەبمان لائەبرد و ووشەی کوردمان لەجێی دائەنا و هەندێ نموونە بۆ ئەو بەدکاریانەئەهێنینەوە کەچۆن عەرەبەکان ، ئینگلیزە کوژراوو مردوەکانیان لە گۆڕ دەرئەهێناو ئەموستیلەی ئاڵتون و دانە زێرەکانیان لەدەم دەرئەکێشان.

لەدوای هەرەس هێنانی حکومەتی عوسمانلی و سەرکەوتنی کمالییە تورکیزمەکان، حکومەتی سۆڤیەت لەو رۆژانەدا بزوتنەوەی تورکیزمەکانی بە بزووتنەوەیەکی ئازادیخواز ژماردوەو بە هەموو جۆرێک بە چەک و بە پارە یارمەتیان داون و ئەو دۆستایەتیەی نێوان سۆڤیەت و تورکە کمالییەکان زۆر کەوتووە لەسەر کوردو سۆڤیەتی ـ دۆستی ئەوسەردەمەی کمالییەکان لە چاویلکەی تورکەکانەوە سەیری شۆرشی کوردستانی تورکیاو بزوتنەوەی میللەتی کوردیان کردوە کە کوردیش وەکو هەموو میللەتێکی بەش خوراوو چەوسێنراو خەباتی کردوە لە پێناوی دەستگیربوونی مافی رەوای خۆیدا کە ئەوەی لینین لێی دواوە کورد لە هەموو کەس ئاشکرا تر ئەگرێتەوە ، واگرمان ئینگلیزەکان تەنها بە قسەو بە پرۆپاگاندە هەوڵیان دابێ کەوابکەن کوردی کوردستانی تورکیا دژی کمالییەکان هان بدەن بۆ ئەوەی لاوازیان بکەن و ووزەو دەسەڵاتی ئەوەیان نەبێت کە داوای ویلایەتی موصل بکەنەوە بەڵام شۆرشەکەی شێخ محمود بە ئاشکرا دژی

ئمپریالیزمی ئینگلیز بوەو ویستویەتی میللەتەکەی وەکو میللەتانی تر لەناو خاکی خۆیدا بسەربەستی و ئازادی بژی کەچی سۆڤیێت بە هیچ جۆرێک لای لە شێخ محمود نەکردۆتەوەو یارمەتی نەداوە و وەرامی ئەو نامەیەی شێخ محمودیشی نەداوەتە ، وەکو ئەوتریٰ دیارە بانێک و دوو هەوا بوە!! لام وایە ئەو لا لیٰ نەکردنەوەی روس ئەویش لەو رۆژانەدا هەر دەستی تورکە کمالییەکانی تیادابوە چونکە راستە تورکەکان یوزدەمیریان ناردبوو بۆ رواندز و هەوڵیان دابوو پێوەندی لەگەڵ شێخ محمود دا بکەن بەڵام بە هیچ جۆرێک ئەولا لیٰ کردنەوە و پێوەندییەی یوزدمیر بۆ ئەوە نەبووەکە کورد لە خوارووی کوردستاندا دەسەلاتێکی ئەوتۆی هەبێت کەلە دوا رۆژدا حکومەتێکی سەربەخۆ بۆ میللەتێکی ئازاد دروست بکات . بەڵکو ئەوەش هەر بۆ ئەوە بووە کە ئینگلیز لە کورد بدا و دڵی ئینگلیز لە کورد کرمیٰ بکا، ئەو رۆژانەی کە تورکەکان دۆستایەتیان لەگەڵ سۆڤیەت گەرم بوو ئەو سەردەمە بوو کە هەرەشەی یۆنانیەکان زۆر ترسناک بوو بۆ تورکەکان بەڵام کە ئەو مەترسیەیان نەما ئیتر تورک بە حسابەکەی خۆیدا چووەوە، تورکەکان بۆ روالەت لەو رۆژانەدا اجازەی حزبی کۆمۆنیستی تورکیان دابوو بسەرۆکایەتی ( حقی بهیج) کە زۆر طۆرانی بووە ، روسەکان بەپێی ئەو مەعلوماتە پر لە درۆ دەلسانەی کە تورکەکان دەربارەی کورد رێکیان خستبو کە گوایا راپەرینی کوردەکان ، راپەرینێکی سەربە ئینگلیز بوەو ئینگلیزەکان نەخشەیان بۆ کورد کێشابوو یارمەتیان دابوون، کەلەراستیدا دەرکەوت ئینگلیز بە هیچ جۆرێک یارمەتی کوردی نەدابوو و هیچ سەرچاوەو بەڵگەیەک بەدەستەوە نیە کە ئینگلیز یارمەتی کوردی کوردستانی تورکیای دابیٰ جگەلەوناردنەی میجر نۆئیل نەبیٰ بۆ ناوچەکانی کوردستان بۆ ئەوەی بەو چونە دڵی تورکەکان لە کورد کرمیٰ بکاو وایان لیٰ بکا ئەو رێک کەوتنە کاتیەی کەلە ئەنادوڵدا پێکیان هێنابوو تێکی بداو کە توانیشی ئەومەبەستە بهێنێتە دی و مس بیل لە کتێبەکەیدا بە ئاشکرا دانی بەوەداناوە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین .

تورکەکان لەدوای پاشگەزبونەوە لە بەڵێنەکانی پێشویان کە کوردیان واتیٰ گیاندبوو دوای سەرکەوتن بسەریۆناندا مافی ئۆتۆنۆمی ئەدەن بە کورد، ئیتر

دەستیان کرد بە پرۆپاگاندە دژی کورد و هەر رۆژەی لە بیانوویەک ئەگەران بۆ ئەوەی لەناویان ببەن. لەگەرمەی ئەو پرۆپاگاندانەدا تورکەکان توانیبویان کارێکی تەواو بکەنە سەر دەزگای راگەیاندنی سۆڤیەت و نووسەرانی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە هەرچی لە دەزگاکانی راگەیاندنی کەمالییەکانەوە دژی کورد دەرچوو بوو هەموویان بەراست زانیوەو ئارشیڤەکانی ولاتی سۆڤیەت وەکو شارەزاکان باسی ئەکەن پرن لە راپۆرتی ئەوتۆ کە رنگدانەوەی ئەو درۆ دەلەسەو پرۆپاگاندانەی تورکە کەمالییەکانی تیادا رەنگ داوەتەوە .

ئەوجۆرە بیرو باوەرانەی کەلەناو نووسەرانی سۆڤیتی ئەو سەردەمەدا باو بووە ماوەیەکی زۆری خایاند هەتا لەم دواییەدا وردە وردە بەو دوکیومینت و راپۆرتانەدا چونەوەو ئەو راستیەیان بۆ دەرکەوتوە کە شۆرشی کوردستانی تورکیا لە سالی ١٩٢٥ و لەوەش بەدواوە، بە هاندانی ئینگلیز نەبووە بەلکو لە ئەنجامی رەگەز پەرستی و جەورو ستەمی تورکە کەمالییەکان بووە کە ویستویانە مافی میللەتی کورد پی شیل بکەن .

وەکو دکتۆر کەمال مەزهەر لە کتێبەکانیا باسی کردوە و ئەو تەقەلاو هەولەی کە ئەو لەگەل شارەزایانی روس داوێتی بەتایبەتی لەگەل یەکێکی وەکو ـ ئەناتولی فیلیپۆ ڤیچ میللەر ـ دەورێکی زۆر گرنگ و کاریگەری هەبووە بۆ راست کردنەوەو روون کردنەوەی ئەو بۆ چونە خوارو پڕ لە هەلانەی نووسەرانی سۆڤیتی ئەو سەردەمە .

نووسەرانی بێگانە زۆر جار سەرچاوەی باسەکانیان بریتیە لە نوسین و یاداشت و راپۆرتەکانی دوژمنی کورد کە هەمیشە هەولیان داوە راستیەکان ئاوەژوو بکەن و ناوی کورد لای بێگانە بزرێنن .

تورکە کەمالییەکان و نووسەرە بەکرێگیراوەکان ماوەیەکی ئێجگار زۆر تەقەلای ئەوەیان دا بو کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن عوسمانلی و تورکەکانەوە هەموو گزتاوەرزکەی بەسەر شان و ملی کوردا بچۆرێننەوە .

پرۆپاگاندەکانی تورک کەلە نوسین و راپۆرتەکانی ئەوسەردەمەی روسیا رەنگیان داوەتەوە تاماوەیەک کوردی بێ تاوانی پێ تاوانبار کرابوو.

لەو روەوە لە دوای نزیک بیست ساڵ بەسەر تاوان و کوشتارەکانی ئەرمەنی و ئاسوریدا لەلایەن عوسمانلی و تورکەکانەوە ( رۆژنامەگەری رۆژهەڵاتناس)لە ژمارە ١٣ ، ١٤ ی ساڵی ١٩٣٢ دا بە توندی رەخنەی لەو نووسەرە سۆڤیەتانە گرتوەو لەو روەوە وتویەتی :«١٤»

جێگەی داخە کە تیوری ئیمپریالیستی لە رێگای بلاو کراوەکانیەوە وەکو (حاکمێتی علیە ) و رۆژنامەی (تایمس)ی ئینگلیزی و چەند رۆژنامەو بلاوکراوەیەکی تر بەنارەوا کوردیان وەکو درندەیەک ، وەکو کێویەک بە خەڵک ناساندووە.جگە لەو کارتێکردنەی پرۆپاگاندەی کەمالییەکان رۆژنامەکانی تری ئیمپریالیزم و هەندی لەو ئەرمەنیانەی کەلەو رۆژانەدا دژی کورد بوون ، ئەوانیش دەستێکی باڵایان هەبووە لە بلاوکردنەوەی درۆدەلەسەو پرۆپاگاندە کردن دژی کورد .

بەلام ئەوەی راستی بێ ، هەرچەند دکتۆرکەمال ئەلێ ئیمرۆ بیری نووسەرانی سۆڤیەت بەرامبەر بە رابوردووی کورد گۆراوە ، بەلام لام وایە هێشتاخڵتەو ژەنگ و ژاری ئەو پرۆپاگاندانەی تورکیزمی ئەوسەردەمە و ئەو ئەرمەنیانەی کەبە هەڵەداچوو بوون هەندێکی لەناو مێشکی چەند نووسەرێکی سۆڤێتی ئەم سەردەمەدا هەرماوە.

بۆنمونەی مانەوەی ئەو ژەنگ و ژارو خڵتەیە، برادەرێکم ( ع.پەشێو ) کەلە مۆسکۆ دکتۆرای لەسەر پیرەمێردی شاعیر وەرگرتوە جارێک بۆی نووسیم کە پیرەمێرد لەو شیعرانەیدا کەبۆ ستایشی خەباتی شێخ عبێداللەوشێخ قادر لە دیوانەکەیدا بلاوی کردبووەوە مامۆستای سەرپەرشتیکەری دکتۆراکەی بەچاوێکی گومان لێکراوە سەیری خەباتی شێخ عبێدالله و شێخ عبدالقادری کردوەو لە دواییدا بە نامەیەکی تر ئاگاداری کردم کە ماوەیەکی زۆری ویست تاکو توانی مامۆستاکەی دڵنیابێت کە پیرەمێرد بە نارەوا ئەو شیعرانەی نەوتوە .لە دوای چەندان ساڵ وەکو وتمان وردە وردە نوسەرانی سۆڤیەت بە حسابە کۆنەکانیاندا چوبونەوەو بلاو کراوەی دەنگ و باسی رۆژهەلاتی ناوەراست بۆ نمونە لە ژمارە/١٢/ی ساڵی ١٩٣١ دا دەربارەی هێرشی تورکە کەمالییەکانی بۆ سەر

کورد نوسیویەتی ئەڵێ :«٦١»
کەمالییەکان لە کوردستاندا هەموو جۆرە چەکێکی تازەیان بەکار هێناوە و هەموو رێگەیەکی خوێن رێژی و پیاو کوشتنیان گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد خەفەبکەن و بە تۆپو فڕۆکە گوندەکانیان بە تەواوی خاپور کراو گاو گوتاڵ و پەزی کوردەکان تالان کراو قڕیان خستە دانیشتوانی کورد بەبێ جیاوازی لە نێوان چەکدار و بێ چەکدا، بەبێ جیاوازی لە نێوانی منداڵ و ئافرەتی بێ دەرەتاندا .

هەروەها مامۆستاکوردیف«١٤» کە شارەزاییەکی تەواوی هەبووە دەربارەی مێژووی کورد لە باسەکانیا بۆچون و لێکدانەوە و سەرنجی نوسەرە بۆرژواکانی ریسوا کردوەو رووی راستەقینەی شۆرش و بزووتنەوەکانی کوردی روون کردۆتەوە .

بەڵام ئەوەی جێگای سەیر و سەمەرەیە ئەوەیە کەلە ساتێکدا هەندێک لە نووسەرانی سۆڤیەت کوردیان بەوە تاوانبار کردووە کە شۆرشەکانیان بە هاندانی ئینگلیزەکان بووە دژی کەمالییەکان کەچی لە هەمان کاتیدا ئینگلیزیش زۆرجار شۆرشەکانی کوردیان والەقەڵەم داوە کە بە هاندانی روس بوە.«١٤»

بۆ نمونە کە ساتێک شێخ عبیداللەی شەمزینی لە ساڵی ١٨٨٠ دا دژی حکومەتی ئێران راپەری و بۆ یەکەمجار هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی دا لە کوردستانی ئێرانا و دەستی کرد بە خەبات و دەسەڵاتی لە ناوچەی (وان)دا پەرەی سەند ، ئێرانیەکان ئەوکاتە کە ناصرالدینی قاجاری شای ئێران ئەبێت بۆ لەناو بردنی شۆرشەکەی شێخ عبیداللە پەنا ئەبەنە بەر روس و ئینگلیزو عوسمانلی ، هەریەکەیان بەجۆرێک یارمەتی ئێران ئەدەن کەچی سەیر ئەوە ئەبێ هەر یەکێک لەو سێ لایە کوردیان بەوە تاوانبار کردوە کە یارمەتی لەلایەکی تریان وەرگرتووە و شۆرش و راپەرینەکەی بە هاندانی ئەو لایە بووە .

وەکو دوکتور جەلیلی جەلیل لە کتێبەکەیدا- راپەرینی کوردان ساڵی ١٨٨٠- وەرگێرانی دوکتور کاوس قەفتان بۆ کوردی، چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٧، ئەڵێ: رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی ئینگلیز بۆ نمونە رۆژنامە دیلی تلگراف لەو رۆژانەدا بڵاوی کردبوەوە کە راپەرینی شێخ عبیداللە بە دەسیسەی روس بووە و لە هەمان

کاتیشدا رۆژنامەی ( قفقاس ) ی روسەکانیش وای بلاو کردبوەوە کە ئەو بزوتنەوەیەی کورد یەکێک بووە لە پیلانەکانی ئینگلیز لەو ناوچەیەدا و ئەرمەنیەکانیش کاسە ئاردی خۆیان کردۆتە ناو مەنجەڵی سەمەنیی ئەو درۆدەلەسانەوە بلاویان کردبوەوە کە ئەو راپەرین و شۆرشەی کورد بە هاندانی عوسمانلی یەکان بووە ( بێگومان هەرلایەیان رقی لە کێ بوو بێت شۆرشەکەی کوردی کلۆڵ و بێکەسی داوەتە پاڵ ئەولایە کە کورد قەت لە ژیانیا شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە نەک سێ لا بەڵکو بگرە لایەکیش لای لێ نەکردۆتەوە).

ساتێک کە شێخ عبیداللە لە ئێران شکا و ناچار بوو پەنای بردە بەر ناوچەی کوردستانی تورکیا، عوسمانلییەکان کە ئەرمەنیەکان ئەیان ووت کورد بە پاڵپشتی عوسمانلی شەریان کردوە شێخ عبیداللە یان وەکو دیلێکی دەست بەسەر تەماشا کردوە نەک وەکو دۆستێک .

دەربارەی تەقەلای کورد بۆ دەستگیر بوونی یارمەتی لەولاتان زنار سلۆپی لە یاداشتەکانیا ئەلێ:«١٩» لە دوای شەری یەکەمی جیهانی و بلاوکردنەوەی چواردە مادەکەی ویلسنی سەرەک کۆماری ئەمریکا ، ئەندامانی کۆمەڵی هێڤی کۆمەڵێکیان لەناو خۆیانا پێک هێنا بوو بەناوی ( کۆمەڵی بوژانەوەی کورد ) بەسەرۆکایەتی شێخ عبدالقادری شەمزینی و ئەمین ئالی بەدرخان جێگری سەرۆک بوەو فریک پاشا ( برازای وەزیری دەرەوەی پێشوی عوسمانی) جێگری دووهەمی سەرۆک و ئەمینی گشتی فریک حمدی پاشا (لواء رکن متقاعد بوو) و محاسب سید عبداللە سید عبالقادرئەفەندی بووو ئەندامەکانی تری ئەوکۆمەڵە بریتی بوون لە عقید خامیل بەگ خەڵکی دەرسیم بوو و عقیدی متقاعد بدیع الزمان خان علی بەگ ( خەڵکی ناوچەی سنە بوەو لە باسی رۆشنبیریدا باسمان کردووە) و ئەمین زەکی بەگ قائدی جیشی متقاعد ( خەڵکی سلێمانی و خاوەنی مێژوی کوردو کوردستان ) و چەند کەسێکی تر وەکو خواجە علی ئەفەندی و پرۆفیسۆر شفیق ئەفەندی ( خەڵکی ئۆراس )، بابان زادە شوکری بەگ کە سەر نووسەری رۆژنامەی ترجمان بوە ، فتح اللە ئەفەندی بازرگان و دکتۆر محمد شوکری صگبان ( کەلە شوێنی خویدا باسمان کرد چۆن ماموستا رفیق حیلمی بە نامیلکەیەک وەرامی

دابوەوە دوای دوای پاشگەزبوونەوەی لە کوردایەتی ).
ئەندامانی ئەو کۆمەڵە لەناو خۆیاندا لەسەر ئەوە ڕێک ئەکەون کە بچن بۆ زیارەتی قونسولخانەی امریکی و فرنسی وئینگلیزی لە ئەستەمبول بۆ ئەوەی گفت و گۆیان لەگەلا بکەن تا حکومەتەکانیان دان بەمافی نەتەوەی کوردا بنێن.
عبد القادر ئەفەندی (نیازی لە شیخ عبد القادری شمزینی بوە) و ئەمین بەدرخان و بدیع الزمان ومحمد شکری صگبان ئەچنە موفوضێتی ئەمریکی و یاداشتیکیان دانێ وکە لەو یاداشتەدا سنووری کوردستانیان تیادا دەس نیشان کردبوو وە داوایان کردبو پێوستە ڕیگەی کوردستان بدرێ بگاتە سەر دەریا.
لەوەرامی ئەوەدا مفوضی ئەمریکی پی یان ئەلێ: بریار ئەوەیە کە حکومەتیکی ئەرمەنی دروست بکریت کە بەشیکی کوردستانیش ئەگرێتەوە ... بدیع الزمان پیێ ئەلێ:- ئەگەر کوردستان لەسەر دەریا بوایە ئێستە ئیمرۆ پاپۆرەکانتان بەئاسانی ئەگەیشتنە کوردستان بەلام پاپۆرەکانتان ناتوانیت بەسەر شاخەکانا بگاتە ئێرە.
لەئەنجامی ئەو گفت و گۆیەدا مفوضی ئەمریکی بەوەفدەکە ئەلی: ئەبی خۆتان یارمەتی خۆتان بدەن ئەوسا خواش یارمەتیتان ئەدا.
دوای ئەوە لیژنەکە نوێنەری ئینگلیزیش ئەبینن و ئەویش لەئنجامدا پێ یان ئەلێ: جارێ پیویستە کورد دان بەخۆیا بگری و چاوەروان بکات.
زنارسلوپی دەربارەی دڵ پاکی و خوش بروایی کورد ئەلێ: «١٦»
"کوردەکان ئەوەندە خوش برواو ساویلکەبون، کەساتیک مصطفی کمال هێشتا ئومێدی بە کورد هەبوو، ئەو هیزەی مصطفی کمال بو پارێزگاری خۆی داینابوو کوردبون و بە جلی کوردی یەوە پارێزگاری یان ئەکرد.
بۆ ڕواڵەت وچاوبەست زور جار لەکوبونەوە گشتیەکانا مصطفی کمال دومندالی هەتیوی کوردی بەجل و بەرگی خاوێنەوە لەتەمەنی ٨-٩ سالیدا لەگەل خویا ئەگێرا بۆ ئەوەی کوردەکان بکا بەپاڵ پشتی خوی کە ئەمە وای لە هەندێ کورد کردبوو بەو پەری ساویلکەیەتیەوە دەماودەم بەیکتریان ئەووت. مصطفی کمال لەبنەچەدا کوردە...

دەربارەی بزوتنەوەی هێزی نەتەوایەتی کورد بەشێوەیەکی گشتی گەلێک لە نووسەران و رۆژ هەلات ناسان و روشنبیران و نووسەرانی خۆشمان لە سەریان نوسیوە کە لیستەی سەر چاوەکانی ئەم کتێبە ناوی زۆری لەوانە هێناوە.

باسیل نیکتین دەربارەی مێژوی کورد و بزوتنەوەکانی میللەتی کورد لەکتێبەکەیدا«٣٨» بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی کردوە بە (٣) قۆناغەوە:

١-قۆناغی یەکەم: قۆناغی راپەرین و بزووتنەوە و یاخی بوونی عفوی (هەرمەیی) کە لە راپەرینی عبد الرحمن پاشای بابانەوە لە سالی ١٨٣٢م دا بەرامبەر بە عوسمانییەکان دەست پێ ئەکا و دوای ئەوە دیتە سەرباسی بزوتنەوەی (بدرخان بەگ) لە سالی ١٨٤٦ دا و دوای ئەوەیش شۆرشەکەی شێخ عبید الله لە کوردستانی ئێران لە سالی ١٨٨٠ دا.

٢- قۆناغی دوهەم: بریتیە لە هەول دان بۆ رێکخستني بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە دوای سەرنەگرتنی شورشەکەی شیخ عبید الله لە سالی ١٨٨٠دا کە ئەو قۆناغە هەتا شەری یەکەمی جیهانی درێژەی کێشا.

رۆژنامەی کوردستان کە لە ٢٢/ئەپریلی/١٨٩٨دا دەرچوە سەرەتای هەست پێ کردنی کوردبوە بەپیویستیی بوونی دەزگایەکی روشنبیری وراگەیاندن شان بەشانی دەزگای شورشگێری چەک هەلگر.

٣- قۆناغی سێ هەم: بریتیە لەبایەخ دان بە بەرژەوەندی دوارۆژی نەتەوەی کورد لە پلەیەکی جیهانيدا وەکو ئەوەی لە پەیمانی سیڤەری سالی ١٩٢٠دا توانرا باسی کورد بکری (مادەکانی ٦٢، ٦٣، ٦٤ی ئەو پەیمانە پیوەندییان بەکوردە وەهەبوە لەشوینی خویدا لەباسی پەیمانی سیڤەردا باسی ئەکەین)، هەروها کێشەی ویلایتی وموسل ودامەزراندنی کۆمەلی خویبون و دامەزراندنی رێکخراو وکۆمەڵەکان هەتا شەری دوهەمی جیهانی.

قدری جمیل بەگ «١٩» دەربارەی قۆناغی سێهەمی باسیل نیکیتن ئەلێ:

"کومەلی أتحاد وترەقی لەسەرەتادا پروگرامێکی تایبەتی نەبوە، بەلکو هەموو هەولیکی تەنها بۆ کەم کردنەوەی دەسەلات و روو بەروو بونەوەی سولتان عبد الحمید بو. لە سەرەتادا ئەو کۆمەلە لەناو قوتابیانی (معهدی طبی) ئەستەنبول

ریکخرا که زوربەی قوتابیانی بەشداربوو لەو کۆمەڵەدا کورد بوون وەکو (أسحاق سکوتی) خەلکی دیار بکر (دکتور عبد الله جودت) و گەلێکی‌تر. بەلاَم لە دواییدا رەگەزپەرەستیی ژون تورکەکان وای لە نەتەوەکانی تر کرد کە ئەوانیش حسابێکی تایبەتی بۆ خۆیان بکەن ... ئەلبانەکان (کۆمەلی باشکیم) وعەرەبەکان (المنتدی الأدبی) و کوردەکان (هیڤی)یان دامەزراند.

هەر لەو رۆژانەدابو کە (حسین جاهید) سەرۆکی رۆژنامەی (طنین) کە ئورگانی أتحاد وترقی بوو چاوی بەرایی نەدەهێنا ناوی کورد بینێت و بەناوی (ویلایاتی رۆژهەلاَت)ەوە ناوی ئەبرد".

سەیرە وادیارە گشتی لە تۆویک کاڵەک... لەخوارەوی کوردستانیشدا رەگەزپەرستەکانی عەرەبیش چاویان بەرایی ناهێنی کە ناوی کوردستان بخوێننەوە بی‌بیەن و پی‌ی ئەلێن (شمال) و ئەوپەرەکەی ئەگەر خواردەیی بکەن پی‌ی ئەلین (شمالنا الحبیب).

زنار سلوپی لە یاداشتەکانیدا ناوی چەند کسێکی هێناوە کە لەکۆمەلی (هیڤی)دا بەشداری‌یان کردبو وەکو ١-اکرم جمیل پاشا، ٢-ممدوح سالم بەگ، ٣-٤ کمال فەوزی وبراکەی (ناوی براکەی نەبردوە)، ٥- ضیاء وەهبی، ٦-نجم الدین حسین (کرکوک)، ٧-بابان زادە عزیز، ٨- شفیق (أرفاس)، ٩-حمزە (خەلکی میلکیس)، ١٠-طاهر علی (خربوط)، ١١-عبد الکریم (سلیمانیە-کە نیازی لە کریم بەگی کرکوکلی زادە بوە) ١٢و١٣-صالح و عبد القاضی (هەردوکیان خەلکی دیاربکر )بون، ١٤-ئاصف بدرخان، ١٥-مصطفی رشاد (دیاربکر)، ١٦-دکتور مصطفی شوقی (مهاباد)، ١٧-محمد مهری (سنە)، ١٨-دکتور فوئاد (کە لەدواییدا لە سێدارە دراوە)، ١٩-عبدالرحمن رەحیمی شاعر(هکاری).

ئەم کۆمەڵە زۆر دەنگی دایەوە و لەدواییدا لقیکی هیڤی لە سویسرەش پیک‌هات.

مێژوو ناسی بەناو بانگی سوڤیەت (لازاریف) کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بەماوەی پێشکەوتنی تیکوشانی میللەتی کورد دائەنێت.

دکتور عزیز شەمزینی دەربارەی راپەرین و شورشەکانی گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا لەسەرەتای سەدی بیستەمەوە هەتا سالی سیەکان) بەم جۆرەی خوارەوە باسی‌کردون «١٤»

١-شورشی کوردەکانی موصل وئەرز روم وبتلیس لەسالی١٩٠٧دا.
٢-شورشەکانی مەلاسلیم وشیخ شهاب الدین لە بتلیس سالی ١٩١٣.
٣-شورشەکانی شیخ محمودی حفید لە سالی ١٩١٨-١٩٣٢.
٤-راپەرینەکانی سمکۆ لە کوردستانی ئیراندا سالی ١٩٢٠-١٩٣٠.
٥-راپەرین وشۆرشەکانی عبد القادری شەمزینی بەسەرکردایەتی پارتی (تعالی کوردستان) لەسالی ١٩٢٥دا.
٦-راپەرینی ئاگری داغ سالی١٩٢٦.
٧-راپەرینی شیخ احمدی بارزان ١٩٣١-١٩٣٢.
٨-جوولاْنەوەی جعفر سولتان (جافرسان) لەکوردستانی ئیرانا ١٩٣١-١٩٣٢.
٩-راپەرینی کوردەکانی دیاربکر سالی١٩٣٤.
١٠-راپەرینی کوردەکانی درسیم.

(سەیر ئەوەیە دکتور شمزین لیرەدا باسی شورشەکەی عبدالسلام بارزانی نەکردوە کە لەسالی ١٩١٤دا لە سیْدارە دراوە وعبد المنعم الغلامی لەکتیبەکەیدا باسیکی تایبەتی بۆ ترخان‌کردوە لەگەڵ ئەوەشدا کە دکتور لەشوینی‌ترا باسی کردوە).

دکتور شمزینی دەربارەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەر لەشەری یەکەمی جیهانی ئەلی:

"شۆرشی سالی ١٩٠٥ی روسیا کاریکی زۆر گەورەی‌کردە سەر بزواندنی هەستی نەتەوایەتی لەناوچەکەدا کە کوردەکانیشی گرتەوە. (گیرگوف)ی قونسولی گشتی روسی لەشاری (خوی) لە ئیراندا لەم روەوە نوسیویتی کەساتیک بازرگانەکانی کورد ویارمەتیدەرەکانیان بەتایبەتی روشنبیرەکانی کورد بۆ سەردان لە فرۆشگای (ماکاریوف) ئەهاتن بۆ (نیزنی نوفکورد) وچاویان بە سەربازە دیموکراتیەکانی روس ئەکەوت، گرنگترین هەواڵ وباسەکانیان لەو سەربازانە

ئەبیست و کاری تیّ ئەکردن وکە ئەگەرانەوە ئەو هەواڵ وباسانەیان بۆ هاووڵاتیانی خۆیان ئەگێرایەوە).

دکتور عزیز شەمزینی هۆی سەرنەکەوتن وشکستی بزوتنەوەکانی کورد بەر لەشەری یەکەم و دوهەمی جیهانی بەم جۆرەی خوارەوە لێک داوەتەوە.

١-جوولانەوەی کوردی ئەو سەردەمە بیّ تاکتیک‌بوەو بەرنامەیەکی رێک و پێکی نەبوە و هیچ پارت وتاقمێکی رێکخراو رێبەرایەتی ئەو شورشانەی نەکردوە و سەرکردەکانیان لەرووی کەم توانایی سیاسیّ و نەشارەزاییەوە وەسەریان لەکاروباری سیاسەت دەرنەچوە و زۆر جار ئەو بزوتنەوانە لەریگەی چەند سەروکیکەوە دەستی‌پی‌کردەوە و ساتیک ئەوانە نەمابن ئیتر شۆرشەکە هەرەسی هێناوە و لەناو چوە.

٢- خیانەتی چینی فیوداڵ و پیاوە ئاینیەکان و چوونەپاڵ بیگانە.

٣- بەش‌بەش‌بوونی کوردستان وای لە کورد کردوە خەباتی بەشەکانی لیک‌پچراوبێت و هیچ‌لایەک نەی‌توانیوە پشتگیری لاکانی‌تر بکات.

٤- دەولەتە داگیرکەرەکانی هەمیشە پشتگیری یەکتریان کردوە بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد (پەیمانی سعداباد و پەیمانە نهینەکانی تر، تا ئەو پەیمانە نهینیەی ئەم روژانەی نیوان رژیمی عراق وتورکیا بۆ پان کردونەوەی کورد نموونەیەکی ئاشکران).

٥- جگە لە دولّەتە داگیرکەرەکان (عیراق‌و تورکیاو ئیران) دەولەتە سەرمایەدارو ئیمپریالیزمەکانیش هەمیشە دژی رزگاربوونی گەلی کوردبون.

٦- نەبوونی دەرامەت و دەسەلاّتی دارایی و نەبوونی چەک بە دەست کوردەوە بە پێچەوانەی داگیرکەرانی کوردستان کە تازەترین چەکیان‌بوە (کە ئینگلیزەکان عراقیان دروست کرد لە شکریکیان بۆ سازکردو هەمو جۆرە چەک وجبەخانەیەکیان بۆ پەیدا کردو بەزەبری فروکەکانی خویان ولاتیان بۆ تەخت‌کردن و کوردستانیان بەزۆرەملی لکاند بە میسوپوتامیاوە ئەوسا بەجیّیان هیّشت).

٧- سیستەمی فیوداڵ و ئاینی رۆلیکی سەرەکییان بینیوە لەسەر نەگرتن و سەرنەکەوتنی شورشەکان و راپەرینی میللەتی کورد.

بەلام ستیڤن لەکتیبەکەیدا «٥٧» دەربارەی هوی لاوازبونی بزوتنەوەی هیزی نەتەوایەتی کورد و سەرنەکەوتنی شورشەکانی ئەلیٚ:

"یەکیک لەو هۆ سەرەکی یانەی کەبۆتە هوی سەرنەکەوتنی شورشەکانی کورد ئەوەبوە کەهیچ بەشیکی کوردستان پیوەندی نەبوە بە بەشەکانی تریەوە، بۆیە هەموو شۆرشەکانیان هەریەکە بەجیا و لەشوینی خویدا لیٚ دراوە، لەگەل ئەوەشدا بزوتنەوەی هیزی نەتەوایەتی کورد شیوەیەکی تازەی وەرگرت وەکو بزوتنەوەکەی أحسان نوری پاشا لەناوچەی ئارارات و شورشەکەی ناوچەی دەرسیم لە سالی ١٩٣٧دا".

ستیڤن لە باسەکەیا لەسەری ئەروا و ئەلیٚ:

"کوردەکانی تورکیا ریکخراوی (خویبون)یان هەبوە کە ئەمە هەنگاریک بوە بۆ بەرەو پیش چوون کە شورشی کوردی لە شورشیکی عەشایریە وە بردبەرەو باریکی ریکخراو.

کە یەکەم کۆبونەوەی (خویبون) لە (بحمدون) بەسترا لە لوبنان، زوربەی بەشداربوانی ئەو کۆبونەوەیە ئەرستوکراتیەکانی کورد بون وەکو کامیران بدرخان و ممدوح سلیم و شاهین بەگ و أحسان نوری پاشا (کە أحسان نوری پاشا لەو کۆبونەوەیەدا کرا بە سەرکردەی گشتیی هیزەکانی کورد)".

ستیڤن بەرپەرچی ئەو پروپاگاندانە ئەداتەوە کە گوایا ئینگلیزەکان هانی کوردیان دابوو بۆ ریکخستنی (خویبون) و ئەلیٚ لە راستیدا ئەرمەنیە طاشناقەکان بەسەرۆکایەتی (V. Papasian) یارمەتی کوردەکانیان دا کە ئەو یارمەتیدانەیان هەر لەبەر ئەوە بوە کە هەردولا دژی تورک بون.

بەراستی وەک ئەوەی ستیڤن باسی کردوەو دکتور شمزین لە هۆی سیٚهەمی سەرنەکەوتنی شورشەکانی کوردا باسی کردوەو زۆر نووسەری تریش هەریەکە بوی چوون و باسیان کردوە هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنی شورشەکانی کورد نەبوونی پیوەندی بوە لەنیوان شورشگیرانی بەشە داگیرکراوەکانی کوردستاندا. کە شورشگیرانی زەمانی شیخ عبید اللەی نەهری دەستیان بەشورشەکانی کردوە دژی شای قاچاری شای ئیران لەهیچ لایەکی تری بەشەکانی کوردستانەوە یارمەتی ئەو

شورشەیان نەداوەو بەشداری‌یان تیادا نەکردوە کەشیخ مەحمود ناچاربوو روو بەرووی ئینگلیزەکان ببێتەوە جگە لەو چەکدارانەی مەحمود خانی دزلی کە هاتن بەدەنگیەوە وەهیچ لایەکی‌تری بەشەکانی کوردستان بەدەنگیەوە نەچوون ئەگەرچی کاک مسعود بارزانی لەکتیبەکەیدا (البارزانی والحرکە التحرریە الکردیە-انتفاضە برزان الاولی چاپی ۱۹۸٦ لە لاپەرە «۲٤»دا ئەلیٚ کە شیخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیزەکان راپەری شیخ ئەحمەدی بارزانی لایەنگری شیخ مەحمودبوەو چەند نامەیەکی ناردوە بو سەروک عەشیرەتەکانی ناوچەی بادینان کە هاوکاری لەگەل شیخ مەحمودا بکەن‌و مەلامصطفی برای لەریگەی (دولی بیاو)و تاقمیکی‌تر لەریگەی (ناوچەی بالک)ەوە نارد وە کە لە ریگا نوکەرانی ئینگلیز بەرنگاریان بونەتەوە، بەلام ساتیک پیشرەوی بارزانیەکان نزیکی سلیمانی بوبونەوە شیخ مەحمود بەدیل گیرابوو «۲۳»

دەربارەی ئەوەی کاک مسعود باسی کردوە پرسیارم لەشیخ بابە علی شیخ مەحمود کرد لە وەراما وتی کە باوکم بریاری روو بە روو بونەوەی ئینگلیزی‌دا (فخری واصف بەگ)ی نارد بۆ لای شیخ ئەحمەدی بارزان بۆ ئەوەی یارمەتی بۆ بنێریت شیخ ئەحمەد لەویٚ نابیت‌و پاش چەند رۆژیک ئەگەریتەوەو نامەکەی شیخ مەحمودی ئەداتیٚ.

لاهووتی لەگوڤاری (روژ هەلاتی نویٚ)ی ژمارە (٤٥)ی سالی ۱۹۲۳ بەزمانی روسی لەژیر ناوی (کوردستان‌و کورد)دا ئەلیٚ:«١٤»

(سیاستی ژون تورک‌بوو بەهوی چەکەرەکردنی هیزی نەتەواتیەکی توندڕەوو پەیدابوونی بزوتنەوەی لاوانی کورد، چونکە ئەوانەی سەربەتورک‌بون لەناو کۆمەلیٚ أتحادو ترقی‌دا لەسەرەتادا قوتابیە کوردەکان بەشیٚکی سەرەکی‌بون لەپیک هینانی ئەو کۆمەلەدا، بەلام تورکیزمەکان وردە وردە دەستیان کەوتە روو نیازەکانیان ئاشکرابو، بۆیە ئەو ئەندامانەی کەتورک نەبوون لەو کۆمەلەدا هەر لایە بەجیا ریکخراویکی بۆ خۆی پیک‌هینا کە ئەو رێکخراوانە بوون بەپیٚشرەوی خەباتی میللەتەکەیان بۆ دەسکەوتنی مافی نەتەوایەتی خۆیان ... بەو پیٚیە کوردەکانیش لەئەستەمبول‌و دیاربکر دەستیان کرد بە دامەزراندنی کۆمەل‌و

ڕێکخراوی خۆیان وەکو (کوردستان جمعیتی) و (کورد تعمیم معارف، ونشریات جمعیتی) و (کوردستان تعالی جمعیتی) و (کورد قادینلر جمعیتی-کە بریتیبوە لە کۆمەڵی ئافرەتانی کورد).

ئەو ڕێکخراوو کۆمەلانە هەریەکەیان بەجۆرێک دەوری خۆی بینیوە لە بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد و هاندانیکورد بۆ داواکردنی مافی خۆی".

دوکتور جمال نەبەز لەکتیبەکەیدا کوردستانو شورشەکەی «١٥» لەو روەوە ئەڵی:

"یەکەم پارتێکی کورد کە دامەزرێنرا ناوی پارتی (عەزمی قەوی) بوو، جگە لەو ڕێکخراوە، ڕێکخراوی تریش لە ئارادابوە وەکو ڕێکخراوی (أستقلالی کوردستان) و ڕێکخراوی (تشکیلاتی اجتماعیە) و ڕێکخراوی (میللەتی کورد)).

(و. ج. أیلڤنستن) لە گۆڤاری (انترناشنال ئەفیز)ی ژمار (١٩)ی کانونی دوهەمی ساڵی ١٩٤٦ کە لەلایان کاک عبد القادر حیشمەتەوە کراوە بەکوردیو بەشێوەی نامیلکەیەک لەساڵی ١٩٤٧دا لە چاپخانەی معارفی بغداد بلأوکراوەتەوە ئەڵی: «٤٧»

( لەدوای اعلانی مشروتیەتو لابردنی سولتان عبد الحمید لەلایەن کۆمەڵی أتحاد و ترقییەوە، کوردە بەناوبانگەکانی دەرەوە کە بۆ کوردایەتی تیٔئەکوشان، لەلایەن گەنجە تورکەکانەوە ڕێگەیان پیٔدرا بگەرێنەوە بۆ ئەستەمبولو لەوی کۆمەلیکی قەومیان پێکهێناو بەرامبەر بەچەند بەڵێن و پەیمانیک یارمەتی کۆمەلەکەیاندا، بەلام لەدواییدا أتحادو ترقی لە بەڵێن و پەیمانەکانیان پاشگەزبونەوەو هەوڵیاندا کوردستان بە پیاوەکانیەوە خاکپۆش بکەنو شریف پاشا و ئەمین ئالی بدرخان حوکمدران بە ئیعدام بەلأم زوو پییان زانی و خۆیان دەربازکرد.

هەرچەند تورکەکان ویستسان لەساڵی ١٩١٢دا دۆستایەتی لەگەڵ کوردا بنوێنن، بەلام ئەو تەقەلایەیان بیٔهوودەبوو چونکە لەهەراو بگری (بوتان)دا سلیمان بەگی بدرخان لەلایەن پۆلیسی تورکەوە کوژرا».

لەباسی رۆشنبیریدا دەربارەی ئەو چالاکیانە دواینو باسمانکرد چۆن بایەخیاندابو بە خویندەواریو روشنبیریو دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامەو بە کورتی

لەباسی عبد الرزاق بدرخاندا وترا کە عبد الرزاق بدرخان لە کوردستانی ئێراندا جێی خلیل خیالی گرتبوە وەلەکوردستانی تورکیادا. و داوای لە رووسەکان کردبوو کە رۆژهەلاتناسی بە ناوبانگ (ئا. ئوربیلی) بنێرن بۆ کوردستان بۆ دانانی رێزمان و فەرهەنگ بە زمانی کوردی و وەرگێرانی بۆ رووسی.

بێگومان عبد الرزاق بدرخان جگە لەو چالاکی روشنبیری‌یە وەکو سیاسیەکی کوردی زرنگ‌و وووریا رولیکی زۆر گەورەشی بینیوە لە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردا و یەکێک بوە لەو کوردانەی بەو پەری دووربینیەوە تماشای دوارۆژی نەتەوەکەی خۆی کردوە و یەکەم سەرکردەی کورد بوە کە رێرەویکی پێشکەوتوخوازانەی گرتۆتە بەربۆ گەیشتنی بەئامانج‌و سەربەخۆیی کورد و کوردستان.

هەر ئەو (ئا. ئوربیللی) یەی کە عبد الرزاق بدرخان داوای لە روسەکان کردبوو کە بی‌نێرن بۆ کوردستان، وەکو دوکتور کمال علی لەباسێکیا دەربارەی عبد الرزاق بدرخان کە لە گۆڤاری چوار چرای ژمارە (٢)ی یەکەم سالی ١٩٨٦ لە سوید بلاوی‌کردۆتەوە ئەلی ئا. ئور بیللی‌ی کورد ناس‌و زانای بەنێوبانگی سۆڤیتی لەچاوپیکەوتنێکا لەگەل عبد الرزاق بدرخان بەم جۆرە باسی عبد الرزاقی کردوە:

«هەرگیز ئەوە لەبیر ناکەم کە میللەتەکەم لەکۆت‌و زنجیری زورداری عوسمانی‌و قاجاری‌دایە، هیوا و ئاوات‌و ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە گەل‌و ولاتمان لەکوت‌و زنجیری زۆردار و داگیرکەر رزگارکەین. جا بۆ بە دیهێنانی ئەم ئامانجە پیروزەش گەلەکەمان پێویستیەکی زۆری بەخۆیندەواری هەیە. کلیلی ئەمەش رەخساندنی ئەسپابی فیربون‌و خوێندەواریە بۆ گەلی‌کورد، لەمەدا یارمەتیمان بدەن. ئەگەر بەمن‌و هەڤالاتم رزگارنەکرا، خۆ هەرکاتێ کورد بوو بەخاوەن دەست‌و قەلەم‌و خۆیندەواریی خۆی، ئەوسا دەتوانێ بەخۆیدا بێتەوە وە ئازادی خۆی بسێنێ».

بێگومان میللەتی کورد، لەگەل ئەوەشدا کە زۆر جار سەرکردەکانی هەولیان‌دابو پیوەندی بەکاربە دەستانی روسی قیصری‌یەوە بکەن، بەلام هەمیشە تەقەلاکانیان بێ‌سوودبوە و هۆی سەرەکیشی ئەوە بوە کە روسەکان ئەوسا ئەرمەنیەکانیان

لەلامەبست تربوە کە سەر بە ئاینی خویان بون وەک لەکوردە موسولمانەکان.

دوای ئەوەی شورشی ئوکتوبەری ١٩١٧ رویدا و میللەتی کوردیش یەکێک بوو لەو نەتەوە بەشی‌خوراو و چەوساوانەی کە شورشگیرانی سۆڤیەت دروشمی یارمەتی و هاوکاریان لەگەڵ ئەو جۆرە میللەتانەدا بەرزکردبوەوە بەلام بەداخەوە دوای ئەو شورشە سەرکەوتوە سۆڤیەتەکان بەهیچ جۆرێک لایان لەکورد نەکردەوە.

چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی بە شێوەیەکی گشتی لەو رۆژانەدا یەکێک بوە لەو باس و لێکۆڵینەوانەی کە (لینین) دەربارەی مافی چارەنوسی میللەتان لەکتێبەکەیدا (مسائل في السياسه القوميه والأمميه البروليتاريه) لە لاپەرە (١٦٣) باسی کردوە و ئەلێ:

(مافی نەتەوەکان بۆ دیاری کردن و مافی چارەنووسی ئەوە ئەگەیەنێت کە پێویستە هەمو نەتەوەیەک مافی سەر بەخۆیی و سیاسی و ئازادی و جیابوونەوەی هەبێت لە دەوڵەتی خاوەن نەتەوەی چەوسێنەر".

هەروەها لەلاپەرە (١٦٤) دا ئەلێ:

«لەسەرمان پێویستە داوای رزگاربوونی نەتەوە ژێردەستە زۆرلێکراوەکان بکەین بەلام نەک هەر بەقسەی بە پێچوپەنا و بە ووشەی پووچ وبی‌مانا و بەتوێکل، وەنابێ داوای دواخستنی مافەکانیان بکەن وبی‌هێلینەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە سوسیالیستی سەرئەکەوێ ... واتا پێویستە راست و روان و بەبێ هیچ مەرجێک پشتێگری خەباتیان بکەین.

هێشتنەوەی نەتەوەیەک بەزەبری هێز لەناو چوارچیوەی دەولەتێکدا لەگەل دیموکراتیەتدا ناگونجی، بەلام ئەگەر هات و ئەو نەتەوەیە مافی چارە نووسی خۆی دەسگیربوو، دیموکراسیەکانی دەوڵەتی دایک‌هانی ئەو نەتەوەیە ئەدا (مەعنای نەک بەزۆرە ملی) کەبەشێوەیەکی بەکسانی لەگەڵیا یەک بێت».

بەوپێ‌یە، بەو جۆرەی لینین بۆی چوە چ‌شورشەکەی شێخ مەحمود کەداوای مافی چارەنووسی میللەتەکەی کردوە و نەی ویستوە ئینگلیزی داگیرکەر بەزوورە ملی میللەتەکەی و نیشتمانەکەی بلکێنێت بەمیللەت و بەنیشتمانەکەی تری بێگانەوە کەهیچ جۆرە ئومێدیکی ئەوەی لی‌نەدەکرا بەچاویکی دیموکراسیانەوە سەیری

دوارۆژی میللەتی کورد بکات، هەروەها شورشەکانی شورشگیرانی کوردستانی تورکیا کە ڕوو بەرووی تورکیزمە ڕەگەزپەرستەکان بوبونەوە بۆ بەرگری میللەت و لەنیشتمانەکەیان کەچی لەو رۆژەدا سوڤیەتەکان، دۆستی دێرینی کمالی‌یەکان‌بوون و هیچ حسابێکیان بۆ ڕاپەڕین و شۆرشی کوردی چەوسینراو نەکردبووەوە. ئەگەرچی ئەمانە هەمویان لە چوارچێوەی ئەو نمونانەدا بون کە لینین داوای کردبوو پال پشتیان لیٰ‌بکریٰ و دان بەمافی چارەنووسیاندا بنرێت !!.

ئایا ئەو مەبادئانەی لینین بۆچی لەو رۆژانەدا لەقسەوە ترجمەنەکرا بەکردەوە لەکاتێکدا کورد بەئاشکرا لە تورکیادا لەلایەن تورکە کمالی‌یەکانەوە ئاوارە دەکرا و مالی‌ویران و خانەویران دەکرا و لە کوردستانی خواروشدا ئینگلیز بەزەبری فرۆکە شار وگوندەکانی ویران ئەکرد ؟؟

ئایا پشت‌گویٰ خستنی ئەو راستیانەی کە لینین بە نوسین دەس نیشانی‌کردبو چ زیانێکی گەورەی گەیاند بە ناوچەکە و چۆن ئەو یارمەتیدانەی سۆڤیەت بۆ کمالی‌یەکان بوو بەهۆی دامەزراندنی بناغەی دەولەتێکی رەگەز پەرستی سەر بەئیمپریالیزم کە ئیمرۆ سنوورەکانی هەمووی بە چەکی ئۆتۆنۆمی بێگانە لەسەر سنووری روسیادا تەنراوە و کوردیش هەتا ئیمرۆ لەژێر باری‌گرانی ئەو رژیمە خوێن ریژەدا دەنالێنیٰت.

سیاسەتمەدارانی بریتانیا هەر لەو سەردەمەوە بگرە هەتا ئیمرۆش نەخشەی رۆژ هەلاٴتی ناوەراستیان بەجۆرێک کێشاوە کە هەمیشە سوودی خۆیان لەناوچەکەدا مسوەگەر بکەن کە ئەو مسوەگەرکردنە هەتا ئێستە بەشێکی زۆری لەسەر حسابی میللەتی کورد و لەسەر ئێسک و لاشەی رەش و رووتی چەوساوەی کورد پێک هاتوە.

کورد هەر لە شۆرشی ئوکتوبەرەوە هەتا ئێستە هەر بەلایەنگر و دۆستی روس ژمێرراوە و تا ماوەیەک سەرۆکی شۆرشی کورد مصطفی بارزانی بە (مەلای سوور) لەقەلٚەم دراوە.

هەر لەو سەردەمی شۆرشی ئوکتوبەرەوە ئینگلیزەکان مەترسی‌ی ئەو دوستایەتیەی روس و کوردیان لیٰ نیشتبوو.

ئەرنولد ویلسن، حاكمی گشتی بریتانیا لەبغداد لەو راپورتانەوە كە لە كوردستانەوە بۆی ئەهات لە كتێبەكەیدا (میسوبۆتامیا لە سالأنی ١٩١٧-١٩٢٠) )«٣٧» بەئاشكرا باسی ئەو مەترسیەی كردوەو وتویەتی ئەوپەری جێی داخە كە ناوەڕۆك و بنچینەی پرنسیپەكانی بۆلشڤیزم ئیمرۆ لەناو كوردستاندا بەسەر زمانی زۆر كەسەوەیە و ئەو بیرو باوەڕانە بە هۆی ڕۆژنامەكانی كەركوكەوە بلأو ئەبێتەوە.

وا بۆ ئاگاداری خوێندەوارانی بەڕێز دەقی ئەو راپورتەی كە میجرسونی حاكمی سیاسی بریتانیا لە سلێمانی بۆ ویلسن حاكمی گشتی بریتانیا لە بەغدا لەو ڕوەوە نوسیویتی و ویلسن لەو كتیبەیدا لە لاپەرە (١٤٥)دا بلاوی كردوتەوە وە هەروەكو خۆی بە ئینگلیزی بلاوی ئەكەینەوە:

I think in view of tend of political opinion in Baghdad the recent successes of bolshevism and the delay of piece with Turkey, that we should not lose sight of the potentialities of the external situation there is no doubt that the great delay in settling piece with Turkey is an obstacle to administration and is occupying the minds of the more important people of south Kurdistan. Moreover the name and tents of bolshevism are unfortunately becoming known (Mainly through Kirkuk newspaper, which is not an unmixed blessing here).

وەك چۆن كوردەكانی توركیا دوای ئەوەی دەستی تاقمەكەی أتحاد و ترەقی كەوتەروو هیچ ئومێدێكیان نەما بەوەی كە توركەكان بیر لە دانی مافی نەتەوەی كورد بكەن و دانی پیادا بنێن، هەروەهاش لە ئێراندا دوای ئەوەی مەشروتیەت لەسالی ١٩٠٥دا اعلان كرا كوردەكان هیوایەكی زۆریان پەیداكرد. بەلأم ئەوانیش نائومید دەرچوون.

دوكتور عبد الرحمن قاسملو لە كتیبەكەیدا «١٦» باسی ئەنجومەن (سوڤیتات)ەكانی ناوچەی مەهاباد و سنەو كرماشان ئەكا كە چۆن لەدوای مەشروتیەتی سالی ١٩٠٥ پێك هاتنی ئەنجومەنی مەهاباد لەژێر سەركردایەتی شاعری ناسراوی كورد (قازی فتاح) داوای ئۆتۆنۆمی بۆ كورد كراو عشیرەتی شوكاك لە ناوچەی ورمیدا بوون بە پێشرەوی داواكەرانی ئەو داخوازیە كە

بێگومان زنجیرەی ئەو ڕاپەڕین و خەباتە لە دواییدا بە سەرکردایەتی سمکۆ (سمایلخانی شکاک) درێژەی کێشا. بەر لەوانەش لەکاتی خۆیدا شیخ عبیداللەی نەهری شورشەکەی لەکۆتایی سەدەمی پێشودا لە کوردستانی ئێران دەستی پێکرد بەڵام وەکو لە پێشتریشدا باسمان کرد ئەویش لەناو برا و شیخ عبید اللە ناچاربوو پەنای بردە بەر عوسمانلی.

لەخوارووی کوردستانیشدا بەر لەتەواوبونی شەری یەکەمی جیهانی بەهۆی ئەو ئەفسەرە کوردانەی کەلەناو سوپای عوسمانلیدا بون وردە وردە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە ئەگەیشتنە کوردستانو ژمارەیەک لە خوێندەوارانو روشنبیران ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەو رۆژانەبون و کە شەری جیهانی کۆتایی هات سەرەتای بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی لەخوارووی کوردستاندا سەری هەلدابوو.

أبو القاسم لاهوتی، شاعیرو روشنبیری مەزنی تاجیکستان لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوە ئەکا کە چون لەسالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە بەندیخانەی کرماشان رای کرد و لەرێگای شاری سلیمانیەوە خۆی گەیاندە ئەستەمبول و لە کاتیکدا کەلەسلیمانیدا بۆ ماوەیەک خۆی حەواندبووەوە، پیوەندی لەگەل شورشگێرانی بزوتنەوەی نەتەوەی کوردی ئەو ناوچەیەدا کردوە.

شیخ رەئوفی شیخ مەحمود لەیاداشتە چاپ نەکراوەکانیدا دەربارەی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی ئەو رۆژانە ئەڵی(٢١):

"سید ئەحمەدی برزنجی (سید ئەحمەدی مەرەخەس) و خزمەکانی باوکم لەکاتی خۆیدا باسی ئەوەیان بۆکردم کە کۆمەڵێکی کوردی لەئەستەمبول پیوەندی بەباوکمەوە کردبوو وەلەسەر داخوازی ئەوان لقیکی ئەو کۆمەڵە لەشاری سلیمانیدا کرایەوە کەلەمانەی خوارەوە پێک هاتبو:

شیخ مەحمود سەرۆکی لق، ئەحمەد بەگی توفیق بەگی طابور ئاغاسی و سید ئەحمەدی برزنجیو فایقی طاپۆو عزت مدفعیو سید محمدی موفتیو گەلیکی تر بەشداری‌یان تیادا کردبوو.

وەکو سید احمد بۆ شیخ رەئوفی گیراوەتەوە و لەیاداشتەکانیدا باسی کردوە، هەستی نەتەوایەتی لەناو شاری سلیمانیدا لەو رۆژانەدا بەهێز بووە و

خوێندەواران و روشنبیرانی ئەو لقەی سلیمانی داوای پرۆگرامی کومەلەکەیان کردبو لەئەستەمبول‌و ئەوانیش بویان ناردبوون‌و هەندیک لەئەفسەرە کوردەکانیش بەشداری ئەو لقەیان کردوە.

سید ئەحمدی برزنجی بەشیخ رەئوفی وتوە: بەلام ئێمە لقەکەی خۆمان لەو سنورەی کە کۆمەڵەی ئەستەمبول بۆیان دانابوین تیپەرمان کرد و پێوەندیمان بە قونسولی روسەوە کرد لەبەغدا و لەموسل وە بۆ ئەو مەبەستە سید احمد نیررابو بۆ موسل‌و سید محمدی مفتی بۆ بەغدا (دکتور کمال مەزهەر باسی کردوە کە لە باسی ژیانی شێخ مەحمودا لیێ دواین).

لەبەغدا سید محمدی مفتی بەهۆی ئەفسەرێکی کوردەوە (کە ناوی نەهێناوە) پێوەندی کرابوو بە لیژنەی دەسنیشان‌کردنی سنوورەوە بەلام زۆری پیێ نەچوو شەری جیهانی هەلگیرسا. ئێمە هەرچەند بەو پێوەندی کردنمان لەسنووری راسپاردەی کومەلی ئەستەمبول لامان دابو بەلام ئەفسەرەکان کە لە هەمویان زۆرتر عزت مدفعی‌بوو سوور بون لەسەر ئەو پێوەندی‌کردنە.

کە ساتێک شەری جیهانی هەلگیرسا ئەو لقەی سلیمانی لەسەر داخوازی‌و راسپاردەی لیژنەی ئەستەمبول وەستێنرا و چاوروانی ئەنجامی شەر کرا.

ئەوەی سید ئەحمدی برزنجی باسی کردوە شتێکی تازەیەو هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی ئەوەی نەکردوە کە لقێکی کۆمەڵی کوردی ئەستەمبول لەسلیمانیدا بووبێت‌و جگە لەوە ئەگەر ئەو لقە پێوەندی بەئەستەمبولەوە بووبێت ئایا لەدوای شەر کە شیخ مەحمود بوو بە دەسەلاتدارو حوکمدار ئەو کۆمەڵەی ئەستەمبول لەبەر چی‌بوە کە لەشیخ مەحمودیان نەپرسیوەتەوە و ئەو لقەی سلیمانی لەکاتی شیخ مەحمودا بۆچی چالاکیەکی وای نەواندەوە کە پێوەندی بەوانەی ئەستەمبولەوە بکا.

چگە لەوە ئەوەی کە سید ئەحمەد باسی کردوە گوایا کە شیخ محمدی مفتی لە بغداد لەگەل لیژنەی دەسنیشان‌کردنی سنوردا پیوەندی کردوە تۆبلی‌ی نیاز هەر لەو لیژنەی سنووره بێت کە مینۆرسکی تیادابوە و شیخ قادری برای شیخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا وەکو باسمان‌کرد، باسی پیوەندی شیخ مەحمودی بە منیورسکی‌یەوە کردوە ؟

دەربارەی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەخوارووی کوردستاندا لەو سەردەمەدا ماموستا رفیق حلمی لەبەرگی دوهەمی یاداشتەکانیدا «٢» لە لاپەرە (٢٨) دا ئەلیٚ:

(لاوە نیشتمانپەروەرەکانی کورد هەر روٚژە کوٚمەلٚیکیان دا ئەمەزراند، کوٚمەلٚە سیاسیەکانی کوردستانی عراقی ئەو روٚژگارە سوودیکی زوٚریان لە تاقی کردنەوەی کوٚمەلٚ و ریکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی تورکیا (نیازی لە کومەلگای کوردبوە لە ئەستەمبول) وەرگرت ئەمەش لەبەر ئەوە بو کە بەشیٚک لە دامەزریٚنەران و ئەندامە چالاکەکانیان بەر لە کوٚتایی شەری یەکەمی جیهانی لە ئەستەمبول لەکاتی خوٚیدا خویٚندبویان و کاریان کردبوو).

یەکیٚک لەو کوٚمەلانەی کە دروست بوە و رفیق حلمی مەبەستی بوە لەو باسەیدا برتی بوە لە (جمعیتی کوردستان) کە ئەمە لەو ماوەیەدا بوە کە شیخ ئاوارە بوە لە هندستان بەلام لەبەر ئالوزبوونی هەلٚویٚست ئینگلیزەکان نەیان ویستوە ریٚگە لە پیٚک هیٚنانی ئەو کوٚمەلٚە بگرن کە وەکو هەمو سەرچاوەکان و ماموستا رفیق حلمی خوٚشی بەدور و دریٚژ باسی کردوە ئەو کوٚمەلٚە روٚژی هەینی لەمانگی تەموزی سالی ١٩٢٢ دامەزراوە و کوٚمەلٚەکە لە مزگەوتی حاجی سید حسنی موفتی (مزگەوتی صابونکەران لە سلیمانی) کوٚبونەتەوە و مصطفی پاشا یامولکی هەلبژیرراوە بە سەروک و ئەندامانی کوٚمەلٚەکە برتی بون لە رفیق حلمی و ئەحمەد بەگی توفیق بەگی طابور ئاغاسی و صالح قەفتان و فایق بەگی مارف بەگ و حاجی ئاغای فتح الله ئاغا و عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف و ئەدهەم ئەفەندی و ئەحمەد بهجت و شیخ مەحەمەدی گولانی و شیخ علی سەرکار و علی باپیر ئاغا و عبد الله ئەفەندی محمد ئەفەندی و شوکری عەلەکە.

لە ژمارە (١) روٚژی ١٩٢٢/٨/٢ ی روٚژنامەی بانگی کوردستان کە مصطفی پاشا یامولکی دەری کردوە بەدور و دریٚژی باسی ئەو کوٚبونەوە و دەنگ دان و هەلٚبژاردنەی کردوە کە لە شویٚنی خوٚیدا بە دوور و دریٚژ باسی ئەکەین.

لەگەل ئەوەشدا بزوتنەوە و راپەرین و شورش لە خوارووی کوردستاندا دوای شورشەکانی کوردستانی ئیران و تورکیا دەستی پیٚ کردبوو بەلاٚم لەگەل ئەوەشدا

وەکو (د. ن. کوتلوف)ی مێژوو نوسی بەناوبانگی رووس ئەڵێ: «٧»
(بزوتنەوەی کورد لە خواروی کوردستانا بەر لە بزوتنەوە و راپەرین و شورشەکەی سالی ١٩٢٠ی عەرەبەکانی ناوچەی فورات لە عراقدا دەستی پێ کردوە).
ویلسن حاکمی گشتی بریتانیا لە کتیبەکەیدا دەربارەی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد ئەڵێ: «٣٧» «لێمان روون بوو کە بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد لەناو سلیمانیدا زۆر بەهێز و تین بوو لەبەر ئەوە ناچاربوین سنورێک بۆ ئەوە دابنێین».
لە شورشی میللەتانا زۆر جار شورشی روشنبیری و سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕوو بە ڕووبونەوەی یاسا و نەریتی کۆن و پێشکەوتنی باری ئابووری پێش ڕوودانی چەکدارانە ئەکەوێ و ساتیک شورشی چەکداری بەرپا ئەبێت شورشگیرانی ئەو میللەتە سوودێکی زۆر لەخوش بوونی ئەو زەمینەیە وەرئەگرن کە ئەو گۆرانکاریانە ئامادەیان کردوە.
بەلام بەداخەوە لە کوردستانا بە شێوەیەکی گشتی و لەخواروی کوردستانا بەشێوەیەکی تایبەتی شتەکە بە پێچەوانەوەبوە. کە شیخ مەحمود کاروباری ناوچەکەی گرتە دەست و بەناچاری ڕوو بەڕووی گەورەترین دەوڵەتی ئەو رۆژانە بوە وە کە بریتانیا بوو ئەتوانین بلێین شورشی روشنبیری لە نزیکی(صفر)ەوە دەستی پێ کردبوو، ژمارەیەکی کەم نەبێت لە خوێندەوارو روشنبیرانی کورد (کە ئەگەر چاوێک بگێرین بەو ناوانەدا کە لە یاداشتەکانی قدری جمیل بەگ و بلەچ شیرکۆ و دکتور شمزین و گەلیکی تردا بۆمان دەرئەکەوێ ئەوانەی کە چوونە پال شیخ مەحمود ژمارەیەکی زۆر کەم بون وبەلای منەوە هۆی ئەو ژمارە کەمیە ئەوەبوە ئەوانە هەر لەسەرەتاوە شارەزای سیاسەتی بریتانیا بون و ئاگاداری ئەوە بون کە بریتانیا بەهیچ جۆرێک نەی‌وسیتوە کورد بگا بەمافی رەوای خۆی بۆیە ئومێدیان بەمانەوەی حوکمداریەتەکەی شیخ مەحمود نەبوە ...
جگە لەوە وەکو لە پێشتریشدا بۆمان روون بوبوەوە کە شورشەکەی شیخ مەحمود لەرۆژێکی زۆر تاریک و پر لە تەنگو چەڵەمەدا روویدا کە هێشتا میللەتی کورد لەدوای گرانی و برسێتی و رەش و رووتی شەری جیهانی هێشتا تێر

سکی خۆی نەخواردبوو، لێشاوی خەلاّت و بەراتی ئینگلیز زۆر کەسی لە خشتە بردبوو سکەی ورپیە ئیمانی بە زۆر کەس گۆڕی بوو ..

جگە لەوە شیخ مەحمود ئەوەندە تاقمی ووشکە مەلاو شیخە رووتەڵی لێ کۆبوبۆوە کە هەر رۆژە سەریەشەیەکیان بۆ پەیدا کردوەو ئەویش وەکو یەکێکی کەم تەجروبەو نەشارەزا لەباری سیاسەتی دەولّەتان نەی توانیبو جلّەوی ئەو ئەسپە سەرکێشەی ئەو رۆژانە تونگ کاتەوەو بەرەو پێ دەشت و نەرمان ملی پێ بنێ و بە پێچەوانەوە هەر رۆژە جگە لەوەی کەپێ ی ئەوترێ (ماساتی جیوپولیتیکی کوردستان) کە سەرنجی زۆر بێگانەی راکێشاوەو دایان ناوە بە هۆی سەرەکی ی سەرنەکەوتنی کورد لەشورشەکانیا و ئەتوانین بەشێوەیەکی کورت هۆی ئەو جیوپولیتیکەو هۆکانی تری سەرنەکەوتنی شورشەکانی کورد بەم جۆرەی خوارەوە دەس نیشان بکەین:

١- نەبوونی کوردستان لەسەر دەریا، چونکە لەراستیدا بوونی ولاتێک لەسەر دەریا جگە لەوەی دەرامەدێکی ئابووری ئێجگار زۆری بۆ پێک دەهێنێت، دەرگایەکی ئێجگار گەورەش والاَ ئەکا بۆ میللەتی ئەو ولاَتە کە پێوەندی میللەتەکەی بە میللەتانەوە لێک نەپچرێنرێ و ئەتوانێ لەو رێگەیەوە گەلێک یارمەتی دەسگیربێت، نەبونی کورد لەسەر دەریا بیانوویەک بوە کە هەمیشە ئینگلیزەکان وەکو بنێشتە خوشەی دەمیان باسیان ئەکرد.

٢- بوونی ئەو زنجیرە شاخانەی کە لە دێر زەمانەوە کوردی لێک پچراوکردوە (ئەگەرچی لەسەریکی تریشەوە تاڕادەیەک کورد توانیویتی لەو شاخانەدا خۆی حەشار بدا و خۆی بپارێزێ) وەلەئەنجامی ئەوەدا بەدرێژایی مێژوو گەلێک شێوە زمان و یاسا و رەوشتی دوور لەیەک پەیدا بووە وای لەبەشەکانی کردوە لێک جیابن و پەرژەوەندی هەمو کورد وەکو ئێستە چۆنی ئەبینن هەروا یەک نەخراوێت.

٣- دەس نیشان نەکردن و لێک جیانەکردنەوەی دوست و دوژمن: مێژوی کورد ئاشکرای کردوە کە کورد هەمیشە دلّپاک و ساویلکەبوەو زۆر زوو فریوی خواردوەو بە بەلّینی درۆی ئەم و ئەو لەخشتەبراوەو کورد هەر وەکو مەری بەسزمان دوای هەرکسێک کەوتوە نەیانگەیاندۆتە ناوڕان.

٤- بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتیو شورشو خەباتی میللەتی کورد بەهۆی دواکەوتنی گەشەکردنی پارەداریو بۆرجوازی لە کوردستاندا زۆر درەنگ دەستی پیْ‌کردوەو لە خواروی کوردستاندا بەشیْوەیەکی گشتی ماوەی چوارسەد پینج‌سەد سالْ جگە لەو تەقەلایانەی کە سەرکردە وئەمیری ئەمارەتە بچووکەکان داویانە (کە ئەوانیش هەمیشە لەناو خۆیانا نارێک‌بون) ئەوی‌تری هەمووی بۆ ئەوە تەرخان‌کراوە کەبەناوی پاریزگاری لەئاینی ئیسلام، پاریزگاری لەسەلْتەنەتو خلافتی عوسمانلی بکات کە بەهیچ جۆرێک ئەوخلافەتە حسابی نەبۆ کورد و نەبۆ کوردستان نەکردوەو هەر ئەوەندەی کوردی پیْویست بوە کە باج و سەرانەی لیْ بسینیْتو لاوەکانی بەناوی غەزاوە بنیْریْت بۆ کۆری جەنگو بیانکا بە سووتەمەنی شەرەکانی خۆی.

٥- دواکەوتنی خویندەواریو روشنبیریو بایەخ نەدانی خلافەتی عوسمانلی بەخویندن لەکوردستاندا دەردێکی کوشندە بوە، ئەوی خۆێندەواریو روشنبیریش بوە یەکە یەکە عوسمانی هەموی لای خۆی کۆی کردوونەوەو ریْگەی نەداون پیْوەندی بە ولاْتەکەی خۆیانەوە بمێنیْتەوە. بۆ نموونە ئەو سەدان ئەفسەرو خویندەوارو روشنبیرانەی کە بەر لەشەری یەکەمی جیهانیو لەکاتی شەرەکەدا و لەدوای شەرەکەی لە ئەستەمبولدا بوونو لەوی کۆبوبونەوە، لەوانە ژمارەیەکی ئیْجگار کەمیان گەراونەتەوە کوردستانو بەشداریان لەخەباتی میللەتەکەیانا کردوە ئەوانی تریان هەموویان لەناو کومەلْگای تورکدا تواونەتەوەو ئیْستە شویْنەواریان دیارنیە.

٦- دابەش کردنی کوردستان بەسەر رژیمی سیْ ولاتدا کە هەر یەکیْکیش لەو رژیْمانە وا بەستەی ولاْتیْکی دەسەلاْتداری بیْگانەن کە ئەو هەر سیْ لایەو ئەو هەموو بیْگانانە هیچیان حساب بۆ کورد ناکەنو دان بەمافیا نانیْن بەپیْچەوانەوە هەرسیْکیان بارەها لەناو خۆیاندا پەیمانیان بەستوە بۆیان کردنەوەی شورشەکانی کورد ...... کوردیش بیْ‌لیْکدانەوەو ساویْلکانە هەر رۆژە ریْگەیەکی گرتوتە بەرو زۆر جار تەنها سەیری بەرپیْی خۆی کردوەو حسابی دوارۆژی نەکردوە.

ئەوەی تورکیزمەکان کردیان، هەر لەکۆمەڵی اتحادو ترقی‌یەوە کە دەستی

کوردیان پیٚ بریبوو تا ئەو لە خشتنەبردنەی کە مستەفا کەمال کوردەکانی لە ئەنادۆل فریودا و مەبستەکانی خۆی هیٚنایە ئەنجام بەیارمەتی کورد، ئیتر ئەوە بو هەمومان ئەزانین دوای گەیشتن بەمەرامی خۆی چی بە کورد کرد.

لە کوردستانی ئیٚراندا،چە لەزەمانی شیخ عبید اللەو چ لەزەمانی سمایلخانی شوکاکدا بۆمان دەرئەکەویٚ کە چۆن شیخ عبید الله هەرلایە وایان‌دابوە قەڵەم کە نوکەری لایەکی‌ترەو کەچی کەلیٚی قەوماوە چوە تورکیا وەکو دەس بەسەریٚک حسابی بۆکرا .. سمکۆش تورکەکان دەستیان بڕی‌و ئینگلیزەکان هەولیان‌دا فریوی بدەن بۆ ئەوەی لەگەڵ شیخ محمودا بیان‌کەن بەیەک‌و هەردولایان بکەن بەقوچی قوربانی سوودی خۆیان‌و تورکەکانی بۆدەربکەن لەناوچەی رواندز بەپیٚ ئەوەی هیچ بەلیٚنیٚکی روون ئاشکرا بدات بە میللەتی کورد.

بەراستی دەردەکانی میللەتی کورد ئیٚجگار زۆرەو بۆ ئەوە ئەشیٚ پیاو تەشتیٚک قوری خست بگریتەوەو بۆ هەر دەردی سەری‌یەک تۆپەلیک لەو قورە بسویٚ بەخۆیا بۆ ئەوەی هەتا ماوە ئەوانەی لەبیر نەچیٚتەوە بەشکو رۆژیٚک بیٚت دەرسیٚک لەوانە وەربگریٚ.

## پێوەندی و هەڵویستی دەوڵەتە بێگانەکان بەرامبەر بە کورد:

١- پیوەندی کورد و (عوسمانلی) تورک.
٢- پیوەندی کورد و ئێران.
٣- پیوەندی کورد و روس.
٤- پیوەندی کورد و ئینگلیز.
٥- پێوەندی کورد و ئەرمەنی
٦- پیوەندی لەگەڵ ولاتان و میللەتانی تردا.

# پیوەندی کورد وبیٚگانە

لەباسەکانی پێشودا زۆر جار باسی ئەو میژووناس و رۆژهەلاتناس و نوسەرانەی بیٚگانەمان کردوە کەچۆن هەر یەکەیان بۆ مەبست و ئامانجیٚکی تایبەتی خۆی و ولاٚتەکەی دەربارەی کورد یاداشت و باسیان تۆمار کردوەو چاپیان کردوە، هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە کیٚشە لەسەر کوردستان شتیٚکی نۆی نەبوە، بەلکو هەر لەکۆنەوە چ عوسمانلی و چ ئیٚران کە هەردوکیان داگیرکەری کوردستان بون و لەناو خۆیانا لەسەر سنوور لەکیٚشەدابوون کە بەشیٚکی زۆری ئەو کیٚشەیە لەسەر خاکی کوردستان بوە (کە ئەو نارێکیە لەشەری چالدیراندا بە تەواوی دەرئەکەویٚ کە لە دوای ئەوە لەگە یەکتردا رێک کەوتن لەسەر دابەشکردنی کوردستان)، وهەرلایە بەجیا هەولی داوە لەگەل سەرکردە و سەرۆکی عشیرەتەکانی کوردا پیٚوەندی خۆی بەهیٚز بکا بە ئومیٚدی ئەوەی بەلای خۆیا دایان شکیٚنیٚت و کوردیش لە نیٚوانی ئەو دوو دەولەتەدا وەکو تەختەی ژێر مشاریکی دودەمی و دوودەسکی لی هاتوە کە بەدەست دوو دارتاشەوە بوەو هەرلایە کە ئەو مشارەی بەرەو پیٚشەوە بردوە دانەکانی لەشی میللەتی کوردی هاریوەو تووشی سەرگەردانی و مال ویٚرانی بوە.

ساتیکیش ولاٚتە ئیمپریالیزم و سەرمایەدارەکان هاتنەکایەوەو کارگەو پیٚشەسازیەکانیان پەرەی سەندو پیٚویستیان بە بازاری نۆی هەبوە کە کالاٚو بەرهەمە پیٚشە سازیەکانی خۆیانی تیا بفرۆشن و بەو پارەیە کەرەسەی خاو و هەرزان بەها بکرن و بەکیٚشی بکەن بۆ بازارەکانی خۆیان، ئیتر لەو رۆژەوە ئەو ولاٚتانەش بوون بە سەربارێکی تر بەسەرشانی کوردەوەو هەر یەکە لەو دولەتە ئیمپریالیزم و سەرمایەدارانە دەستیان کردوە بەناردنی گەرۆک و میسونیر و بازرگان و میٚژوونووس چ بەئاشکرا و چ بە نهیٚنی کەوتنە کۆکردنەوەی دەنگ و

باس و چوونه بنج و بناوانی باری سامان و دەرامەدو رەوشت و هێز و دەسەڵاتی عەشیرەت و سەرکردەکانی کورد و هەریەکەیان بە جۆرێک لەشێوەی راپۆرت و یاداشتدا یا نوسینی باسێکدا گەلیک نووسینیان ئامادەکردوەو ئەو سەر چاوانە هەمووی ئەوسا و لەدوا رۆژدا بوون بەرێ نیشاندەر و رێ نما بۆ ئەو کاربەدەست و بەرپوەبەرە سیاسی و ئیداری و عسکەری یانەی کە رژانە ناوچەکەوە و دەستیان بەسەردا گرت کە کوردستان بەشێکی گرنگی بوە.

لەئەنجامی کێشەو بەرەو هەڵپەی ئەو دەوڵەتانەو گفت و گۆ کردن لەناو خۆیانا، لەگەرمەی جەنگی یەکەمی جیهان کە هوی هەڵگیرساندنی شەرەکە هەر بۆ مەبەستی دەس بەسەراگرتنی ولاتاندابوە، روسیای قەیسەری و بریتانیا و فرنسە کەوتنە ووت و وێژو و گفت و گۆو لەئەنجامدا لەسەر ئەو نەخشەیە رێک کەوتن کە بە پەیمانی (سایکس پیکو) کۆتایی هات.

بەر لە هەڵگیرساندنی شەرو لەگەرمەی شەردا ئەلمانەکانیش ماوەیەکی زۆربوو کەوتبونە پەلەقاژەی ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا-بە کوردستانیشەوە- بە هێز بکەن بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن بەربەرەکانی بازرگانیتی ولاتانی تر بکەن -بەتایبەتی هی روس- وە بۆ ئەو مەبەستە پیوەندی یان لەگەڵ عوسمانلی یەکان بەهێز کرد و مافی پشکنینی نەوتیان دەسگیر بوو لەگەڵ ریگەدان پی یان کە هێڵی ئاسن رابکیشن و بگەنە بازارە تازەکانی ناوچەی رۆژ هەلاتی ناوەراست.

جگە لە ئەلمانیا، ئەمریکاییەکانیش لەدوای شەری جیهانی کە بۆیان دەرکەوت دەولەتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپا هەریەکەیان بەجۆرێک دەمیان ژەندبوە رۆژهەڵاتی ناوەراست، ئەوانیش کەوتنە خۆیان و دیبلوماسیەتی ئەمریکا کەوتە گورج و گۆڵی و چالاکی.

لەگێژاوی ئەو بین بەرکێ و هەڵپە بێ ووچانەی ولاتانی سەرمایەدار و ئەو بەڵێن و گفتانەی کە بە میللەتی ناوچەکەیان دابوو کە بۆ ئەوە هاتبونە ئەو ناوە کە لە زوڵم و زوری عوسمانلی رزگاریان بکەن و هەر رۆژە بەیانێک و بە ڵێنیکیان بەناوچەکەدا بلاو ئەکردەوە، ئەو میللەتە بەشخوراوانەی ناوچەکە هیوای هاتنی

دوارۆژێکی پڕ لە شادمانیان کەوتبوە کەللەوە کەچی بەپێچەوانەوە میللەتی کوردی کڵۆڵ کە یەکێک بوە لەو میللەتانە، کەوتۆتە ناو گێژاوو گەرداوی بوخچە بەگەردانەی دەوڵەتانەوە بەتایبەتی هی ئینگلیز کە کوردیان وەکو طۆپی یاری لێ کردبوو هەر جارە بەرەو گۆڵێکی مەبستی خۆیان هەڵیان ئەداو هەموو جاریکیش کورد مایە پووچ و دوودەس بەناڵە ئەبوو.

میللەتی کوردی دوور لەشارستانێتیو دوور لە پێوەندی نیو میللەتانی جیهانو گۆشە گیری ناو دۆڵو لووتکەی چیاکانی ... میللەتی کوردی دواکەوتوو لەباری سیاسەتو لەرووی دارایی و کەم دەرامەتیەوە، ئەو میللەتەی کە هێشتا زۆربەی رۆڵەکانی لە گەرمیانو کویستان کردن نەکەوتبونو لەچەند شارو شاروچکەیەکی کەمو لەچەند قوتابخانەیەکی ئاینی ناوخۆ بەولاوە هیچی بەخۆیەوە نەدیبوو زۆر گران بوو بتوانیت بەرگەی تەوژم و گوژمو ووروژمی ئەوانە بگری کە مرخیان لە خێر و بیری خۆش کردبوو بەئارەزوی خۆیان نەخشەی دوارۆژیان ئەکێشا ..

دوای ئەوەی روالەتو درۆی کەمالیەکان لە ژووری کوردستاندا و دەس بڕینی ئینگلیزەکانو رەگەزپەرستەکانی میسۆبۆتامیای بۆ دەرکەوت، تازە کار لەکار ترازبوو دەستی لەهەسانەکە چوبوە دەرەوەو پەلەقاژەو ڕاپەڕینی شیخ مەحمودو شورشەکانی ئەوکێشو قەوارەیان نەبوە بەرگەی ئەو ئەنجامە سەختە بگرێ بۆیە هیوا و ئاواتی کوردی ئەو رۆژانە بەجوانە مەرگی سەری نایەوە.

هەموو میللەتیک لەژیانیا پێویستە لەهەمو کاتیکدا دۆستو دوژمنی خۆی بناسیتو لێکیان جیا بکاتەوەو بەگفتو بەڵێنی درۆ نەخەڵەتیو سوود لەتاقی کردنەوە وەمێژوی میللەتان وەربگرێت کەبەداخەوە کورد لەوەدا زۆر کزڵ بوە ولام وایە هێشتا لە ئەلفو بێی ئەو تاقی کردنەوەیە تیپەری نەکردوەو پیاو جارو بار ئەو پەندی پێشینە کوردی دێتەوە بیر کە ئەڵێ:

جارێکت خەڵەتاندم خوا بتگرێ ... دووجارت خەڵەتاندم خوا بتگرێ ... سێ جارت خەڵەتاندم ئەم جارەیان خوا خۆم بگرێ.

لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی لێرەدا کورتە باسێکی پێوەندی ولاتان بە کوردەوە یا کورد بە ولاتانەوە بەر لەشەری یەکەمی جیهانیو دوای ئەوەش باس بکەمو لەم

رووەوە سوود لە نووسین‌و باسی نووسەرە پاکەکان وەربگرین کە لە باسەکانیانا راستی‌ی رووداوەکانی میژوویان بی پیچ‌و پەنا تۆمارکردووە بۆ ئەوەی بۆمان دەربکەوی کە باوو باپیرانمان تا چ رادەیەک بە هەلّداچوون لەدەسنیشان کردنی دۆست‌و دوژمندا کە بەداخەوە هەتا ئیستەش لەو بەشە میراتە پر لەنەگبەتیە رزگارمان نەبوەو ناو بەناو پیادا ئەچینەوە.

بەلی راستە هەموو میللەتیک‌و هەموو حکومەتیک پیویستی بە دۆست‌و دۆستایەتی هەیە لەگەل میللەتان‌و حکومەتانی‌ترا، بەلام پیویستە ئەو دۆستایەتی‌و پیوەندی‌یە لەسەر بناغەیەکی ساویلکە پیک نەیەت‌و بەجۆریک نەبی ئەو دوستایەتیە وای لی‌بکا هەمیشە چاوبەستی بکاو دەستی بکا بە زاخاو بیکا بەسیبەری خۆی. یا وەکو نۆکەریک، وەکو کلیلیک، وەکو دەست‌و پی بەسراو و بەکرێگیراو و خەلەتینراو سەیر نەکریت.

## ١- پیوەندی کورد لەگەل عوسمانلی‌و تورک

گەلی کورد لەو بەشەیدا کەماوەیەکی دوورو دریژ لەژیر ئالای خلافەتی عوسمانی‌دابوە بەو پەری دلسۆزی‌و پاکیەوە بۆ پاریزگاری لەوخلافەتە تیکۆشاوەو سەری‌پیوە نەبوە لەبەر گری‌کردن‌و گەنج‌و لاوەکانی ئالا هەلگرو سووتەمەنی ئاگری شۆرش‌و غەزاکانی‌بوون و سەنگەرو پەنا بەرد نەمابوو لەگۆری جەنگەکانی عوسمانلی‌دا خوینی کوردی تیادا نەریژرابی و لاشەی شەهیدی کوردی تیا نەنیژرابی بەبی ئەوەی ئەو جۆرە خۆبەخت‌کردن‌و فیداکاری‌یە هیچ سوودیکی بوبیت بۆ نەتەوەی کورد و بۆ ولاتەکەی‌و بەپیچەوانەوە لە هەمو میللەتیک‌و هەمو ولاتیک زۆرتر بی‌بەش‌کراوە لەچاودیری‌و لەبایەخ پیدان.

زۆربەی میللەتی کورد لەناو خاکی خۆیا لەژیر سایەی ئالای خلافەتی عوسمانلی‌دا یا چەوسینراو و رەتینراوی فیودالی کورد بوەو لەژیر ئەرکی بیگاریا نالاندویتی یا رووت‌کراوەو زۆر لی‌کراوی ئەفسەرو جەندرمەکانی عوسمانلی‌یوەو نەخویندەواری‌و دوور لە شارستانیتی بالی رەشی کیشاوە بەسەر کوردستاندا و

ئاگای لە پێشکەوتنی باری ژیان نەبوە.
سوارەی حمیدیە کە لە راستیدا بەراویژی دیبلوماسیتی ئینگلیزو بەهاندانی ئەوان پێک هاتبوو بۆ ئەوەی ببێت بە داردەستو هێزێکی هەرزان بەها بەدەست سوپای عوسمانلی‌یەوە بۆ بەرگریو ڕێ‌گرتن لەروسیای قەیسەری کە ئەویش چاوی بڕیبوە ناوچەکەو ئەی‌ویست دەستی بەسەرا بگرێت کە ئەو چاوتی‌بڕینە لەماوەی کورتو درێژدا مەترسی‌هەبوە بۆ دەسەلاتو بۆ بەرژەوەندی بریتانیا کە هەمیشە ویستویەتی ئەو ناوچەیە کە بڕا بڕاگەی پشتی ڕێی گوزەرگاری خۆی‌بوە بۆ هیندستان لەژێر چاودێری و دەسەلاتی‌خۆیدا ببێت نەک لەژێر دەسەلاتی دەولەتێکی تری وەکو روسیای قەیسەری.
ئەو سوارەی حمیدیەی (کەپێی ووتراوە ئێسترسوار) زۆربەی لەڕۆلە خەلەتێتنراوەکانی کورد پێک‌هاتبوو، سولتانو کاربەدەستانی عوسمانلی توانیبویان لەرێگەی دەرەبەگو ئاغا و سەرکردەی عشیرەتەکانو پیاوە ئایندارە دەس رۆیوەکانەوە سەرباز بۆ ئەولەشکرە ئامادەبکەن و نرخی ئەو ئامادەکردنەو پاداشەکەی ئەوە بوە ئەو سرکردەو دەس رۆیوانە زەویو زارێکی زۆریان پێ بەخشراوە یا بەناوی (لزمە)وە بەنرخیکی هەرزان زەویو زاریان دراوەتی وە یا پێیان فروشراوە کە ئەمانە هەمووی لەدەمی رەشو رووتی میللەتی کورد گیرراوەتەوە.
دەربارەی سوارە حمیدیە (د. م. س. لازاریف) لەباسەکەیدا ئەلی: «٢٥»
(ریکخراوە سوپاییەکەی حمیدیە، سەرومڕ بەدلی حکومەتی بریتانیا بوە).
و(نیلدوف) لەنامەیەکیا لەورووەوە ئەلێ:
"پێک‌هاتنی سوارەی حمیدیە لەناو کوردەکانا بەزووری بەراویژو بەیارمەتی ئینگلیزەکان بوە. کاتیک کێشەی ئەرمەنیەکان هاتەکایەوە، ئەمانیش بۆ شتێک ئەگەران بۆ ئەوەی ڕوو بەڕووی رووس ببیتەوە، ئەو نیازە بەئامادەکردنو چەکدارکردنی کوردەکان هاتەدیو ئینگلیزەکان هەولیان‌دا هەتا لەتوانادابێ سوارەی حمیدیە دژی روسەکان بەکار بهێنرێتو ڕوو بەڕووی بوەستیت. کونسولو سیخورەکانی ئینگلیز سەریان لە خێلە کوردەکان ئەداو پێوەندی‌یان لەگەلیانا

بەهێز ئەکرد. بالوێزی بریتانیا لە ئستەمبول ئامۆژگاری کاربەدەستانی تورکی ئەکردو ریگای پیشان ئەدان کە چۆن هێزەکانی حمیدیە یەک بخەن و بەهێزیان بکەن‌و پێش‌نیازی ئەوەشی‌کرد کە (زەکی پاشا)ی سەرۆکی لیوای چوارەم لەفیرقەی هەشت بکرێت بەسەرۆکی حمیدیە (کە دیارە سەربەخۆیان بوە) بەلام عوسمانلی‌یەکان ئەو پیوەندی‌یەی ئینگلیز بەسەرۆک عەشیرەتەکانی کوردو ئەو پالاوتنەی زەکی پاشایان بەدلْ نەبوە چونکە لەوە ئەترسان کە دەسەلاتی عوسمانلی بەسەر کوردەکانا لاوازبێت. بەلاْم هۆی سەرەکی سلْمینەوەی تورک لەو پێش‌نیازەی ئینگلیز ئەوەبو کە زۆر ترسیان هەبوە لندن ئەوە بکات بەهۆی دووبەرەکیتی لەنیوان کورد و ئەرمەنداو ئینگلیز بەبیانووی ئەوەوە لووت بژەنیتە کاروباری تورکیاوە".

بێجگە لەبەشداربوونی کورد لە سوارەی حمیدیەدا، کەساتیک کۆمەلی أتحادو ترەقی دروست بوو کوردەکان شان بەشانی تورکەکان بەشداري‌یان تیاداکردوەو لەهەندی شوێنی کوردستاندا لقی ئەو کۆمەلە دامەزرینراوە (وەکو ئەو لقەی سلیمانی کە لە باسی کارەساتەکەی موسلدا باسمان کرد). بەلاْم ساتێک مەبەستی ناپاکی تورکیزمەکان دەرکەوت، کوردەکان لیْ‌ی تەکنیەوە و دەستیان کرد بە دامەزراندنی ریکخراوی تایبەتی خۆیان کە زۆری پیْ نەچو کاربەدستانی عوسمانلی بەو پەری درندەیەتیەوە ریگەیان لە کورد گرت کە هەنگاوبنیت بۆ دەسگیربوونی مافی رەوای‌و ریکخراوەکانی یەک لە دوای یەک هەلوەشاندەوەو پیاوە ناسراوو ناودارەکانی هەمووگرت‌و سزای‌دان‌و ژمارەیەکی زۆری لەسێدارەدان.

لەسێدارەدانی شیخ عبدالسلامی بارزانی لە ١٩١٤/١٢/١دا لەگەل دوکەسی‌تر لەتێکوشەرانی هاوری‌ی لەناو شاری موصل بەشێک‌بوە لەترسی عوسمانلی بەرامبەر بەراپەرینی کورد لەناوچەی بادیناندا.

لەگەل ئەو هەمو کەم تەرخەمیەی کە عوسمانلی بەرامبەر بە کورد هەیبوەو گوی‌ی نەداوەتە دواکەوتنی کوردو ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، بەلاْم لەگەلْ ئەوەشدا کورد بەرامبەر بەهەستیکی ئاینی لەزور هەلویستدا کورد دەولەتی

عوسمانی‌ی بەدوڵەتی ئیسلام داناوەو پاریزگاریی لەو دەوڵەتە بە پاریزگاری‌کردن لەئاینی ئیسلام ژماردوە بۆیە ژمارەیەکی زۆری کورد لەو شەرانەی تورک لە قرم و قفقاس‌و بالقان کردویتی بەشداری‌کردوەو وەکو باسمان‌کرد چ شیخ سعیدی حفیدو چ شیخ مەحمودی کوری بەرودوا لەشەری قارص‌و ئەردەهان‌و لەشەری شعیبەو رووبەروو بونەوەی لەشکری روسی قەیسەری لەناوچەی مەریوان‌و پینجویندا شەریان کردوەو بەشداری ئەو شەرانەبوون.

لەکوردستانی تورکیاش لەدوای روخاندنی دەوڵەتی عوسمانی‌و هێرشی یونانیەکان بۆ سەر رۆژ ئاوای تورکیا بە هاندانی ئینگلیز، کوردەکان بەوپەری ئازایەتیەوە بەرگری‌یان لەخاکی تورکیا کردوەو هۆی سەرکەوتنی تورک بەسەر یونانیەکاندا ئەو بەشداری کردنە گەرمەی کورد بوە کە تورکەکان خۆیان دانیان پەوا دانابوو، ئەوەبوو لەدوای سەرکەوتنی تورک بەسەر یونانداو پاشەکشەی هێزەکانیان، کاتێک کە پەردە لەرووی ئەو پەیکەرەی کە بۆ (سەربازی نەناسراو) دروست‌کرابو، سەر لەشکری تورک لەکاتی لابردنی پەردەی ئەو پەیکەرەدا بە ئاشکرا وتبوی: بەوپەری سەر بەرزی‌یەوە پەردە لەرووی سەربازی نەناسراومان لائەبەین کە هیچ گومانم لەوەدا نیە کە ئەو سەربازە سەربازێکی کوردبوە ...

بەڵام زۆری پی‌نەچوو ناپاکی‌ی تورکیزمە کمالیەکان‌و رەگەزپەرستیان ئاشکرابوو ... جاریک توفیق وهبی بەگ بۆی گێرامەوە ووتی:

دوای ئەوەی تورکەکان بەرامبەر سویند خواران شکان‌و لەشکرەکەیان پاشەکشەی کردو هێزی بێگانە رژایە ناو ئەستەمبوڵەوە کچی ئەفسەرە لووت بەرزە رەگەزپەرستەکانی تورک بەوپەری بی‌شەرمیەوە ئەیان ووت:

(بزم کورد افندیلر در ... واتا هێشتا ئێمە هەر ئاغای کوردەکانین).

دکتور قاسملو لەکتیبەکەیدا «١٦» دەربارەی هاوکاری‌کردنی کورد لەگەل تورکەکاندا ئەلی:

«کە مصطفى کمال لە مانگی تموزی ١٩١٩دا راپەرینەکەی بەرپاکرد لە ناوچەی ئەنادوڵدا کوبونەوەیەکی گشتی لەژیر سەرکردایەتی مصطفى کماڵدا کرا و

لەئەنجامی ئەوەدا لیژنەی بەرگری لەمافی ئەنادولی رۆژهەلأت پێک‌هات‌و هەمو روشنبیرو چاوکراوەکان لەو کۆبونەوەیەدا بەشداریان‌کرد بەئومێدی ئەوەی ئەو کۆمەڵە لەدوا رۆژدا ئەبێتە هۆی ئەوەی کوردیش مافی نەتەوایەتی خۆی دەسگیربێت‌و لە دواییدا لە ئەنقەرە کە مجلس نیشتمانی تورکی لە سالی ۱۹۲۰دا کوبونەوە لەناو ئەندامانی ئەو مەجلسەدا (۷۲) نائبی کوردی تیادا بەشدار بوو بەناوی ئەوە وەکە نوێنەری کورد بون‌و هەموو ئەو نوێنەرانە ئامادەیی خویان پیشاندا بۆ هاوکاری‌کردن لەگەڵ مصطفی کمالدا.

دکتور کەمال مەزهەر لە کتیبەکەیدا (کوردستان لە ساڵەکانی شەری جیهانی یەکەم«۷»دا ئەلیٚ:

"عوسمانی‌یەکان ئەیان ویست کوردستان بکەن بە قەلایەکی سەخت دژی روسیای قەیسەری، لەبەر ئەوە خۆیان لە سەرەک هۆزەکانی کورد نزیک ئەکردەوە، بەلأم عوسمانلی‌یەکان لەو تەقەلایەیانا زۆر سەرکەوتوو نەبوون، چونکە لەگەڵ ئەوەی بەهۆی هەستی ئاینیەوە ژمارەیەک لە کوردەکان چون بەدەنگیانەوە (کە بە زۆری ئەوە لەپێک‌هێنانی سوارەی حمیدیەدا خۆی نواندەوە)، بەلأم لەکاتی شەردا زۆر لەو کوردانەی کە دژی عوسمانی‌بون کە دەرفەتیان بۆ هەلکەوتوە وازیان لەتورک هیناوە و چوونەتە پاڵ روسیا.

ئەوەی کەوای لەو کوردانە کردبوو کە بە تەواوی لەتورک بێزاربن بەهوی چەوساندنەوەی کوردەوە بوە و بەهوی باری نالەباریی ئابووری دەوڵەتی عوسمانلی‌و رووتاندنەوەی کورد لەلایەن کاربەدەستەکانیانەوە بوە.

لەئەنجامی ئەو بێزاربوونەدا هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردا پەرەی سەندو هەندیکیان داوای خود موختاریان ئەکردو بەیاناتیان بلاو ئەکردەوەو کوردەکانیان هان ئەدا دژی جەوروستەی کاربەدەستانی عوسمانی هەڵسن و لەیەکیک لەو بلاوکراوانەی ئەو رۆژانەدا نوسرابو: "ئەڤ خۆڵە ... خۆلیٚ مەیە".

کوردناسی بەناوبەنگ (لازاریف) دەربارەی ئەو بەیانانە ئەلیٚ:

"ئەو بلاوکراوو بەیانانە لەناو خەلکدا دەنگیان دابوەوە کە بەزۆری لە کوردستانی باکورو کوردستانی ئیراندا بلاو ئەکرانەوەو ژمارەیەکیشیان ئەگیشتە

خواروی کوردستان که لەرێی تەکیەکانی بارزانەوە ئەگیشتنە شوینەکانی تری خواروی کوردستان".

دکتور جەلیلی جلیل بەناوی (کوردەکانی ئیمپراتوریەتی عوسمانی) باسێکی زور دورو درێژو زانیارانەی دەربارەی پیوەندی کوردو تورکەوە نوسیوە که لەلایەن دکتور کاوس قەفتانەوە ترجمەکراوە بە کوردیو لە سالی ۱۹۸۷دا لە بغداد چاپی‌کردوە.

دکتور شمزینی لەکتیبەکەیدا دەربارەی گرنگیی ستراتیژی کوردستان ئەلی:«۱٤»

"مصطفی کمال وتویەتی: ئەگەر هاتو بارودۆخی جەنگ لەرۆژ هەلاتی نزیکدا تای ترازووی هاوسەنگ‌بوو، ئەو لایەی که دەس بەسەر کوردستاندا بگریت سەرکەوتن بۆ خۆی مسۆگەر ئەکات".

لەراستیدا مصطفی کمال ئەوەی کرد بە پروگرام بۆ خۆی که نەک هەر دەستی بەسەر کوردستاندا گرتو لەبەلێن وپیمانەکانی پێشوی بەرامبەر بە کورد پاشگەزبوەوە، بەلکو نەخشەی لەناوبردنی ناوی کوردستان و تواندنەوەی کوردی لە ولاتەکەی خویدا کێشا، ئەوەبوو هەر که بەسەر یونانیەکاندا سەرکەوتو ئاسوریو ئەرمەنیەکانی پان‌کردەوە ئیتر بەربوە ویژەی کوردو بەهەزارانی کوشتو لەسێدارەداو بەسەد هەزارانی ئاوارەو دەربەدەرکرد.

جواهر لال نهرو لەکتیبەکەیدا (لمحات من تاریخ العالم-چاپی بیروت سالی ۱۹۵۷ دەربارەی ئەو تاوانانەی که تورکە رەگەزپەرستەکان بەرامبەر بە کورد کردبویان نوسیویتی:

"دوای ئەوەی تورکەکان لەشەرەکانیاندا سەرکەوتن، ئیتر دەستیان‌کرد بەلەناو بردنی ئەو کوردانەی که ئەوانیش بۆ ئازادیو سەربەستی خۆیان تێدەکۆشان.

بەراستی سەیرە، نەتەوەیەک هەتا دوێنی پاریزگاری لەخوی ئەکردو داوای مافی خوی ئەکرد کەچی دەس درێژی بکاتە سەر مافی نەتەوەیەکی‌ترو لەخەباتی رزگاری‌خوازی خویەوە روویکاتە دەس درێژی‌کردن بۆ سەرگەلیکی‌تر".

نهرو لە کتیبەکەیدا ئەلێ: لەسالی ۱۹۲۹دا راپەرینیکی دیکەی گەلی کورد

بەرپاکرا، بەلام دریژەی نەکیشا زوو دامرکایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کێ هەیە بتوانیت میللەتیک لەناو بەریت ... لەبەر ئەوە میللەتی کورد بۆ وەدەسهینانی مافی خوی ئامادەیە نرخی ئەو سەربەستیە پیشکەش بکا".

یەکیک لە کورت بینیەکانی کورد ئەوەیە وەکو وتمان تا ئیستە نەی‌توانیوە دوست‌و دوژمن بە شیوەیەکی باش لیک جیاکاتەوە و لەو ڕوەوە دەرس لەسەر هاتەکانی ڕابوردوو وەرگریت ...

بۆ نموونە لە زەمانی شیخ مەحمودا ئەوانەی لەدەوروبەری شیخ کوبوبونەوە (جگە لە چەند کەسیکی وەکو مصطفی پاشا یامولکی کە بەئاشکرا ئالای دوژمنایەتیان دژی تورکەکان هەلگرتبو) هیچ ئەوەیان لیک نەدابوە وە کە تورکە کمالی‌یەکان وەکو درندە بەربوبونە گیانی نیشتمان‌پەروەرکانی کوردستانی تورکیا کەچی ئەو جل‌خوارانەی لەدەوری شیخ کوبوبونەوە بەبێ لیکدانەوە شیخیان تووشی پیوەندی‌یەکی خوارو ناریک کردبوو لەگەل یوزدمیر (علی شفیق)دا کە سوور ئەزانرا یوزدمیر بەهیچ جۆرێک ئەو دەسەلاتەی نەدرابویە لەلایەن کمالی‌یەکانەوە ئەگەر تورک لەو ناوچانەدا توانیان ئینگلیزەکان دەربکەن ئیتر دان بەمافی کوردا ئەنێن ... ئەوەبو زۆری پێ‌نەچوو ئینگلیزەکان بە هەڕەشە و بەڕاوە ڕیوی تورکەکانیان ناچارکرد کە دەس بەر داری ویلایتی موصل ببیت‌و هەردولا لەسەر هیلی (بروکسل) ریک‌کەوتن کە ببیت بەسنوری نیوانی تورکیا و عراق‌و ئینگلیزەکان تورکەکانیان دلنیاکرد لەدوای ریکەوتن لەسەر ویلایتی موصل کە ئیتر بە هیچ جۆرێک ریگەی ئەوە نادەن کە کورد نەسەر بەخۆیی‌و نە ئوتونومی دەسگیرببیت کە ئەوە یەکیک بوە لەو مەترسیانەی لەناو دلی کمالی‌یەکانا ماوەیەک‌بوو جیگربوبو، بەو ریکەوتنەی تورک‌و ئینگلیز ئیتر ناوی پیک هینانی حکومەتی کوردی لەخوارووی کوردستاندا لەقاموسی ئینگلیزەکانا نەماو ئەو بەیاناتە درۆیانەی کەخۆیان یالەدواییدا لەلایەن حکومتی عراقەوە بلاوکرانەوە وەهەمووی چاوبەست‌و دەس‌برین‌بوە و ئینگلیزەکان وەکو لەشوینی خویدا باسی ئەکەین لەڕاپورتەکانیا شادمانی خویان بەوە دەربریبو کە کوردایەتی لەناوچەی بادیناندا نەماوە و لەناوچەی هەولیردا زۆر

کزبوه و لەناوچەی سلیمانیشدا ئەگەر شیخ مەحمودی هارو هاج نەمینیت ئیتر لەویش خاموش ئەبیتەوەو ووشەی عراق و عراقیتی بەسەر وشەی کورد و کوردستاندا زالْ ئەبیْت ...

تورکەکان دوای ئەوەی دەس بەرداری ویلایەتی موصل بوونەوەو ترسی رووبەروو بوونەوەی ئینگلیزیان نەما و شورشی کوردیان پانکردەوە ئیتر بەرامبەر سوڤیەت گیرپان گۆری‌و پارتی کومونستی تورکیان هەلوەشاندەوەو پیوەندی‌یان لەگەل ولاتانی ئیمپریالیزمدا بەهیزکرد و بەراسپاردەی ئینگلیز تورکیاو ئیران لە ۱۹۲٦/۱./۲۲دا لە طهران پەیمانیکیان مورکرد کە بەپی‌ی مادە (٦.٥)ی ئەو پەیمانە بریاریاندا هەردوولا هاوکاری‌بکەن بۆ لەناو بردنی هەر جۆرە چالاکی‌یەک لە سەرسنوریانا رووئەدا (کە بیگومان نیاز لەوە هەر کوردو راپەرینی کوردبوە) کە لە دوای دەسال تیپەربون بە سەر ئەو پیمانەدا معاهدەی سعد ئابادیش مۆرکرا کە ئەم جارە عراقیش چوە پال تورکیاو ئیران هەر بە مەبەستی لەناوبردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد.

## ۲- پیوەندی کورد و ئیران

---

باری میللەتی کورد لەکوردستانی ئیراندا چ لەزەمانی صوفیەکان‌و چ لەدەوری بنەمالەی قاجاری‌یەکان و پەهلەوی‌دا لەوەی کوردستانی عوسمانلی باشترنەبوە چونکە بیجگە لەکیشەی نەتەوایەتی، کیشەیەکی دورو دریژی تریش هەبوە بۆتە هوی ئەوەی کورد لەژیر دەسەلاتی شاهەکانی ئیرانا هەمیشە بارەکەی قورس‌و گران‌بی‌و ژیانی ئالوزو پر لە ئەشکنجە و ئازارو چەوساندنەوە بیْ ئەویش بریتیی‌بوە لە کیشەی مەزهەبی لەنیوانی شیعەو سنەدا.

کیشە لەسەر مەزهەبی شیعی‌و سونە لەنیوانی دەولەتی ئیران‌و عوسمانلی‌دا زۆر جار خاکی کوردستانی‌کردوە بەکوری شەری لەشکرەکانی ئەو دوو دەولەتەو مالْ کاول‌بون‌و ویرانکاریەکی تەواو لە کوردستانی سەر سنووری هەردولایانا

ڕوویداوە.

پیوەندی کورد بە دەولەتی ئیرانەوە بەدریژایی میژوو بە رودوا باسیکی زۆر دوورو دریژە و لەباسی ئەم کتیبەمان لائەدا، بۆیە هەوڵ ئەدەین چەردەیەک لەو بەسەرهاتو ڕووداوو هەڵویستانە بدوێین کە کەم یا زۆر کاریان کردوتە سەر خوارووی کوردستان کە مەبەستی ئەم باسەمانە...

بێگومان لەکۆندا کە ئەمارەتی ئەردەلان لەناوچەی (سنە)داو ئەمارەتی (بابان) لەناوچەی سلیمانیدا بون، کە هەر لایان سەربەلایەک بوەو ئەردەلاٚن سەر بە ئیرانبوەو بابان سەر بەعوسمانیبوە، هەر کاتێ شەڕ و ناکوکی لەنیوانی ئەو دوو دەوڵەتەدا ڕوویدابێ ئەو ناکوکیە لەنیوانی بابانو ئەردەلانیشدا ڕوویداوە...

بارەها کوردی کوردستانی ئیران کە کاربەدەستانی ئیران راویاننا‌وە ناچاربوە ڕوویکاتە خوارو‌ی کوردستانو زۆر جاریش سەرکردەیەک یا سەروک عەشیرەتیکی کورد لەخوارو‌ی کوردستاندا کە حکومەتی عوسمانی یا لەدوای ئەو ئینگلیزو حکومەتی عراق راوی‌ناون ئەوانیش ڕوویان کردوتە ئیران...

کەساتیک سالار الدولە داوای عەرشی ئیرانی لە پەهلەویەکان کردەوە ماوەیەک روی‌کردە خوارو‌ی کوردستان..جافرسان سەرۆک عەشیرەتی هەورامی لەناوچەی هەورامانی تەخت بوو بە پەنابەر لە کوردستانی عراق، هەروەها حمە ئەمین بەگی هەورامیش هەر بەو جورە ماوەیەک پەناهەندبوە لە خوارو‌ی کوردستاندا ... شیخ مەحمود کە بەفروکەو بوردومانی ئینگلیز ناچارکرا ڕوویکاتە چیاکانی سنوور بە زۆری ئەپەڕیەوە ئەوبەر بۆناو کوردستانی ئیرانو خیزانەکانیان ماوەیەکی زۆر کوردەکانی ئیران لەدوای بە دیل گرتنی شیخ محمود لەشەری دربندی بازیاندا رویان‌کردە کوردستانی ئیرانو زۆر ریزیان لی‌گیرا و حەوانەوە.

مصطفی بارزانی لە ناوەراستی چلەکاندا کە سوپای عراقی بەیارمەتی ئەفسەرەکانی ئینگلیز راویان‌نابو سەر سنوور ناچاربوو بچیت بەودیودا و لە کۆماری مەهابادا بوو بە لایەنگری قازی محمدی شەهید.

لەدوای روخاندنی کۆماری مەهاباد ژمارەیەکی زۆر لەتێکۆشەرانی کوردی ئیران‌بوون بە پەناهەندە لەخواروی کوردستاندا ...

سمایلخانی شکاک لەدوای ئەوەی ئیرانیەکان ناچاریان‌کرد ناوچەکەی بەجێ‌بێڵێت‌و تورکەکان دەستیان‌کرد بەزاخاو یارمەتیان‌نەداو بەپیچەوانەوە شەریان لەگەلاکردوەو (خوسرەو)ی کوریان بەدیل‌گرتوە ئەویش ناچاربوە رووی‌کردۆتە خواروی کوردستان‌و لە سالی ۱۹۲۳دا چوتە سلیمانی‌و لەگەل شیخ مەحمودی حوکمدار گفت‌و گۆیان‌کردوە.

جگە لە سمایلخانی سمکۆ کە پیوەندی تایبەتی لەگەل شیخ مەحمودا هەبوە، سید طەی نهریش هەر کوردستانی ئیرانی بەجێ‌هێشتوەو هاتۆتە خواروی کوردستان‌و لەویوە پیوەندی لەگەل ئینگلیزەکانا کردوەو ئینگلیزەکان کە شیخ مەحمود لەهندستان‌بوو سید طە یەکیک‌بوو لەوانەی کەبیریان لیٚ‌کردبوەوە بیکەن بە حوکمداری کوردستان بەلام کە چوە بغداد و دەم‌و دووی ئینگلیزەکانی تاقی‌کردەوەو داوای ئەوەی لی‌کردن کە بەلێنی سەربەخۆیی بدەن بە میللەتی کورد وەکو ئەو حکومەتەی کە لە بغداد دروستیان‌کردبو ئیتر ئینگلیزەکان دەستیان لەویش‌شت کە بتوانیٚ بەخۆرایی لەشکر کۆکاتەوەو بچیێت بەگژ تورکەکاندا لە رواندزو دەریان‌بکا ..

کە شیخ مەحمود لە حوکمدارێتی یەکەمیدا ۱۹۱۸-۱۹۱۹ بۆی دەرکەوت ئینگلیزەکان نیازیان نیە مافی کورد بدەن‌و ئەیانەوی وەکو کریٚ‌گرتەیەکی خۆیان‌و بۆ مەبەستیٚکی تایبەتی بەکاری‌بیٚن، شیخ مەحمود روو بەرووی ئینگلیز بوەوە و داوای لە سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردکرد کە بە هاواریەوە بچن‌و بۆ وەرامی ئەو بانگە وازەی شیخ مەحمود، مەحمود خانی دزلی یەکەم سەروکی ناوچەی مەریوان‌بوە کە خۆی‌و بە(..۳۰) چەکدارەوە چوە سلیمانی‌و شەری دژی ئینگلیز کردو کەساتیک شیخ مەحمود شکاو مەحمود خانی دزلی گەرایەوە بۆ ناوچەی مەریوان، ئیرانی‌یەکان مەحمود خانی دزلی‌و مەحمود خانی کانی سانانیان گرت‌و دایانن بە ئینگلیزەکان‌و ناردیانن بۆ بەغدا وەکو لەبەشی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتیدا باسمان‌کرد.

شیخ رەئوفی شیخ مەحمود لە یاداشتەکانیا«[21]» دەربارەی بنەماڵەی مەحمود خانی دزلی ئەلی:

"عبد الله بەگی کوری مەحمود خانی دزلی بۆی گێرامەوە وتی:- کە لەدوای لابردنی بنەماڵەی قاچاری لە ئیران ئینگلیزەکان هەلومەرجیکی وایان ڕەخسان کە رەزا شای پەهلەوی بیێتە شای ئیران.

رەزا شا کە دەستی کرد بەکار، یەکیک لە کردەوەکانی ئەوەبو هەرچی سەروک عەشیرەتەکانی کورد هەبوو هەموی گرتن کە من یەکێک بووم لەوان و هەمومان دراین بەدادگای سوپایی- ئەوسا عبد الله بەگ وتویەتی تەمەنی ٢٤ ساڵ بوە.

عبد الله بەگ وەکو لە یاداشتەکانی شیخ رەئوف دا باس کراوە وتویەتی:

"لە کاتی محاکمەکردنماندا، حاکمی عەسکری یەکەیەکە لەهەمومانی ئەپرسی: ئایا بەشداریت کردوە لەبزوتنەوەکانی کوردا ؟ ئایا هاوکاریت کردوە لەگەڵ شیخ مەحمودا لەو شەرانەی کە لەگەڵ ئینگلیزەکانا کردبوی ؟ ئایا مەزبەتەتان مۆرکردوە لەو مەزبەتانەی کە نێررابون بۆ دار الأعتمادی بریتانی لە بەغدا کە لە ومەزبەتانەدا داواتان کردبیت بچنەپاڵ بزوتنەوەکەی شیخ مەحمود و داواتان کردبیت لە ئیران جیاببنەوە و حکومەتیکی کوردی دابمەزرێنن ؟

ئیمەش هەمومان ئینکارمان کرد و وتمان ئەوانە هیچیان راست نین و بەشداریمان لە هیچیانا نەکردوە ... حاکمی عەسکری دەستی برد چەند نامە و مەزبەتەیەکی بەرزکردەوە و وتی: ئەی چی ئەلین دەربارەی ئەو مەزبەتانەی ناردبوتان بۆ حاکمی گشتی بریتانیا لە بغداد کە داواتان کردوە لە ئیران جیاببنەوە و بچنە باڵ کوردەکانی عراق ؟

کابرای حاکمی عەسکری وتی: سەفارەتی بریتانیا لە بغداد خۆیان ئەو مەزبەتانەی ئیوەیان بۆناردین. ئیمەش هیچ دەسەلاتیکمان نەبوو خۆمان هاویشتە بەر قەزا و قەدەرو ئەوانەی ناویان هاتبوو لەو مەزبەتەیەدا بریاری حوکمی هەمیشەییان یەسەرا درا و ئەوانی تر ئاوارەکران بۆ رۆژ هەلاتی ئیران".

ئەو مەزبەتانەی کە عبد الله بەگ لە یاداشتەکانی شیخ رەئوفی شیخ مەحمودا وتویەتی کە حاکمی عەسکری وتویەتی سفارەتی بریتانیا بۆیان ناردون لەراستیدا

هەموی هەبوەو ئەوانەی کە شیخ مەحمود ساتێ خۆی کۆی‌کردبوەوەو دابووی بەویلسنی حاکمی گشتی بریتانیا کە لە حوکمداریتی یەکەمی شیخ مەحمودا چوبو بۆ سلیمانی‌و گفت‌و گۆی لەگەڵ شیخ مەحموداکردوە وەکو لەشوینی خویدا باسی ئەکری ...

ئەو کردەوەیەی ئینگلیزو ناردنی ئەو مەزبەتانە بۆ کاربەدەستانی شای پەهلەوی شتێکی سەیرنەبوە چونکە پیشەی هەمیشەیی کاربەدەستانی بریتانیابوەو مەبەست لەناردنی ئەو مەزبەتانە ئەوەبوە کە لە ریێ شای ئیرانی نۆکەری خۆیانەوە کوردەکانی ئیران چاوترسێن‌بکەن‌و جاریکی‌تر بیرلەوە نەکەنەوە هاوکاری لەگەڵ شورشگیرانی کوردستانی عراقدا بکەن.

جگە لە مەحمود خانی دزڵی، مەحمود خانی کانی‌سانانیش یارمەتی خیزانە ئاوارەبوەکانی سلیمانی‌یان داوە دوای بە دیل گرتنی شیخ مەحمود لەشەری دەربەندی بازیاندا، ئینگلیزەکان داوایان لە حکومەتی ئیران‌کرد کە ئەویش تسلیم‌بکا بەوان‌و ئیرانیەکانیش‌گرتیان‌و ئینگلیزەکان لەبغداد بەدەس بەسەری بۆ ماوەیەک هیشتیانەوە.

جگە لە سمکۆی شوکاک‌و مەحمود خانی دزڵی‌و مەحمود خانی کانی‌سانان کوردەکانی ناوچەی سنەو سەقزو بانەو شیخانی زەنبیل و گەلیکی‌تر لەو رۆژە تووش‌و گرانیەدا فریایان کەوتون‌و دالدەیان‌داون.

## ٣- پێوەندی کورد لەگەڵ روسی قەیسەری و روسی سۆڤیێتدا

روسیای قەیسەری بە هۆی ئەوەوە کە نزیکی کوردستان بوە و لە زۆرکاتدا چ لەگەڵ ئێران و چ لەگەڵ تورکدا کە هەریەکەیان داگیرکەری بەشێک لە کوردستان بوە، کە لەگەڵ یەکێک لەو دەوڵەتانەدا کەتۆتە کێشە و شەرکردن میللەتی کورد و خاکی کوردستانیش لەو کێشە و شەرە داتێ گەلاوە و بارەها گوند و شارەکانی لە نزیکی سنووری هەردولادا بوون بە کۆری شەڕ و خەڵکێکی زۆری تیاچوە و شار و گوندەکانی وێرانکراوە.

روسی قەیسەری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا چەند هۆیەک وای لێکردوە کە سیاسەتی بەرامبەر بە میللەتی کورد بگۆڕێ و خۆی لێ نزیک بکاتەوە و لە مەسەلەی کورد بکۆڵێتەوە و شارەزایانی پسپۆری بۆ تەرخان بکا بۆ ئەوەی هەرکەسە سەرنجی خۆی دەربارەی کورد و کوردستان دەس‌نیشان بکا.

هۆی سەرەکی ئەو بایەخ پێدان و سەرنج راکێشانەی رووس ئەوە بوە کە ئاگاداری ئەوەبوە ولاتە کۆلۆنیالیەکانی تر بایەخ ئەدەن بە رۆژهەڵاتی ناوەراست وهەریەکە بە جۆرێک خەریکە دەم بژەنێتە خێر و بێری ناوچەکە بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا ببێت بە میراتگری عوسمانلی، بۆیە رووسەکانیش کەوتنە خۆیان و سیاسەتیان بەرامبەر کورد گۆری.

لازاریف لەو روەوە ئەلێ:«٢٥»

(جێگری قونسولی روس لە شاری (وان) گەیشتۆتە ئەو بیروڕایەی کە مەسەلەی کورد بە نیسبەت روسیاوە مانایەکی گرنگ و تایبەتی هەیە). هەروەها (ڤ. گردەلیڤسکی) کە خۆی بۆ ماوەیەک لەناو کوردا ژیاوە سەرنجی خۆی دەربارەی کورد بەم جۆرە دەربریوە:

(روسیا ئەرکێکی رۆشنبیری زۆر گەورەی کەوتۆتە ئەستۆ، پێویستە میللەتی کورد بەلای خۆیا رابکێشێت و لە بواری کۆمەلایەتی و رۆشنبیریدا یارمەتی کورد بدات...... بۆ کورد کامیان باشە؟ ئایا بچنە پاڵ روسیا یا هەر لە

چوارچێوەی تورکیادا بمێننەوە؟ ئایا کورد ئەبێ کولتوری روس لە کولتوری بێگانەی تر بە باشتر دابینێن یانا؟)

یەکێک لەو کوردە ناودار و وریایانەی کە هەولی داوە کورد پێوەندی بە دەولەتێکی بێگانەوە بکا بۆ ئەوەی یارمەتی بدا و لە کۆت و زنجیری عوسمانلی رزگاری ببێت عەبدولرەزاق بەدرخان بوە.

لە باسی رۆشنبیریدا لەوە دواین کە چۆن عەبدولرەزاق بەدرخان تەقەلایەکی زۆری دابوو بۆ بە هێزکردنی پێوەندی کورد بە رووسەوە و چۆن داوای لە روسەکان کردبوو بایەخ بدەن بە زمانی کوردی و داوای لێ کردبوون (ئا. ئۆربیللی) رۆژهەلاتناسی بەناوبانگی روس بنێرن بۆ کوردستان بۆ ئەوەی (رێزمان) و قاموسی کوردی دابنێت و روسەکانی هان ئەدا کە ئەدەبی روسی تەرجمە بکرێ بە کوردی و بەشێکی کوردی لە دەزگاکانی رۆژهەلاتناسی پترۆگرادا بکرێتەوە.

لەم روەوە ئەو ئا. ئۆربیللی‌یەی عەبدولرەزاق بەدرخان داوای کردبو کە بچێتە کوردستان بۆ بەهێزکردنی پێوەندی روس و کورد. دەربارەی عەبدولرەزاق بەدرخان وتویەتی:«٤٩»

(عەبدولرەزاق بەدرخان مرۆڤێک بوو وەک هەلۆ ئەی‌روانیەشت لە ئاخاوتندا وریا و زانا، رەوشت بەرز و خوێندەوارێکی هەلکەوتوبو، وەک کوردێکی راست و نیشتمانپەروەر لە کاروباریا زۆر ئازا و چالاک بو)

لە گۆڤاری یەکەم سالی (چوارچرای ژمارە ٢ سالی ١٩٨٦ چاپی سوێد دوکتۆر کەمال عەلی باسێکی تێر و تەسەلی دەربارەی عەبدولرەزاق بەدرخان نوسیوە ئەلێ (پ. ئەڤریانۆڤ) لە نوسینیکیایە ناوی (کورد لە شەری روس لەگەل تورکدا ئەلێ:

(پێوەندی عەبدولرەزاق بەدرخان لەگەل رووسەکاندا بێ هوودە نەبوو بەلکو ئەو ئامانجەی کە بۆی تێدەکۆشا پلانی خۆی بۆ دانابوو، کە بەر لە هەمووشتێک گەرەکی بوو سوود لەو دوژمنایەتیە بن‌داکوتاوە کۆنەی تورک و روسەکان وەربگرێ و لەو رێگەشەوە یارمەتی و هاوکاری روسیا بۆ کورد مسۆگەر بکات،

له لایەکی تریشەوە روسەکان دەسەلاتیان لە کوردستانی ژێردەستی قاجاری‌دا هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە هاوسێ‌ی کوردیش بوون).

لازاریف «٢٢» لە باسەکەیدا دەربارەی تەقەلای عبدالرزاق بەدرخان بۆ پەیداکردن و بەهێزکردنی پێوەندی لەگەڵ روسەکاندا ئەلێ:

(بەدرخان لە نامەیەکی نهێنیدا بۆ مەکتەبی قەفقاس ئەلێ: ژون تورکەکان دوای هاتنیان بۆ سەرکاروبار خۆیان لە ئاستی زۆرشتدا کوێر کردوە، نە ئاگایان لە رووداوەکانی ناوچەکانی کورد هەیە نە لە هی‌پاشە رۆژی خۆیان. کورد لەم هەڵوێستەدا هەموو دوژمنی تورکن و ئامادەن بچنە پاڵ ئێران یا روسیا تەنانەت سوارەی حەمیدیەش دوای راکردنی حوسێن پاشا وەکو گیانێکی بێ‌هۆشی لێ‌هاتوە......

لە سەرەتادا عەبدولرەزاق بەدرخان ئەیویست بچێتە قەفقاس و بارەگای خۆی بباتە (یریڤان) بۆ ئەوەی دووربێت لە تورکەکانەوە، بەڵام بەرلەوەی بچێتە قەفقاس ئەو پرۆگرامەی کە دەمێک بوو بیری لێ‌کردبوەوە، لە دانیشتنێکدا لەگەڵ قونسولی روس لە (وان) ئەو پرۆگرامەی خۆی بەم جۆرەی خوارەوە باس کردوە:

(ئێمە هەموو شتێکمان ئامادەیە لەناو لەشکری تورکدا، کوردێکی زۆر هەیە کە جێی متمانەیە و جێی بڕوای ئێمەن و من ئیستە ئەتوانم (وان) داگیر بکەم بەڵام هیچ سوودێک لە گرتنی نابینم بۆیە راستەوخۆ ئەتوانم بچمە ئێران و داوا لە حکومەت ئەکەم دەسەڵاتی کوردستانم بدرێتی و بەڵێنیان ئەدەمێ تورک لەناوچەکە دەربکەم. هیوام وایە فارسەکان بێ گیروگرفت ئەم پێشنیازەم وەربگرن و خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوا بە هێزی خۆم (سلْماس) یاخود (ورمیە) ئەگرم و تلگرافێک بۆ شاە ئەنوسم و هەموو دەسەڵاتێکم بۆ دەرکردنی تورکەکان بەکار دەهێنم...... ئێمە کوردین، ئەبێ لەپێش هەمووشتێکدا جێ و رێ‌یەک بۆخۆمان دامەزرێنین لە ئێران کە ئەم کارە ئەبێتە هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی میرنشینێکی سەربەخۆ، وەئەگەر ئەمە سەریگرت ئەوسا لە کوردستانی تورکیاش دەست بە شۆرش ئەکەم و هەر لێرەشدا دوبارەی ئەکەمەوە کە هەموو شتێکمان

ئامادەیە، میللەتی کورد تەنها چاوەڕەیی فەرمانێکن، ئێمە ئەمانەوێ ئەو خاکەی کە هی کوردستانە تەنها ئەوە بخەینە ژێردەستی خۆمان و چاو نابرینە خاکی تورک و ئێران.
دوای ئەوەی کە کورد داوا لە روس ئەکا زامنی سەربەخۆیی کورد بکا، لە ئێستاوە بۆ داهاتووش هەمیشە لەگەڵ روسدا دراوسێ و هاودۆستێکی راست ئەبێ...... ئەمەیە پلانەکەمان، ئەگەر گەیشتینە مەبەست، کار لەوە باشتر نیە، بەڵام ئەگەر ئەوە سەری‌نەگرت ئەوا سەرمان لە رێگای ئەو مەبەستەدا دائەنێ‌ین.
وابزانم روس کەم و زۆر بەرژەوەندی لەوە دایە کە وامان بەسەرنەیەت کەبکەوینە بارێکی سەخت و دژوارەوە و لەم روەوە وەرامێکی روون و ئاشکرامان ئەوێ).
بەڵام ئایا ئەو تەقەلایەی بەدرخان هەتا کوێ بری کردوە و ئەنجام بەچی گەیشتوە؟ وەکو هەموو سەرچاوەکان باسیان کردوە بەدرخان هەولێکی زۆری داوە کە سەرکردەکانی کوردی ئەو رۆژە هاوکاری بکەن لەو تەقەلایەیدا و هەولی داوە پێوەندی لەگەڵ نەتەوەکانی تریش بکات بەڵام ئەو هەوڵەی بۆ نەچۆتە سەر چونکە سەرۆک هۆزەکان هەمیشە سوودی خۆیان مەبەست تر بوە وەک لەوەی کە بچن بەدەم داخوازیەکانی عەبدولرەزاق بەدرخانەوە.
جگە لەوەش لام‌وایە ئەو بیرکردنەوەیەی بەدرخان بە ئومێدی ئەوەی ئێرانیەکان رێگەی بدەن لە ناوخاکی کوردستانی سەر بە ئێراندا خۆی کۆبکاتەوە و دەسەڵاتێکی بە هێز لەو ناوچانەدا پەیدا بکات شتێکی خەیاڵی بوو و هەر لەو بۆچوونانەی دوایی ئەچێت کە زۆرجار هەندێ لە تێکۆشەرانی کورد بە هەمان هەلە داچون و لەگەڵ ئەوەشدا ئێران رابردویەکی زۆر رەشی هەبوە لەگەڵ کوردا وەکو ئەوەی شێخ عوبێدەوللا شەمزینی و (لەناوبردنی سمکۆ و قازی محەمەد لە دوای ئەوان)، چونکە ئێرانێک کە رێگەی کوردی ژێردەستی خۆی نەدا مافی خۆی دەزگیر ببێت چۆن بۆی دەس‌ئەدا لەبەر خاتری کوردی شوێنێکی تر دەوڵەتێکی وەکو عوسمانلی لە خۆی بۆ رووژێنێت؟.

(دوکتور کەماڵ عەلی لە پەراوێزی بڵسەکەیدا ئەڵێ: (عەبدولڕەزاق بەدرخان کوری نەجیب پاشای کورە گەورەی بەدرخان بەگە. لە ساڵی ١٨٤٦ دا لە دایک بوە و حاجی قادری کۆیی مامۆستای بوە ماوەیەک سکرتێری سێهەمی باڵیوزخانەی عوسمانلی بوە لە (پیترۆبورگ) و لەوێ زمانی روسی فێربوە و پاش ئەوە بوە بە سکرتێری دووهەمی باڵیوزخانەی عوسمانلی لە تاران.

دوکتور عەزیز شمزینی دەربارەی تەقەلای روس بۆ پتەوکردنی جێپێی خۆی لە کوردستاندا ئەڵێ:«١٤»

روسەکان لە ساڵی ١٩٠٣دا قونسوڵخانەیەکیان لە شاری (وان) کردەوە و لە رێگای گاورەکانی ناو کوردستانەوە باشترین بنکەیان دانا بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی هێز و دەسەڵاتدارێتی روس و بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباسی ئەو ناوچەیە.

روسەکان مەشروتیەتی ئێرانیان بە هەڵ زانی (مەشروتیەتی ئێران لە ساڵی ١٩٠٥دا بەرلەوەی تورکیا بڵاوکرایەوە) و هەولیاندا ناوچەی کوردستانی ئێران بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە بۆ ئەوەی وڵاتەکانی پشت قەفقاس هەموو بخەنە سەر ئیمپراتۆریەتەکەیان.

بۆ گەیشتن بەو مەبەستە گەلێک قونسلخانە و قوتابخانەی ئایینییان لە شارەکانی کوردستاندا کردەوە و بەرلەوەش چاپخانەیەکیان لە شاری ورمی دامەزراندبوو وە تەقەلایەکی زۆریاندا ئابووری کوردستان ببەستن بە بازارەگانی روسەوە.

ئەو چالاکییەی روس لەناو خاکی ئێراندا ئەڵمانەکانی بێتاقەت کردبوو بۆیە کەوتنە هاندانی تورکەکان بۆ بەربەست کردنی روس و کەوتنە هاندانی تورکەکان کە شەر بفرۆشن بە ئەفسەر و دیپلۆماسیەکانی روس لەناوچە کوردییەکاندا وەبۆ ئەوەی بێزاریان بکەن هەندێ ئاژاوەیان لەسەر سنوور بەرپاکرد.

روسەکان لە ئەنجامی ئەوەدا کەوتنە جۆرە تەقەلادانێکی تر بەوەی کە ئەگەر نەتوانن کورد بەلای خۆیاندا داشکێنن هیچ نەبێ وایان لێبکەن بێلایەن بوەستن.

قونسولی روس کە ساتی خۆی لەشەری یەکەمی جیهانیدا لە (دمشق)

کاروباری کوردستانیشی پێ سپێررابو لە نامەیەکیدا ئەڵێ: کە شەر دەستی‌پێ کرد، چ لە بارەگای قەفقاس و چ لە پترۆگراد پشت بە ئەرمەنیەکان بەسرا و چەکیان درایە کەچی هیچ ئاورێک لە کورد نەدرایەوە و ساتێک لە کاتی شەردا روسی قەیسەری گەیشتنە ناوچەکانی کوردستان ئەو چەکدارە ئەرمەنیانەی کە رقیان لە کوردەکان بوو دەستیان کرد بە تاوان و دەس‌درێژی کردن بەرامبەر بە کوردەکان.

روسەکان لە ماوەیەکی کەمدا توانیان رۆژئاوای ئێران بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم‌دا سابلاخیان کردبوو بە بازارێکی گەورە بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلی خۆیان و لە هەمان کاتدا پلانە سیاسیەکانیشیان ئەنجام ئەدا).

دەربارەی پێوەندی کورد و روس (و.ج. ئیلفتسن)«٤٧» ئەڵێ:

(لە شەری یەکەمی جیهانی‌دا کوردەکان کە لەناو سوپای عوسمانلی دابوون بەشداری شەریان کرد شان بە شانی تورکەکان، بەڵام لەو کاتەدا (کۆمەڵی نیشتمانی کورد) لەگەڵ روسەکاندا رێک‌کەوت و یارمەتی ئەو لەشکرەی روسی‌دا کە بەرەو بتلیس و ئەرزنجان ئەهاتن بە ئومێدی ئەوەی روسەکان یارمەتی کورد ئەدەن بۆ سەربەستی و ئازادی گەلی کورد، بەڵام روسەکان شکان و پلانەکەش هەڵوەشایەوە، بەڵام کۆمەڵی نیشتمانی کورد لەگەڵ دەولەتە سوێندخوارەکانا لە ساڵی ١٩١٨دا لە ئەستەمبوڵ یەکتریان بینی و شەریف پاشا هەڵبژێرا کە لە کۆنگرەی ئاشتیدا داوای مافی میللەتی کورد بکات).

دەربارەی پێوەندی روسی و کورد دوکتۆر جەمال نەبەز ئەڵێ:«١٥»

(روسەکان هەولیان‌دا شوێن پێ‌یەکی ئابووری و سیاسی‌ی نوێ‌یان دەس‌بکەوێ لەسەر ئەوە روسیای قەیسەری کەوتە ئەوەی زۆرتر ئاوور لە کێشەی کورد بداتەوە، بە تایبەتی لە دوای شەری (ژاپۆن)، لەبەر ئەوە هەولی‌دا پلانێک سازبکا کە رێ و شوێنێکی وابدۆزێتەوە کە بتوانێت ژمارەیەکی زۆر لە خێڵە کوردەکان بەلای خۆی داشکێنێت، بۆ ئەو مەبەستە لە ساڵی ١٩٠٦دا ئاورێکی تەواوی لە کوردەکانی (دەرسیم) دایەوە، بۆ نموونە سکرتێری قونسولی گشتی لە

ئەرزروم نێررا بۆ دەرسیم).

لە نووسراوێکی بارەگای گشتیی جەنگی قەفقاس لە ١٩٠٨/٥/١٨دا ئەلێ: ئەگەر هات و شەر روویدا، ئەوا ناوچەی دەرسیم ئەتوانێ دەهەزار چەکدار ئامادە بکات. بەلاْم شەش هەزاری ئەو چەکدارانە ئامادە نین لەژێر فەرماندەی کاربەدەستانی تورکدابن).

دوکتۆر جەمال نەبەز دەربارەی تەقەلای روسەکان ئەلێ:«١٥»

روسەکان زۆر حەزیان ئەکرد خێلە کوردەکان بەلای خۆیاندا داشکێنن، هەر چەند هەولْ و تەقەلاکانیان لەم رووەوە سوودی نەبوو، ئەوەی دەسگیریان بوو تەنها بریتی بوو لەوەی لەگەلْ حامید سەدیقی شێخی شەمزینیدا رێککەوتن کە ئەو خۆی لووتی لەوە ئەخورا کە روسەکان پشتگیری بکەن. سەردانی شێخی شەمزینی بۆلای یاریدەدەری قونسولی روس لە (وان) و ورمێ سەردلی تورکەکانی گرت و زراوی نوێنەرانی ئینگلیز و ئەلمانیای تۆقان. جگە لەوە لە سالْی ١٩١٦دا بەدرخانیەکان لە (تەفلیس) پێوەندیان بە (دوق نیقولای) روسەوە کردوە داوای پشتگیری کردنیان لێکرد بەلاْم روسەکان ئەو سەردەمە هەلْوێستێکی روون و ئاشکرایان نەبوو بەرامبەر بە کورد بۆیە گوێیان نەدایە داخوازیی بەدەرخانیەکان).

دوکتور قاسملو دەربارەی سیاسەتی قەیسەری روس و چاوتیبرینی لە کوردستان ئەلێ:«١٦»

(لە ئەنجامی رێکەوتنی روسیا و بەریتانیا و فەرانسەدا لە پەیمانی سایکس پیکو لەسەر ئەوە بریاردرا کە کوردستانی تورکیا بکرێت بە دوو بەشەوە بەشی روسی و بەشی فەرەنسی. بەلاْم شۆرشی ئۆکتۆبەر سنوورێکی دانا بۆ ئەو موغامەرەیەی کە روسی قەسەری دایناِبوو دەربارەی داگیرکردنی بەشێک لە کوردستان).

قەدری جەمیل بەگ دەربارەی پێوەندی کورد و روس ئەلێ:«١٩»

(لە سالْی ١٩١٤دا ئیسماعیل ئاغای شکاک و عەبدولرەزاق بەدرخان و شێخەکانی نەهری و سەید تەها و سەید عەبدوللا لەناوخۆیاندا لەسەر ئەوە رێک

کەوتن کە پێکەوە خەبات بکەن بۆ وەدەسهێنانی مافی کورد، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە دۆستایەتیان لەگەڵ روسی قەیسەری‌دا سازکردبوو، بەڵام کە شۆرشی ئۆکتۆبەر روویدا هەمویان گەرانەوە بۆ تورکیا. عەبدولرەزاق بەدرخان لەلایەن تورکەکانەوە نیررا بۆ موسل بۆ محاکەمەکردن، بەڵام بەرلەوەی محاکەمە بکرێت کوشتیان و سەید تەها و سمکۆ و ئەوانی تر خۆیان نەدابەدەستەوە و خۆیان رزگارکرد).

باسیل نیکیتین کە قونسولی روس بوە لە ئێران ئەلێ:«٣٨»

(لە ساڵی ١٩١٦دا کمیل بەگ بەدرخان کە لە بنەماڵەی (بۆتان)ە، لەو ساڵەدا لە (تفلیس) لەگەڵ دۆقی گەورە (نیکۆلای) کە نائبی مەلیکی قەفقاس و قائیدی گشتی بوە لەسەرسنووری تورک گفتوگۆی لەگەڵدا کردوە دەربارەی کورد. بەڵام روسەکان لەو رۆژانەدا هەڵوێستێکی ئاشکرایان نەبوە بەرامبەر بە کورد وەسەرگرتنی هیوا و ئاواتەکانی کورد تێکەڵ بوبوو بە دروستبونی ئەرمەنیای سەربەخۆوە......

لە کۆتایی ساڵی ١٩١٧دا وەفدێک لەلایەن کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردەوە هاتنەلام (باسیل نیکیتین) و نامەیەکیان دامێ کە لەلایەن (سەید تەها)وە نێررابوو بۆ ئەوەی پێکەوە دژی تورک لەسەر نەخشەیەک رێک بکەوین بۆ ئەوەی کوردستان رزگاری بێت).

لە خوارووی کوردستانیشدا لە باسی شێخ سەعیدی حەفید و شێخ مەحمودی کوریدا باسی ئەو شەرانەمان کرد لە زەمانی کاک ئەحمەدی شێخ و لە کاتی شەری جیهانیدا شێخ سەعید لە شەری قارس و ئەردەهان شان بە شانی لەشکری تورک شەری دژی روسیای قەیسەری کردوە و شێخ مەحمودی کوریشی ساتێک لەشکری روسی قەیسەری نزیک مەریوان و پێنجوێن (هەتا نزیکی گوندی ولیاوا بوونەوە) بوەوەوە ئەو ناوەی کاوڵ کرد و هەرەشەی ئەوەی ئەکرد کە بچێتە ناوشاری سلێمانی‌یەوە، ئیتر شێخ مەحمود خۆی و لەشکرەکەي گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە و روسەکانی بەربەست کردوە.

روسی قەیسەری لەو شەرانەیاندا کە گەیشتبونە ناو خاکی کوردستانەوە

لاپەڕەیەکی زۆر ڕەشی پڕ لە تاوانیان بۆ خۆیان تۆمار کردوە، چ لە خانەقین و چ لە ڕەواندوز و چ لە ناوچەی مەریوان زۆر دڕندانە جوولاونەتەوە.

ئەرنۆلد ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لە لاپەرە ۳۱و ۳۲ی کتێبەکەیدا ئەڵی:«۳۷»

(کە روسەکان زستانی ساڵی ۱۹۱۵- ۱۹۱٦ گەیشتنە ناوچەی ڕەواندوز هەرچیکیان بەردەست کەوت بە تالانی بردیان و ئەوەی مایەوە هەمویان سووتاند. کە هیچیان بۆ نەمایەوە دەستیان کرد بە سووتاندنی دارودرەخت و جۆگای ئاوەکانیان تێک ئەدا و پڕیان ئەکردەوە. ئەوانەی لەو ناوەدا دەسەڵاتی چەک هەڵگرتنیان هەبوە یا کوژراون یا بە زۆرەملی لەگەڵ خۆیانا بردوویانن. بەڵام رووسەکان بە زۆری ئەم ڕەفتارەیان لەگەڵ کوردە موسلمانەکاندا ئەکرد و ئەوانەی کردیستیان بوون بە نەرم و لەسەرخۆ لەگەلیاندا ئەجوولانەوە.

کە ساتێکیش لە سەرەتای ساڵی ۱۹۱۷دا ناوچەی خانەقینیان داگیرکرد ئەو ناوچەیەشیان لە ڕەواندوز خراپتر لێکرد، هەتا ژن و منداڵیش بەسەلامەتی دەرنەچون و رزگاریان نەبوو).

لە باسی ژیانی شێخ مەحموددا باسی تاوانی روسەکان کرا لە ناوچەی پێنجوێن و مەریواندا و چۆن ئەو تاوانانە وای لە شێخ مەحمود کردبوو کە بە هیچ جۆرێک بە بەڵێن و بەو خەڵات و بەراتانەی کە بڕیاربوە بۆ شێخ مەحمودی بنێردرێ لە لایەن قەیسەرییەوە رازی نەبێت و وەکو لە یاداشتەکانی زیوەردا باسی کردوە«۱۳» وەرامێکی زۆر ڕەق و سەختی ناردوە بۆ روسەکان کە پێویست ناکا لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

دەربارەی پێوەندی کورد و روس و سیاسەتی روسی قەیسەری بەرامبەر کورد دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەڵی:«۷»

(روسەکانیش هەروەکو ئینگلیز زۆر دەمێک بوو چاویان بریبوە کوردستان بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە نزیک سنووری خۆیان.

روسەکان لە مێژبوو قونسلخانە و قوتابخانەی تایبەتی و بنکەی ئایینی کریستیانیان لە هەندێ شاری کوردستانی تورکیادا دامەزراندبوو. بەر لە

دەست‌پێ‌کردنی شەڕی یەکەمی جیهانی لە شاری (ورمێ) چاپخانەیەکیان دامەزراند. قونسولی ڕوس لە دیمەشق شازادە (باریس شاخوڤسکی) لە ساڵانی شەڕی جیهانی‌دا بوو بە سەرپەرشتیکەری کاروباری ڕوس لە هەموو کوردستاندا و شاخوڤسکی بایەخێکی زۆری دا بەوەی کە باری ئابووری کوردستان ببەسرێتەوە بە ڕوسیاوە بۆ ئەوەی نەک تەنها هەر بەرهەمە پیشەسازیەکانی ڕوس کە ئەنیررا بۆ کوردستان بەڵکو بەرهەمەکانی ئەورووپاش لە ڕێگەی ڕوسیاوە بەکێش ئەکرا بۆ کوردستان کە لە ئەنجامدا پێوەندی بازرگانی و ئابووری ڕوس لەگەڵ کوردا گەیشتە ڕادەیەک کە ئەڵمانەکانی بێزار و ناڕاتارام کردبوو).

دوکتور کەمال مەزهەر هەر لە باسەکەیدا ئەڵێ:

(م.س. لازارێف لای وابوە ڕوسەکان ئەگەرچی وەکو دەوڵەتە گەورەکانی تر چاوی بڕیبوە خاکی کوردستان و سامانی کوردستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەتێکی سیاسی و دیار و دووربینی نەبوە بەرامبەر بە کورد و کوردستان و زۆرجار سیاسەتی ڕوس بەپێ‌ی کات و شوێن ئەگۆڕا (وابزانم درۆناکەم ئەگەر بڵێم ئێستەش هەروایە). قونسولی ڕوس لە (ورمێ) لە یەکێک لە دۆکۆمێنتە نهێنیەکاندا بە ئاشکرا دانی بەوە داناوە کە ڕوسەکان بە ڕادەی یەکەم لە گۆشەی دامەزراندنی ئەرمەنیای سەربەخۆوە سەیری کێشەی کورد و دوا ڕۆژی کوردی ئەکرد کە بەوە ڕوس دوو سیاسەتی جیاوازی هەبوە بەرامبەر بە کورد و بەرامبەر بە ئەرمەن. دەربارەی کورد ڕوسەکان جارێک لە جاران پشتگیری کوردیان نەکردوە کەچی لە هەمان کاتدا بەبێ وچان پشتگیری ئاسووری کرد و سیاسەتێکی تایبەتی هەبوە بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان لە کاتی پێویستیدا چەکیان داونەتێ).

دوکتۆر کەمال مەزهەر لە لاپەرە (٢٦)ی کتێبەکەیدا ئەڵێ:«٧»

شازادە (شاخۆڤسکی) لە نامەیەکی ڕەسمیدا نووسیوێتی ئەڵێ:

(لەگەڵ دەست‌پێ‌کردنی شەڕی جیهانی، چ لە بارەگای قەفقاس و چ لە پترۆگراد پشت بە ئەرمەنیەکان ئەبەسرا و هیوایەکی زۆر هەبوە بە ئەرمەنی

کەچی هیچ گوێ نەدراوەتە کوردەکان).

لە باسی ژیانی شێخ مەحمودا و لە باسی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتیدا باسی پێوەندی شێخ مەحمود و مینۆرسکی و روسەکانمان کرد کە چ دوکتۆر کەمال مەزهەر و چ شێخ رەئوف باسی ئەو پێوەندیانەیان کردوە و لێرەدا بە پێویستمان نەزانی دووبارەیان بکەینەوە.

## ٤- پێوەندی کورد و ئینگلیز

لە دوای ئەوەی ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر هیندستاندا گرت و لەوێوە پەرینەوە بۆ ناوچە پڕ لە نەوتەکانی خوارووی ئێران، ئیتر لەوساوە بەلای سیاسەتمەدارانی ئینگلیزەوە بە پێویست زانراوە ئەو ناوچانەی کە بڕبڕاگە پشتی رێگەوبانی هات و چوی نێوانی ئینگلترە و هیندستان پیادا ئەڕوات (جگە لە رێ‌ی هات و چۆی ناودەریا) والیٚ بکا سەربەخۆی بن یا هەر هیچ نەبیٚ دوورین لە دەسەلاٚتی دوژمنەکانیانەوە. جگە لەوەش کە شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپادا تەقیەوە و پێویست بوون بە کرینی کەرەسەی خاو بە نرخێکی هەرزان و فرۆشتنی مالی بازرگانی لەناو بازاری ولاٚتاندا کە رۆژهەلاٚتی ناوەراست ناوچەیەکی دەولەمەندبوە ئەوەش ئەوەندەی تر وای لە ئینگلیز کردوە بایەخ بدات بەو ناوچەیە کە خاکی کوردستانیش بەشیٚکی گرنگ و ستراتیژی بوە لەو نەخشانەی ئینگلیزەکان کیٚشاویانە.

دوای ئەوەش کە ئینگلیزەکان زانیان کوردستان پڕە لەنەوت (کە سەیر ئەوەیە ئینگلیز هەتا ماوەیەکی درەنگ ئەو بایەخدانەیان بە کوردستان وا ئاشکرا نەکردوە کە لەبەر بوونی نەوت بوە، بەلکو ئەتوانین بلیٚین هەندیٚک لە کاربەدەستانی ئینگلیز خۆشیان کە لە ناوچەکەدا کاروباریان پیٚ‌سپیٚررابوو و ئاگاداری ئەوە نەکرابوون کە بایەخدانی ئینگلیز بە کوردستان لەبەربوونی نەوت بوە- وەکو لە باسیٚکی تایبەتیدا روونی ئەکەینە بە ناوی نەتەوە).

ئینگلیزەکان ماوەیەک بوو گەرۆک و شارەزایان و میسونیٚرەکانی خۆیان بە ئاشکرا و نهیٚنی ناردوە بۆ کوردستان بۆ کۆکردنەوەی هەوالٚ و شارەزابوون دەربارەی باری کۆمەلاٚیەتی و ئابووری و ژمارە و شویٚن و دەسەلاٚتی عەشیرەتەکانی کورد و سەرۆکەکانیان.

ئەدمۆندز لە کتیٚبەکەیدا«٤٥» باسی ژمارەیەکی زۆری لەو گەرۆک و بازرگان و

میسونێرانە کردوە کە بەر لە شەری یەکەمی جیهانی بەناو کوردستاندا گەراون و شارەزاییەکی زۆریان دەربارەی کورد و کوردستان پەیدا کردوە و راپۆرت و نووسینێکی زۆریان تۆمار کردوە.

بێجگە لە ئەدمۆندز(لونگریک .S.H) لە کتێبەکەیدا Four centuries of Modern Iraq چاپی لەندەن سالی ١٩٢٥- ئەویش باسی ژمارەیەک لەو گەرۆکانەی کردوە کە چوونەتە کوردستان وەکو (د. کامبێل) و (ت. هاول) و چەند کەسێکی تر. ستیڤن لە کتێبەکەیدا«٥٧» دەربارەی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بە ناوچەی رۆژهەلات (بە کوردستانەوە) بەم جۆرەی خوارەوە بۆی چوە:

«ئینگلیزەکان بۆ پارێزگاری لە هیندستان پێویستیان بەوە هەبوە کە زنجیرەی ئەو شوێنە گرنگانەی کە ئەکەوێتە نزیک هیندستانەوە، ئەو شوێنانە والیْ بکەن لەژێر ئینتدابی خۆیاندا بیْ یاخود هیچ نەبیْ سەربەخۆبن و لەژێر دەسەلاتی هیچ حکومەتێکی بە هێزی تردا نەبن.

لەو رووەوە ئینگلیزەکان دوو جۆر لێکدانەوە و بۆچوونیان هەبوە:

١- بەشداری کردن لەگەلْ روسەکاندا لە دەس بەسە راگرتنی ناوچەکەدا.

٢- هێشتنەوەی ئەو ناوچانە بە سەربەخۆیی.

ئینگلیزەکان ئەو بۆچوونەی دووهەمیان پەسند کردوە لەوەدا ئەوەیان خستۆتە بەرچاو کە هەر جۆرە هاوکاریەک لەگەلْ روسدا ئەبێتە هۆی ئەوەی روسەکان والیْ بکا بیر لە دەس‌تێوەردانی ناوچەکە بکەن و بە تایبەتی لە هیندستان و لە خەلیجدا، بەو جۆرە ئێرانی دراوسیْی هیندستان و جنوبی ئێرانی پر لە نەوت حسابی بوکرا کە پێویستە ولاتێکی سەربەخۆبێت». (هەرچەند لە سالی ١٩٠٧دا ئەو بریارە تێکچوو وەلەگەلْ روسەکاندا رێک‌کەوتن کە هەردوولایان دەسەلاتیان هەبێت بەسەر ئێراندا کە ئەو دەسەلاتە دوقۆلیە لە شەری جیهانی دووهەمدا خۆی دەرخست کە ساتێک ئینگلیزەکان هێزیان ناردە جنوبی ئێران بۆ پارێزگاری نەوت، روسەکانیش هێزی خۆیان نارد بۆ ناوچەی ئازربایجان و دەوروبەری کوردستان).

رۆژهەلاتناس و مێژوو نوسەکان لەوانەی کە بایەخیان بە رووداوەکانی ناوچەی

رۆژهەلاتی ناوەراست داوە، هەریەکەیان بە جۆرێک باسی سیاسەت و دیپلۆماسیەتی بەریتانیایان کردوە.

ئینگلیزەکان لە کوردستاندا هەوڵیان داوە بە تەواوی لووت بژەننە کاروباری کوردستانەوە و تەنها هەرخۆیان بێن بە تاقە کەڵەگای ناوچەکە. بۆ بەجێ هێنانی ئەو سیاسەتەیان هەر لە کۆنەوە بۆ ئەوە تێکۆشاون کە پێوەندیەکی بە هێز و پتەو لەگەڵ خوێندەوار و رۆشنبیر و سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردا پەیدا بکەن بە تایبەتی ئەوانەیان کە زۆر بێزار بون لە دەوڵەتی عوسمانلی و ئێران.

یەکێک لەو کوردە زرنگ و وریایانەی کە هەر لە کۆنەوە لە فروفێڵ و دەس‌برینی ئینگلیز گەیشتبو عەبدولرەزاق بەدرخان بوە کە هیچ ئومیدێکی بە ئینگلیز نەبوە و بە دەوڵەتێکی هاوسێ‌ی کوردستانی دانەناوە و لەو بارەوە پرۆفیسۆر حەسرەتیان لە کتێبەکەیدا«٤٩» بیروباوەری عەبدولرەزاق بدرخانی بەرامبەر بە ئینگلیز بەم جۆرە باسی کردوە:

(ئینگلیزەکان کوردیان هەڵخەڵەتاندوە و بۆ راستی ئەو بۆچوونەی شۆرشەکەی شێخ عوبیدوللای ساڵی ١٨٨٠ی هێناوەتەوە بە نمونە و روونی کردۆتەوە کە ئەو دەس برینەی ئینگلیز بەرامبەر بە شێخ عوبێدوللا شتێکی ئاشکرایە و نابێ هیچ کەس متمانەی پێ بکات).

عەبدولرەزاق بەدرخان ماوەیەک لە بەریتانیا ژیاوە و وەکو ئاواریەک لەگەڵ ئاوارەبوەکانی تری عوسمانلی‌دا لە ئینگلترە تێکەڵ بوە، بە تایبەتی لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا و لەو ماوەیەدا بە تەواوەتی لە سیاسەتی دووروویی ئینگلیز گەیشتوە.

ئینگلیزەکان لە نیوەی سەدەی هەژدە بە دواوە فەرمانبەران و پیاوە بەکرێگیراوەکانی کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتیان ناردبوو بۆ کوردستان، ئەو کۆمپانیایە جگە لە کاروباری ئابووری و بازرگانێتی رۆڵێکی زۆر گرنگیشیان دیوە لە بەجێهێنانی سیاسەتی بەریتانیادا لە ناوچەکەدا.

لە ساڵی ١٧٥٨دا دوکتۆرێکی ئەم کۆمپانیایە لە رێگەی کەرکوکەوە چۆتە شاری (ماردین)، دوای ئەو (د. کامبێل)، هەروەها (ت. هاولی) وەکو

لونگریک باسی کردوه چونەتە کوردستان و بەناویدا گەراون.

کلودیوس ریچ، نوێنەری کۆمپانیای هیندستان لە ساڵی ١٨٢٠ دا گەشتێکی دوور و درێژی بە کوردستاندا کردوە و کتێبێکی لە شێوەی یاداشتدا چاپ کردوە«٤٨»، ئەگەرچی ریچ بێجگە لەو گەشتەی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە زۆر جاری تریش لە رێگەی هاتوچۆیدا لە بەغداوە بۆ ئەستەمبول بە کوردستاندا رۆیشتوە و پێوەندی لەگەڵ کوردی ئەو رێ و بانەدا هەبوە.

ریچ لە گەشتەکەیدا پێوەندی لەگەڵ هەندێ ناسراو و پیاوە ناودار و سەرۆکی عەشیرەتەکانی کوردا کردوە و بایەخێکی زۆری داوە بە باری ژیانی کوردی ئەو سەردەمە بە تایبەتی لە ناوچەی سلێمانی‌دا کە لەو رۆژانەدا هێشتا بابانەکان میر و دەسەڵاتداری ئەمارەتەکەیان بون لە سلێمانی‌دا.

ریچ لەو گەشتەیدا بۆ یەکەم جار نەخشەی چەند شوێنێکی کوردستانی کێشاوە و باسی ژیانی کۆمەڵایەتی و باری ئابووری دەسنیشان کردوە.

لە دوای ریچ لە ساڵی ١٨٣٦دا (راولنسون) وەدوای ئەو (مێجر. ف. میللینگتن) سەریان لە زۆر ناوچەی کوردستان داوە و سەرنجی خۆیان تۆمار کردوە.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا (لۆرد کیرزن)ی دیپلۆماسی‌ی بەریتانیای بەناوبانگ بە ئاشکرا باسی ئەوەی کردوە کە پێویستە میسوپۆتامیا هەمووی بە تەواوی بکەوێتە ژێردەسەڵاتی ئینگلیزەوە. هەر ئەو (لۆرد کیرزن)ە لە دوای نزیکی بیست ساڵ لە بەردەمی ئەنجومەنی لۆردەکانی ئینگلیزدا بە ئاشکرا وتبوی: (زۆر هەڵەیە ئەگەر وابزانرێ بەرژەوەندی ئینگلیز تەنها لە ناوچەی خەلیجی فارسدا ئەبێ هەبێ...... بەرژەوەندی ئینگلیز تەنها ناوچەی بەسرە و بەغدادیش ناگرێتەوە بەلکو ژوروی بەغدایش ئەگرێتەوە (مەبەستی لە کوردستان و ویلایەتی موسل بوە).

ئەرنۆلد ویلسن حاکمی گشتی بەریتانیا لە کتێبەکەیدا لەو رووەوە ئەلێ:«٣٧» سێ هۆ هەبوە کە پاڵی بە ئینگلیزەوە ناوە بایەخ بدا بە کێشە و باسی کورد:

١- پاشەرۆژی ویلایەتی موسل کە زۆربەی دانیشتوەکانی کوردن.

٢- مەسئەلەی ئەو زەوی و زارانەی کە ئەکەونە ژوور ویلایەتی موسل.
٣- بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە کوردستانی ئیراندا کە پێویستە حسابێکی تایبەتی بۆ بکرێت (سەیر ئەوەیە باسی گرنگ بوونی نەوتی نەکردوە).
لازاریف لە کتێبەکەیدا (دۆخی جیهانی کوردستانی) دەربارەی هەڵپەی ئینگلیز لە کوردستاندا ئەڵێ: «٢٥»
(بەریتانیا لە ساڵی ١٩.٤- ١٩.٥دا روسی بە گەورەترین دوژمن و بەربەرەکانێکەری خۆی دانابوو لە کوردستاندا. کاربەدەستانی ئینگلیز کە رووبەرووی روس ئەبونەوە لە رۆژهەڵاتی دوور و لە ناوچەی ئاسیای ناوەراستدا، لەو باوەرەدابون کە تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی روس لە کوردستاندا ئەبێتە هۆی هەرەشە و مەترسی‌یەکی گەورە بۆ بەرژەوەندی ئابووری و باری سیاسەتی ئینگلیز لە رۆژهەڵاتی نزیکدا.
ئینگلیز ئەیویست لە خۆی بەولاوە هیچ هێزێکی تر لە کوردستاندا دەسەڵاتدار نەبێت چونکە بەبێ کوردستان بۆی نەدەکرا دەسەڵاتی خۆی لەناو وڵاتانی عەرەب و ئاسیای بچووکدا بچەسپێنێت).
لازاریف دەربارەی چالاکی ئینگلیزەکان لە کوردستاندا ئەڵێ:
(قونسولەکانی ئینگلیز لە ئەنادۆلی رۆژهەڵاتدا، لەناو کوردەکاندا پرۆپاگاندەیان دژی روس بڵاو دەکردەوە و تەقەلای ئەوەیان ئەدا دەسەڵاتی روس لەناو کریستیانەکانی ناو کوردستانی ئێران و عوسمانلی‌دا لاواز بکەن. بە شێوەیەکی گشتی ئینگلیز بە چاوێکی پڕ لە مەترسی‌یەوە ئەیروانیە تەشەنەکردنی دەسەڵاتی روس لەناو کوردستاندا. لەم رووەوە قونسولی فەرەنسا لە ئەرزەرووم نوسیویێتی: هەرکاتێک قونسولی روس سەری لە سەرۆکێکی کورد بدایە، دەمودەست قونسولی ئینگلیز بە دوای ئەوا ئەچوە لای ئەو سەرکردەیە و سەری لی‌ئەدا. بەو جۆرە قونسەلەکانی ئینگلیز هەمیشە وەکو سێبەری قونسولەکانی روس وابون لە کوردستاندا و لی‌یان جیا نەدەبونەوە.
لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا چالاکی و جرت و فرتی سیخور و پیاوە سیاسیەکانی ئینگلیز لە کوردستاندا تەواو پەرەی سەندبوو. قونسولەکانی

ئینگلیز لە راستیدا لە هەرێمەکانی رۆژهەلاتی عوسمانلیدا لە ئەفسەرەکان دائەنران.

(فریمەن)ی یاریدەدەری قونسولی ئینگلیز لە دیاربەکر بۆ ماوەی ساڵێک بە هەرێمی بتلیس و ناوچەکانی دەوروبەریدا گەرا، (مایو ئەندرسن) کە یاریدەدەری قونسولی ئینگلیز بوە لە (سیواس) بەناو هەرێمی دیاربەکر و (خەربوت)دا گەراوە، هەروەها (کاپتن. تیرێل) یاریدەدەری ئینگلیز گەشتێکی بە ناوچەی هەکاری و بەتلیس دا کردوە.

بێگومان نابێ گەشتە نهێنیەکەی (مێجرسۆن)مان لە بیر بچێت بە ناوچەی سلێمانیدا کە نووسەری ئینگلیز (ئەرنست مێین) دەربارەی مێجرسۆن ئەلێ: کارەکانی مێجرسۆن بەرادەی کارەکانی (لۆرانس) گرنگ بوە هەرچەند لەو کەمتر ناوبانگی بلاوبۆتەوە.

لە کاتی گەشتەکەی مێجرسۆندا (مارک سایکس) کە نوێنەری ئینگلیز بوە لە سازکردنی پەیمانی (سایکس پیکۆ)دا گەشتێکی دووردرێژی (٧٥٠٠) میلی بە کوردستانی ژووروودا کردوە و لە ژیانی عەشیرەتەکانی کوردی کۆلیوەتەوە. نووسینەکانی مارک سایکس زۆر بە کەلکی ئەو کاربەدەستە ئینگلیزانە هات کە لە دوای ئەو ماوەیە کاروباری ناوچەکەیان پێسپێررابو «٧»

ئەرنۆلد ویلسن کە لە دوای داگیرکردنی عێراق کرابە حاکمی گشتی بەریتانی لە بەغدا لە کتێبەکەیدا ئەلێ:«٣٧»

(لە ساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا، پیاوە هەرە بە توانا و لێهاتوەکانمان لە ناوەندی دورگەی فارس و کوردستان و خواروی رۆژئاوا و ژووری رۆژئاوای ئێران و کەنداوی بەسرەدا کاریان کردوە).

دوای ئەوەی ئینگلیزەکان لە مانگی مارتی ١٩١٧دا بەغدایان داگیر کرد، لەوێوە دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی پروپاگاندە بۆ پیاوەتی ئینگلیز و دژی عوسمانلی و تورک. بۆ ئەو مەبەستە چەند رۆژنامەیەکیان لە بەغدا دەرکرد کە (العرب) بە زمانی عەرەبی بوە و (تایمس) بە ئینگلیزی و (ایران) بە فارسی و رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) بە کوردی دەردەکرد کە یەکەم ژمارەی

تێگەیشتنی ڕاستی لە بەغدا لە ١٩١٨/١/١دا دەرچوە.

دوکتور کەمال مەزهەر کتێبێکی تایبەتی دەرکردوە دەربارەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) و ڕۆژنامەنووسی و ڕۆشنبیری لە کاتی حوکمدارێتی شێخ مەحمودا.«٧»

سیاسەتی دووڕوویی و فریودان و دەسبرینی ئینگلیز بە تایبەتی لەناوەڕۆکی ئەو ڕۆژنامەیەدا ئاشکرابوە.

لەیەکەم ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیەدا ئەلێ:

(تێگەیشتنی ڕاستی خزمەتی یەکبوونی سەربەستی و سەرکەوتنی کوردان ئەکا).

ئەو ڕۆژنامەیە بەسەرپەرشتیکردنی مێجرسۆن دەرچوە (کە ساتێکیش لە دوای ئاوارەکردنی شێخ مەحمود بۆ هیندستان کرا بە حاکمی سیاسی لە سلێمانی. مێجرسۆن ڕۆژنامەیەکی تری لە هەمان شێوەی لە سلێمانی دەرکردوە بە ناوی (پێشکەوتن). لە دەرکردنی ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستیدا وەکو دوکتۆر کەمال مەزهەر بۆیچوە، شوکری فەزلی شاعریش یارمەتیدەری نوسین بوە. لە ژمارەیەکی تری ئەو ڕۆژنامەیەدا ئەلێ:

(حکومەتی ئینگلیز و فەرەنسا و روسیا لەبەر خاتری موسولمانان لە حکومەتی تورکیان گەیاند کە نابێ شەریکا، بەلکو ئەبێ بێ لایەن بێ و ئێمە هەرچی شتی باشە بۆ ئەوی ئەکەین، بەڵام ئیتحادی‌یەکان چونکە ئەیانویست عەرەب و کوردەکان لەناو ببەن و هەر خۆیان بمێننەوە، گوێیان لەو قسانەی ئێمە نەگرت).

کاربەدەستانی ڕۆژنامەکەی ئینگلیز بۆ بەجێ هێنانی سیاسەتی حکومەتەکەیان لەو ڕۆژانەدا ئەیانویست هەستی ئیسلامەکان بیزوێنن.

لە ژمارە (٤)ی کانونی دوهەمی ساڵی ١٩١٨ دا ئەو ڕۆژنامەیە ئەلێ:

(فەرمو...... ئەوا مستر ل. ج. ستیوارت) نەک تەنها هەر بوە بە ئیسلام بەلکو ناوی خۆشی گۆڕیوە و کردوێتی بە (جەمال الدین) و (مستر جاکسن) کە تازە موسوڵمانە و ناوی خۆی ناوە (سەعدی حەمدی) ئەو ناوەی لە هەموو

ناوێکی ئینگلیزی تری لاخۆشترە... خۆ مستر (سۆن) کە نیازی لە (مێجرسۆن)ی لێپرسراوی رۆژنامەکە بوە- سەری بچوایە نوێژی نەدەچوو (ئەوە بوو لە گەشتەکەی ساڵی ۱۹.۹دا خۆی وانیشان دابوو کە ناوی حاجی میرزا غلام حسین شیرازی‌یە و لەسەر مەزهەبی شیعەیە).

هەروەها لە ژمارە (٤) دا نوسیویێتی:

(حکومەتی موعەزەمی بەریتانیا شرق (رۆژهەلاّت)ی بۆ شەرقیەکان ئەوێ، ئەم حەربە گەورەیە بۆ سەربەست بوونی ئەقوامی موختەلیفەی وەکو عەرەب و کورد و ئەرمەن ئەکا و بۆخۆ بە خۆ ژیانی ئەقوام سەعیێکی تەواوی اختیار کردوە)

لە ژمارەیەکی تری رۆژنامەکەدا ئەلێ:

(چارەی کوردان ئەمرۆ وەک عەرەب بە حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا پشت‌پێ بەستنە، چونکە چاوی لەماڵ و موڵکی کەس نییە و ئارەزوی ئازادکردنی ئەقوامە، حکومەتی ئەمریکا دەسنێژی ئەوە (یەعنی ئینگلیز دروستی کردوە)، کەنەدا و ئیرلەندە و میسر و هیندستان لە سایەی ئەوا زۆرچاک بە سەربەستی ئەژین. لە تورکیا بە تەمای دڵخۆش بون شێتیە . ئەی کوردان برایان).

لە ژمارەیەکی تردا ئەڵێ:

(حکومەتی ئینگلیز کوردانی خۆش ئەوێ، چونکە ئەزانێ لە تاریخی عالەمدا کوردان ناوێکی گەورەیان هەیە و بە مەردی و ئازادی هەتا ئێستا خۆیان راگرتوە، حەزناکا وا بلاّوبێنێتەوە و خزمەتی ئەم و ئەو بکەن، هەڵبەتە حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا کوردانی لە هەمووکەس خۆشتر ئەوێ، وەکو أیشی ئەقوامی تری ئاسان کرد ئیش بۆ ئەوانیش سازدەکا).

لە هەمان رۆژنامەدا لە شوێنێکی تردا ئەلێ:

(کورد عاقلن، دەبێ نەختێک تێفکرن، هەتا زوە یاریدەی حکومەتی موعەزەمەی ئینگلیز طلب بکەن و خۆیان هەم لە تورک و هەم لە ئەلمان و کەسانی تر رزگار بکەن و بۆخۆیان بژین).

لە ژمارە ١٢ی (١٩١٨/٢/٢٧)دا ئەلیٚ:
(ئینگلیز لە هەموو قەومیٚک زیاتر دۆستی کوردانن، عاشقی شەجاعەتی ئەوانن، دلیٚریی کوردیان چاک بیستوە).
لە ژمارە (٣١)ی رۆژی ١٩١٨/٦/٣دا ئەلیٚ:
(عەرەب لە مەکەی موشەرەفە اعلانی استقلالیان کرد، کوردەکانیش چارەسەرێکی خۆیان بکەن چاکە، چونکە حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا موجیبی کوردانە).
سەروتاری ژمارە (١٩)ی ئەو رۆژنامەیە بەم جۆرە بوە:
رۆسای کورد دەبیٚ چی بکەن؟
رۆژنامەکە لە دوای ستایشیٚکی زۆری فەرمانڕەوایی سەردەمی بابانەکان ئەلیٚ:
(سەردارانی بابان دائم مستقل ئەژیان و ئەگەر- لە تەرەف عەجەم و تورکەوە تەجاوزێکیان بدیایە، بۆ موحافەزەی ئەمارەتی خۆیان بەگژ ئەم دوو حکومەتەی کە چەند دفعە لە خۆیان گەورەتر بوون دەچوون و دەیان شکاندن، هم تورک و هم عجم افتخاریان بە ئەمارەتی بابان ئەکرد ئەگەر تماشای حقیقت بکریٚ، کورد تا ئەم نزیکانە قەومیٚکی حاکم بون، کەواتە بۆچی حاکمیٚتی بە مەحکومی ئەگۆرنەوە؟ لەم شەڕەدا هەر قەومیٚکی بەغیرەت بو و سەری بەرز کردەوە ئەوا نائلی حاکمیەت ئەبیٚ، قەومی کورد هەڵبەت لەگەڵیٚک ئەقوامی تر بە غیرەت ترن...... بۆچی تائیٚستا وەستاون؟)
لە ژمارەیەکی تری ئەو رۆژنامەیەدا دەست ئەکا بە ژماردنی بیاوە ناودارەکانی کورد لە خیٚزانی شیٚخانەوە دەستپیٚدەکا (ئای لەو زۆڵیٚتیە......! هەر ئەو شیٚخانەبوون هەزار جنیٚویان پیٚدان و درۆ و دەلەسەیان بۆ هەڵبەستن)... دوای شیٚخان بەسەروباڵی جاف و پژدەر و مەنگور و هەمەوەند و زەنگەنە و تاڵەبانی و باجەلان و گەلیٚکی تردا هەڵئەدا و داوایان لیٚئەکا سلیٚمانی و دەوروپشتی لە زوڵمی تورکەکان رزگار بکەن.
لە ژمارە (١٩)ی مارتی ١٩١٨دا ئەلیٚ:
(ئەم شەرە هەر ئەبریٚتەوە، ئەوسا ناوی عەرەب و ئەرمەن و جوولەکە لە ناو

معاهەدەی سولحدا زیکر ئەکرێ، چونکە ئەمانە لەم شەڕەدا هەموویان سەریان بەرز کردەوە و داوای حکومەتیان کرد، ئەما کوردەکان هەتا ئێستا هیچیان نەکرد!! دیارە خۆیان حاکمیتیان ناوێ چونکە ئەگەر بیانویستایە هەرایەکیان ئەکرد و بە قسەی تورکەکان تەفرەیان نەدەخوارد، کورد ئەبێ لە ئێستاوە پەلە پەل بکەن بۆ ئەوەی لەناو موعاهەدەی سولحدا ناویان هەبێ...... وەکو دەبینن حکومەتی ئینگلیز زۆر کوردانی خۆش ئەوێ چونکە لە هەموو دەوڵەتەکانی تر زۆرتر ئەیان ناسیت، موحتەمەلە کە زۆر یاریدەیان بدات...... ئەمّا کە ئەوان وسکت بن، تەبیعی دەخلی بەسەریانەوە نامێنیت و لە پاشدا زەرەرێکی زۆر ئەکەن).

لە ژمارە (۱۹) شوباتی ۱۹۱۸دا ئەفسەر و سەربازە کوردەکانی ناو سوپای عوسمانلی هان ئەدا کە بدەنە شاخ و داوایان لێ‌ئەکا پێوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکەن و ئەڵێ:

(ئێمە، روو ئەکەینە رەنجبەر و فەقیران، چونکە ئەزانین دەوڵەمەندان بە نانی خۆیان گەیشتون و رۆحی خۆیان زۆر خۆش ئەوێ و خۆیان نە بە قەومی کورد و نە بە دونیا ناگۆڕنەوە، ئەی کورد، ئەی برایانی فەقیر و رەنجبەر، خۆتان چاک ئەزانن کە ئەرزی کوردستان هەمووی شاخ و داخە عەسکەری غەریب رێی تێدا چاک دەرناکا. ئەگەر کورد سلاحی خۆیان بهێنن و هەموو یەک‌بن ئەتوانن هەرایەکی گەورە بەرپابکەن).

لە ژمارەیەکی تردا رووئەکاتە گەورە پیاوانی و ئەڵێ:

(گوناحی فەقیر و هەژاری کورد هەمووی بە ئەستۆی ئێوەیە، ئەگەر مەنفەعەتی شخصی خۆتان بە فائدەی عومومی کورد و کوردستان بگۆڕنەوە ئەو قەومەی بە هجومی بابل و ئاشور و میدی و فورس و حکومەتانی تر بە فەنا نەچوە لە ناوی ئەبەن).

ئای لەو هەموو زۆڵێتی و بلۆف و سابوون لەبەرپێدانە...... ئەو کەسەی لەو رۆژەدا ژمارەیەکی ئەو رۆژنامەیەی بخوێندایەتەوە کە ئۆرگانی ئینگلیزەکان بوە لە بەغدا وای ئەزانی ئینگلیز سەربەستی پەروەر و ئازادیخواز ئەو هەموو

ئەفسەر و سەربازانەی لەبەر خاتری چاوی گەلە چەوساوەکانی ژێر دەستی عوسمانلی بردە بۆ ناوچەکە...... بەڵام زۆری پێ نەچوو رەفتارەکانی مێجرسۆنی حاکمی سیاسی سلێمانی و ئەفسەرەکانی تری ئینگلیز لەناوچەکانی بادینان و رەواندوز و ئاکرێ و ناوچەی سوورچیەکاندا دەریخست کە ئەوانە هەمووی بۆ دەس‌برین بوە و ئەو هەموو پروپاگاندانە بۆ ئەوەبوە هەستی کورد بجزوێنن و هیوایەکی خۆرایی لە دڵ و مێشکیان جیگیر بکەن و بۆ ئەوەی بتوانن کوردیش وەکو ئەو سەربازی سیک و گورگەی کە لە هیندستانەوە بە کێشیان کردبون، کوردیش بکەن بە کوتەکی دەستی خۆیان و بەگژ تورکیا بکەن...... ئینگلیز لەو رۆژنامەدا بە ئاشکرا داوا لە کورد ئەکا بە چەکی خۆیەوە بچێتە کۆری شەرەوە بەبێ ئەوەی دان بەوە دابنێت کە ئامادەیە هیچ جۆرە یارمەتیەکی بدا......

لە راستیدا بۆیە باسی ئەو رۆژنامەیەمان بە دوور و درێژی کرد بۆ ئەوەی بۆ خوێندەوارانی روون بکەینەوە و ئاگاداری ئەوەیان بکەین کە شێخ مەحمود وەنەبێ کابرایەکی گەمژە و نەزان بووبێ و نەیویستبێت سوود لە دەرفەت وەربگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو رۆژانە زۆر کوردی تورکخواز هەبوە کە بە هیچ جۆرێک پێیان خۆش نەبوە لە ئینگلیزەکان نزیک ببنەوە و ئەگەر بە دەستیان بوایە رێگەیان لە شێخ مەحمود ئەگرت کە پێوەندی بە ئینگلیزەکانەوە نەکا. بەڵام شێخ مەحمود نەیویستوە ئەو هەلەی ئەو رۆژانە لە کیس خۆی و لەکیس میللەتەکەی بدا وەکو لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین ئینگلیزەکانی بەبێ کێشە و هەرا و خوێنرشتن و بە شێوەیەکی ئاشتی هێنایە کوردستان بەڵام کە بۆی دەرکەوت ئینگلیزەکان ئەیانەوێ وەکو نۆکەرێکی بەکرێ گرتە سەیری بکەن ناچار بوو رووبەروویان ببێتەوە و داوای مافی رەوای میللەتی کوردیان لێ‌بکات.

بە کورتی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بە کورد سیاسەتێکی دووڕووانەبوە...... لە سەرەتادا بۆ رواڵەت و بۆ جێ‌پێ قایمکردنی خۆیان بلاویان کردەوە کە ئینگلیز دۆستی کوردە و بۆ ئەوە تێدەکۆشێ کە کورد لە جەور و ستەمی تورک رزگار بکا.

رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی کە ئۆرگانی دەسەلاتدارنی ئینگلیزی داگیرکەری

ئەو رۆژانە بوە لە میسوپۆتامیادا و ئەو نووسینانەی کە دەربارەی کورد بلاوی ئەکردەوە، زۆر بە ئاشکرا دەری ئەخا کە چۆن هەسانیان لەبەرپێی کورد ئەدا بۆ ئەوەی دژی تورکەکان راپەرن و (کە هێشتا تا ئەو دەمە شەڕ نەوەستێنرابوو ریکەوتنی مودراس مۆر نەکرابوو هێزەکانی ئینگلیز نەگەیشتبوونە شاری موسل) لە کوردستان دەریان کەن و خۆیان بە ئاسانی دەستی بەسەرا بگرن.

مەبەستی ئینگلیز لەو پروپاگاندانەی کە ئەیکرد بۆ بزواندنی کورد و جولاندنی هەستی نەتەوایەتی لەناویاندا لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەم: بۆ ئەوەی کوردەکان لە خۆیان نەئالۆزێنن و خۆیان واپیشان بدەن کە وەکو فریشتیەیەکی رزگارکەر لە رزگارکردنی کورد بەولاوە هیچ مەبەستێکی تریان نەبوە و ئینگلیز دۆستێکی راستەقینەی کورد ئەبێت لە دوارۆژدا.

دوهەم: بۆ ئەوە بوە کەوا لە تورکەکان بگەیەنن کە نەک تەنها ئینگلیزەکان کە ئەیانووت دانیشتوانی میسوپۆتامیا ئەیانەوێ لە تورک جیاببنەوە، بەڵکو کوردیش کە زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتی موسلیان پێک ئەهێنا قایل نین بە هیچ جۆرێک لە ژێردەسەلاتی عوسمانلی و تورکدا بمێننەوە.

بێگومان وەکو لە دواییدا بۆمان دەرئەکەوێ سیاسەتی ئینگلیز لە پێکهێنانی حوکمدارێتی شێخ مەحمود تەنها بۆ ماوەیەکی کاتی بوە و هەر بۆ ئەوە بوە تورک ناچار بکەن دەس‌بەرداری ویلایەتی موسل بێت.

دوای ئەوەی ئینگلیزەکان توانیان وا لە تورک بکەن واز لە ویلایەتی موسل بهێنیت و هەردولا بە (هێڵی بروکسل) قایل بون کە بکرێ بە سنووری عێراق و تورکیا بەرامبەر بەو بەڵێنەی ئینگلیز بۆ تورکەکان کە لە دوای ئەو رێک‌کەوتنە ئیتر حسابی شێخ مەحمود تەواو ئەبێ و کوردستان ئەلکێنرێت بە عێراقەوە، کە ئەمانە جێ‌بەجێ کران ئینجا ئینگلیزەکان بە ئاشکرا بە شێخ مەحمودیان وت: ئیتر هەمووشتێک تەواو...... ئێوە دەورتان نەما...... چارنییە ئەبێ بچنە ژێر باڵی شا فەیسەڵ و بە عێراق و عراقچێتی قایل بن و ئەگەر ئەتەوێ لەماڵ و مولکی تایبەتی خۆت بێ بەش نەکرێی ئەوا بێدەنگ دانیشە و بە پێچەوانەوە بە هێزی فرۆکە پانت ئەکەینەوە......

بەرامبەر بەوە شێخ ڕێگەی خەباتی گرتەبەر ئەگەرچی تەقەلاکەی سەری‌نەگرت، بەلاّم وەکو شۆڕشگێڕێکی نەبەردی کۆڵنەدەر چوە مەیدانی خەباتێکی سەختەوە بەرامبەر بە گەورەترین هێزی سەرزەمینی ئەو ڕۆژانە.

## ٥- پێوەندی کورد و ئەرمەن

---

کورد لە کۆنەوە پێوەندی بە میللەتی ئەرمەنیەوە بوە ئەگەرچی چ لە کوردستانی تورکیا و چ لە کوردستانی ئێراندا، چ عوسمانلی و چ ئێران هەولیان داوە هەستی ئایینی کورد بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان بۆ سوودی خۆیان بەکاربهێنن و روسی قەیسەری و دەوڵەتە بێگانەکانی تریش تەقەلایەکی زۆریان داوە کە هەستی کر ستیانی ئەرمەنی بەرامبەر بە کورد بەکاربهێنن بۆ سوودی خۆیان.

بە تایبەتی کوردستانی تورکیا، کە میللەتی کورد بە هۆی عوسمانلی‌یەکانەوە بە خۆرایی وای‌لیٚ کرابوو کە بەشداری بکا لە شەری جیهانی یەکەمدا و کورد لە دەوڵەتی عوسمانلی‌دا وەکو سەرباز بە زۆر بەکێش کرابوون بۆ شەری ڕووبەرووی روسی قەیسەری کە لەو شەرەدا ئەرمەنیەکان هاوکاری رووس بوون، لە ئەنجامی ئەوەدا کورد و ئەرمەن لە زۆرشوێندا لەو شەرەدا بە خۆرایی ڕووبەرووی یەکبوونەوە بە تایبەتی سوارەی حەمیدییە کە تورکەکان بە زۆری لە کوردەکان پێکیانهێنابوو هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ نێگەرانی کورد و ئەرمەن لەیەکتری ئەگەرچی سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردیش لەو نارێکیەدا لە کوردستانی تورکیا دەورێکی خراپیان دیبوو لە ئەنجامی هاندانی عوسمانلی‌یەکان، بەلاّم وەکو لاپەرەکانی مێژوو ڕوونی کردۆتەوە، دەرکەوتوە کە هۆی ئەو نارێکی و کوشتارانەی کە ڕوویداوە بە هۆی ڕەگەزپەرستی عوسمانلی‌یەکانەوە بوە و ئەرمەنیە ڕۆشنبیرەکان و مێژووناسەکانیان لە دوای شەری جیهانی لە زۆر باس و نوسینیانا ڕوونیان کردۆتەوە کە هۆی ئەو تاوان و کوشتارەی لە ئەرمەنی کرابوو بە هۆی کاربەدەستانی عوسمانلی‌یەوە بوە نەک بە هۆی کوردەکانەوە وەکو لە

شوێنی خۆیدا ڕوونی ئەکەینەوە لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا، لەم بەرگەدا لە باسی پێوەندی کورد و ئەرمەن سەرچاوەیەکی تازە لەو ڕووەوە ڕوونی ئەکاتەوە کە چۆن تورکە عوسمانلی‌یەکان هەولیان داوە هەر لە کۆنەوە نێوانی کورد و ئەرمەن بۆ سوودی خۆیان بەکاربهێنن.

لە گۆڤاری (کاروان)ی ژمارە (٦٨) ئەیلوولی ١٩٨٨ چاپی بەغدا بە پێنووسی ئەحمەد ئیسماعیل بەرزنجی باسی کتێبۆلکەیەک ئەکا بە قەبارەی (١٥) لاپەرە بە ناوی (کورد لە کەیەوە خەریکە) بلاوکراوەتەوە.

ئەو کتێبولکەیەی کە لەو گۆڤارەدا باسی کراوە لە بلاوکراوەکانی (قوتابخانەی لاوی کورد- ژمارەی یەکەم) کە لەلایەن عەلی عرفانەوە بلاوکراوەتەوە و هەر بە ئیملای ئەو ڕۆژانە نوسراوە کە سالی ١٩٢٧ بوە.

عەلی عیرفان لەو نامیلکەیەیدا تەرجەمەی باسێکی (ڕوبین پاشا)ی ئەرمەنی بلاوکردۆتەوە کە ڕوبین پاشا لە سالی ١٩٢٥ دا نووسیوێتی و لە ڕۆژنامەی (ترۆشاک)ی ئەرمەنی ژمارە (٢٤٣) لە شاری جێنێوا لە ئیتالیا بلأوکراوەتەوە.

ئەوەی شایانی باسە دوکتۆر کەمال مەزهەریش لە کتێبەکەیدا (کوردستان لە سالەکانی شەری جیهانی‌دا«٧» باسی ئەو ڕۆژنامە ئەرمەنیەی کردوە کە ئۆرگانی (تاشناق)یەکان بوە و سەرۆکی تاشناقیەکان لە سالأنی نەوەدی چەخی نۆزدەهەمدا لەگەلٚ عەبدولرەحمان بەدرخان لە جنێڤ کۆبونەتەوە و دەربارەی یەکگرتن و هەولی هاوکاری کورد و ئەرمەن دواون و عەبدولرەحمان بەدرخان لەو ڕۆژنامەیەدا بە زمانی کوردی و بەپیتی عەرەبی وتارێکی بلأوکردۆتەوە و ئیسماعیل حەقی شاوێسی نیشتمانپەروەری کوردیش هەندی نوسراوی لەو ڕۆژنامەیەدا بلاوکردۆتەوە.

لەبەر گرنگی ئەو کتێبۆلکەیەی کە عەلی عیرفان چاپی کردوە و لە سالی ١٩٢٧دا بلاوی کردۆتەوە حەزم کرد بە دووروودرێژی باسەکەی بخەمە بەرچاو.

عەلی عیرفان لە نامیلکەکەیدا ئەلی:

(ئەم مقالەیە عائد بە کوردایەتی‌یە، بە واسطەی ڕەفیقێکی خۆشەویستی ئەرمەنیەوە کراوە بە تورکی و منیش لە تورکی‌یەوە ئەیکەم بە کوردی).

عەلی عیرفان لە پێشەکی نامیلکەکەیدا ئەلێ: (هەر بە ئیملاتێکی خۆی بلاۆی ئەکەمەوە کە چۆن لە گۆڤاری کارواندا بلاوکراوەتەوە):

[رجا ئەکەم هەموو لاوان و میللەت پەروەرانی کورد بە دیقەت تەماشای ئەم سێ چوار پەرە قسانە بکەن، بزانن پیاوێکی ئەجنەبی چۆن مەسائیلی کوردایەتی ئەزانی و لە جێگایەکی دوورەوە نشری ئەکات، مع مافیە ئێمە طبیعی لەوان زیاتر ئەبی هەموو مەسائیلێکی وەتەنەکەمان بزانین بۆ خاتری لەفکر نەچێتەوە].

کورتە باسەکەی (روبین پاشا) دێتە سەرئەوەی کە عەلی عیرفان باسی کردوە و ئەلێ:

(ئێستا ئەوی زیهنی تورکەکان ئیشغال بکات مەسەلەی کوردەکانە چونکە کوردەکان خەباتی رزگاری و سەبەرخویی دەکەن و ئەو تۆمەتانەش رەت دەکاتەوە کە گوایا جولانەوەکەیان بە هاندانی لایەنە بێگانەکانە.....

من وائەزانم ئەمە ئەسلی نییە چونکە میللەتەکانی تر لەژێر زوڵم و ئیستبدادی تورک نەجاتیان بوو کوردەکانیش ئەیانەوێ خۆیان رزگار بکەن، سیاسەتی تورکەکان لەگەڵ کوردەکاندا وەیا بەرامبەر ئەوان هەر ئەوەبوو کە بەرامبەر نەتەوەکانی تر بەکاریان دەهێنا و زیاد لەمەش میللەت و عەنعەناتی خۆیانیان لە فیکربەنەوە و لەگەڵ تورکەکانی وەسەطی ئاسیادا ئیرتیباط پەیدا بکەن و ببن بە یەک و ئەو میللەتانەی کە لە لەبەینیان دان محویان بکەنەوە. بەرامبەر بەمە کوردەکان کەوتنە خۆیان تانەتوینەوە، سیاسەتی تورکیا لەوەدابو چونکە ئەم دوو نەتەوەیە (کورد و ئەرمەن) خاکەکەیان لەپاڵ یەکدابوو بۆیە بەیەکجار نەیانتوانی پەلاماری هەردوکیان بدەن و بە تەواوی ژێردەستەیان بکەن لەبەر ئەوە بە واسیتەی مەعنەویاتەوە دوژمنایەتی خستبوە بەینیانەوە، بەم سەبەبە موفق بوو بەعزێ ئەرمەنی لە عەلەیهی کورد و بەعزێ کورد لە عەلەیهی ئەرمەنی تحریک ئەکرد و فەسادیکی گەورەی خستوتە بەینیانەوە، دەولەتی عوسمانلی هەربەوەشەوە نەوەستا بەلکو هەتا لە بەینی کوردەکاندا دیسانەوە بە واسطەی تەفرەقەی مەزاهیبەوە عەداوەتیکی گەورەی خستبوە بەینیانەوە).

روبین پاشا لە باسەکەیدا ئەلێ: (بەدرخانیەکان زۆر تەرەقیان کردبوو لەناو

کوردەکاندا و خانەوادەیەکی موقەدەس بوون و لە هەموو کوردێک زۆرتر بۆ جیابوونەوە لە تورک و بۆ ئیستیقلال سەعیان ئەکرد. تورکەکان فەرقیان بەمە کرد و دەسبەجێ سیاسەتێکی زۆر بە شیدەت لە عەلەیهیان تعقیب کرد و ئەم سیاسەتە لە سالی ١٨٤٥ هەتا سالی ١٨٦٥ دەوامی کرد، نتیجە قسمێکی زۆر لە عائلە گەورەکانی کورد هیجرەتیان پی‌کرا بۆ قەفقاس و تورکەکان حکومەتەکانی ئەوروپایان وا تی‌گەیاندبوو کە کوردەکان زۆر ئەزیەتی ئەرمەنی ئەدەن بۆیە نەفیان ئەکات. کە ئەرمەنی‌یەکان بۆ تأمینی ئیستقلال نمایشیان کرد، تورکەکان هەست بەم جموجۆلە ئەکەن و سیاسەتیان وەرگیرایە عەلەیهی ئەرمەنیەکان و کوردەکانیان کرد بە ئالەت و هوزە کوردەکانی چەکدار کرد کە زولم لە ئەرمەنیەکان بکەن و ئەم سیاسەتە هەتا سالی ١٨٨٠ دەوامی کرد. نتیجە تورکەکان ئەرمەنیەکانیان بە کورد زەعیف و بی‌قوەت کرد.

لە دوای محاربەی روس لە معاهدەی (برلین)دا موافقی (٦١) لە خسوس ئەم مسئلەیەوە کوردەکان مسئول کران و تورکەکانیان سەربەست کرد کە تەجزیەی کوردەکان بکا و ئینتیقامی ئەرمەنییان لی‌بسێنێت. بەو جۆرە ئیمجارە تای تەرازوی کورد لە سیاسەتی عوسمانلی‌دا سەری کرد و سووک بوو)

نووسینەکەی روبین پاشا لەوەدا رەخنە لە کورد ئەگرێ کە ئەلێ عوسمانلی‌یەکان کە لەناو کوردەکاندا سوارەی حەمیدی‌یان دانا گەورەکانیان کردن بەسەرکردە ئیتر بەوە لە خۆیان بایی بون و لەناو میللەتەکەی خۆیاندا دەستیان کرد بە دەسدرێژی و مسائیلی میللی خۆیان لەبیرچوەوە کە ئەمە زەرەرێکی زۆری بەخشی بە کورد و بە ئەرمەنی.

کە شەری جیهانی دەستی‌پی‌کرد تورکەکان بریاری لەناوبردنی ئەرمەنی‌یاندا و زیانێکی زۆریان بە ئەرمەنیەکان گەیاند و لەو کوشتارانەی کە روویدا کوردەکانیشی گرتەوە.

لەگەلْ ئەوەشدا لە پەیمانی سیڤەردا بەلێن درابوو کە سەربەخۆیی بدرێ بە کورد و ئەرمەن بەلام سەری‌نەگرت و دوبارە کورد کەوتە هەلەیەکی تروە کە بە هاندانی تورکەکان دیسانەوە نێوانی کورد و ئەرمەنی و ئاسووری تێکچوو).

نوبار پاشا له باسەکەیدا له هەڵوێستی دەوڵەتێکی ئەوروپایی سەری‌سوور ئەمێنێت و ئەڵی:

(نازانم لەبیّ طالعی کوردەکان بوو یاخود لەبەر سیاسەتێکی تربوو که ئومید نەدەکرا فەرەنسیەکان له جیاتی ئەوەی یارمەتی کورد بدەن کەچی به پێچەوانەوه یارمەتی تورکیان دا).

نووسەر رەخنه له هەموو دەوڵەته ئەوروپاییەکان ئەگریّ که بەرامبەر بەو تاوانانه هیچیان نەکرد و رەخنەش لەسەرکردە کوردەکان لەوەدا ئەگریّ که له بۆچوونیاندا دەربارەی سیاسەتی تورک به هەڵەداچوون».

له بەرگی دووهەمدا، له کۆنگرەی ئاشتی و تەقەلای شەریف باشای خندان باسی قۆناخێکی نوێی هاوکاری و دۆستایەتی کورد و ئەرمەن ئەکەین که چۆن هەردولایان نارێکیه کۆنەکانیان خستەلاوه و دەستیان بۆیەکتری درێژکرد و دوکومێنتەکانی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا باسی ئەو پێوەندی‌یەیان کردوه به تایبەتی له راپۆرتی مەندوبی سامی بەریتانیا له ئەستەمبول بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا له دۆکۆمێنتی ژمارە: Fo. 371- 5068 و رۆژی ٣/مایس/ ١٩٢٠.

## ٦- پێوەندی کورد و وڵاتان و میللەتی تر

---

جگه لەو دەوڵەتانەی باسمان کردن، هەندیّ دەوڵەتی سەرمایەداری تریش هەبوه که هەریەکەیان له قۆناغێکدا و هەر یەکەیان به جۆرێک هەولی داوه دەسەڵاتی خۆیان له کوردستاندا بچەسپێنن و بازارەکانی کوردستان والیّ‌بکەن هەمیشه دەرگای کراوەبیّ بۆ کاڵا و بەرهەمەکانی خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن به ئاسانی کەرەسەی خاوی هەرزان و تالان بکرن.

دەربارەی پێوەندی ئەمریکا به کوردستانەوه لازاریف ئەڵی:«٢٥»

(وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا که به تەمای ئەوەبون جیّ‌پیّ‌ی خۆیان له

کوردستاندا قایم بکەن، لە ساڵی ۱۸۹٥دا بە بیانووی کوشتنی (لینسی) ئەمریکاییەوە، قونسوڵخانەیەکیان لە ئەرزەروم کردەوە و خۆیان کۆکردەوە کە قونسوڵخانەیەکیش لە (خربوط) بکەنەوە. تورکەکان بەربەرەکانی ئەو تەقەلادانەی ئەمریکاییەکانیان کرد بەڵام ئەمریکا گوێی نەدایە و پرۆفیسۆر (نۆرتۆن)یان کرد بە قونسولی خۆیان لە (خربوط).

کەساتێک تورکەکان رێگەیان لە هاتنی نورتۆن گرت ئەمریکا بۆ دەربرینی زەبر و زەنگی خۆیان پاپۆرێکی جەنگی (کەنتاکی)یان نارده بەندەری ئەزمیر و تورکیان ناچارکرد مل بۆ قبولکردنی ئەو قونسولە دانەوێنیت.

ئەمریکاییەکان بێجگە لەوە هەولیاندا بە هۆی ئەو میسونیرانەی کە ناردبویانە ناو ئاسووری‌یەکانەوە دەسەڵاتی خۆیان بەناو کوردستاندا بڵاویکەنەوە کە بوونی ئەو میسونیرانە لە کاتی شەری جیهانیدا بوو بە هۆی کوشتارێکی زۆر).

هەروەها لازاریف ئەڵێ:

(ئەڵمانیەکانیش لە دوای شەری روسیا و ژاپۆن کە بۆیان دەرکەوت روس و ئینگلیز خەریکن لەیەک نزیک ئەبنەوە ئەوانیش هەولیاندا دەسەڵاتی خۆیان بەناو ئیمپراتۆرێتی عوسمانلی‌دا پەرەپێبدەن و بۆ ئەوە هەموو جۆرە رێگەیەکیان گرتەبەر. لە ساڵی ۱۹۰٦دا ژمارەیەکی زۆر لە نێرراوانی ئایینی و زانایانی ئەڵمان لە ویلایێتی بەتلیس‌دا سەریان دەرهێنا و کەوتنە گەشت و گەران بەناوچەکەدا)

لازاریف لە زمانی (شێرکۆف)ەوە ئەگێرێتەوە و ئەڵێ:

(لەپێش هەرا و شۆرشی ئەرمەنیەکان ساڵی ۱۹۰۳- ۱۹۰٤ لە (ساسون)وە بەر لە هاتنی یەکەم قونسولی روس بۆ (بەتلیس) لە بەهاری ۱۹۰٤دا پێش گەیشتنی ئەو نێرراوانە تا ئەو سەردەمە هیچ نیرراوێکی ئەڵمانی لەو ناوچانەدا نەبینرابوون، کەچی لە هاوینی ئەو ساڵەدا لە پر پەیدابون و چالاکی‌یان لە ناوچەی بتلیس‌دا هەتا ئەهات پەرەی‌ئەسەند و کاربەدەستانی تورکیاش پشتیان ئەگرتن و ورده ورده لە کوردستانی ئێرانیشدا سەریان دەرهێنا.

دوکتۆر (گوگە گرۆتی) کە نوسەرێکی ئەڵمانی و شارەزای رۆژهەڵاتی نزیک بوە لە تشرینی دوهەمی ساڵی ١٩٠٧دا سەری لە کرماشان داوە و بەرلەوە لە موسلیشدا ژیاوە. لە کوردستانی ئێراندا تەقەلایەکی زۆری دابوو سەرنج و هەواڵ و دەنگ و باسێکی پڕ لە زانیاری دەربارەی عەشیرەتە کوردەکان کۆکردەوە و تۆماری کرد

وردە وردە چالاکی‌یەکانی ئەڵمان لە کوردستاندا ئاشکرابوو کە بۆ دژایەتی روس بوە و بۆ بەربەرەکانی دەسەڵاتی بوە لە کوردستاندا.

ئەڵمانەکان ویستیان کوردستان بکەن بە بنکەیەکی بەهێز بۆ دوارۆژی خۆیان، بۆ ئەوەی لەوێوە پەلاماری روس بدەن.

لەو روەوە قونسولی گشتیی روسیا لە (حەلەب) کە ناوی (ئا. کروگلۆف) بوە نوسیویێتی: یەکەم هەنگاوی گرنگی ئەڵمانەکان لە موسلدا ئەوە بوو دەسەڵاتی خۆیان بەناو تورکیادا بڵاوبکەنەوە و نێوانی ئێمە و تورک شلۆق بکەن و ئەڵمانەکانیش وەکو ئینگلیزەکان هەولیان دا ئیسترسواری حەمیدیەی عوسمانلی رێک بخەن و بە هێزی بکەن).

دوکتۆر کەمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا (کوردستان لە ساڵەکانی شەری یەکەمی جیهانی‌دا) ئەلێ:«٧»

(ئەلمانەکان لە کاتی شەردا کەوتنە بایەخدان بە کوردستان، بە تایبەتی کە لەو کاتانەدا خاکی کوردستان ببوە مەڵبەندی شەر و لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا هەولێکی زۆریان‌دا بەیاننامە و چاپەمەنیەکانی پان ئیسلام بە هەموو کوردستانی ئێراندا بڵاوبکەنەوە بۆ ئەوەی هەستی کوردە موسوڵمانەکان بەلای عوسمانلی‌دا داشکێنن و دژی روس بن. بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەک لە جاسوسە بەناوبانگەکانیان وەکو (شیونمان) و (لیتێن) و هەندێکی تر بە گەرمی کەوتنەکار.

تەقەلاکانی ئەڵمان لەم روەوە بێ‌ئەنجام نەبوو چونکە لە ناوچەی کرماشان سەرۆکی عەشیرەتە کوردەکان هەتا ساڵی ١٩١٦ توانیان پێوەندی روس بە لەشکری ئینگلیزەوە کە گەیشتبونە خوارووی عێراق بپچرێنن، ئەڵمانەکانیش بە

ناوی غەزاوە کوردەکانیان هان‌ئەدا کە دژی روس و ئینگلیز شەر بکەن و ئەوانیش وەکو ئینگلیزەکان بلاویان ئەکردەوە کە زۆرکەسی ئەلمانی بوە بە ئیسلام هەتا غیلیومی قەیسەری ئەلٚمان خۆشی بوە بە ئیسلام و بۆ پروپاگاندە هەندێ جار پیٚ‌یان ئەوت: محەمەد ولیم.

لازاریف لەم روەوە پرسیارێک ئەکا و ئەلێ:

(بۆچی ئەلٚمانەکان لە کوردستاندا زۆر بە توند و تیژی بەرامبەر بە ئینگلیز نەوەستان و چالاکی سەرەکی خۆیان لە کوردستاندا دژی روس تەرخان کردبوو؟ لە وەرامی ئەو پرسیارەدا ئەلێ: چونکە ئەلٚمانەکان لایان وابو روس تاقە ولاٚتێکە بتوانێت بە خێرایی و سەرکەوتوانە دەسەلاٚتی خۆی بەسەر کوردستاندا بلاٚوبکاتەوە و ڕووبەرووی ئەلٚمان بوەستێت لەو ناوچەیەدا، لەبەر ئەوە بە زۆری بەربەرەکانی خۆی بە شێوەیەکی تایبەتی دژی روس تەرخان کردبوو.

جگە لە ئەمریکایی و ئەلٚمانەکان، فرانسیەکانیش لە مێژبوو هەوڵیان ئەدا پیاوە ئایینەکانیان بنێرن بۆ کوردستان و بە هۆی ئەوانەوە بتوانن جیٚ‌ی پیٚی خۆیان لە کوردستاندا قایم بکەن.

بەلاٚم فەرەنسیەکان زۆرتر بایەخیان بە جموجۆلی سیاسی ئەدا و لە هەمووشتێک زۆرتر بەرامبەر بە سیاسەتی بەریتانیا بێزاربون لە ناوچەکەدا.

شەریف پاشای خەندان کە ساتێک سەفیری دەولٚەتی عوسمانلی بوە لە (ستۆکهۆلم) هەولی داوە پێوەندی لەگەلٚ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسەدا پەیدابکا بە ئومێدی ئەوەی بەلێنێکیان لیٚ‌وەرگرێت دەرەبارەی مافی کورد و لە فەرەنسیەکانی گەیاند کە ئامادەیە کورد والیٚ‌بکات یارمەتی هێزی سوێندخواران بدەن لە کاتی شەردا بە مەرجێک لە دوای سەرکەوتن بەسەر عوسمانلی‌دا کوردستانێکی سەربەخۆ دروست بکرێت.

بەلاٚم فەرەنسیەکانیش هەروەکو ئینگلیز هەمیشە بە دوای سوودی خۆیان گەراون و ئەگەر بەلێنیشیان دابێت تەنها بۆ مەبەستێکی کاتی بوە، بۆیە ئەو تەقەلایەی شەریف پاشا وەکو تەقەلاکانی تر سەری‌نەگرت.

١- کوردو کوردوستان لە پەیمانی سایکس پیکۆدا.

٢- شەری یەکەمی جیهانی و دەوری کوردو شێخ مەحمود لەو شەرەدا.

٣- پەیوەندی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزدا لەدوای وەستاندنی شەری جیهانی.

٤- مەبەستی راستەقینەی ئینگلیز لە هاتنیا بۆ کوردستان.

ا- چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی لە کوردستان و ناوچەکەدا.

ب- دەس گرتن بەسەر نەوتی کوردستاندا

٥- سەرەتای هاتنی ئینگلیز لەسەر داواکردنی شێخ مەحمود

٦- هاتنی میجر نوئیل بۆ کوردستان و دەوری میجر نوئیل

# کورد و کوردستان لە پەیمانی ــ سایکس پیکو ــ دا

زۆر کەس لەرۆژ هەلات ناسان و مێژونووسان دەربارەی پەیمانی سایکس پیکۆ نوسیویانە و دوکیومێنتی ناو ئارشیفی ئەو ولاتانەی کە بەشداری یان کردوە لەبەستنی ئەو پەیمانەدا پڕن لەچۆنیتی ساز کردنی ئەو پەیمانە.

لەگەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا کە دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەوسەردەمە ئاگری شەڕەکەیان بۆ ئەوە نابوەوە کە هەرلایە بۆ خۆی دەست بگرێ بەسەر زۆرترین بازاری جیهاندا و شوێنە ستراتیژیەکان لەژێر سایە ودەسەلاتی خۆیدابێ کە بێگومان بەشی زۆری ئەوشەڕە لە سەرلاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بوە کەلەرۆژانەدا سەرەتای دارزیویی و هەڵوەشاندنی دەستی پێ کردبوو ، دەوڵەتە سەرمایەدارو دەس رۆیەکانی ئەوسەردەمە بۆ ئەوەی لەدوارۆژدا لە سەر بەشە میراتی ئەو ئیمپراتۆریەتە لەدوای بڕانەوی شەر بەئاسانی لەناوخۆیاندا رێک بکەون ، بۆیە بەریتانیا و فرنسە و روسیای قەیسەری لە دوای وت و وێژێکی زۆرو بێنە و بەرەیەکی درێژ خایەن لە سەر پەیمانی سایکس پیکۆ رێک کەوتن و مۆریان کرد کەخاکی کوردستان بەشێک بوە ( ئەوەی ژێر دەسەلاتی عوسمانی ) لەو نەخشەیەی کە بۆ دابەشکردنی میراتی عوسمانلی نەخشەی کێشرابو .

باسی گفت و گۆوکەین و بەینی بەستنی ئەو پەیمانە دوروودرێژە و لێرەدا ئیمە تەنها ئەمانەوێ لەو بەشەی بدوێین کە پەیوەندی بە خاکی کوردستانەوە هەیە بۆ ئەوەی بزانین شوێنی کوردستانی ژێردەسلاتی عوسمانلی ئەو رۆژانە بەپێی ئەوپەیمانە چۆن بڕیار بوە دابەش بکرێت .

## چۆنێتی سازکردن و مۆرکردنی پەیمانی سایکس پیکۆ

لە نێوانی ١٥-١٧ مایسی ساڵی ١٩١٦ دا هێشتا جەنگی جیهانی یەکەم لە گەرمەی دا بوو که دوو دیپلۆماسی ئینگلیز و فرنسە ( مارک سایکس ـ نوێنەری ئینگلیز ) و ( جورج پیکۆ نوێنەری فەرەنسە ) پاش گفت و گۆو راوێژێکی دوورو درێژی پێشووتر گەیشتنە ئەوەی لەسەر پەیمانێک رێک بکەون کە لە دواییدا بە ناوی هەر دوکیانەوە ناونرا پەیمانی سایکس ـ پیکۆ.

بۆ رەزامەندی روسیای قیصری لە سەر ئەونەخشەیەی کێشرابوو بۆ ئەومەبەستە مارک سایکس و جورج پیکۆ چوونە شاری (پترۆگراد) و لەدوای گفت و گۆ لەگەڵ حکومەتی روسیای قیصریدا لەسەر ئەوپەیمانە رێک کەوتن و لە ئەنجامدا هەرسێ لا مۆریان کرد . ئەوەی لەو پەیمانەدا پەیوەندی بە کوردستانی سەربە عوسمانلی ئەو رۆژانەوە هەبوو بریتی بوو لە رێک کەوتنی خوارەوە:

١ـ ویلایەتی موصل ( بەشی خواروی کوردستان ) لەگەڵ ویلایەتی شام و حەلەب بەر فرنسیەکان کەوت .

٢ـ کوردستانی مرکزی ژوورو: بۆ روسیای قیصری دانرابوو بلاًم لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەر و کشانەوی سۆڤێەت لە شەری جیهانی و ئاشکرا کردنی پەیمانی ساکس پیکۆ و دەس بەردانی رووس لەو بەشەی لە کوردستانی ترکیادا بۆی دانرابوو گرێژەنەی ئەو پەیمانە تێکچوو وە ئینگلیزەکان توانیان ئەوپلانە درێژ خایەنەی کەبۆ ستراتیژی دوارۆژی خۆیان لەناوچەی رۆژ هەلاًتی ناوەراستدا دەس نیشانیان کردبوو جێبەجێیان کرد .

لە باسەکانی داهاتوودا ( بە تایبەتی لەپەیمانی سیڤەردا لە بەرگی دووهەمدا) باسی ئەوە ئەکەین بۆچی ئینگلیزەکان لەورۆژانەدا لەکاتی گفت و گۆی پەیمانی سایکس پیکۆدا بە ئاشکرا بایەخیان نەدابوو بە ویلایەتی موصل و هەر وا بەسووک و ئاسانی بۆ فەرەنسیەکانیان بە جێ هێشتبوو ، کە هۆی سەرەکی

ئینگلیز لەو نەخشەیەدا وەکو لە پەیمانی سایکس پیکۆ و لەپەیمانی سیڤەردا کێشابووی ئەوەبوو کە ئینگلیز نەی‌ویستوە سنووری دەسەلاتی خۆی لە هیچ شوێنێکدا لەگەڵ سنووری دەسەلاتی رووس لەیەک بدەن و جگەلەوە پلانی ئینگلیز لەوەدا بووە کە لەرێی فەرەنسیەکانەوە ویلایەتی موصل بۆ خۆی مسۆگەر بکا و بیخاتە سەر میسیۆپۆتامیا وەکوو لە شوێنی خۆیدا بە دوورو درێژی باسی ئەکەین.

لە دوای شەڕ، کە پەیمانی سایکس پیکۆ ئاشکرابوو و ئینگلیز و فەرەنسا هەر یەکەیان دەستیان بەسەر ئەو شوێنانەدا گرت کە لە سەری رێک کەوتبوون ، ئەمریکاییەکانیش کەوتنە خۆیان و بەدەسەلاتی فەرەنسییەکان رازی نەبوون بەسەر سوریا و لبنان دا ، بەلام ئینگلیزەکان پشتی فەرەنسییەکانیان گرتوو بە هۆی وازهێنانی روسیای سۆڤیەتی لە کوردستانی خواروی رۆژ هەلاتی تورکیا ئیتر ئینگلیزەکان ئەوترسەیان نەما ئەگەر دەست بە سەر ویلایەتی موصلیشدا بگرن نابن بە دراوسێی روسیا، لەبەر ئەوە ئینگلیز بە حسابە کۆنەکەیدا چوەوە و نەخشەیەکی تایبەتی کێشا بۆ ئەوەی ویلایەتی موصل لەدەست فەرەنسییەکان دەربێنێت (کە بێگومان هۆی سەرەکی بایەخدانی ئینگلیز بە کوردستانی خوارو نەک هەرتنها لەبەر ستراتیژیەتی شوێنەکەی بوو ، بەلکو لەبەر بوونی ئەو نەوتە زۆرە بوو کە ئینگلیزەکان زانیویانە لە کوردستان دا هەیە بەلام راستی‌ی ئەو بوونی نەوتەیان ئاشکرا نەکردوە و کە لەدواییدا ویلایەتی موسلیان لە فەرەنسا کێشایەوە و دەرکەوت نەوتێکی زۆر لە ویلایەتی موصلدا ئەوسا فەرەنسییەکان کێشایان بە دەستی خۆیانا بەلام تازە کار لە کار ترازابوو وەکو لە باسەکانی داهاتوودا لێی ئەدوێین.

دەربارەی پەیمانی سایکس پیکۆ و هۆی سازکردنی ئەو پەیمانە ، دوکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبەکانیا بەم جۆرە باسی کردوە :

(هۆی هەلگیرساندنی شەڕی یەکەمی جیهانی بە هۆی چاوچنۆکی دەولەتە گەورەکانەوەبوە بۆ دابەشکردنی جیهان کە کوردستانیش بەشێک بوە لە نەخشەی ئەو دابەشکردنە .

ئەلمانیا کە بەسەرزاری دۆستی دەولەتی عوسمانی بوو وەلەوشەرەدا عوسمانی

چونه پالْ ئەڵمانیا بە ئومێدی ئەوەی بە هێزی ئەوانەوە خۆیان لە دەوڵەتە سوێند خۆرەکان بپارێزن ، ئەو ئەڵمانیایە بەتەمای هەموو وڵاتی عوسمانی بوو، بەریتانیاش ولایەتی موصلی ئەویست بەلاْم لە دراوسێیەتی رووس ئەترسا ، روسیای قەیصەریش ئەگەر دەستی بکەوتایە هەموو کوردستانی بۆ خۆی ئەویست ، فەرەنساش جگە لە سوریا و لوبنان چاوی بڕیبوە ولایەتی موصل .

نامەیەکی( سازانوف)ی وەزیری دەرەوەی روسیای قەیصەری کە لە مانگی نیسانی ساڵی ۱۹۱٦ دا ناردویەتی بۆ باڵوێزخانەی فەرەنسا لە پترۆگراد بەم جۆرە باسی کوردستانی کردوە:

۱ـ ئەبێ ناوچەی ئەرزروم و تراپزون و وان و بەتلیس هەتا ئەو شوێنەی لە رۆژئاوای ترابزۆندایە لەسەر کەناری دەریای ڕەش هەموی بۆ رووس دابنرێت.

۲ـ ئەبێ ناوچەی کوردستان لە باشوری (وان) و بەتلیسدا، لەنێوانی مووش و سعرت و روباری دجلە و جەزیرەی ابن عومەر، خەتی لوتکەی ئەو شاخانەی بەسەر عمادیەدا ئەڕوانن لەگەڵ مەرگەوەڕ هەموی بۆ روسیا بەجێ بهێڵرێ. بەرامبەر بەوە رووس دان بەوەدا ئەنێ کە ئەو ناوچانەی کەوتونەتە نێوان(ئالەداخ) و قەیصەری و خەربوط بۆ فەرەنسە بێت.

۳ـ روسیا بە توند و تیژی بەرامبەر هەوڵی فەرەنسە ئەوەستێت وە نابێ هیچ بەشێک لە کوردستان (بەتایبەتی خۆر ئاوای ترکیا) بدرێت بە فەرەنسە.

ئەم مەرجانەی رووس داوای کردبوو هەموی بەر لە ڕێکەوتن بووە لەسەر ئەو پەیمانە، بەلاْم لەدواییدا لە ۱۹۱٦/٤/۲٦ دا ئەو پەیمانە لەنێوان روسیا و فەرەنسەدا مۆرکرا و ئینگلیزیش ڕەزامەندی خۆی پیشاندا و ڕێکەوتنێکی تری لەو جۆرە لە ۹و۱٦/۵/۱۹۱٦ دا لە نێوانی فرەنسە و بەریتانیادا مۆر کرا کە بەو دوو مۆر کردنە پەیمانی سایکس پیکۆ قاڵبی دوایی گرت.

بە پێی پوختەی ڕێکەوتنی هەر سێ لا، هەموو کردستانی باکور(کوردستانی ئیمرۆی ترکیا) بۆ روسیا دانرا.

ئینگلیزەکان حسابی ئەوەیان کردبوو کە ئەبێ هەموو کانی نەوتەکانی رۆژهەلاْتی ناوەڕاست و ڕێگەی گواستنەوەی نەوت هەموی لە ژێردەستی خۆیابێ، بۆ ئەوە هەوڵی دا بەشێک لە کوردستانی ئێرانیش بکەوێتە سنووری

دەسەڵاتیەوە چونکە ئەو بەشە بایەخێکی ستراتیژی زۆری هەبوو بۆ بەرژەوەندی ئینگلیز لە ناوچەکەدا ).

سەرچاوەی باسەکان هەموو لەسەر ئەوە یەکن کە هەرچەند وەکو نەخشەیەکی کاتی، وە وەکو تاکتیکێکی تایبەتی ئینگلیزەکان لە سەرەتادا و لەبەستنی پەیمانی سایکس پیکۆدا بەوە قایل بوون کە ولایەتی موصل بەر فەرەنسە بکەوێ بلاّم هەمیشە ستراتیژی ئینگلیز وابوە کە لە دواییدا ولایەتی مرصل بقۆزێتەوە و لەدەستی فرەنسەی دەربێنێت و تا ئەوسەردەمەی کە بڕیاربوە ئەرزروم بەر روسیای قەیصەری بکەوێ ئینگلیز ویستویەتی دوورەپەرێز بێ لە رووسەوە و سنووری دەسەلاّتیان لە یەک نەدا، بلاّم لەوەدا حسابی ئەوەی کردوە کە بەهێزی فەرەنسیەکانەوە لە دوا رۆژدا ئەتوانێ ولایەتی موصلی پڕ لە نەوت بۆ خۆی مسۆگەر بکات.

دکتۆر کەمال مەزهەر لە شوێنێکی تری باسەکەیدا ئەڵێ :

«لەدوای تەواوبوونی شەڕ و بۆ بەشکردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی، لە ئەستەمبوڵ کۆبونەوەیەک کرا کە بۆ باسی ولایەتی موصل تەرخان کرابوو. لەو کۆبونەوەیەدا نوێنەری تورکیا بە ئینگلیز ئەڵێ، لە پەیمانی سایکس پیکۆدا کە ئێستە ئێوە ئەتانەوێ جێ بە جێ ی بکەن، لەوەدا موصل بۆ فەرەنسە دانراوە، لەبەر ئەوە داواکردنی ولایەتی موصل لەلایەن ئێوەوە خۆی لەپەیمانی سایکس پیکۆ دوور ئەخاتەوە و شتێکە ئەو پەیمانە نایگرێتەوە بلاّم (سێر برسی کۆکس)ی نوێنەری ئینگلیز لەو کۆبونەوەیەدا بە ئاشکرا و بە بێ پێچو پەنا وەرامی نوێنەری تورک ئەداتەوە و پێی ئەلێ کە ساتێک پەیمانی سایکس پیکۆ مۆرکرا، ئەوسا روسیا هاوپەیمان بوو بەریتانیا نەی ئەویست هاو سنوور و دراوسێی رووس بێت، بلاّم ئەوا رووس خۆي کێشایەوە و بەوە لە هاوبەشی دەرچووە بۆیە ئێمە لە ناو خۆمانا ئەوی ماوینەوە لەسەر بڕیارەکانی ئەو پەیمانە رێک ئەکەوین.ئەوەبوو لە دواییدا فەرنسییەکان دانیان بەوەدانا کە ولایەتی موصل بەر بەریتانیا بکەوێ»

بەو جۆرە کشانەوەی سۆڤیەت لە پەیمانی سایکي پیکۆ وە کشانەوەی هێزەکانی لەو هەرێمانەی کە داگیری کردبوو بەپێی ئەو رێکەوتنەی کە

هەردوولایان لە ۱۹۱۷/۱۲/۲۲ دا بەناوی پەیمانی (بریست لیتوڤیسک) مۆریانکردبوو بوو بە هۆی گۆڕینێکی ئێجگار گرنگ لە ترازووی هێزی دەوڵەتە دەسەلاتدارەکانی ئەورووژانەدا کەدەستیان بەسەرناوچەکەدا گرتبوو وە بەو گۆڕینە پاشەرۆژی کوردیش کەوتە بارودۆخێکی تازەوە، کە تەڵەکەبازیی ئینگلیز و بوونی نەوت لە کوردستاندا ( وەکو لە باسێکی تایبەتی دەربارەی نەوت باسی ئەکەین) بوو بە هۆی ئەوەی کورد بکەوێتە گێژاوێکی ئێجگار سەختەوە کە هەتا ئیمرۆش لەژێر باری سیاسەتی دەوڵەتە دەسەلاتدارەکان و ڕژێمە بەکرێگیراوەکانیانا ئەناڵێنێت.

لە کانونی دووهەمی ساڵی ۱۹۱۸ دا (کلیمەنصو)ی سەرەک وەزیرانی فەرەنسە لە کۆبونەوەیەکدا لە لەندەن داوای لە (لوید جۆرج)ی سەرەک وەزیری ئینگلیز کرد کە بە جووتە سەر لە نوێ دان بە پەیمانی سایکس پیکۆدا بنێنەوە، بەلام (لوید جۆرج) ئەو داخوازی یەی پشت گوێ خست و ئەو داخوازیەی فرەنسەی بەستەوە بەئاڵ و گۆڕێکی گەورە لە بەندەکانی ئەو پەیمانە کە بۆ ولایەتی موصل و فەلەستین تەرخان کرابوو.

سەرەک وەزیرانی فەرەنسە کە هیچی بۆنەمایەوە وازی لەو داخوازیە هێنا و ئینگلیز بەرامبەر بەو وازلێهێنانە بەشێک لە نەوتی موصلی تەرخان کرد بۆ فەرەنسا کە لەدواییدا (کلیمانصو)کە پێ ی زانی ئینگلیز ویلایەتی موصلی بۆ نەوت ویستوە دەستی کێشا بەدەستی خۆیدا و دانی پیادانا کە هەڵەیەکی زۆر گەورەی مێژوویی کردوە بەو وازهێنانەی لە ویلایەتی موصل.

بەلام تازە کار لە کار ترازابوو، پەشیمانیی هیچ دادێکی فەرەنسەی نەدەدا).

لازاریف لەم رووەوە ئەڵێ: «۲۰»

«پەیمانی سایکس پیکۆ و پیلانەکانی تری دەوڵەتە گەورەکان کارێکی زۆریان کردە سەربار و هەڵوێست لەناو کوردستان دا ... لە ئەنجامی پەیمانی سایکس پیکۆدا کە شەر تەواوبوو کوردستانی سەر بە عوسمانلی دابەش کرا... کوردستانی باکوور لە ئەنجامی سەرکەوتنی کەمالیەکان و یارمەتیدانێکی زۆری سۆڤیەت بۆ تورکەکان و رەگەز پەرستەکانی تورک توانیان بە ئاگروئاسن ئەوناوە خاپوور بکەن و ناوچەکە ببەستنەوە بە تورکیاوە و خوارووی کوردستانیش بە فرو

فیلْ و تەڵەکە بازی ئینگلیز و چاوچنۆکی سەرمایەداران و ئەوانەی حسابێکی دوورودرێژیان بۆ نەوتی کوردستان کردبوو، خواروی کوردستانیان بەزۆرەملی و بەبێ ڕازی بوونی دانیشتوانی بەست بە میسۆپۆتامیاوە کە ناوی لێ‌نرا (عێراق) ، بەڵام کوردستانی ئێران ، لەبەر ئەوەی ئێران بەشداری شەڕی نەکردبوو، ئەو بەشەی کوردستان هەر لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا مایەوە».

سەیرە لە شەڕی جیهانی دووهەمیشدا تورکە کەمالیەکان لە گەڵ ئەوەشدا کە دام و دەزگای ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەکانیان بەدڵ لەگەڵ ئەڵمان و ئیتالیابوون بە هیوای ئەوەی ئەوشوێنانەی کەهی ئیمبراتۆرییەتی عوسمانلی بوو و لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لەکیسیان چووبوو دەستیان بکەوێتەوە...بەڵام تورکەکان بۆ نەگبەتی کورد لەو شەڕەدا دانیان بەخۆیانا گرت و توانیان لەسەر دوو پەت یاری بکەن و کە شەڕ بڕایەوە هیچ زیانێکیان پێ‌نەگەیشت و وردە وردە بایان دایەوە بەرەو ئەمریکا و ئینگلیز.

لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتەکانی پەیمانی سایکس پیکۆ بەسەرزاری لەناوخۆیانا لەسەر نەخشەیەک ڕێک کەوتبون بۆ دابەشکردنی میراتی عوسمانی لەدوای بڕانەوەی شەڕ، بەڵام لە ژێرەوە هەرلایە بەجیا بۆخۆی پلانی تایبەتی تری هەبوە و ویستویەتی ئەو پلانەی بخاتە کار.

بۆ نموونە: وەکو ئەحمەد خواجا لە یادشتەکانیا «٣» لەلاپەڕە (١٦)دا ئەڵێ:

«لە گۆڤاری مێژوی (رەسملی تأریخ مجموعەسی) ژمارە (١) مانگی (أوجاخ)ی ساڵی . ١٩٥ ئەم نوسراوەی تیادا بڵاوکراوەتەوە:

لە ساڵی ١٩٢٤ دا لەلایەن (ئی.ئی.ئادام توف)ی سەرۆکی لیژنەی پشکنین تۆمارکراوە لەناو دۆکۆمێنتە نەهێنیەکانی قەیسەری رووس دەربارەی پارچە پارچە کردنی وڵاتی تورکیا ئەم دۆکیومێنتە هاتوەتە بەر چاو:

نامەیەک لە ١٩١٥/١٢/١١ دا، (أس.ئەی.پوکلەڤیسکی) أیلچی رووس لە (بکرە شەوە) بۆ وەزیری دەرەوەی رووسی نوسیوە ئەڵێ:(جمال پاشا لەگەڵ حکومەتەکەیدا (عوسمانی) ناڕێکە، ئەگەر بێت و دەس درێژی بکرێ بۆ سەر تورکیا پێویستە جمال پاشا لە حکومەتەکەی هەڵگیرێتەوە و ئەرمەنیەکانیش لەگەڵ جمال پاشا پێک بگەیەنن ئەوسا بەمەرام ئەگەین ...چاوەڕوانی وەرامم).

ئەوداخوازیە لەلایەن وەزیری دەرەوەی رووس (سازانۆف) گەیەنرایە ایلچیەکانی (بالیوز) رووس لە انگلتەرە و فەرەنسە و ئیتالیا، بۆ ئەوەی لە عەرەبستان و عراق و کلیکیا بەناوی ئاسیاوە جمال پاشابکرێت بە سولتان... بزانە بیری ئەو حکومەتانە چۆنە و لەگەڵیانا بکەوەرە گفت و گۆ ؟ ئەگەر جمال پاشا لەعوسمانی یاخی بوو، بۆ ئەو سولتانە تازەیە (جمال)، سوریا۔ فلسطین،عراق،عەرەبستان،کیلیکیا ،ئەرمەنستان،کوردستان،لە وێنەی ئەیالات دا بەناوی تورکیای ئاسیاوە سەربەخۆییان بدرێتێ و دەولەتە گەورەکان بەڵێنی پارێزگاری لێ کردنیان بدەن. وەرامی ئینگلیز بۆ ئەو پێش نیارە ئەوەبوو، وتیان: جارێ وا ئێمە بەسرەمان گرتوە، کە عێراقمان بە تەواوی گرت ئەوسا لەو کارە ئەدوێین.

فەرەنسیەکانیش وتیان: وا لوبنانمان گرتوە، پاش گرتنی سوریا و عیراق ئەوسا قسەی لێ ئەکەین»

# شەڕی یەکەمی جیهانی و دەوری شێخ مەحمود لەو شەڕەدا

کەشەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا، لەگەڵ ئەو هەموو ماف خۆراوی و چەوساندنەوەیەی کە میللەتی کورد لە کوردستانی ژێر جەور و ستەمی عوسمانلی دا ئەی چێشت هەمیشە لە ژێر باری ئەشکەنجە و تالانی و ڕاو و ڕووتی هێزەکانی عوسمانلی دا ئەی چێشت چوار پێنج سەدە بوو کورد و کوردستان بەسرابوو بە پێچکەی دەوڵەتێکی دیکتاتۆری دواکەوتوی خوێن ڕێژەوە و بەناوی پارێزگاری لە ئاینی ئیسلام ەوە میللەتی کورد لەهەموان زۆرتر چەوسێنراو و بەش خوراوبوە و بێ بەش بوە لە بوونی قوتابخانە و دەزگای خوێندەواری و ڕۆشەنبیری، لەگەڵ ئەوەشدا کە شەڕی جیهانی هەڵگیرسا و تورکەکان ئالای غەزایان بەرزکردەوە و هەستی ئاینیی میلەتی کوردیان بزواند، ئیتر کوردی ساوێلکە و دڵپاکی بێ گزی و فزی و نەشارەزا لە کەین و بەین و فێڵ و کەڵەکی سیاسەتی دەوڵەتان، چەک هەڵگرەکانیان چونە ژێر ئالای ئیسلامەوە کەنەک ئەوانەی هەر سەربازبوون لە سوپای عوسمانلی دا، بەڵکو بەهۆی پیاوە ئایینیەکانەوە و بە هۆی سەرۆک عەشیرەتەکانەوە هەزاران چوونە پێشەوە و کۆڕی زیکر و تەپڵ و دەف و های و هوو و مل بادان پالی پێوەنان بۆ ناو گەرمەی شەڕەکان و لەپێشی پێشەوەی کۆڕی شەڕەکانا چ بەتفەنگ و چ بە شیر و سونگی هەر لە ناوچەی قەفقاسەوە هەتا فاو و شعێبە و لە کەناری دەریای ڕەش و سپی دا سنگیان نا بە گوللەو شیر و سونگیەوە و ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان کوژران و وڵاتەکەیان لە ژێر هێرشی لەشکرەکانی دوژمنانی عوسمانلی دا پێشێل کرا و ماڵ و خانەیان سووتێنرا و وێران کرا.

لازاریف لەم ڕووەوە ئەڵێ:«٧»

«دەنگی یەکەم تەقەی شەڕی جیهانی لە ڕۆژهەڵاتی نزیک دا لە کوردستانی

ئێراندا بەرزبوەوە نەک لە دەریای ڕەشدا ».

بەو جۆرە ئەو شەڕەی کە هیچ سوودێکی میللەتی کوردی تیادا نەبوە جگە لە ماڵ وێرانی و سەرگەردانی بەو لاوە هەستی ئایینی لەناو خەڵک دا زاڵ بووە و هەستی نەتەوایەتی کە لەو سەردەمەدا لە ناو چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا خۆی نواندوە و بیری نەتەوایەتی هێشتا تازە لە گڕوگاڵدا بووە و نەگەیشتوەتە قۆناغی دارەدارە، بۆیە بەرگەی لێشاوی هەستی ئایینی نەگرتووە و لە ساڵەکانی شەردا وەکۆ هەستێکی خەفەکراوی لێ هاتووە و ئەوانەش کە بەر لە شەڕی جیهانی کەوتبونە جووڵە و بزوتنەوەی نەتەوایەتی و میلەتانی تر کاری تێ کردبوون، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ لە کاتی شەردا بیریان لەوە نەکردبوەوە کە پەیوەندی بە کار بەدەستانی ولاتانەوە بکەن بۆ ئەوەی کە شەڕ بڕایەوە حسابێکیش بۆ میلەتی کورد بکەن وەکو ئەو چالاکی و پەیوەندیانەی شەریف پاشای خندان لەگەڵ فەرەنسیەکان و لەگەڵ ولاتە سوێند خۆرەکاندا کردبووی .

لە کاتی شەڕی جیهانیدا کورد توشی زیانێکی زۆری ماڵی و گیانی بووبوو، گرانی و برسیەتی هەموو بەشەکانی کوردستانی گرتبوەوە، گەنج و پیاوی بەتوانا نەمابوو لە کوردستاندا کشتوکاڵ بکات یا مەڕ و ماڵات بەخێو بکات و سەرپەرشتی خاو و خێزانەکان بکات، ئەو قات و قڕیەی لە کوردستاندا پەیدابووبوو بەهۆی ڕاو و ڕووتی جەندرمە و زەفتییەکانی عوسمانلی. ئەمانە هەموو وایان لە کورد کردبوو بەبڕانەوەی شەڕ چاوەڕوانی ڕۆژێکی نوێ و پڕ لە شادمانی و بەختیارییان ئەکرد.

ئێران داخلی شەڕی جیهانی نەبوبوو بۆیە هیچ دەوڵەتێکی دەسەلاتداری ئەو ڕۆژانە حسابی بۆ کوردستانی ئێران نەکردبوو، مابوەوە کوردستانی بەشەمیراتی عوسمانی کە وەکو لە باسی پەیمانی سایکس پیکۆدا بڕیاری لەسەردرابوو کوردستان لە ڕۆژهەلاتی تورکیادا بەر روسیای قەیسەری کەوتبوو. بەلام کە سۆڤیەتییەکان هاتنە سەرکار وخۆیان لە شەڕ کێشایەوە و پەیمانی سایکس پیکۆیان ئاشکراکرد ئیتر ئینگلیز لەوکاتەوە ئەگەرچی بەپێی ئەو پەیمانە کوردستان بۆ فەرەنسە دانرابوو بەلام هێشتا شەڕ کۆتایی نەهاتبوو کە بیری لە دەست بەسەراداگرتنی کوردستانی خواروشدا کردبوەوە کە بێ‌بەستێت بە

میسۆپۆتامیاوە و ڕۆژنامەی ئۆرگانی لەشکری داگیرکەری بەریتانیا لە بەغدا(تێگەیشتنی ڕاستی) پەیتا پەیتا بەر لەوەی کە شەڕی جیهانی تەواوببێت کوردی هان ئەدا کە تورکی عوسمانلی لە ناوچەکەیان دەربکەن و باوەش بکەنەوە بۆ ئەو فریشتەی فەڕ و پیت و بەرەکەت هێنەرەی کە لە دواڕۆژدا کورد و کوردستان بەرەو دوا ڕۆژێکی پڕ لە شادمانی ئەبات. ئەوەبوو ئینگلیز لەگەڵ ئەوەشدا کە پەیمانی مۆدراسی مۆرکرابوو و بڕیار وابوو بەپێی ئەو پەیمانە لە مێژوی مۆرکردنی ئەو پەیمانە بەولاوە جوڵە بە هێزەکانی نەکا، بەڵام ئینگلیزەکان بۆ تەواوکردنی نەخشەکەیان هێزەکانیان چونە ناو شاری موسلەوە و لە ئەستەمبولیش هێزی دەوڵەتە سوێند خۆرە سەرکەوتووەکان دەستیان گرت بەسەر کار و باری ئەو سەردەمەدا و بەداخەوە ئەو هەموو جەنەراڵ و ئەفسەر و ڕۆشنبیرانەی کورد کە لە ئەستەمبولدابوون نەیاتوانیبوو هەل و دەرفەت لەو هەلوێستەی ئەو ڕۆژانە وەربگرن و بۆ ئەو دەوڵەتانەی روون بکەنەوە کە پێویستە حساب بۆ دوا ڕۆژی کورد بکرێ و ئەو هەنگاوانەی دوای ئەوە نران چ لە پەیمانی ئاشتی و چ لە پەیمانی سیڤەردا بە هۆی سیاسەتی دەوڵەتە سەرکەوتوەکانەوە هیچی بەرەو ئاواتەکانی کورد ملی نەدەنا، بەو جۆرە کە شەڕ بڕایەوە و دەنگی تەقە لە هەمولایەک کپ کرا ئەوەبوو سەرکۆزەری خەرمانی ئەو شەڕە خوڕاییەی کە کوردی تێوە ئاڵێنراو بریتی بوو لە گرانی و برسییەتی و ماڵ کاول بوون، بریتی بوو لەو ناوزڕاندنەی کورد کە بەهۆی تاوانی عوسمانلییەکانەوە تووشی بوو...ئەو کوشتارە دڕندانەی کە تورکەکان لە ئەرمەنییەکانیان کردبو زۆر لەسیاسەتمەدارانی دەوڵەتانی دەسەڵاتداری ئەر ڕۆژەی دڵگیرکردبوو لە کورد و، تورکەکانیش بەهەموو جۆرێک هەوڵیان ئەدا دەستە خوێناویەکەی خۆیان بەسەر کوردا بسڕن کە ئەو تەقەلایەیان لە کاتی خۆیدا تارادەیەک کاری خۆی کرد ئەگەرچی لە پاش ماوەیەک مێژونووس و ڕۆژهەڵاتناسە بە ویژدانەکان وردە وردە بەو حساب وبڕیارە نارێکەدا چوونەوە و روونیان کردەوە کە ئەو تاوانە کورد نەی کردبو بەڵکو بەهۆی کردەوە و پیلانی تورکەکانەوە بووە.

ئارنۆڵد ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا لە کتێبەکەیدا لەو ڕووەوە

ئەڵێ:«٣٧»

« بەهۆی کردەوەی رووسەکان و دۆستەکانی رووسەوە کە ئەرمەنی و ئاسووری بوون کوردەکان لە شەڕی جیهانی دا تووشی گەلێک سزا و ناخۆشی و دەردەسەری بوون، لە بەر ئەوە کوردەکانیش کە دەستیان ڕۆیی زۆر بەدڵ ڕەقی تۆڵەی خۆیان لێ کردنەوە »

بێگومان ویلسنی نوێنەری ئەو ڕۆژانەی ئینگلیز ئەوەی بۆ مەبەستێکی پاک نەوتوە و ویستویەتی تاوانی کوشتاری ئەرمەنی و ئاسووری بەسەر کورددا بسەپێنێت بەبێ ئەوەی باسی ئەوە بکات کە هۆی سەرەکی ئەو تاوانانە تورک بووە .

(ڤ.لیڤسکی) دەربارەی ئەو تاوانانەی تورک کە ویسترا بخرێتە ئەستۆی کوردەوە ئەڵێ :

« کاربەدەستانی تورک لە شەڕەکانیاندا هاواریان ئەکرد :- خۆتان بە تالانییەوە خەریک مەکەن..گاور بکوژن و لە هیچ مەترسن..مردن بۆ گاور و ژیان بۆ موسوڵمان» ئەو کوشتارەی بەسەر ئەرمەنییەکاندا هات لە ڕاستیدا بەشێک بووە لە بەکارهێنانی چەکی کاریگەری ئایینی کە چ رووس چ عوسمانلی هەریەکە بەجۆرێک بەکاریان هێناوە و دڵی زۆرلایان بەناڕەوا لە کورد یەشاندوە ئەگەرچی یەکێکی وەکو(کیلینگ)ی نووسەری ئینگلیز بەناوی(سەردەمێک لە روسیا و تورکیا)ویژدانی خۆی وای لێکردووە کە هەستی ئایینی کوێرانە ئەو ڕاستییەی لێ نەشارێتەوە و ویژدانی خۆی بەکارهێناوە و لە کتێبەکەیدا وتویەتی:«٩»

«خۆم بەچاوی خۆم لە ناوچەکانی کورددا ژمارەیەکی زۆرم لە ئەرمەنییەکان دیوە کە کوردەکان داڵدەیان دابوون و منداڵەکانیان لە مردن ڕزگارکردوون».

لە شەڕی جیهانیدا کە کوردستان کەوتبوە نێوانی ئەو دەوڵەتانەی کە بەشدارییان لەو شەڕدا کردبوو، کورد بوبوبوو و بە سووتەمەنی ئەو شەڕە و خاکەکەی وێران کرابوو، گرانی و برسییەتی و نەبوونی باڵی رەشیان کێشابوو بەسەر هەموو ناوچەکاندا و لە گەرمەی ئەو شەڕانەدا ئەو دەوڵەتانە هەریەکەیان بەجۆرێک هەستی ئایینی کوردیان جولاندبوو، هیچیان بەلای ئەوەدا نەدەچوون

که هەستی نەتەوایەتی ی ببزوێنن چونکە هیچ لایەکیان بەتەمای ئەوە نەبوون لە دوای شەڕ حساب بۆ ئەوە بکەن کوردیش وەکو میللەتان مافی نەتەوایەتی خۆی دەستگیربێت تەنها ئینگلیزەکان لە کۆتایی شەڕدا کە گەیشتنە بەغدا و دەستیان کرد بە پروپاگەندە بۆ هاندانی کورد دژی عوسمانلی، تەنها لەو ڕۆژانەدا لە ڕۆژنامەی(تێگەیشتنی ڕاستی)دا کە ئۆرگانی لەشکری داگیرکەری بەریتانی بوو وەکو لە باسی پەیوەندی کورد و بەریتانیا لێ ی دواین، بەهۆی ئەو ڕۆژنامەوە کەوتنە هاندانی کورد و بزواندنی هەستی نەتەوایەتیان چونکە لەو ڕۆژانەدا بۆیان دەرکەوتبوو کە پەنابردنە بەر چەکی ئایینی بۆ هاندانی کوردی ئیسلام دژی دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلام شتێکی بێ هوودەیە، بۆیە کەوتنە سەر بارێکی تر و مێجەر سۆنی شارەزا بەکوردیان تەرخان کرد بۆ ئەو مەبەستە کەدەرکەوت هەموی درۆ و دەستبڕین بوە وەکو لە شوێنی خۆیدا بۆمان روون دەبێتەوە .

ئەوەی کە لە کۆتایی شەڕی جیهانیدا بوو بەهۆی کڵپەسەندنی هەستی نەتەوایەتی لەناو هەندێک کورددا گەلێک هۆ بووە ... رزگاربوونی دەوڵەتەکانی بەلقان، ڕاپەڕینی ئەرمەنی و شۆڕشی شەریفی مەککە و چالاکی و بزوتنەوەی کوردەکانی ئەستەمبوول کە بە هۆی رووداو و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو ڕۆژەوە و بەهۆی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی کە بۆ دەسگیربوونی مافی میللەتی کورد ڕێکیان خستبوو، و تاڕادەیەک چالاکی و جموجۆڵی ڕێکخراو و کۆمەڵی ئەو میلەتانەی تر کە دژی تورک بوون وەکو یۆنان و دەوڵەتەکانی بەلقان ئەمانە هەموی سەرەتای بزوتنەوەیەکی گەرم بوون لەناو کورددا و مادە (١٢)ی چواردە مادەکەی سەرەک کۆماری ئەمریکا کە ئەڵێ :

«پێویستە ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی بۆ ئەو نەتەوانە دابین بکرێت کە هەتا ئێستە لەژێر سایەی دەوڵتی عوسمانلیدا ژیابوون و پێویستە ڕێگەیان بدرێتێ خۆیان کارو باری خۆیان ببەن بەڕێوە ».

هەروەها ئەو وتارەی (جەنەڕاڵ مۆد)ی بەریتانی لە بەغدا بۆ خەڵکی ڕوونکردبوەوە کە بەریتانیا بۆ داگیرکردن نەهاتووە بەڵکو بۆ ڕزگاربوون و ئازادی هاتووە......

ئەو بەیانەی جەنەراڵ مۆد و پروپاگەندەکانی ئینگلیز لەناو کورددا بەهۆی بڵاوکردنەوەی تێگەیشتنی راستییەوە ئەمانە هەمووی وای لە کوردی ئەوڕۆژە کردبوو کە دەولەتە سوێندخۆرەکان بە رزگارکەری دابنێن و بەتایبەتی بەریتانیا وەکو فریشتەیەکی رزگارکەر سەیربکەن بە ئومێدی ئەوەی یارمەتی میللەتی کورد ئەدا و رزگاری دەبێ لە تورک.

ئەوەی لێرەدا، لەم باسەدا مەبەستمانە، بریتیە لە بەشداریکردنی شێخ مەحمود و هاوکارەکانی شان بە شانی هێزی عوسمانلی خەلیفەی ئیسلام دژی بەریتانیا و رووسی قەیسەری.

## ئا۔ شەڕی شعێبە

کە ئینگلیزەکان لە(فاو)ەوە کشان بەرەو ژوور کە مل بنێن بەرەو و بەغدا، عوسمانلییەکان پەنایان بردە بەر سەرۆک عەشیرەتەکانی عەرەب و کورد بۆ هاوکاری کردن لەو شەرەی کە بە ناوی غەزاوە بەناو خەڵکدا بڵاویان کردبوەوە... شێخ مەحمودی ئازا و ناسراوی ئەوڕۆژانە وەکو کوردێکی ئیسلام پاڵپشتی عوسمانلی بوە و ژمارەیەکی زۆر لەخزم و کەس و کار و دۆست و ناسیاوی ناوچەی سلێمانی کۆکردوەتەوە و رووبەرووی ئینگلیزەکان بوونەوە.

دەربارەی شەڕی شعێبە کە تورکەکان لەوشەوەدا شکان و شێخ مەحمود و هاوکارەکانی بەشدارییان تیاداکردوە، زۆر کەس باسی ئەو شەڕەی کردوە. شێخ مەحمود خۆی لەو گفت و گۆیەی کە رۆژنامە نووسی ئەوسەردەمەی کە شێخ مەحمود لە بەغدا دەست بەسەر بووە، نوری ثابت(حبزبوز) لەگەڵیا کردوە وتویەتی: «٢٨»

«کە شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد، منیش وەکو یەکێکی لایەنگری دەوڵەتی عوسمانلی ژمارەیەکی زۆرم لە چەکدارانی کورد کۆ کردەوە و چوین بۆ شعێبە بۆ بەربەستکردنی هێرشی ئینگلیز».

مامۆستا رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ژمارەی ئەو کوردە چەکدارانەی کە

لەگەڵ شێخ مەحمودا چوبون بۆ شعێبە بە(...١) کەس داناوە، بلاّم نوسەری کتێبی ـ عراق لە دەوری احتلال و انتداب دا (عبدالرزاق حسنی) ژمارەکەی بە(..١٥)کەس داناوە. و دۆکیومێنتی ژمارە 32-F.O.5068-2205 رۆژی ١٥/ئەپریلی .١٩٢ ژمارەی کوردەکانی بە (...٣) چەکدار باسی کردوە.

لەو شەڕی شعێبەدا جگە لە شێخ مەحمود سەید ئەحمەدی خانەقا و سەید محەمەدی جباری و شێخانی عەودالان و شەدەڵەی ناوچەی سورداش و بەرزنجەییەکانی خزمی شێخ مەحمود بەرامبەر بە هێزێکی زۆر و رێک و پێک و پڕچەک و تێر و تەسەلێ ئینگلیز وەستاون و شەڕیان کردوە.

مامۆستا رەفیق حلمی لەیاداشتەکانیا ئەڵێ:« لەو شەرەدا رەشید پاشای خەڵکی سلێمانی کە کۆنە موتەسەرفی (منتفک) بوە بەشداری ئەو شەڕەی کردوە.

لە شەڕی شعێبەدا کە لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩١٥ دا روویداوە ژمارەیەک لە کوردەکان شەهیدبوون و ژمارەیەکیشیان لێ بریندار بوو کە لە ناو ئەوانەدا شێخ مەحمود و سەید ئەحمەدی خانەقا بوو»

دکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا (ثورە العشرین ـ لاپەڕە ٩٢ـ ) لەو روەوە ئەڵێ :

« عەرەبەکان لە شەڕی شعێبەدا بەدەم شەڕەوە هۆسەیان ئەکێشاو ئەیان ووت :ثلثین الجنه لهادینا ( مەبەست لە هادی مگوطر بوو)و ثلث لکاک احمد».

بەلاّم هەموو جارێک کە باسی ئەو شەڕە ئەکرا عیزەت مدفەعی کە لە کاتی خۆیدا لە سوپای عوسمانیدا ئەفسەر بوە و لەو شەڕەدا بەشداری کردوە، لە نادی سلێمانی کە باسی ئەو شەڕە و بەشداری شێخ مەحمود و کوردەکانی بۆئەکردین ئەیووت هۆسەی عەشایەری عەرەبەکان بەم جۆرە بوە:

ثلثین الجنه لها دنیا و ثلث لکاک احمد و شویه شویه للبربوتی).

لە سەرەتای ساڵی هەشتادا لە لەندەن لای تەوفیق وەهبی باسی ئەوەی عیزەت مدفەعیم کرد وتی عوسمانی لەو شەڕەدا خراپ شکا و زیانێکی زۆری لێکەوت و ئێمەش بەشکاوی چوینە ناسریە، لەوێ لەگەڵ شێخ مەحمود کە لەو شەرەدا بریندار کرابوو کەوتینە گفت و گۆ و بۆمان دەرکەوت کە عوسمانلی ئەم شەرەی

دورپاندوه و زۆری پێ ناچێت ئینگلیزەکان ئەبن بە خاوەن دەسەڵات لە ناوچەکەدا، لە بەر ئەوە بیرمان لێ کردەوە کە لیژنەیەک ڕێکبخەین بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە بکەین بە ئومێدی ئەوەی کە گەیشتە کوردستان حساب بۆ مافی میللەتی کوردیش بکات و لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە نامەیەک بنێرین بۆ ئینگلیزەکان و من بینووسم و لە ڕێگەی یەکێک لەو کوردانەی خەڵکی سلێمانی کە ماوەیەک بوو لە(ناصریە) دەژیا ئەو نامەیە بگەیەنینە ئینگلیزەکان(ئەو کوردانەی کە تۆفیق وەهبی باسی کردن هەتا ماوەیەکی دوای ئەوەش هەر لە ناسرییەدا مابوون، لە کۆتایی ساڵانی چلەکاندا بەڕێکەوت چوومە لای خزمێکم کە ئەندازیار بوو لە ناصریە، یەک دووکەسم لەو کوردانە بینی کە هەندێکیان خزمی حاجی محەمەدی لاوەی خەڵکی سلێمانی بوون . ).

تۆفیق وەهبی گوتی هەر کە باسی ئەو نامە ناردنەم کرد کابرای خانە خوێ چاوی پەڕییە پشتی سەری و گوتی لەبەر خاتری ئەو زاتە نەبوایە(نیازی لە شێخ مەحمود بوو)، هەر ئێستە ئەچووم تورکەکانم ئەهێنا و لە بەردەمی ماڵی خۆمانا هەڵیان ئەواسیت.

لە باسی بەشداری کردنی شێخ مەحمود لە شەڕی شعێبەدا، شێخ بابەعەلی شێخ مەحمود جارێک بۆی گێڕامەوە و گوتی:

« (عەبدولهادی چەلەبی) کە لە کاتی شەڕی شعێبەدا لێ پرسراوی عوسمانلییەکان بووە بۆ ناردنی ئازووقە و خواردن بۆ لەشکری عوسمانلی، کەرەتێک باسی ئەوەی کرد گوتی لەو ڕۆژەدا کە باوکت چووبوو بۆ شەڕی شعێبە ، لە هەندێ پیاوی ئایینی عەرەبی ئەو ناوچەیەم بیستووە کە گوتبوویان با نەهێڵین شێخ مەحمود بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، بالێرە بکوژرێ بۆ ئەوەی لێرە بینێژن و گۆڕەکەی بکرێت بەجێی زیارەتگاه ».

## ب ـ بەشداری کردنی شێخ مەحمود لە شەڕی رووس و عوسمانلیدا لە ناوچەی مەریوان و پێنجوین

دوای شکاندنی لەشکری عوسمانی لە شەڕی شعێبەدا و گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان، لەو ڕۆژانەدا کە لەشکری رووسی قەیسەری گەیشتبوونە ناوچەی مەریوان و پێنجوین و شەڕ لە گەرمەیدابوو لە نێوان هەردوو لەشکری عوسمانی و رووسیدا و قوزاغەکانی رووس لەزۆر شوێنی کوردستاندا وەکو ناوچەی خانەقین و رەواندز کە هەمووی برسی و تینوو بوون، بگەیشتنایەتە هەر شوێنێک ئەو ناوچەیەیان هەر وەکو کوللە دادەبێژا و ڕاوو و رووتی خەڵکیان دەکرد و ئەو لەشکرانەی رووس ببوون بەسەرباری نەبوونی خواردن و خۆراک لە زۆر شوێنی کوردستاندا کە گرانی و برسییەتی تێدا بڵاو ببوەوە.

لەو ڕۆژانەدا هێزەکانی رووس خۆیان ئامادەکردبوو کە بەرەو شاری سلێمانی بچن و داگیری بکەن وتالانی بکەن، دووبارە بۆ بەربەستکردنی هێرشی لەشکری رووس، تورکەکان داوایان لە شێخ مەحمود کرد کە لەشکر کۆکاتەوە و رووەو پینجوین و مەریوان بڕواو شەڕ لەگەڵ رووسەکاندا بکات.

شێخ مەحمود بەرلەوەی کە بچێت بۆ شعێبە وەکو لە شوێنی خۆیدا باسکرا پەیوەندی بە رووسەوە هەبووە و وەکو شێخ قادری برای شێخ مەحمود لە یادداشتەکانیدا باسی کردوە «٢٧» مینۆرسکی بەڵێنی ئەوەی دابویە کە یارمەتی کورد بدات، کەچی ئەو لەشکری رووسەی کە شێخ مەحمود هیوای پێ بوو یارمەتی کورد بدات لەو ڕۆژانەدا تاوان و کوشت و بڕیی لەتام دەرچووبوو. شێخ مەحمود بەخۆی و هێزەکەیەوە چوەتە ناوچەی مەریوان و پێنجوین و لە ماوەی حەوت ڕۆژدا دەورێکی زۆری بینیوە لە بەربەستکردنی لەشکری رووس.

ئەحمەد خواجا لە یادداشتەکانیدا دەربارەی بەشداربوونی شێخ مەحمود لەو شەڕەدا ئەڵێ: «٣»

« شێخ مەحمود وتبووی من بۆیە بەڵێنم دابوو بە (خەلیل پاشا)ی والی کە شان بە شانی تورک بوەستم بەئومێدی ئەوەی کە شەڕ بڕایەوە تورکەکان(ئۆتۆنۆمی)ئەدەن بە کورد و لەئەنجامی ئەوەدا میللەتی کورد بەسەربەستی ئەژی»

ئەحمەد خواجا ئەڵێ :

« کە شێخ مەحمود گەیشتە کۆڕی جەنگ و روو بە رووی رووسەکان بوەوە، (سەفوەت بەگ) کە بەرلە شەڕی یەکەمی جیهانی موتەسەرفی سلێمانی بووە و لە تاقمی ئتحاد و تەرەقی بووە و بەر لە هەڵگیرساندنی شەڕ لەگەڵ شێخ مەحموددا یەکتریان ناسیوە و بەر لە دەستپێکردنی شەڕ کە سەفوەت بەگ رایکردبوو و چووبوە ( لینینگراد )، لەکاتی شەڕدا رووسەکان سەفوەت بەگیان هێنابووە ناوچەکە و داوایان لێکردبوو کە پەیوەندی بە شێخ مەحمودەوە بکات..کە شێخ مەحمود لەو رۆژانەدا لە ناوچەی(بانە)دا بوو...

سەفوەت بەگ چوە(سەقز) و لەوێوە قورئانێکی بە مۆرکراوی لەگەڵ نامەیەکی خۆیدا ناردبوو بۆ شێخ مەحمود کە لەو نامەیەدا نووسیبووی :

« حکومەتی عوسمانلی لە تەواوبوون دایە، پەکی کەوتووە، ناتوانێت بەرگری لە هێزەکانی قەیسەر بگرێت، چونکە عوسمانلییەکان لەو ناوچەیەدا لە کورد بەولاوە کەسی بەدەستەوە نەماوە و بەرگەی شەڕ ناگرێت..رووس خاوەنی تۆپ و تەیارەیەکی زۆرە ، دڵنیاین بەم زوانە شەڕ بەسەرکەوتنی رووس تەواو دەبێت..جا بەبۆنەی دۆستایەتیمانەوە ئەم تکایەت لێ دەکەم :- حکومەتی قەیسەری ئامادەیە ئەوەی کە تۆ ئارەزوی ئەکەیت و ئەتەوێ، ئامادەیە پێشکەشتانی بکات..ئێمە زۆر پێویستیمان بەیارمەتی تۆ هەیە، نامەوێ دوژمنی وا گەورەت هەبێ..چاوەڕوانی وەڵامتانم. »

سەفوەت بەگ ئەو قورئان و نامەیەی بە ئەحمەد ئاغای خەڵکی(سوورێن)دا ناردبوو کە گوندێکە لە ناوچەی بانە.

شێخ مەحمود لە وەرامی ئەو نامەیەدا ئەڵێ :

من کە نیشتیمانەکەم لە جانەوەری و خوێن رێژی رووس دەپارێزم بەهیوای بەخشەندەیی قەیسەرنیم کە کوردیان لەبن هێناوە، خۆت ئەمناسیت و دارایی من

ئەزانیت،لەو دوژمنەی کە ناسیومە ناترسم..ئاوات و ئارەزوی من ئازادی گەلی کوردە، کێ دەست بداتە دەستمان دۆستی ئەو کەسەین..وەلامی دوژمن لە لولەی تفەنگی کوردەوە دەبیسترێت».

لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود و هاوکارەکانی بەشداری ئەو شەڕەیان کرد و توانییان لەشکری رووس بوەستێنن. بەلام زۆری پێ نەچوو دوای سەرکەوتن بەسەر لەشکری رووسدا، لەگەڵ ئەفسەرە دز و جەردەکانی عوسمانلیدا تێکچوو، تورکەکان هەندێک لەو سەرۆک عەشیرەتە کوردانەی کە بەشداری ئەو شەڕەیان کردبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا کە تورک خۆیان دەستیان کردبوو بە تالانی و دەستگرتن بەسەر دەسکەوتەکانی ئەو شەڕەدا، کەچی تاوانی ئەو تالانکردنەیان دابوە پاڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد و بەتەمابوون ژمارەیەکیان لەسێدارە بدەن .

شێخ مەحمود بەرامبەر بەو رەفتارەی تورکەکان رقی هەڵسا و هێزەکانی خۆی کێشایەوە بۆناوچەی سلێمانی.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا لە باسی ئەو رەفتارەی تورکدا ئەڵێ:«۲۱»

«کە شەڕی رووسەکان لەگەڵ تورکەکاندا گەیشتە ناوچەی پێنجوێن و مەریوان و رووسەکان شکان، تورکەکان جگە لەو دەسکەوتەی لەشەڕدا دەستیان کەوتبوو، ئازووقە و خواردەمەنی کوردەکانی ئەو ناوچانەشیان تالان کردبوو، خەڵک لە برسا پەرێشان بوون و زۆری نەمابوو زۆریان لێ بمرێ.. سەید ئەحمەدی بەرزەنجی( سەید ئەحمەدی مەرەخەس)و سەید عەبدوالڵای حاجی سەید حەسەنی ئامۆزای باوکم کە لەو شەڕەدا لەگەڵیاندابوو لە دواییدا بۆیان گێڕامەوە کە باوکم لە ئەنجامی ئەو رەفتارە ناپیاوانەی تورکەکاندا هەموویانی کۆ کردوەتەو و پێی وتون:

چاوتان لێ یە تورکەکان چ ناپیاوییەکیان لەگەڵ کورد دا کرد ؟ ئیتر بەسیەتی لەوە زۆرتر خۆم پێ ناگیرێ، پێویستە کورد لە برسیەتی و سەرشۆڕکردنی تورکەکان رزگاربکەین، ئەبێ هەمومان هەوڵ بدەین سەربەخۆیی بۆ کورد مسۆگەربکەین.

که شێخ گەڕایەوە زۆری پێ نەچوو هێزی ئینگلیز گەیشتبوە کفری لەبەر ئەوە شێخ مەحمود بڕیاری دا سەید محەمەدی موفتی کە لەوڕۆژانەدا لە بەغدا دائەنیشت ئاگاداری ئینگلیزەکان بکا کە ئەیەوێ پەیوەندی یان پێوەبکا سەید محەمەدی موفتی لە وەراما بۆ شێخ مەحمود ئەنوسێتەوە کە ئینگلیزەکانیش زۆر پەرۆشی ئەوەن کە پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود و هاوکارەکانیا بکەن.

وە شێخ مەحمود بۆ ئەو مەبەستە وەفدێکی نهێنی پێک ئەهێنێت لە عیزەت مەدفەعی و سەید ئەحمەدی بەرزنجی و فایقی تاپۆ و ئەیان‌نێرێت بۆلای ئینگلیزەکان کە داخوازی کورد بدەن بە ئینگلیزەکان کە بریتی بوە لە داوای مافی نەتەوەی کورد.

کە ساتێک ئینگلیزەکان گەیشتنە کەرکوک شێخ مەحمود نامەیەکی تری نارد بو بۆ ئینگلیزەکان لە کەرکوک بەڵام لەوڕۆژانەدا ئینگلیزەکان لەپڕ شاری کەرکوکیان چۆڵ کردبو تورکەکان چوبوونەوە ناو کەرکوک و ئەونامەیەی شێخ مەحمود بۆ ئینگلیزەکانی ناردبوو، لەجیاتی ئەوەی بدرێتە دەستی ئینگلیزەکان دەست تورکەکان کەوت و لەسەر ئەوە شێخ مەحمود گیرا و نێررا بۆ کەرکوک و موحاکەمە کرا و بڕیاری خنکاندنی درا بەڵام لەسەر داخوازی عەلی ئیحسان پاشا لە موسڵ شێخ مەحمود نێررا بۆ موسڵ و لەوێ تورکەکان لێی خۆشبوون و ناردیانەوە بۆ سلێمانی.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یادداشتەکانیا باسی هۆی لێ خۆشبوونی باوکی بەم جۆرەی خوارەوە تۆمارکردوە «٢١»

« لەساڵی ١٩٤٨ دا کە خاڵە فەتاحم(فەتاح بەگی ئەمینی عەتار کە ژن برای شێخ مەحمود بوە و لە ناو لەشکری تورکدا ئەفسەربوە و لە دواییدا وەکو نوێنەری تورک لە لیژنەی عصبە الامم دەربارەی کێشەی موسل نێرراوە بۆ کوردستان)، جارێک بۆی گێڕاینەوە وتی کە وەختێک عەلی ئیحسان پاشا لەسەر کار نەما و لە ئەستەنبووڵ نیشتەجێ بوو، چەند جارێک چوومە لای و رۆژێک لێم پرسی: پاشا تۆ چۆن و لەبەرچی ئەو حوکمەی شێخ مەحمودت لە کاتی خۆیدا هەڵوەشاندەوە و ناردتەوە بۆ سلێمانی؟

لەوەراما عەلی ئیحسان پاشا پێ‌ی ئەڵێ:

من ئەمزانی عوسمانلی شەڕی دۆڕاندوە، لەبەر ئەوە هیچ سوودێکم لە خنکاندنی شێخ مەحمودا نەدەبینی، بەڵکو ئەوەم بە باشتر زانی کە بیکەم بە سەرۆکی (میلیشیا)لە ناوچەی سلێمانی بۆ ئەوەی ئاراستەی ئینگلیزەکانی بکەم و رێگا لە چوونی ئینگلیزەکان بگرێت و هیچ نەبێ ماوەی پێویست بۆ داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن ئینگلیزە وە دوابخرێت»

بەلای ئەحمەد خواجاوە وایە«٣» کە شێخ مەحمود دونامەی ناردبو بۆ ئینگلیزەکان نامەی یەکەمیان بەهۆی(موحسین ئاغا)وە بوە لە کفری کە نێرابو بۆ ویلسن لە بەغدا (لە کاتێکدا شێخ رەؤفی شێخ مەحمود ئەڵێ یەکەم نامەی ناردبوو بۆ سەید محەمەدی موفتی کە بیدا بە ئینگلیزەکان و لەگەڵ عزەت مەدفەعی و سەید ئەحمەدی بەرزنجی و فایقی تاپۆدا ناردبوی ئەگەر چی دوور نیە ئەو نامەیە لە بەغدا لە لایەن سەید محەمەد «موفتی یەوە درابێ بە ئینگلیز)، وە نامەی دوهەمی ناردبوو بۆ ئینگلیزەکان لە کەرکوک کە ئەوەیان بوە دەست تورکەکان کەوتبوو پاش کشانەوەی ئینگلیز لە کەرکوک و ئەڵێ ئەو نامەیە بە هۆی (عەبدوڵلا سافی)یەوە لە جیاتی ئەوەی بگاتە دەست ئینگلیزەکان درا بە تورکەکان.

بلاّم رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا«٢» کە باسی ئەو نامەیە ئەکا ناوی (عبدالله سافی) ناهێنێ(لام وایە رەفیق حلمی حەزی نەکردوە ناوی عبدالله سافی بهێنێت چونکە رەفیق حلمی لە کەرکوک خوێندویەتی ماوەیەک ژیاوە و عبدالله سافی دۆستی بوە و ناسیاوی بوە، جگە لەوە وەکو لە شوێنی خۆیدا لە بەرگی دووهەمدا باسی ئەکەین کە چۆن عبدالله سافی لە دواییدا یەکێک بوە لەو کوردە چالاکانەی کە لەگەڵ چەند نائبێکی تری کوردا یاداشتیان داوە بە حوکومەت و داوای مافی کوردیان کردوە)

مامۆستا رەفیق حلمی وەکو سکرتێرێکی تایبەتی شێخ مەحمود بۆ ماوەیەک وشارەزا لە رووداو و بەسەر هاتەکانی ئەو سەردەمە، دەربارەی ناڕێکی شێخ مەحمود و تورکەکان لە یاداشتەکانیا بەم جۆرەی باس کردوە:

«لە دوای تێکچوونی شێخ مەحمود لەگەڵ تورکەکاندا، وە دوای ئەو بەشداربونەی لە شەڕی نێوانی رووس و تورکدا لە ناوچەی پێنجوێن و مەریوان،

ئیتر شێخ مەحمود لەوساوە دڵی لە عوسمانییەکان کرمێ بوو، هیچ هیوایەکی بە تورک نەمابوو لەبەر ئەوە هاتنی ئینگلیزەکانی بە هەل و دەرفەت زانی و لەگەڵ پیاوە ناودار و ناسراوەکانی سلێمانی دا لەدوای وت و وێژ و گفت و گۆ بڕیاری دا نامەیەک بنێرێت بۆ ئینگلیزەکان و لەو نامەیەدا داوای لێ کردبوون بەڵێن بدەن بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە ژێر چاودێری بەریتانیادا.

بەڵام ئەوە بوو ئینگلیزەکان کەرکوکیان بە جێ هێشت و تورکەکان کەرکوکیان داگیرکردەوە و ئەونامەیەی شێخ مەحمود بۆ ئینگلیزەکانی ناردبوو دەست تورکەکان کەوت و تورکەکان لە ئەنجامی ئەوەدا داوایان لە (موستەفا بەگ)ی قائمقامی عەسکەری عوسمانی کرد کە شێخ مەحمود لە سلێمانی بگرێ... موستەفا بەگ بە فڕ و فێڵ و بەناوی راوێژ کردنەوە لەگەڵیا داوای لە شێخ مەحمود کرد کە بچێتە لای و دەم و دەست گرتی و ناردی بۆ کەرکوک و لەوێ خرایە زیندانەوە»

موستەفا نەریمان لە کتێبەکەیدا (شۆرشی ئیبراهیم خانی دەڵۆ)«٢٤» ئەڵێ: ئەوەی لە سلێمانی شێخ مەحمودی گرت ناوی(سەلاح الدین چۆلاغ)بو کە سوپاسالاری تورک بوو لە سلێمانی و لە سلەیمانیەوە ناردی بۆ کەرکوک.

شێخ مەحمود لەو نامەیەدا بۆ (ویلسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیای ناردبوو (بەو حسابە ئەبێ ئەونامەیە بوویێت کە بەهۆی سەید محەمەدی موفتی یەوە درابوو بە ئینگلیزەکان یا خود وەکو ئەحمەد خواجا ئەڵێ بە هۆی (موحسین ئاغا)وە لە کفری‌یەوە ناردبوی بۆ ویلسن، لەو نامەیەدا نوسیبوی :

« کوردەکان سەرکەوتنی ئینگلیزیان زۆر پێ خۆشە و هیوایان وایە لە حوکمی تورک رزگاریان بێت و لە ژێر باڵی حکومەتی ئینگلیزدا بحەسێنەوە و بە وێنەی عەرەبەکان بکەونە خۆشیەوە).

شێخ مەحمود لە نامەکەیدا تکای لە ئینگلیزەکان کردبوو کە بەهیچ جۆرێک رێگەی ئەوە نەدرێ تورکەکان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان...

رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: لەو رۆژانەدا کە شێخ مەحمود ئەونامەیەی ناردبوو بۆ ئینگلیزەکان هەموندەکانیش نامەیان ناردبوو بۆ ئینگلیزەکان و ئامادەیی خۆیان دەربڕیبوو بۆ یارمەتیدانی لەشکری ئینگلیز بە ئاژەڵ و بەدەغەڵ

و دان که لەو ڕۆژانەدا گۆشت و نان باشترین دیاری بوو.

بەڵام ئەحمەد خواجا ناوەڕۆکی نامەکەی شێخ مەحمود بەم جۆرەی خوارەوە باس ئەکا: «٣»

« چەرخی گەردون ئێوەی بە سەرکەوتوویی گەیاندە نیشتمانی کورد لە کوردستان، کورد هیچ بەهرەیەکی لە عوسمانلیەکان وەرنەگرت، ئەزانن کە هەزاران ساڵە ئەمە خاکی نیشتمانی کوردە... لە ئادەمیزاد پەروەرتیان ئومێد ئەکەین کە ئێوە مافی کورد بدەن و ئازادی و سەربەستی لە کوردستاندا بڵاوبکەنەوە و ماوەی ئەوەنەدرێ کورد بە چەک داوای مافی خۆی بکات».

مامۆستا ڕەفیق حلمی دەربارەی موحاکمە کردنی شێخ مەحمود لە لایەن تورکەکانەوە لە کەرکوک لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: «٢»

« لە دوای موحاکەمە کردنێکی سەرپێیی، وەلەسەر ڕاسپاردەی سەرلەشکری گشتیی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە عیراقدا، بڕیاری خنکاندنی شێخ مەحمود درا... بەڵام لە مردن ڕزگاری بوو چونکە تورکەکان بیریان لە دوا ڕۆژی ڕەش و لەتەنگانە ئەکردەوە، هەرچەند هۆی کشانەوەی لەشکری ئینگلیز لەو ڕۆژانەدا لە کەرکوک وا لێکدرابوە وە کەهێزی سوێندخواران لە جەبهەی فەرەنسەدا شکابون و تورکەکان بەتەمای ئەوەبوون نەک هەر لە کەرکوک بەڵکو لە هەمو عیراقیش بیانکەنە دەرەوە.

بۆیە تورکەکان ویستیان لەگەڵ کوردەکاندا لەو ناوچەیەدا باری خۆیان ئاڵۆز نەکەن و عەلی ئیحسان پاشا کەتازە هاتبوە جێی خەلیل پاشا و بوبوو بە سەرلەشکری ئوردوی شەشەمی عوسمانی، بیری لەوە کردبوەوە کە وا باشە سوود لە شێخ مەحمود وەربگیرێت بۆیە لە موسڵەوە داوای ناردنی شێخ مەحمودی کرد بۆ موسڵ و لەوێ دڵنەوایی شێخی دایەوە و ئاشتی کردەوە بۆ ئەوەی بتوانێت لە هەرێمی سلەیمانیدا بە هۆی عەشایەرە کوردەکانەوە هێزەکانی تورک بپارێزێت و سلێمانی نەدا بە دەستەوە».

ڕەفیق حلمی لە چوونی شێخ مەحمود بۆ موسڵ و ناردنەوەی بۆ سلێمانی ئەڵێ:

« کە شێخ مەحمود چوە موسڵ عەلی ئیحسان پاشا میوانداری‌یەکی باشی

کوردو خەلات و بەراتی دایە و بە چەند راسپەردەیەکەوە ناردیەوە بۆ سلێمانی و بۆ بە جێهێنانی ئەم کارە (٥٠٠٠)لیرەی ئاڵتونی دایە و عەلی ئیحسان پاشا فەرمانی دەرکرد بو سەرلەشکری تورک لە سلێمانی کە هەرچی چەک و جبەخانەیەک شێخ مەحمود پێویستی پێی بێ بیداتێ.

لەسەر ئەوە شێخ مەحمود لە تشرینی دوهەمی ساڵی ١٩١٨ دا گەڕایەوە بۆ سلێمانی و تورکەکان بۆ تازە کردنەوەی دۆستایەتی لەگەڵ شێخ مەحمودا لەقەبی(نەقیب)یان دایە.

بلاّم شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا دەربارەی ئەو (٥٠٠٠)هەزار لیرەیەی کە رەفیق حلمی باسی کردوە کە گوایا عەلی ئیحسان پاشا دابوی بە شێخ مەحمود ئەلێ:«٢١»

تورکەکان هیچ پارەیەکیان نەدابو بە باوکم ... کە عەلی ئیحسان پاشا بڕیاری گەڕانەوەی بۆ باوکم دەرکرد، باوکم بۆ گەڕانەوەی هەندێ پارەی لەو ئەفسەرە کوردانەی خەڵکی سلێمانی کە لە موسڵ بون قەرزکردبوو بۆ خەرجکردنی ڕێگا و بان و سەید ئەحمەدی بەرزنجی کە لەگەڵ شێخ مەحمودا بوە لەو گەڕانەوەیدا پێی وتم: لە دواییدا خۆم بە دەستی خۆم قەرزی ئەو ئەفسەرانەم دایەوە. حەمەی نێرگەلەچی کە پیاوی باوکم بوو وە لە موسڵەوە لەگەڵیابوو بۆی گێڕامەوە و وتی: کە لە موسڵ بووین زۆر دەست کورت بووین و هیچمان نەبوو بەدەستەوە و شێخ پارەی لە چەند ئەفسەرێکی کورد قەرزکرد کە لە دواییدا ئەو قەرزەی بۆ ناردنەوە...

لەگەڕانەوەی باوکما ئێمە لە سلەیمانیەوە هەتا هەولێر چوین بە پیریەوە لە هەولێر لە ماڵی شێخ محی الدین دابەزین، دایکی شێخ محی الدین هەندێ پارەی خستە گیرفانمەوە کە هاتینەوە سلێمانی و حەمەی نێرگەلەچی پێی زانی من ئەو پارەیەم لە دایکی شێخ محی الدین وەرگرتوە لێم توورەبوو وتی بۆچی باسی ئەو پارەیەت لەگەڕانەوەمانا نەکرد، چونکە لە ڕێگا زۆر تەنگاوبووین بو پارە؟...

لەوانەی کە لەگەڵ شێخ مەحمودا لە موصلەوە هاتن بۆ سلێمانی عیزەت مەدفەعی بوو کە عەلی ئیحسان پاشا بڕیاری دابوو عیزەت وەکو ئەفسەرێکی

پەیوەندی بەست لە نێوانی عوسمانلی و شێخدا بێت ... عیزەت مدفەعی باسی گرانەوە وگەیشتنی خۆیانی کرد لە موصلەوە و وتی لەرێگا زۆر دواکەوتین چونکە خەڵکێکی ئێجگار زۆر لە ڕێگا بە پیر شێخ مەحمودەوە چوبون».

مامۆستا رەفیق حلمی لە باسی کشانەوەی ئینگلیز لە کەرکوک و داگیر کردنەوەی لەلایەن تورکەکانەوە لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«بە کشانەوەی ئینگلیز لە کەرکوک ناوبانگی ئینگلیز لە بەرچاوی خەڵک زڕا و زۆر کەسیان لێ هەڵگەڕایەوە کە لە وانە هموەندی‌یەکان بون.

لە دوای شکانی فەرنسیەکان لە جەبهەی شەڕی خۆیاندا ئینگلیزەکان هەندێک لەشکریان لە عیراق کێشابوەوە (کە دیارە ئەوانەی کەرکوک بەشێک بوە لەوە) بلاْم کە ساتێک ئینگلیز بۆی دەرکەوت بەو کشانەوەیان ناویان لای خەڵک سووک بوە و نرخیان کەم بوەتەوە، بۆیە زۆری پێ نەچوو بۆ کڕینەوەی ناوو ئیعتباریان جارێکی تر کەرکوکیان گرتەوە.

ئەو چوڵکردن و داگیرکردنەوەی کەرکوک لەو رۆژانەدابو کە شەڕی جیهانی وەستێنرابوو... ئینگلیزەکان ئەو وەستاندنی شەڕەیان بە هەل زانی و کەرکوک و هەولێریان گرت و دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەغلْ و دان و مەڕ و مالاْت لەو شوێنانەی کە تورکەکان فریای کۆکردنەوەیان نەکەوتبوون».

مامۆستا رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەڕواو ئەڵێ:

« کە لە ۳۱/۱۰/۱۹۱۸ دا بڕیاری شەڕ وەستاندن(موتارەکە=هدنە) مۆرکرا و بلاْوکرایەوە، ئیتر عەلی ئیحسان پاشا چاری نەما، بە تلگراف رای سپارد کاروباری ناوچەی سلێمانی بدرێتە دەست شێخ مەحمود. بەو جۆرە شێخ مەحمود بوو بە متصرفی سلێمانی و متصرفی سلێمانی ئەو وەختە کە (عەلی رەزابەگی خەڵکی (قۆنیە) بوو داوای لێ کرا بگەڕێتەوە بۆ موصل. لەو رۆژانەدا فەوجی عەسکەری تورک لە سلێمانیدا لەژێر سەرکردایەتی صالح بەگی طابور ئاغاسی دابوو وە هەندێ جەندرمەی تورکیش هێشتا لە سلێمانی دا مابوون.

بەلاْم شێخ مەحمود هیچ هیوایەکی بە دەسەلاْتی تورک نەمابوو بیری لەوە ئەکردەوە بەرامبەر بە هەندێ قەول و بڕ و ئیمتیازات سلێمانی تەسلیم بە

ئینگلیزەکان بکات. نامەی ئەم جارەی بە عیزەت مدفەعی و ئەحمەد فایقی طاپۆدا راستە و خۆ ناردە کفری و داوای لە ئینگلیزەکان کرد کە بچنە سلێمانی. ئینگلیزەکان بەرلەوە ئاگاداری پەیوەندی عەلی ئیحسان پاشا و شێخ مەحمود بوون، لە بەر ئەوە بەخۆیاندا ڕانەدەپەرموو کە هەتا کاتی خۆی نەیە، نەچنە سلێمانی.

ئینگلیزەکان نامەکەی شێخ مەحمودیان پێ خۆشبوو، نامەکەی شێخ لە کفری یەوە نێردرابوو (ویلسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیا و داوایان لە شێخ مەحمود کرد کە چاوەروانی بڕیاری حاکمی گشتی بکات لەو ڕووەوە.

## پەیوەندی شێخ مەحمود
## لەگەڵ ئینگلیزەکان لەدوای وەستاندنی شەڕی جیهانی

لە باسەکانی پێشودا دەربارەی هەڵوێستی ناوچەی سلێمانی دواین کەچۆن لە دوای وەستاندنی شەڕی یەکەمی جیهانی ئینگلیزەکان گەیشتبونە خانەقین و کفری و کەرکوک و چون هێزەکانی عوسمانلی دەسەڵاتیان لە کوردستاندا کز و لاواز بوبو، عەلی ئیحسان پاشا شێخ مەحمودی لە موسلەوە ناردەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێ و ئەگەر لە توانایدا بێ ڕێگەی ئەوە نەدا ئینگلیزەکان بەئاسانی بچنە ناوچەکەوە و دەستی بە سەردابگرن.

ئەوە بوو کە شێخ مەحمود گەڕایەوە بۆ سلێمانی و جارێکی تر ئینگلیزەکان کەرکوکیان داگیر کردەوە و تورکەکان پاشە کەشەیان کرد و موصلیان چوڵ کرد و ئینگلیزەکان چونە ناویەوە (هەرچەند لە راستیدا داگیرکردنی موصل لەلایەن ئینگلیزەوە لە پاش وەستاندنی شەڕ بوو بەپێی پەیمانی مودراس کە ئەوە پێچەوانەی ڕێکەوتنەکەبوو کە ئەبوایە هێڵی دەسەڵاتی ئینگلیز بریتی بوایە لەو شوێنانەی کە لەرۆژی شەڕ وەستاندندا بە دەستیانەوە بوە نەک ئەو ناوچانەی تر کە پاش مۆرکردنی پەیمانەکە چوونە ناویەوە وەکو موصل)، ئیتر شێخ مەحمود بۆی دەرکەوتبوو کە تازە تورک حسابی تەواو بوە و پشتگیری کردن لە تورک وەکو ئەوە وابوە کە پەیمان لەگەڵ یەکێکی دۆڕاودا ببەسرێت کە هیچ سوود و مەبەستێکی لێ سەوز نەدەبوو کە لە دوا رۆژێکی نزیکدا ئینگلیزەکان تاقە دەسەڵاتداری ناوچەکە ئەبن و ئەوان بڕیاری دوارۆژ و چارەنوسی گەلانی ناوچەکە ئەدەن.

لەبەر ئەوە شێخ مەحمود چاری نەمابو ئەو بۆشاییەی کە بە کشانەوەی هێزی عوسمانلی لە ناوچەی سلەیمانیدا پەیدابوبو ئەبوایەپڕی بکاتەوە و دەستی بەسەرا بگرێت، بەڵام زۆر باش لەوە گەیشتبوو کە تەنها بە خۆی و بە هاوکارەکانی ئەو سەردەمە کە هیچ جۆرە دەرامەد و چەک و جبەخانەیەکی ئەوتۆیان نەبوە کە

دەسەلاتێکی بە هێز و یەک گرتوو لە ناوخۆیانا سازبکەن و بتوانن هەتاسەر جڵەوی ناوچەکە بگرنەدەست و پارێزگاری لێ بکەن.

جگە لەوەش ئاگاداری ئەوە بوون کە ئینگلیزەکان لە بەغدا خەریکی دامەزراندنی دەزگایەکی کاتی بوون بۆ بەڕێوە بردنی کار و باری ناوچە عەرەب نشینەکان، لەبەر ئەوە شێخ مەحمود ویستی سوود لەو هەل و دەرفەتە وەربگرێ و بۆ ئەوە دەستی کرد بە پەیوەندی کردن لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کە لە ناوچەی سلێمانی نزیک بو بونەوە بە هیوای ئەوەی بەبێ شەڕ و کوشتار بێنە ناوچەکەوە و هاوکاری لەگەڵ یەکتردا بکەن.

شێخ مەحمود بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەک لە سەرکردەی عەشیرەتەکان و خەڵکی ناسراوی سلێمانی و دەوروبەری لە خۆی گردکردەوە بۆ ئەوەی لە ئینگلیزەکان بگەیەنێت کە ناوچەی خواروی کوردستان بێ خاوەن نیە و خەڵکی ئەو ناوچەیەش وەکو ناوچە عەرەبیەکانی عراق مافی ئەوەیان هەیە دەزگای کاروباری تایبەتی خۆیان هەبێت و کوردیش وەکو میللەتان بە مافی خۆی بگات.

شێخ مەحمود کە ئەو سەرۆک عەشیرەت و خوێندەوار و رۆشنبیر و پیاوی ئایینی و ناسراوەکانی بنە ماڵەکانی ئەو ناوچەیەی کۆ کردەوە بڕیاری دا بەناوی هەموانەوە داوا لە ئینگلیزەکان بکرێت کە بچنە ناوچەکەوە بە مەرجێک مافی میللەتی کورد بخرێتە پێش چاو و ماوەی ئەوەش نەدرێ کە جارێکی تر تورکەکان سواری سەری خەڵکی ناوچەکەببنەوە.

ئەو رۆژانەی کە شێخ مەحمود و هاوکارانی کەوتبوونە ئەو بیرکردنەوە و مشوور خواردن و تەقەلادانە بۆ کورد، رۆژێکی ئێجگار سەخت و دیژوار بوە و ئەو رۆژانە بوە کە خەڵکی ناوچەکە لەبەر برسیەتی و نەبوونی و ڕەش و ڕووتی لە پەل و پۆ کەوتبوون و بەرلەمە لە باسی باری ئابوری و پیشە سازی و بازرگانی لە کوردستاندا لەناو یاداشتەکانی رەفیق حلمی دا وێنەیەکی تاریکی ئەورۆزانەمان هەڵبژارد و بلاومان کردەوە کە چۆن خەڵک بەهۆی شەڕی جیهانییەوە تووشی برسیەتی و گرانیەک بوبون کە پیاولەگەڵ خوێندنەوی باسەکەی رەفیق حلمی دا دیمەنی ولاتێکی کەساس و داماو و میللەتێکی رەش و

برسی و لە ژیان بێزاربووی دێتە بەر چاو ... لەبەر ئەوە لەو رۆژە سەخت و تاڵەدا تاقە هیوایەک کە لە ئاسۆی کوردستاندا لە دوای وەستاندنی شەڕی جیهانی بەدی ئەکرا بریتی بوو لەو تروسکە ڕوناکاییەی وەکو ئەستێرەی کاروان کوژە لە ئینگلیزەکانەوە ئەهاتە بەر چاو و خەڵک وای لێ هاتبوو بە هەموشتێک قایل بێت هەر بەمەرجێک لە مردن و رەش و رووتی و برسیەتی ڕزگاری ببێت، بەتایبەتی لەو رۆژانەدا کە هەواڵی تازەی ناوچە داگیرکراوەکانی عیراق لەلایەن ئینگلیزەوە ئەگیشتە کوردستان کە چۆن ئینگلیزەکان خەڵکیان لە برسیەتی و ڕەش و ڕوتی ڕزگار ئەکرد، کوردیش بەو هیوایەی کە ئەویش بەو مەبەستە بگات و بێتەوە هۆش خۆی چاوەڕوانی هاتنی ئینگلیزەکان بوون. لەبەر ئەوە لەو رۆژانەدا چ بەلای شێخ مەحمودەوە و چ بەلای خەڵکی ناوچەکەوە وابوو کە بیرنەکردنەوە و هەوڵ نەدان بۆ بەستنی پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ ئینگلیزی ئەو رۆژەدا، ئینگلیزی دەسەڵاتداری خاوەن فرۆکە و خاوەن چەک و جبەخانە و سوپا و لەشکری بەهێزی بەکیش کراو، بەشتێکی زۆر نەزانانە و گەمژە و گێلانە دائەنرا و مانای ئەوەبوە ئەوەی کە بەربەرەکانی هاتنی بکردنایە، لە مەبەستی ماڵ کاول کردن و مردنی هەژارانی رەش و رووت بەولاوە هیچی تری لێ دەسگیر نەدەبوو...هەواڵی بڵاوکردنەوەی نان و خۆراک و جل و بەرگ لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە بەسەر خەڵکی ئەو ناوچانەدا کە لە برسییەتی و گرانی شەڕی جیهانی رزگاریان بووبوو بەناو هەموو کوردستاندا بڵاوببوەوە، بۆیە هەموو لایەک زۆر پەرۆشی ئەوەبوون کە بەزوترین کات ئەو فریشتەیە بگاتە کوردستانیش. بەڵام لێرەدا چەند پرسیارێک دێتە پێشەوە:

ئەگەر شێخ مەحمود و هاوڕێکانی دەسپێشکەرییان نەکردایە و پەیوەندییان لەگەڵ ئینگلیزەکان نەکردایە و بەهێمنی و بەئاسایشی رێگایان نەدایە بێنە ناو کوردستانەوە، ئایا ئینگلیزەکان بەرامبەر بەوە هەڵوێستیان چۆن ئەبوو؟ ئایا هەروا سووک و باریک بێدەنگ ئەبوون و وازیان لە خەڵکی ناوچەکە ئەهێنا بەئارەزوی خۆیان کاروباری خۆیان ببەن بەڕێوە؟

یا ئەگەر شێخ مەحمود بیویستایە هاوکاری لەگەڵ تورکەکاندا بکا و بەهیوای ئەوان تەنها خۆی و ئەوسەرۆک عەشیرەتانەی کە ئەورۆژە لەدەوری گردبوونەوە،

بەوانە بە هەموویان دەسەڵات و توانای ئەوەیان هەبوە کە ڕێگە لە هاتنی ئەو لەشکرە زۆر و پڕچەکەی ئینگلیز بگرن بەخۆی و بەفڕۆکە و تۆپ و زرێلیەوە و ماوەی نەدەن بگاتە ناو کوردستان لە کاتێکدا هێزی دەوڵەتی عوسمانلی خۆی لەبەر ئەو هێزە دانەگرتبوو هەتا شاری موصلیشی بەبێ شەڕو کوشتار بۆ بەجێ‌هێشتوو؟

یاگریمان تورکەکان بۆ ماوەیەک یارمەتی شێخ مەحمودیان داو توانیان ڕێگە لە هاتنی ئینگلیز بگرن بۆ کورستان، ئایا تورکەکان ئەوەندە پیاوبون کە بیر لە مافی کورد بکەنەوە؟

ئەوەی لەو ڕۆژانەدا پڕ و پاگاندەی ئینگلیزەکانی بیستبوو، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)دا لە بەغدا بە کوردی بڵاو ئەکرایەوە کە ئۆرگانی لەشکری داگیرکەری بەریتانیا بوە لەوڕۆژانەدا کە لەلایەکەوە کوردی هان ئەدا دژی تورک بوەستن و لە کوردستاندا دەریان بکەن و لەلایەکی تریشەوە سەرزەنشی بێدەنگ بوونی کوردی ئەکرد و هەڕەشەی ئەوەی لێ ئەکردن ئەگەر زوو نەیەنە دەست و فریای خۆیان نەکەون و هاوکاری لەگەڵ ئینگلیزەکانا نەکەن بۆ دەرکردنی تورک لە کوردستاندا، ئەوا ئیتر میللەتی کورد بێ بەش ئەکرێ لە مافی خۆي و ئۆبالی ئەو بێ بەش بوونەی کورد بە ئەستۆی کوردە دەسەلاتدارەکان ئەبێ.

ئایا ئەگەر شێخ مەحمود لەو ڕۆژانەدا ئەو سیاستەی بەکار نەهێنایە و ئەو هەلْ و دەرفەتەی لە کیس بدایە و ئینگلیز بە زۆرە ملی و بەشەڕ بهاتایەتە ناو کوردستانەوە ئەنجامەکەی لەوە باشتر ئەبوو کە بەئاسایش ڕێگە درا ئینگلیز بێتە کوردستانەوە؟

یا ئەگەر ئینگلیز بەشەڕ بهاتایەتە کوردستان و شێخ مەحمود ڕێگەی لێ بگرتنایە کە هیچ ئەنجامێکی نەدەبوو، ئایا زۆر کەس لەو ڕۆژانەدا و لەدوارۆژدا چییان بە شێخ مەحمود ئەووت؟

هەر ئەو شێخ مەحمودە لەدواییدا کە بۆی دەرکەوت ئینگلیزەکان دەستی ئەبڕن و یاری پێ ئەکەن و ئەیانەوێ وەکو نۆکەرێکی بەکرێ گرتە بەکاری بێنن بۆ ئامانجەکانی خۆیان، کە ڕوو بە ڕوویان بوەوە و خەباتی کرد ودایە شاخ ئایا لە

ڕەخنەی ئەوە ڕزگاری بوو کە زۆر کەس ئەیان وت ئەبوایە شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیز تێکی نەدایە و هەل و دەرفەتی لەکیس خۆی نەدایە؟
لە دواییدا شێخ مەحمود ئەوەشی تاقی کردەوە لەگەڵ ئینگلیزەکانا و بە هەموو جۆرێک لەگەڵیانا ڕۆی بەرێوە بلاّم سوودی نەبوو وەکو لە شوێنی خۆیدا ڕوونی دەکەینەوە.

بێگومان وەکو لە داهاتوودا بۆمان دەرئەکەوێ ئینگلیز تەنها بۆ ئەوە نەهاتبوو کە لە سنووری کفری و کەرکوک‌دا بمێنێتە، بەڵکو لەمێژ بوو نەخشەی داگیرکردنی خواروی کوردستانی کێشابوو، دەمێک بوو دەمی لیکی ئەکرد بۆ خێر و بێری کوردستان و بەهیچ جۆرێک دەس بەرداری چاڵە نەوتەکان نەدەبوەوە کە یەکێک بووە لەو هۆسەرەکیانەی کە ئینگلیز ڕووی کردبوە میسۆبوتامیا و بەرەو کوردستان هێزەکانی ئامادەکردبوو.
ئەرنۆڵد ویلسن، حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا لە کتێبەکەیدا لەو ڕووەوە ئەڵێ:«٣٧»

«ئینگلیزەکان بەسەرکردایەتی (جنەڕاڵ مارشاڵ) بڕیاریان دا کە لە بەغداوە بەرەو ژوور بنەوە بۆ کەرکوک و سلێمانی بۆ ئەوەی ئەو فشارەی کە تورکەکان بە سەرکردایەتی (ئەنوەر پاشا) خستبویانە سەر ئازەربەیجان کەم بکرێتەوە.
جەنەراڵ مارشاڵ لەبەر هەندێ هۆی عەسکەری بڕیاری دا سلێمانی داگیر بکات، ئینگلیزەکان بەر لەوە کەرکوکیان لە ١٩١٨/٥/١٧ دا گرتبوو وەلە ١٩١٨/٥/٢٧ دا بۆ ماوەیەکی کاتی چۆڵیان کردبوو وە تورکەکان چوبونە ناویەوە، بلاّم ئینگلیزەکان جارێکی تر کەرکوکیان گرتەوە و تورکەکانیان لێ دەرکرد.»
کەواتە ئینگلیزەکان بڕیاری ئەوەیان دابوو واز لە سلێمانی نەهێنن ... دەمێک بوو بە هۆی گەڕۆک و ڕۆژ هەلاّتناسەکانیانەوە شارەزای کوردستان و ئاگاداری ناکۆکی نێوان عەشیرەتە کوردەکان بووبوون و دڵنیابوون لەوەی کە کورد هەروا بەئاسانی پێکەوە نالکێت و هیچ سەرۆک عەشیرەتێک بە سەرکردایەتی ئەوی تر قایل نی یە، بۆیە لەژێر تیشکی ئەو سەرنج و ئاگاداربوونەدا ماوەیەک بوو نەخشەی داگیرکردنی کوردستان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئامادەکرابوو، لەبەرئەوە

بەربەرەکانی کردنی ئینگلیز لەو ڕۆژانەدا لەلایەن شێخ مەحمودەوە لەو بارو هەڵوێستەی ئەو سەردەمەدا لە وێران کردنی سلێمانی و لە ماڵ کاولکردنی ئەو خەڵکەی کە تازە لە گیانە لای برسێتی ڕزگاری بوبو هیچی تری لیٚ نەدەهاتە ئەنجام

بەڵیٚ ئینگلیز بەپێی نەخشەیەکی تایبەتی خۆی ئامادەکردبو بێتە کوردستانەوە،کوردستانی پڕ لە کشت و کاڵ و پڕ لە مەڕ و ماڵات و توتن، کوردستانی پڕ لە چاڵە نەوت کە هەتا ئەو ڕۆژانە هێشتا ئینگلیز بایەخی ئەو نەوتەی لای کەس نەدرکاندبوو بگرە هەندێک لە کار بەدەستانی خوشیان لە میسۆپۆتامیادا بە تەواوی لەنرخ و گرنگی ئەو چاڵە نەوتانەی کوردستان نەگەیشتبون و تەنها حیساب بۆ گرنگی ستراتیژی شوێنی کوردستان و بەرهەمە کشت و کاڵییەکان ئەکرا، بەلاٌم لە دوای چەسپاندنی دەسەلاٌتی ئینگلیز بەسەر چاڵە نەوتەکاندا دوای ئەوەی کە فەرەنسە و دوای ئەوانیش تورکەکانیان هەریەکە بەجۆرێک دەمکوت کرد و کە هەمووشتێکی بۆ ساغ بوەوە ئەوسا ڕاستیی بایەخدانی خۆی بە کوردستان و بە نەوتی کوردستان ئاشکرا کرد وەکو لە شوێنی خۆیدا روونی ئەکەینەوە .

بەڵیٚ ڕاستە ... ئەو ڕەخنەیە هەیە لە شێخ مەحمود کە وەکو هەندیٚ لە نوسەران بۆی چون کە ئەبوایە پەلەی نەکردایە و ساتێک خۆی و هاوکارەکانی کە بڕیاریاندا پەیوەندی بە ئینگلیزەوە بکەن ئەبوایە پێشەکی زۆرشتیان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا باس بکردایە و شتیان بەنابینایی و بە تەماوی و لەژێر پەردەدا نەهێشتایەتەوە (لە شوێنی خۆیدا بە دوورودرێژی باسی ئەو ڕەخنەیە و هەندیٚ ڕەخنەی تر لە حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود باس ئەکەین)بەلاٌم وەکو دوکتۆر جەماڵ نەبەز لە کتێبەکەیدا ئەڵیٚ:«١٥»

« شتێکی ناڕەوایە کە هەڵوێست و ڕووداوی حەفتا ساڵ لەمەوبەر بەکێش و پێوانەی ئیمڕۆ بکێشریٚ و بپێوریٚ»

لە ڕاستیدا کورد نەک هەر لەوەدا کە خاوەنی تاقی کردنەوەیەکی سیاسیی ئەوتۆو شارەزای کەڵەک و پلانی وڵاتان نەبوە و لەو باسەدا دووربینی نەکردوە و ساویلکانە و بەپەلە بۆ مەبەستەکەی چوە بلاٌم بەداخەوە ئەواڵە دوای

تێپەربوونی حەفتا ساڵ بەسەر ئەو کورت‌بینییەی ئەو رۆژانەدا بارەها کورد تووشی داوی تەفرەی بێگانەبوە و بەزمانی لووس لە خشتەبراوە و داخوازیە سەرەکیەکانی هێشتوەتەوە بۆ دوارۆژ کە بێگومان دوارۆژ سەدان رووداو و بەسەر هاتی تازەی تیادا پەیدا بوە کە بوەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەو لێک ترازاندنی شیرازەی ئەو کارانەی پێشوو، ماوەی داوە بە دوژمن لە بەڵێنەکانی پاشگەز بێتەوە کە لە ئەنجامیا کورد توشی گەلێک نووچدان و هەرەسهێنان و ماڵ کاولی بوە.

زنجیرەی ئەو تەفرەدان و هەسان لە پێدانەی کورد شتێکی تازە نیە ... دەس برینی کەمالیەکان لە ناوچەی ئەنادۆل کە چۆن بۆ ماوەیەک کوردیان تەفرەدا هەتا ئەو کاتەی یۆنانیەکانیان دەرکرد و جێ پێی خۆیان چەسپاند و ئەوەبوو پەیمانی سیڤریان گۆری بە لوزان، ئەوسا بەئاشکرا بە کوردیان وت: بەڵێنی چی و پەیمانی چی؟ ئێوە تورکن و پێویستە بەوە قایل بن و ئەگەر بێدەنگ دانەنیشن پانتان ئەکەینەوە کەلە راستیدا چۆنیان ویست ئەنجامیان بەوجۆرە گەیاند و کوردیان ماڵ وێران و سەرگەردان کرد...

کورد لە کۆماری مەهابادا کە چاوەروانی یارمەتی سۆڤییەت بوون، کاتێکیان بە خۆیان زانی سۆڤییەت لەگەڵ قوام السلطنەی ئێراندا رێک کەوتن و بارگە و بنەیان لەو ناوچانەی کوردستان و ئازربێجان پێچایەوە و لە چوارچرای مەهابادا قازی محەمەدی تێکۆشەر و هاورێکانی کران بە سێدارەدا بەبێ ئەوەی فزە لە هیچ لایەکەوە بێت !!

تازەترین و زەق ترین نموونەی کورت بینی و خۆش بروایەتی کورد کە هێشتا کاس و ووری ئەو دەسبرینەین کە لەبەیانی ئازاری ۱۹۷۰ دا خۆی ئەونوێنێت کە بەداخەوە لە و بەینەدا گزی و دەست برینەکەی هەر لەسەرەتاوە دیاربوو کە ناونرا (بەیان)، نەک رێک کەوتن (اتفاق) کە لەوەدا کوردیان بەلایەک حساب نەکردبوو لەرێکەوتنی ئازاردا . . لەو بەیانەدا زۆر شت لەگەڵ میریدا بەتەماوی و ئاڵۆزکاوی هێڵرابوەوە کە ئەبوایە هەر لەسەرەتاوە ئەوسا کە دوژمن لاوازبوە هەموشتێک بریاری لەسەر بدرایە نەک بخرایەتە دوای چوارساڵ کە لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا وای لێ هات ئەو شۆرشەی کە توانی بەر لە بەیانی ئازار بە

(۱۰) هەزار پێشمەرگە حکومەت ناچار بکا دان بە مافی ئۆتۆنۆمی دا بنێت بەڵام بە داخەوە لە دوای چوار ساڵ بە (۱۲۰) هەزار پێشمەرگە نەتوانرا رێگە لە هەرەس هێنانی ئەو شۆڕشە بگرێت ... ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە هێشتا ئیمرۆش هەر دەرس لەو رووداوانە وەرناگرین ...

## مەبەستی راستیی ئینگلیز لە هاتنیا بۆ کوردستان
## أـ چەسپاندنی دەسەلاتی ئینگلیز لە کوردستاندا

که ئینگلیزەکان خواروی عیراقیان گرت، وەکو لەزۆر شوێنی تریشدا باسی ئەکرێ ئینگلیز لە نەخشەیانا ئەوەیان خستبوە بەرچاو کە تەنها بەناوەڕاست و خواروی عیراقەوە نەوەستن بەڵکو لە مێژبوو سیاسەتمەدارانیان بڕیاریان دابوو دەست بەسەر کوردستانیشدا بگرن.
بێگومان ئینگلیزەکان حەزیان ئەکرد ئەگەر بۆیان دەس بدا (کە بۆی دەست دان) بەبێ تەقە و شەڕ و خوێن رشتن وبەئاسانی بگەنە سنووری ئەو شوێنانەی مەبەستیان بوو ... ئینگلیزەکان لەوە گەیشتبون کە تورکەکان بەئاسانی دەس بەرداری ولایەتی موصل نابن و بەبێ گێچەڵ رێگەی ئینگلیز نادەن دەس بەسەر ئەو ویلایەتەدا بگرن، لەبەر ئەوە لە سەرەتادا کوردیان بۆ دوو مەبەست ئەویست.
یەکەم:
بۆ ئەوەی سوود لە کوردەکان وەربگرن و هەستی نەتەوایەتیان بجوولێنن دژی تورک و واله دانیشتوانی ویلایەتی موصل بکەن کە بەگەڕانەوەی تورک قایل نەبن.
دوهەم:
بۆ ئەوەی بەپێی ئەو نەخشەیەی کە کێشابویان بتوانن لە دوارۆژێکی نزیکدا کوردستان بلکێنن بە میسۆپۆتامیاوە تا بەهۆی ئەوەوە بتوانن لەنگەری دەسەلاتی خۆیان بەوەڕابگرن کە عەرەب و کورد هەرلایەکیان سەرپێچیان کرد بەرامبەر بە ئینگلیزەکان لاکەی تری لێ راست بکەنەوە و لە جووڵەی بخەن.
ئینگلیزەکان وەکو لە نوسینی ئەفسەرە سیاسیەکان و یاداشتەکانیانا دەرئەکەوێ و وەکو دوکیۆمێنتەکانی ناو ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەری ئەخەن، هەر لە سەرەتاوە شێخ مەحمودیان بەدڵ نەبوە و هەمیشە هەوڵیان داوە دەست و

پیٚ بەستی بکەن ...

ئینگلیزەکان ئەیانویست شێخ مەحمود وەکو (راجا)یەکی ناو هندستان دەستێکی بە سنگەوە بگرتایە بۆ ئەوان و بەدەستەکەی تریشی چەک هەڵگریٚ و سەرۆک عەشیرەتەکان لە خۆی کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی رووبەرووی تورکەکان بێتەوە کە تا ماوەیەک لە داواکردنەوەی ویلایەتی موصل کۆڵیان نەدابوو بلاّم ئینگلیزەکان زوو بۆیان دەرکەوت کە شێخ مەحمود ئەو پیاوە نەبوە کە ئەوان لە ناوچەکەدا بە دوایا ئەگەڕان ... ئەیان ویست شێخ مەحمود وەکوو کاپتن بابەکری سەلیم ئاغای پژدەری بە مووچە و مانگانەی خۆی قایل بیٚ و بیر لە کورد و کوردستان نەکاتەوە و گویٚ نەداتە رەخنە و سەرزەنشی ئەو خەڵکەی کە بۆیە لە دەوری شێخ مەحمود گرد بوبونەوە چونکە ئەیانویست لە سایەی ئەوا میلەتی کورد ئازادبیٚ و ولاّتەکەیان رزگاربێت لە دواکەوتن ...

وەکو ئینگلیزەکان لە شێخ مەحمود گەیشتبون، هەروەها شێخ مەحمودیش لەوان گەیشتبوو، ئەیزانی دەستی پیٚ ئەکەن و کە ئیشیان پێی نەما ئیتر رەئیس عەشیرەتە کوردەکانی لیٚ هان ئەدەن کەلێی بتەکێنەوە و بەسەرکردایەتی ئەو قایل نەبن ...

وەکو لە شوێنێکی تریشدا باسی ئەکەین جارێک یەکێک لە ئینگلیزەکان لە شێخ مەحمود ئەپرسێت : تۆ تێمان ناگەیەنیت چیت لە ئێمە ئەویٚ؟ شێخ لە وەرامدا ئەڵیٚ زۆرباش ئەزانم چیم لە ئێوە ئەویٚ، بەلاّم نازانم ئێوە چیتان لە من ئەویٚ؟

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا ئەڵیٚ:«٢١»

«عیزەت مدفەعی کە زۆر جار نوێنەری باوکم بوە و لایەنگری باوکم بوە بارەها لێم بیستوە ئەیوت ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتاوە، چ لە بەغدا و چ لە کەرکوک، کە بەناوی شێخ مەحمودەوە پەیوەندیم پێوە ئەکردن و باسی داوای مافی میللەتی کوردم لە گەلاّ ئەکردن، هەموو جارێک شتێکیان دووبارە ئەکردەوە کە پێیان ئەوتم : ئێوە پێویستە پەیوەندی بە شەریف حسێنی حجازەوە بکەن و لە رێگای ئەوەوە داخوازیەکانی خۆتان پێشکەش بکەن ( ئەوسا هێشتا فەیصەڵ لەئارادا نەبوە و نەهێنرابو بۆ عێراق بۆ ئەوەی بکرێت بە مەلیک)،

عیزەت ئەیوت : ئێمەش هەموو جارێک لە ئینگلیزەکانمان ئەگەیاند کە ئێمە بۆ ئەوە نەهاتوینە لای ئێوە کە (بەیعەت) بە شەریف حسێن بکەین، ئێمە کوردین ... هاتوین باس و داوای مافی نەتەوەکەی خۆمان ئەکەین لەناو خاک و وڵاتی خۆمانا.

عیزەت ئەیوت: ئینگلیزەکان ئەیان ویست بە شێخ مەحمود بڵێن کە پێویستە پەیوەندی لەگەڵ شەریف حسێن دا بکات چونکە ئێمە کەلیمەی شێخ مەحمودمان لەو روەوە زۆر لا مەبەستە ... بەڵام ئێمەش قەت ئەوەی ئینگلیزەکانمان بە شێخ مەحمود نەدەگەیاند چونکە پێشەکی ئەمانزانی بە هیچ جۆرێک بەوە رازی نابێت و ئەگەر شتی وامان بۆ بگێڕایەتەوە دەم و دەست شێتگیر ئەبوو کە بەلای عیزەت مدفەعی یەوە لەو کاتە ناسکەدا سوودی کوردی تیادا نەبوە . »

دوو روویی ئینگلیز لە هەڵوێستیاندا بەرامبەر کورد لە تام دەرچوبوو ... لەلایەکەوە بە عیزەت مدفەعیان ئەوت پێویستە بە شێخ مەحمود بڵێی کە لە رێی (شەریف حسێن)ەوە پەیوەندیمان پێوە بکا کەچی لۆنگریک لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: «٤٣»

« لە ساڵی ١٩١٥- ١٩١٦ دا سێر ماکماهۆن لەگەڵ شەریفی مەکەدا باسی حکومەتێکی عەرەبی کردوە وە کە هاتوەتە سەرباسی عەرەب لە عیراقدا تەنها باسی ویلایەتی بەصرە و بەغدای کردوە و بە هیچ جۆرێک باسی ویلایەتی موصل و کوردستانی نەکردوە . »

بێگومان ئەمەشیان هەر لە کۆنەوە هەر بۆ جامبازییەکی دوارۆژ هێشتوەتەوە کە فەیصلیشیان هێنا و کردیان بە مەلیک لە عیراقدا لە زۆر هەڵوێستدا لە فەیسلیان ئەگەیاند کە کوردستان بەئاسانی نالکێنرێت بە دەوڵەتەکەیەوە ئەگەر پەیمانێکی دورودرێژی تایبەتیان لەگەڵا مۆرنەکا و بەر لەویش وەکو وتمان لە شێخ مەحمودیان گەیاندبوو کە پێویستە لە رێگای شەریف حسێنەوە پەیوەندیان پێوە بکا کە ئەمەش هەڕەشەیەک بوو بۆ دواڕۆژی کورد و ئەگەر بە تواوی خۆی نەبەستێتەوە بە سیاسەتی ئینگلیزەوە کورد چاری نیە ئەبێ بچێتە ژێر باڵی حکومەتی عیراقەوە .

که شێخ مەحمود بوو بە حوکمدار و بیری لەوە کردەوە کە کوردستانیش وەکو عیراق ببێت بە حکومەتێکی کوردی و خاوەنی دەسەلاّتی خۆی بێت، ئینگلیزەکان ئەو تەقەلاّیەی شێخ مەحمودیان بەلادان و سەرپێچی کردن دانا بۆیە دەست و برد کەوتنە ئەوەی لە سەرەتادا دەسەلاّتی کەم بکەنەوە بۆ ئەوەی لە دوای ئەوە لە ناوی ببەن.

لە حوزەیرانی ١٩١٩ دا سکرتێری وەزارەتی هندستان لە لەندەن تەلگرافێکی نارد بۆ حاکمی گشتی بەریتانی لە بەغدا کە بە پەلە هەواڵی ناوچەی کوردنشینەکانیان بۆ بنێرێت لەگەڵ سەرنج و پێش نیاری خۆی دەربارەی هەڵوێست لە کوردستاندا، حاکمی گشتی بەریتانیا لە ١٩١٩/٦/١٣ بەم تەلگرامە وەرامی وەزارەتی هندستانی دایەوە لە لەندەن:

« لەبەر چەند هۆیەکی ئابووری و ستراتیژی وە بۆ ئەوەی دەوڵەتی عیراق کەڵک و سوود لە ناوچە شاخاویە پڕ دارستانەکان وەربگرێت کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن نیاز وایە سلێمانی و رانیە و کۆیسنجەق بخرێتە سەر میسۆپۆتامیا و هەولێر کە بەشێکی هێڵی شەمەندەفەری بەرەو موصل پێک ئەهێنت پێویستە لە کوردستان جیاکرێتەوە و ئەبێ دهۆک و زاخۆش بخرێتە سەر میسۆپۆتامیا (بلاّم لەو تەلگرامەدا باسی ئامێدی ناکا چونکەهەتا ئەوکاتە هێشتا ناوچەی ئامێدی لە ناو سنووری تورکیادا مابوەوە وەکو لە دواییدا لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین کەچۆن خرایەوە ناو سنووری عیراق. »

هەر لەو رۆژانەدا پەیامنێری رۆژنامەی تایمس لە لەندەن لە رۆژهەلاّتی ناوەراستەوە لە تەلگرافێکدا بۆ وەکالەتی (رۆیتەر) ئەڵێ «[١٤]»

«لکاندنی خوارەوەی کوردستان بە میسۆپۆتامیاوە ئاسایش لە ناوچەکانی خانەقین و سلەیمانیدا ئەچەسپێنێت، جگە لەوە ئەو پێکەوەلکاندنە بۆ ئێمە شتێکی زۆر گرنگە چونکە ئێمە (بەریتانیا) بەر پرسیارین بەرامبەر بە ولاّتی فارس. »

## ب ـ نەوتی کوردستان و تەقەلاّی ئینگلیز دەربارەی نەوتی کوردستان

ئەو هەموو دەردو بەلاّ زۆرەی کە تووشی ناوچەی رۆژهەلاّتی ناوەراست بوە و تا ئێستەش هەر ئاسایشی بە خۆیەوە نەدیوە و نیازیش نیە ئەو ئاسایشە بەم زوانە لەو ناوچەیەدا بەرپابێت، سەرەتاکەی ئەگەرێتەوە بۆ ئەو رۆژانەی هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی بریتانی هندستانیان داگیر کرد و نوێنەری مەلیکی بەریتانیایان لێ دانا کە راستە وخۆ هندستان لەلایەن ئەو نوێنەرە و وەزیرێکی تایبەتی کە لە لەندەن بەناوي وەزیری کاروباري هندستان دانرا ئەبرا بەرێوە. ئیتر لەو رۆژەوە سەرمایەدارانی بەریتانیا دەستیان کرد بە کێشانی نەخشەیەکی دوورودرێژ بۆ ئەوەی هندستان بە جۆرێکی هەمیشەیی لە ژێر دەسەلاّتی خۆیانا بهێلنەوە.

بۆ گەیشتنی بەو مەبەستە پێویستیان بەوە هەبوو ئەو رێ و بانانەی کەهات و چۆی بەریتانیایان ئەبەست بە هندستانەوە (بێجگە لەوەی کە ئەبوایە رێ و بانی دەریاش موسوگەر بکەن) بیانخەنە ژێر دەسەلاّت و چاودێری خۆیانەوە ئەگەر بۆشیان نەکرا لەژێر دەسەلاّتی خۆیانا بێت هەر هیچ نەبێ رێگە نەدەن بەو دەولّەتانەی بەربەرەکانی دەسەلاّتداریەتی بەریتانیایان ئەکرد دەست بە سەر ئەو رێگا و بانانەدا بگرن.

ئینگلیزەکان بە هێزی ئەو دەزگا فراوانەی لە هندستاندا دایان مەزراندبوو بەراست و چەپدا دەستیان کرد بە پەل هاویشتن و لووت تێ ژەنین لە کاروباري ئەو ناوچەیە و بە هەمولایەکدا وەکو شێرپەنجە بلاّوبوونەوە و رەگیان داکوتا، ئەگەرچی لەم روەوە لە ئەفغانستانی ئەوسا هیچیان دەسگیر نەبوو چونکە ئەو هێرشەی کە ناردبویان هەموی لەناوچوو تەنها ئەو دوکتۆرەی کە لەگەلّ ئەو هێرشەدا نێردرابوو بەساغی گەرابووەوە. پاش ئەوەی ئینگلیزەکان دەسەلاّتیان لە خلیجی فارسدا بەهێز کرد و دەستیان گرت بەسەر نەوتی خوارووی ئێرانا، ئینجا

کەوتنە خولیاوسەودای مرخ خۆشکردن لە خێر و بێری ولاْتانی ژێر دەستی عوسمانلی و بۆ ئەوە ماوەیەک بوو گەڕۆک و میسونێر و بازرگانەکانیان بە ئاشکرا و بە نهێنی بە هەموو لایەکدا بلاْو بوونەوە و دەستیان کرد بە گەڕان بۆ کۆکردنەوەی هەوالْ و دەنگ و باس و شارەزابوون لە باری ئابووری و کۆمەلاْیەتی و ئاینی هەر ناوچەیەک لەو ناوچانە بە جۆرێکی تایبەتی کە ولاْتی کوردستانیش بەشێک بوە لەو نەخشەیەی کە بەریتانیا بۆ ئەم مەبەستە کێشابووی.

کلۆدیۆس ڕیچ لە گەشتەکەی سالْی ۱۸۲۰یدا بۆ کوردستان «٤٨»، ئەو ڕۆژانەی ئەو گەشتەی تیادا کردبوو هێشتا ئەمارەتی بابان لەناو نەچوبوو، ڕیچ ئەو سەردەمە نوێنەری شرکەی ئەفریقی بوە لە هندستان و (لە دواییدا کرا بە قونسولی بەریتانیا لە بەغدا) لەو گەشتەیدا شارەزاییەکی تەواوی پەیدا کردووە و دەربارەی هەموو شتێک سەرنجی خۆی تۆمار کردووە و هەرچی بۆ خۆی و بۆ بەرژەوەندی دوارۆژی ولاْتەکەی پێویست بووبێت هەموی تۆمار کردووە و هەتا باسی شەڕەکەوی ئەوسەردەمەشی لە بیرنەچوە کە باسی بکا چۆن ئەو خەلْکە لەو ڕۆژانەدا بایەخیان پێداوە.

ئەدمۆنز لەکتێبەکەیدا (کورد،تورک،عەرەب)«٤٥» ولۆنگریک لەکتێبەکەیدا «٤٣» هەردوکیان باسی ژمارەیەک لەو گەڕۆک و میسونێر و ئەفسەرانەیان باس کردوە کە چوونە کوردستان و هەریەکەیان سەرنج و باسی گەشتەکەی خۆی تۆمارکردوە و هەریەکەیان ڕاپۆرتی خۆی داوە بەکاربەدەستانی ولاْتەکەی خۆی کە بێگومان بەر لە چونیان هەر یەکەی فەرمانێکی پێ سپێردراوە و بۆ مەبەستێکی تایبەتی ڕاسپێردراوە.

ئینگلیزەکان بەر لە هەموو کەسێک بایەخی نەوتیان زانیوە و داگیرکردنی هندستان و نزیک بوونەوەیان لە ڕۆژهەلاْتی ناوەڕاست و دەست گرتنیان بەسەر نەوتی خوارووی ئێراندا ئەوەندەی تر خستونیە سەر ئەوەی بایەخ بدەن بە بوونی نەوت لە شوێنەکانی تردا کە نەوتی ولایەتی موصلْ یەکێک بوە لەوانەی ئینگلیز لە زووەوە چاوی تێ بڕیوە و نەخشەی بۆ کێشاوە کە بیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە.

له زه‌مانی عوسمانلیدا (گڕی بابه گوڕگوڕ) هێشتا وه‌کو ئه‌مڕۆ کڵپه و بڵێسه‌ی به‌رز نه‌بوبوه‌وه و نه‌چوبو به ئاسماندا ... نه‌وت هێشتا له ژێر زه‌میندا بوه و په‌نگی خواردبوه‌وه و تاکو لۆکه خه‌ڵکی ئه‌و سه‌رده‌مه جاروبار به که‌ر و بار له هه‌ندێ زه‌وی و زاری ناوچه‌ی که‌رکوکدا نه‌وت و قیریان هه‌ڵێنجاوه و به که‌ر و بار فرۆشتویانه و چه‌ند خێزانێکی کۆن و بنه‌ماڵه‌ی شاری که‌رکوک به‌و هۆیه‌وه به قیردار و نفطچی ناو بانگیان ده‌رکردوه .

وادیاره له‌و سه‌رده‌مه‌دا نه‌وت وه‌کو ده‌رمانیش به‌کارهێنراوه به نیشانه‌ی ئه‌وه‌ی شێخ ره‌زای تاڵه‌بانی له شیعرێکی دا که باسی ئێستره‌که‌ی ئه‌کا ئه‌ڵێ «چه‌ند قروشێکم هه‌بوو بۆم دا به نه‌وت و عه‌نزه‌رووت».

له مه‌قاڵێکی تایبه‌تیدا که مامۆستا جه‌رجیس فه‌تحوالله ده‌رباره‌ی نه‌وت له ژماره (٢)ی گۆڤاری (الثقافه الکردیه)ی مانگی مارت ١٩٩٠ که له له‌نده‌ن بلاْوکراوه‌ته‌وه نوکته‌یه‌کی تێدایه ده‌رباره‌ی نه‌وت ئه‌ڵێ :

(که‌ساتێک موئته‌مه‌ری ڤێرسای به‌سترا و لوید جۆرجی بریتانی داوای له کلیمه‌نسۆی فه‌ره‌نسی کرد که ده‌سبه‌رداری ولایه‌تی موصلْ بێت بۆ ئینگلیز، کلیمه‌نسۆ پێی ئه‌ڵێ باشه بۆ ئێوه ... موسته‌شاری کلیمه‌نسۆ ئه‌چرپێنێت به گوێدا و ئه‌ڵێ : چۆن موصلْ ئه‌ده‌ی به‌وان؟ ئه‌ی نازانی نه‌وتی تێدایه؟.. ئه‌ویش ئه‌ڵێ : جا نه‌وت چیه هه‌ر کاتێک پێویستم به نه‌وت هه‌بوو ئه‌چمه سه‌یده‌لییه‌ک ئه‌یکڕم)... (وادیاره ئه‌وسا نه‌وت له سه‌یده‌لیه‌کاندا فرۆشراوه ).

کوردی ئه‌و سه‌رده‌مه هێشتا سه‌ر گه‌رمی نوری خوا و جادوو و نوشته بوون و نه‌یانده‌زانی ژێر خاکی ولاْته‌که‌یان خاوه‌نی ده‌ریایه‌کی نه‌وتی ژێر زه‌مینه و نه‌یانده‌زانی رۆژێک دێ ئه‌و نه‌وته ئه‌بێته ئاگر و به‌ر ئه‌بێته گیانی خه‌ڵکی کوردستان . خه‌ڵکی ساوێلکه‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه جار و بار چیلکه‌یان له زه‌ویه‌کانی بابه‌گوڕگوڕ ئه‌ژه‌ند و گڕێک به‌رزده‌بووه‌وه و ده‌یانگوت ئه‌وه نووری خوایه ... نه‌یانده‌زانی نووری شه‌یتانه و کوردستان دائه‌پڵۆخێنێت ... ژنی نه‌زۆک ده‌چوه سه‌ر بابه‌گوڕگوڕ و لێی ده‌پاڕایه‌وه و ده‌یگوت :

بابه گوڕگوڕ ... بابه‌گوڕگوڕ ... هاتوم به‌نیازی سکی پڕ ... بابه‌گوڕگوڕ هاتوم بۆ کوڕ ...

ئەوەبوو هەر کە ئینگلیز پێی نایە کوردستانەوە، ئیتر نەخشەی ئەوەی کێشا کە ئەبێ کوردستان بلکێنرێت بە میسۆپۆتامیاوە و لەوساوە بە هۆی نەوتەوە کورد لە ژێر باری سیاسەتی بەریتانیادا ئەناڵێنێت و لەوساوە بەقەد دڵۆپەکانی ئەو نەوتەی لەبیرەکانی بابەگوڕگوڕ هەڵێنجراوە خوێن و فرمێسک لە لەش و لە چاوی میلەتی کورد و لە ڕەش و رووتی چەوساوەی کورد ئەڕژێ و سیاسەتی ئینگلیز لەوساوە بەرامبەر بە کورد نەگۆڕاوە و ناگۆڕێ کە بریتیە لە لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی کورد و گوێچکە پڕکردن لە وتەی عیراق و عیراقچیەتی و لە پیرۆزیی سنووری عیراق و لێک جیانەبوونەوەی کوردستان و هەردەمەی بە ئاوازێک و بە قەوانێک بە قەد و بالای ئەو سنوورەدا هەڵدەدرێ کە کار بەدەستانی ئەو سەردەمەی ئینگلیز وەکو ویلسن و پیرسی‌کۆکس و کۆرنوالیس و ئەدمۆندز و مێجەرسۆن نەخشەیان بۆ کێشابوو، ئەگەر چی هەندێک ڕێژگا و هێشتا ئەو سنوورە دەسکردە بە پیرۆزدائەنێت و بەلایانەوە گرانە لەناوا نەمێنێت.

ئینگلیز هەتا ئیستا وە نەبێ تەنها هەر بەداپلۆسینی کورد لەلایەن ڕژێمەکانی عیراقەوە وازی هێنابێت، بەڵکو لە هەرکاتێکدا خۆی و دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی تر هەستیان کردبێت کە خەباتی کورد گەیشتوەتە زادەی سەرگرتن و سەرکەوتن. چاوێکیان لە ڕژێمەکانی تورکیا و ئێران هەڵتەکاندوە و یارمەتی عیراقیان داوە و بە هەموویان گەلەکومەکیان دژی کورد کردوە.

لەلام وایە مرۆڤ کە تووشی دەرد و نەخوشی بوو پێویستە بزانێ ئەو نەخۆشیەی چییە و هۆی چییە و لە چییەوە هاتوە و چۆن چارە سەردەکرێ.

ڕەنگە گەلێک هۆ هەبێ کە میللەتی کوردی بەم دەردەی ئیستەی بردوە، بەلاّم لام وایە نەوت هۆی سەرەکی بینیوە و ئەو نەخۆشییە کە وەکو گرانەتایەکی هەمیشەیی لێی نابێتەوە و لە ولاّتی خوا پێداودا نەوت هۆی تێرکردن و فێرکردن و پۆشتەکردنی میللەتە، کەچی لای ئێمە لە کوردستاندا مایەی کوێرەوەری و دەردەی‌سەری و ماڵ کاول بوونە ... لام‌وایە ئەگەر کوردستان نەوتی تێدا نەبوایە، ناڵێم دەوڵەتێکی پێشکەوتوو ئەبوو بەلاّم هەر هیچ نەبێ هەمیشە میللەتەکەی ئەوەندە سەر گەردان و ماڵ وێران نەدەبوو، کورد

نەدەکەوتە ئەم گێژاوەی ئەمڕۆوە کە نازانێ لافاوی سیاسەتی دەوڵەتان بۆ کوێی ئەبا و بەرەو کوێ ڕاپێچی ئەکا.

باسی نەوت باسێکی دوور و درێژە و لێرەدا ئەمانەوێ کورتە باسێکی مێژوویی دەربارەی دۆزینەوەی نەوت لە ویلایەتی موصڵدا، درووست بوونی کۆمپانیای نەوتی تورکی (کەلە دواییدا ناوەکەی گۆڕا بە کۆمپانیای نەوتی عیراقی)، بەشداربوونی وڵاتان لە پشکنین و دۆزینەوەی نەوت و دەوری هەر یەکێک لەو بەشداربوانە بکەین هەتا کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم. بەڵام نەخشەی بەریتانیا لە دوای شەڕ و دەست گرتنی بەسەر میسوپۆتامیا و ناوچەکانی ویلایەتی موصڵدا کە مەبەستی سەرەکی لەو دەستبەسەرداگرتنە بریتی بووە لە مسۆگەرکردنی نەوت ئەمانە ئەهێڵینەوە بۆ بەرگی دوهەمی ئەم کتێبە کە لەگەڵ ڕووداو و بەسەرهاتەکاندا لە باسی هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە بەڵێنەکانی بەرامبەر بە کورد و پشت گوێ خستنی پەیمانی سیڤەرەوە دەست پێ ئەکا و لەپەیمانی لۆزاندا بە هۆی گۆڕانێکی بنەرەتی لە سیاسەتی بەریتانیادا بەرامبەر بە تورکیا کە بەهۆی ئەو سیاسەتە تازەوە بڕیاری دا لە ڕێگەی دیبلۆماسیەتەوە واله لە تورک بکات دەس بەرداری ویلایەتی موصڵ ببێت کە لە ئەنجامدا بە هۆی عصبە الامەوە کە وەکو فتبۆڵێکی دەستی ئینگلیزەکان وابوە، تورک والێکرا دەس بەرداری ویلایەتی موصل ببێت و (هێڵی بروکسل) دانی پیانرا وەکو هێڵی سنووری تورکیا و عیراق کە بەمە بەریتانیا ویلایەتی موصلی بە تەواوی خستە ژێر سیاسەتی خۆیەوە و بە زۆرەملی و بەبێ قایل بوونی میللەتی کورد، کوردستانی لکاندن بە عیراقەوە و بەو جۆرە کورد و کوردستان بوون بە قۆچی قوربانی بەریتانیا وەکو لە باسەکانی داهاتوودا بە دوورودرێژ باسی ئەکەین.

دەربارەی بایەخ دان بە نەوتی کوردستان، دوکتۆر کەمال مەزهەر لە کتێبەکەیدا ئەڵێ «٧»

« هێشتا سەدەی نۆزدەهەم کۆتایی نەهاتبوو، هەندێ لەزانا و جیۆلۆجیەکانی ڕۆژئاوا بەگەرمی کەوتنەباس و سەرنجدان لە چاڵەنەوتەکانی باباگوڕگوڕ ...

( ج.مورگان)ی فەرەنسی توانیبوی سنووری نەوتی کەرکوک تا خانەقین و

شاخ کوێخای پشت قەسری شیرین بە نزیکی (٣٠٠) کیلۆمەتر دەست نیشان بکات.

ئەڵمانەکان لە ساڵی ١٩٠٣ دا کە ماف و دەسەلاّتی دروسکردنی هێڵی شەمەندەفەری بەغدایان لە عوسمانلی وەرگرتبوو، بە پانایی (٢٠) کیلۆمەتر شان بە شانی درێژایی ئەو هێڵی شەمەندەفەرە مافی پشکنینی نەوتیشیان وەرگرتبوو.

ئینگلیزەکانیش کەدەسەلاّتیان بەسەر نەوتی خوارووی ئێراندا هەبوو هەوڵیان داوە مافی پشکنین و دەرهێنانی نەوتی ولاّتی عوسمانلی وەربگرن. ئەمریکاییەکانیش کەوتنەخۆیان و (کۆلّبی شیستر)ی عەمیدی سوپای موتەقاعدی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٠٨دا پاش ئەوەی بەرتیلێکی باشی دا بە سوڵتان عەبدولحەمید، توانی مافی پشکنین و گەڕان بەدوای نەوتا لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانلیدا دەستگیربێت و سوڵتان ئەومافەی بەبڕیارێک دەڕبڕی بەلاّم زۆری پێ نەچوو تاقمی ئتحادو تەرەقی هاتنە سەرکارو ئەو بڕیارەی سوڵتان عەبدولحەمیدیان هەڵوەشاندەوە».

چ دۆکیومێنتەکانی ناو ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و چ کتێبی(تأريخ أكتشاف النفط في العراق) بە دوورو درێژی باسی هەنگاوە مێژووییەکانی چۆنیەتی دروستبوونی کۆمپانیای نەوتی تورکی و هەڵپەی ولاّتانی سەرمایەداری رۆژئاوا و بێن بڕکێی نێوانیان بە دوورو درێژی باس کردووە... کە چۆن نوێنەری خۆیان (ئەرنست کاسل)ی نارد بۆ ئەستەمبول و ئەویش (کالۆستی سرکیس کۆڵبنکییان)ی لەگەڵ خۆیدا برد و لەسەرەتادا بەپارەی ئینگلیز(بانقی وطنی تورکی) پێکهات کە لەراستیدا ئەو بانقە وەکو بنکەیەک وابووە بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەوەوە لووت بژەنرێتە ئابووری دەوڵتی عوسمانلییەوە کە لەو رۆژەدا بۆجەو باری عوسمانلی زۆر نەوی بووە و هەرلایەی لە دەولەتان بەجیا ویستویانە لەرێی قەرزدان بەعوسمانلی دەسەلاّتی ئەوە پەیدابکەن کاربەدەستانی عوسمانلی والێ بکەن بەسیاسەتی دەسەلاّتدارانی رۆژئاوا قایل بن و مل بۆ نەخشەکانیان کەچ بکەن .

کۆڵبەنکیانی شارەزای ناوچەکە بۆی دەرکەوت کە رزگاربوون لە ئەڵمان و ئەو

مەبەست و داخوازییانەی کە ئەڵمانەکان هەیان بووە دەربارەی پشکنینی نەوت بارێکی زۆرگران بووە و بەئاسانی نەدەتواندرا خۆی لێ رزگاربکرێت، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەڵمانیا و بەریتانیا بەخوێنی سەری یەکتری تینوبوون لەساڵی ۱۹۱۱دا توانییان هەردولا لەسەر پێک هێنانی کۆمپانیای نەوتی تورکی رێک بکەون.

ئینگلیزەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵ ئەڵمانەکان بەرواڵەت رێک کەوتبوون و پێکەوە کۆمپانیای نەوتی تورکییان دامەزراندبوو، بەڵام لەژێرەوە کە هەستیان بەبوونی نەوت کردبوو لە کوردستاندا، نەخشەی ئەوەیان ئەکێشا کە ویلایەتی موسڵ لەرێگەی بەکارهێنانی توانا و دەسەلاتی هێزەوە بێ یا لەرێگەی دیبلۆماسییەوە بێ کەبتوانن پەیمان لەگەڵ دەوڵەتاندا ببەستن و نەوتی ئەوناوچەیە بۆخۆیان مسۆگەربکەن.

ئینگلیزەکان بۆگەیشتن بەومەبەستە نەخشەیەکی دوورو درێژیان بۆ دواڕۆژی ویلایەتی موسڵ کێشا و لەلایەن مەجلسی عومومی بەریتانیاوە لیژنەیەکی مەلەکی(Royal Commission) پێک هێنرا بۆ پشکنین و دەستگرتن بەسەر چاڵە نەوتەکانی ویلایەتی موسڵ دا و لەوڕۆژانەدا چرچل لە ۱۹۱۳/۷/۱۷دا و لە پەرلەماندا لەورووەوە وتویەتی:

«دەبێ دەس‌بگرین بەسەر ئەو شوێنانەدا کە نەوتیان تێ دایە بۆ ئەوەی پێویستی خۆمان لە نەوت مسۆگەربکەین»

حکومەتی بەریتانیا لە ساڵی ۱۹۱۳دا نەخشەی ئەوەی کێشاو ئەوەی خستە بەرچاوی خۆی کە شرکەی نەوتی ئەنگلۆ/فارسی بەدەست خۆیانەوەبوو لەگەڵ شرکەی نەوتی تورکیدا هەمووی بکرێ بەیەک زنجیرە.

لە ۱۹۱٤/٦/۲۸دا (صدری ئەعزەم= سەرەک وەزیران)ی عوسمانلی دوونامەی ئاراستەی بەرتانیاو ئەڵمانیا کرد کە بەشێوەیەکی رەسمی مافی پشکنین و دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوتی عیراق درا بە هەردوولایان.

کە حکومەتی ئەمریکا ئەمەی بیستەوە بێزاری خۆی دەربڕی (چونکە لەراستیدا لەوڕۆژانەدا و لە دوایشدا ئەمریکییەکان دەترسان چاڵەنەوتەکانی خۆیان تەواوببێت وبۆیە ئەوانیش کەوتنە هەڵپەکردن بۆ نەوت).

له ئەنجامی گفتوگۆی ئەوانەی کە دەسەلاتیان درابوویە لەسەرەتادا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە کۆمپانیای نەوتی تورکی وەکو خوارەوە پێک بێت(ئەگرچی لەدواییدا گەلەک گۆڕانی بەسەرداهات وەکو لە باسێکی داهاتودا لە بەرگی دوهەمدا کە بۆ نەوتمان تەرخان کردووە وەک هۆیەکی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە مافی کورد، بە دووردرێژی باسی دەکەین).

. ٥٪ بۆ شرکەی نەوتی ئنگلۆ/ئێران
٢٥٪ بۆ شرکەی رۆیال دۆچ شێل
٢٥٪ بۆ مەجموعەی شرکاتی ئەلمانی

بەلام کۆلبنکیان وەکو ڕێکخەرێکی چالاک و گورج و گۆل لەناویاندا، شرکەی رۆیال دۆچ شێل لە ٢,٥٪ ی بەشەکەی خۆی و شرکەی ئنگلۆ/ئێران ٢,٥٪ی بەشەکەی خۆیان کە بەهەردووکیان کردیە ٥٪دا دایان بە کۆلبنکیان کە لەو رۆژەوە بەدواوە بە مستر Five ناودەبرا.

لە دواییدا، دۆکیومێنتی ناو ئارشیفی بریتانی ژمارە١٤/٧٣٠ و رۆژی ١٩٢٠/٤/٢٢ بەدوورو درێژی ئەوکێشەیەی کە بەهۆی کۆمپانیای نەوتی تورکییەوە پەیدابوو باسی هەمووی کردووە کە چۆن لە سالی(١٩١٤)ەوە پەیدابووە.

لەسەرەتادا ئەوانەی کە لەسەر پێک هێنانی کۆمپانیای نەوتی تورکی ڕێک کەوتبوون بەلێنیان بە یەکتردابوو کە هیچ لایەکیان بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندی لاکانی تر هیچ جۆرە چالاکی یەک نەنوێنێت بۆ پشکنین و دۆزینەوەی نەوت کە مەبەست لەوە تەنها بۆ ئەوە بووە کە ریگا لە ئەمریکا بگرن دەست نەخاتە کاروباری ناوچەکەوە.بەلام شەڕی جیهانی دەستی پێ کردو کاروباری ئەو کۆمپانیایە وەستا هەتا کۆتایی شەڕ.

بەلام کەشەڕ تەواوبوو ئینگلیزەکان چوونە ناو موسلەوە بەپێچەوانەی ئەو بڕیارەی کە نەدەبوو هیچ لایەک بەبێ ڕەزامەندی لاکانی تر دەست بکات بە پشکنین و دۆزینەوەی نەوت، لەگەل ئەوەشدا هێشتا چارەنووسی ویلایەتی موسل

که بەپێ ی پەیمانی سایکس پیکۆ بۆ فەرەنسە داندرابوو، هێشتا ئەوە دەستنیشان نەکرابوو، بەڵام ئینگلیزەکان گوێیان نەدایە ئەو بڕیارە و بەدەست و بردی دەستیان کرد بە پشکنین و ناردنی شارەزایانی خۆیان بۆ ناوچە نەوتییەکان کە لەو ڕۆژانەدا دەستیان بەسەردا گرتبوو و گوێیان نەدایە بێزاربوونی فەرەنسە وەکو لەدواییدا باسی دەکەین کە چۆن ئینگلیزەکان دوای ئەوەی ترسی رووسیان نەما کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا (ئەنادۆڵ) بۆ ئەوان داندرابوو لەگەڵیدا ببن بە دراوسێ، ئیتر قۆناغێکی تر لە پیلان و نەخشەی بەریتانیا دەستی پێ کرد بۆ قۆستنەوەی ویلایەتی موسڵ و دەرهێنانی لە چنگ و دەسەڵاتی فرەنسە.

بەکورتی دەتوانین بڵێن نەوت هۆیەکی سەرەکی بووە کە ئینگلیزەکان بایەخیان بە کوردستان داوە و هەروەها هۆیەکی سەرەکیش بووە بۆ پاشگەزبوونەوەی بەریتانیا لە بەڵێنەکانیدا بەرامبەر بەکورد وەکو لە بەرگی دووهەمدا بە دوورو درێژی باسی دەکەین.

# سەرەتای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەی سلێمانی

لە دوای ئەوەی شێخ مەحمود پەیوەندی کردبوو بە ئینگلیزەوە کە بچنە کوردستان ، بەو مەرجەی مافی میللەتی کورد بخەنە پێش چاوو رێگە لەوەبگرن کە جارێکی تر تورکەکان ناوچەکە داگیر بکەنەوە . دەربارەی چونی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەی سلێمانی زۆرکەس لە یادداشت و نووسینەکانیدا لێ ی دواون و هەرکەسە بەپێ ی ئاگاداربوون و شارەزایی و بیرەوەری خۆی بۆی چووە و تۆماری کردووە .

ئەوانەی دەربارەی گەیشتنی ئینگلیزەکان نووسیویانە یا خۆیان لەناو کۆڕی روداو و بەسەرهاتەکاندا بوون وەکو رەفیق حلمی و ئەحمەد خواجا و ئەحمەد تەقی و زێوەر و شێخ قادر و شێخ رەئوفی شێخ مەحمود و هەندێکی تریش دوور و نزیک ئاگاداربوون و دەماودەم لە کەسێکی شارەزا و ئاگادار بەڕووداوەکانی ئەورۆژە باسەکانیان پێ گەیشتووە و تۆماریان کردووە .

جگە لەو نووسەرانەی خۆشمان، ئەو کاربەدەست و ئەفسەرە سیاسیانەی ئینگلیز کە خۆیان دەستیان هەبووە لە رووداو و بەسەرهاتەکانی ئەوڕۆژانەدا و شارەزاو ئاگاداری زۆرشت بوون و هەندێکیان لەشێوەی یادداشت دا یا لەشێوەی سەرنج و راپۆرتی رۆژانەدا یا مانگانە یا سالأنەدا ئامادەیان کردوە و ناردویانە بۆ کاربەدەستانی لە خۆیان بەرەوژوورتر کە زۆریان لەناو ئارشیفەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا پارێزراون و هەندێک لەوانەی تا ئێستا ماوەی (٣٠) سالْ بەسەر نوسینی ئەو راپۆرتانەدا تێپەڕ بوە خراونە بەردەستی نوسەران و خوێندەواران و هەندێکیشیان هەر بە نەهێنی ماونەتەوە و قەدەغە کراون و هەتا ئەمرۆش ماوە نەدوراوە بخرێنە بەردەست .

لە ڕاستیدا زۆر شت هەبوو کە مەراقم بوو بەهیوای ئەوەبوم لە ناو ئەو

دۆکیومێنتانەدا دەستم بکەوێ کە پەیوەندیان هەبووبێ بە سیاسەتی ڕاستەقینەی بەریتانیا و هەڵوێست و مەبەستیان لە دروست کردنی حوکمداریتی یەکەم و دووهەمی شێخ مەحمود و هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز و گۆڕینی سیاسەتیان بەرامبەر بە کورد و کوردستان جگە لەو لێکدانەوەو بۆچونانەی بلاْوکراونەتەوە بەلاْم لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت ئەوانەی ڕێگەی خوێندنە و بلاْوکردنەویان دراوە و لە ناو ئارشیفی گشتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا دانراون ژمارەیەکی تایبەتین و زۆربەیان بریتین لەو دۆکیومێنتانەی کە نووسەران و کاربەدەستان و ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز خۆیان لەکاتی خۆیدا لە یادداشت و کتێبەکانیاندا بلاْویان کردوەتەوە و زۆر باسی گرنگ هەیە کە پەیوەندی بە باسە سەرەکییەکانەوە هەیە وەکو سیاسەتي حکومەتی بەریتانیا و سەرنج و ڕاسپاردەکانی بۆ حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا و لە دواییدا بۆ مەندوبی سامی بەریتانیا لە عیراق دەربارەی دواڕۆژی کورد و مەبەستی نەهێنی لە چونیان بۆ کوردستان و رادە و پلەی ئەو ڕێکخراوەی کە بەناوی حوکمدارییەتی کوردستانەوە لەو ڕۆژانە ماوەی پێکهاتنی درابوو، لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیا لەسەرەتاوە بۆ لکاندنی کوردستان بە میسۆپۆتامیاوە و گەلێک باسی گرنگی تر ئەمانە ئێجگار زۆر کەمیان خراونەتە بەردەست و دووریش نیە لەدواڕۆژێکی نزیکیشدا هەرنەخرێنە بەر دەست چونکە لەوانەیە هەندێک لەو سیاسەتەی بەریتانیا کە ئەوسا بەرامبەر بە کورد بەکارهێنراوە و کراوە بە پرۆگرامێکی هەمیشەیی بۆ سیاسەتمەدارانی ئینگلیز دەربارەی کورد ئەمرۆش هەر وەکو خۆی مابێ و هیچ گۆڕانێکی بەسردا نەهاتبێت لەبەر ئەوە نایانەوێت کەس شارەزای ئەوانە ببێت ئەگەر چی ڕووداوەکان زۆرشت ڕوون ئەکەنەوە کەپێویست بەو شاردنەوەیە نەکات.

لە باسی پەیوەندی کورد و ئینگلیزدا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن شێخ مەحمود هەوڵی دا بەهۆی ناردنی نامەوە بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز داوایان لێ بکا کە بێنە کوردستانەوە و ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا بۆ وەرامی ئەو نامەیەی کە شێخ مەحمود بۆی ناردبوو فەرمان ئەدا بە نوئێل کە دەم و دەست روو بکاتە سلێمانی و ڕاسپاردەکانی بەجێ بهێنێت.

نوئێل لەسەر ئەو فەرمانەی حاکمی گشتی خۆی و ئەفسەرێکی تری ئینگلیزی (مێجەر دانلیس) و دوکتۆرێک و ئەندازیارێک و ئاشپەزێک و ژمارەیەک سەرباز دەچن بەرەو ناوچەی سلێمانی.

مامۆستا رەفیق حلمی کە سکرتێری تایبەتیی شێخ مەحمود بوە و ئاگاداری گفتوگۆی شێخ مەحمود و مێجەر نوئێل بووە لەو رۆژانەدا لە یادداشتەکانیدا ئەڵێ: «٢»

« کە مێجەر نوئێل لە کەرکوکەوە بەرەو سلێمانی هات، لە سەرەتادا چوە گوندی (داریکەلی) کە گوندی شێخ مەحمود بوو، ساتێک هەواڵی گەیشتنی نوئێل گەیشت و بەناو خەڵکی سلەیمانیدا بڵاوبووە ئەو فەوجی عوسمانلییەی کە لەناو شاری سلەیمانیدا هەتا ئەورۆژانە مابوونەوە ئەوانەی کە کوردبوون فەوجەکەیان بەجێ هێشت و بەرگی کوردی‌یان لەبەر کرد، ئەوسەربازانەی تریش کە کورد نەبوون ترسیان لێ نیشتبوو و هەیانبوو خۆی شاردەوە و ئەوانی تریش شڵەژان و نەیان ئەزانی چی بکەن. شێخ مەحمود لە پیاو مەقوڵ و ناسراوەکانی هەمە جۆرەی ئەو رۆژانەی سلێمانی کۆبوونەوەیەکی لەماڵی خۆیان کرد و پێی گەیاندن کە دەستەیەکی ئینگلیز بەرێوەن بگەنە سلێمانی و شێخ داوای لەو خەڵکە کرد کە لەنا خۆیاندا چەند کەسێک هەڵبژێرن بۆ ئەوەی بچن بەپیر ئینگلیزەکانەوە ».

لەدوای مشتومڕ و مقۆمقۆیەکی کەم (رەفیق حلمی باسی هۆی ئەو مشتومڕو مقۆمقۆیەی نەکردوە کەلام وایە چەند هۆیەک هەبووە یەکێک لەوانە وەکو یاسایەکی عەشایەری هەر عەشیرەتەی هەوڵی داوە نوێنەری خۆی تێدابێت و بێگومان هەموو عەشیرەتەکانیش لە ناوخۆیاندا رێک نەبوون لەبەر ئەوە لەسەر چۆنیەتی پێک هێنانی ئەو نوێنەرانە مقۆمقۆ و کێشە هەبوو، جگەلەوەش زۆری تورکخواز و کەللەرەق کە دەوڵەتێکی وەکو ئینگلیزیان بە غەیرەدین داناوە و پێیان خۆش نەبوە جێگەی عوسمانلی ئیسلام بگرنەوە ئەوبەپیرەوەچوونەیان پێ خۆش نەبوە و ووشکەمەلا و شێخی رووتەڵەی زۆر کە ئەوانیش بۆ مەبەستی خۆیان بەناوی دین و ئاینەوە ئالآیان دژی غەیرەدین هەڵکردبوو ئەوانەش بەشێکی تر بوون کە بێزاربوون لەوەی خەڵک بچێت بەپیر ئینگلیزەکانەوە و

کەچی زۆرکەس ئەوبارە گرانەی ئەورۆژەی بۆ ئەو رۆژانەی شێخ مەحمود حساب نەکردوە و لەچاوێکی ترەوە سەیری شێخ مەحمودیان کردوە)، ئەو هەیئەتەی کە دانران بەسواری ولاغ چون بەپیر ئینگلیزەکانەوە، ئینگیزەکان لەوەوپێش نەیان ویست یەکسەر بێنە ناو سلێمانیەوە چونکە مەترسییان هەبوو لەو فەوجی سەربازە تورکەی کە لەناو شاردا هێشتا مابوو، جگە لەوە هێزێکی واشیان لەگەڵ خۆیانا نەهێنابو بۆ پارێزگاری بۆیە لەپێشدا چوونە داریکەلی بۆ ئەوەی شێخ مەحمود بیان پارێزێت و بەبێ گێچەڵ بگەنە سلێمانی، بەلاّم کە هەیئەتەکە گەیشتنە لایان ئیتر دڵنیابوون و ڕوویان کردە سلێمانی و بەوجۆرە نوئێل بە ئاسانی و بەبێ دەنگ و تەقە هاتە سلێمانی و دەس‌بەجێ بە یارمەتی شێخ مەحمود دەست کرا بە ناردنی سەربازە تورکەکان بۆلای عەلی ئیحسان پاشا لە موصل و عەمارەکانی خواردەمەنی و ئازووقە و ئەو چەک و جبەخانانەی لە عەماردابوون یا بەدەست سەربازەکانەوەبوون شێخ مەحمود لێی وەرگرتن».

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا[٣]، دەربارەی ئەو سەربازانەی تورک بەجۆرێکی تر باس ئەکا و ئەڵێ «٣»

« کە مێجەر نوئێل هاتە سلێمانی، هەوڵی دا ئەو ئەفسەر و سەربازانەی عوسمانلی کە لە سلێماندا مابوون هەمویان تێکەڵ بە گیراوەکانی تری عوسمانلی بکات کە لە کەرکوک بوون، بەلاّم شێخ مەحمود بەوە قایل نەبوو بەڵکو هەموی لەڕێگای کۆیەوە ناردنەوە بۆ موصل، تەنها نزیکەی (٢٠٠) سەربازی پەڕاگەندەیان مابوون لە نێوانی سلێمانی و چمچەماڵ و کەرکوکدا تەنها ئەوانەبوون کۆکرانەوە و درانە دەست ئینگلیزەکان لە کەرکوک. »

جارێک تەوفیق وەهبی بۆی گێڕامەوە ووتی کە ئینگلیزەکان گەیشتنە سلێمانی بە شێخ مەحمودم ووت باتەو سەربازانەی عوسمانلی کە لە ناوچەی سورداشدا مابوونەوە بە دیل بیانگرین و بیاندەینە دەست ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی توانا و هێزی دەسەلاّتی خۆمان دەرببڕین لە ناوچەکەدا و بۆ ئینگلیزیش روون بکەینەوە کە توانا و دەسەلاّتمان بەسەر ناوچەکەدا هەیە، بەلاّم شێخ مەحمود ئەو پێش نیازەی پەسەند نەکرد ...

جارێک ئەوەی تەوفیق وەهبیم لای شێخ باباعەلی شێخ مەحمود باس کرد

لەوەرامدا وتی :

« وابزانم تەوفیق وەهبی لەوەدا بەهەڵەدا چوبوو، چونکە کە هێزی تورک شکا، ئەو هێزەی کە لە سلێمانیدا هەبوون هەندێکیان هەوڵیاندا بچنە سورداش، بەلاّم عەشایەرەکانی ئەو ناوچەیە ڕێگەیان لیٚ گرتن و هێنرانەوە بۆ سلێمانی. بۆ ئەوەی ئەو سەربازانە بەبیٚ گێچەڵ بگەنە جێی خۆیان و لە ڕێگا لێیان نەدریٚ و تووشی زیان نەبن باوکم لەگەڵ ئینگلیزەکانا ڕێک کەوت کە کۆیان کەنەوە و لەڕێگەی موصلەوە بیانێرنەوە بۆ تورکیا. »

ئەرنولد ویلسن ی حاکمی گشتی لە بەغدا لە کتێبەکەیدا دەربارەی چونی نوئێل بۆ سلێمانی ئەڵیٚ بە میجر نوئێلم ووت: «٣٧»

تۆ ئەوا بوویت بە ئەفسەری سیاسی بۆ ناوچەی کەرکوک، ناوچەی کەرکوک لە روباری (زاب)ەوە دەست پیٚ ئەکا هەتا دیالە وەلەباکووری رۆژهەلاٌتدا ئەگاتە سنووری ئێران کە ئەمە بەشێکە لە ویلایەتی موصل ئیستە وا حیساب بۆ ئەوناچانە ئەکریٚ کە کەوتونەتە ناو سنووری داگیرکراوەوە و لەژێر دەسەلاٌتی هێزەکانی ئێمەدان.

لە کاتی پێوەندی کردن‌دا لەگەڵ سەرۆکەکانی ناوچەکە، پێویستە ئەوە بخەیتە بەر چاو و حیساب بۆ ئەوە بکەی کە کاربەدەستانی سوپایی بە شێوەیەکی هەمیشەیی بەرەو سلێمانی ئەڕۆن یاخود بۆ ئەوشوێنانەی تر کە ئەکەوێتە ئەودیو ئەو هێڵەی کە ئێستە ئێمەی تیادایِن.

ئەبیٚ ئەوە بە پێویستی سەر شانی خۆت بزانیت کە بەیارمەتیی سەرکردەکانی ناوچەکە ئارام و ئاسایش لەو شوێنانەدا بەرپا بکرێت کە ئەکەونە ئەولای ناوچە داگیرکراوەکانی عەسکەریەوە بۆ ئەوەی بتوانیِن بە ئاسانی بەسەر بەکرێگیراوەکانی دوژمندا زاڵ ببیِن.

دەسەلاٌتی ئەوەت ئەدەمیٚ کە شێخ مەحمود وەکو نوێنەرێکی ئێمە لە سلێمانی دابنیێن بەشێویەکی موناسیب و بۆ چەمچەماڵ و هەڵەبجەش خەڵک دابنیێن.

پێویستە بۆ هەموو عەشایەر و سەرۆکەکانیان روون بکەیتەوە کە حکومەتی بەریتانیا بیر لەوە ناکاتەوە بە زۆرەملی ئیدارەیەکی بێگانەیان بەسەرا بسەپێنرێت و سەرۆکی عەشیرەتەکان هان بدە کە جۆرە یەک گرتنێک لە ناو

خۆیانا سازبکەن بۆ ئەوەی کاروباریان بە شێوەیەکی پڕ لە ئاسایش و بەبێ گێچەڵ لە ژێر ئیدارەی ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیزدا بڕوات بەڕێوە و تێیان بگەیەنە کە چۆن لە زەمانی عوسمانلی دا (باج)و گومرگ سەنراوە ئەمڕۆش ئێمە هەر بەو پێیە لەسەری ئەڕۆین بۆ ئەوەی بتوانین بە هۆی ئەو باج و گومرگەوە ناوچەکەیان بیەین بەڕێوە و خەڵک بیوژێنەوە . »

ئەوەی لەو راسپاردەیەی ویلسن بۆ میجەر نوئێل دەردەکەوێ بریتیە لە :

١ـ سنووری ناوچەکەی دەست نیشان کردوە کە لە دیالەوە هەتا (زاب)ی گرتوەتەوە .

٢ـ نوئێلی راسپاردبو کە لە خەڵک بگەیەنێت لە چوونی ئینگلیزدا بۆ کوردستان نایەوێ بەزۆرە ملی ناوچەکەیان بخاتە ژێر دەسەڵاتی بێگانەوە .

٣ـ داوای لە نوئێل کردبوو هەوڵ بدا سەرۆک عەشیرەتەکانی ئەوناوچەیە لە ناوخۆیاندا جۆرە یەکگرتنێک ساز بکەن.

بێگومان ساتی خۆی کە نوئێل چوەتە سلێمانی و گفت و گۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا کردوە و بوە بەراوێژیاری، ئەو خاڵانەی سەرەوەی روون کردوەتەوە و شێخ مەحمودیش هەر لەو رۆژەوە حیسابی کردوە ئەو ناوچەیە هەمووی یەک گرتوو ئەبێ و لەژێر حوکمدارێتی خۆیدا ئەبێت و وا لە شێخ گەیەنراوە کە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا ئەوەیە کە هەوڵ بدا عەشایەرە کوردەکانی ئەوناوچەیە لەناو خۆیانا یەک بگرن.

بەلاّم مس بێل لە کتێبەکەیدا ( فصول من تأريخ العراق القريب «٥٥» دەربارەی ئەو راسپاردەیەی ویلسن بۆ نوئێل شتێکی تر ئەڵێ کە زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو راسپاردەیەی ویلسن بۆ نوئێل:

مس بێل ئەڵێ ویلسن بە میجەر نوئێلی وتبوو:

« ئەگەر زانیتان سوود لەوەدایە کە شێخ مەحمود بکەن بە نوێنەری ئێمە لە سلێمانی لەگەڵ دانانی چەند کەسێکی تر بۆ چەمچماڵ و شوێنەکانی تر ئەوا دایان بنێن. هەروەها داوا لە نوئێل کرا ئەوانەی کە دائەنرێن هەریەکەیان سەرنج و پێش بینی خۆیان بۆ حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیز پێشکەش بکەن».

مس بێل لە هەمان کتێبدا لە رووی چۆنیەتی بیر لێ کردنەوەی ئینگلیز

دەربارەی دوا رۆژی کوردستان ئەڵێ:

« مەسئەلەی پێک هێنانی حکومەتێک لە خواروی کوردستاندا کە ئۆتۆنۆمی هەبێت لە ساڵی ۱۹۱۸ دا لەلایەن جنراڵ شەریف پاشا (نیازی لە شەریف پاشای خەندان بوە )وە هاتە کایەوە کە لە کاتی خۆیدا لە (مارسیلیا) لەوێ حاکمی گشتی بەریتانیای دیبوو (نیازی لە ویڵسن حاکمی گشتی بەریتانیا بوە لە بەغدا). شەریف پاشا کوردێکە خەڵکی سلێمانی، بەلاّم ماوەیەکی زۆرە لە وڵاتەکەی خۆی دوور کەوتوەتەوە و تورکەکان دووریان خستبوەوە بۆ دەرەوەی وڵات.

شەریف پاشا لە ساڵی ۱۹۱٤ دا خزمەتێکی زۆر گەورەی کردین بەوەی کە هەوڵی دا کوردەکان لە تورکەکان دوور بخاتەوە و بەلای ئێمەدا دایان بشکێنێت بەلاّم ئێمە لەو کاتەدا پەیوەندیمان لەگەڵ کوردا نەبوو لەبەر ئەوە نەمانتوانی داخوازیەکانی قبوڵ بکەین. »

مس بێڵ لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا ئەڵێ:

« ئەو ڕاسپیریانەی لەسەر کردایەتی ئیدارەی گشتیەوە ( نیازی لە ویڵسن بوە) دەرچوبو بۆ نوئێل ئەوەی ئەگەیاند کە پێویستە وا لە خەڵک بکەیەنێت کە ئەو ئیدارەیەی لە سلێمانیدا پێک دێ شتێکی کاتییە و پێویستە نوئێل ئەو ڕاستیە بۆ شێخ مەحمود و خەڵک روون بکاتەوە. »

ئەوەی مس بێڵ لەمەی دواییدا باسی کردوە کە ئەو ئیدارەیەی لە سلێمانیدا پێک‌دێ شتێکی کاتی ئەبێ و بە هیچ جۆرێک بەو شێوەیەی ئەو ئەڵێ لە کتێبەکەي ویڵسن دا بەو جۆرە باس نەکراوە.

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا «۲۱» دەربارەی ئەو بۆچوونەی مس بێڵ بۆلێکدانەوەی راسپێرریەکانی ویلسن بۆ نوئێل (مەگەر شتی وابووبێت و ویلسن لە کتێبەکەیدا باسی نەکردبێت و یا نەی ویستبێت باسی بکا) ئەڵێ:

« کە کتێبەکەی مس بێڵ دەرچوو، ئەو درۆیە بەوەدا دەرکەوت کە سەید ئەحمەدی بەرزنجەیی و سیدعبداللەی حاجی سەید حسنی ئامۆزای شێخ مەحمود کە هەردوکیان لە کۆبونەوەکانی شێخ مەحمود لەگەڵ میجەر نوئێلدا بەشداریان کردوە و ئاگاداری هەمووشتێک بوون، هێشتا کاتی دەرچونی ئەو کتێبە

هەردوکیان مابوون و کە لیم پرسین بەتوندی ئەوەی مس بیلیان بەدرۆ ئەخستەوە و ئەیان ووت لە هیچ کۆبونەوەیەکدا لەگەلْ میجەر نوئیل باسی ئەوەی نەکردوە کە ئەو ئیدارەیەی ئەو ڕۆژانە لە سلیمانی داپیک هات ئیداریەکی کاتی ئەبیٚ، بەلْکو بەپیچەوانەوە نوئیل هەمیشە باسی دوارۆژ و چارە نووسی کورد و کوردستانی ئەکرد . »

بەلای منەوە دوورنیە ویلسن ئەو ڕاسپاردەیەی بۆ نوئیل بەو جۆرە بوبیت کە مس بیلْ باسی کردوە، چونکە مس بیلْ سکرتیری تایبەتی بوە لە ئیدارەی گشتی بەریتانیا لە بەغدا و ئاگاداری هەمو شتیک بوە بەلاْم نوئیل ئەو راستییەی لەو ڕۆژانەدا بەوپەڕی زیرەکییەوە لە شیخ مەحمود شاردوەتەوە و لەدواییدا کاربەدەستانی تری ئینگلیز وەکو میجەرسۆن و ئەدمۆندز و پیرسی کۆکس و مس بیلْ هەر یەکەیان نیازی راستەقینە و سیاسەتی حکومەتەکەیان ئاشکراکردوە .

ئەوەی سەرنج رادەکیشیت لە تەقەلاکانی ئینگلیزدا و باسەکانی ویلسن و مس بیلْ ئەوەیە کە ساتیک ئینگلیزەکان گەیشتنە کەرکوک و نوینەری خۆیان کە میجەر نوئیل بو ناردبۆ سلیمانی،هیشتا مەترسییان لە تورکەکان هەبوو کە نەوەکو هەولی ئەوە بدەن هەستی ئایینی کورد بېزوینن و بەلین بدەن بە کوردەکان و بەلای خۆیانا دایانبشکینن. جگەلەوە هیشتا موسۆگەرکردنی ویلایەتي موسل بۆ ئینگلیزەکان ساغ نەبوبوەوە و ئینگلیزەکان بە پیچەوانەی بریاری پەیمانی (مودراس) لەدوای وەستاندنی شەرچوبونە موسلەوە بۆیە ئەیانزانی تورکەکان هەروا بە ئاسانی دەس بەرداری ویلایەتی موسل و کوردستان نابن لەبەر ئەوە نەیان ئەویست بە هیچ جۆریک لەو رۆژانەدا لەگەلْ کوردەکانا تیکی بدەن و ئەگەر مەبەستیکی تریشیان بووبیت جگە لەو بریارانەی کە ئاشکرایان کردبوو بەلینیان دابوو ئەوانەیان هەلگرتوە بۆ کاتی خۆی وەکو لە شوینی خۆیا باسی ئەکەین .

ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لە کتیبەکەیدا ئەلیٚ «۳۷»

«لە ۱۹۱۸/۱۲/۱ دا چوومە سلیمانی بۆ ئەوەی هەندیک لە سەرکردەکانی کورد ببینم و لەگەلْ شیخ مەحمودا گفت و گۆیەکی دووورودریژ کرا وەلە ئەنجامی

ئەو گفت و گۆیەدا بوم دەرکەوت کە ئەگەر تورکەکان دەست درێژی بکەن بۆ سەر ئەوناوچەیە، کوردەکان ئامادەن بەربەرەکانیان بکەن و ڕێگەی هاتنیان لێ بگرن، لەبەر ئەوە لە ژێر تیشکی ئەو بار و هەڵوێستەدا جۆرە بەڵێن و پەیمانێک لەلایەن بەریتانیاوە بۆ کورد شتێکی پێویست بوو لەو ڕۆژانەدا بۆ ئەوەی کوردەکان دڵنیا بکرێن کە ئێمە یارمەتیدەر و پاڵ پشتیانین.

کە لە سلێمانی بوم هەندێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد بە نهێنی پێیان وتم بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود قایل نین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوی یەکێکی تری لەو باشتریان نەهێنا کە لە جێی ئەو بکرێ بە سەرۆک»

دەربارەی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ سلێمانی لۆنگرێک لە کتێبەکەیدا ئەڵێ «٤٣»

«میجەر نوئێل کە فارسیەکی باشی ئەزانی نێردرا بۆ سلێمانی و پێی سپێردرا کە لە زابی گەورەوە هەتا دیالە هەوڵ بدا خەڵکی ئەو ناوچانە بخاتە ژێر سایە و ژێر دەسەلاتی شێخ محمودەوە.

خەیاڵی پێک هاتنی حکومەتێکی کوردی لە خواروی کوردستاندا لە ژێر سایەی بەریتانیادا لەوڕۆژانەدا ئیجگار زۆر گەرم بوو، عەشایەری ناوچەکە ڕژانە ناو شاری سلێمانیەوە و بەگەرمیەوە چاوەڕێی ئەوە ئەکرا ئینگلیزەکان دەست پێشکەری خۆیان دەربڕن و ئاشکرای بکەن لە پێکهێنانی ئەو حکومەتەدا. شێخ مەحمود بە هوی ناسراویەوە، تاقە کەسێک بوو کە دەست بدا بۆ ئەو مەبەستە ... بەڵام زۆر سەرچڵ و سەرەڕۆبوو، پیاوێکی خام بوو، لەبەر ئەوە ئەو ئاواتە نەهاتە دی کە چاوەڕێی لێ ئەکرا ... بێجگە لەوە ئەو عەشایەرانەی کە لە دەوروپشتی کۆبوبونەوە تەنها ئامادەی ئەوەبوون خەڵات و بەرات و دیاری وەربگرن و دەسەلات بگرنە دەست، بەڵام ئامادە نەبوون هیچ بەڵێن و پەیمانێک ببەنە سەر.

ئەوانە تەنها بۆ دەسکەوتی خۆیان دانیان بە سەرکردایەتی شێخ مەحمودا نابوو، ئامادە نەبوون دەست بەرداری هیچ شتێکی خۆیان بن. لەڕاستیدا ئەوانە نەشارەزابون لە سیاسەت و تاقی کردنەوەیەکی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو، شارەزای ژیانی کۆمەلایەتی نەبوون، لەبەر ئەوە ئومێدی نەک ئیمپراتۆریەتیکی کوردی لە ژێر سایەی شێخ مەحمودا، بەڵکو لە پلەیەکی زۆر نزمیشدا هیوای سەرگرتنی لێ

نەدەکرا ...

بەو پی‌یە زۆری پیّ نەچو کە دەسکەوتی ئەو عەشایەرانە کەم کرایەوە ئیتر ئەوانیش وردە وردە ساردبونەوە ...

هەمووی چەند هەفتەیەک تێپەری نەکردبوو بەسەر ئەو گەرماوگەرمی و هات و چۆکردنەیانەدا بۆ سلێمانی، عەشایەرەکان ساردبوونەوە، جافەکان لە هەڵەبجە خۆیان لە شێخ مەحمود کێشایەوە و لەسەر خواستی خۆیان ئەفسەرێکی ئینگلیزی بۆ کاروباری هەڵەبجە دانرا ».

لەو باسەی لۆنگریک دا چەند سەرنجێکمان دێتە بەرچاو:

۱ـ ئەویش لە کتێبەکەیدا وەکو ئەوەی ویلسن نەی وتوە بریار ئەوەبوە ئیدارەیەکی کاتی لە ناوچەی سلێمانی داپێک بهێنرێت، بەڵکو وەکو لۆنگریک ئەڵیّ لە میجەر نوئێل گەیەنرابوو کە سنووری دەسەلاّتی شێخ مەحمود لە دیالەوە هەتا ڕوباری (زاب)ی گەورە ئەبێت (کە لە دواییدا کاربەدەستانی ئینگلیز هەوڵیان دا تەنها هەر سلێمانی و دەوروبەری بە سنووری دەسەلاّتی شێخ بژمێرن).

۲ـ راستە شێخ مەحمود پیاوێکی تازەپیاکەوتوو بوە لەڕوی سیاسەت و پەیوەندی کردن بەدەوڵەتانەوە و لەزۆر هەڵوێستیدا سەر گەرم و سەرچڵ بوە وەکو زۆر لەوانەی یادْشتیان نوسیوە باسی شێخ مەحمودیان بەو جۆرە کردوە، بەلاّم لەراستیدا شێخ مەحمود ئەو سەرچڵی و یاخی بوونەی کە ئینگلیزەکان لێی بێزاربوون وەختێک دەستی پیّ کردوە و روویداوە کە شێخ مەحمود پاشگەزبوونەوەی ئینگلیزی بۆ ئاشکرابوە لەو بەڵێنەی دابویان بە کورد و کەوتنە تەفرەدانی عەشایەرەکان بۆ خۆ دوورخستنەوە لە شێخ مەحمود و هەڵوێستی وایان هێنایە کایەوە کە هەڵەبجە و کۆیە و رانیە لە سنووری دەسەلاّتی حوکمدارێتی سلێمانی جیاکەنەوە و شێخ مەحمود لە ناو شاری سلێمانیدا بەگۆشەگیری بێنێتەوە.

۳ـ هەروەها راستە ئەو عەشایەرە کوردانەی کە لۆنگریک باسی کردون وەکو یاسا و رەوشتی هەمو عەشایەری تر هەمیشە پەرژەوەندی خۆیان لەبەرچاوبوە و هەر ئەوجارەش نەبوە کە عەشایەری کورد نەک هەر لە خەباتی میللەتەکەیان

لایان داوە، بەڵکو زۆر جار، بۆ سوودی خۆیان چوونەتە پاڵ دوژمن، بەڵام لە راستیدا ئەگەر پاشگەزبوونەوە و هاندانی ئینگلیزی تیادانەبوایە، ئەو عەشایەرانە هەروا بەئاسانی لە شێخ مەحمود جیا نەدەبوونەوە و لێی هەڵنەدەگەڕانەوە.

خۆ ئەگەر ئینگلیز بیویستایە و مەبەستی سەرگرتنی حکومەتێکی کوردی بوایە کە بێگومان لەوەدا شێخ مەحمود سەری لەڕێ دانەبوە، ئەگەر لەناو کوردستاندا عەشایەری واش هەبووبێ کە دژی پێک هێنانی حکومەتێکی کوردي بوبن خۆ ئەوانە لەو عەشایەرە عەرەبانەی ناوچەی فورات بە هێزتر نەبوون کە ئینگلیزەکان بۆ مەبەستی خۆیان هەرچی توانا و دەسەلاَت و هێز و فرۆکەی خۆیان هەبوو بۆیان کردنەوەی یاخی بوونی ئەو عەشایەرانە بەکاریان هێنا ...

وەکو لە شوێنی تریشدا باسی ئەکەینەوە، ئینگلیز شێخ مەحمودی بۆ ئەوە نەدەویست کە ڕێگەی بدرێتێ حکومەتێکی سەر بە خۆ لە کوردستاندا دروست بکات ... لە سەرەتادا کە پێویستیان بە شێخ مەحمودێکی بەهێز هەبوە کەروو بە رووی تورکەکان بێتەوە، لەورۆژانەدا لە عەشایەرەکانیان ئەگەیاند کە پێویستە بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود قایل بن، بەلاَم کە ئیشیان بە شێخ مەحمود نەما هەر ئەوان بوون ئەو عەشایەرانەیان هاندا کە لە شێخ مەحمود دووربکەونەوە و هەندێکیان کردن بەگژیا ...

# مێجر نوئێل و ڕۆڵی میجەر نوئێل لە کوردستاندا

لەبەر ئەوەی میجەر نوئێل یەکەم نوێنەری حکومەتی بەریتانیابوە که بەشێوەیەکی رەسمی هاتوەتە کوردستان و دەورێکی گرنگی بینیوە لەسەرەتای دامەزراندنی یەکەم حوکمدارێتی شێخ مەحمودا و یەکەم ئینگلیزبوە چوەتە سلێمانی که بەناوی موستەشاری شێخ مەحمودەوە کاروباری بردوە بەڕێوە و له باسی هاتنی ئینگلیزەکانا بۆ کوردستان و مەبەست لەو هاتنەیان لە پێشتردا باس کرا بۆیه لێرەدا بە پێویستمان زانی باسێکی تایبەتی بۆ مێجەر نوئێل تەرخان بکەین که ژمارەیەک لەو نوسەرانەی کورد وەکو رەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی ستایشیان کردوە و لایان وابوە ئەبوایە شێخ مەحمود سوودی لەبوونی نوئێل وەربگرتایە بۆ دەسگیربوونی مافی کورد لەو قۆناغەدا که نێرابو بۆ سلێمانی وەکو لە دواییدا باسی ئەکەین.

ئەو ڕۆژانەی نوئێل گەیشتبوە سلێمانی، ناوچەکە بە شێوەیەکی گشتی لە هەلۆێست و بار و دۆخێکی ئێجگار سەخت و دژواردابوە، هێشتا هەوری ڕەشی برسیەتی و گرانی و ڕەش و ڕووتی لە ئاسمانی ناوچەکەدا نەڕەویبوەوە، بۆیە ئەوخەڵکەی که لە کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەمدا لە مۆتەکەی مەرگ و له جانەوەری و چاوچنۆکیەتی ڕاووڕووتکەرانی عوسمانلی تازە خەریک بوون ڕزگاریان ئەبوو هیوایان بە دواڕۆژێکی پڕ لە ئارام و خۆشی و دوور لە برسیەتی و نەبوونی و نەخۆشی پەیداکردبو، ئینگلیزەکان بە هۆی ڕۆژنامە و بیانات و پروپاگەندەکانیانەوە خەڵک بە چاوی ڕزگارکەر و ئازادی بەخش و فەڕ و بەرەکەت هێنەرەوە سەیریان ئەکردن و مێجەر نوئێلی پێشرەوەیان وەکو فریشتەیەکی مژدەهێنەر ئەهاتە بەرچاو و زۆربەی خەڵکی برسی و نەبوو دودەس بەناڵە چاوەڕوانی هەڵهاتنی ڕۆژێکی نوێیان ئەکرد بەسەر ئاسمانی وڵاتەکەیانا لەبەر ئەوە میجەر نوئێلی فریشتە و نوێنەری ئینگلیز لە ناو کوردا نرخێکی تایبەتی هەبوە و ئێجگار زۆر ڕێزی لێ گیراوە ( بە پێچەوانەی مێجەرسۆن که

له دوایيدا باسی دەور و ڕەوشتی ئەویش ئەکەین لە شوێنی خویدا ).

ئەدمۆنز لە کتێبەکەیدا دەربارەی مێجەر نوئێل ئەڵێ «٤٥»

« کە لە شوشتربوم لە خواروی ئێراندا، دوو هاوڕێم هەبوو یەکەمیان (سۆن)بو کە یارمەتیدەری ئەفسەری سیاسی بوو لە (دیزەفول)و دوهەم (نوئێل)بو کە نائیبی قونسول و یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی بو لە (ئەهواز). من و نوئێل هردوکمان لە بەهاری ساڵی ١٩١٣ دا بەشداری راونانی (وکلاء الجهاد)ی ئەڵمانیمان کرد کە دەستەیەک بوون لە لایەن ئەڵمانەکانەوەنێررابوون بۆ ئێران بۆ ئەوەی لەو ناوچەیەدا ئاژاوە بنێنەوە (بێگومان ئاژاوە نانەوەی ئەڵمان لەو ڕۆژانەدا بۆ ئەوەبوە کە عەشایەرەکانی ئەو ناوچانە هان بدەن دژی ئینگلیز و وەکو لەمەوپێش باسمان کرد ئەڵمانەکان هەوڵیان ئەدا پروپاگەندەی ئیسلامەتی بکەن بۆ عوسمانلی دۆستیان دژی روسیای قەیسەری و ئینگلیز، جگە لەوە ئەلمانەکان لەو چالاکیانەیاندا هەوڵیان داوە کە پەیوەندی و هات و چۆی نێوانی رووس و بەریتانیا لێک بپچڕێنن و ڕێگەنەدەن ئینگلیزەکان بە ئاسانی سوود لە نەوتی خواروی ئێران وەربگرن).

مێجەر نوئێل توانی بەناوبانگترینی ئەوانە کە ناوی (واسمۆس)بو لە نزیکی بەندەر ئیلام بگرێ بەلاّم واسمۆس توانی بەشەو لەدەست یاساوڵەکان خۆی رزگاربکاو دەربازبوو.

لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨ دا نوئێل بە هێزێکەوە نێررا بۆ (باکۆ)، لەڕێگا (جەنگەڵی)یەکان لە نزیکی (ڕەشت) گرتیان و بە هاندانی بوڵشەویکەکان زۆر خراپ رەفتاری لەگەڵا کرا و ماوەی پێنج مانگ لە زیندانا مایەوە، بەلاّم لە دوای شکاندنی جەنگەڵیەکان بەپێی ڕێکەوتنێک نوئێل بەرەڵلاّ کرا و نێررا بۆ بەغدا و لەوێوە چوە کەرکوک و بەپێی بریاری حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا نێررابو سلێمانی و کرا بە ئەفسەری سیاسی و موستەشار لای شێخ مەحمود»

ئەدمۆندز لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا دەربارەی نوئێل ئەڵێ:

« کە نوئێل لە ساڵی ١٩١٨ دا چوە سلێمانی، ئەو برسیەتی و گرانیەی کە لە کاتی شەڕی جیهانیدا پەیدا بوبو، ئەو گرانیە بە جۆرێک بوو خەڵک لە برسا ئەمردن، نوئێل بەچاوی خۆی لە سەرجادەکان زەلامی مردوی بینیوە.

که نوئێل چوە سلێمانی تەماشای کرد (١/٣)ی دانیشتوانی جارانی لیٚ نەماوە. ئیتر دەست و برد خواردنی پەیداکرد و زۆرکەس بەوهۆیەوە بووژانەوە، لەبەر ئەوە خەڵک میجەر نوئێلیان زۆر خۆش ئەویست».

بەراستی ئەو کارەی نوئێل کە لەورۆژەدا بۆی رەخسابوو، نەک هەروای کردبو تەنها نوئێلیان خۆش بویٚ بەڵکو ئینگلیزیش بەرزگارکەری خەڵکی ئەو سەردەمە سەیر ئەکرا، بە پێچەوانەی عوسمانلی یەوە کە ئێسکیان لای خەڵک تاڵ بوبو لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا هەستی ئاینی لە ناودا مابوو هەندیٚ مێشک ووشکی کەللە رەقی سەرگەرم بەناوی ئاینی ئیسلام و دەستەی چەکمەرەقی جل خواری سەربە تورک تا رادەیەک لەدەم هەراشی خۆیان نەکەوتبون و ئینگلیزیان بە غەیرەدین دائەنا، بەلاٚم شێخ مەحمود توانی بەرهەڵستی هەمویان بکا و لەگەڵ نوئێلدا لاپەڕەیەکی تازە بۆ ژیانی خەڵکی ئەو رۆژانە بکەنەوە و تا ئەوسا هێشتا شێخ مەحمود دڵی لە ئینگلیز کرمیٚ نەبوبو بە تەقەلاٚی هەردوولا توانرا ئارام و ئاسایش بەرپا بکرێت .

لەبیرم دیٚ لە سەردەمی لاویەتی ئێمەدا باسی یەکێکی ئەو رۆژانە ئەکرا کە چۆن فرمێسکی بۆ ئایینی ئیسلامی عوسمانلی هەڵدەرشت و کە روپییەی بدیایە وێنەی ئینگلیزێکی پێوەبوایە تفی لیٚ ئەکرد ... کەچی هەر ئەو زەلامە لە دواییدا ئەیان ووت بە چنگ روپیەی سکەی ئینگلیزی ئەخستە گرفانیەوە ...

مس بێلٚ لە کتێبەکەیدا دەربارەی باری ژیانی ئەو رۆژانە ئەڵیٚ «٥٥»

« لە راپۆرتێکی میجەر نوئێلدا دەربارەی هەڵوێستی ناوچەکە باسی ئەوە ئەکا کە کوردەکان بە هەموو جۆرێک ئامادەبوون هەر پەیمان و بەڵێنێک کە داوای مۆر کردنیان لیٚ بکرێت، بەبیٚ گیرەوگرفت مۆریان ئەکرد بۆ ئەوەی ئاسایش لەناوچەکەدا بەرپا بکرێت ...

شوێنێکی وەکو رواندوز کە ژمارەی خانوەکانی (٢٠٠٠) خانوبو تەنها (٦٠٠) خێزانی تیادا مابوو، ئەوانەش کە مابوون هەموو برسی و رەش و رووت بون و پەلاماری هەموشتێکیان ئەدا ... هەر لە گژوگیاوە هەتا گۆشتی پشیلە و بگرە گۆشتی زەلامیش».

ویڵسنی حاکمی گشتی بەریتانیا دەربارەی ستایشی نوئێل لە بەجێهێنانی

کاروبارەکانیا ئەڵێ «۳۷»

«سەرگوزەشتە پڕلە موجازەفاتەکانی نوئێل کتێبێکی گەورە پڕەکاتەوە و خۆزگە ڕۆژێک هەمووی ئەنوسرایەوە.

ئازایەتی و زرنگی و کار ئامۆدەیی سێ کەس ئاشکرایە کە هەرسێکیان جێگای سوپاسن ... شارەزایی لیچمن (ابو حنیک) لە وڵاتی عەربدا، هی سۆن لە کوردستاندا و هی نوئێل لە ئێراندا».

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا دەربارەی میجەر نوئێل نوسیوێتی: «٤»

« بە داخەوە شێخ مەحمود نەیتوانی دەسکەوتێکی زۆر بۆ کورد لەو هەڵ و دەرفەتە وەربگرێت کە لەو ڕۆژانەدا هەبوو ... بەتایبەتی یەکێکی وەکو (نوئێل) لەناو شارەکانی کوردستاندا کەوتبوە پڕوپاگاندە بۆ ئەوەی ئەو شارانە بخاتە سەر حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود ... بەڵێ ڕاستە ئینگلیز ئەمەی لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد نەدەکرد، بەڵکو ئەیویست بەهۆی دەسەڵاتی شێخ مەحمودەوە دەسەڵاتی خۆی لەناوچەکەدا بچەسپێنێت، بەڵام هەرچۆنێک بوایە ئەتوانرا کەڵکێکی باش لەو هەلە وەربگرێت. میجەر نوئێل هەرچۆنێک بوبێ، ئەگەر بەسەرزاریش دەریخستبێت کە دۆستی کوردە، زۆر ڕێزی لە شێخ مەحمود ئەگرت و هیچی بە بێ پرسی ئەو نەدەکرد و هەر مێجەر نوئێلیش بۆ لە ۱۹۱۹/۱۱/۲۷ دا یاداشتێکی نارد بۆ ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا کە وتبوی: چوارسەد ساڵە کورد گیرۆدەی دەستی تورکە و هەمو هەوڵێک دراوە وەکو نەتەوەیەک نەهێلرێ بتوێتەوە ...

مێجەر نوئێل زۆر هەوڵی دا ئینگلیزەکان ڕازی بکاو تێیان بگەیەنێت کە چاک وایە بیانوو بە شێخ مەحمود نەگرن و هەوڵێکی ڕاستەقینە بدەن بۆ دروست بوون و یەک بوونی کوردستان، بەڵام سیاسەتی ئینگلیز ئەم بۆچوونەی نوئێلی پەسەند نەکرد، لەپێشا ئینگلیز ئەیویست کوردستان بەش بکا بە چەند دەوڵەتێکی بچووکەوە، لەدواییدا بە یەکجاری وازی لەوەش هێنا و بەنەهێنی بڕیاری پارچەپارچەکردنی کوردستانیدا، کە نوئێل زانی هیچی پێ ناکرێت داوای لە ویلسن کرد کە لە فەرمانی حاکمی سیاسی لە سلێمانی مەرەخەسی بکات، ویلسن ئەو داخوازیەی زۆر پێ خۆشبوو، لە جیاتی ئەو میجەرسۆنی نارد».

ئەحمەد تەقی لە شوێنێکی تری یاداشتەکانیا دەربارەی شێخ مەحمود و دەور و پشتەکەی ئەڵێ:

« بە زۆری ئەوانەی لە شێخ مەحمود کۆبوبونەوە خۆپەرست و پوولەکی بوون و بو سوودی خۆیان ئاژاوەیان ئەنایەوە، شێخ مەحمودیش لە سیاسەتدا زۆر تازە بوو، ئاژایەتیەکەشی ئەوەندەی‌تر هەڵەی پێ دەکرد ... ویڵسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا هەر لە سەرەتاوە شێخ مەحمودی خۆش نەدەویست و هەمیشە لە بیانوو ئەگەڕا، نوئێل زۆر هەوڵی دا ویڵسن لە شێخ مەحمود نەتۆرێ، بەڵام کە نوئێل ڕۆیشت و میجەرسون هاتە جێگای ئیتر شێخ مەحمود گلۆڵەی کەوتە لێژی»

بەو جۆرە ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا هەروەکو مامۆستا رەفیق حلمیش هەر وای بۆ چوبو، بە جووتە لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە نوئێل ئارەزوی پێک هێنانی حکومەتێکی کوردی ئازاد و سەربەخۆی بۆ کورد کردوە و پاڵ پشتێکی ڕاستی شێخ مەحمود بوە ئەگەرچی رەفیق حلمی لە ئەحمەد تەقی زۆرتر سەرگەرم بوە دەربارەی نوئێل کە رەفیق حلمی دەربارەی نوئێل ئەڵێ «٢»

« ئەگەر کورد بەختی هەبوایە و میجەر نوئێل لە کوردستاندا بمایەتەوە هیچ دوور نەبوو کوردستانێکی گەورە پێک بهاتایە . »

ئەو بۆ چوونەی رەفیق حلمی کەوتوتویەتی ئەگەر کورد بەختی هەبوایە، لام‌وایە مەبەستی ئەوەبوە: ئەگەر ئینگلیز بۆ سوودی خۆی بڕیارەکانی بەرامبەر بە میللەتی کورد باش و پاک بوایە و تەنها هەر سوودی خۆی نەخستایەتە بەرچاو و هەڵوێست و ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەوڕۆژانە لەگەڵ کوردا بوایە و کشانەوەی رووس لە پەیمانی سایکس پیکۆ ڕێگای بۆ ئینگلیز خۆش نەکردایە کە ئیتر ترسی ئەوەی نەمێنێت کە ئەبێت بە هاوسنووری رووس و پەیمانی سیڤەر کە لە مادەکانی ٦٢و٦٣و٦٤ دا باسی مافی کوردی تیادا دەسنیشان کرابوو خاوەخاوی تیادانەکرایە و لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکرایە و تورکە کەمالیەکانی پاشەبەرەی عوسمانلی بەسەر یونانیەکاندا سەرنەکەوتنایە و بار و هەڵوێستی ئەو ڕۆژانە ئینگلیزی وا لێ بکردایە وەکو چۆن حکومەتی عیراقی عەرەبی ئەو سەردەمەی دروست کردبوو فەیسەلی بۆ بەکێش کردوژمارەیەکی ئێجگار زۆری

وەکو نوری سەعید و یاسین هاشمی و جەعفەر عەسکەری و جەمیل مدفەعی و ئەو خوێندەوار و ڕۆشەنبیرانەی کە بۆ فەیسەڵ کۆ کرانەوە ئەگەر ئینگلیزیش مەبەستی بوایە ئەو هەموو ئەفسەرە گەورانەی کورد کە لە ئەستەمبوڵ بون و دەیان جەنەراڵ و بەرەوژوورتر و بەرەو خوارتریان تیادابوو هەموی بە کێش ئەکردن بۆ خواروی کوردستان و ئەیکردن بە کاربەدەست و ڕێبەری کورد لە خواروی کوردستاندا و هەوڵی نەئەدا زۆری وەکو ئەمین زەکی مێژوو نوس لە شێخ مەحمود دورە پەرێزبێ و گەلێکی تری وەکو تەوفیق وەهبی و صالح زەکی صاحبقران و عیزەت مدفەعی کە لە سەرەتادا لەگەڵ شێخ مەحمودا بون ئەوانەی هان نەئەدا لە شێخ مەحمود دوور بکەونەوە و لەناو سوپاو کارو باری عیراقدا دای نەدەمەرزاندن، ئەگەر ئەوانە رووی نەدایە ئەوا دەوڵەتەکەی شێخ مەحمودیش وەکو ئەوەی شافەیسەڵ سەري ئەگرت ... بەڵام ئەو هەموو ئەگەرانە و ئەو هەموو خۆزگانە چۆن بۆ کوردي دواکەوتوو داماوی ئەو ڕۆژانە کۆ ئەبونەوە...؟!

لە یاداشتەکانی شێخ ڕەئوفی شێخ مەحمودا «٢١» باسی ئەوەئەکا کە چۆن لە سەرەتادا زۆری وەکو ئەحمەد تەقی گلەیی و ڕەخنەی زۆریان بەرامبەر بە کرداری شێخ مەحمود بوە، بەڵام کە کتێبەکەی مس بێڵ بڵاوکرایەوە ئەوسا ئەحمەد تەقی بە شێخ ڕەئووف ئەڵێ:

« بەڕاستی لە دوای ئەوەی کتێبەکاني ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز چاپ کران و بڵاوکرانەوە، بەتایبەتی ئەوەی مس بێڵ، ئەوسا بۆمان دەرکەوت کە جاران چەند غەدرمان لە شێخ مەحمود کردبوو، وەوامان دانابوو ئەگەر شێخ مەحمود سەرکێشی نەکردایە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، لەوانەبوو نۆئێل میللەتی کورد بگەیەنێت بە قۆناغێکی تازە و بگات بە هیواو مەبەستی خۆی. »

بەڵێ ڕاستە وەکو ڕەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی باسیان کردوە و هەندێ کەسی تریش لێی دواون، هیچ دوورنیە نوئێل هەتا ڕادەیەک وەکو ویلسن و سێر پێرسی کۆکس و میجەرسۆن و ئەدمۆندز رقی لە شێخ مەحمود نەبووبێ و دوورنیە لەبەر ئەوەی کە هەر لە سەرەتاوە یەکەم ئینگلیز بوە پەیوەندی ڕۆژانەی بێ گێچەڵ بووبێت لەگەڵ شێخ مەحمودا و لە نزیکەوە بۆی دەرکەوتبێت شێخ مرۆڤێکی

راست و بێ گزی و بێ فێڵ بوە و دڵسۆزی راستی گەل و نیشتمانەکەی بوە و دووریش نیە حەزی کردبێت کوردستان سەر بە خۆبێت ئەگەر سیاسەتی ئینگلیز لەگەڵ ئەو سەربەخۆبوونەی کوردابێ، بەلاّم کە نوئێل پێی زانی ئیتر سیاسەتی حکومەتەکەی خۆی لەوەدایە گێر بگۆڕێ و بەرامبەر بە بەڵێنەکانی بۆ کورد پاشگەزبێتەوە و وا لە شێخ مەحمود بکرێ دەسەلاّتی کەم بکرێتەوە و وەکو مووچە خۆرێکی کرێ گرتە سەیری بکرێ، بڕواناکەم نوئێل ئیتر توانیبیتی یا ویستبیتی درێغی بکا لە بەجێ هێنانی سیاسەتی حکومەتەکەی، تەنها ئەوە هەیە ڕەنگە نوئێل بە شتێکی ئاسانی نەزانیبێت پاش ئەو هەمو دۆستایەتیەی لەگەڵ شێخ مەحمودا ڕوو بەڕووی ببێتەوە و بیانووی خۆڕایی پێ بگرێ و ئەو لووت بەرزی و دەعیە زۆرەی کە لە میجەرسۆندا هەبووە لە نوئێلدا نەدەبینرا بۆیە هەوڵیدا لەو کارەی دووربکەوێتەوە و کەوەختێ داوای ئەوەی کردوە ویلسنی حاکمی گشتی پێی خۆشبوە و دەم و دەست میجەرسۆنی لە جیاتی ئەوناردوە بۆ سلێمانی بۆ بەجێهێنانی سیاسەتی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز.

ڕەفیق حلمی لە شوێنێکی یاداشتەکانیا ئەڵێ:

« لە دوای ئەوەی نوئێل لەو گەشتەی گەڕایەوە کەکردبوی بۆ هەندێ لە شارەکانی کوردستان بۆ ڕێکخستنی کاروباری ئەو ناوچە و شارانە، کە گەڕایەوە بۆ سلێمانی شێخ مەحمودی لە وێنەیەکی تازەدا هاتە بەر چاو و بۆی دەرکەوت کە شێخ مەحمود لە هەوایەکی تردایە و خەریکە لەو ڕێگەیە لابدا کە ئینگلیزەکان بۆیان دانابوو، لەگەڵ ئەوەشدا نوئێل ئەوەی نەدایە رووی شێخ مەحمود.

نوئێل ئینگلیزێکی شارەزابوو بە هەواڵی کورد، هەتاکو لە سلێمانیدا مایەوە بواری ئەوی نەئەدا هیچ کەم و کووڕیەک دەربکەوێ، بەڵکو هەوڵی ئەدا هەر چەوتی و ناڕێکیەک هاتبێتە ڕێ راستی کردوەتەوە ».

ئەوەی سەرنجی یاداشتەکەی ئەحمەد تەقی و ڕەفیق حلمی بدا بۆی دەرئەکەوێ کە هەردوکیان لایان وابوە نوئێل بۆیە چوە بۆ گەشت و گەڕان بە ناوچەکانی خوارووی کوردستاندا بۆ ئەوەی کاروباری ناوچەکە ڕێک بخا و داوا لە خەڵکی ئەو ناوچانە بکا کە بچنە ژێر سایەی ئیدارەی شێخ مەحمودەوە ... بەلاّم لە

ڕاستیدا شتەکە بەو جۆرە نەبووە ... ئەحمەد تەقی لە شوێنێکدا تۆزێک بۆ ئەوە چوە کە وتویەتی ئینگلیزەکان هەوڵیان دا کە کوردستانی خوارو بکەن بە چەند ویلایەتێکی جیاوازەوە بەڵام لە دواییدا ئەوە سەری نەگرت ...

لام وایە شێخ مەحمود لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ نوسەر وتویانە خام بوە لە سیاسەتدا بەڵام وابزانم ئەوەندە زیرەکی تیادابوە کە مەبەستی ئینگلیز، چاک و خراپی لێک جیا بکاتەوە ... ئەو گەشتەی نوئێل بۆ ئەوە نەبوە کە وەکو ڕەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی بۆی چوون بەڵکو بۆ ئەوەبوە کە دەم و دووی سەرۆک عەشیرەتەکان شارەزاببێت و ڕاپۆرتێک ئامادە بکا بۆ کاربەدەستانی خۆی دەربارەی پەیوەندی ئەو سەرۆک عەشیرەتانە لەناوخۆیاندا و هەڵوێستی هەر لایەکیان بەرامبەر بە شێخ مەحمود و شێخیش زۆرباش ئاگاداری سیاسەتی بەریتانیا بوە، وە هیچ دوورنیە هەندێ لەو سەرۆک عەشیرەتانەی نوئێل چاوی پییان کەوتوە ئەو ڕاستیەیان لای شێخ مەحمود درکاندبێت بۆیە وەکو ڕەفیق حلمی ئەڵێ کە نوئێل گەڕایەوە شێخی لە بارێکی تردا بینی و تەماشای کرد خەریکە لەو ڕێگەیە لابدات کە ئینگلیز بۆی دانابوو.

ڕەفیق حلمی لە باسی ڕەوشتی نوئێل دا ئەڵێ «٢»

« نوئێل مەنگ و هێمن و زۆرشارەزابوو بە ئاداب و هەڵسان و دانیشتنی کوردەواری و بێ ئەندازە حورمەتی حوکمداری ئەگرت و بۆ خۆی تەنها کاتبێکی بچووک یا خزمەتکارێکی بچووکیشی بەبێ ئەمرو ڕەزامەندی شێخ مەحمود دانەدەنا ».

ڕەفیق حلمی لە باسی پەیوەندی خۆی بە نوئێلەوە ئەڵێ:

« بە ئەمری شێخ مەحمود من لە تەرجمەدا یارمەتی نوئێلم ئەدا، لەو ڕۆژانەدا پیاوی ئینگلیز زان نەبوو، من فەرەنسیم ئەزانی و نوئێلیش فەرەنسی ئەزانی بۆیە شێخ مەحمود ئەمری پێ کردم یارمەتی نوئێل بدەم و بە شەویش دەرسی زمانی کوردیم پێ ئەوت و لە دوای تەواوکردنی دەرس لەگەڵما ئەکەوتە باس و هەواڵی کوردستان، هەر لەو ڕۆژەوە لەخەیاڵی گەشتێکدا بوو بۆ کوردستانی تورکیا و ئەیویست دەربارەی کوردە ناوادارەکانی کوردستانی تورکیا شارەزایی پەیدابکا ... باسی بەدرخانیەکان و کوڕەکانی جەمیل پاشا و بابانەکانی

ئەستەمبولی ئەپرسی و وەکو بۆم دەرکەوت ئەو لەمن شارەزاتربوو لەو ڕووەوە.

نوئێل بەتەمابوو گەشتێک بکا بۆ تورکیا و منیش لەگەڵ خۆیا ببا و لەوێ لەگەڵ کوردەکان و نیشتمان پەروەردەکان و گەورەپیاوانی ئەوێدا بۆ کورد تێ بکۆشێت و پیشتیوان و لایەنگر بدۆزێتەوە بۆ حکومەتی کوردستان. لەبەر ئەوە شێخ مەحمودی لە خۆی زیز نەدەکرد و نەی ئەویست دەستی لێ بەردا (نوئێل لەو گەشتەی کە کردی بۆ کوردستانی تورکیا فایقی تاپۆی لەگەڵ خۆیدا بردوە لەجیاتی ڕەفیق حلمی کە وەکو لە یاداشتەکانیا خۆی ئەڵێ لەو ڕۆژانەدا نەخۆش کەوتبوم).

ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەڕواو ئەڵێ:

«بەو پێیە، میجەر نوئێل بەو سیاسەتە نەرم و نیان و زرنگەی خۆی، توانی هەتا ماوەیەکی باش کۆلۆنێل ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا لە شێخ مەحمود نەتۆرێنێ بەڵام خەڵکی شارەکان وەکو کفری و کەرکوک و چەند کەسێک لە عەشیرەتەکانی کورد حەزیان نەکرد بچنە ژێر دەسەڵات و حوکمداریەتی شێخ مەحمود و شێخیش ئەوەی لە ئینگلیزەکان ئەناسی (بێگومان شێخ زۆرباش بۆی چووبوو)و هەموی بە پیلانی ئەوان دائەنا و باوەڕی پێیان نەمابوو.

بە کورتی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزدا ڕێک نەکەوت و متمانەی پێ نەکردن، لەبەر ئەوە تەقەلای نوئێل کەڵکی نەگرت و ناکۆکی کەوتە نێوان شێخ مەحمود و ویلسن وە کە هەر لەسەرەتاوە حەزی لە شێخ مەحمود نەدەکرد و بە چاوێکی باش سەیری نەدەکرد».

لام وایە هەندێ لەو ستایشەی - ڕەفیق حلمی بۆ نوئێل بە هۆی ئەو تێکەلاوی و پەیوەندیەوە بووبێ کە لە سەرەتاوە لەگەڵ نوئێلدا هەیبوە، ئەو نوئێلەی زۆربەی خەڵکی ناوچەکە وەکو فریشتەیەک سەیریان کردبێت گومان لەوەدانیە ئەبێ کاریشی کردبێتە سەر ڕەفیق حلمی ...

بەڵام بەلای منەوە هەندێکیش لەو ستایشە بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی ئەوانە بوە کە دژی ئینگلیز بوون و ( بەزۆری ئەوانەی سەر بە تورک بوون هەمیشە دژی ئەوانەبوون کەسەر بە ئینگلیزبوون) و دوور نیە ئەو نزیک بوونەوەی ڕەفیق

حلمی وئەو پەیوەندیەیان لەگەڵ نوئێلدا بە جۆرێکی تر لێک درابێتەوە و(کە لە راستیدا رەفیق حلمی دووربوە لەوە و لە ڕاسپاردەی شێخ بەولاوە بەهیچ شتێکی تر هەڵنەستاوە) خەڵک ووتبیتیان ئەگەر هەر لەبەر ئەوە بووبێ کە هەردوکیان فەرەنسی ئەزانن لام وایە نوئێل فارسیەکی زۆر باشی زانیوە و چ شێخ مەحمود و چ خەڵکی ئەو سەردەمە بەشی زۆریان وەکو زمانێکی ئەدەبی فارسیان زانیوە و شارەزای ژمارەیەکی زۆر لە شاعیرانی فارسی بوون.

بێجگە لەوە رەفیق حلمی هیچ گومانی تێدانیە ئەو ڕۆژانە تەنها ڕووی دەرەوەی نوئێلی دیوە و شارەزای دیوی ناوەوەی نەبوە و ئەو یاداشتانەی لە دواییدا نوئێل خۆی تۆماری کردوە دەربارەی گەشتەکەی بۆ کوردستانی تورکیا نەیدیوە و نەیخوێندبوەوە، بۆیە لای وابوە کە نوئێل بۆیە چوە بۆ کوردستانی تورکیا بۆ ئەوەی لەگەڵ گەورە پیاوانی کوردا گفت و گۆ بکاو بۆ کوردستانی گەورە هەوڵ بدا بەلاّم ئەو گەشتەی کە نوئێل کردبوی بۆ کوردستان و بە نامێلکەیەک بەناوی گەشتێک لە نێوانی ١٤ی خوزەیران هەتا ٢١ی/ئەیلول/١٩١٩ کردبوی و چاپی کردبو و بلاّوی کردوەتەوە زۆر بە ئاشکرا مەبەست لە چوونی روون ئەکاتەوە .

میجەر نوئێل لەو گەشتەیدا بە ئاشکرا باسی ئەوە ئەکا کە چوونەکەی بۆ کوردستانی تورکیا بۆ ئەوە بوە ڕاسپێرەکانی حکومەتەکەی خۆی جێ بە جێ بکات ... ئەو سەردەمەی نوئێل گەشتەکەی کردوە و پەیوەندی بە سەرکردە و ناوداران و عەشیرەتەکانی کوردەوە کردوە لە کوردستانی تورکیا ئەوڕۆژانەبوە کە لە ناوچەی ( ئەنادۆل)دا کوردەکان بڕیاری هاوکاری کردنیان دابوو لەگەڵ موستەفا کەمال پاشا و تورکە کەمالیەکانا (بەر لەوەی موستەفا کەمال لێیان هەڵگەڕێتەوە)، و کەمالیەکان بڕیاریان دابوو لە دوای ڕزگارکردنی تورکیا لە داگیرکەران، ئۆتۆنۆمی بدەن بە کورد .

ئینگلیزەکان زۆر چاک ئاگادار و شارەزای ئەو پەیوەندیەی نێوان موستەفا کەمال و کوردەکان بوون لە ناوچەی ئەنادۆلدا، بۆیە ئینگلیز بەهەر نرخێک بوایە، ئەبوو ئەو هاوکاریە تێک بدا و لە ڕاستیدا چوونی میجەر نوئێل بۆ ناو کوردەکانی تورکیا بۆ ئەوەبوە کە دڵی موستەفا کەمال و کەمالیەکان لە کورد

کرمیْ بکا و بیانخاتە گزمانەوە، بەو جۆرە ئەو مەبەستەی کە نوئێلی بۆ نێررابوو سەری گرت.

مس بێلی سکرتێری ئەوسەردەمە بۆ کاروباری ڕۆژهەلاٌت کە لای حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا (ویلْسن) دەورێکی زۆر گرنگی بینیوە و یەکێک بوە لەوانەی دژی کوردبوە و بە چاکە ناوی شێخ مەحمود و شۆرشگێڕەکانی کوردی نەهێناوە، دەربارەی ئەو چوونەی میجەر نوئێل بۆ کوردستانی تورکیا لە کتێبەکەیدا ئەلیْ «٥٥»

«لە کۆتایی مانگی حوزەیران سالْی ١٩١٩ دا میجەر نوئێل نێررا بۆ ئەستەمبول بۆ ئەوەی لەویْ لەگەلْ مەندوبی سامیدا گفت و گۆ بکات.

کە چوە ئەستەنبول هەردوکیان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە پێویستە کوردەکانی تورکیا ( کە لەو ڕۆژانەدا هێشتا لەگەلْ تورکەکاندا تێکیان نەدابووە لە ئەنادۆل هاوکاریان کردو وەکو لە باسی پەیوەندی کورد و تورکدا لە پێشتردا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن کوردەکان بە ئومێدی ئەوەبوون دوای ڕزگارکردنی تورکیا لە داگیرکەران ئۆتۆنۆمیش بدەن بە کورد)لە تورکە قەومیەکان دووربخرێنەوە ...

بۆ ئەوە موافقتی کاربەدەستانی ئەستەمبول وەرگیرا بۆ ئەوەی میجەر نوئێل بەناوچەی کوردستانی تورکیادا گەشتێک بکات و میجەر نوئێل چوە کوردستان و جگە لەو کارەی کەپێی سپێرابوو داوای لیْ کرابوو کە هەولْ بدا ئەمن و ئاسایشی کریستیانەکانی ناو کوردستان مسۆگەر بکات ...

تورکەکانی سەر بە موستەفا کەمال لەو هەلْوێست و گەشتەی میجەر نوئێل سلەمینەوە و ترسی ئەوەیان لێنیشت کە ئینگلیزەکان تەقەلاٌی ئەوە بدەن کوردستانێکی سەر بە خۆ دروست بکەن و کوردستان لە تورکیا جیابێتەوە ... ئەوەبو سەرکردەی لەشکری (١٣)ی تورک (ئەحمەد جەودەت) هەولْی دا بەدرخانیەکان بگرێت ... ئەو کاتەی نوئێل ئەو گەشتەی تەواو کرد، سەرکردەی حەملەی میسر میجەر نوئێلی داواکرد و لە (ملاطیە)وە بردیە لای خۆی و نوئێل لە گەشتەکەیدا ئەو مەبەستەی هێنایە دی کەبۆی چوبوو و لەو ڕۆژەوە ئیتر نێوانی تورک و کوردەکان تێکچوو».

وابزانم ئەو دان پیانانەی مس بێلْ شتێکی ئاشکرایە و هیچ روون کردنەوەیەکی تری ناوێ دەرباوەی مەبەستی راستەقینەی چوونی نوئێل بۆ کوردستانی تورکیا.

نوئێل جگە لەو تەقەلایەی کە سەری گرت، چوونەکەی مەبەستێکی تریشی تیادابوە کە لە ڕاپۆرتی سالانەی سالی (١٩١٩)دا میجەر نوئێل بە ڕاپۆرتی ژمارە C.o. 731-5068 بە دورو درێژی باسی گەشتەکەی خۆی و پەیوەندی کردن بە سەرۆکی عەشیرەتەکان و سەرکردەکانی کوردوە کردوە و هەولی داوە لەو ماوەیەدا کە گەشتەکەی تیادا کردوە لە نێوانی (١٩١٩/٦/١٤ هەتا ١٩١٩/٩/٢١) مەعلوماتێکی ئێجگار زۆر و دوور و درێژی دەربارەی ژیانی کۆمەلایەتی و دەسەلاتی سەرۆک عەشیرەتەکان کۆ بکاتەوە و لە پاشکۆی ئەو ڕاپۆرتەدا (٦٣) وێنەی ئەو سەرۆک و ناسراوانەی کە ئەو ڕۆژانە لە کوردستان دیونی لە (٣٠) لاپەڕە دا وێنەکانی بلاو کردوەتەوە کە هەندێکی وەکو کامەران بەدرخان و جەلات بەدرخان و ئەکرەمی جەمیل پاشای دیابەکر و یەعقوب پاشا و کوردەکانی زازا و قزلباش و گەلێکی تری تیادایە کە لە ڕاستیدا ئەوە ئەهێنێت باسێکی تایبەتی بە پێی ئەوە بنوسرێت.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لە کتێبەکەیدا دەربارەی هۆی ناردنی نوئێل بۆ کوردستانی تورکیا لە کتێبەکەیدا ئەلێ «٤٩»

ئەوڕۆژەی نوئێل چوە کوردستانی تورکیا، تورکەکان هەولیان دا بیرو ڕای گشتیی جیهانی و ناوخۆ وا تێ بگەیەنن کە نوئێل بۆ ئەوە چوبو بۆ کوردستان بۆ ئەوەی زەمینە بۆدامەزراندنی حکومەتی کوردی خۆش بکرێت. بەلام شتەکە لە ڕاستیدا بەو جۆرە نەبوە، مس بێلْ لە کتێبەکەیدا دانی بەوەداناوە کە هەمو هەولْ و تەقەلایەکی نوئێل لەناو کوردەکانا تەنها بۆ ئەوە بوە کە ڕازیان بکات دژی تورکەکان بوەستن و ڕاپەڕن و شۆڕش برپاربکەن ئەوەبو لە (کاختا) لە مایس ١٩١٩ دا ئەو هەولْ و تەقەلایەیان بە ئاشکرا دەربڕی».

پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسی دوکیۆمێنتە نەهێنیەکانی ناو تورکیا ئەکا کە پەیوەندییان بەو سەردەمەوە هەیە ئەلێ:

« لەگەلْ ئەوەشدا تورکەکان ئەوجۆرە پروپاگەندەیان بلاو ئەکردەوە، هەندێ لەو بەلگە نەهێنی و دوکیۆمێنتیانەی ناو ئارشیفەکانی تورکیا ئەوپروپاکەندانە بە

درۆ ئەخاتەوە، ئەو دوکیومێنتانە لەلایەن هەندێ کەسی دیموکراتییەوە توانرا ببرێنە دەرەوە و ڕاستیەکە ئاشکرا بکەن». ( بۆیە تورکەکان ئێستە بە هیچ جۆرێک ڕێگەی کەس نادەن ئەو دوکیومێنتانەی ئەو سەردەمە لە ناو ئارشیفەکانیاندا سەیربکەن جگە لە چەند نووسەرێکی تایبەتی خۆیان نەبێت).

ئەوەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسی کردوە لەم ڕۆژانەشدا لە ساڵی ١٩٨٩/١٩٨٨ دا سەریهەڵدایەوە کە هەندێ کەس هەوڵیاندا دەربارەی کوشتاری ئەرمەنی لە لایەن تورکەکانەوە پەنا ببرێتە بەر ئەو دوکیومێنتانە و دراسەیان لە سەر بکرێت بەڵام کاربەدەستانی تورکیا ڕێگەی ئەوەیان نەدان و ڕۆژنامەی لەندەنی وەکو(گاردیان) ئەو ڕاستیەی روون کردەوە و دەستی تورکەکانی خستە ڕوو).

پروفیسۆرحەسرەتیان دەربارەی چالاکی ئینگلیزەکان لە ناو کوردەکانی تورکیادا ئەڵێ «٤٩»

«وەکیلی ئینگلیز بۆ وەزارەتی دەرەوەی نوسیوە ئەڵێ: لەگەڵ شێخ عەبدالقادر( مەبەستی شێخ عبدالقادری شمزینی بوە) و هەندێ کەسی تردا قسەم کردبوو، داوام لە شێخ عەبدالقادر کرد بچێتە کوردستان و لەوێ دەسەلاتی خۆی بەکاربێنێت، ئێمە ئەمانەوێ تورکەکان بخەڵەتێنین، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ بڕوا بە کورد بکرێت ... هاندانی کوردەکان لەم ڕۆژەدا شتێکی خراپ نیە، هەر ئەوە وەکیلە لە راپۆرتی ساڵی ١٩١٩ دا ئەڵێ:

هێشتا کوردەکان دژی موستەفا کەماڵ ڕانەپەڕیون، بەڵام نوئێل ئومێدەوارە کە بتوانێت ئەوە بکا ( نوئێل لەو ڕۆژانەدا بە موافەقەتی کاربەدەستانی تورکی کە لە ئەستەمبول بوون و ئەو ڕۆژانە ئیدارەی ئەستەمبول جیاواز بوە لەگەڵ ئەوەی ئەنادول کە موستەفا کەماڵ و ئەوانەی سەر بە ئەوبوون چالاکی خۆیان تیدا ئەنواند و لەوناوچانەدا کوردەکان هاوکاریان ئەکردن، بە موافەقەتی ئەوانەی کوردستانی تورکیا بۆ ئەو گەشتەی کە باسی کردوە».

جگە لەو بەڵگەیەی کە باسمان کرد دەربارەی کردەوەی نوئێل بۆ بەجێهێنانی سیاسەتی حوکومەتەکەی کە بێگومان چ رەفیق حلمی و چ ئەحمەد تەقی ئاگاداری ئەو راپۆرتە و مەبەستی چوونەکەی نەبوون لە کاتی خۆیا، جگە

لەوەش کاپتن های لە کتێبەکەیدا Two years in kurdistan ئەڵێ: «٤١»

« کە چوینە کۆیە، شێخ مەحمودی حوکمدار، شێخ عوسمانی ناردبو کە بکرێت بە قائیمقامی کۆیە (زۆرم هەوڵدا کەبزانم ئەو شێخ عوسمانە کێ بوە بەڵام نەگەیشتمە ئەنجام)،بەو حیسابەی کە کۆیە و رانیە و قەلادزە بەشێک ئەبن لە ناوچەی سلێمانی و لە ژێر ئیدارەی شێخ مەحمودا، بەڵام میجەر نوئێل وای تێ گەیاندم کە پێویستە یەکێک لە خەڵکی کۆیە بکرێ بە قائمقام ... شێخ عوسمان لەگەڵ شێخ عەبدوالله (وابزانم نیازی لە سەید عەبدوالڵەی حاجی سەید حەسەنی ئامۆزای شێخ مەحمودبوە) دابو و ئەفسەرێکی تورکیش لێبوو کە ناوی (راشد ئەفەندی)بو، شێخ عوسمان پیاوێکی زۆر جەنتڵمان بوو، تەنها بەزمانی کوردی ئەیتوانی شت بنوسێت و بخوێنێتەوە، لە هەموو کردەوە و رەفتاریکیا پیاوێکی راست بوو (بێگومان چۆن پیاوی لەو جۆرە بۆ سیاسەتی ئینگلیز دەستی ئەدا )، لەورۆژانەدا لە کۆیە غەفوری یەکان و حەویزی یەکان لەناو خۆیانا ناڕێک بوون، منیش چارم نەبوو ئەبوایە لە هەردوولا یەکێکیانم بگرتایە ... بۆئەوە محەمەد ئەمین ئاغای غەفوری و کەریم ئاغای حەویزی گیران و نێران بۆ کەرکوک.

ئەم گرتنە بە دڵی شێخ عوسمان و شێخ عەبدوالله بوو وەدیاربوو ئێجگار ئەوەیان پێ خۆشبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا هێشتا هەردوولا هەربەوە قایل نەبوون ئەو نوێنەرەی کە لە لایەن شێخ مەحمودەوە نێررابوو بۆ کۆیە کە بکرێ بە قائمقام.

کە میجەر نوئێل هاتە رانیە، وای بە باش زانی رانیە و قەلادزەش بخرێتە ژێر چاودێری و دەسەڵاتی منەوە (کە کاپتن های نیازی لە خۆی بوە کە ئەوسا حاکمی سیاسی بوە لە کۆیە (لە دواییدا بوو بەهی هەولێر) و بە گەشت چوە بۆ ئەوناوچەیە)وە لە دوای مۆرکردنی موتارەکە (رێکەوتنی مودراس لە ٣٠/١٠/١٩١٨) بابەکر ئاغای پژدەری لەلایەن ئێمەوە کرا بە قائمقامی پژدەر»...

کەواتە ئەوە نوئێل و ئەوە کاپتن های کە بەئاشکرا دەستی ئەو گەشتەی نوئێلی ئاشکرا کردوە و ئەو گەشتەشی بۆ تورکیا هەر خۆی و مس بیل ئاشکرایان کردبوو، ئیتر نازانم ئەبێ چۆن نوئێل هەوڵی ئەوەی دابێ کە

کوردستانێکی گەورە پێک بێت وەکو ڕەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی بۆی چووبوون؟؟

لێرەدا شتێکی خراپ نیە ئەگەر باسی ڕاپۆرتێکی ئەوسەردەمەی ئینگلیزەکان بکەین دەربارەی هەڵوێست لە کۆیسنجاق دا...

ژمارەی دۆکیومێنتەکە (Fo.371-5069) ساڵی ١٩١٩ ئەڵێ:

«تورکەکان لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٨دا شاری کۆیەیان بەجێ هێشت و کۆیەیان لەژێر ڕەحمەتی عەشایر و سەرکردەکاندا جێ هێشت. لەو کاتە نا ئارامیەدا تەلگرافێک نێردرا بۆ موسڵ لەلایەن کۆییەکانەوە و داوا لە ئینگلیزەکان کرا پارێزگاری لە کۆیە بکەن و بۆ وەرامی ئەو تەلگرافە ئەمردرا بە کاپتن های کە ئەو ساتە لە ئاڵتون کۆپری بوو دەم و دەست بگاتە کۆیە و لە ١٥/دیسەمبەری ١٩١٨دا کاپتن های گەیشت و لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی لێ کرا و حەماغای کۆیە (باوکی کاکە زیاد کرا بە حاکمی کۆیە) بەڵام کاپتن های دەڵێ کرا بە قائمقامی کۆیە».

هەمان ڕاپۆرت لە باسی ئەو ڕۆژانەی کۆیەدا ئەڵێ:

«ژمارەی کۆیە لەو ڕۆژەدا (٤...) کەس و ژمارەی ناوچەی کۆیە بە شارەکەوە (٢١٤٨٨) کەس بوو کە لە ناو ئەوانەدا (٥٨٠) کریستیان و (٣٢٤) جوولەکە هەبوو. کۆیە دوو ناحیەی هەبوە ١ـ تەق تەق ٢ـ کانی ماران.

حەماغای کۆیە کە سەرۆکی غەفوری یەکانە لایەنگری ئێمەیە و قبوڵی نەکرد کە ئیعتراف بە شێخ مەحمود بکات (ناڵێ ئێمە هانمان دا و وامان لێ کرد کە لە شێخ مەحمود نزیک نەکەوێتەوە بۆ ئەوەی وەکو چۆن هەڵەبجەیان لەدواییدا لە شێخ مەحمود پچڕی،ناوچەی کۆیەش ڕێگە نەدەن ببەسترێت بە سلێمانیەوە)، غەفوریەکان لە حەوێزیەکان بە هێزترن ئەگەر چی حەوێزیەکان خوێندەوار و ڕۆشنبیریان زۆرترە ... پیاوە ئاینیەکانیش ( عولەماء) دەوری خۆیان هەبوە و بەخۆیان و جبە و مێزەرە سپیەکانیانەوە بە دوای مووچە و مانگانەدا دەگەڕان.

لە ناو مەلاکانی ناوچەی کۆیەدا مەلا محەمەد (نیازی لە مەلای گەورە بوە) ناوبانگی لە زۆر شوێنی میسۆپۆتامیا و کوردستاندا بڵاو ببوەوە و قسەکانی لە ناوچەی کۆیەدا وەزنی خۆی هەیە... بەر لەوەی ئینگلیزەکان لە ١٥/دیسەمبەری

سالی ١٩١٨ دا بگەنە کۆیە، یاسا و هەڵوێست زۆر ئاڵۆز بوو لە ١ی/دیسەمبەردا بڵباسەکان پەلاماری شاریان دا بەڵام لەوساوەکە کاپتن های گەیشتوەتە کۆیە پشێوی و ئاژاوە نەماوە».

لە راستیدا ئەو ناکۆکیەی تاقمی کۆیە و شێخان لە کۆنەوە هەبوە، لەباسی چوونی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود بۆ ئەستەمبوڵ باسی ئەو ناکۆکیەمان کرد.

وەکو لە پێشتریشدا باسمان کرد، مێجەر نوئێل نوێنەری راستەقینەی قۆناغێکی سیاسەتی ئینگلیز بووە کە لە سەرەتادا بەرواڵەت ئەیان ویست وا لە خەڵک بگەیەنن ئینگلیز دڵسۆزی کوردە و هەوڵیان ئەدا بە هیچ جۆرێک کورد لەو رۆژانەدا لە خۆیان نەئاڵۆزێنن و دڵیان رازی بکەن.

هیچ گومان لەوەدا نییە مێجەر نوئێل لە سەرەتادا و لە دواییشدا بە بست لە سیاسەت و لە سوودی وڵاتەکەی خۆی لای نەداوە و ویستویەتی دەسەڵاتی وڵاتەکەی بەسەر ناوچەکەدا زاڵ ببێت و زۆر بەپەرۆش بووە بۆ ئەوەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیادا بەپەلە و دەستوبرد مور بکرێ (بێ گومان ئەو مۆر کردنەش هەر لەسەر حیسابی کوردبووە). بۆ نموونە: مێجەر نوئێل لە راپۆرتێکیدا بۆ ویڵسنی حاکمی گشتی لە بەغداً لە بەهاری ساڵی ١٩١٩ دا ئەڵێ «٣٧»

«پێویستە ئەوەمان لە بەر چاوبێ کە سیایەتی جیهانی زۆر کار دەکاتە سەر هەڵ و مەرجی ناو خۆی ناوچەی کورد نشینەکان، بەدوا خستنی مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیادا لەگەڵ شەڕی نێوان تورک و یۆنانیەکاندا سەرنجی هەموو سەرکردەکانی کوردی ڕاکێشاوە، بەرنامەی بۆلشەویکەکان لەناو هەموانا زانراوە و ناوی بۆلشەویک هەتاکو بێت زۆرتر پەرە دەسەنێت و کەس نییە بە خراپە باسیان بکا کە ئەمە ڕێگا لە دەسەڵات و لە سەپاندن و جێگیربوونی سیاسەتی بەریتانیا دەگرێ لە ناوچەکەدا».

بەڵای زۆر کەسەوە وابوە، ئەو رۆژانەی کەمالییەکان پەیوەندییان بەهێزبوە لەگەڵ سۆڤیەتدا و ئەوانیش لەبەر ئەوە کەمالییەکانیان بە رزگارکەری وڵاتەکەیان داناوە بەرامبەر ئینگلیزی داگیرکەر و لەیۆنانیەکان کە ئەویش چاوی

بڕیبوە هەندی ناوچەی خۆرئاوای تورکیا ،لەبەر ئەوەی کەرکوک لەو سەردەمەدا شوێنی پڕوپاگندەی کەمالییەکان بوە دژی ئینگلیز و بۆ ئەوەی وا لەخەڵک بکەن کە جارێکی تر ویلایەتی موسڵ بخرێتەوە سەر تورکیا، ئەو نووسین و بڵاوکراوانەی ئەو ڕۆژانە لەناو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تورکیادا بڵاو دەکرایەوە کە لەو ڕۆژانەدا تورکەکان ئیجازەی حزبی شیوعی تورکییان دابوو، خەڵک ئەو بڵاوکراوانەی ئەوانیان پێ خۆش بوە کە دژی ئمپریالستی داگیرکەری ئەو ڕۆژانە بڵاو دەکرایەوە، ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە کە گەیشتونەتە کەرکوک، خوێندەوارە کوردەکانیش کە هەندێکیان تورکی‌یان زانیوە ئەو بیروباوەڕە مارکسیانەی ئەو ڕۆژە کاری تێ کردوون و بەناو خەڵکدا بڵاویۆتەوە، کە ئینگلیزەکان بێزاری خۆیان بەرامبەر بەو بڵاوبوونەوەیە دەربڕیوە...لە باسی بزوتنەوەی نەتەوایەتیدا دەقی ئەو بێزاربوونەم هەر وەکو خۆی بە ئینگلیزی بڵاوکردەوە.

لەبیرم دێ جارێک تۆفیق وەهبی باسی ئەو ڕۆژنامانەی ئەکرد کە ئەوسا لە تورکیا دەرئەچوون و ئەگەیشتنە کەرکوک یا هەولێر وەیاخود لە ڕێگای سوریا و لوبنانەوە ئەگەیشتنە کوردستانیش، ئەی وت بەڕاستی لەو ڕۆژانەدا ئینگلیزەکان بە گەیشتنی ئەو ڕۆژنامانە زۆر تەنگەتاو دەبوون و هەولیان دەدا بەهەموو جۆرێک ناوی بۆلشەویک لای کورد بزڕێنن،کە ناوی بۆلشەویک لەو ڕۆژانەدا مانای کفرو ئیلحادو بەرەڵایی ژیانی خێزانی دەگرتەوە.

سەیر ئەوەیە ئیدارەی بەریتانیا لە بەغدا بەهۆی مێجەرسۆنەوە واچووبوە مێشکیانەوە کە نوئێل بیو بەهۆی ئەوەی شێخ مەحمود زێدەڕۆیی بکات بەرامبەر بە سیاسەتی بەریتانیا ... بۆ نموونە:

لە کاتی خۆ ئامەدەکردنی بەریتانیا بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەي ئاشتیدا وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ڕۆژی ١٤/٥/١٩٢٠ داوای لە ئیدارەی بەریتانیا کردبوو لە بەغدا (لاپەڕە ـ ٢٤٦ ـ دۆکیومێنتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ژمارە (C.O.371-5068) کە ئایا بەباش دەزانرێت (نوئێل) لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بەشداربێت بەپێی ئەوەی شارەزای کوردستان بووە، بەڵام حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا بە تەلگرافی ڕۆژی ١٩/٥/١٩٢٠ (لاپەڕە ـ ٢٤٧ ـ دۆکیومێنتی ژمارە (F.O.371-5068)وەرام ئەداتەوە کە وا باشە یەکێک لە

پلەیەکی بەرزتردا بەشداری بکاتو وەبۆ ئەوە لیفتنانت کۆلۆنێل (Cunliffe owen) بەشداربێت باشترە کە وەختی خۆی مولحەق بووە لە سەفارەتی بەریتانیا لە ئەستەمبول .

مێجر نۆیل

# دامەزراندنی یەکەم حوکومدایەتی شێخ مەحمود

لە باسەکانی پێشودا لەوە دواین کە چۆن ئینگلیزەکان بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ شێخ مەحمودا کردیان بەبێ گێچەڵ و بێ تەقاندنی تاقە فیشەکێک نوێنەری خۆیان مێجەر (نوئێل)یان نارده سلێمانی و لە سلێمانی بوو بە حاکمی سیاسی و ڕاوێژیاری شێخ مەحمودی حوکمدار و خانوی (مەکتەبی ئیعدادی)ی زەمانی تورک تەرخان کرا بۆ مێجەر نوئێل .

شێخ ڕەئووفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا دەربارەی ئەو ڕۆژانەی کە باوکی کرا بە حوکمدار ئەڵێ «٢١»

«کە باوکم کرا بە حوکمدار، حاجی سەید حەسەنی مامی باوکم کرا بە (قازی)، حاجی سەید عومەری مامیشم کرا بە موتەسەرفی سلێمانی و ئەحمەد بەگی صاحیبقرانی شاعیر کرا بە سەرۆکی شارەوانی و تاهیری حەمەی ئەمین ئەفەندی (کە لە خێڵی فەرخەبووە)کرا بە مودیری پۆلیس و بۆ قەزا و ناحیەکان قائمقام و مودیری ناحیە دانران و دائرەکانی ناوچەکە فەرمانبەریان بۆ دانرا و مانگی (١٥)هەزار ڕوپیە بۆ باوکم تەرخان کرا و مووچەش بۆ سەروک عەشیرەتەکان بڕایەوە و ئینگلیزەکان هێزێکی بچووکی (لیڤی)یان دروستکرد و شێخ قادری مامم (شێخ قادری حەفید)کرا بە سەرکردەي ئەو هێزە و خەڵک لای وابوو ئەوە بنکە و بناغەی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی ئەبێت ...

ئەوڕۆژانەی کە باوکم کرا بە حوکمدار، ووشەی حوکمدار لای ئێمە نەبیسترابوو، هەندێ جار ووشەی حوکمدار بەمانای (مەلیک) لێک ئەدرایەوە و خەڵک هەموو لایان وابوو ئەو دەزگایەی لە سلێمانیدا پێک هێنرابوو بریتیە لە وەزارەتێکی کورد لەناو دەوڵەتێکی کوردی گەورەدا کە لە دواییدا هەموو دەزگاکانی تری تەواو ئەکرێت».

شێخ ڕەئووف لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەڕواو ئەڵێ: سەید ئەحمەدی بەرزنجی زۆر جار باسی مێجەر نوئێلی بۆ ئەکردین و ئەی ووت لە سەرەتادا کە

حوکمداریتی شێخ مەحمود دامەزرا، لەکاتی گفت و گۆو ووت و وێژدا مێجەر نوئێل هەندێ شتی دەردەبڕی کە مانا و مەبەستەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرا نەبوو لامان، بەلاَم زۆر لەوە ئەترساین ئەگەر درێژە بدەین بە داواکردنی ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستانە دوورنەبوو ئەوە ببێتە هۆی تێکچون و ناڕێکیەک لە نێوانی هەندێ لەو سەروک عەشیرەتانەی کە لە کاتی ووت و وێژ و گفت و گۆدا ئامادە ئەبوون بۆیە ئەوسا نەمانویست زۆر لەسەری بڕۆین و زۆرتر بچینە پینج و بناوانی ئەو شتانەی کە مێجەر نوئێل بە تەواوی ڕوونی نەدەکردەوە کە لە ڕاستیدا ئەوە هەلَەیەکی ئێجگار گەورەبوو لە ئێمەوە و کەمتەرخەمیەکی زۆرمان کرد کە ئەبوایە ئەوسا و لە سەرەتاوە داوامان بکردایە و هەموو شتێکمان بۆ ڕوون بکرێتەوە»

شێخ ڕەئووفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا باسی ڕەخنەیەکی تر ئەکا لەو ڕووەوە ئەلَێ: «٢١»

«حاجی سەید حەسەنی مامی باوکم هەر لە سەرەتاوە ڕەخنەی لە باوکم گرتبوو وە پێی وتبوو وشەی حوکمدار ووشەیەکی ئالَۆزە و بە گەلێک جۆر لێک ئەدرێتەوە و شتێکی ڕوون نیە لەبەر ئەوە قبولَی مەکە و پێویستە هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێکت بۆ ڕوون بێتەوە ئەوسا قبولَی بکە».

مامۆستا ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەلَێ:

«نوئێل بەپێی ئەو ڕاسپاردەیەی کە لە (ویلسن)ەوە وەری گرتبوو لە ١٩١٨/١١/١ دا لەبەر دەرگای سەرا کۆبونەوەیەکی گەورەی ڕێکخست کە هەمو پیاوە ئاینی و ئەشراف و سادات و تاجر و سەرۆکی عەشیرەتەکان و لە هەموو دەستەکانی تری ئەهالی تیادابوو. نوئێل وەکو نوێنەری دەولَەتی بەریتانیا بە فارسی ووتارێکی دووروودرێژی خوێندەوە و لەو وتارەیەدا وتی شێخ مەحمود لە لایەن حاکمی گشتی بەریتانیاوە لە عیراق کرا بە حوکمداری کوردستان و هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە مالَی شێخ مەحمود پیاوە ناودار و ناسراوەکان کۆکرانەوە و بەیعەت بە حوکمدار کرا ... لەو ڕۆژەدا من و ئەحمەد ئاغای کەرکوکلی زادە لەو بەیعەت کردنەدا بەشداریمان کرد و بڕیاردرا نوئێل لە شارەکانی تری خوارووی کوردستاندا دەست بکات بە تەشکیلات و بۆ ڕێکخستنی

ئەو شارانەی کە لەگەڵ کوردوستانی تازەدا ئەبێ.

مێجەر نوئێل بۆ رێکخستنی کاروباری شارەکانی تر و بڵاوکردنەوە دەسەڵاتی شێخ مەحمود لەو گەڕانەیەدا هەتا رەواندز چوو و بۆ رێکخستی کاروباري ئەو شارانە لەگەڵ سلێمانیدا تەقەلایەکی زۆریدا».

دەربارەي ئەوکۆبونەوە یە دوکتۆر جەمال نەبەز لە کتێبەکەیدا ئەڵێ «١٥»

«رۆژی ٢ی نۆڤەمبەری سالی ١٩١٨ لە هەڵبژاردنێکی ئازاد دا لەلایەن کوردەوە شێخ مەحمود بە مەلیکی کوردستان هەڵبژێررا وەلە ١/دیسەمبەري سالی ١٩١٨ دا کۆلۆنێل ویلسن بۆ پیرۆزبایی کردن لە شێخ مەحمود بە فرۆکە چوە سلێمانی »

رەفیق حلمی دەربارەي دامەزراندنی دەزگای حوکمداریەت ئەڵێ:

«مانگی (١٥) هەزار روپیە (مواجب) بۆ حوکمدار بڕرایەوە و بەپێی واتای هەندێ لە ئینگلیزەکان شێخ مەحمود کرابوو بە نوێنەری هێزەکانی بەریتانیا لە کوردستاندا و لە سلێمانیش تەشکیلاتێکی وەکو تەشکیلاتەکەی پێشووتر (مەبەستی زەمانی عوسمانلی بووە) دامەزرێنرا.

سەید عومەری مامي شێخ مەحمود کرا بە موتەسەرفي سلێمانی و حاجی سەید حەسەنی مامی کرا بە حاکم و یاخود(رەئیس شەرع) ـ بەلاٚم شێخ رەئووف ناوی قازی ئەبا لە جیاتی حاکمی شەرع ـ و شێخ قادری برای شێخ مەحمود بوو بە سەرداري لەشکر (سوپا سالار) و لە دامەزراندنا شێخ مەحمود (سەید بسم اللە)شی بێ بەش نەکرد و کرا بە قۆمیسەر.

بەو جۆرە زۆربەی خزم و کەس و کاری حوکمدار و دەستەودایەرەی شێخان هەریەکە بە پێی حاڵ، کارێک یا مواجێکیان (مەعاش) بۆ رێکخرا و دامەزرێنران»

مێجەر نوئێل ناوی (حاکمی سیاسی لێ نرا) کە لە بنای ئیعدادی زەمانی تورکدا دائەنیشێت (لە دواییدا بەو خانوە ئەوترا مەکتەبی سیاسی و لە زەمانی منداڵی ئێمەدا کرا بە قوتابخانەی فەیسەلیە و ئێستە ئەو بنایە نەماوە و لە شوێنەکەیا بازارێکی تازە دروست کراوە).

رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«ئەو ڕۆژانەی شێخ مەحمود کرا بە حوکمدار ناوشاری سلێمانی خرۆشابوو، سوارەیەکی زۆری عەشایەر، لادێی یەکی زۆر و خەڵکی دەورپشت، دێهاتەکانی شێخ مەحمود دوا بەدوا و لە هەموو لایەکەوە ڕوویان کردبوە ئەوشارە بچکۆلەیە.

کۆلانەکان، چایخانەکان و قەیسەری و بازار، ماڵە گەورەکانی سلێمانی و ماڵە دەوڵەمەندەکان جمەیان ئەهات ... برنج و گەنمی عەماری میری کە لە تورکەکان مابوەوە، هەر زەخیرەیەک کە لە دێهاتەکانی شێخ مەحمودا هەبوو هەموی کرا بە پلاو و چێشت و لە چێشتخانەی حوکمدارەوە ئەچوە ورگی ئەو عەشاماتە، لەولای تریشەوە میجەر نوئێل خەریکی چارە سەرکردنی گرانی و برسێتی بوو، پەیتا پەیتا لە عەمارەکانی کەرکوک و لە بەغداوە شەکر و چا و ئاردی سپی ئەگەیاندە سلێمانی و بە خۆڕایی بەسەر فەقیر و هەژار و مأمورەکانا بەشی ئەکرد، ئەوشتانە لەو ڕۆژانەدا لە سلێمانی قات بوو دەست نەدەکەوت، لەبەر ئەوە هەرچی لە فەقیر و هەژارەکان و مەئمورەکان ئەمایەوە بەهۆی رەئیسی شارەوە (نیازی لە سەرۆکی شارەوانی بوە کە حەمدی صاحیبقرانی شاعیر لەو ڕۆژانەدا کراوە بە سەرۆکی شارەوانی) ئەخرایە بازارەوە و بە نرخێکی کەم ئەفرۆشرا.

نوئێل هەر تەنها بەوەوە نەوەستا، بەڵکو ڕوپیەی بانکنوت و لیرەیەکی زۆری تورکی ڕژاندە ناو سلێمانی و بەبێ دەست و پێ لەرزین بە سەر عەشیرەتەکان و دەستەودایرەی حوکمدارا بلاوی ئەکردەوە».

رەفیق حلمی لە شوێنێکی تری یاداشتەکانیا باسی شێخانی دەور و بەری شێخ مەحمود ئەکا ئەڵێ:

« لەو ڕۆژانەدا نۆکەر و خزمەتکار و کارەکەر و دایەن و مامانی شێخان خۆیان گیف کردبوەوە و مواجبیان بۆ بڕایەوە ... چەفتە و مشکی و سورمە و ئاوریشمی دەستەی شێخان و دەس وپەیوەند دیمەنێکی تری دابوو بە سلێمانی کە لە دوای ڕووتوقووتی و برسیتیەکی کوشندە و بووژانەوەیەکی کوت و پڕی و دیمەنەکانی تێر و تەسەلی و جوانی و خۆش بەختی، هەر چەند ئەمانە بەخیلی پێ بردنیشی تیادا بوو، بەلام دیسان جێگەی سوپاس بوو چونکە هیچ نەبێ

یادی هەژارە ڕووت و قووتە ووشک هەلاتوەکان و تەرمە ئاوساو و شین هەلگەڕاوەکانی مردوی ناو مزگەوت و کەلاوە و کۆلانەکانی دوێنێ ی لە بیر ئەبردەوە و هیوای تازە ئەکردەوە ».

چ ڕەفیق حلمی و چ ئەحمەد تەقی هەردوکیان بە جووتە لە یاداشتەکانیاندا ڕەخنەیان لەوەدا لە شێخ مەحمود گرتوە کە ئەو ڕۆژانە شێخ لەگەلْ هەندێک دەستەودایرەیدا ئەچوە دەشتی کانێسکان و بەسەیر و گالْتە و گەپەوە ڕای ئەبوارد و لای وابوو دنیا هەر بەو جۆرە بۆی ئەمێنێتەوە.

بەلاّم شێخ ڕەئووفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا «٢١» وەرامی هەردووکیان ئەداتەوە لەو ڕەخنە گرتنەیاندا و ئەلْیْ:

« شتەکە بەو جۆرە نەبووە کە ئەوان باسیان کردوە، بەلْکو ئەو عەشایەر و میوانانەی کە لەو ڕۆژانەدا ئەهاتنە سلێمانی بۆ دەربڕینی پشتگیری کردن، باوکم ناچاربوو دەعوەتیان بکات کە ئەمانەی هەموی لە سەر حیسابی خۆی ئەکرد. »

ڕەفیق حلمی جگە لەو ڕەخنەیەی پێشووی ڕەخنەیەکی تری بەرامبەر بە شێخ مەحمود دەربڕیوە کە ئەلْیْ:

« دوای ئەوەی شێخ مەحمود بوو بە حوکمداری کوردستان، ئیتر کەوتە گێژاوێکی گرنگەوە و لە کاروباری حوکومەتێدا کەم تەجروبە و بووە لە مەیدانی سیاسەتدا بێکەس بوو (جەلال تالەبانیش لە کتێبەکەیدا «٢٥» هەر هەمان جۆرە ڕەخنەی لە شێخ مەحمود گرتوە کەلای وایە شێخ مەحمود موستەشاری لیْ هاتو و شارەزای نەبوە کە ڕاوێژیان پیْ بکات و لە هەندیْ هەلْوێستی گرنگدا پرسیان پیْ بکات کە ئەمە یەکێک بووە لەو هۆیانەی شێخ مەحمودی تووشی هەلْەکردوە ».

ڕەفیق حلمی دێتە سەر جۆرە ڕەخنەیەکی تر لە شێخ مەحمود و ئەلْیْ:

« شێخ مەحمود ئازایی و چاونەترسی و کەم تەرخەمی خۆشی هۆیەکی گرنگ بوو کە تووشی هەلْەی زۆری بکا، لەبەر ئەوە ئەستێرەی بەختی زوو ڕووی کردە کزی چونکە ڕیْ و شوێنێک کە لە هەلْسووڕاندنی کار و باری عەشایردا لەسەری ڕۆیشتبوو بو تەدبیری کاروباری حکومەت لەیەک نەدەهات، ئەوانەی دەیانتوانی لە حوکمدار نزیک ببنەوە لەو بابەتەبوون،دەست و پێوەندی نەفام و نەخوێندەوار،

دەوروپشتی چاوبرسی و دوای تالانی کەوتوو، نۆکەری خەنجەر لەپشت و عەشایری تفەنگ لەشان، هەرچەند لە بەغداوە هەتاکو تورکیا هەندی خوێندەواری باش و نیشتیمان پەروەربوون و دەیانویست تێ بکۆشن و یارمەتی حوکمدار بدەن، بەلاّم رێکەوتنی تاقمی دەوروپشتی حوکمدار و ئەوانەی تر نەدەگونجا و تاقمی یەکەم لە بەینی شێخ مەحمودی حکومدار و تاقمی دووهەمدا لە خەنجەرو دەمانچە دیوارێکی دروست کردبوو، ئەگەر حوکمدار خۆی بیویستایە ئەو دیوارەی دەرووخاند و لە زابتەکان و لە منەوەرەکان نزیک دەکەوتەوە. بەلاّم وەکو گوتمان، نەترسان لە دوارۆژو ئازایی خۆی لە لایەکەوە و گرێی‌یەکی نەفسی کە بەرامبەر بە زابت و رۆشنبیر پەیدای کردبوو لە لایەکی ترەوە بەرهەڵستی ئەوە بوو کە شەقێک لە دیواری خەنجەرو دەمانچەکە هەڵداو بیڕووخێنێت و خۆی بگەیێنێتە خوێندەوارە باشەکان.

لەناو مونەوەرو زابتە کوردەکاندا بەڕاستی هی باش هەبوو، نیشتیمان پەروەر هەبوو، هەموویان لەوانە نەبوون کە شێخ مەحمود لێیان بسڵەمێتەوە، بەلاّم وەکو گوتمان گرێیەکی نەفسی لەودیو دیواری خەنجەرو دەمانچەکەوە شێخ مەحمودی راگرتبوو، وەوەستاندبووی.

بەرهەلستیەکی هەرەگرنگی نزیک بوونەوەی لە زابتەکان گرێیەکی تازە نەبوو بەڵکو لەو رۆژەوە پەیدابوو کە لقی ئتحادو تەرەقی لە سلێمانیدا دامەزرابوو، ئەو کۆمەڵە بەشێکی زۆری لەو چەشنە زابتانەبوون کە وەختی خۆی ببون بەهۆی دەرپەڕاندنی نەوەی کاک ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی و ئەو دەرپەڕینەی کەبوو بەهۆی کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی برای شێخ مەحمود و ببو بەهۆی نوشوستی و دەربەدەری وکەساسی و ماڵ وێرانیان(رەفیق حیلمی لەوەدا نیازی لە کارەساتەکەی موسڵە).

دەست وپێوەندە نەفامەکان ئەم راستییەیان چاک دەزانی و بۆ مەرامی کارو قازانجی خۆیان باش کەڵکیان لێ وەرگرت و ساتێک لە هاندانی حوکمدار دوانەکەوتن و زۆر وەستایانە زابت و مونەوەرەکانیان لەبەر چاوی شێخ مەحمود ئەخست و سووکیان دەکردن.

عزەتی فاتە(عزەت مەدفەعی کە بە عزەتی فاتەی خولە درێژ ناسراوبووە)و

فایقی تاپۆ کە توانیبویان لە شێخ مەحمود نزیک ببنەوە، هەتا ماوەیەک کاتی ئەسراری بوون، زوو لێ ی جیابوونەوە و لە ئینگلیزەکان نزیک کەوتنەوە.

فایقی تاپۆ دەیویست خزمەتی کورد بکات، زۆر کەسی تریش بەتەمابوون کە تاسەر لەگەڵ شێخ مەحموددا بمێننەوە و بەبێ درۆ یارمەتی بدەن، بەڵام داخەکەم ئاواتەکە نەچوەسەر!»(فایقی تاپۆ خوشکەزای حاجی رەشیدی رێوی بووە). بێ گومان ئەوەی رەفیق حلمی وا لێ کردبوو لە یادداشتەکانیدا بەو جۆرە رخنە لە شێخ مەحمود و دەورو پشتەکەی بگرێت تەنها بۆ دەرپڕینی داخی دڵی خۆی بووە و بۆ روونکردنەوەی راستییەک بووە کەبووە بەژان لە دڵیدا و دەسەڵاتیشی نەبووە لە تۆمارکردنی ئەو رخنانە بەولاوە هیچی تر بکات...

رەفیق حلمی وەنەبێ رقی لە شێخ مەحمود بوویێت یا کۆنە قینێکی لە دڵدا بوویێت بەرامبەری کە ویستبێتی لە یاداشتەکانیا ئەوە بە هەڵ بزانێ و هەمووی هەڵرێژێتە خوارێ، بەڵکو رەفیق حلمی دڵسۆزی شێخ مەحمود بووە و خۆشەویستی بووە و جێی متمانەی بووە و هەتا لە ژیانیشدا مابوو من وەکو قوتابییەک و ئەو وەکو مامۆستایەک بارەها لە دەمی رەفیق حلمیم بیستوە کە زۆرستایشی ئازایەتی و کۆڵنەدان و خەباتی کردوە و هەمیشە وەکو سەرکردەیەکی پاک و دڵسۆزی کورد ناوی هێناوە بەڵام زەمانە و ڕۆژگار لەگەڵ ئەو و لەگەڵ کوردا نەبوە و یاساو رەوشتی عەشایەری و تەسک بینی و بیروشکی شێخەرووتەڵ ومەلاکان کە لەو ڕۆژانەدا هێزێکی گەورەیان پێک هێنابوو گاڵتەی لەگەڵدا نەدەکرا، ئەمانە هەمووی ئەوەندەی تر باری سەرشانی شێخ مەحمود و دەزگای کاروبارەکەی قورستر و ئاڵۆزتر کردبوو.

رەفیق حلمی وەنەبێ ڕووی دەمی ڕەخنەکانی هەمووی هەر کردبێتە شێخ مەحمود بەڵکو دانیشی بەوەداناوە کە هۆی ئەو هەڵانەی شێخ مەحمود کردبووی بە هۆی نەبوونی شارەزاییەکی سیاسی و نەبوونی تاقی کردنەوەیەکی ڕابوردوو لەگەڵ نەبوونی زەمینەیەکی پتەوی پڕ لە دارایی و دەرامەد و گەشەنەکردنی بیری نەتەوایەتی و سەر هەڵنەدانی پێک هاتنی چینی بۆرجوای پێشکەوتوتر لە چینی کۆچەرایەتی و فیوداڵ و نەبوونی پرۆگرامیکی پوخت کراو ونەبوونی ڕێکخراوێکی سیاسی کە بتوانێت بیروباوەڕی جەماوەر وەربگرێ و بەشداریان

بکات لە مەسئولیەتی سیاسی و رووداوەکانی ئەو رۆژانەدا، کە ئەمانە هەمویان بە کۆمەڵ بوون بە هۆی بەرگە نەگرتنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود رووبەرووی هێزی داگیزکەرێکی دەوڵەمەندی پرچەکی سیاسەت زان و تەجروبەدیدە لە ژیاندا.
بەڵام رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا رووی دەمی کردۆتە ئەو خەنجەر و تفەنگ بەدەستانەی کە بوبون بە هۆی دروست بونی ئەو دیوارەی کە شێخ مەحمودی لە خوێندەواران و ئەفسەران و رۆشنبیران جیا ئەکردەوە بەبێ ئەوەی نەختێکیش رەخنە لە هەڵە و بۆچوونی ئەو خوێندەوار و رۆشنبیرانەی ئەو رۆژەش بگرێت کە لام وایە هەڵەی هەندێ لەوانەش گەلێک کێشەی بۆ شێخ مەحمود نابوەوە و بوبون بە هۆی پتەوکردنی ئەو دیوارەی نێوان ئەوان و ئەوانەی تر کە رەفیق حلمی بێزاری خۆی دەربڕیبو بەرامبەریان.
وەکو لە هەندێ شوێنی تریشدا باسمانکردوە و گەلێک جار یەکێکی وەکو تەوفیق وەهبی خۆی لەورۆژانەدا لە کۆری کارەکەدا بووە دانی بەوە دانا کە هەندێک لەو رۆشەنبیر و خوێندەوارانە لە چاو هەڵوێستی ئەو رۆژانەدا زیادە روویان کردوە و وایان لە خۆیان کردبوو لە ناو خەڵکدا خۆشەویست نەبن و هەندێکیان لەو رۆژانەدا کفر و بەئاشکرا خوا نەناسین و دژی ئاین و هەندێ یاسای تر کە ئەوسا باسکردنیان وەکو کفر وابوە ئەوەش گاڵتەی لەگەڵدا نەدەکرا و لە توانای شێخ مەحمودا نەبوە کە خەڵکی ساویلکەی ئەوسا بە ئاسانی وا لێ بکا کە چاو لە رەوشت و هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانە بپۆشن و لێیان خۆش بن.
رەفیق حلمی وەکو وتمان دڵسۆزی شێخ بووە و حەزی بە سەرکەوتنی شێخ کردوە و لە شوێنی خۆیدا کە هەڵی گرتبێت دەربارەی ستایشی شێخ مەحمود درێغی نەکردوە .
بۆ نمونە لە بەرگی یەکەمی یاداشتەکانیا باسی تەقەلای شێخ مەحمود ئەکا بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی ئاشتیدا بەوەی کە مەزبەتەیەکی زۆری بە ئەهالی و عەشایەری کوردەکان کۆ کردەوە و ناردی بۆ شەریف پاشای نوێنەری کورد لە کۆنفرانسی ئاشتیدا کە بەداخەوە ئینگلیز و فەرەنسیەکان نەیان هێشت ئەو

مەزبەتانە بگاتە دەست شەریف پاشا وەکو لەباسی شەریف پاشا و لە باسی کۆنگرەی ئاشتیدا ڕوونی ئەکەینەوە لە بەرگی دووهەمدا.

هەروەها لە بەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا هەوڵ ئەدەم بەراوردێکی حوکمدارێتی یەکەمی شێخ مەحمود ١٩١٨ـ١٩١٩ بکەم لەگەڵ حوکمدارێتی دوهەمیدا کە لە ساڵی ١٩٢٢ دا دەستی پێ کرد، بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەک هەڵەکۆنەکان دووبارە بوونەتەوە.

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیدا دەربارەی ئەو ڕۆژانەی حوکمدارێتی یەکەمی شێخ مەحمود ئەڵێ «٢»

« میجەر نوئێل لە ١٩١٨/١١/١٨ دا گەیشتە شاری سلێمانی، ڕۆژی دوهەم لەبەر چاوی هەموو دانیشتوانی سلێمانی و عەشایەری جاف و هەماوەند و پژدەر و ئاکۆ و بڵباس و جەباری و زەنگەنە و داوودە و تاڵەبانی و عەشایەرەکانی تر، مێجەر نوئێل چوە سەر سەکۆیەک و بە فارسی وتارێکی بۆ خەڵک خوێندەوە کە ئەمە کوردیەکەیەتی:

بەناوی حوکومەتی بەریتانیا و حاکمی گشتی بەریتانیا لە عیراقدا قسەتان لەگەڵ ئەکەم ئەوا لە یەخسیری ڕزگارتان بوو، ئیتر سەربەست و ئازادن، شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە، لەسەر فەرمایشتی حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا ئەو مژدەیەتان ئەدەمێ ...

لە دوای تەواو بوونی ئەو قسانەی نوئێل، مەلا محەمەدی دەنگ گەورە (دیارە مایکرۆفۆنی ئەوڕۆژانەبوە) بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد:

ڕۆژە ڕەشەکانتان فەرامۆش نەکەن، کەستان نازانن باوک و برا و کورتان لە چ کوێرە شیوو بوودرپکدا کوژراون و بوون بە خۆراکی جانەوەر وکێوێ، ئیمڕۆ پیرۆزبایی ئازادیتان لێ ئەکەم، ئەگەر ئەمانەش (نیازی لە ئینگلیزبوە) خراپ بوون لەگەڵمان خۆتان ئەزانن چییان لەگەڵدا ئەکەین؟

شێخ مەحمودیش بەدوای ئەودا فەرمووی:

« براینە، لەو هەورازە کوورەی لە پێشمانەوە بو سەرکەوتین، لە ئێوە یەکێتی و لە منیش گیان بەخت کردن. »

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەڕواو ئەڵێ:

«بەو مژدەیەی مێجەر نوئێل بانگی ئازادی و حوکمدارێتی کوردستان بۆ هەڵکردنی ئالأی کورد بڕیاردرا ویڵسنی حاکمی گشتیش لە بەغدا نامەیەکی بە فارسی ناردبو بۆ شێخ مەحمود کە ئەمە تەرجومەی کوردیەکەیەتی:
لە حوکومەتی ساحیب الجەلالەوە فەرمانم پیٚ دراوە کە پیٚتان بگەیەنم کە وا لەم ڕۆژانەدا لیٚدوانی سەربەستی ـ أستقلال ـ ی کوردستان تەواو ئەبیٚت ... کورد سەربەخۆ و ئیٚوەش بە حوکمدار ناسراون» ئەوەی کە ئەحمەد خواجا باسی کردوە هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی ئەو نامەیەی ویڵسنی بەو جۆرە نەکروە و دەقی نامە فارسیەکەیش لە هیچ سەرچاوەیەکدا بلأو نەکراوەتەوە و چ ویڵسن و چ مس بیڵ و چ ئەفسەرە سیاسیەکانی تری ئەو سەردەمە بەوجۆرە ناویان نەهیٚناوە... دوورنیە ئەوە ئەگەر ڕاست بووبیٚت تەنها بریتی بووە لە ووتەیەک کە نوئیٚل ویستویەتی لە دەمی ویڵسنەوە بلأوی بکاتەوە بۆ دڵنیا کردنی خەڵک لە مەبەستی چوونی ئینگلیز بۆ کوردستان.
ویڵسنی حاکمی گشتی بەریتانیا دەربارەی پیٚک هیٚنانی حوکمدارێتی شیٚخ مەحمود لە کوردستاندا ئەڵیٚ: «٣٧»
« کە نوئیٚل چوە سلیٚمانی، یەکسەر دەستی کرد بە بەڕیٚوەبردنی کاروبار و سیستەمیٚکی پیٚکهیٚنا (دەزگا) کە هیوای ئەوەی لیٚ ئەکرا خەڵکی ئەو ناوچەیە بەدڵیان بیٚت و بڕوایان بەوە هەبیٚت کە لەو ناوچەیەدا ئیدارەیەکی کوردی ساز ئەکریٚت و ئاواتەکانی کورد ناخریٚنە پشت گویٚ».
بەو جۆرە شیٚخ مەحمود کرا بە حوکمدار و بۆ هەر بەشیٚک لە ناوچە ئیداریەکان کە لە لایان فرمانبەرە کوردەکانەوە ئەبرا بەڕیٚوە ئەفسەریٚکی سیاسی بریتانی بۆ چاودیٚری و ڕاوێژکردن دانرا (سەیر ئەوەیە لەو حوکمە زاتیە داتاشراوە کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە خواروی کوردستاندا دانرا، میری هەرهەمان سیاسەتی ئەو ڕۆژانەی ئینگلیزی بەکارهیٚناوە و بەکاری ئەهیٚنیٚت و لە هەموو دەزگاکانی حوکمی زاتیدا کاربەدەستیکی خۆیان داناوە کە کاروباری ڕاستی لەلایەن ئەوانەوە ئەبریٚت بەڕیٚوە و زۆر جار کاربەدەستیٚکی کورد بەبیٚ ڕای نوێنەری میری ناتوانیٚت فەڕاشیٚک دامەزرێنیٚت).
ویڵسن لە کتیٚبەکەیدا ئەڵیٚ: ئەو کاربەدەستە تورک و عەرەبانەی کە لەو

ناوچەیەدا هەبوون لابران و لە جیاتی ئەوان کورد دانرا و لە هەمان کاتدا ئەو ئەفسەر و سەربازە تورکانەی کە لەوێ بوون لە ژێر حیراسەتدا نێرران بۆ بەغدا.
هەموو سەرکردەی کوردەکان لە ڕێگەی شێخ مەحمودەوە هەر یەکەیان کرا بە لێپرسراوی عەشیرەتەکەی خۆی و دانی پیانرا وەکو کاربەدەستێکی رەسمی. یەکەم شتێک کە ئەبوایە دەستی پێ بکرێت بریتی بوو لە بووژاندنەوەی خەلک و ئاوەدان کردنەوەی ئەو شوێنانەی کە لە ژێر ئیدارەی تورکەکاندا لە ناو شاردا وێران بوبو، دەور و بەری شار هێشتا هەر بەبرسێتی و گرانی مابوەوە، بۆ ئەوە تۆوی کشت و کاڵ لە دەرەوە بەکێش کرا و دەستکرا بە بووژاندنەوەی بازرگانێتی ناوخۆ، شوێنە گشتیەکان و مزگەوتەکان ئاوەدان کرانەوە. دوای ئەوە وردە وردە دروشمی (کوردستان بۆ کورد لە ژێر چاودێری (ئینگلیزدا)بوو بەدروشمێکی ڕۆژانە و سەری بەرزکردەوە».
ویلسن لەکتێبەکەیدا ئەلێ:
«بەلاَم ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو کە یەک بوون لە بیروباوەڕی سەرۆکی کوردەکاندا نەبوو، هەندێکیان لە ناوخۆیانا ناڕێک بوون لەسەر شێوە و چۆنیەتی بەڕێوە بردنی کاروبار لە کوردستاندا، هی وایان هەبوو ئەیویست کوردستان لە ژێر ئیدارەی لەندەن دابێ نەک لەگەڵ ئیدارەی بەغدا، هەندێک لەوەدابون کە کوردستان لە ژێر ئیدارەی ئینگلیزدا نەبێت، هی واشیان هەبوو بەدزیەوە پێیان وتم کە بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود رازی نین بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا کە داوام لێ کردن کە کێ لەو باشترە و بەدڵیانە ناوی یەکێکی تریان نەهێنا کە بتوانێت جێی شێخ مەحمود بگرێتەوە و بکرێت بە سەرۆک...
لەکاتی گفتوگۆ کردنما لەگەڵ شێخ مەحمود، مەزبەتەیەکی دامێ کە لەلایەن( ٤٠ )سەرکردەی کوردەوە مۆرکرابوو.
ویلسن لەلاپەڕە(١٢٩)ی کتێبەکەیدا تەرجومەی ئەو مەزبەتانەی بلاَو کردۆتەوە کە ئەمە تەرجومەکەیەتی لە ئینگلیزییەوە، (بەداخەوە نەزانرا ئەو مەزبەتانەی کە ویلسن باسی کردووە بە چ زمانێک نووسرابوو مۆرکرابوو لەلایەن ئەو ( ٤٠ ) سەرکردەوە ):
(کە ساتی خۆی حوکومەتی ساحیب الجلالە بلاَوی کردەوە کەوا کێشەی

دانیشتوانی ڕۆژهەلاّت چارەسەر دەکات و دانیشتوانی ئازاد دەکات لە چەوساندنەوەی تورکەکان و بەلّێنی دا کە یارمەتیان بدات بۆ گەیشتن بە ئاواتی سەربەخۆییان، سەرکردە و نوێنەرانی کوردستان تکایان لە حکومەتی بەریتانیا کرد کە ئەوانیش (کوردەکان) قبولّ بکات لە ژێر سایەی بەریتانیادا وەکو چۆن پارێزگاری عیراق دەکا و سوود لەو کەلّکانەی کە بە عیراقی دەگەیێنێت بەو جۆرە بە کوردیش بگەیێنرێت.

بۆیە داوایان لە حاکمی گشتی مەدەنی میسۆپۆتامیا کرد کە نوێنەرانی خۆیان بنێرن لەگەلّ یارمەتیدا بۆ ئەوەی کوردەکان لەژێر چاودێری ئینگلیزدا بەرەو ئاسایشی و شارستانیەتی بڕۆن و ئەگەر حوکومەت ئەو یارمەتی و پارێزگاریەیان بۆ بڕەخسێنێت ئەوا ئامادەن هەموو ڕاوێژ و ڕاسپاردەکانی بەجێ بهێنن)).

ویلّسن ئەلێ: شێخ مەحمود جگە لەو داخوازییەی ناو مەزبەتەکە داوای کرد چەند ئەفسەرێکی بریتانی بەشداری بکەن وەکو وەکو ئەفسەر لەناو هێزی لیڤی کورددا بەمەرجێک ئەو هێزە لەژێر دەسەلاّتی کورددابێت نەک هی عەرەب. بەرامبەر بەوە نامەیەک(راپۆرت)درا بە شێخ مەحمود کە هەر عەشیرەتێکی کورد لە نێوانی زابی گەورە و دیالەدا(جگە لەو عەشیرەتانەی سەر بە ئێرانن) لەوانە هەرکەس کە بەئارەزوی خۆی ئەیەوێ بەرەهبەرایەتی شێخ مەحمود رازی بێ ئەوە ڕێگەی ئەوەی لێ ناگیرێ و ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە پالّ پشتی لەوە ئەکەین و شوێنەکانیان بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە ئەپارێزین کە لەو حالّەتەدا پێویستە ئەوامرەکانی بەریتانیاش بەجێ بهێنرێت.

عەشیرەتەکان ودانیشتوانی کەرکوک و کفری نەیان دەویست لەژێر رەهبەرایەتی شێخ مەحموددا بن بۆیە ئەو نامەیە کە درا بە شێخ مەحمود باسی ئەو ناوچانەی تێدا نەبوو و کوردەکانی ئێرانیش ئاگادارکران کە حکومەتی بەریتانیا تەنها کوردەکانی خواروی کوردستان ئەگرێتە خۆی، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەریان لەژێر دەسەلاّتی حکومەتی ئێراندا بمێننەوە.

لەگەلّ ئەوەشدا شێخ مەحمود بەوە رازی نەبوو و وای ئەگەیاند کە هەموو کوردەکانی ویلایەتی موسلّ و زۆربەی عەشیرەتەکانی کوردستانی ئێران بەرەهبەرایەتی ئەو قایلن، لەبەر ئەوە داوائەکەن ئۆتۆنۆمییەکی یەک گرتوو

هەبێت کە خۆی (شێخ مەحمود) ڕەهبەرایەتی بکات و لەژێر چاودێری و پارێزگاری بەریتانیادا بێت».

ویڵسن لە کتێبەکەیدا ئەڵێ:

«واهاتە بەرچاو کە جارێ تەنها لە توانادایە حکومەتێک لە سێ ویلایەتەکەی تر دروست بکرێت (نیازی لە بەسرە و بەغدا و موسڵ بووە) بیر کردنەوە لە کوردستانێکی سەربەخۆ لەژێر حیمایەی بەریتانیا لەوەوە دەستی پێ کرد کە ساتێک سەرۆکی عەشایری موکری لە سابلاغ لەگەڵ لیفتنانت کۆلۆنێل(Kennion)دا لەشاری (سەقز) لەمانگی تەموزی١٩١٨دا باسی کوردستان کرا و گوترا کە حکومەتێکی ئەرمەنیایی سەربەخۆ لە ناوچەکانی ژووری تورکیادا لە لایەن کوردەکانەوە وەختێک قەبوڵ دەکرێت کە کوردستانیش لە نێوان تورکیا و دەوڵەتی عەرەبیدا (عیراق) دروست بکرێت»

ویڵسن لە کتێبەکەیدا جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر باسی کاپتن نوئێل(کە لەدواییدا لە مێجەرەوە بووە بە کاپتن) و ئەڵێ:

«لە کۆتایی مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩١٨دا نوئێل سلێمانی بەجێ هێشت و چوو بۆ ئەو گەشتەی کە بڕیار درابوو لە ناوچەکانی خوارووی کوردستاندا بیکات، بەڵام دوای چەند هەفتەیەک گەڕایەوە بۆ سلێمانی. کە هاتەوە تەماشای کرد شێخ مەحمود لەو ماوەیەدا بەئارەزوی خۆی کاروباری بردووە بەڕێوە»

ویڵسن دوای گەڕانەوەی نوئێل بۆ سلێمانی بە ئاشکرا خواست و مەبەستی ڕاستەقینەی حکومەتەکەی بەرامبەر دواڕۆژی خوارووی کوردستان دەرئەبڕێت (کە جارێکی تریش ئەمە دەری دەخات کە ئەو گەشتەی نوئێل بە ناوچەکەدا بۆئەوە نەبوە کە پاڵ پشتی بۆ شێخ مەحمود پەیدا بکات)وە ئەڵێ:

«لە بارەی جیۆپۆلیتیکی و بازرگانی یەوە ئەوەمان خستە بەرچاو کە پێویستە کوردستانی خوارو بەشێک بێت لە میسۆپۆتامیا، چونکە تاقە بازاڕێکی سەرەکی بۆ خوارووی کوردستان بریتی بووە لە بازاڕی موسڵ و بەغدا و تاقە ڕێگەیەکی هاتوچۆ لە کوردستانەوە ئەبوایە بەخاکی میسۆپۆتامیادا بڕۆیشتایە».

وردە وردە ئەم ڕاستییانە بۆ زۆر کەس روون بوەوە و ژمارەیەکی کەم لە

وێنەی هەندێ لە عەشایری کورد لە ناوچەی رانیە لە ساڵی ١٩١٩دا
کە ئەو وێنەیە لەلایەن مێجر نوئێلەوە گیراوە.

کوردەکانیش لەو راستییە گەیشتن کە پێویستە تەنها ئۆتۆنۆمییەک لەو ناوچەیەدا لەناو چوارچێوەی حکومەتێکی عیراقیدا پێک بێت هەتا ئەوکاتەی ئەو حکومەتە لەژێر چاودێری بەریتانیادا دەبێت، زۆربەی سەرۆک عەشیرەتەکان لەلایان روون بوو کە چونەژێر دەسەلاتێکی هەمیشەیی حکومەتێکی عەرەبییەوە شتێکی ناڕەوا و نابەجێ بوو بەلاّم ئەوەشیان ئەزانی کە سەربەخۆیی تەواو بۆ کورد هەمیشە ئەیانخاتە ژێرباری هێرش و رەحمەتی دەوڵەتە دراوسێکانەوە.

کێش و پێوانەی قەوارەی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد شتێکی ئاسان نەبوو. لەشوێنێکی وەکو سلێمانیدا ئەو هەستە زۆر بەهێزو توندو تیژ بوو و لایان وابوو و وای بۆ چووبون کە حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا مەسئولییەتی ئەوەی گرتوەتە ئەستۆی خۆی کە حسابێک بۆ کوردستان بکا و سەرۆکەکانیان بەو پێیە راوێژو سەرنجەکانی ئێمەیان لێک دابووەوە و ئەوەیان کردبوو بەبناغەی بۆچوونەکانیان لەوڕووەوە.

ئەوەی کە بەتەواوی ئەوشتەی خستبوە مێشکیانەوە ئەوە بوو کە رێکخراوەکانی هێزی لیڤی لەژێر ئیدارەی ئەفسەرە کوردەکاندا بوو، زمانی کوردیش کرابوو بە زمانی حکومەتەکەیان، یاساو فەرمان بەجۆرێک دەستکاری کرا کە لەگەڵ خوو و رەوشتی خەڵکدا رێک بکەون و باج کۆکردنەوە وای لێ کرابوو لەگەڵ تواناو و دەرامەدی خەڵکدا بگونجێت، هەروەها یاسای عەشایری ناوچەیی لە سنوورێکی موناسیبدا رێزی لێ گیرا و دان بەسەرۆکی عەشیرەتەکاندا نرا کە هەر یەکەیان دەسەلاتی خۆی لەناو عەشیرەتەکەیدا بەکار بهێنێت».

لەڕاستیدا دان نانی ئینگلیز بە یاسای عەشایری و بایەخدان بە سەرۆکی عەشیرەتەکان ، چ کورد و چ عەرەب پرۆگرامێکی تایبەتی ئینگلیزەکان بووە و دەمێک بوو باسێکی تەواویان لەوڕووەوە ئامادە کردبوو، کە باسەکەی مس بێڵ (عەشایرەکانی عیراق) یەکێک بووە لەوانە.

جگە لەو هۆیانەی ئارنۆڵد وڵسنی حاکمی گشتی بەریتانیا بۆی چووبوو و یەکە یەکە لە کتێبەکەیدا دەستنیشانی کردبوون کە ئەوانە ببونە هۆی ئەوەش کە کوردەکان حساب بۆ دواڕۆژی کورد و کوردستان لەسەر بناغەی حکومەتێکی

کوردی سەربەخۆ بکەن، کەلێ هۆی تریش هەبووە کە کورد لەو ڕۆژانەدا ئاگاداری بووە و دەوڵەتە گەورەکان بە درۆ و بە ڕاست دانیان پیادا نابوو و بلاویان کردبوەوە وەکو مادە(١٢)ی چواردە مادەکەی ویلسنی سەرەک کۆماری ئەمریکا و ئەو بەیانەی کە لە نێوانی بەریتانیا و فەرەنسەدا لە ١٩١٨/١١/٧دا دەریان کردبوو لە لەندەن و پاریس و قاهیرە و نیۆیۆرک بلاوکرابووەوە و لۆنگریک لە کتێبەکەیدا ئەو بەیانەی وەکو خوارەوە باسکردووە کە بریتی بووە لە: «٤٣»

«مەبەستی بەریتانیا و فەرەنسە لەو شەڕی جیهانیەی کە سوێندخۆران تیایادا ڕووبەڕووی ئەڵمانەکان بوونەوە و عوسمانلیش تیایدا بەشداری کرد ئەوەبوو کە ئەو میللەتانەی مافیان خورابوو مافی خۆیان بدرێتێ و ببن بە خاوەن دەسەلاتی خۆیان».

ویلسن لە دەربڕینی ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بە شێخ مەحمود ئەڵێ:

«گەورەترین کێشەی شێخ مەحمود بریتی بوو لە خۆی، هەندێ کردەوەی هەر وەکو منداڵ وابوو، لەگەڵ ئەوەشدا خولیای ئارەزوویەکی زۆری هەبوو لەگەڵ زیرەکییەکی فتری و زۆرجار دوای عاتیفەو سەرچڵی دەکەوت، لەبەر ئەوە پێویستی بەیەکێکی وەکو (مێجەرسۆن) هەبوو کە ئەویش زۆرجار بەرەلابوو بەرامبەر بەو کارو رەفتارانەی کە ئەیکرد.

ئێمە نەمان ئەویست لایەنگری شێخ مەحمود بین لەوەدا کە دەسەلاتی بەسەر هەموو سەرۆک عەشیرەتەکاندا هەبێت، ئەبوایە سیاسەتمان بەجۆرێک ڕێکخستایە لە کوردستانی خواروودا کە نەختێک لەو جۆرە ئیدارەیە بچوایە کە لە شوێنەکانی تری عیراقدا پێکمان هێنابوو.

لەدوای گفتوگۆ و ووتو وێژێکی دوورو درێژ، بە ئامادەبوونی نوئێل و لیچمەن و سۆن و گۆردن و وۆکەر و چەند کەسێکی تر، نوئێل داوای کرد کە مێجەرسۆن لەجێی ئەو لە سلێمانی دابنرێت لەبەر هەندێ ئیعتیباراتی شەخسی خۆی کە لەگەڵ شێخ مەحموددا هەیبووە».

ئەم چەند دێڕەی دوایی ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا گەلێک شتی روون کردوەتەوە و لەگەڵ دان پیانان و بۆچوونەکانی تریدا کە باسمان کرد و لەبەر

ئەوەی ویلسن لە قۆناغێکی زۆرگرنگدا حاکمی گشتی بووە و کاروباری کوردستانی پێ سپێردرابوو رۆلێکی زۆرگرنگی بووە لە دارشتنی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بە کورد و شارەزاکردنی سیاسەتمەدارانی بەریتانیا لە وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیا و گەلێک کاربەدەستانی تر، بۆیە بەپێویستمان زانی ئەو بۆچوونانەی ویلسن هەلسەنگێنین و لە مەبەستەکان و لە ئەنجامەکانی بکۆلینەوەو شی بکەینەوە.

١ـ ویلسن لە کتێبەکەیدا ئەلێ: لەسەرەتادا داوا لە مێجەر نوئێل کرا وا لەخەلک بگەیێنێت کە حکومەتی بەریتانیا بیر لەوە ناکاتەوە و نایەوێ ئیدارەی بێگانە بەسەر کورددا بسەپێنێت جگە لەوە لەو نامەیەی کە ویلسن بە نوئێل دا ناردبووی بۆشێخ مەحمود بە فارسی کە نووسیبووی(لە حکومەتی ساحیب الجەلالەوە فەرمانم پێ دراوە کەپێتان راگەیێنم کە وا لەم رۆژانەدا لێ دوانی سەربەخۆیی کوردستان تەواو دەبێت)ئەمانە هەردووکیان روالەت بوون و لە سیاسەتی بەریتانیادا نەخشەی وا نەبووە کە ئەو بەلێنەی ویلسن باسی کردبوو ببێت بەبناغەیەک بۆ پەیوەندی نێوان کورد و بەریتانیا، چونکە ویلسن هەرخۆی لەدواییدا خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە کە ئەلێ کوردەکان هەندێ شت بەتەواوی تێ نەگیشتبوون و بەخۆرایی ئەوە چووبوە مێشکیانەوە کە بەریتانیا سەربەخۆیی کردنی کوردستانی خواروی گرتۆتەئەستۆ.

سیاسەتمەدارانی بەریتانیا لە بەغدا بەرودوا، ویلسن و سێر پێرسی کۆکس و لە کوردستانیشدا مێجەر سۆن و ئەدمۆنز هەرچێکیان کردوە و هەرچێکیان لە خەلک گەیاندوە دەربارەی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بە کورد بە پێچەوانەی ئەو بەلێنەی ویلسن بووە کە لەسەرەتادا مێجەر نوئێلی راسپاردبوو لە سلێمانیدا لە خەلکی بگەیێنێت.

٢ـ ویلسن ئەلێ: لەسەرەتادا هەولماندا خەلک بیوژێنینەوە و لەو گرانی و برسییەتیەی ئەورۆژانە رزگاریان بکەین...

بەلێ راستە ئینگلیز ئەو تەقەلایەی دا ئەنجامەکەشی ئەگەرچی خەلکی رەش و رووت سوودیان لێ وەرگرت، بەلام لەلام وایە ئەوەشی هەر لەبەر خاتری چاوی کالی کورد نەبوە بلکو حسابێکی دوورو درێژی تیادابوە، یەکەم بۆ ئەوەی خۆی

لەناو کوردا بچەسپێنێت و تیٚیان بگەیەنێت کە تاقە هێزێکە پاڵ پشتی ی کورد بکا و هەرکاتێک دەستی لیٚ کیٚشایەوە برسێتی و گرانی جارێکی تررووی تیٚ دەکاتەوە، دوهەم بە هۆی ئەو پارە ڕشتنەی کە بەپێی نەخشەیەک کیٚشابووی توانی دەس نیشانی ئەو سەرۆک عەشیرەتانە بکا کە ئەتوانریٚ هەمیشە بە خەڵات و بەرات بەلای خۆیا دایان شکیٚنیٚ و ئەگەر ویسترا بە ئاسانی و لە کاتی خۆیدا لە شێخ مەحمودیان بپچڕێنێت.

هەروەها ئەو پارە ڕشتنەی هەتا ڕادەیەک بوو بە هۆی جووڵە و بوژاندنەوەی بازاڕ و بازرگانی و تاقمی پارەداری کرد بەلایەنگری خۆی کە زۆرباش ئاگاداری ئەوە بوون کە شێخ مەحمود هەر لە کۆنەوە لەگەڵ ئەوانەدا ڕێک نەبوە و تیٚی گەیاندون کە سوود و کاسبی و بازارگانیەکان بەسراوە بە لایەنگری کردنی سیاسەتی بەریتانیالە کوردستاندا و توانی وەکو تاقمێکی (کۆمبرادور) بیان بەستێتەوە بە خۆیەوە (کە لە ڕاستیدا لەوماوەیەدا کە شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا تێکچوو، ئینگلیزەکان ئەوبازرگانانەیان هاندا کە سلیٚمانی چۆڵ بکەن بۆ ئەوەی شت لە بازاڕا نەمێنێت و هەندێکیان لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیزدا چوونە کەرکوک و بەغدا).

سەرەڕای ئەوانەی کە باسمان کرد، ئینگلیزەکان لەو ڕۆژانەدا کە هەموو ژمارەی بوونیان لە کوردستاندا لە ژمارەی پەنجەی دەست تێپەڕی نەکردبوو، لەو ڕۆژانەدا پێویستیان بەبوونی هێزێکی کوردی هەبوو (کە بەناوی هێزی لیڤی کوردی)یەوە مەشقیان پیٚ کردن، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو هێزەوە ڕێگە لە هاتنەوەی تورک بگیرێت بۆ ناوچەکە ...

بێگومان بوونی هێزێکی برسی و رووت و قووت چ دادیکیان ئەدا و چۆن بەرگەی هێزی تورکی ئەگرت بۆیە تێرکردنی ئەو هێزەش هەر بەشێک بوە لەو خواردن و پارە رشتنەی لەو ڕۆژانەدا خەریکی بوون.

٣ـ ویلسن ئەڵیٚ: لە دواییدا وورده وورده درۆشمی کوردستان بۆ کورد لە ژێر چاودێری بەریتانیادا بوو بە درۆشمێکی ئەو ڕۆژانە و سەری بەرزکردەوە. جاریٚ ئەگەر ویلسن لەوەدا مەبەستی ئەوە بووبێت کە (ئینگلیز بوە بە هۆی بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەو ڕۆژانەدا کە تازە پێیان نابوە ناو کوردستان وابزانم

ئەوەشی هەر بۆ ڕواڵەت وتوە و لەگانگای دڵیەوە نەبوە و ئەو دەربڕینانەی ئەو ڕۆژانەیان کە بەسەر زاری بۆ ڕزگارکردنی میللەتان چووبونە ناوچەکەوە تەنها بۆ ئەوەبوە کە لە تورکەکان بگەیەنن جارێکی تر بیر لەوەرگرتنەوەی ویلایەتی موسل نەکەنەوە و ئەوەشیان نەک هەر لە کوردستاندا نواندوە بەڵکو هەستی نەتەوایەتی عەرەبی عیراقیشی زۆرتر بزواندبوو دژی تورک و بۆ هەر لایە نەخشەیەکی جیاوازی دانابوو، کە بێگومان بۆ ئەوەی کوردستان، لە هیچ کاتێکدا بە مەبەستی پاک نەبوە.

٤ـ ویلسن ئەڵێ : کە چوومە سلێمانی و گوێم لە سەرکردەی عەشیرەتەکان گرت بۆم دەرکەوت هەمویان لەسەر یەک شت نەبوون، هەیان بوو بەدزیەوە ئەی ووت: بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود ڕازی نیە.

بەڵێ ڕاستە، یەکێک لە سروشتەکانی کۆچەرایەتی فیوداڵی (سەرەک خێڵایەتی) و فیوداڵی خاوەن زەوی و زار ئەوەیە کە هەمیشە لەگەڵ ئەو کەسەدان کە دەسەڵاتدارە و سوودی پێ ئەگەیەنێت و دەسەڵاتی بە هێز ئەکا لە ناو عەشیرەتەکەی خۆیدا و لە ناوچەکەی خۆیدا. بێگومان بوونی شێخ مەحمودی فیوداڵ کە دەمێک بوو بنە ماڵەکەیان لەگەڵ زۆر لادا لە کێشە و ناڕێکیدا بوون وەکو لە پەیوەندی بنە ماڵەی شێخان و عەشیرەتەکان و بنە ماڵەکانی سلێمانی دا بە دورو درێژی باسمان کرد،ئەو شێخ مەحمودی فیوداڵە کە بوو بە حوکمدار و لە لایەن بەریتانیای دەسەڵات داری ئەوڕۆژەوە دەسەڵاتێکی زۆرتری لەوانەی تر پەیداکرد، هەرچۆنێک بووبێ ئەوانە حیسابیان بۆ ئەوە کردوە کە بەوە دەسەڵاتی خۆیان کەم ئەبێتەوە و هەلپەرستی و بەدوای سوودی تایبەتی گەڕاندا سروشتێکی چینایەتی‌یە کە نەک هەر لە کوردستاندا بەڵکو لە هەموو شوێنێکی تردا وای لەوانە کردوە کە لە جاران زۆرتر لە شێخ مەحمود بسڵەمێنەوە و ئەگەر دەرفەتێکیان بۆ ڕێک بکەوێ لێی دوور ئەکەوتنەوە و بە سەرکردایەتی ڕازی نەدەبوون ...

بێگومان زیرەکی هەندێک لەو سەرۆکانە، دوورنیە وای لێ کردبن لە و گفت و گۆیانەیاندا کە لەگەڵ ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیزدا کردویانە ئەو سیاسەتەی بەریتانیایان بۆ ڕوون بوەتەوە کە ویلسن خۆی دانی پیا دناوە کە وتویەتی

ئەمان ئەویست وا لە هەموو سەرۆک عەشیرەتەکان بکەین کە بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود قایل بن ...

وەکو لە هەندێ شوێنی تریشدا لێی دواین، شێخ مەحمود ئەوەندە نەزان و گەمژە نەبوە کە ئاگاداری ئەو هەموو کەین و بەینە نەبوبێت، بەڵکو ئاگاداری زۆری بوە و هەمووشی لە ناوچەوان و هاندانی ئینگلیز زانیوە ...

بۆ نموونە وەکو لە شوێنێکی تریشدا باسی ئەکەین یەکێکی وەکو سەید ئەحمەدی خانەقا لە کەرکوک لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بە ساداتی بەرزنجە زانیوە و شێخ مەحمود هەوڵێکی زۆری دابوو لە حوکمداریەتەکەیدا دڵی ڕابگرێت و گەیشتبوە ڕادەیەک کە شێخ محەمەدی حاجی سەید حەسەنی مامی نارد بۆلای بۆ ئەوەی لایەنگریی حوکمداریەتەکەی بکا و ئەگەر بەوەش قایل نیە لەبەر خاتری ولاتەکەی و نیشتمانەکەی ئەوا ئامادەیە بە سەرکردایەتی سەید ئەحمەد رازیبێت و ببێت بە جێگری خۆی و کاروبار بگرێتە دەست، گومان لەوەدا نیە کە ئینگلیزەکان لەوەی سەید ئەحمەد و زۆری تریشدا دەستێکی بالایان بوە و بەئاشکرا ویلسن ئەڵێ کە ساتێک سنووری حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمودمان دەست نیشان کرد لە دیالەوە بۆ زابی گەورە باسی کەرکوک و کفری مان نەکرد چونکە خەڵکی ئەو ناوچانە بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود قایل نەبوون ... ئەوەبو ئینگلیز بەوەی کەرکوک و کفریشەوە نەوەستان بەڵکو زۆری پێ نەچوو لە بژدەرا بابەکر ئاغایان قوت کردەوە و کۆیە و هەڵەبجەشیان لە حوکومدایەتی شێخ مەحمود دوور خستەوە.

٥ـ ئەو مەزبەتانەی کە ویلسن باسی کردوە کە (٤٠) سەرکردەی کورد ئەو مەزبەتەیان مۆر کردبوو بۆ دروست کردنی حوکومەتێکی کوردی، درۆیەکی تری ویلسن ئاشکرا ئەکا کە لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: وەختی خۆی شەعبیەتی شێخ مەحمود موبالەغەی تیادا کرابوو.

جگە لەوە کاربەدەستانی ئینگلیز لەو رۆژەوە بە تەواوی لە مەبەستی شێخ مەحمود سڵەمی بوونەوە و بەدوای نۆکەرێکی بەکرێ گرتەدا ئەگەڕان نەک بەدوای سەرکردەیەک کە هەوڵی دروستکردنی کوردستانێکی یەک گرتوویدا.

ڕقی کاربەدەستانی ئینگلیز لەو تەقەلایەی شێخ مەحمود بۆ مۆرکردنی ئەو

مەزبەتانە ئەوەندە زۆربوە لە دواییدا کە شێخ مەحمود بە تەواوەتی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا تێکچو و مەندوبی سامی بریتانی لە بەغدا وێنەی ئەو مەزبەتانەی کە سەرکردە کوردەکانی ئێرانیش مۆریان کردبوو هەمووی ناردن بۆ حوکومەتی ئێران بۆ ئەوەی سزای هەمویان بدەن و هەڕەشە لە هەر عەشیرەتێکی تری کوردی ئێران بکرێت کە نەوێرێ دوای ئەوە توخنی شێخ مەحمود بکەوێ لە پاش ئەوەی کە ڕوو بەڕووی ئینگلیز بوەوە و ڕووی کردە شاخەکانی سەر سنوور. وەکو لە پێشتریشدا لە باسی پەیوەندی کورد و حوکومەتی ئێراندا لێی دواین.

٦ـ ویلسن دەمێک بوو بۆ بیانوویەک ئەگەڕا بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی روون بکاتەوە کە بەستنی کوردستان بە میسۆپۆتامیاوە شتێکی ناچاری یە و سوودی کوردی تیادایە و بەبێ ئەوە کورد لە کوردستاندا بە گۆشەگیری ئەمێنیتیەوە و ڕێی بازاڕی دەرەوەی لێ ئەگیرێت.

کەی سەر بە خۆیی میللەتێک بەسراوە بە هۆی بەستنی بازاڕی ـ وڵاتی ئەو میللەتەوە بە بازاڕی وڵاتێکی تر ...؟؟ ئەی ترانسیت بۆچی دانراوە؟

ئایا هەر وڵاتی کوردستان هەیە کە بێ دەریا بێ؟ ئەگەر سوودی ئینگلیز لە دروست کردنی کوردستاندا بوایە لەلای ئەسکەندرۆنەوە هیچ نەبێ کەلەبەرێکی ئەدۆزیەوە کە کورد لەویوە خۆی بگەیەنێتە دەریا بەر لەوەی کوردەکانی ئەوێ ئاوارە بکرێن .

٧ـ لە کۆتاییدا، ئەگەرچی ویلسن ڕقی لە شێخ مەحمود بوە و ناوی بە خراپ بردوە کە خراپیەکەشی هەر ئەوەبوە بە زوڕنای ئەوان هەڵنەپەریوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دانی پیاداناوە کە ئەبوایە شێخ مەحمود هەبوایە و ئەبوایە بۆ سوودي خۆیان لەو ڕۆژانەدا شتێکیان بەڵێن بدایە بە کورد و لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە سەرۆک عەشیرەتەکان بە نهێنی بە ویلسنیان وتبوو بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود قایل نین، بەڵام کەسێکی تری بە دەسەڵات تری نەبینیوە لەو ڕۆژانەدا کە زۆربەی کوردی ئەو سەردەمە پێی ڕازی بن ...

# پاشگەزبوونەوە و هۆی پاشگەزبوونەوە و چۆنیەتی پاشگەزبونەوەی ئینگلیز

گەلێک لە نووسەرانی کورد و بێگانە هەریەکەیان بە جۆرێک دەربارەی هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لەو بەلێنانەی بە کوردیان دابوو نوسیویانە و هەریەکە بەجۆرێک باسی چۆنیەتی ئەو پاشگەزبوونەوەیان کردوە.

مامۆستا رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا باسی ویلسنی حاکمی گشتی بریتانی ئەکا لە بەغدا و ئەلێ هەر لە سەرەتاوە به چاوێکی باش تەماشای شێخ مەحمودی نەدەکرد و هەولی داوە بە زووترین کات کۆتایی بە حوکمداریەتەکەی بهێنێت و بۆ ئەوە بڕیاری دا ڕاستەوخۆ دەست بخاتە کاروباری ناوچەی سلێمانیەوە و ناردی بە شوێن (نوئێل)دا و لە دوای گفت و گۆ و بەئامادەبوونی لیچمن و سۆن و گوردن‌ووکر بەرەزامەندی نوئێل خۆی میجەر نوئێل لە کاروباری ناوچەی سلێمانی لابرا و بڕیاردرا میجەرسۆن بکرێ بە موستەشار یا حاکمی سیاسی ... کە ئەمە نیشانەی گۆڕینی ئاشکرای سیاسەتی ئینگلیزەکان بوە بەرامبەر بە شێخ مەحمود و حوکمداریەتەکەی. (بەلام وابزانم رەفیق حلمی لەوەدا بە هەلەدا چووبوو چونکە نوئێل بەئارەزوی خۆی وازی لە کارەکەی نەهێنا بەلکو لابرا وەکو خۆی دانی پیاناوە لە دوکیومێنتی ژمارە (c.o.730-13) سالی ١٩٢١ دا ئەلێ لابرام نەک خۆم لاچوم) لەباسی میجەرسۆندا ئەوراپۆرتانە بلاو ئەکەینەوە.

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا دەربارەی پاشگەز بوونەوەی ئینگلیز نوسیویەتی:

«کە شەڕی جیهانی برایەوە هەموو شتێک لە ئەستەمبولدا بەدەست هاو پەیمانەکانەوە بوو. ئەو کوردانەی لە ئەستەمبول بوین، بۆ گەڕانەوەمان بۆ ولات ئەبوایە رەزامەندی ئینگلیزەکان وەربگرین (کە ئەو ڕۆژانە ئینگلیز لە هەموان دەسەلاتدارتربون).

ڕۆژێک بە پاپۆڕ ئەچوم بۆ ئەستەمبوڵ لە ناو پاپۆڕەکەدا لەگەڵ حاجی تەوفیق بەگی مەحمود ئاغادا (نیازی لە پیرەمێردی شاعیرە) یەکترمان ناسی و کە زانی ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی و چاوەڕوانی موافەقەتی ئینگلیز ئەکەم، پیرە مێرد لە کاتی گفت و گۆمانا باسی (کۆمەڵەی کورد)ی بۆ کردم کە لە ئەستەمبولدا بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدوالقادری نەهری( لە هەندێ سەرچاوەدا بە شەمزینی ناوی هاتووە) پێک هاتبوو، پیرەمێرد ووتی بۆ گەڕانەوەت ڕەنگە شێخ قادر بتوانێ چارە سەری گەڕانەوەت بکا. منیش خۆم چومە خزمەت شێخ قادر و بەناوی هەموو کوردە هاوڕێکانمەوە داوام لێ کرد کە ئیجازەی گەڕانەوەمان بۆ وەربگرێ. پاش چەند ڕۆژێک بڕیاری گەڕانەوەمان دەرچوو و بەرلەوەی بگەڕێمەوە چوومە خزمەت شێخ قادر و فەرمووی: لە سلێمانی ئینگلیزەکان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود ئیدارەیەکی کوردی یان پێک هێناوە و ئینگلیز بەڵێنی دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی بە ئێمەش داوە، بەڵام وادیارە هەموو نیشانەکان وا ئەگەیەنن کە ئینگلیزەکان لەگەڵ شێخ مەحمودا گزی و فرۆفێڵ ئەکەن و لەوە ناچێت لەگەڵ ئێمەشدا بەراستی بێنە پێشەوە. لەبەر ئەوە بە شێخ مەحمود بڵێ هەتا لە توانایدایە خۆی بگرێ و لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ئیدارە بکا هەتاکو بزانین ئەنجومەنی گەلان (عصبە الامم) دەربارەی کوردستان چ بڕیارێک دەرئەکا، هەروەها شێخ عەبدوالقادر نامەیەکی دامێ بۆ خزمەت شێخ مەحمود و عەرزی شێخ قادرم کرد کە نابێ بە هیچ جۆرێک دڵ بە ئەنجومەنی گەلان خۆش بکەین چونکە کەس دڵی بە ئێمە ناسووتێ و تەنها ئەبێ بە چالاکی خۆمان مافەکانمان دەستگیر ببێت.

لە وەرامدا شێخ قادر فەرموی: ئەمە ڕاستە، بەڵام بۆ میللەتێکی بێ کەسی وەکو گەلی ئێمە چارێ خۆمان هیچمان پێ ناکرێت ... ئایا باشترنیە کە داوا لەلایەک بکەین پێمان بکەیەنێت؟

کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی هەواڵی ناوشار لەو ڕۆژانەدا باش نەبوو، هەواڵی شێخ مەحمودم لە مەلاحەمەئەمین پرسی (مەلاحەمەئەمین ئیمامی مزگەوتی گەورەبوە) لە وەرامدا پێی ووتم شێخ مەحمود ئێستە لەگەڵ گرینهاوسدا پەیوەندی باش نیە (گرینهاوس یارمەتیدەر و وەکیلی مێجرسۆن بوە) و ئینگلیز

دەربارەی شێخ مەحمود بیر و باوەڕی زۆر خراپە.

ڕۆژی دوایی چوومە خزمەت شێخ مەحمود و نامەکەی شێخ قادرم دایە وراسپاردەکانیم عەرزی شێخ مەحمود کرد، ئەویش فەرمووی کەوا لەگەڵ ئەوبیرو رایەی شێخ قادرا یەکە کەواباشە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بگونجێت و بێ دڵییان نەکا، بەلاٚم ئینگلیزەکان هەمیشە بە هانەی پێ ئەگرن و هەوڵی دەست کورتکردنی حوکمداریەتەکەی ئەدەن ... وادیاربوو شێخ مەحمود دڵی لە ئینگلیزەکان کرمێ بوبو ... شێخ فەرموی : تێ ناگەم ئینگلیزەکان بۆچی کردەوەیان وایە لەگەڵمان؟»ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا دەربارەی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیزەکان ئەڵێ:

میجەرسۆن لە یەکەم ڕۆژەوە کە هاتە سلێمانی دەستی کرد بە کز کردنی دەسەلاٚتی شێخ مەحمود و ناوشاری پڕکرد لە مووچەخۆر و نۆکەری عەجەم و ئەفغانی و عەرەب و هندی و گەلێکی تر، لە هەموو دائیرەیەکدا بەناوی (موتەرجم)ەوە راوێژیارێکی ئینگلیزی دانا ... خۆ پیاو و نۆکەرەکانی ئینگلیزی خۆمانەش لەولاوە بوەستێت!! »

ئەحمەد تەقیش هەر وەکو رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا رەخنە لە دەوروبەری شێخ مەحمود ئەگرێ و هێرش ئەباتە سەر ئەوانەی کە بەناوی پیاوی شێخانەوە لەو مشکی لار وخەنجەر لە پشتێن و دەمانچە بەلاقەد و تفەنگ لە شانانەی کەهەر لایە پەلاماری تاقمێکی تری ئەدا و چاڵیان بۆ یەکتری هەڵدەکەند و ئەوانەی دەوروپشتی شێخیش بۆ پتەوکردنی شوێنی خۆیان کەوتنە فیتنە هەڵبەستن بۆ یەکتری و لەولاشەوە ئینگلیزەکان کەوتبونە هاندانی سەرۆک عەشیرەتەکان بۆ دوژمنایەتی شێخ کە ئەمە لەسەرەتادا لە رانیەوە دەستی پێ کرد ...

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ :

شێخ ئەمینی سندۆلاٚن (برای شێخ حسێن و شێخ محیەالدینی سندۆلاٚن) کە خزمی شێخ مەحمود بوو کرا بە قائمقامی رانیە، بەلاٚم ئینگلیزەکان پارەیەکی باشیان دا بەسەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکە کەبە شێخ ئەمین رازی نەبن و مەزبەتەیەکیان پێ کردنەوە دژی شێخ ئەمین، هەرچەند ئەوانەی ئەو مەزبەتەیان

پێ کرایەوە رازی نەبوون بەڵام میجەرسۆن لە ئەنجامی ئەو مەزبەتانەدا شێخ مەحمودی ناچارکرد کە بە تەلگرافێک داوای لە سەرۆک هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بکا کە لە قسەی (کاپتن بێل)ی حاکمی کۆیە دەرنەچن و بڕیاری لابردنی شێخ ئەمین مۆربکەن کە ئەمە وای لە زۆر کەس کرد بڕوا و متمانەی بە شێخ مەحمود نەمێنێت و لە پاشە رۆژی خۆیان بترسن»

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا لە سەری ئەڕوا و ئەڵێ:

« لە مزگەوتی گەورە جەنابی شێخ مەحمود رۆژێک کە لە نوێژەکەی بوەوە لەسەر بەردە نوێژەکانی مزگەوتی گەورە بانگی کردم و بە جووتە بەرەو مەرقەدی کاک ئەحمەدچوین و بە رێگاوە فەرمووی نیازی وایە نوێنەرێک بنێرێت بۆ تاران بۆ ئەوەی لای باڵیۆزخانەکانی وولاتان سکالا لە دەست ئینگلیزەکان بکات، منیش عەرزم کرد: چ تاران و چ تورکیا و زۆر شوێنی تر هەموو لە ژێر ڕکێفی ئینگلیزدان و هیچیان گوێ نادەنە دەسەڵاتی کورد، بەڵکو وا باشە خۆمان بە هێزی فیشەک و چەک و بە یەکبوون و یەک گرتنی هەموو هۆزەکانی کورد بەخەڵکیی بسەلمێنین کە دڕندەیەتی ئینگلیز کارمان تێ ناکات و کۆڵمان پێ نادا وەکو چۆن تورک نەیتوانیوە کۆڵمان پێ بدا.

لە پاش ماوەیەک بیستم شێخ و کۆمەڵەکەی بە نهێنی بڕیاریان داوە نوێنەر بنێرن بۆلای باڵوێزخانەکانی ولاتان بۆ ئەوەی پاشگەز بوونەوەی ئینگلیزەکانیان پێ بگەیەنێت بەرامبەر بە کورد و شکاندنی پەیمانەکانیان بۆ ئاشکرا بکا.

شێخ مەحمود بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو کەوتە هاندانی سەرەک هۆز و ناحەزانی ئینگلیز و خۆ ئامادەکردن بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی ئینگلیز بۆ ئەوەی لە سلێمانی دەریان بکا.

جگە لەوە شێخ گەلێک نوێنەری تری خۆی نارد بۆ شارەکانی کوردستان بۆ ئەوەی بیروبڕوایان وەربگرێ دربارەی ئینگلیز و لە زۆر لاوە هەواڵی بۆ هاتەوە کە خەڵکی شارەکان زۆریان دژی ئینگلیزن و خەڵک هەمووی وەکو مەنجەڵ ئەکولا و نارەزابوون لە کردەوەی ئینگلیز لە زۆربووندایە.

(کاک مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا «٢٣» باسی شێخ مەحمود و بارزانیەکانی کردوە لەو ڕوەوە و لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین.

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«میجەرسۆنی شارەزا و پلانگیر ئەوەندەی تر ئاگری نارەزابوونی خەڵکی خۆشکرد و دوورنیە ئەمەشی هەر دەس هەڵبەست بووبێت بۆ ئەوەی دەست پێشکەری شێخ بکات بە بیانوو وەوای لێ بکات سەری پێ دانەوێنێت. بەڵام خەیاڵی میجەرسۆن خاوبوو، چونکە شێخ مەحمود لەوانە نەبوو یەکێکی وەکو سۆن کۆڵی پێ بدا ... شێخ کەوتە گفت و گۆ لەگەڵ سەرەک هۆزەکاندا و توانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەماوەند و هەباسی مەحمود ئاغای پشدەر و مەحمود خانی دزڵی بکا بە دۆستی خۆی و بەپشت بەستن بەوانە کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی ئینگلیز».

ئەحمەد خواجا لە یادداشتەکانیدا دەربارەی پاشگەزبوونەوە و هەڵوێستی ئینگلیزەکان لەو رۆژەدا ئەڵێ:

« ئینگلیزەکان وردە وردە دەستیانکرد بەهێنانی ئینگلیز و هندی وعەرەب و ئێرانی و جاسوسیان بڵاوکردەوە و دەستیان خستە کاروباری وڵاتەوە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی حوکمدارییەتی شێخ مەحمود بخەنە ناو چوارچێوەیەکی تەسکەوە...شێخ مەحمود لەسەرەتادا نەیدەویست لەگەڵ ئینگلیزەکاندا تێک بچێت چونکە ئەورۆژانە هێشتا برسییەتی و گرانی مابوو، ئینگلیزەکان خواردنیان هێنابوو دابەشیانکردبوو ، بەو دابەشکردنە هەوڵیان دابوو خەڵک بەلای خۆیاندا داشکێنن و گرینهاوس بە ئارەزوی خۆی کاروباری ئەبرد بەڕێوە. ئینگلیزەکان بەناوی معاونی حاکمی سیاسییەوە گەلێک ئینگلیزی تریان هێنا وەکو:

١ـ دانلێس کرا بە سەرلەشکر و دامەزرێنەری سوپای کوردستان و دانشمەندی سوپای عەسکەری و لە فەرماندەی ئەفسەرە کوردەکان کە لە تورکیاوە هاتبوونەوە سوپایەکی گەورەو بە هێزی دروست کرد بەناوی (سوپای لیڤی) و بەشێوەی ئینگلیز مەشقی پێ دەکردن(بەڵام رەفیق حلمی لە پەراوێزی لاپەڕە ـ ٥٩ ـ ی یادداشتەکانیدا لای وابووە کە مێجەر دانێلس لەسەرەتاوە لەگەڵ نوئێلدا هاتبوو بۆ سلێمانی).

٢ـ مارک براید: یاریدەری دانلێس...مێجەر سارجن براید بۆ ئەوە هێنرابوو کە

ببێ بە سەرپەرشتکەری سوپای لیڤی، زۆربەی کاروبار بەدەست ئەوەوەبوو، ئەوانەی خۆشیان دەویست ناویان لێ نابوو (مام برایم)، بەلای ئەوانەوە کەسەر بە ئینگلیز بوون مارک براید هەرچییەکی بکردایە و بیوتایە بەلای ئەوانەوە شتێکی رەوابوو. بەلأم سەیر ئەوەبوو مارک براید پاش ماوەیەک گەڕایەوە بۆ لەندەن ، لەلەندەنەوە نامەیەکی ناردبوو بۆ رەشید ئەفەندی بەکر ئەفەندی (باوکی فوئاد رەشید) کە لە هێزی لیڤیدا کاپتن بوو لەو کاغەزەدا نووسیبووی لە دوای گەڕانەوە م بۆ لەندەن زۆر بێ ئیش مامەوە بەلأم ئەمە سێ رۆژە لە جێگەیەکی گشتی بە (قرناتەژەن) دامەزرێنراوم بۆیە بە پێویستم زانی مژدەتان بدەمێ» .

ئەحمەد خواجە لە یادداشتەکانیدا باسی رەفتاری ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمە ئەکا و ئەڵێ:

«دەست درێژی کردنی گرینهاوس و پێچ و کەڵەکی دانلیس بەتەواوی شێخ مەحمودیان وەڕز کردبوو، وردە وردە دەسەلأتیان لێ ئەسەندەوە لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود هەتا ماوەیەک خۆی گرت بۆ ئەوەی دڵی ئینگلیزەکانی لێ نەرەنجێ...

ئەوەی لەژێر دەسەلأتی حوکمداردا مایەوە بریتیبوو لە (۳۰) پۆلیس بە سەرۆکایەتی تاهری حەمە ئەفەندی (فەرخە) و بەیاریدەدەریی حاجی ئاغاو مستەفا ئەفەندی(نیاز لە خاڵە مچەی حاجی ئیبراهیم ئاغابوە)، بەلأم حاجی ئاغا خۆی خستە ناو جۆشەکەی گرینهاوس و بەلای ئەوا دایشکاند.

ئینگلیزەکان زمانی فارسییان ئەزانی، لە دائیرەکان نووسین بە زمانی فارسی بوو تەنها وەرام دانەوە لە حوکمدارەوە بۆ ئینگلیزەکان بە کوردی بوو، هەتا لە ناحیە و قەزاکانیشدا بەهۆی معاوینە سیاسییە ئینگلیزەکانەوە نامە بە فارسی ئەنووسراو هەموویان لەسەر پرۆگرامی گرینهاوس ئەجووڵأنەوە و هەریەکەیان بەجۆرێک کندیان لە حوکمدارێتی شێخ مەحموددا ئەکرد و دەسەلأتیان کەم ئەکردەوە بۆ روخاندنی.

ئینگلیزەکان لەناو سلێمانیدا هەر یەکەیان بەناوی فەراشی و مەیتەری و چێشتکەری و شتی ترەوە خەڵکی بێگانەیان ئەهێناو ناو سلێمانییان پڕکرد لە

جاسوس. شێخ مەحمود بەرامبەر بەو هەڵوێستە هیچ چاری نەما، نامەیەکی نارد بۆ ویلسنی حاکمی گشتی و داوای بەجێ هێنانی بەڵێن و پەیمانی پێشووی لێ کرد کەبریتی بوو لە ئازادی کورد و ئینگلیزەکانی تەنگەتاو کرد کە دەزگای کوردی دامەزرێنن و کورد بەخاوەنی کوردستان و ئینگلیز بە یاریدەدەر بناسرێت.

ویلسن لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا هاتە سلێمانی و لەگەڵ شێخ مەحموددا یەکتریبیان بینی و لە چاوپێکەوتنێکدا بەڵێنی دا بە شێخ مەحمود کە کاری کورد بەم زووانە تەواو ئەبێت کەچی لەدوای گەڕانەوەی ویلسن بۆ بەغدا ئینگلیزەکان لە سلێمانیدا لەجاران زۆرتر توندو تیژڕەو بوون و بەتەواوی کاروباریان گرتەدەست و دەستیان کرد بەدوورخستنەوەی سەرۆک عەشیرەتەکان لە شێخ مەحمود و هانیان ئەدان لێی هەڵگەڕێنەوە.

ویلسن زۆرباش ئەیزانی شێخ مەحمود سوورە لەسەر داخوازییەکانی بۆ کورد بۆیە بوونی شێخ مەحمود دەستی نەئەدا بۆ ئینگلیزەکان، ئەوەبوو بۆ ساردکردنەوەی شێخ مەحمود و تەفرەدانی خەڵکەکە لەو کاتەدا ئەم بەیانەی خوارەوەیان بلاوکردەوە...

«حکومەتی بەریتانیا پێی ناخۆش نییە کەبەناوی حاکمی گشتییەوە ئەو کوردانەی(جگە لە قەزاکانی بادینان لە موسڵ)کۆمەکی شێخ مەحمود بکەن بەو مەرجەی شێخ مەحمودیش خۆی بە نوێنەری ئینگلیز بزانێت و دەزگایەک دابمەزرێنێت و مێجەر نوئێلیش بەناو کوردەکاندا بگەڕێت»(کە دیارە ئەو بەیانەی ئەحمەد خواجە باسی ئەکات لەو کاتەدا بووە کە هێشتا مێجەرسۆن نەنێردرابو بۆ سلێمانی).

وردە وردە دەستی ئینگلیزەکان کەوتەڕوو، بۆ پیاوێکی لە گرینهاوس خراپتر و ملۆزمتر ئەگەڕان کە ئەویش(مێجەرسۆن)بوو هێنایان بۆ کوردستان و کرا بە حاکمی سیاسی(کە نوئێل نێردرا بۆ گەشتی کوردستانی تورکیا گرینهاوس کاروباری گرتبوە دەست هەتا مێجەرسۆن چووبوو بۆ سلێمانی) پاش ئەوەی مێجەرسۆن هاتە سلێمانی هەموو کاروباری گرتەدەست و وردە وردە ژمارەی ئینگلیزەکان زۆربوون و تا وایان لێ هات لەوڕۆژانەدا کە شێخ مەحمود

رووبەڕووی ئینگلیزەکان بووەوە و هەموویانی گرت(پاش ئەوەی مێجەرسۆن بەناوی ئیجازەوە بۆ هێنانی ژنەکەی لە بەسرە سلێمانی بەجێ هێشتبوو) بریتیبوون لەمانەی خوارەوە...

١ـ مێجەر گرینهاوس جێگری حاکمی سیاسی
٢ـ کاپتن دۆگلاس یارمەتی دەری حاکمی سیاسی
٣ـ کاپتن هۆلت معاونی سیاسی
٤ـ کاپتن رایت معاونی سیاسی
٥ـ مێجەر دانلیس فەرماندەی سوپا
٦ـ شکۆفیل سارجن مێجەر
٧ـ کاپتن بۆند حاکمی سیاسی چەمچەماڵ

دەربارەی پاشگەز بوونەوەی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کورد و بەرامبەر بە حوکمدارییەتی شێخ مەحمود، شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یادداشتەکانیدا ئەڵێ: «٢١»

«دوای ئەوەی ئینگلیزەکان مێجەرنوئێلیان لابردو مێجەرسۆنیان هێنا وردە وردە مەبەستە گڵاوەکانی خۆیان ئاشکراکرد.

نازری گومرگ کە ئینگلیزبوو فارسییەکی باشی دەزانی...رۆژێک ئەو کابرایە داوای لەباوکم کرد کە پێکەوە بچن بۆ بەکرەجۆ، لەوێ ئەو کابرایە سووک و باریک بە باوکمی گوت:

من ئێستە بە ناوی ئینگلیزەوە داوات لێ ئەکەم کە واز لە حوکمداری بهێنیت (ئیستیقالە بکەی)و من بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە بەڵێنت ئەدەمێ هەرچی زەویوزاری میری هەیە لە سلێمانیدا بخرێتە ژێردەستی تۆوە و هەتا بەریتانیا لە عیراقدا دەستی بڕوات ئەو زەویوزارانە هەر بەدەست خۆتەوە ئەبێت و ئەو مووچەو مانگانەیەش کە ئێستە هەتە، هەتا ئینگلیز لێرەمابێت هەرئەمێنێت چونکە ئێمە سیاسەتمان گۆڕیوە و مێجەرسۆن رەوشتێکی سەیری هەیە و زۆرجیاوازە لە نوئێل.

باوکم بێدەنگ ئەبێ و هیچ وەرامێکی ناداتەوە و لەدواییدا ئەو گفتوگۆیەی

باوکم و ئەو کابرای ئینگلیزەم لەخاڵم (کاکە حەمەی ئەمینی عەتار)بیست کەبەم جۆرەی خوارەوە بۆی گێڕامەوە:

«دوای گفتوگۆی شێخ مەحمود و ئەو ئینگلیزە شێخ مەحمود هەموو موستەشارەکانی خۆی کۆکردەوە کە بریتی بوون لە من(کاکە حەمە)و حسێنی نازم بەگ و حەمەڕەشیدی جوامێری هەمەوەندی و عزەت مەدفەعی(کە نوێنەری ئەفسەرە کوردەکان بوو لای باوکم) لەگەڵ حاجی سەیدحەسەنی مامی باوکم و حەمدی ساحیبقڕان(شاعیرو سەرۆکی شارەوانی سلێمانی لەو رۆژەدا) و تاهیر حەمە ئەفەندی(فەرخە) و هەندێکی تر، لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو وتو وێژدا،ئەوانەی کۆببوونەوە بوون بە سێ بەشەوە،بەشێکیان پێشنیازی ئەوەیان کرد کەشێخ ئیستیقالە بکا و داخوازی‌یەکانی ئینگلیز قبول بکا کە بریتی بوو لە وەرگرتنی زەوی و زار و ئەمیریەکانی سلێمانی و مووچە و مانگانەکەی. بەشی دوهەم وتیان باشێخ ئیستقالە بکا، بەلاّم مووچە و زەوی وەزارەکان لە ئینگلیز قبوڵ نەکا. بەشی سێ هەم کە بریتی بوو لە عیزەت مەدفەعی و حەمەرەشیدی جوامێری هەمەوەندی و یەکێکی تر (شێخ رەئووف لە یاداشتەکانیا ئەڵێ هەرچەندم کرد ناوەکەیم نایەتەوە بیر) ئەم بەشی سێ هەمە وتیان شێخ مەحمود نابێ دەست بەرداری حوکمداریەتەکەی ببێت .

حاجی سەید حەسەنی مامم بە شێخ مەحمود ئەڵێ:

«مەحمود کە ساتێ خۆی میجەر نوئێل داوای لێ کردیت ببیت بە حوکمدار و پرست پێ کردین ئەوەبوو ئەوسا من تاقە کەسێک بووم کە پێم ووتیت قبوڵی مەکە چونکە تێم گەیاندیت ووشەی (حوکمدار) ووشەیەکی روون و ئاشکرانیە، بەلاّم تۆ گوێت نەدایە و قبوڵت کرد، ئەو تاقمەی لەگەڵ تۆدابوو وتیان ئەوە سوودی کوردی تیادایە با لەکیسمان نەچێت و دوای نەخەین ... باش لەبیرتە کە پێم ووتن مەسەلەی نەتەوایەتی شتێکی تازەیە، ژمارەیەکی کەم نەبێت ئەوەیان بەمێشکا ناچێت، باجارێ ئەمە دوابخەین بۆ دوارۆژ، بەلاّم ئەوەبوو هەمووتان قسەکەی منتان پەسەند نەکردو دووبارە لەبیرت دێ پێم وتی: ووشەی حوکمدار شتێکی روون نییە و لێڵ و ئاڵۆزە و لەراستیدا نوێنەری ئینگلیزی ئەوڕۆژە(کە مێجەرنوئێل بووە) نەی دەویست نیاز و مەبەست و مانای ووشەی (حوکمدار)

ڕوون بکاتەوەو ماناکەی هەروا بەتەماوی هێشتەوەو لەوەدا عیزەت مەدفەعی لەناوتاندا لەهەموان زۆرتر سەرگەرم بوو کەگوێ ناداتە دوارِۆژی کەس..وا ئێستە ئێمە لەدوو هەڵوێستداین یا ئیستیقاالە قبووڵ بکەی یا قبووڵی نەکەی؟ ئەگەر قبووڵت نەکرد ئاپا ئێمە دەتوانین بەرگەی هێزی ئینگلیز بگرین؟..ئەگەر ئیستقالەشت کرد ئاپا لەسەرزەنش و لەجنێوی دوارِۆژ رزگارت دەبێت؟؟

شێخ رەئوف لەسەری دڕواو ئەڵێ... ئەوەبوو باوکم بوو بەلایەنگری دەستەی عیزەت مەدفەعی و حەمەڕەشیدی جوامێر و عیزەت مەدفەعی لەو کۆبونەوەیەدا گوتبووی: ئەگەر شێخ وازبێنێت لە حوکمداری، خەڵک پێمان ئەڵێن خیانەتمان کردووە بەرامبەر بە نیشتیمانەکەمان و پێمان ئەڵێن ولاتمان فرۆشتووە بە ئینگلیزەکان و هەتا ماوین لەم سەرشۆڕییە رزگارمان نابێت و بەلای منەوە خۆکوشتن زۆر باشترە لەم سەرشۆڕییەی کەدێتە رێگامان ئەگەر مل بۆ ئینگلیز کەچ بکەین».

شێخ رەئوف دەربارەی بیانووگرتن و پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز و رەفتاری مێجەرسۆن بۆ بەجێ هێنانی ئەو پەڵپ و بیانوو و پاشگەزبوونەوەیە ئەڵێ:

«بەرلەوەی مێجەرسۆن بگاتە سلێمانی، چەند سەربازێکی کوردی خەڵکی سلێمانی کە وەختی خۆی سەربازی عوسمانلی بوون داوایان کرد کەببن بەحەرەسی تایبەتی باوکم کە عەریفی ئەو تاقمە ناوی عەبدوڵا ئاغەی چاوش بوو، باوکیشم قبوڵی کردن.کە ساتێک هێزی لیڤی کورد پێکهێنرا ئەوتاقمە هەر معاشی سەربازیان وەرئەگرت و بەحەرەسی باوکم مانەوە .بەلام میجەر سۆن کەهات ئەوەشی پێ رەوا نەبینی و رۆژێک داوای کرد کە ئەبێ ئەو حەرەسانە بگەڕێنەوە بۆناو فەوج بەبیانووی ئەوەی کە پێویستە تەدریبیان پێ بکرێت ...

شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیدا لەسەری ئەروا و ئەڵێ:

هەموو شەوێک یەکێک ئەهاتە لای باوکم و هەمووجارێک ئەو کەسە کە ئەهات یا عەبدوڵلا ئاغەی حاجی حەمەسەعید یا عەبدوللا ئاغەی چاوەشی لەگەڵدا ئەبوو کە ناوی ئەو کەسەم پرسی وتیان ناوی (سدقیی فاتەشەل)ە سدقی پیاوێکی کەڵەگەت بوو، کرابوو بە هەمزەی وەسڵ لە نێوان باوکم و ئەفسەرە کوردەکاندا کە مێجەر سۆن هات و چۆن ئەو ئەفسەرانەی بۆلای باوکم قەدەغە

کردبوو.

میجەر سۆن بەوهات و چۆیەی سدقی زانی و سدقی گواستەوە بۆ هەڵەبجە و زۆری پێ نەچوو لە لایەن (عەلی بەگی ریشێن)ەوە لە بەردەمی چادرەکەی خۆیا کوژرا (عەلی بەگی ریشێن کوڕی ئەحمەد بەگی ریشێن بوە، ئەحمەد بەگ کچێکی خانمی ژنی وەسمان پاشای هێنابوو بەلاّم عەلی بەگی کوڕی لەو کچەی خانم نەبوو بەڵکو لە ژنێکی تری بوو).

شێخ رەئووف ئەڵێ: کاپتن لیز لە کتێبەکەیدا (دوو ساڵ لە کوردستان) دانی بەوەدا ناوە کە عەلی بەگ رزگاری کردبوو لە سیدقی و وتبوی سیدقی سەر بە شێخ مەحمود بو و دژی ئێمە بوو. لیز لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: بڕیار وابوە کە سیدقی من بگرێ و بمداتە دەست مەحمود خانی دزلی هەورامی (ئەو کاپتن لیزەی شێخ رەئووف باسی کردوە ئەفسەری فڕۆکەوان بووە و کرابوو بە حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە بۆ ئەوەی ئەوناوە دژی شێخ مەحمود هان بدا و کە شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا تێک چوو ویسترا کاپتن لیز لە هەڵەبجە بگیرێت، وەکو لە پێشتردا باسمان کرد خانمی ژنی وەسمان پاشا یارمەتی داو دەربازی کردبوو بۆ خانەقین و لەئەنجامی ئەوەدا لەقەبی بەهادوّر خانی پێ درابوو لە لایەن ئینگلیزەکانەوە) ...

کاپتن لیز لە کتێبەکەیدا ئەڵێ : من دەخلم بەسەر کوشتنی سیدقی یەوە نەبوو بەڵکو عەلی بەگ هەر لە خۆیەوە کوشتبوی بەلاّم شێخ رەئووف بەدرۆی ئەخاتەوە و ئەڵێ: لیز راست ناکا چونکە عەلی بەگی ریشێن سیدقی نەناسیوە و نەبیسترابوو هیچ ناکۆکیەک لە نێوانیاندا روویدابێ بەڵکو بە پێی راسپاردە و پیلانی میجەرسۆن و ئاگاداری لیز کوژرابوو (سەیر ئەوەیە عەلی بەگی ریشێن لە ناوەڕاستی سالّی پەنجاکاندا لە هەڵەبجە کوژرا و ئەو کوشتنەی وونکرا کە بەهۆی ناڕێکی ناو خۆی جافەکانەوە بووە کوژرابوو).

شێخ رەئووف لە باسی چۆنێتی گەرم بوونی ناڕێکی باوکی و مێجەر سۆندا ئەڵێ:«۲۱»

«وردە وردە ناکۆکی نێوان شێخ مەحمود و مێجەرسۆن پەرەی سەند و گەرم بوو رۆژێک پیاوێکی هەورامی هاتە لای باوکم و نامەیەکی دایە دەستی، کە

باوکم نامەکەی خوێندەوە چاوی پەڕییە پشتی سەری و بەتووڕەییەوە بەکا برای ووت: کوێخا ... من کاتی خۆی نامەم لە مەحمود خانی دزڵی ی ئاغاتەوە بۆ هاتوە کە ئامادەیە هەتا مردن لەگەڵمابێت ... ئایا ئێستە لەوە پەشیمان بۆتەوە؟ (ئەو پیاوە ناوی کوێخا زۆراب بوو یەک دوو جار لەگەڵ شێخ لەتیفی شێخ مەحمودا دیومە کە شێخ لەتیف زۆر گاڵتە و گەپی لەگەڵ ئەکرد).

شێخ رەئووف لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«لە راستیدا بیرکردنەوە لە شەڕکردن لەگەڵ ئینگلیزدا لەو رۆژانەدا شتێکی گاڵتە نەبوو کارێکی ئاسان نەبوو چونکە:

١ـ ئەو رۆژانە ئینگلیزەکان لە پۆپەی دەسەڵات و هێزی سوپایی و سیاسیدا بوون.

٢ـ کورد لەوپەڕی دەست کورتی و بێ پارەیی و پەرێشانیدا بوو.

٣ـ کورد هیچ جۆرە پاڵ پشت و یاریدەدەرێکی نەبوو، بە تایبەتی کورد بە هۆی شەڕ و بەهۆی گرانیەوە زۆر پەریەشان بوبو، خەڵک هێشتا لە برسێتی ڕزگاری نەبوبو.

٤ـ بیر و باوەڕی نەتەوایەتی کورد هێشتا خام و دەڵەمەبوو، بە هێز نەبوو تەنها لەناو ژمارەیەک خوێندەواران و رۆشنبیران و ئەفسەرانی کوردا هەبوو کە ژمارەیان زۆر کەم بوو.

٥ـ بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی و شۆرشگیری لەناوچەی سلێمانی و هەندێ شوێنی کەرکوکدا هەبوو، بە داخەوە کوردی ناوچەکانی تر بەشداری ئەو بزوتنەوەیان نەکرد ئەگەرچی زۆریان بەدڵ لەگەڵ شۆڕشی کوردا بوون و لە زۆر لاشەوە هەرتاقمە بەجیا لەناوچەکانی خۆیاندا بەشێوەیەکی پچڕپچڕ دژی ئینگلیزەکان راپەڕیبون.

پاش ماوەیەک ژمارەیەک لە چەکدارانی ناوچەی بازیان هاتنە لای باوکم و پاش ئەوانیش مەحمود خانی دزڵی بەخۆی و هێزی ناوچەی (مەریوان)ەوە گەیشتنە شارباژێر و شێخ عەبدوالرەحمانی داراغا گەیشتە نزیکی سلێمانی و بەرزنجەییەکانیش زۆریان هاتنە سلێمانی. میجەرسۆن کە ئەو چکدارانەی بیست وا هاتونە دەورووبەری سلێمانی پەیوەندی بە باوکمەوە کرد و داوای لێ کرد کە

بە مەحمود خانی دزلی بلێ کە بگەڕێتەوە، باوکیشم لەوەرامدا پێی ووت: مەحمود خان دۆستی کۆنمە و زۆر جار دێت بۆ دیدەنیم، لەبەر ئەوە ناتوانم ڕێگەی هاتنی لێ بگرم . ئیتر میجەرسۆن بە پەلە، بە بیانووی ئەوەی کە ئەچێت خێزانەکەی لە بەسرەوە بهێنێت، خۆی لە سلێمانی دەربازکرد و لە ڕێگا تووشی ئەو کاروانە ئەبێت کە مەعاش و مووچە و مانگانەی مووچە خۆرەکان ئەبا بۆ سلێمانی، سۆن کە ئەیان بینێت داوایان لێ ئەکا بەپەلە بچن و بگەنە سلێمانی، بە خەیاڵی خۆی لای وابوو ئەگەر ئەو پارانە بگەنە سلێمانی، ئیتر شۆرشگێرەکان لە ناو خۆیانا لەسەر تالآنکردنی ئەو پارەیە تێک ئەچن.

بەلاّم ئەو ئاواتەی میجەر سۆن نەهاتە دی، چونکە لە ڕێگا لە لایەن عەشایەرەکانەوە ئەو کاروانە دەستی بەسەرا گیرا و هیچ کێشە و هەرایەکیشی لەسەر نەقەوما .

ستیڤن لە کتێبەکەیدا دەربارەی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە پێک هێنانی حکومەتێکی کوردی‌دا ئەلێ:«٥٧»

١ـ هەندێ کەس ئەلێن هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە پێک هێنانی حوکومەتێکی کورد لەبەر بوونی نەوت بووە لە کوردستاندا .

ئینگلیز کە لە دوای پەیمانی سایکس پیکۆی ساڵی ١٩١٦ بۆیان دەرکەوت نەوت لە کەرکوک هەیە بە پێی ئەو پەیمانی سایکس پیکۆیە ویلایەتی موسل بەر فەرەنسە کەوتبوو، بەلاّم لە دواییدا لوید جۆرجی ئینگلیزی لەگەڵ کلیمنسۆی فەرەنسیدا لە ساڵی ١٩١٨ دا ڕێک کەوتن کە ویلایەتی موسل بدرێ بە ئینگلیز بەرامبەر بەوە بەشێک لە نەوت بدرێ بە فەرەنسە، لەبەر ئەوە کە ئینگلیزەکان ئەو داخوازیەیان سەری گرت ئیتر هەوڵیان دا هەموو ناوچەکە بخەنە ژێر دەسەلاّتی خۆیانەوە و پێویستیان بە دروستکردنی حوکومەتی کوردی نەما .

٢ـ هەندێکی تر ئەلێن: داگیر کردنی عیراق بە ویلایەتی موسیلیشەوە بەهۆی دائیرەی هندستانەوە پێک هات (کە ئیدارەیەکی تایبەتی ئینگلیز ئەیبرد بە ڕێوە) ئەو دائیرەیە بەرپرسیار بوو لە خەلیج، بۆیە ئیدارەی هیندستان ویستی ویسایەتێک بسەپێنێت بەسەر ئەو شوێنەدا کە لە دواییدا بە (میسۆپۆتامیا

ناوبرا).

بەوجۆرە ئینگلیز بڕیاری دا ویلایەتی موسل بخەنە سەر دوو ولاتەکەی تری میسۆپۆتامیا کە بریتی بوو لە بەغدا و بەسرە.

٣ـ هەندێکی تر ئەڵێن: لۆرد کیرزنی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ویستی پاڵ پشتی ئەو موغامەرەیە بکا کە ئەویسترا لە ئێراندا بکرێ دوای ئەوەی کۆمونیستەکان قەیسەری روسیان لابرد.

ئەو بەیانەی کە لەو ڕووەوە دەرچوبو بۆ ئەو مەبەستەبو کە ڕێگا لە ئەڵمانەکان بگیرێت کە نەچنە ناو ئێرانەوە، لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان بایەخیان دا بە کوردستان و خستیانە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە.

بەلام مس بێلْ لە کتێبەکەیدا لە لاپەڕە (٩٨ــ ١٠٠) دەربارەی هۆی پاشگەزبونەوەی بەریتانیا بەرامبەر بە کورد ئەڵێ: «٠٠»

بۆمان دەرکەوت کە شێخ مەحمود پەیوەندی هەبوە لەگەڵ ئەو بزوتنەوەیەی کە لە (شرناخ)دا هەبوە (نیازی تورکەکان و لە بزوتنەوەی کوردەکانی تورکیا بووە، کە وابزانم لەو نامەیەی کە ئەحمەد تەقی باسی کردوە کە لە شێخ قادری شمزینییەوە بردبوی بۆ شێخ مەحمود، هیچ سەرچاوەیەکی تر باسی ئەو پەیوەندیەی نەکردوە)، لەبەر ئەوە پێویست بوو سنوورێک بۆ دەسەلاتی شێخ مەحمود دابنرێت.

لە سلێمانیدا (کۆمەڵ ـ پارت)یک هەبوو حەزی ئەکرد کوردستان یەکسەر لە لایەن بەریتانیاوە ببرێت بە ڕێوە، بازرگان و کاسبەکان ئەوەیان لاباشتربوو لەوەی لەژێر سەرکردایەتی کوردێکدابن. (لەڕاستیدا چۆن چینی فیوداڵ سروشت و ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیە و تەنها بەدوای سوودی خۆیدا ئەگەڕێ، زۆرجاریش بەشێوەیەکی گشتی بازرگان و پارەدارەکان(جگە لە بازرگان و پارەدارە نیشتیمانییەکان) لە سروشتی خۆیان لانادەن و وەکو کۆمبرادۆرێک رۆڵی خۆی ئەبینێت و هەمیشە بەو ڕێگەیەدا ئەڕوا کەسوودی خۆی تیادا مسۆگەر بکا و بێگومان مس بێلْ زندە ڕۆیی کردوە کە بەبێ جیاوازی هەمو بازرگان و کاسبەکانی لە ریزی ئەوانەدا داناوە کە خۆیان بەستبوو بەمان و بوونی دەسەلاتی بەریتانیای داگیرکەر).

مس بێلْ لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: شێخ مەحمود قایل نەبوو بەوەی ئێمە سنوور بۆ دەسەڵاتی دابنێین و دوو ڕووەکانی دەورپشتیشی هانیان ئەدا لەقەبی (حاکمی هەموو کوردستان) لە خۆی بنێت کە بێگومان ئەو داخوازییە سوودی دەسەڵات داریەتی ئاغا و سەرکردەکانی بەهێز ئەکرد لەگەڵ ئەوشدا نەمانتوانی گۆڕینێکی کوت و پڕ و گورج ساز بکەین، بەڵام بۆمان دەرکەوت هیچ جۆرە پێشکەوتن و ئاسایش و ئارامییەک کە سوودی گشتیی تیادا بێ سەر ناگرێ هەتاکو ئەو (درنجە)ی کە لە شووشەکەیەوە هاتوەتە دەرەوە نەخرێتەوە ناو شووشەکەی خۆی (کە نیازی لە شێخ مەحمود بووە) ...

کە مێجەرسۆن کرا بە حاکمی سیاسی بۆ ئەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود کەم بکاتەوە، دوای مانگێک بەسەر تێپەڕ بوونی کاروباری دا، مێجەرسۆن لە ڕاپۆرتێکیدا ئاگاداری کردین کە دەسەڵاتی شێخ مەحمود وردە وردە کەم کرایەوە و خەڵکەکە ئەوەیان بەدڵە و هەموو دڵنیابوون و کە بۆ خەڵک دەرکەوت ئینگلیز نایەوێ بەزۆر شێخ مەحمودیان بەسەردا بسەپێنێت، ئیتر وردە وردە لێی تەکینەوە جگە لە سلێمانی و دەور و پشتی نەبێت.»

ئەوەی لەو بۆ چونانەی مس بێلْ دا دەردەکەوێت بریتیە لە چەند شتێک بۆ پینە کردنی پاشگەزبوونەوەی حوکومەتەکەی:

یەکەم ـ ئەوەی کە وتویەتی شێخ مەحمود پەیوەندی بە (شرناخ)ەوە هەبوە بیانوویەکی ئەشکرا بووە چونکە مس بێلْ سوور زانیویەتی ئەو پەیوەندیەی شێخ مەحمود ئەگەر ڕووشی دابێ لەدوای ئەوە بووە کە دەستی لە ئینگلیزەکان شتبوو بە ئاشکرا دەستیان کردبوو بە گێڕانی پیلان و نەخشە بۆ نەمانی، یا ئەگەر ئەو تاقە کاغەزەی کە شێخ عەبدوالقادری شەمزینی بە ئەحمەد تەقی دا ناردبوی بۆ شێخ مەحمود ئەوە ئەو هۆیە بوبێ کە مس بێلْ بێزاری خۆی بەرامبەر دەربڕیبوو، شتێکی ئاشکرایە ئەو پەیوەندیە وەکو ئەحمەد تەقی ئەڵێ: کە هاتمە سلێمانی بۆم دەرکەوت شێخ مەحمود بەتەواوی دڵی لە ئینگلیزەکان کرمێ بوبو، بێ گومان پەیوەندیشی بە تورکەکانی ناوچەی (شرناخ) هەر لە دوای هیوا نەمانی شێخ بووە بە ئینگلیزەکان.

دووهەم ـ ناوی (پارت ـ کۆمەڵ)ێک ئەبات کە گوایە حەزیان کردوە

کوردستان هەر لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بێت و ئەوەیان لا باشتربووە وەک لەوەی لەژێر دەسەڵاتی سەرکردایەتیەکی کورد دا بن ...

وابزانم ئەو پارتەی کە مس بلل باسی ئەکا شتی وا نەبوە کەپێی بوترێ پارت و دوورنیە چەند کەسێک لەوانەی کە چارەنووس و سوودی خۆیان بەستبوو بەمانەوەی ئینگلیز لە کوردستاندا، ئەوانەبوون کە لە ئینگلیزیان گەیاندوە ئەوانیان لا باشترە لە سەرکردایەتییەکی کورد کە همیشە بەدرێژایی مێژوو ئەو جۆرە هەڵپەرستانە بوون و هەن ...

بەلام کە ئەڵێ داخوازی بۆ ئەوەی شێخ مەحمود لەقەبی (حاکمی هەمو کوردستان)ی ببێت شتێک بووە دەسەلاتی ئاغا و سەرکردەکانی دەرېڕیوە بۆچوونێکی بێ سەروپێیە، چونکە ئەو ئاغاو سەرۆکانەی کە ئەڵێ سوودیان لەوەدا بووە کە شێخ مەحمود ببێت بە حاکمی هەموو کوردستان ئەوانە زۆربەیان لە ژێر رکێفی خۆیاندابوون و بە پارە و خەلات زۆریان کڕیبون و ویلسنی حاکمی گشتی لەکتێبەکەیدا دانی پیادانابوو کە ئەو سەرکردانە بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود قایل نەبوون.

ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا دەربارەی هۆ و چۆنیەتی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز ئەڵێ: «٤٤»

« کە حوکومەتی کاتی لە سلێمانی پێک هات و هەندێ ناوچەی دەوروبەری خرایە سەر، ویلسنی حاکمی گشتی بە شێخ مەحمودی گوت: هەر ناوچەیەک یا عەشیرەتێک بە زەعامەتی شێخ مەحمود قایل بێت ڕێگەی ئەوەی لێ ناگرین کە بچێتە ناو ئەو ئیدارەیەوە، بەلام لە دواییدا دەرکەوت کە موبالەغە هەبوو لە شەعبیەتی شێخ مەحمود دا بۆیە تەنها ئەو ئیدارە کاتیە هەر لە سلێمانی و هەندێ ناوچەی کەرکوک دا مایەوە.

کە شێخ مەحمود کرا بە حوکمدار ئەفسەرێکی سیاسی بۆ دانرا هەروەهار لە چەمچەماڵ و هەڵبجەش یاریدەدەرێکی ئەفسەری سیاسی دانرا. شێخ مەحمود لە سەرەتاوە بێزاری خۆی دەربڕی بەرامبەر بە کەم کردنەوەی سنووری دەسەلاتی و لە ئەنجامی ئەوەدا خۆی لە دواییدا تووشی گەلێک گێرەوکێشە کرد .

هێشتا تورکەکان لە سلێمانیدا مابوون شێخ مەحمود بەبێ ئەوەی هیچ

سیفەتێکی ڕەسمی هەبوویێ توانیبووی دەست بەسەر سلێمانیدا بگرێت، بەڵام لەو کەسانە نەبوو کە تەنها بەو سنوورەی کە بۆی دانرابوو ڕازی ببێت، بەڵکو ئەو سنوورەی کە نوئێلیش بۆی دانابوو ئەوەشی خستە پشت گوێ لەبەر ئەوە لە ١١/نیسانی/١٩١٩ دا بڕیاردرا گۆڕانێکی تر بەسەر ئەو ناوچەیەدا بکرێ و هەروەکو شوێنەکانی تر سەیر بکرێت. بۆ ئەو مەبەستە نوئێل گوێزرایەوە بۆ کاروبارێکی تر کە لەگەڵ ئارەزووی خۆیدا بگونجێت و میجەرسۆن چوە جێی نوئێل.

سۆن شارەزاییکی تەواوی هەبوو دەربارەی سلێمانی، ئەوەبوو لەوەختی خۆیدا بەتەبدیلی قیافەت (نیازی لەو گەشتەی بووە کە لە ساڵی ١٩٠٩ دا چوبوە سلێمانی و هەڵەبجە بەناوی حاجی حسێن غولامی شیرازی خۆی کردبوو بە حاجیەکی خەڵکی شیراز و ماوەیەک لە سلێمانیدا بوو).

کە سۆن گەیشتە سلێمانی یەکسەر دەستی کرد بە کاروباری خۆی و شێخ مەحمود بە ناردنی سۆن بۆ سلێمانی بۆی دەرکەوت هیچ دەسەڵاتێکی نامێنێت، لەبەر ئەوە دەست و برد لەگەڵ هەموو بنەماڵەکانی بەرزنجیی و دۆستەکانیان لە هەماوەند و جاف شۆڕشێکیان بەرپا کرد و لەو شۆڕشە چەکدارەدا هەورامییەکانی سەر سنووری ئێرانیشی لەگەڵدا بوو». (نیازی لە مەحمود خانی دزڵی بووە).

بەڵام مێجەرسۆنی کوتەکی دەستی ویڵسنی حاکمی گشتی بەریتانیا لەبەغدا کە بەپێی ڕاوێژی هەموویان هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود کەم بکاتەوە وسەری پێدانەوێنێ، لەهەمووان زۆرتر بەئاشکرا سیاسەتی حکومەتەکەی وهۆی پاشگەزبوونەوەو چۆنیەتی پاشگەزبوونی ڕوونکردوەتەوە، بۆیە بە پێویستمان زانی ئەو ڕاپۆرتە دوورو درێژەی (دۆکیومێنت) کە ناردبووی بۆ کاربەدەستان لە بەغدا هەمووی بڵاو بکەینەوە ژمارەی ڕاپۆرت(c.o.730/13-3341 ڕاپۆرتی ساڵی ١٩١٩:

« ئەو هۆیانەی وای لە حوکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا کرد و خستیە سەر ئەوەی خاوروی کوردستان داگیر بکات شتێک نیە لەم ڕاپۆرتەدا لێی بدوێم. (وەکو وتمان زۆر ڕاپۆرت هەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا ٣٠ ساڵی بەسەردا

تێپەڕیوە بەلاّم هێشتا ڕێگەی ئەوەی لێ بەستراوە کە بخرێتە ناو ئەرشیفەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا وەکو ئەوەی مێجەرسۆن دانی پیاداناوە کە نەیویستوە ئەو هۆیانە باس بکات).

بە کورتی ساتێک کوردستانی خوارو ئۆتۆنۆمی پێ درا لەژێر حمایە و چاودێری بەریتانیادا و (مس بێلْ ناوی ناوە ئیدارەیەکی کاتی) بە یارمەتی و هاوکاری سیاسیەکانی بەریتانیا، لەو ڕۆژانەدا شێخ مەحمود وەکو یەکێکی دەسەلاّتدار لە ناوچەکەدا، وای ئەزانی کە ئەتوانرێ بە یارمەتی ئێمە حوکومەتێکی کوردی دروست بکات کە دووربێت لە دەسەلاّت و لە کۆنترۆلی ئەو ئیدارەیەی لە بەغدادا پێک هێنرابوو وە لای وابوو ئەو حوکومەتەی ئەو نابەسرێ بەوەی بەغداوە و بەتەمای ئەوەبوە سنووری دەسەلاّتی لە خانەقینەوە بگاتە ناوچەی شەمزینان و لە شاخی حەمرینەوە (ئەوسا بەحەمرین وتراوە قەشقە) بگاتە سنووری ئێران.

ئەو ئاوات و هیوایانەی شێخ مەحمود لەو ڕۆژانەدا شتێک نەبوو کە ئەفسەرە سیاسیەکانمان ئاگاداری نەبوبن و هەستیان پێ نەکردبێت و ناشبێ گلەییان لێ بکرێ لەو بۆچوونەدا چونکە شێخ مەحمود کرابوو بە حوکمداری خواروی کوردستان و شێخ مەحمود ژیرانە و زیرەکانە وا خۆی نیشان ئەدا کە دەیەوێ سیاسەتێک بگرێتە بەر کە ڕێز و هەیبەتێک بۆ کورد پەیدا بکاتەوە و بۆپێک هێنانی حوکومەتێکی کوردی ئەوتۆ هەوڵی ئەدا کە پڕبێت لە خۆشی و شادمانی، هەرچەند لە سەرەتاوە هەنگاوەکانی بۆ ئەفسەرە سیاسیەکانمان ئاشکرابوبو کە چۆن تەقەلاّی ئەوەی ئەدا هەمو دائیرەکان بە خزم و ناسیاوەکانی پڕبکاتەوە بەبێ ئەوەی گوێ بداتە خەڵکی لێ هاتوو کارامە و شارەزا و دەستی کرد بە دوور خستنەوەی ئەوانەی سەربەخۆی نەبون و لایەنگری نەبوون.»

وردە وردە ئەم ڕاستیە بۆ ئەوانەش ئاشکرابوو کە شێخ مەحمودیان نە بە موقەدەس و نە بە زیرەک دائەنا ... بەلاّم بەهۆی ئەفسەرە سیاسیەکانەوە توانرا کۆسپ بخرێتە بەردەمی شێخ مەحمود و ڕێگەی ئەوەی لێ گیرا دەسەلاّتی خۆی بلاّوبکاتەوە و والە خەڵک کرا بتوانن بە ئاشکرا ئارەزو و خواستی خۆیان دەرببڕن و داوا بکەن کە ئەیانەوێ لە ژێر سایەی حکومەتی بەریتانیادا بن نەک

لە ژێر سایەی شێخ مەحمود دا .
کوردەکان لەو ڕۆژانەدا زۆر بەپەرۆشبوون بۆ ئاشتی و ئاسایش، بە جۆرێکی وا ئامادەبوون هەر (وەسیقە)یەک کەداوایان لێ بکرێ مۆری بکەن تەنها بۆ ئەوەی ئاسایش و ئارام و خۆراک بۆ ناوچەکە دابین بکرێت.
بەو جۆرە عەشیرەت لە دوای عەشیرەت، لەوانەی جاران سەر بە شێخ مەحمود بوون، مەزبەتەیان مۆرکرد و داوایان کرد دەست بگیرێ بەسەر دەزگاکەی شێخ مەحمودا کە ئەویش کاتی خۆی ئەو دەسەڵاتەی کە پەیدای کردبوو هەر بە هۆی بەریتانیاوە دەسگیربوبو.
لە شوباتی ١٩١٩ دا حاکمی گشتی مەدەنی لە بەغدا ئاگادارکرا، ئەگەرچی ئەبوایە زووتر ئاگادار بکرایە کە وا ناوی شێخ مەحمود زۆر لەوە زیاتر بڵاوبوەتەوە کە سنووری بۆ دانرابوو (دووڕوییەکانی ئینگلیزەکان لەوەدا دەرئەکەوت لە لایەکەوە ئەیان ووت شەعبیەتی شێخ مەحمود موبالەغەی تیادا کرابوو کەچی لە دوکومێنتیکی نهێنی وادا دانی پیادانراوە کە شەعبیەتی شێخ مەحمود زۆر لەوە زیاتر بڵاو بوەتەوە کە ئینگلیز ویستویەتی) .
میجەر سۆن لە ڕاپۆرتەکەیدا لە سەری ئەڕواو ئەڵێ:
« حاکمی مەدەنی گشتی لە بەغدا ئاگادار کرا کە وا دەسەڵات لە ناوچەی سلێماندا خەریکە زۆر شوێنی تر ئەگرێتەوە هەر وەکو کەرکوک و کفری کە بە خۆرایی ناویان لەگەڵ ناوی خواروی کوردستاندا باس ئەکرێ و ناویان لە ژێر ناوی حوکمداریەتی شێخ مەحمودا ناو ئەبرێ (ئەمەش درۆیەکی تری ویلسنی حاکمی گشتی دەرئەخا کە وتبوی لەبەر ئەوەی خەڵکی کەرکوک و کفری بە دەسەڵاتداریەتی و سەرکردایەتی شێخ مەحمود ڕازی نەبوون بۆیە لەو سنوورەی کە بۆ دەسەڵاتی دانرابوو لە ڕێگەی مێجەر نوئێلەوە ئاگادار کرابوو ناوی کەرکوک و کفریان نەبردبوو، وەکو لە پێشتردا باسمان کرد)، لەبەر ئەوەی حاکمی گشتی مەدەنی ئەو دوو ناوچەیەی لە سلێمانی جیاکردەوە وە داوا لە من کرا لەگەڵ ئەو جافانەدا پەیوەندی بکەم کە بەنا بەدڵی لەگەڵ شێخ مەحمودا بوون (لێرەدا مێجەرسۆن دانی پیادا ئەنێ کە حاکمی گشتی لە ترسی ئەوە کەرکوک و کفری لە سلێمانی جیا کردبوەوە چونکە نفوز و دەسەڵاتی شێخ

مەحمود لەو دوو شوێنەدا پەرەی سەندبوو».
مێجەرسۆن دەربارەی تەقەلاّ و هەوڵدانی بۆ دوورخستنەوەی عەشایەرە کوردەکان لە شێخ مەحمود بە ئاشکرا لەو دوکیومێنتەدا دەرئەبڕێ و ئەڵێ:
«کە بڕیاردرا پەیوەندی بەو جافانەوە بکەم کە بەناپەدڵی لەگەڵ شێخ مەحمودا بوون، ئەوکاتە ئەو وەختەبوو کە عەشیرەتی جاف بە کۆچ و بار لە ناوچەی کفری‌دا بوون. لە ئەنجامی چاوپێکەوتنندا بۆم دەرکەوت کە جافەکانیش وەکو پژدەر و مەنگوڕ و مامش و هی‌تر، ئەوانە تومەز لە کاتی خۆیدا بەو مەرجە لایەنگیریی شێخ مەحمودیان کردبوو کە ناوچەکە لە ژێر کۆنترۆڵی بەریتانیادابێت.
لە کۆبونەوەیەکمدا لە (کەلار) لە کەناری روباری سیروان بە ئیجازەی حاکمی گشتی مەدەنی لە بەغدا ئەفسەرێکم تەقدیمی جافەکان کرد کە ناوی (A.P.O)بوو (هەرچەند ناوی نەهێناوە بەلاّم بێگومان کاپتن لیزی فرۆکەوان بووە کە کرا بە معاونی حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە و لەدواییدا بەیارمەتی خانمی ژنی وەسمان پاشا لەکاتی تێکچوونی ئینگلیزەکان لەگەڵ شێخ مەحموددا دەربازکرا بۆ خانەقین وەکو لەهەندێ شوێنی تریشدا باسمانکردوە) جافەکان پێشوازییان لەو ئەفسەرە کردو هەموو ئیخلاسی خۆیان بەرامبەری دەربڕی..
هەر بەوجۆرەش چوومە ناوچەی چەمچەماڵ کە پایتەختی هەماوەندەکان بوو ئەو هەماوەندەی کە تاماوەیەک چەک هەڵگرێکی کەڵڵەڕق بوون بۆ شێخ مەحمود و بۆ شێخ سەعیدی باوکی (سۆن لەو چوونەی چەمچەماڵدا توانیبووی هەندێکی وەکو موشیری حەمەی سلێمانی هەماوەندی لەخشتە ببات و ئەوەبوو لەشەڕی دەربەندی بازیاندا ئەو موشیری حەمەی سلێمانە خیانەتی لەکورد کردو پێش هێزەکانی ئینگلیز کەوت و رێگەی پیشاندان و ئینگلیزەکان ئابڵوقەی شێخیان دا لە دەربەند و بە بریندارى بە دیل گرتیان)، شێخ مەحمود بەوەی کەرکوک و کفری و جاف زۆر سەغڵەت بوو، لە جیاتی ئەوە رووی کردە کۆیە و رەواندز و ئێستە خەریکی ئەوەیە هەڵوێست و هەنگاوی دوژمنانە بەرامبەر بە بەریتانیا بنێت کە هەتا ئیمرۆ هێشتا مانگی دەهەزار روپیە مانگانە وەرئەگرێ (دیارە مانگانەکەشی وەکو حوکمدارێک لە ١٥ هەزارەوە کەم کرابوەوە بۆ

دەهەزار روپیە) .

شێخ مەحمود بەهۆی خزمەکانیەوە خەریکە لە هەموو لایەکەوە دەست بخاتە کاروبارەوە و کۆسپ بخاتە سەر رێگامان.

شێخ مەحمود بۆ ئەوەی خەڵک لە ئینگلیز بێزار بکات هەوڵی ئەوە ئەدا کە بیخاتە مێشکیانەوە ئەم هەڵوێستەی ئینگلیز بەرامبەر بەو لەبەر ئەوەیە کە ئینگلیز نایەوێ کورد سەر بەخۆیی دەسگیر ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەستی ئایینی و دینی بەکار دێنێت لەناو خەڵکدا، بەڵام نەیتوانیوە لە کوردستاندا ژمارەیەکی زۆر بەلای خۆیادا بشکێنێت، ئینجا دوای ئەوە کەوتە سەر ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی ئێراندا پەیدابکات، بەڵام ئەمانە هیچی کەڵکی نەگرت چونکە ئەیانزانی سوودیان لە چیدایە و قانزاجیان لەوەدایە کە شێخ مەحمود بێ دەسەڵات بهێڵرێتەوە تەنها هەماوەندەکان چوون بەدەنگیەوە (لێرەدا ناوی مەحمود خانی دزڵی پشت گوێ خستوە).

شێخ مەحمود وای بلاْوکردبوەوە کە نیازی وایە کەرکوک بگرێ و کوردستانێکی سەر بەخۆو ئازاد و سەربەست پێکبهێنێت، بەڵام لەو تەقەلایەیدا سەرنەکەوت. بەو پێیە قۆناغی یەکەمی تەقەلا و هەڵدانی شێخ مەحمود کۆتایی هات و تەواو بوو.

تەنها مایەوە سەر کۆیسنجەق و رەواندز کە ئەوانیش غەریب بوون لە سلێمانی (مەبەستی ئەوەبوە پەیوەندیان زۆر بە هێزنەبوە لەگەڵ سلێمانیدا) .

میجەرسۆن لەو راپۆرتەدا بە ئاشکرا قین و ژهراوی ناو دڵی خۆی بەرامبەر بە شێخ مەحمود دەرئەبڕێ و بەوەشەوە ناوەستێ و رقی خۆی بەرامبەر بە خەڵکی شاری سلێمانی دەرئەبڕێ کە ئەڵێ:

دۆست و پەیوەندەکانی شێخ ناوشاری سلێمانی یان والیێ کردوە کە هەر وەکو ساڵی ١٩٠٩ ی لێ بێت (نیازی لەوساڵەبوە کە خۆی بە تەبدیلی قیافەت چووبوو بۆ سلێمانی و ئەو ساڵەش بوە کە کارەساتەکەی موسیل رویداوە و شێخ مەحمود و تاقمەکەی بە دڵشکاوی و بەکۆست کەوتوویی لە موسل گەڕابوەوە وەکو لە باسی کارەساتەکەی موسلْ دا بەدوورو درێژی لێی دواین) .

سۆن لەو راپۆرتەیدا بە چاوێکی سووکەوە باسی خەڵکی سلێمانی ئەکا و

بەسووکی ناویان ئەبات و هەوڵی داوە لای لێپرسراوەکانی لە بەغدا ناوی خەڵکی سلێمانی بزڕێنێت کە ئەڵێ:

شاری سلێمانی و ناوی سلێمانی لای خەڵک خۆشەویست نیە، هەتا ئەو کوردانەش کە لە بەغدا دائەنیشن قایل نین و نایانەوێ بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی و لە شارەکەی خۆیاندا بژین ... بەم ستافەی کە ئێستە لە سلێمانیدا هەیە بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەواری ناتوانرێ دەستەیەکی رۆشنبیر و خوێندەواری نوێ بێتە کایەوە ئەگەر کارێک نەکرێت کە جۆرە هەست و سۆزێک لەناو خەڵکدا دەربکەوێ و ئەوانەی کە ئەیانەوێ بخوێنن ئەچنە تورکیا و بیروت لە بریتی ئەوەی بچنە قوتابخانەیەک کە ئینگلیز چاودێری بکات، (ئەمەش لایەک لەو تەقەلایەی سۆن دەرئەخا کە بەرواڵەت هەوڵی ئەدا خزمەتی زمانی کوردی بکات).

سۆن لە شوێنێکی تری ئەو راپۆرتەیدا دەربارەی سنووری دەسەڵاتی حوکمدارییەتی شێخ مەحمود ئەدوێ و مژدە ئەدا بەکاربەدەستانی بەغدا کە سنووری شێخ مەحمود زۆر تەسک بوەتەوە و کەم کراوەتەوە کە ئەڵێ:

«گەورەترین پەرەسەندنی دەسەڵات و فراوان بوونی ناوچەی کوردستان (دەسەڵاتی شێخ مەحمود) لە مانگی شوباتی ١٩١٩ دا پێکهات کە لەو کاتەدا کفری و کەرکوکیشی گرتەوەو هەتا ئەولای رەواندزیش چووبوو، بەڵام لەمانگی مارتی ١٩١٩ دا کەرکوک جیا کرایەوەو کرا بە ناوچەیەکی سەربەخۆ و کفریش لە مانگی حوزەیرانی ١٩١٩ دا لابرا و بەدروست بوونی ئیدارەی هەولێر کۆیەشی جیا کردەوە و کۆیە خرایە سەر هەولێر ... بەو جۆرە لەدوای ئەو لێک پچڕاندنانە، ئێستە رووی پێوانەی ناوچەی سلێمانی لە نێوانی ..٦٥- ...٧ کیلۆمەتری چوارگۆشەییدا ماوەتەوە کە ئەکەونە نێوانی زنجیرە شاخەکان و چەند دەشتێک کە ئەکەوێتە نێوان بازیان و شارەزوور و هەندێ ناوچەی رانیە و قەڵادزە. کە بەو پێیە ئەتوانین بڵێن ئەو ناوچەیە لە شاخەکانی قەرەداغەوە هەتا ناوچەکانی (ئاکۆ) ئەگرێتەوە ».

سۆن لە بەشێکی تری راپۆرتەکەیدا باسی هێزی لیڤی و پۆلیس و سەربازەکانی ئەو سەردەمە ئەکا و ئەڵێ:

« که ئەفسەرە سیاسیەکانمان بۆ یەکەم جار هێزی پۆلیسیان دامەزراند، هەندێ پۆلیسی دەوری عوسمانلی هەبوو (لە زەمانی عوسمانلیدا بە پۆلیس ئەوترا - زەفتیە)، بەلاّم نەک بە شێوەیەکی رەسمی شێخ مەحمود زۆری کرد کە ئەبێ تاهیر ئەفەندی (نیازی لە تاهیری حەمە ئەفەندی بووە کە لە خێڵی فەرخە بووە) بکرێت بە مودیری پۆلیس، ئەو تاهیر ئەفەندیە پیاوێکی رەق بوو، پیاوی شێخ مەحمود بوو بۆیە شێخ مەحمود پێی داگرت کە ئەبێ دابمەزرێنرێت.

سۆن لە راپۆرتەکەیدا ئەڵێ: ژمارەی پۆلیسەکان ٤٠ - ٥٠ پۆلیس ئەبوون، مرۆڤی ناسراوو رێزلێگیراو لەو رۆژانەدا نەدەبوون بە پۆلیس، چونکە ناوبانگی پیسیان زۆر پیس و گلاّو بوو ناویان لای خەڵک زڕابوو ئەفسەرە سیاسیەکان لەگەڵ ئەو پۆلیسانەدا تووشی گەلێک سەرئێشە بوون کە شێخ مەحمود خۆی ئەوامری بۆ دەرئەکردن (لە یاداشتەکانی شێخ رەئوفیشدا باسمان کرد).

سۆن لە هەمان راپۆرتدا ئەڵێ: لە ٢٤/ی نیسانی ١٩١٩ دا گەیشتمە سلێمانی سەیرم کرد بار و هەڵوێست زۆر ئاڵۆز بوو، ئاژاوە هەموو لایەکی گرتبووەوە (وەکو خۆیان هیچ دەستێکیان نەتوێت لەو ئاژاوەنانەودا) هیچ تاوان بارێک بەرامبەر بەو تاوانەی کە ئەیکرد سزا نەئەدرا، لەبەر ئەوە داوام لە شێخ مەحمود کرد پێویستە تاوان بار لە ماوەی (٢٤)سەعاتدا بگیرێت، من ئەمزانی شێخ مەحمود گوێ ناداتە ئەوقسەیەی من بەلاّم ئەمویست بیکەم بە بیانوویەک بۆ ئەوەی وەکو دەسکەلایەک بەدەستمەوە بێ بۆ رۆژی خۆی. هەرچۆنێک بوو تاهیر ئەفەندی لابراو (عەونی ئەفەندی) کە ئەفسەرێکی لیڤی بوو لەجێی ئەو داندرا، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاشکرا هەرەشە لە عەونی کرا بەلاّم گوێی نەدایە ئەو هەڕەشە و گوڕەشەیە و کاروباری خۆی بە باشی ئەبرد بە ڕێوە.

بۆ دابین کردنی ئاسایش لە ناوچەی عەشایەرەکاندا ئەو کارە سپێردرا بە عەشایرەکان و ئەو شوێنانەی دەسەلاّتی سەرۆک عەشیرەتی تیادا نەبوو هێزی لیڤی داندرا کە لە ١٩١٩/٥/١ دا ژمارەی ئەو هێزی لیڤیە بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

| | ژماره |
|---|---|
| ئەفسەری ئینگلیزی | ٢ |
| ئەو بەریتانیانەی کە دەرەجەی تریان هەبوو | ٣ |
| ئەفسەری کورد | ٣٦ |
| نائیب ئەفسەر | ٦ |
| دەرەجەدار (مراتب) | ٦٥ |
| سەرباز | ١.٥٥ |
| کاتب | ١. |
| موراسیل | ٥١ |
| ئێشکچی(حرس) | ٣٨ |

جلوبەرگی هێزە کۆنەکان بریتی بوو لە جلوبەرگی کوردی کە لەناوچەکەدا دەست ئەکەوت.

لە ١٩١٩/٥/٢. دا هێزەکان بلاْوەیان لێ کرد (نیازی لەو ڕۆژانەیە کە هێزی ئینگلیز کە لیڤیان بە هی خۆیان دانابوو لەگەڵ هێزی پێشمەرگەکانی شێخ مەحموددا کە زۆربەیان بریتی بوون لە چەکدارەکانی مەحمود خانی دزلی ڕووبەڕووی یەک بوونەوە و وازیان لە ئینگلیزەکان هێنا ـ وەکو لە باسی ڕووبەڕووبونەوەی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا باسی ئەکەین).

سۆن لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا ئەڵێ :بەلاْم لەگەڵ ئەوەشدا سوارەی عەشایرەکان یەکەم تاقم بوون کە خیانەتیان لە ئێمەکرد (نیازی لە هێزی ئەو عەشیرەتانەوە کەسەر بە ئینگلیز بوون فریای ئەوە نەکەوتبوون کە لەسەرەتای ڕووبەڕووبوونەوەدا یارمەتی ئینگلیزەکان بدەن».

لەبەر ئەوەی مێجەرسۆن دەورێکی زۆرکاریگەری هەبووە دژی شێخ مەحمود و دژی کوردو کوردستان (ئەگەرچی بەرواڵەت بۆ مەبەستێکی تایبەتی هەوڵی داوە خزمەتی زمانی کوردی بکا) بوە و کورتەکی ڕاستەقینەی کاربەدەستانی ئینگلیز بووە لە ڕوخاندن و نەهێشتنی یەکەم حوکمدارییەتی دا کەهیوای ئەوەی لێ دەکرا ببێت بەبناغەیەکی پتەو بۆ دامەزراندنی حکومەتی دوارۆژی کورد، وەکو

چۆن باسێکی تایبەتیمان بۆ (نوئێل) تەرخانکرد، بەپێویستم زانی باسێکی تایبەتیش بۆ مێجەرسۆن و رۆڵی مێجەرسۆن تەرخان بکەم.

## ELY. Baniszer sone میٚجرسۆن

ئینگلیزەکان دەمیٚک بوو میٚجرسۆنیان بۆ ئەوە گۆش کردبوو کە فرمانیٚکی تایبەتی پیٚ بسپیٚرن. ئەو گەشتەی لە ساڵی ۱۹۰۹دا کردبووی بۆ ناوچەی سلیٚمانی و بۆناو جافەکانی هەڵەبجە گەشتیٚکی ئاسایی و خۆڕایی نەبوە و بۆ گەشت یا خود بۆ کاسبی و بازرگانی نەبوە بەڵکو ڕاسپیٚرراوی دەزگاکانی ئەو سەردەمەی ئینگلیز بوە کە لە هندستان دا شەرکەی ئەفریقی و شرکەی نەوتی ئنگلۆئیٚرانی سەرپەرشتیکردنی ئەو ئینگلیزەنانەی کردوە کە نیٚرراون بۆ ڕۆژهەلاٚتی ناوەڕاست و سۆن هەر لە خۆیەوە ئەو ڕیٚگەیەی نەگرتوەتە بەر و بەخۆڕایی فیٚری زمانی فارسی و کوردی نەبوە بەڵکو حیسابی دوا رۆژی بۆ کراوە.

سۆن لەگەشتەکەیدا لە ساڵی ۱۹۰۹دا (وەکو لە باسی باری کۆمەلاٚیەتی لە کوردستاندا بە دوورودریٚژی باسمان کرد) کە بەناوی بازرگانیەوە چوە هەڵەبجە و ماوەیەک لە ناو جافەکاندا مایەوە پیٚوەندی یەکی گەرمی پەیداکردوە لەگەڵ عەدلی خانمی ژنی وەسمان پاشا و کوڕەکانیا و خانمی ژنی وەسمان پاشا ئەگەرچی بە رواڵەت هەندیٚ جار دۆستایەتی خۆی پیشان دابوو بەرامبەر بە نەوەی کاک ئەحمەد و کە شیٚخ مەحمود بۆ جاری دوهەم لە ساڵی ۱۹۲۲دا کرایەوە بە حوکومدار و خانم بۆ پیرۆز بایی کردن لە شیٚخ مەحمود بەخۆی و دەستەودایەرەیەوە چوە سلیٚمانی و شیٚخ مەحمود پیٚشوازی لیٚ کردو حامد بەگی جاف لە سەرەتادا بۆ ماوەیەک لەگەڵ شیٚخ مەحمودا بوە و سەردەمیٚکیش ئینگلیزەکان ڕاویان نابوو بۆ دەرەوەی هەڵبجە و بە دوایا ئەگەڕان بەلاٚم بە شیٚوەیەکی گشتی وەکو یاسا و سروشتی هەموو عەشایەریٚک وە نەبوویێ شیٚخیانیان خۆشویستبیٚت وەکو لە باسی بنە ماڵەی شیٚخان و جافەکاندا باسمان کرد، بیٚگومان میٚجەرسۆنی زیرەک و وریا ئاگاداری ئەو ناکۆکیەی نیٚوانیان بوە و زانیویەتی کە شیٚخان لەو کارەساتەی موصل دا لە مەحمود پاشای سەرۆکی لقی اتحاد و تەرەقی دڵگیربون و ئەو قینەی بەخۆرایی لە دڵ دەرنەچوە، بۆیە

مێجەرسۆن ئەو ناکۆکیەی قۆستوەتەوە و توانی لە دواییدا کە کرا بە حاکمی سیاسی لە سلێمای زۆر وەستایانە ئەو ناکۆکیە کۆنە بۆ سوودی خۆی و سوودی سیاسەتی حوکومەتەکەی بەکاربێنێت.

مێجەرسۆن هەر لە کاتی ئەو گەشتەیەوە سا یا بە هۆی کارتیٚکردنی خانمی وەسمان پاشاوە بوبێت یا بە هۆی ئەوەی کە شێخان لووت بەرزیی سۆنیان پیٚ قبولٚ نەکرا و ئەو قینەی لە بنە ماڵەی شێخان بوە و لە کتێبەکەیدا «٣٩» بە ئاشکرا لە باسی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودا ئەڵێ شێخ سەعید کابرایەکی پیاوکوژ بوە بە زۆر زەوی و زاری لە خەڵک داگیزکردوە (کەچی سەیر ئەوەیە هەر لەشوێنێکی تری کتێبەکەیدا ئەوەی بیرچوەتەوە و نوسیویەتی کە شێخ سەعید ناوبانگی زۆر بەرزبوە و لای خەڵک و هەموان زۆر باش ناسراوبوە).

شێخ رەئوفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا باسی یەکێک لەو هۆیانە ئەکا کە مێجەرسۆن رقی لە شێخان بوە ئەڵێ:«٢١»

«میجەرسۆن لە کتێبەکەیدا باسی سەید نوری نەقیبی کردوە و جنێوی خراپی پیٚ داوە، لە کاتی خۆیدا لە سەید نوری نەقیبم پرسی کە هۆی ئەو ڕقەی مێجەرسۆن چی بوە لیٚی لە وەرامدا پێی ووتم: وەختی خۆی کە مێجەرسۆن لە ساڵی ١٩٠٩دا بەناوی میرزا حسێن غلامی شیرازی هاتە سلێمانی من هات و چۆی مێجەرسۆنم ئەکرد، ژنێکی ئێرانی زۆر جوانی هەبوو مێجەرسۆن وای ئەزانی حەزم لە ژنەکەی کردوە بۆیە هات و چۆی ئەکەم ... ئەو قینەی هەر لە دڵا مابوو، لە دواییدا کە بو بە حاکمی سیاسی سلێمانی لە دوای ئاوارەکردنی شێخ مەحمود بۆ هندستان ڕقی لیٚ هەڵگرتم و بە ئاشکرا هەر رۆژەی بیانوویەکی پیٚ ئەگرتم و لە ئەنجامدا بیانووی ئەوەی پیٚ گرتم کە من قەرزاری حکومەت بووم و نەمداوەتە، بۆ ئەوە سەرانەیەکی زۆری لە سەر دانام و منیش نەمبوو پارەکەی بدەم ناچاربووم گوندێکم فرۆشت و پارەکەم دایە»

لە راستیدا سۆن کابرایەکی زۆر ڕق هەڵگربوە و بە هیچ جۆرێک لیٚ بووردن و لیٚ خۆشبوونی لا نەبوە و خەڵکی ئەو سەردەمە زۆر شتی سەیری مێجەرسۆنیان بۆ ئەگێڕاینەوە ... جارێک حەمەی حاکم (حەمە درێژ) کە لە کۆتایی ژیانیدا لە

گوندی (موغاغ)ی حەمەد بەگی حاجی رەسولْ بەگ دائەنیشت شتێکی سەیری بۆ گێڕاینەوە دەربارەی قینی سۆن و ووتی : مێجەرسۆن کە ڕقی لە یەکێک هەڵبگرتایە قەت دڵی لیْ پاک نەئەبوەوە و پاکانە و لیْ خۆشبوونی لا نەبوو، لە ساڵی ۱۹.۹دا کە مێجەرسۆن بە ناو خەریکی کاسبی و ڕۆن و خوری کڕین بوو لەگەڵیا چووم بۆ دەوروبەری شارەزور لە نزیکی پردەکەی تانجەڕۆ چەند زەلامێکی چەکدارمان لیْ پەیدا بوو ڕۆنەکانیان لیْ سەندین و بە بەتاڵی گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، لە ساڵی ۱۹۱۹دا لە دوای ئەوەی شێخ مەحمود نێررا بۆ هندستان و مێجەرسۆن بوو بە حاکم، تاقمێکی بە کریْ گرت و کەوتە سۆراخکردنی ئەو زەلامانەی کە بەر لە حەوت هەشت ساڵ روتیان کردبوینەوە ... پارەیەکی زۆری خەرج کرد هەتا ئەو زەلامانەی دۆزیەوە بە شەق پارەی ڕۆنەکەی لیْ سەندنەوە کە لە راستیدا پارەکە زۆر لەوە کەمتربوو کە بۆ ئەو مەبەستە خەرجی کردبوو.

لە راستیدا ئەو قینەی سۆن بەرامبەر بە شێخان کارێکی زۆری کردبوە سەر کاربەدەستانی ئینگلیز لە بەغدا و لە راپۆرتەکانیا هەمیشە دژی شێخان هانی ئەدان و هەمیشە هەوڵی داوە ناویان بزرێنیْ و تووشی هەرایان بکات، یەکێکی وەکو مس بێلْ بە هۆی ئەو راپۆرتانەی کە مێجەرسۆن ناردبوی بۆ حاکمی گشتی بریتانیا لە بەغدا لە لاپەڕە (۹)ی کتێبەکەیدا «***» ئەڵیْ:

شێخ مەحمود لە نەوەی کاک ئەحمەدی شێخە کە کاک ئەحمەد پیاوێکی زۆر موقەدەس و بە ناوبانگەو لە سلێمانیدا نێژراوە، بەڵام دەسەلاْتی شێخ مەحمود جگە لە ڕووی ئاینیەوە، لەوەشەوە هاتوە کە خەڵک بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی زۆری لیْ ئەترسان، بە تایبەتی ئەو دەس درێژی و پیاو کوشتنەی کە پیاوەکانی بە ناوی شێخ مەحمودەوە ئەیانکرد.

بێگومان کارتی کردنی راپۆرتەکانی مێجرسۆن لەو کتێبەی مس بێڵدا زۆر ئاشکرایە، ئەگەر شێخ مەحمود ئەو پیاوکوژ و درندەیە بووبیْ کە سۆن و مس بێلْ باسیان کردوە ئەی چۆن ئەو ...۱ـ ..۱٥ کوردەی کە لەگەڵ خۆیدا بردبوونی بۆ غەزا و شەڕی شعێبە هەروا بە ئاسانی دوای کەوتبون؟ یا بۆ شەڕی پێنجوێن و مەریوان چۆن چون لە گەڵیا؟ ئایا قینی هەردوکیان و کار بەدەستانی

تریش لە شێخ مەحمود ناگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕقەی کە لێیان هەڵگرتبوو لە بەشداری کردنیا لە سەڕی شعێبە، بەتایبەتی زۆر نووسەران دانیان بەوەدا ناوە کە ویڵسنی حاکمی گشتی بریتانیا هەر لە سەرەتاوە شێخ مەحمودی خۆش نەویستوە؟ ویلسن لە کتێبەکەیدا بە چاوێکی سووکەوە سەیری بەشداربوونی کوردی کردوە لە شەری شعێبەدا.

لە ڕاستیدا مێجەرسۆن ئەگەرچی خۆی کابرایەکی لووت بەرز و لە خۆبایی بوە، بەڵام وابزانم ئەو لووت بەرزی و لە خۆبایی بوونەی هەموی هەر لە خۆیەوە نەبوە بەڵکو ڕاسپێرراو بووە و هاندراو بوە و وەختێک نێررابو بۆ سلێمانی کە حوکومەتی ئینگلیز سیاسەتی خۆی بەرامبەر بە کورد و شێخ مەحمود گۆڕی بوو، ئینگلیزەکان سروشت و رەوشتی شێخ مەحمودیان تاقی کردبوەوە و زۆرجار بە سەرچڵ و کەللە ڕەق ناویان هێناوە بۆیە حسابیان کردبوو بە یەکێکی لووت بەرزی وەک مێجەرسۆن نەبێت شێخ مەحمودیان بۆ دانامرکێتەوە و ئەو دامرکاندنەی کە ئەوان ئەیانویست بە میجەر نوئێل نەدەکرا بۆیە مێجەرسۆن و گرێنهاوسیان دەس نیشان کرد و نەخشەیەیان بۆ کێشان بۆ لەناوبردنی شێخ مەحمود.

کاربەدەستانی ئینگلیز بە جۆرێک لە شێخ مەحمود پڕبوبون بە هۆی ئەو ڕاپۆرتانەی سۆنەوە کەبەر پەرچی بۆچوون و پێش نیازەکانی وەزارەتی هندستانیشیان ئەدایەوە کە لەو ڕۆژانەدا سەرپەرشتیکەری کاروباری ناوچەی مسیۆپۆتامیا و ویلایەتی موصلْ بوە ...

بۆ نموونە:

کە ساتێک سکرتێری وەزارەتی هندستان بروسکەیەکی نارد بۆ نوێنەری بریتانیا لە بەغدا کە لەو بروسکەیەدا وترابوو: «١٤»

وادیارە چار نیە ئەبێ واز لە کوردستان بێنین بۆ ئەوەی ڕێگە نەدرێ زیان بە ئارام و ئاسایشی میسوپۆتامیا بگا و بۆ ئەوەی کارەکەمان بە ئەنجام بگا و لە بروسکەکەدا سکرتێری وەزارەتی هندستان وتبووی کە بەلای مێجەر (نوئێل)ەوە سێ مەرج هەیە

١ـ پێویستە دەسەڵاتی تورکیا لە کوردستاندا نەهێڵرێت.

٢ـ ئەبێ کوردستان لەت و پەت نەکرێ (ئینگلیزەکان لەدوای حوکومداریەتی یەکەم و بەر لەوەش نیازیان ئەوەبوە کوردستانی خوارو بکەن بە چەند ناوچەیەکی جیا جیا و هەرلایە لە ژێر سەرکردایەتی یەکێکد بێ و لەژێر چاودێری خۆیاندا ببرێ بەرێوە).

٣ـ لە کاتی دەست نیشانکردنی سنوری کورد و عەرەبدا پێویستە هێڵی نەتەوایەتی دیاری بکرێ ...

جگە لەوە نوئێل لای وایە ئەگەر کارمان بەسەر چارە نووسی کوردەوە نەبێ هەموو کوردەکان حەز بە دۆستایەتی بریتانیا ئەکەن و پێویستیان بە یارمەتی و هاندانی کەس نابێت بۆ ئەوەی تورکەکان لە دەرەوەی سنور بهێڵنەوە لە سەرێکی ترەوە نوئێل لای وایە لەت و پەت کردنی وڵاتی کوردستان و لکاندنی بە میسۆپۆتامیاوە هەل و دەرفەتێکی لە بار ساز ئەکا بۆ پرو پاگەندەی تورکەکان دژی بریتانیا».

لە وەرامی ئەو بروسکەیەدا حاکمی گشتی بریتانیالە بەغدا لە ١٩١٩/١١/٢٦دا بەم جۆرەی خوارەوە وەرام ئەداتەوە:

«نیشانە بە بروسکەکەتان، هەر سێ مەرجەکەی نوئێل رەدئەکەینەوە و لەگەڵ هیچیاندا نین»

بێگومان ئەو وەرامەی کە لە لایەن حاکمی مەدەنی گشتی بریتانیا لە بەغدادەوە نێررابو بۆ سکرتاریەتی وەزارەتی هندستان (کە سەرپەرشتیکەری کاروباری میسوپۆتامیا بوە لەو رۆژانەدا) بە بێ پرس و سەرنجدانی مێجەرسۆن وەرامی نەدراوەتەوە بەڵکو مێجەرسۆنی دژ بە کوردستان بە هیچ جۆرێک دەرفەتی ئەوەی نەداوە کە باسی مافی نەتەوەی کورد بکرێت.

لێرەدا بە پێویستم زانی کە شتێکی زۆر گرنک هەیە دەربارەی ئەورۆژانە روونی بکەمەوە ئەویش ئەوەیە میجەر نوئێلی لابراو (دوای ئەوەی سیاسەتی بریتانیا بەرامبەر بە کوردستان گۆررا) مێجەرسۆن نێررا بۆ سلێمانی و کرا بە حاکمی سیاسی بۆ ئەوەی ئەو سیاسەتە تازەیەی کە کاربەدەستانی بریتانیا بریاریان لەسەر دابوو کە لە خوارەوی کوردستاندا جێ بە جێ بکرێت، کە مێجەرسۆن چوە سلێمانی بە هیچ جۆرێک بایەخی بە بوونی شێخ مەحمود نەداوە

(وەکو لە دواییدا لە باسی یاداشتەکانی ئەحمەد خواجادا روونی ئەکەینەوە)و میجەرسۆن بوە بە کەڵگای ناوچەکەو بە ئارەزوی خۆی کاروباری بردوە بەڕێوە و راپۆرتی پەیتاپەیتای ناردوە بۆ کاربەدەستان دەربارەی چالاکییەکانی خۆی و رەخنە گرتن لە کاروباری میجەر نوئێل و وای لە کاربەدەستانی بریتانیا گەیاندوە لە بەغدا کە هۆی سەرەکی یاخی بوونی شێخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیزەکان هەڵە و ساردی و کورتبینی مێجەرنوئێل بووە، بۆیە مێجەر نوئێل بەرامبەر بەو ڕخنەو سەرزەنشانە بێدەنگ نەبوە و لە ساڵی ۱۹۲۱دا کە بەهۆی لووت بەرزی و ڕەفتاری درندانەی مێجەرسۆن و ئەفسەرە سیاسیەکانی تری بریتانیا لەگەڵێک شوێنی خواروی کوردستاندا (جگە لە سلێمانی) لە زۆر شوێندا هەڵوێست ئاڵۆز بووە و خەڵک بێزاری خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر بەو ڕەفتارەی ئەفسەرە سیاسیەکان کە لە ڕاستیدا ئەو کردەوانەیان لە ئەنجامی گۆڕینی سیاسەتی بریتانیاوە بوە ... بۆیە مێجەر نوئێل لە ڕاپۆرتێکیدا بە دوورودرێژی وەرامی ئەو ڕەخنە و سەرزەنشانەی مێجەرسۆنی داوەتەوە و بەر پەرچی بۆچوونەکانی بوە (کە ئەمە نیشانەی بوونی کێشەیەک بوە لە نێوان هەردوکیان) کە ئەو کە ڕاپۆرتە لەدوکیومێنتی ژمارەی دوکیومێنت (c.o.730-13) ساڵی ۱۹۲۱دا بلاوکراوەتەوە.

ئەوەی پێوەندی بەم باسەی ئێمەوە هەیە لەو راپۆرت و دوکیومێنتە دا ئەڵێ:

« شێخ مەحمود تاقە کەسێک بووە کە لە ناوچەکەدا دەسەلاتی هەبوە و توانیبوی دەست بەسەر هەڵوێستدا بگرێت ...

ئەوە ڕاست نیە کە مێجەرسۆن لە نامەیەکیدا ـ ڕاپۆرتێکیدا ـ ووتویەتی گوایا ئێمە (نوئێل) یارمەتی شێخ مەحمودمان داوە بۆ ئەوەی خۆی بکا بەزۆرداری ناوچەکە هەر لە سنووری ئێرانەوە هەتا شەمزینان و جەبەل حەمرین و ئەگەر ماوەی پێ بدرایە هەوڵی ئەدا ڕەواندزیش بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

ئەو دەستوورەی بە شێخ مەحمود درابوو لەلایەن حاکمی گشتی مەدەنییەوە لە کانونی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۸دا ڕێگەی ئەوەی دا بە شێخ مەحمود کە حوکمرانی ئەو ناوچانە بکات کە ئەکەونە نێوان سنووری ئێران هەتاکو زابی گەورە، ئەو دەسەلاتە هەتا مانگی شوباتی ساڵی ۱۹۱۹ دەوامی کرد و لەو کاتەوە ئیتر

حاکمی مەدەنی گشتی بڕیاری دا ئەو دەسەڵاتەی شێخ مەحمود بوەستێنرێت.

هەتا ئەوکاتە (یەعنی شوباتی ۱۹۱۹) هیچ پشێوی و ناکۆکیەک لە ئارادا نەبوو، وڵات بێ ئاشووب بوو، ئاسایش بەرپا بوو، هەتا ئەو کاتە کوردەکان و کاربەدەستانی شێخ مەحمود خۆیان وەکو دۆستی ئێمە پیشان ئەدا ... کەواتە دەرئەکەوێ ئەو بڕیارەی کولۆنێل ویلسن بوو کەلە مانگی کانونی یەکەمی ۱۹۱۹دا وای ئەگەیاند کە:

۱ـ دەزگایەکی خود موختاری لە کوردستاندا دامەزرێنرێ بە مەرجێک ئەنجامێکی خراپ و دیژواری نەبێت بۆ ناوچە هاوسێ عەرەبیەکان کە لە لایەن بریتانیاوە ڕاستە و خۆ حوکوم ئەکرا»

( کەواتە ئەگەر خود موختاریش بووبێت ئەوەی کوردستان بەر لە عیراق پێک هاتبوو چ جای ئەو دەوڵەتە کوردیەش کە لە کوردستاندا بەر لە هاتنی فیصل لە عیراقدا پێک هێنراوە لە شوێنی خۆیدا (لە بەرگی دووهەمدا) روونی ئەکەینەوە، بەتایبەتی لەو مەقالەیەی کە لەلایەن تەوفیق وەهبی یەوە لە لوبنان بلاْوکرایەوە لە ڕۆژنامەی (الراصد)ی بەیروتی ژمارە (۳۷٦٦) و ڕۆژی ۱۹۳۲/۸/۲٤ کە لە باسی شۆرشی ئەیلولی ۱۹۳۰دا مەقالەکەی بە کوردی بە شێوەیەکی کورتی بلاْو ئەکەینەوە، ئەمانە دەرئەخا کە چ ئۆتۆنۆمی بووبێت چ حوکومداری، کورد لە پێش عەرەبی عیراقدا خاوەن دەسەڵات بووە).

لە هەمان ڕاپۆرتدا لە فەقەرەکانی تریشدا ئەڵێ: «

۲ـ هەندێ لەوانەی کە لەناوچەکەدا لەسەر کاربۆن ناڕاست و زۆرداربوون کە ئەمەش تا ڕادەیەک بوە بە هۆی بێزابوونی خەڵک کە ئەمەش لەگەڵ پێویستیی سەرشانی ئێمەدا یەکی نەدەگرت (بێگومان مەبەستی لەڕەفتاری ئەو ئەفسەرە سیاسیانەی تری بریتانیا بوە کە کردەوەکانیان بووە بە هۆی بێزاربوون و ڕاپەڕینی کورد لە هەمو ناوچەکانا وەکو ئەوانەی ناوچەی بادینان و بارزان و ناوچەی سورچی و هەندێ شوێنی تر، کە زۆریان لەو ئەفسەرانە کوژران)

۳ـ پشت بە دۆستایەتی و دڵسۆزی ئەو تاقمە سوپاییە نابەسرێت کە لە ناوچەکەدا دائەمەزرێت بەتایبەتی ئەوانە لە دوای ئەوەی جێگا پێی خۆیان پتەو ئەکەن و ڕەگ دائەکەوتن و ئەگەنە ئەوەی هەست بە سەربەخۆیی بکەن»

نوئێل لە راپۆرتەکەیدا لەسەری ئەرواو ئەڵێ:

«مێجر       لە مانگی مارتی ۱۹۱۹دا نێررا بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی ببێتە جێگری من (نوئێل)، ئەوەبوو لەپاش دوومانگ شۆرش روویدا و بەناچاری هێز بەکار هێنرا ...

مێجەرسۆن لە راپۆرتەکەیدا وئەڕیئی «هۆی ئەو رووداوانە لە ئەنجامی سروشت و جۆری ئەو سیاسەتەوە پەیدابوبو کە لە کاتی خۆیدا بە هەڵەبەکار هێنرابوو وە بەراست نەئەزانرا ...، بەلاّم لە راستیدا بەلای منەوە (نوئێل) هۆی ئەو رووداوانە هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو کردەوە پێچەوانانەی کە لەلایەن سۆنەوە بەکار هێنرا و لەگەڵ ئەو سیاسەتەی کە دانرابوو یەکیان نەئەگرتەوە.

هەتا کاتی لابردنی من (نوئێل بە ئاشکرا لە راپۆرتەکەیدا ئەڵێ لابردنی من نەک وازهێنانم لە کار وەکو حاکمی سیاسی سلێمانی بە ئارەزۆی خۆم، وەکو هەندێ نووسەر لەو روەوە وایان نیشان داوە کە مێجەر نوئێل بە ئارەزوی خۆی وازی لەو کارە هێناوە)، شێخ مەحمود بەپێی ئەو نەخشەو دەستوورە ئەجوولایەوە کە بۆی داندرابوو (ئەمەش وەرامێکی راست و رەوانە بۆ زۆر کەس لەوانەی کە ئەڵێن شێخ مەحمود هەڵەی زۆربوە کە بەپێی راوێژی ئینگلیزەکان رەفتاری نەکردوە و بە خۆرایی سەرپێچی کردوە و ئەگەر وای نەکردایە ئەو هەڵەی ئەوسامان لە کیس نەدەچوو).

نوئێل لە راپۆرتەکەیدا ئەڵێ: «ئەمانزانی حوکمی شێخ مەحمود لە کاروباردا هەندێ هەڵە و ئارەزووکاری تیادابوو، بەلاّم بەلای منەوە مافی خود موختاری ئەوە ئەگەیەنێت کە پیاو بتوانێت حوکمی خۆی بەراستی یا بە چەوتی کاروباری خۆی ببات بەڕێوە و من هیوای ئەوەم هەبوو کە ئامۆژگاری کردنی دۆستانە و کار رێکخەری کاربەدەستی سیاسیی جێنشینم بکەم کە لە چەوتیی حوکوم کەم بکاتەوە، بەلاّم بڕیاری گۆڕرانی سیاسەت بەرامبەر بە کوردستان دەرچوو بەبێ ئەوەی ئەو پرسیارانە کە لە ناوچەکەدا هەبوون بخرێتە بەر چاو و حیسابی بۆ بکرێت»

لە دوکیومێنتەکەدا ئەڵێ: لێ پرسراوانی ناوچەکە ئەمانە بوون

۱ـ کۆلۆنێل گۆردن ۆکر Colonel Gorden Walker که ئەفسەری مەسئولی

ئێستایە (یەعنی هی ساڵی ١٩٢١).
٢ـ مێجەر دانلیس ـ لێ پرسراوی هێزی لیڤی Majgor.Daniles
٣ـ مێجەر نوئێل ئەفسەری سیاسی
ئێستە حاڵی خازر ئەو (٣) ئەفسەرە هەرسێکیان لە ئینگلتەرەن و کۆبونەوەیان هەیە کە پێکەوە ئەو کۆبونەوەیان شتێکی زۆر بەجێیە (مێجەرسۆنیان لەگەڵا نەبوە) چونکە لام وایە گفت و گۆ و بیروباوڕیان بەو قسانەی مێجەر نوئێل باسی کردوە شتێکی بەنرخ ئەبێت».
لە بەشێکی تری راپۆرتەکەی نوئێل کە لەو دوکیومێنتەدا بلأوکراوەتەوە نوئێل ئەڵێ:
«شێخ مەحمود حوکم درا بە (١٠)ساڵ و ئێستە لە بەندیخانەیەکدایە لە هندستان، بەپێی تاقیکردنەوەیەک کە لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەم بووە هەتا مارتی ١٩١٩ وە لە رێڕەوی گفت و گۆما لەگەڵ ئەو لێ پرسراوانەی کە شێخ مەحمودیان ناسیوە، بڕوام وایە وە لام وایە پیاچوونەوەیەک بەرامبەر بە شێخ مەحمود شتێکی بەسوود و باش بێت، لەم روەوە باوەڕی کۆلۆنێل گۆردن ۆکر و مێجەر دانلیس شتێکی پێویستە ... شێخ مەحمود وەختێ دۆستایەتی خۆی بۆ ئێمە دەربڕی بوو، لە زستانی ساڵی١٩١٧/١٩١٨دا دژی تورک یاخی بوو، ماوەیەک پێش نیازکرا شێخ مەحمود بکرێت بە نوێنەری ئێمە لە سلێمانی، بەڵام لەبەر کشانەوەمان ئەو کارە لە سەرەتادا سەری نەگرت و بڕواشم وایە کە تورکەکان لەکاتی خۆیدا ئاگاداری ئەوپێش نیازەی ئێمە بوون کە شێخ مەحمود بکرێ بە نوێنەری ئێمە.
لە دوای وەستاندنی شەڕی جیهانی، شێخ مەحمود تاکە کەسی دەسەڵاتداربوو کە من وەکو مەسئولێکی سیاسی ئینگلیز لە شاری سلێمانیدا پێشوازی لێ کردم، ئامۆژگاریەک کە من دابووم ئەوەبوو کە شێخ مەحمود بکرێت بە نوێنەرمان لە سلێمانی و کە لە بەغدادەوە هاتمە سلێمانی کاربەدەستانی خۆمان ئاگاداریان کردم و پێیان وتم: نابێ بەتەمای ئەوەبی هیچ سەربازێکی ئینگلیزت بۆ بنێررێت بۆ کوردستان، بەڵکو پێویستە هەوڵی ئەوەبدەم لەگەڵ ناودارانی ناوچەکە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبار و بۆ ئاسایش هەوڵبدەم سازبکرێ.

به گەیشتنم بۆ سلێمانی بۆم دەرکەوت شێخ مەحمود بەهێزترین کەس بوو لەو ناوچەیەدا و بەبێ دۆستایەتی و هاوکاری ئەو پیاوە لە توانادا نەبوو ئاسایشی ناوچەکە ڕابگیریت و بەرپاربکرێت.

بەبێ دۆستایەتی و هاوکاری شێخ مەحمود ئەبوایە هێزێکی سوپاییمان بە کێش بکردایە بۆ ناوچەکە کە لەو ڕۆژانەدا شتێک بوو بیری لێ نەدەکرایەوە لە ئەنجامی ئەوەدا بەشتێکی باشم زانی شێخ مەحمود بکرێت بە نوێنەری ئێمە و پاش دوو هەفتە کۆلۆنێل ویلسن هەنگاوێکی زیاتر و بەرەو پێشتری ناو نامەیەک درا بە شێخ مەحمود کە سەرکردایەتی پەسەند کرا لە ناوچەی دیالەوە هەتا زابی گەورە بە مەرجێک کوردەکانی ئەو ناوچانە بە ڕەزامەندی و ئارەزوی خۆیان ئەو سەرکردایەتیەی ئەو قبولْ بکەن.

لە ماوەی دوو هەفتەدا زۆربەی عەشیرەتەکان هاتنە ناو ئەو کۆنفیدراسیۆنەوە.

لە دوکیۆمێنتەکەدا ئەڵێ: هەڵوێست و بۆچوونێک ئەگەر دژی شێخ مەحمود هەبوبێت لەم ڕاپۆرتەی خوارەوەی مس بێلْ دا دەرئەکەوێت کە ئەڵێ:

« شێخ مەحمود نوێنەر و دەم ڕاستی ئاغاکان بوو، ئەو دەسەڵاتە بەهێزەی ئاغاکانیش هەر لە خراپەدا دیاربوو، وەکو گەورەیەکی ئاینی شێخ مەحمود هێزێک بوو فەرامۆش نەدەکرا و نەدەبو هیچ گۆڕانێکی کوت و پڕ لە هەڵوێستدا بەرامبەری بکرێت، بەڵام دەرکەوت پێشکەوتن و پەرژەوەندی گشتی نەدەهاتە ناو هەتا ئەو (جنۆکە ـ درنجە)ی لە شووشەکەی حەزرەتی سلێمانەوە هاتبوە دەرەوە نەخرێتەوە ناو شووشەکەی»

بەڵام مێجەر نوئێل لە ڕاپۆرتەکەیدا کە لە دوکیومێنتی ژمارە C.O.730-13 ی ساڵی ١٩٢١دا بڵاوکراوەتەوە ئەڵێ:

دەربارەی کرژکردنەوە (توندکردنەوە)ی سیاسەت بەرامبەر بە شێخ مەحمود پرسیارێک لە مێجەرسۆن کرا کە مەسئولی سیاسی بوو لە سلێمانی ئەبێ بە جۆرێک دەسەلات و مەرکەزی شێخ مەحمود بچووک بکاتەوە کە زۆر وەستایانە بۆی بچێت و بە جۆرێکی شارەزاییانە بێ ...

شتێکی ئاشکرا و بەڵگە نەویست بوو کە شێخ مەحمود بەرامبەر بەم هەڵوێستە (کەم کردنەوەی دەسەلات و بچووک کردنەوەی مەرکەزی) بەرەنگار

ئەبوەوە بەتایبەتی بەرامبەر بەو شێوەیەی کە مێجەرسۆن بەکاری ئەهێنا کە ئەنجامەکەی گەیشت بەوەی بەناچاری هێزی سوپا بنێرێت و شێخ مەحمود بە دیل بگیرێت و دوور بخرێتەوە ...

دەسەلاتی شێخ مەحمود داتاشرا و بە جۆرێک کەم کرایەوە کە پێویستی بەوە نەدەکرد، چونکە جنۆکەکە گوریس کرابوو، هەر بەو جۆرەش ئەمایەوە هەتا خۆی دەستەمۆ ئەبوو ئەگەر وەستایانە بۆی بچونایە».

لە کۆتایی راپۆرتەکەدا نوئێل ئەلێ:

« کردەوەی شێخ مەحمود بەرامبەر بەو ئینگلیزانەی کە لە سلێمانیدا دەستیان بەسەرا گیرابوو بەلگەیە بۆ جوامێریەتی شێخ مەحمود و پێویستە جێگای ئێستەی بگۆرێ لە (حجام ـ هەنگام)، وە لە هندستان بۆ شوێنێکی تر» افزا- نۆیل ١٩٢١/٣/١٦.

باشترین بەلگە بۆ ڕەوشت ولووت بەرزی مێجەرسۆن هەر لەسەرەتایەوە دیاری دابوو ئەتوانین لەو یاداشتەی ئەحمەدخواجادا باسی‌کردوە بخەینە ڕوو کەئەلێ «٣»

« بەر لەوەی مێجەر سۆن بگاتە سلێمانی، گرینهاوسی حاکمی سیاسی سلێمانی شێخ مەحمودی ئاگادار کردبوو و بۆ پێشوازی کردن لە مێجەرسۆن چی پێویست بوو کرا، پتر لە (٥٠٠)سوار و (١٠٠٠) پیادە بەخێرهاتنیان کرد وچادر و رەشماڵ لە موشیر ئاوا (دەشتێک بوو لە خۆر ئاوای سلێمانی نزیکی سەرە ڕێگەی کەرکوک جاران چۆڵ بوو ئێستە هەمووی کراوە بە خانوو) هەلدرابوو مێجەرسۆن بە فرۆکە گەیشت و کە دابەزی یەکەیەکە لەگەڵ خەلکدا تەوقەی کردو دەستی گوشین بەلام بە هیچ جۆرێک ڕووی نەکردە شێخ مەحمود و ئەویش لە رقا بەجێی هێشت و گەڕایەوە بۆ سلێمانی و خەلکەکەش بە دوای ئەوا چۆلیان کرد و لە ئینگلیزەکان بەولاوە کەسی تری تیادا نەما لەوناوەدا.

مێجەرسۆن هەر کە یەکەم ڕۆژ دەستی کرد بە کاروبارەهەرچیەکی ئەکرد بە پێچەوانەی ئارەزووی حوکومدارەوە بوو، هەتا ئەو ساردی و خۆگرتنی لە شێخ مەحمودەوە بدیایە ئەو ئەوەندەی تر توند و تیژ تر ئەبوو وە بە هیچ جۆرێک دیدەنی حوکومداری نەدەکردبەو جۆرە مەبەستی مێجەرسۆن و گرینهاوس بۆ شێخ مەحمود ئاشکرابوو ئەویش چاری نەما دەربارەی ئەو هەلوێستە نامەیەکی نارد

بۆ ویلْسن حاکمی مەدەنی گشتی لە بەغدا نوسیبوی:

کورد داوای ئازادی ئەکا، ئەگەر بەزویی ئەو مافە نەدریٚ بە کورد ئیتر من ناتوانم بەر بەستیی خەڵک بکەم ... بەناوی خۆم و هەموو کوردەوە تکا ئەکەم ڕەوشتی سیاسەتە ناڕەواکەتان و ئەو پیاوە سیاسیانەی ئیٚستا لیٚرەن کە بە پیاوی ژیر و تیٚگەیشتویان ئەزانن بیان گۆڕن.

مامۆستا ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا دەربارەی ڕەوشتی میٚجەرسۆن و پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز نوسیویەتی: «٢»

« کە میٚجەرسۆن لە سالی ١٩١٩دا لە جیاتی میٚجەر نوئیٚل هاتە سلیٚمانی، بە ئاشکرا دەرکەوت کە ئەیەویٚ شەڕ بە شیٚخ مەحمود بفرۆشیٚت بەلاٚم ئەیزانی بە ئاسانی ناتوانیٚت گرەو لە شیٚخ مەحمود بباتەوە. یەکەم تەقەلاٚی ئینگلیز بۆ کەم کردنەوەی دەسەلاٚت و کزکردنی ناوی شیٚخ مەحمود ئەوەبوو کە ناوچەکانی دەوروبەری سلیٚمانی لیٚ داببڕیٚت ... لە ناوچەی رانیە سەرۆک عەشیرەت و دەس ڕۆیوەکانی هان دا کە دژی شیٚخ مەحمود مەزبەتە بکەنەوە و شیٚخ ئەمینی سندۆلاٚن کە لەلایەن شیٚخ مەحمودەوە لە رانیەدا کرابوو بە قائمقام لایبەرن، بەلاٚم زۆریان لەوەدا دوودڵ بوون و غەفور خانی ناودەشت بە ئاغاکانی ووت:

«ئەم گۆت باوەڕ بەم ئینگلیزانە ناکریٚ و هەندەی پیٚ ناچیٚ بۆ تیٚکدانی ئەم ئەساسە هەوڵ ئەدەن و دوودڵی و ناکۆکی ئەخەنە ناومانەوە؟ ئەوا قسەکانم دەرکەوت! »

دوای ئەوەی ئەو تەقەلاٚیەی (بیٚل)ی نائبی حاکمی سیاسی لە کۆیە لەو ڕووەوە سەری نەگرت، توانی بە هۆی میٚجەرسۆنی حاکمی سیاسی سلیٚمانی تلگرافیٚک بە شیٚخ مەحمود بنوسیٚت بۆ سەرۆکەکانی ناوچەی رانیە کە سەرپیٚچی نەکەن بەرامبەر لابردنی شیٚخ ئەمینی سندۆلاٚن (بەڕاستی شیٚخ مەحمود هیچ شتیٚک نەمابوەوە کە تاقی نەکاتەوە، چ ئەوەی ئەحمەد خواجا و چ ئەوەی ڕەفیق حلمی باسیان کردوە و گەلیٚ شتی تر بەڵگەی ئەوەبوون کە ئینگلیزەکان لە بیانوو گەڕابون بۆ پاشگەزبوونەوە لە مافی کورد و لە حوکومداریەتی شیٚخ مەحمود) .

ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا نموونەیەک ئەهیٚنیٚتەوە بۆ بڕیاردانی سیاسەتمەدارانی ئینگلیز بۆ کەمکردنەوەی دەسەلاٚتی شیٚخ مەحمود و لەو ڕووەوە

ئەڵێ:«٢»

« ئەحمەد نوری کە موفەتشی پۆستە و تلگراف بوو لە بەغدادەوە هاتبوو چویەوە لای (بێڵ) بۆ ئەوەی بکرێ بە قائمقامی رانیە (دیارە ئەو تەقەلایە لە دوای لابردنی شێخ ئەمینی سندولاَن بووە) بێڵ لەو ڕۆژانەدا تازە لە رانیەوە گەڕابوەوە بۆ کۆیە و ئەحمەد نوری چوبوە لای بۆ ئەوەی ئەو داخوازیەی خۆی بداتێ کە بکرێ بە قائمقام ... بێڵ لێی ئەپرسێت: تۆ بەر لەوەی بێیتە ئێرە تلگرافت بۆ شێخ مەحمود ناردبوو؟ ئایا بەتەمای ئەوەی بتکا بە قاڎمقام؟؟ تۆ چۆن تلگراف بۆ شێخ مەحمود ئەنوسیت، شێخ مەحمود کێیە و چۆن ئەتوانێ دەسکاری کاروباری ئێرە بکات؟

ئەحمەد نوری لە وەرامدا ئەڵێ: ئێمە شێخ مەحمودمان نەکردوە بە حوکومدار، بەڵکو خۆتان کردتان ... ئەگەر ئیمڕۆ ئێوە لێی پەشیمان بوونەتەوە ئەوە گوناهی ئێمەی تیادانیە ... شێخ مەحمود هاوڕێی منداڵیمە رانیەش قائمقامی نییە منیش بە تەلگراف داوام لێکرد بێم بۆ ئەوەی بمکا بە قائمقام.. بێڵ بە تورەییەوە داوا لە ئەحمەد نوری ئەکا هەر ئەو دەقیقەیە کۆیە بەجێ بهێڵێت»

بەلاَم زۆری پێ نەچوو(بێڵ)لە کۆیەوە چوە رەواندز و لەوێوە تەلگرافێکی پێ گەیشت کەعەشایری (دزلی) بە بیانووی زیارەتی کاک ئەحمەدی شێخەوە هاتونەتە سلێمانی و ئنگلیزەکان لە سلێمانیدا هەموویان گیراون، بەو جۆرە وەکو لە شوێنی تریشدا باسمان کرد مێجەرسۆن بیانوی دۆزیەوە و سلێمانی بەجێ هێشت و ئەو لەناو گیراوەکاندا نەبوو ...

رەفیق حلمی لە بەرگی یەکەمی یاداشتەکانیا باسی لووت بەرزی بێڵ ئەکا کە دیارە ئەمە سیاسەتی ئینگلیزەکانی ئەو ڕۆژەانە بووە لە کوردستاندا، رەفیق حلمی بە موافەقەتی شێخ مەحمود چوبوە لای کاپتن بێڵ کە بوبوە حاکمی سیاسی لە کۆیە و ماوەیەکیش لەگەڵیا مابوەوە، وە لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: «بێڵ غەزەبێکی خوابوو لە کەس نەدەچوو» ... بێگومان بێڵیش وەکو مێجەرسۆن لەلایەن کاربەدەستانی ئینگلیز لە بەغدا ڕاسپێررابوو کە هەمان دەوری مێجەرسۆن ببینێت لە سنووری ناوچەکەی خۆیدا، بێڵ، لە دوای لیچمن کرا بە حاکمی سیاسی بریتانیا لە موصل و لە ناوچەی بادینان دەستی کرد بە زەبر و

زەنگ و لە ناوچەی عەقرە ئەو و (سکۆت)ی موعاونی لە ٤/ی تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩١٩دا لە لایەن بارزانیەکانەوە کوژرا.

ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا دەربارەی مێجەرسۆن و رەوشتی مێجەرسۆن ئەڵێ:«٤٥»

« کە وەختی خۆی لە (شوشتر)بووم لەسەر روباری (کارون) لە نزیکی چاڵەنەوتەکانی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ/ئێرانی دوو هاوڕێم هەبوو یەکێکیان مێجەرسۆن بوو ئەوی تریان (نوئێل)بوو.

مێجەرسۆن رەوشتێکی ئێجگار زۆر سەیری هەبوو، ئەو کاتە موحاسیب بوو لە بانکی ئیمپراتۆریەتی ئێراندا، ماوەیەک بوو وەکو مرۆڤێکی خەڵکی ئێران لە گوندی (سانکی) لە نزیک (بۆشیر) گوزەرانی ئەکرد ئەکرد و خۆی لە کۆمەڵی ئەوروپی دوور ئەخستەوە.

لە ساڵی ١٩.٥دا لە شیراز بوو بە ئیسلام (شیعە) وەئەڵێن گوایە کچێکی خەڵکی شیرازی هێنابوو، دوای ئەوە کرا بە موديری لقی بانکی کرماشان و دەستی کرد بەوەی زمانی کوردی فێر ببێت وە لە ساڵی ١٩.٧دا وازی لە ئیش هێناو دەستی کرد بە گەڕان بە تەبدیلی (قیافەت) ... (سۆن لەو گەشتەیدا لە ساڵی ١٩.٩دا گەیشتبوە سلێمانی و هەڵەبجە).

لە دوای ئەو گەشت و گەڕانەی لە شرکەی نەوتی ئەنگلو ئێرانی دا دەستی کرد بە ئیشکردن، دوای ئەوە کرا بە لێپرسراوی هەڵکەندنی بیری نەوت لە (چیا سورخ) لە نزیکی خانەقین.

تورکەکانی عوسمانلی لە سەرەتای شەڕی جیهانی دا مێجەرسۆنیان گرت و ناردیان بۆ ناوچەیەک لە سەر دەریای سپیی ناوەڕاست بەڵام لە دواییدا بەریان دا و لە تەموزی ئەو ساڵەی کە بەربوو کرا بە ئەفسەری سیاسی لە (دیزەفول)....

ئەو کاتە ئەو رۆژانەبوو کە عەشایەری بەختیاری شکابوون و تورکەکان و ئەڵمانەکان لەو ناوەدا خەریکی هاندانی خەڵک بوون دژی ئینگلیز.

ئەدمۆندز دەربارەی خو و رەوشتی سۆن ئەڵێ:

« سۆن کابرایەکی زۆر ڕەق بوو زۆر عاتفیش بوو، زۆر سەر گەرم بوو، لە دۆستایەتی و خۆشەویستیدا و لە ڕق و قیندا مام ناوەندیەتی نەئەزانی مانای

چیە، وردە وردە لە عەسکەرییەکانی نزیک بوەوە و لە زۆر شتدا لە هەڵس و کەوت و ڕەفتار و خووی‌دا لە ئینگلیز نەدەچوو (بێگومان ئەدمۆندز ڕاستی کردوە و زۆرباش بۆی چوە، کاتی خۆی دوکتۆر ناجی عەبباس ئەو عیبارەتەی ئەدمۆندزی لە لابیو بەگریٚ و تەقەلاٚیەکی زۆری داو من خۆم لێم بیستوە کە بۆی دەرکەوتوە مێجەرسۆن ئینگلیز نەبووە بەڵکو قەرەچ (جیبسی)یەکانی ناوچەی (ویلز)بوە لە بریتانیا).

لە دوای داگیرکردنی بەغدا لە سالی ۱۹۱۷دا سۆن گوێزرایەوە بۆ خانەقین بۆ ئەوەی وردە وردە لە کوردەکان نزیک بێتەوە. کە سۆن نەقڵ کرا لە دیزەفولەوە بۆ خانەقین، ئەدمۆندز لە جیاتی ئەو لە دیزەفول دانرا.

ئەدمۆندز ئەڵێ: کە سۆن چووە خانەقین، لەوێ ئیجازەی وەرگرت بۆ ماوەیەک و لەسەر داخوازی (ویڵسن) من چوومە جێگای مێجەرسۆن و لەوێوە نێررام بۆ کەرکوک و ئەوکاتە ڕائید (س.هـ.لۆنگریک) ئەفسەری سیاسی بوو لە کەرکوک.

ویڵسن حاکمی گشتی بریتانیا لە بەغدا لە کتێبەکەیدا دەربارەی سۆن و ناردنی بۆ سلێمانی ئەڵێ: «۳۷»

بەتەواوی نەدەتوانرا بزانرێت بزوتنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردەکاندا هەتا چ ڕادەیەک ئەتوانێ داوای سەربەخۆیی کوردی پێ بکرێ و نەدەتوانرا بزانرێ ئایا ئەو بزوتنەوەیە بریتییە لە خولیا و ئارەزووخواستی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەت و زەعیمەکانی کورد یانا؟؟

بەلاٚم ئەوەی لێمان ڕوون بوو ئەوەبوو وە هیچ گومانی تیادا نەبوو کە بزوتنەوەی هێزی نەتەوایەتی کورد لەناو سلێمانیدا زۆر بە هێز و تیژڕەوبوو، لەبەر ئەوە ناچاربووین سنوورێک بۆ ئەوە دابنێین و لە خەڵکی سلێمانمان گەیان وە بیرمان خستنەوە کە حوکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا خۆی بە بەرپرسیار (مسئول)ی کوردستان دانەدەنا هەتا خەڵکەکە بەڵێنی ئەوەیان نەدایە کە خۆیان و سەرکردەکانیان ئامادەن هەڵوێست و ڕەفتاریان باش بێت و هەموو سەرنج و ڕاوێژ و ڕاسپاردەکانی ئێمە بەرامبەر بە ڕووداوە گرنگەکان پەسەند بکەن و قبووڵ بکەن.

بەلاْم شێخ مەحمود گەورەترین کەس بوو کە بوو بە هۆی ئەو ئاڵۆز بوون و ناڕێکیەی لە ڕێ ڕەوی ئەو ڕێکەوتنەدا ڕوویدا.

شێخ مەحمود لەگەڵ نەشارەزاییدا، ئاواتی دوارۆژێکی ئێجگار گەورەی خستبوە پێش چاوی خۆی و دەستێکی بالاْی هەبوو لە فروفێڵدا.

شێخ مەحمود زوو تووڕە ئەبوو هەڵئەوچوو، لەبەر ئەوە لە مێجەرسۆن باشتر نەدۆزرایەوە کە ڕووبەڕووی شێخ مەحمود بێتەوە و ئاگاداری هەموو هەڵس و کەوتێکی ببێت.

بەلاْم لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتیەی لە شێخ مەحمودا هەبوو، خەڵکێکی زۆر لە دەوروپشتی گردبوبونەوە کە لە ٨٠٪ی خواروی کوردستانی ئەگرتەوە (کەچی بارەها ویڵسن و مس بێڵ و زۆری تر لە ئینگلیزەکان بارەها لەباسی شێخ مەحمودا وتویانە شێخ‌مەحمود موبالەغەیەکی زۆر کرابوو لە شەعبییەتیا)، بۆیە بۆمان دەرکەوت مانەوەی شێخ مەحمود بەو هەموو دەسەلاْتەیەوە شتێکبوو بۆ ئێمە نەدەشیا و زیانێکی زۆری هەبوو ... ئەوەشمان ئەزانی کە هێزێکی تر هەبوو لەناو سلێمانیدا کە بریتیبون لە پارەدار و موڵکدار و بازرگان، کە بەلای ئەوانەوە دەسەلاْت بەدەست بریتانیاوە باشتربوو وەک ئەوەی لای شێخ مەحمود بێ ... بەو جۆرە بۆمان دەرکەوت کە نابێ پشت بە شێخ مەحمود ببەستین و نابێ ڕێگەی ئەوەی بدرێتێ دەسەلاْتی بەسەر عەشیرەتەکاندا هەبێت چونکە بە پێچەوانەی ئەوە هەموو نەخشەکانمان لە خواروی کوردستاندا تێک ئەچێت.

ئەوەبوو لەناو خۆمانا کەوتینە گفت و گۆ و ڕاوێژ کردن من و نوئێل و لیچمن و سۆن و مێجەر گۆردن ۆکر و چەند کەسێکی تر کۆبوینەوە لەوانەی کە شارەزایی و ئاگاداری و پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو، بڕیاری هەموان لەسەر ئەوەبوو کە مێجەرسۆن لە جێی نوئێل بکرێت بە حاکمی سیاسی لە سلێمانی کە هەتا ئەو کاتە مێجەرسۆن هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ شێخ مەحمودا نەبووە، بەلاْم لێ هاتوویی و شارەزابوونی مێجەرسۆن لە ناوچەکە دڵنیای کردین کە ئەتوانێت کاروباری ناوچەکە بیات بەڕێوە.

کە مێجەرسۆن نیررا بۆ سلێمان، ئیتر ئارام و ئاسایش بەرپا کرا (بێگومان نەبوونی ئارام و ئاسایش هەر بە هۆی خۆیان و بە گرێ گیراوەکانیانەوە بووە،

که خۆیان ویستیان ئەوە نەمێنێت ئیتر دیارە ئاسایش بۆ ماوەیەک بەرپا بوە)، ورده ورده وا له خەڵک کرا له شێخ مەحمود بتەکێنەوە و دەرکەوت زۆر لە وانەی کە سەر بە شێخ مەحمود بوون، لەبەر خاتری خۆشەویستی شێخ مەحمود نەبوو بەڵکو لە ترسابوو (سەیرە دانی بەوەدا نەناوە کە ئەوانەی لە شێخ مەحمود جیابوونەوە لە ترسی خۆیان و دوا ڕۆژیان لە ئینگلیزەکان نزیک بوبوونەوە).

جافەکان داوای ئەوەیان کرد کە لە شێخ مەحمود جیا بکرێنەوە، بۆ ئەوە ئەفسەرێکی ئینگلیزی (لیزی فرۆکەوان) نیررا بۆ هەڵبجە بۆ ئەوەی کاروباری ئەوێ ببا بەڕێوە.

کە عەشایەرەکانی تر بۆیان دەرکەوت نیازی ئەوەمان هەیە خۆمان حوکوم و کاروباری ناوچەکە ڕاستەوخۆ بگرینە دەس، ئیتر دەم و دەست دەسەڵاتی شێخ مەحمود کەم بوەوە و خەڵکێکی زۆری لێ تەکیەوە و لە کۆتایی مانگی نیسانی ساڵی ١٩١٩دا گەلێک لە عەشیایرەکان خۆیان لێ کێشایەوە و ئەوانەی لەگەڵیا مابوون بریتیبوون لە شێخانی بەرزنجە و کرپجنە و عەشایەری هەماوەند و هۆزی مکابەڵی لە عەشرەتی جاف ... ورده ورده هێزی لیڤی و پۆلیس هێنرانە ژێر کۆنترۆڵی خۆمان، جگە لەو ئەفسەرە کوردانە نەبێ کە سوێندیان بۆ شێخ مەحمود خواردبوو لەگەڵیا بمێننەوە ».

نەخشەو پیلانی دووروودرێژی ئینگلیزەکان بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی عەشایری کورد بۆ سوودی خۆیان و بۆ قایم کردنی جێ پێی خۆیان شتێکی روون و ئاشکرایە و بەخۆڕایی نەبووە کە هەر لە کۆنەوە بایەخیان بە عەشایری کورد داوە و شارەزا و گەڕۆک و پسپۆری خۆیان هەر یەکە بەجۆرێک و هەر یەکە بۆ مەبەستێک ناردوە بۆ کوردستان و پەیوەندیان لەگەڵ عەشیرەتەکاندا پەیدا کردوە لە ڕەوشت و لە سروشت و لە هێز و لە پەیوەندی نێوانیان شارەزاییەکی تەواویان پەیدا کردوە و هەموویان تۆمار کردوە بۆ کاربەدەستانی دوا ڕۆژ کە سوود لەو سەرنجانەیان وەربگرن ...

لە ناوچەی هەڵەبجەدا لەگەڵ ئەوەشدا حامد بەگی جاف لە سەرەتادا بۆ ماوەیەک لەگەڵ شێخ مەحمودا بووە و ئینگلیزەکان ڕاویان ناوە و دەورووبەری

عەبابەیلیٚ یان بویە بەردومان کردبوو چونکە ئەو پەنای بۆ بردبوو، بەلاٚم لە دواییدا لە حوکومداریەتی دووهەمی شیٚخ مەحمودا بەلای خۆیاندا دایان شکاند و ئەحمەد بەگی موختاری شاعیریان کرد بە قائمقام و حامد بەگیان کرد بە موعاونی قائمقام و عەدلە خانم (خانمی ژنی وەسمان پاشا) هەر لە کۆنەوە سەر بە ئینگلیز بووە و لە پشدەریشدا بەرامبەر بە هەباسی مەحمود ئاغای دۆست و ئاشناو لایەنگری شیٚخ مەحمود توانیبویان بابەکری سەلیم ئاغا (کاپتن بابەکر) بکەن بە دەسکەلای خۆیان و لە ناو هەماوەندەکاندا بەرامبەر بە کەریم بەگی فەتاح بەگ و سابیری کوڕی، چەند کەسیٚکی وەکو مشیری حەمەی سلیٚمانیان لە ژیٚرەوە کڕیبوو و لە شەڕی دەربەندی بازیاندا بۆمان دەردەکەویٚت کە ئەو موشیرە چ خیانەتیٚکی لە شیٚخ مەحمود و میللەتی کورد کرد.

لە ناوچەی کۆیەش کیٚشەی حەویٚزی و غەفوری هەر سوودی خۆیانی تیادابووە و زۆری پیٚ نەچوە ئەو ناوچەیەش هان بدەن دژی شیٚخ مەحمود بوەستن و بە سەرکردایەتی شیٚخ مەحمود قایل نەبن و ڕازی نەبن لەگەڵ حوکومداریەتی سلیٚمانیدا بن و لە کەرکوک تەقەلای ئینگلیز لە کۆنەوە لەویٚ و لە کفری زۆر ئاشکرا بوو و سەید ئەحمەدی خانەقایان وا لیٚ کردبوو لایەن گری شیٚخ مەحمود نەبیٚت و لە ناوچەی سەنگاو و گەرمیان بەرامبەر بە شیٚخ قادری (گۆپ تەپە) کەبە (شیٚخ قادری گوللە نەبڕ بەناوبانگ بووە) شیٚخ عەبدولکەریمی قادر کەرەمیان بەدەستەوە بووە کە بە نهیٚنی لەگەڵیانا بووە و وەکو باباعەلی شیٚخ مەحمود بۆی روون کردمەوە کە شیٚخ عەبدولکەریم پیاویٚکی هەڵپەرست بووە و لە ژیٚرەوە و لە دڵا حەزی لە شیٚخ مەحمود نەکردوە و حەزی بە دەسەلاٚتداریٚتی شیٚخ مەحمود نەکردوە و لەشویٚنی خۆیدا لە بەرگی دووهەمدا لەباسی نیشتەجیٚ بوونی شیٚخ مەحمود لە نیٚوانی سالاٚنی ١٩٣٢-١٩٤١ باسی ئەوە ئەکەین کە چۆن شیٚخ عەبدولکەریم لای ئینگلیزەکان هەوڵی داوە شیٚخ مەحمود نەگەڕیٚتەوە بۆ کوردستان نەوەکو کیٚشەیەکی تازەیان بۆ پەیدابکات.

بازرگان و پارەدارەکانیش پیٚی ناویٚ باسیان بکەین، ئەوانیش سوودی خۆیان و برەوی کاسبی و بازرگانیەکەیان بەستبوونیەوە بە مانەوەی ئینگلیز لە کوردستاندا و بە ئاشکرا بوبون بە دەهۆڵ ژەنی ئینگلیز ...

بەڵێ ڕاستە شێخ مەحمود سەرەتای تاقیکردنەوەی سیاسی نەبووە لە ژیانیا و بەر لەوە تەنها لە یاسا و ڕەوشت و سروشتی عەشایەریدا شارەزابووە و کە بووە بە حوکومدار کەم تەجروبە بووە لە کاروباری ئیدارەدا و هەڵوێستی ئەو ڕۆژانە و گێرگۆڕینی ئینگلیزیش ڕێگەی ئەوەی نەداوە و بواری نەداوە بە ئارام و ئاسایش کاروبار ببات بەڕێوە (وەکو نوئێل لەو ڕاپۆرتەی کە باسمان کرد دانی پیانابوو) و ئەوانەش کە لە دەوروپشتی کۆبوبونەوە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ ئەوانی تر سوودی خۆیان مەبەست بووە و شێخ مەحمودیان توشی شەپەشەق و سەریەشەیەکی زۆر کردوە و زۆر کوردی شارەزا و لێ هاتووی تر هەبووە کە لە دوای لێکدانەوە و سەرنجدان بۆیان دەرکەوتوە ئینگلیزەکان بەدڵ نەیان ویستوە حوکومداریەتی کوردستان سەربگرێت، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بەشداریان لەگەڵ شێخ مەحمودا نەکردوە، بۆ وێنە یەکێکی وەکو ئەمین زەکی بەگی مێژو ناس کە ئاگاداری مەبەستی ئینگلیز بووە بەلای حوکومداریەتی کوردوستان دا نەچوە و هەر لە سەرەتاوە لە دامەزراندنی دەزگای سوپایی و دروستکردنی مەکتەبی عەسکەری بەغدا بەشداری کردوە.

هەروەها ڕاستە لەو ڕۆژانەدا کە شێخ مەحمود بوبو بە حوکومدار گەلێک ئاڵۆزی و پەشێوی و خواری و گێڕی هەبووە لە بەڕێوەبردنی کاروباردا و شێخ مەحمود هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردوە کە هەوڵی داوە بەزۆری خزمەکانی لەناو دەزگاکانی حوکومداریەتەکەیدا دامەزرێنێت (وەکو ڕەفیق حلمی سەرزەنشی کردوە و ڕەخنەی لێ گرتوە لەو ڕوەوە)، بەڵام ئینگلیزەکان خۆشیان لەو ئاڵۆزبوونە و گێژاو و ناڕێکیەی لەو ڕۆژانەدا ڕوی دابوو دەستێکی ئیجگار باڵایان هەبووە و ئەگەر ئینگلیزەکان نیازیان پاک بوایە وەکو لە هەندێ شوێنی تریشدا باسمان کردوە، وەک ئەو مەبەست و نیازەی کە لەگەڵ مەلیک فیصل دا هەیان بووە و لەژێرەوە هەوڵیان نەدایە خەڵک لە شێخ مەحمود دووربخەنەوە و هەوڵیان بدایە وەکو چۆن کە مەلیک فەیصەلیان لە حیجازەوە بەکێش‌کرد بۆ عێراق دوای ئەوەی لە سوریا دەرکرا، وە چۆن بەوپەڕی دڵسۆزییەوە پەرۆشی ئەوەبوون خەڵکێکی زۆری شارەزا و خوێندەوار لە فیصل کۆ بکەنەوە وەکو جەعفەر عەسکەریو و یاسین هاشمی ونوری سەعید و ئەمین زەکی بەگ و

گەلێکی تر لەو خوێندەوار و ئەفسەرە بەرزانەی کورد کە لە ئەستەمبولدا دوای رووخاندنی عوسمانلی لە ئەستەمبول مابوونەوە ئەتوانرا لە کوردەکانیش دەستەیەکی ئێجگار شارەزا و لێ ھاتوو لە شێخ مەحمود کۆبکەنەوە و گرێیان شێخ مەحمودیش لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا نەگونجایە، وابزانم لە کاتی دوورخستنەوەی شێخ مەحمودا بۆ ھندستان ئەیانتوانی ئیدارەیەکی ڕێک وپێکی وەک ئەوەی بەغدا لە خواروی کوردستانیشدا دروست بکەن، نەک ھەر بۆ چاو بەست لە ناوچەیەکی تەسکی وەکو سلێمانیدا شێخ مەحمود بکەن بە حوکومدار کەئەیانویست لە شێوەی (راجا)یەکی ھندستانی دا بە پارە و مووچە بیکەن بە کرێ گرتەی خۆیان و کاپتن بێل و زۆری تری وەکو ئەو ئەفسەرانەی تری ئینگلیز کە لە ناوچەی بادینانەدا کوژران لەو جۆرە کەسەی نەدەنارد بۆ ئەوەی بار و ھەڵوێستی ناوچەکە ئاڵۆز بکەن و بۆ بیانوویەک بگەڕێن حوکومداریەتی شێخ مەحمود نەھێڵن و خواروی کوردستان بلکێنن بە میسۆپۆتانیاوە و لە ھەمان کاتیشدا عصبەالامم ئاگاداربکەن کە کورد خۆی لەباریا نەبووە کاروباری خۆی ببات بەڕێوە بۆیە ناچاربوون کوردستانیان لکاند بە عیراقەوە.

لەم باسەی مێجەرسۆندا ئەمەوێ سەرنجی ئەمین زەکی بەگی مێژونوسی کورد دەربارەی مێجەرسۆن پێشکەش بکەم کە وتویەتی:

« مێجەرسۆن بەقەد کوردێک زمانی کوردی ئەزانی و لە زانایەکی کورد زۆرتر شارەزای زمانەکەمان بوو ... زانینەکەی سۆن و شارەزابوونی لە زمانی کوردیدا بە ڕادەیەک بوو ئەیتوانی قورئان بکات بە کوردی ».

کە سۆن لە دوای نوئێل کرا بە حاکمی سیاسی و دوای ئەوەی شێخ مەحمود ئاوارە کرا بۆ ھندستان، ئیتر سۆن خۆی کرد بە دۆستی زمانی کردی (نەک بە دۆستی میللەتی کورد) وە ھەوڵی دا خەڵک بە زمانی کوردی بنووسێ و بخوێنێتەوە کە ئەو تەقەلایەشی ھەروا بە خۆڕایی نەبووە، لەلایەکەوە ویستویەتی وا لە خەڵک بگەیێنێت مەرج نیە تەنھا ھەر شێخ مەحمود دڵسۆزی کورد بوویێت و بۆ کورد ھەوڵی دابێت وە ئەوا ئەو لە جیاتی شێخ مەحمود خزمەتی زمانی کوردی ئەکا جگە لەوە ئەو ڕۆژانەی کە سۆن ئەو تەقەلایەی داوە، ئەو ڕۆژانەبووە کە کۆنگرەی قاھیرە و پەیمانی سیڤەر و عصبە الامم لە

ناودا هەبوە و ئینگلیزەکان لە ڕاپۆرتەکانیانا بۆ عصبە الامم وایان گەیاندبوو کە بە بوونی (انتداب)ی بریتانیا بۆ عیراق کوردیش مافی خۆی هەیە و بەزمانی خۆی ئەنوسێ ... .

بۆ نموونە ئەم بڵاوکردنەوەیەی سۆن بڵاو ئەکەینەوە کە وەکو (اعلان)ێک لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن کە خۆی دەری ئەکرد و سەرپەرشتی ئەکرد و لە سلێمانیدا چاپ ئەکرا، لە ژمارەی ڕۆژی ٣/مارتی/١٩٢١دا بڵاو کردوەتەوە ئەڵێ: «١٩»

بۆ زانینی هەموو ...

مەجیدی کوڕی عەلی هەموەندی ٢٧ ساڵەیە، دەستەپیاوە، سمێڵ پڕو درێژە،ریش پۆپەیە، مووی سوورە، پیاوی کوشتوە و هەڵاتوە، هەرکەسێ هەواڵی مەجید بدا کە بۆ کوێ چوە یا بیگرێ و بیگەیەنێتە حوکومەت سێ سەد روپیەی ئەدرێتێ»

کە مێجەرسۆن دوای ئاوارە کردنی شێخ مەحمود بوو بە هەمووشتێک لە سلێمانیدا بڕیاری دا زمانی کوردی لە دەزگاکانی ناو سلێمانیدا بەکاربێت، بە پەلەو بە گورجی ئەلف و بای کوردی چاپ کردو خۆی سەرپەرشتی فێرگەکانی ئەکرد و هانی نووسەران و شاعیرانی کوردی ئەدا کە بە کوردی پەتی بنووسن، بۆ ئەو مەبەستە وەکو لە شوێنی تریشدا باسمان کردوە موسابەقەیەکی رێک خست بۆ باشترین کەس کە بە کوردی پەتی شت بنووسێت، لەو موسابەقەیەدا شێخ نوری شێخ صالحی شاعیر نوسینەکەی بە یەکەم و ئەوەی رەفیق صائیب (مستەفا صائیب) دووهەم دەرچوو هەرکەسە جائیزەی خۆی وەرگرت تەنها لەبەر ئەوەی نوسینەکانیان بە کوردی یەکی پەتی بووە نەک لەبەر ناوەرۆکی نوسینەکانیان کە تەنها باسی جووت و کشت کاڵ کردن بووە.

لە راستیدا چ مێجەرسۆن و چ ئەدمۆندز و چ قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە زمانی کوردییان خۆش ئەویست، بەلام میللەتی کوردیان خۆش نەئەویست و هەریەکەیان بە جۆرێک هەوڵیان داوە قەوارەی مێژوی گەلی کورد کەم بکەنەوە وەکو ئەوەی قوتابیی ئەم سەردەمەیان دوکتۆر مەکنزی بە نوسینەکانی ئەڵێ:

کورد ماد نییە و هەورامی کورد نییە و گەلێ بۆچوونی تر کە بریتیە لە رەنگدانەوەی ئەو قوتابخانەیەی مێجەرسۆن و ئەدمۆندز ...

سۆن بۆ ئەوە نێررابوو شێخ مەحمود لابیا و خەڵک فێری مل شۆڕی و کرنووش بردن بکا ...

مێجەرسۆن بە ئاشکرا بە هۆی جارچیەوە بەناو شاری سلێماندا بلاْوی کردبوەوە کە هەر ساتێک مێجەرسۆن حاکمی سیاسی بەناو بازاڕدا تێپەری کرد پێویستە هەموو دوکاندارەکان بەرزەپێ لەبەری هەڵسن (هەندێ کەس ئەو سەردەمە بۆیان ئەگێڕاینەوە کە نۆکەرەکانی مێجەرسۆن خەڵکیان هان ئەدا کە نەک هەر لەبەر مێجەرسۆن بەڵکو ئەگەر (قەپاتمە)کەشی بەناو بازاردا رۆی ئەبێ لەبەری هەڵسن).

سۆن نەی ئەزانی یەکێکی وەکو (مەلاعەلی مۆرهەڵکەن)ی خەڵکی گەڕەکی مەڵکەندیی لێ پەیدا ئەبێت و جارێک کە مێجەرسۆن بە بەر دوکانەکەیدا تێپەر ئەکا مەلا عەلی لەبەری هەڵناسێت، لە دواییدا مێجەرسۆن ئەنێرێ بە شوێنیا و لێی تووڕە ئەبێ و هەڕەشەی لێ ئەکا کە جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە ... ئەویش لە وەرامدا پێی ئەڵێ:

من پیاوێکی ئیسلامم و تۆش غەیرە دینی ... جگە لەوە تۆ داگیرکەری وولاْتەکەمی، لەبەر ئەوە ئاینەکەم کە ئاینی ئیسلامە ڕێگەی ئەوەم نادا لەبەرت هەڵسم ... کەیفی خۆتە چیت لە دەس دێ بیکە بەلاْم من ناتوانم بە پێچەوانەی ئایینەکەمەوە ڕەفتار بکەم ...

سۆن بۆ ئەو کاتە لێی بێدەنگ ئەبێ ... بەلاْم سۆنی ڕق هەڵگر ئەوەی لە بیر ناچێتەوە و لە دوای ماوەیەک ئەنێرێت بە شوێنی هەمان مەلا عەلی دا و پێی ئەڵێ مەلا عەلی :

من بۆم دەرکەوت کە تۆ پیاوێکی پاک و ڕاست گۆی و لەو خەڵکە ساختەچی و دەس بڕانەی تر ناچیت و ئێمە تەقدیری ئەو ڕاست گۆییەت ئەکەین لەبەر ئەوە بڕیارمان داوە مانگی (٤٠) روپییەت بۆ ببڕینەوە ئەویش لە وەرامدا پێی ئەڵێ:

من کە ئاینەکەم ڕێگەم نەدا لەبەر تۆ هەڵسم ڕێگەی ئەوەشم نادا پارەی تۆ وەربگرم.

سۆن پێی ئەڵێ:

« خوا بەقوربانی عەقڵی خۆت و بەقوربانی ڕاست گۆیی خۆتت بکا، بەخوا

ئەگەر ئەو مووچەیەت قبوڵ بکردایە هەر لێرەوە هەتا بەردەم دوکانەکەی خۆت بەشەق ئەمبردیت»...

راستە خەڵکی سلێمانی ئەوسەردەمە هێشتا نەهاتبوونەوە سەرخۆیان و گرانی و برسێتی شەڕی جیهانی لەپەل و پۆی خستبوون و ئینگلیزەکان بە پارە بلاْوکردنەوە و بەکێش کردنی خواردەمەنی بۆ ناوچەکە توانیبویان زۆرکەس بەلای خۆیانا داشکێنن و هەستی نەتەوایەتی شتێکی نوێ بوە و تازە چەکەرەی کردبوو، بەلاْم تاڕادەیەک هەستی ئایینی ئیسلام لەناو مێشکی زۆر کەسدا هێشتا بە هێز و بەتاوبووە و بە ئاسانی بوونی ئینگلیزەکانیان لە ولاْتەکەیان دا قبوڵ نەکردوە و هەندێ هەڵوێستی ئاشکرای ئینگلیزەکان وەکو ئەوەی کە مێجەرسۆن شوێنی بۆ ژنە خراپ و داوێن پیسەکانی ئەوسەردەمە کردبوەوە و پۆلیس پارێزگاری شوێنەکەیانی ئەکرد بەلاْم ئەورۆژانە بوونی جێگەی وا وەکو (قەحبەخانە) کفر و ناشایستە بووە و هەرچی بەلای ئەوەدا بچوایە خۆڵ و دۆی ئەکرا بەسەردا و بەرەوپشت سواری گوێ درێژیان ئەکرد و وەکو ئەگێڕنەوە (جەلالی فاتەبچکۆل)ناو یەکێک بووە لەوانەی کە سەرپەرشتی ئەو شوێنەی کردووە، لە دواییدا کە مێجەرسۆن ڕۆیشتوە. شاربەدەریان کردوە و خۆڵ و دۆیان کردوە بەسەریا، جگ لەوە زەبروزەنگ و هەڕەشەی ئەفسەرە سیاسیەکانی ئینگلیز لەناو عەشایەرەکاندا وایان کردوە کە زۆر لە سەرۆک عەشیرەتەکان لە دوارۆژی خۆیان لە دەسەلاْتی لە کیس چوونی خۆیان بترسن و ئینگلیزیان بە ملۆزم زانیوە و لێی ترساون و بە خاوەنی فرۆکە و تۆپ و ڕەشاش و لیرەی ئاڵتونیان داناوە لەبەر ئەوە ئەو جۆرە کردەوانەی ئینگلیزیش دەورێکی زۆری بووە لەو پاشگەزبوونەوەیەی کە سەرۆکی عەشیرەتەکانی بەرامبەر بە شێخ مەحمود کردویانە ...

ساڵی ١٩٥٥/١٩٥٤ فرمانبەربووم لە قەلاْدزە، بابەکر سەلیم ئاغای پژدەری کە ئینگلیزەکان بە (کاپتن بابەکر) ناویان ئەهێنا و یەکێک بوو لە دۆستە دێرینەکانی ئینگلیز ... ئینگلیزەکان بەرامبەر بەولایەنگرییەی بابەکر ئاغا، جگە لەوەی کە کردبویان بە قائمقامی قەلاْدزە و مانگانەیان ئەدایە، خەلاْت و بەراتشیان بە لیرەی ئاڵتون پێ ئەبەخشی ... لەو ساڵەی قەلاْدزەم دا لەگەڵ

یەکێک لە کورەکانی بابەکر ئاغادا کە هاوڕێی قوتابخانەبووین لە منداڵیدا باسی ئەو پارانەی ئەوسای ئینگلیزکرا، ووتی بابم وەختی خۆی متمانەی بە ئینگلیزەکان نەبوو هەمیشە لەوە دەترسا کە پاشگەزبینەوە و بابم دەترسا کە ئەو پارانەی لێی وەرگرتبوون داوای لێ بکەنەوە، لەبەر ئەوە هەتا ماوەیەک نەی دەویرا هیچ لەو پارانە خەرج بکا و هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد کە پارەکانی لیٚ بسێننەوە .

لە کۆتاییدا ئەو کتێب و نامیلکانەی کە مێجەرسۆن نوسیویەتی و چاپی کردوە لەوانەی کە پەیوەندی یان بە کوردی یەوە هەیە ئەمانەویٚ وەکو لە کتێبەکەی دوکتۆر کەمال مەزهەردا بڵاوکراوەتەوە ئێمەش بڵاوی بکەینەوە «٧»

١- Mesopotamia and kurdistan in disguise دوجار بە ئینگلیزی چاپ کراوە یەکەم ساڵی ١٩١٢دا دوهەم لە ساڵی ١٩٢٦دا

٢- Southern kurdish folcsong in kermenshahi dialect چاپی ساڵی ١٩٠٩

٣- Notes on kurdish dialect, the shadi branch of kermanji چاپی ساڵی ١٩٠٩

٤- Notes on kurdish dialect, sulaimania (southern kurdistan) چاپی ساڵی ١٩١٢

٥- Grammer of the kurmanji or kurdish language چاپی ساڵی ١٩١٣

٦- Elementary kurmanji grammer چاپی ساڵی ١٩١٩

٧- Kitabi Awalamini Qirrati kurdi کیتابی ئەوەڵەمین قیرائەتی کوردی چاپی ساڵی ١٩٢٠

٨- A short anthology of Guran poetry مەبەستی لە شیعری شێوە زمانی گۆران بووە شباطی ١٩٢١ چاپ کراوە

٩- Nots on the Phonology of southen kurmanji چاپی ئەپریلی ساڵی ١٩٢٢ .

## ئاڵۆزبوونی هەڵوێست بە هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز و بەهۆی هاتنی مێجەرسۆنەوە

کاربەدەستانی ئینگلیز لە بەغدا، لەوانەی کە دەوروپشتی حاکمی مەدەنیان گرتبوو وەکو مس بێلْ و ئەو ئەفسەرە سیاسیانەی کە لە ناوچەی سلێمانی و لەناوچەکانی تری خواروی کوردستاندا کاروباریان پیْ سپێررابوو، لە یاداشت و کتێب و نوسین و راپۆرتەکانیانا بەزۆری رەخنەیان لە شێخ مەحمود و لە نەشارەزایی و لە بیْ ئیدارەیی گرتوە کە نەیتوانیبو کاروبار ببات بەڕێوە و نەی توانیبوو ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکەدا بەرپابکات بەبیْ ئەوەی ویژدانی خۆیان بخەنەکار و نەختێکیش لەو کردارە نالەبار و رەفتارە پیس و چەپەڵەی ئەفسەرەکانی خۆیان و نۆکەرەکانی خۆیان ئەیان کرد روون بکەنەوە ...
هەندیْ لە نووسەرانی خۆشمان وەکو رەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیانا رەخنەیان لە دام و دەزگاکەی شێخ مەحمود و لە خۆی گرتوە کە نەیان توانیبو بچنە ریزی بەجیْ هێنانی ئەو ئەرکە گرنگانەی کە پێویست بوو لەو رۆژانەدا بەجیْ بهێنرانایە و رەخنەشیان لەو کاربەدەستانە گرتوە کە شێخ مەحمود دای نابوون و هەندێکیان ئەوەیان لەبارا نەبوە ئەو ئەرکەی کە پێیان پیْسپێرابوو بەجێی بهێنن و بۆ نموونە رەفیق حلمی دامەزراندنی (سەید بسم الله)ی بەڕاست نەزانیوە کە بکریْ بە قومیسەر ... بەلاْم ئەو نووسەرانەی خۆمان وەنەبیْ تەنها هەر رەخنەیان لە شێخ مەحمود و دام دەزگاکەی گرتبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە خوێن لە دڵ و جەرگیان تکاوە بەرامبەر بەو تاوان و ناپیاویەی کە ئەفسەرە ئینگلیزەکان و نۆکەرەکانیان لە کوردستاندا ئەیان کردو ئێمەش لەم کتێبەدا سەرنج و خەم و پەژارەی ئەوانەمان وەرگرتوە و هەریەکەی لە شوێنی خۆیدا بۆ نموونەی تاوانباریتی ئینگلیزکانی ئەورۆژە کردومانن بە نموونە .
کاربەدەستانی ئینگلیز لە راپۆرت و یاداشت و کتێبەکانیانا، جگە لەو راپۆرتەی مێجەر نوئێل نەبیْ کە لە پێشتردا باسمان کرد (راپۆرتی ژمارە

C.O.730-13 ساڵی (١٩٢١) کە بە ئاشکرا ڕەخنەی لە سیاسەت و لە کاربەدەستانی خۆیان گرتوە، ئیتر ئەوانی تر هەرچی ڕوویداوە هەموویان داوە پاڵ شێخ مەحمود و دەوروپشتەکەی .

دوای ئەوەی کە ئینگلیزەکان لەو بەڵێنانەی کە دابویان بە میللەتی کورد لە خوارووی کوردوستاندا پاشگەزبوونەوە و سیاسەتی خۆیان گۆڕی و بۆبەجێ‌هێنانی ئەو سیاسەتە تازەیان گەلێک هەڵوێستی ناڕەوایان بەرامبەر بە کورد پیشاندا و یەکێکی وەکو مێجەرسۆنیان کرد بە کوتەکی دەستی خۆیان و ناردیان بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی شێخ مەحمود بشکێنێ و لە سنوور و لە دەسەڵاتی کەم بکاتەوە و بە ئاشکرا بوو بە مڵۆزم و وەکو کەڵەگا سواری سەری هەموولایەک بوو ئینگلیزەکانیش دڵیان بەوە خۆش بووە کە مێجەرسۆنیان ناردبوو هەلوێستیان بۆ تەخت بکاو ئارام و ئاسایش بەرپا بکا و لەجیاتی ئەو دامودەزگا لاوازەی شێخ مەحمود دایناوبوو دامودەزگایەکی ڕێک‌وپێکی پڕ لە یاسا و پڕ لە عەدالەت ساز بکا و لەماوەیەکی کەمدا والە خەڵک بکا هەموویان شێخ مەحمودیان لەبەرچاو بکەوێ ...

بەلام ئەوەی ئاشکرایە کە مێجەرسۆن بە کردەوەکانی خۆی نەک هەر وای‌کرد خەڵک لە ئینگلیز بێزاربێت بەڵکو خەڵکی والی‌کرد کە بەجارێک هیوایان بە ئینگلیز و بەو پڕوپاگەندانەی کە بڵاویان کردبوەوە نەمێنێت جگە لای ئەوانە نەبێت کە بوبون بەنۆکەر و بەکرێ گرتەی و جگە لەو پارەدار و بازرگانانە نەبێ کە خۆیان بەستبوو بە پێچکەی ئەو بێگانە داگیرکەرەوە کە گوایا بۆ ئەوە هاتبوو لە زوڵم‌وزۆری شێخ مەحمود و دەوروبەرەکەی بیان پارێزێت ...

لە باسەکانی پێشودا لە پاشگەزبوونەوە و هۆی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیزدا زۆر شتمان نووسی وەکو یاداشتەکانی ئەحمەد خواجا و ئەحمەد تەقی و شێخ ڕەئوفی شێخ مەحمود.

لێرەدا ئەمانەوێ دەقی ئەو چەند دێڕی ڕەفیق حلمی بڵاوبکەینەوە لەبەرگی دوهەمی یاداشتەکانیا لەلاپەرە ١٠٥ ـ ١٠٩ باسی کردوە دەربارەی هەڵوێستی ئەو ڕۆژانەی کە مێجەرسۆن بوبو بە هەموشتێک و شێخ مەحمودی خستبوە پشت‌گوێ و پرس و ڕای پێ نەدەکرد بۆ ئەوەی بزانین ئەوانەی کە خۆیان

بەستبوو بە ئینگلیزەوە و لەو ڕۆژانەدا بوبون بە کلک‌وگوێی بۆچی لەو ڕۆژانەدا دەنگی بێزاری خۆیان دەرنەبڕیبوو بەرامبەر بەو فریشتەیەی کە لە کورد بوبو بە مێردەزمە...

ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

« شێخ مەحمود لە هەواڵ گەیشتبوو وەلە ئینگلیزەکان ساردبوبوەوە، ئیتر هیوای هیچی پێ‌یان نەمابوو، لەبەر ئەمە ئەویش لە ژێرەوە خەریکی ئەو ڕەئیسانە بوو کە ئەیتوانی لەگەڵیاندا ڕێک‌بکەوێت. لەولای تریشەوە ئەوانەی متمانەی پێ‌دەکردن بەدزییەوە ئەیناردن بۆ ئەملاو ئەولای عیراق. نەبزی گەورەکان و ڕەئیسەکانی تاقی ئەکردەوە، لەناحەزەکانی ئینگلیز ئەگەڕا، ئەیویست بزانێت کە بیری خەڵکی شارەکانی تر چۆنە بەرامبەر بە ئینگلیز. حاکمەکانی ئینگلیز لە هەموو لایەکدا دوژمنیان بۆ خۆیان پەیداکردبوو، هەر ساتە نە ساتێک یەکێکیان ئەکوژرا.لە ڕووی دەستەودائیرەی خراپ و نەخوێندەوار و جاسووسانی بێ غیرەت و بێ شەرەفەوە هەر کەسێکی تۆزێک فامیدە و تێگەیشتو، کەم و زۆر خوێن گەرم و خاوەن غیرەت هەبوو، هەمویان لە حوکومەت هەڵگیڕرا بوەوە. ئەم داخ لە دڵانە لە هەمو لایەک بەبێ ترس و لێکدانەوەی دواڕۆژ کەوتبوونە سەروپۆتەلاکی ئینگلیز.

لەزۆربەی شارەکانی عیراقدا بەدزییەوە(کۆمەڵ)ڕێکخرابوو و ڕۆژ بە ڕۆژ لەزیادبوون و پەرەسەندندابوو.گەلێک لەوانەی کە پێیان خۆش‌بوو (تورک) لە عیراق دەرچووبوون و وایان ئەزانی کە ئینگلیزەکان ڕزگارکەری قەومە بچووکە بێ‌دەسەلاتەکانن لەژێر چنگی دەوڵەتە گەورەکان و بۆ ئەوە هاتوون کە ئاسایش بخەنە وولاتەوە، برسییەتی نەهێڵن، ڕاستی و ماف(حەق)بڵاوبکەنەوە، وردە وردە بیریان گۆڕیبوو و بایان‌دابووەوە، واتە بیونەوە بە(تورکخوا) ...

(لێرەدا ویلسنی حاکمی گشتی بریتانیا لە لاپەڕە (١٣١) کتێبەکەیدا «٣٧» دانی‌پێدادەنێت کە کردەوەی ئەفسەرە ئینگلیزەکان لەو ڕۆژابەدا و ئەو سیاسەتەی کە لەسەری ئەڕیشتن وایان لە کوردەکان کردبوو ئەو پڕو پاگەندانەی کە تورکەکان بڵاویان ئەکردەوە بەراستی بزانن کە بە کوردەکانیان ئەوت: ئینگلیزەکان و مأمورەکانیان هەروەکو رووسەکان لەگەڵتانا ئەجووڵێنەوە و

بەدەردێکتان ئەبەن لە دوارۆژدا واتان لێ‌بێت دەست‌وپێی عەرەب و کلدانی‌یەکان ماچ بکەن)، ئەو تورکخوایانە بە هەمو جۆرێک پڕوپاگاندەیان بۆ تورک ئەکرد. ئەمە گەیشتبوە ڕادەیەکی وا کە ئیتر زۆرکەس نەیان ئەوێرا باسی کوردایەتی بکەن، چونکە لەلایەن تورکخواکانەوە بە نۆکەری ئینگلیز ئەدرانە قەڵەم و یا بە خائین و جاسوس دائەنران.

مێجەرسۆن حاکمی تازەی سلێمانی کە ماوەیەک پێش شەڕی گەورە (ساڵی ۱۹۰۹) بە خۆگۆڕین و بەرگی (خەفیەوە)وە هاتبوە کوردوستان و بە یەکێک لە شارەزاکانی هەواڵی کوردوستان ئەژمێررا، لەرووی فیزو تڕ زلی خۆی و مەرایی و دوور ڕووی زۆربەی خەڵقەوە وردە وردە جڵەوی حوکمی لەدەس دەرئەچوو وە لە دەس وەشاندن و حەپس و جەریمەکردن بەولاوە ڕێگەیەکی ئیداری بۆ نەمابوەوە، لەبەر ئەمە گەلێک کەسی کردبوو بە دوژمنی خۆی.

وەکی تریش بەبۆنەی جادەکردنەوە و ڕێگا دروست کردن ژمارەیەکی زۆر کورد و عەرەب و عەجەمی لە ژێر دەستی (عەزیز خان) ناوێکی (فەیلی)دا کۆ کردبوەوە و بە ناوی (موهەندیس) و موراقیبی کرێکارەوە خستبونیە هەر چوار لای سلێمانی. عەزیز خان کە نەخوێندەوارێکی تڕزل و تووش‌بوو چاوی عەرزی نەئەبینی و لەدوای (سۆن) هەر خۆی حیساب بوو.

لەناو موراقیبەکانیشا هی وای تیابو ناوی خۆی بەزەحمەت ئەنوسی. ئەمانە ڕێگاکانیان ڕاست ئەکردەوە و ڕێکیان ئەخست وە یا لەسەر جۆگە و شیوو ئاوەڕۆی کەندوکۆسپی شاخەکاندا پردیان دروست ئەکرد. لەم ڕێگانەدا دراوێکی ئێجگار زۆر خەرج‌کرا بەڵام بەشی زۆری ئەم دراوە کەبە لێشاوی لە صندوقی میری دەر ئەچوو لەڕێی وەکیلەکانیەوە ئەچوە خزمەت عەزیزخان و لەویشەوە بەرەو ژوور ئەبوەوە و وەکو ئەمان‌بیستەوە ئەچوە گیرفانی مێجەرسۆنی حاکمی بێ شەریکی هەرێمی سلێمانی. سۆن بەمەشەوە نەئەوەستا، لەوە ئەچوو کە بیەوێ کردەوەکانی لە خەڵق بشارێتەوە، لەبەر ئەوە لە تێکەیشتوەکان و نیشتمان پەروەردەکان بوبو بە (قەرەقۆش) و بە چەشنی ئیدارەی ئەو (قەرەقۆش)ەی میسر ناوچەی سلێمانی ئەبرد بەڕێوە».

رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«ڕۆژ نەبوو لەسەر تەرسی وڵاخ چەند لادێیەک جەریمە نەکرێت، کە سۆن بە بازاڕا بڕۆیشتایە ئەبوو خاوەن دوکان و کرێکارەکان بەجارێک ڕاست بنەوە و لە سلاّوبا بوەستن، ئەبوایە ڕێبوار خۆی لادایە و ڕێی بۆ چۆڵکا. پۆلیسێک لەرزی لێ بهاتایە وە یا جاسوسێک نەخۆشکەوتایە، بەگەورەو بچوکەوە ئەبوایە بچنە ماڵەکەی و هەواڵی بپرسن و دوعای خێری بۆبکەن. حەبیوم ئەفەندی جوولەکە کە بە منداڵی لەگەڵ مندا قوتابی بوو، کوڕی کابرایەکی حەماڵی گۆمرگ وەیا خەراردروو بوو لەم دەورەدا بوبو بە قۆمیسەری ناوچە (مأمور مرکز). جارێکیان ئەو حەبیومە تووشی لەرزوتا هات، گەورە و خەڵک شکی تیا نیە کە لە ڕوودا دەنگیان نەئەکرد و (لێو)یان بەر لێو نەئەنا. بەلاّم لە تاقمی دوو ڕوو و مونافیقەکان بەلاوە کەس نەمابوو لەم حاڵە وەڕس نەبێ. شاری سلێمانی لە ژێرەوە وەکو مەنجەڵی سەر ئاگر قوڵپی ئەدا. لەبەر ئەوە کە مێجەرسۆن کەوتە شەڕفرۆشتن بە شێخ مەحمود و ویستی سەری پێ بنەوێنێت، شێخ توانی بە گورجی بێتە دەست و شۆرشێک بنێتەوە»

بەو جۆرە بۆمان دەرکەوت کە ئینگلیزەکان دوای ئەوەی مێجەرسۆنیان نارده سلێمانی و دەستی کرد بە حوکمی قەرەقۆش و هەر ڕۆژە بیانویەکی بە شێخ مەحمود ئەگرت و مووچەکەی لە (١٥)هەزار ڕوپیەوە کرد بە (١٠)هەزار ڕوپیە و حەرەسەکانی لێ کێشایەوە و هەڕەشەی لە خەڵک و لە ئەفسەرە کوردەکان ئەکرد کە لە شێخ مەحمود دووربکەونەوە ئیتر شێخ مەحمود بۆی دەرکەوت کە ئەو ڕەفتارەی مێجەرسۆن شتێکی خۆرایی نەبووە بەڵکو بە هۆی گۆڕینی سیاسەتی بریتانیاوە بوە بەرامبەر بە کورد، ئیتر شێخ مەحمود چاری نەماو کەوتە خۆ کۆکردنەوە و پەیوەندی کردن لەگەڵ دۆستەکانیا و بەر لەوەی بە چەک ڕوو بە ڕووی ئینگلیزەکان ببێتەوە ئەم نامەیەی نارد بۆ ویلسن: «٣»

«هیوامان زۆر بە هێز بوو کە بەندی پەیمانەکەتان بەجێ بهێنن، بەلاّم ئێستا کردەوەی پیاوە سیاسیەکانتان لەوە ناچێت و نەئەبوایە بەرامبەر بە قەومێکی ئازادیخواز بکرێت. من وای بە باش ئەزانم کە زوو حەقی کورد بدرێت ئەگینا کورد ناچارە حەقی خۆی بسێنێت.»

پاش ئەوەی شێخ مەحمود هیچ ئەنجامێکی دەسگیر نەبوو، چاری نەما کەوتە

خۆی و خۆی گورج کردەوە و ناردی بەشوێن مەحمود خانی دزڵی‌دا کە بە لەشکرێکی چەکداری زۆری هەورامی‌یەوە گەیشتە شارباژێر.

کە مێجەرسۆن بیستی ئەو لەشکرەی مەحمود خانی دزڵی هاتوە، ئەم نامەیی نارد بۆ شێخ مەحمود: «٣»

« وەکو بیستومە مەحمود خانی دزڵی بە لەشکرێکی زۆری چەکداری هەورامی‌یەوە گەیشتوەتە شارباژێر و دێت بۆ دیدەنیتان. تکایە تێی بگەیەنن کە پێویستە تەنها خۆی و (١٠) کەسی بێ چەک زیاتر نەیەنە ناو شارەوە وە ئەگەر چەکیان پێ‌بوو هەر لە ڕێگاوە چەکەکانیان ببەنە پۆلیس‌خانە بە بێ چەک بێن».

سۆن. حاکمی سیاسی
١٨/مایس/١٩١٩

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: شێخ مەحمود بەو نامەیەی مێجەرسۆن زۆر سەغڵەت بوو ڕۆژی ٢٠/ی مایس ١٩١٩ مەحمود خانی دزڵی بە خۆی و لەشکرەکەیەوە گەیشتە سەر کەلی گۆیژە و چاوەڕوانی فەرمانی حوکومداری ئەکرد مێجرسۆن بەبێ لێکدانەوە و بە پەلە بەبیانوی ئەوەی کە ئەچێت ژنەکەی لە بەسرە بهێنێت، سلێمانی بە جێ هێشت و بەرلەوەی بڕوا فەرمانی جەنگ و بەربەستکردنی هاتنی مەحمود خانی سپارد بە (مێجەر دانلیس) کە لەو کاتەدا پیادەی لیڤی لە ژێر فەرماندەی ڕەزابەگ‌دا بوو و سوارەی لیڤی لە ژێر فەرماندەی (جماڵ عرفان)دا بوو لە بناری گۆیژە و سەرکاریزی (حسینە جۆلاّ) کە لەناو چادرا بوون ( هێزی لڤی هەموی لە ژێر سەرکردایەتی مێجەر دانلیس‌دا بووە)

ڕۆژی ٢١/ی مایس لەگەڵ هێزی مەحمود خاندا بە شاخی گۆیژەوە کەوتە شەڕکردن کە هەتا ئێوارە درێژەی کێشا، بەڵام هێزی لیڤی خۆی پێ نەگیرا و کشایەوە دواوە و خۆیان گەیاندە بارەگای حوکومدار و چوونە پاڵی و سوارە و پیادەی لیڤی هەموو بە جارێک چەکیان فڕێدا و هاواریان کرد: کورد کورد

ناکوژێ.

ئەو ڕۆژە جمال عرفان لەگەڵ سوارەکانیا گەڕایەوە بەلاّم ڕەزا بەگی فەرماندەی پیادەی لیڤی لەگەڵ (..١) چەکداریا هەتا نیوەشەو مایەوە شەڕی کرد هەتا گیرا و هێنرایەوە بۆ سلێمانی.

لە دواییدا باسی ئەو شەڕە بە دوورودرێژتر ئەکەین.

کە ئەو شەڕە دەستی پێ کرد هەموو ئینگلیزەکانی ناوشار گیران و کۆکرانەوە و بە ڕیزەوە لە کۆشکی حوکومداریەتیدا دانران و مأمور و پیاوەکانیشیان لە (دەبۆ) دانران و لەلایەن شێخ مەحمودەوە ئەم تەلگرافەی خوارەوە نێررا بۆ ویلسن: «٣»

« کورد لەووزەیدا نەما، ئیتر بە قسەی ئێوە تەفرە ناخوا و بۆ ئازادی دەست درایە چەک، گیانی هەموو پیاوەکانتان لە ژێر داڵدەی خۆمدایە، بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێ حەقی خۆمان بدەنێ کە ئازادی کوردە و وەعدتان بە جێ بێنن».

هەروەها شێخ مەحمود نامەشی نارد بۆ سەرۆک عەشیرەتەکانی سۆران و ناوچەی بادینان کە ئەمە پوختەی ئەو نامەیەبوە: «٣»

«ئینگلیزەکان ناچاریان کردین دەستبدەینە چەک و خۆمان لە ژەنگ و ژاری ئیگلیز ڕزگار بکەین، پشت بە خوا سەرکەوتن بۆ کوردە ، ئینگلیز نایەوێ کورد بە سەربەستی بژی و نایەوێ بە ئادەمیزادمان بزانێت»

دەربارەی ناردنی ئەو نامەیە جارێک شێخ باباعەلی شێخمەحمود بۆی گێڕامەوە و وتی ئەو نامەیەی کە باوکم بۆ شێخ ئەحمەدیبارزانی ناردبوو بە(فەخریبەگی واصف بەگ)دا ناردبووی کە فەخریبەگ ئەگاتە بارزان شێخئەحمەد لەوێ نابێ و لەدوای سێ ڕۆژ ئەگەڕێتەوە و نامەکەی ئەداتێ:

کاک مەسعود بارزانی لەمڕوەوە لە کتێبەکەیدا(البارزاني و الحركە\ التحرریە\ الكردیە\)«٢٣» دەربارەی وەرام بۆ ئەو نامەیەی کە شێخ مەحمود ناردبوی بۆ شێخ ئەحمەد ئەڵێ:

« کە شێخ مەحمودی حەفید دەستی کرد بە شۆرشەکەی و ڕوو بەڕووی ئینگلیز بووەوە لە مانگی مایسی ١٩١٩دا، شێخ ئەحمەدی بارزانی نامەی نارد بۆ هەندێ لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی بادینان بۆ ئەوەی لایەنی شێخ

مەحمود بگرن و خۆشی بۆ ئەوە هەندێ چەکداری بارزانی نارد بۆ ئەوەی بەشداری شۆڕشەکەی شێخ مەحمود بکەن . ئەو چەکدارانە لە ناوچەی (دۆڵی بیاو) کە بەشێکە لە ناوچەی سوورچییەکان لە رۆژهەڵاتی بارزاندا و بە رێگەی خەلیفان - بارزان‌دا تێ‌پەڕین و هەندێکی لەوێوە نارد و هەندێکی تری لەڕێگای (باڵەک)ەوە نارد و هەردوو تاقم لەڕێگایانا رووبەڕووی هەندێ بەکرێ‌گیراوی ئینگلیز بوونەوە و لەوشەڕدا هەندێکیان لێ کوژرا...

بەڵام بەرلەوەی هێزەکە بگاتە سلێمانی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیاندا بە دیل گیرابوو، لەبەر ئەوە گەڕانەوە بۆ ناوچەی بادینان»

کاک مەسعود لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: «هەندێ لەو سەرۆک عەشیرەتانەی ناوچەی بادینان کە شێخ ئەحمەدی بارزانی نامەی بۆ ناردبون کە یارمەتی شێخ مەحمود بدەن نامەکانی شێخ ئەحمەدیان دابوو بە ئینگلیزەکان و ئەوانیش ئەوەندەی تر قینیان لە شێخ ئەحمەد هەڵسا و بڕیاریان دا لە بارزان بدەن و ناوچەکەیان پێ چۆڵ بکەن لە جیاتی ئەوان ئاسوورییەکانی تیا نیشتەجێ بکەن».

لەباسی بزوتنەوەی هێزی نەتەوایەتیشدا بەر لەمە باسی ئەو تەقەلایەی شێخ ئەحمەدمان کردوە بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحمود.

ئەوی ڕاستی‌بێ ئەوەیە کە ئینگلیزەکان وەنەبوبێ ڕەفتاریان تەنها لە سلێمانیدا بەو جۆرە بوبێ ناسمانکرد و بوو بە هۆی ڕاپەڕینی شێخ مەحمود و هاوکارەکانی بەرامبەریان بەڵکو لە هەمو ناوچەکانی تری کوردوستاندا ڕەفتاریان لەوەی سلێمانی باشتر نەبووە بەڵام سیاسەتی ملشۆڕکردن بە کورد شتێک نەبووە کە ئینگلیزەکان بە ئاسانی بتوانن بیبەنەسەر لەبەر گی دوهەمی ئەم کتێبەدا بە دوور و درێژی باسی ئەو ڕاپەڕین و ئەو شۆڕشانە ئەکەین کە لە ناوچەکانی تری خواروی کوردوستاندا جگە لەو شۆڕشەی شێخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیزەکان کردبوی لە هەموی ئەدوێین و بۆمان روون ئەبێتەوە چۆن سیاسەتی نارەوای ئینگلیز لە ماوەی دوورخستنەوەی شێخ مەحمودا بۆ هندستان چۆن لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا هەموو ناوچەکانی تری کوردوستان ئاڵۆز بوو و ئینگلیزەکان چارەسەری ئەو ڕووداوانەیان نەکرد و لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٢٢دا دووبارە

ناچار بوون شێخ مەحمود لە هندستانەوە بهێننەوە و بیکەن بە حوکومداری کوردوستان وەکو لە شوێنی خۆیدا بەدوود و درێژی باسی ئەکەین و یەکەیەکە لەو دۆکیومێنتانەی ناو ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا ئەدوێین کە باسی ئەو ڕاپەڕینانە ئاکات لە ناوچەکانی کوردوستاندا.

ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیدا دەربارەی ڕوو بە ڕووبونەوەی شێخ مەحمود لە سلێمانیدا بە هۆی هێزی پێشمەرگەکانی مەحمود خانی دزلّیەوە کە بۆ یارمەتی شێخ هاتبوون بەرامبەر بە ئینگلیز ئەلّێ: «٤»

«شێخ مەحمود بە نهێنی داوای لە مەحمود خانی دزلّی کرد کە بە بیانووی زیارەتی مەرقەدی کاک ئەحمەدی شێخەوە خۆی و هێزەکانی ڕووەو سلێمانی بێن. کە ساتێک مێجەرسۆن داوای لە شێخ مەحمود کرد کە ڕێگە نەدا مەحمود خانی دزلّی بەو قەلّەبالّغیە بێتە ناو سلێمانیەوە شێخ لە وەرامدا پێی ووت: ناتوانێ ڕێگا لەو کەسە بگرێ کە ئەیەوێ بێت بۆ زیارەتی کاک ئەحمەدی شێخ، ئەوەبوو هێزەکانی مەحمود خان لە ١٩١٩/٥/٢١دا گەیشتنە سەر شاخی گۆیژە و لە ١٩١٩/٥/٢٣دا لەلایەن هێزەکانی کوردەوە دەست بەسەر سلێمانیدا گیرا»

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا دەربارەی هەلّوێست لە سلێمانیدا لەو ڕۆژانەدا ئەلّێ: «٣»

«ساتێک ئەو ئینگلیزانەی لە سلێمانیدا بوون گیران و هێنران بۆ کۆشکی حوکومداریەتی، شێخ مەحمود خۆی چوو بە پیریانەوە و یەکەیەکە دەستی گوشین و پێی ووتن: ئێوە میوانێکی خۆشەویست و بەڕێزی خۆمن، دلّتان هیچ نەکات بە سەربەستی ئەژین.

شێخ مەحمود ڕووی کردە گرینهاوس (کە مێجەرسۆن کردبوی بە جێ‌نشینی خۆی)و لێی پرسی: کوا (سۆن)؟... تۆبویی بە هەوێنی نانەوەی ئەم شەڕە! زۆر باش ئەزانیت ئێمە چیمان لە ئێوە ئەویست بەلاّم نەمانزانی ئێوە چیتان لە ئێمە ئەوێ؟؟

لە پاش دانیشتن و دلّ نەوازشێکی زۆر، ڕوی کردە گرینهاوس و پێی ووت: «من لە ڕێگەی ئازادی گەلەکەما زۆر بە پاکی و بە ڕاستی هاتم بە پیر ئێوەوە بە هیوایەکی زۆر گەورەوە چاوەڕێی بەجێهێنانی ئەو بەلّێنانەتانم ئەکرد کە

بەشەرەفی بریتانیا دڵنیا کرابووین، کەچی تۆو سۆن ئاگرتان بەردایە هیوای کورد و بەڵێنەکانتان لەبیر چوەووە ... داخەکەم ئەبوایە لەڕۆژی خۆیدا ڕێگەم نەدانایە... چونکە وابزانم لەمەی ئێستەتان زیاتر پێ‌نەدەکردین !!!».

بەلاَم لەپاش‌چی...... لەپاش باران کەپەنک؟... لێرەدا ڕەخنەکەی حاجی سەید حسنی مامی شێخ مەحمودمان دێتەوە بیر کە بە شێخ مەحمودی وتبوو: مەحمود، ئەبوایە هەموو شتێکت لەپێشەوە بۆ ڕوون ببوایەتەوە ئەوسا حوکومداریەتیت قبوڵ بکردایە) ...

بەو پێ‌یە ئینگلیزەکانی ناو سلێمانی هەمویان گیران کە بریتی بوون لە :

١ـ مێجەر گرینهاوس ـ جێگری حاکمی سیاسی (مێجەرسۆن خۆی دەربازکردبوو)

٢ـ کاپتن دۆگلاس معاونی حاکمی سیاسی

٣ـ کاپتن هۆلت معاونی سیاسی

٤ـ کاپتن ڕایت معاونی سیاسی

٥ـ مێجەر دانلیس ـ فەرماندەری هێزی لیڤی و دانشمەندی سوپای حوکومدار

٦ـ شکۆفیلڵ ـ سارجنت میجەر

٧ـ کاپتن بۆند حاکمی سیاسی‌ی چەمچەماڵ کە لەو ڕۆژانەدا هاتبوە سلێمانی (لەداوییدا کە شێخ مەحمود نێررابوو بۆ هندستان کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند کوشتی وەکو لە بەرگی دوهەما باسی ئەکەین).

ئەو گیراوانەی سەرەوە چەند نەفەرێک سەربازی ئینگلیزیشیان لەگەڵابوو مەئموورە هیندی و عەرەب و ئەفغانی و ئێرانیەکان لەگەڵ هەموو خزمەتکارەکانیانا کە ژمارەیان (٢٠٠)کەس بوو بەرەڵلاَ کران و سەربەست بوون جگە لە (١٥) مأموری هندی گەورە لەگەڵ چەند ئینگلیزێکدا نێررانە قشڵە (دەبو).

مامۆستا ڕەفیق حلمی باسی ئەو ڕۆژانەی دوای گرتنی ئینگلیزەکان و شۆڕشەکەی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا بەم جۆرە ئەکا: «٢»

«لەو کاتەدا کە ئینگلیزەکان هەوڵیان ئەدا شێخ مەحمود بشکێنن و دۆستەکانی لێ دوور بخەنەوە و دەمی خەڵکیان چەور ئەکرد بۆ ئەوەی لە شێخ

مەحمود هەڵگەڕێنەوە، شێخ مەحمود بەتەواوی لە مەرام و ڕەفتاری ئینگلیزەکان گەیشتبوو، هیچ ئومێدێکی پێیان نەمابوو، بۆیە ئەویش لەگەڵ هەندێ سەرۆک عەشیرەت و خوێندەوار و ئەفسەری کوردا کەوتە گفت و گۆ و کەریم بەگی فەتاح بەگی هەماوەند و هەباسی مەحمود ئاغای پژدەر و مەحمود خانی دزڵی لە ڕیزی دۆست و سوێند خوارەکانیا بوون، نارەزایی و بێزاری خەڵک لە ناوچەکانی خواروی کوردوستان بەرامبەر بە هەڵوێست و بە کردەوەی نا ڕەوای ئینگلیزەکان هیوا و تین و ئومێدی بە شێخ مەحمود دابوو، هەڵگیرساندنی شۆرش و ڕاپەڕین لە ناوچەی زاخۆ (نیازی لە ڕاپەڕینی عەشیرەتی گۆیان بووە) دژی ئینگلیز شێخ مەحمودی خستە سەر ئەوەی شۆڕشێک دژی ئینگلیزەکان بەرپا بکا و بە نهێنی ڕای‌سپارد مەحمود خانی دزڵی بە خۆی و (٣٠٠) چەکدارەوە، بە ناوی زیارەتی کاک ئەحمەدەوە بێنە سلێمانی و لە ١٩١٩/٥/٢١دا هاتنە سەر شاخی گۆیژە و ڕژانە ناو شاری سلێمانیەوە و هەتا ئەو هێزە نەگەیشتبوە سەر شاخی گۆیژە ئینگلیزەکان ئاگاداری هاتنی ئەو هێزەی مەحمود خانی دزڵی نەبوون.

هێزەکانی مێجەر (دانلیس) کە بریتی بوو لە (٢٠٠٠)پیادە و (٤٠٠)سوار، لە دوای چەند تەقەیەک و کوشتنی دوو ئەفسەری ئینگلیزی و چەند نەفەرێک بڵاوەیان لێ کرد و ئەوانەی کوردبون لەناو هێزەکانی دانلیس‌دا چوونە پاڵ هێزەکەی شێخ مەحمود و دانلیس بە دیلی گیرا (بەلاّم مێجەرسۆن لەو ڕاپۆرتەی لە دوکیومێنتی ژمارە C.O.730-13-3341 کە لە باسی پاشگەزبوونەوەی ئینگلیزدا لی‌ی دواین ژمارەی هێزەکەی بە کەمتر دەست نیشان کردوە).

بەلاّم مێجەرسۆن بەر لە گەیشتنی هێزەکەی مەحمود خانی دزڵی بۆ ناو شاری سلێمانی (گرینهاوس)ی کردبوو بە وەکیلی خۆی و لە ١٩١٩/٥/٢١دا خۆی گەیاندە کەرکوک.

ویڵسنی حاکمی گشتی بریتانیا دوای ئەو ڕووداوە و گرتنی ئینگلیزەکان بە فڕۆکە بەسەر سلێمانی‌دا فڕی و بەیان‌نامەی بۆ شێخ مەحمود بڵاوکردەوە و داوای لە شێخ مەحمود کرد بۆ گفت و گۆ بچێتە بەغدا.

شێخ مەحمود بە هۆی ئەو ئینگلیزانەی کە لە (دەبۆ)دا دەستی بەسەراگرتبون هەندێ مەرجی دانا بۆ ئەو چوونەی بۆ بەغدا بەلاّم ویڵسن ئەو مەرجانەی شێخ

مەحمودی قبوڵ نەکرد، دوای ئەوە ویلسن بە فڕۆکە چوە هەڵەبجە بۆ ئەوەی ئەفسەری سیاسی لە هەڵەبجە (نیازی لە فڕۆکەوانی ئینگلیزی کە کرابو بە موعاونی حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە) کە هەڵەبجە لە لایەن هەورامی‌یەکانی سەر بە شێخ مەحمودەوە گیرابوو ڕزگاری بکا، بەلاّم هیچی پێ نەکرا و لە دواییدا بە هۆی تەقەلاّی خانمی ژنی وەسمان پاشاوە دەرباز کرابوو»

ڕەفیق حلمی لەو کاتەدا کە ئینگلیزەکان لە سلێمانیدا گیران و هێزی مەحمود خانی دزڵی هاتە ناو سلێمانیەوە ئەوسا ئەو لەگەڵ (بێل)دا لە (ڕەواندز)بوە، لە یاداشتەکانیا لەباسی هەڵوێستی ئەو ڕۆژانە لە ناوچەی ڕەواندز و دەوروبەریا نوسیویەتی: «٢»

«کە دەنگی شۆڕشی شێخ مەحمود لە ڕەواندز و لە ناو عەشایەرەکانا بلاّو بوەوە گەلێ کەس پێی خۆشبوو بەتایبەتی ئەوانەی لە ئینگلیز نا ڕەزابوون و ئیتر هەرچیت ئەبینی چەکی لە خۆی ئەداو خۆی بۆ شەڕ ئامادە ئەکرد ... زۆر لەمانە ئۆقرەیان لێ هەڵگیرابوو بەتەمابوون شۆڕشەکەی شێخ مەحمود پەرە بسێنێت و بتەنێتەوە و بگاتە ئەمدیوی زێ، چاوەڕێ بوون لەشکری شێخ مەحمود نزیک بکەوێتەوە و بەری کۆیە بگرێ هەتا ئەمانیش لە عاستی خۆیانەوەڕاست ببنەوە و دەس بدەنە چەک و شۆڕش بگێڕن، هەواڵی زۆر سەیر بلاّو ئەبوەوە دەربارەی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود و خەڵک ئەوەندەی تریشی ئەنایە سەر بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە قسانەی کە بلاّو ئەبوەوە وەکو ئەفسانە و خەرافات کارێکی بەتینی هەبوو، تەزویەکی خۆش گەرمی ئەهێنا بە گیانی کوردەکانا.

لەو ڕۆژانەدا عەماری حوکومەت لە ڕەواندز هەموو تەحرە زەخیرەیەکی تیادابوو، تالاّنی عەمارێکی وا لەو ڕۆژانەدا بۆ دێهات و عەشایەر شتێکی کەم نەبوو، شاری ڕەواندز تەنها دوو ئینگلیزی لێبوو (بێل) و مولازمێکی موعاونی بێل و هێزی ئینگلیز لە کوردە بە کرێ گیراوەکان پێک هاتبوو .١٥ تا ٢٠٠ نەفەر ئەبوو کە لەژێر سەرکردایەتی (نوری باوێل ئاغا)دابوو بە ڕۆژ موعاونەکەی بێل مەشقی پێ ئەکردن. هاوین بوو، ئاغاکانی عەشایەر بەسەڵتی خۆیان و تفەنگچیەکانیان مابوونەوە و کۆچ و باریان ڕەوانە کردبوو بۆ کوێستان

و چاوەڕێی هەراکەی شێخ مەحمود بوون.

بێلْ لەوەستاوێکی سامناکدابوو لە ماوەی دوو ڕۆژدا پڕ بە گونیەیەک (بانکنوت)ی گەیاندە ڕەواندز و لە سەردەسی خۆمدا ئەم لێشاوە روپیەیەی بەسەر ئەوانەدا بلاْوکردەوە کە بۆیە لە ڕەواندزا بوون چونکە چاوەروانی تالاْنی بوون، بەمە (بێلْ) تالاْنکردنی لە بیر بردنەوە و چاو بەرەو زێری کردن و دوای ئەوە ئەوان (عەشایەرەکان) ڕەواندزیان بەجێ هێشت و چوونە کوێستان بێلْ ناسراوەکانی ڕەواندزی لەماڵی خۆیا کۆکردەوە و گفتوگۆی لەگەلاْ کردن و ئەیویست دەمودوویان تاقی بکاتەوە بزانێ ئەگەر هێزەکانی شێخ مەحمود لە ڕێی کۆیە پەڕینەوە ئەوانەی ڕەواندز ئەچنە پالْ شێخ مەحود یانا »

ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا باسی ناپیاوی باوێل ئاغا و مەردایەتی غەفور خانی ناو دەشت ئەکا لەو گفت و گۆیانەی کە کرا (ڕەفیق حلمی لە یاداشتەکانیدا هۆی مانەوەی ئەو ڕۆژانەی لەگەلْ بێلْدا ئەکا کە ساتی خۆی بە موافەقەی شێخ مەحمود بووە).

## رووبەڕووبوونەوەی ئینگلیز:

١- شەری تاسلوجە، شەری دەربەندی بازیان، برینداربوونی شێخ مەحمود و بەدیل گرتنی.

٢ـ موحاکەمەکردنی شێخ‌مەحمود لە بەغدا و ئاوارەکردنی بۆ هندستان.

٣ـ ئاوارەبوونی شێخان وئەوانەی بەشداریی شۆرشیان کردبوو.

٤- کورتە باسێکی یەکەم حوکمدارێتی شێخ مەحمود.

یەکەم- تەمەن و ماوەی حوکمدارێتی.

دووهەم- دەزگاکانی یەکەم حوکمدارێتی.

سێهەم- دەرامەدی ناوچەی حوکمدارێتی.

٥- ئەو رەخنانەی گیراوە و ئەگیری لە یەکەم حوکمدارێتی.

# ڕووبەڕوونەوە و شەڕەکان

دەربارەی ڕووبەڕوو بوونەوەی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دوای ئەوەی دەستبەسەر شاری سلێمانیدا گیرا و ئینگلیزەکان لە (دەبۆ)ی سلێمانیدا دەستبەسەرکران، گەلێک لەنووسەرانی بیگانە و خۆمانە باسی ئەو شەڕەیان کردووە کەهەوڵ دەدەین کورتەی باسی هەریەکێکیان بخەینە بەر چاو.

ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانی لەکتێبەکەیدا دەربارەی شۆڕشی کورد بەرامبەر بە ئینگلیزەکان ئەڵێ: «۲۷»

« شێخ مەحمود بۆ ئەوەی ناوی خۆی بەرزبکاتەوە، بەنەهێنی(. . ۳۰)چەکداری لە کوردستانی ئێرانەوە داواکرد(نیازی لە چەکدارەکانی مەحمودخانی دزلی بووە) و ئەو هێزە گەیشتە سلێمانی. هێزی لیڤی شەڕێکی ئازایانەیان لەگەڵاکردن بەڵام بەرگەیان نەگرتن و شکان، بەوجۆرە شێخ‌مەحمود بوو بەدەسەڵاتداری تەواو.

مێجەر گرینهاوس کە بەشێوەیەکی کاتی ببو بەجێگری مێجەرسۆن هەرچی پارەی خەزێنە هەبوو هەمووی لێ‌سەندرا و دەستی‌بەسەرداگیرا و شێخ‌مەحمود بەتەواوی ئیعلانی‌کرد کە حاکمی گشتی هەموو کوردستانە (Chief Ruler) و بەیداخی تایبەتی هەڵکردو پوولی تایبەتی بەکارهێنا(وابزانم ویلسن لەوەدا بەهەڵەداچوە چونکە پوول لە حوکومدارییەتی دووهەمیدا بووە وەکو لەبەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین)و هەموو ئەوانەی سەربەخۆی بوون لە ناوچەکەدا دایمەزراندن و خەتی تەلگرافی لەگەڵ کەرکوکدا پچڕاند.

دووڕۆژی پی‌نەچوو هەواڵی ئەو بزوتنەوەیەی شێخ‌مەحمود گەیشتە هەڵەبجە و خانەقین منیش یەکسەر بەفڕۆکە چووم بۆ ئەوەی بزانم ئەو شەش ئەفسەرە ئینگلیزەی لە سلێمانی گیرابوون چیان بەسەرهاتووە. ویستم بچمە هەڵەبجە بۆ ئەوەی ئەفسەری سیاسی ئەویٰ لەگەڵ خۆمدا بیەم بەڵام لەبەر نەبوونی بەنزین لە تەیارەکەدا ئەوکارەم بۆ نەهاتە ئەنجام.

ئەوەی کە توانیم بیکەم لەو چوونەمدا ئەوەبوو لەئاسمانەوە نامەیەکم بۆ ئەو ئەفسەرەی هەڵەبجە فڕێدایە خوارەوە(نیازی لە لیزی فڕۆکەوانبووە)بۆ ئەوەی لەوناوەدا نەمێنێت و خۆی دەربازبکات، ئەوەبوو توانیبوی بەیارمەتی خانمی ژنی وەسمانپاشا خۆی دەربازبکات و خانمیش لە هەڵەبجە دەربازی کردبو».

ئەحمەد تەقی لە یادداشتەکانیدا ئەڵێ: «٤»

« کە ویلسن بە فڕۆکە بەسەر سلێمانیدا تێپەڕیکرد بەیانێکی بەسەر شاری سلێمانیدا بلاوکردەوە کە بۆ شێخمەحمود نووسرابوو داوایلێکرابوو کە بچێتە بەغدا بۆ گفتوگۆ، بەلام شێخمەحمود بۆ ئەوچوونەی چەند مەرجێکی دانا کە ویلسن ئەو مەرجانەی شێخمەحمودی قبووڵنەکرد(نە ئەحمەدتەقی و نە ویلسن باسی ئەو مەرجانەی شێخمەحمودیان نەکردووە بەلام گومان لەوەدا نییە شێخ مەحمود زانیویەتی دەستیئەبرن و ئەیگرن و بەزۆر ئینگلیزە گیراوەکانی پێبەرئەدەن) .

ویلسن باسی هەڵوێستی ئەورۆژانە ئەکاو ئەڵێ: «٣٧»

«هەڵوێستێکی ئێجگار سەیربوو، لە کەرکوک هەمووی بەتالیۆنێکمان هەبوو(پیادە) لەگەڵ چەند ئۆتۆمۆبیلێکی عەسکەری و چەند سوارەیەک. لە (بێجی) هەندێ هێزمان هەبوو، فەرمان بۆ ئەوانیش دەرچوو کە بەرەو کەرکوک بجولێن.

هێزەکانمان بۆ ئەوەی خۆی ئامادەبکات کە بەرەو سلێمانی بڕۆن، ئەو ئەفسەرەی کە لێپرسراوبوو لە کەرکوک ئەمری پێکرابوو تەنها بەرەو دەشتی چەمچەماڵ بڕوات ئەوەی لە بێجی بوو ئەوانیش گەیشتنە کەرکوک.

بەلام ئەو ئەفسەرەی کە ڕاسپێررابوو تەنها هەتا چەمچەماڵ بڕوات، لەجیاتی ئەوە یەکسەر ملیلێنابوو هەتا گەیشتبوە(تاسلوجە) کە نزیکی (١٢)میل لە خۆرئاوای سلێمانییەوە دوورە.کوردەکان بەرزاییەکانی ئەو ناوچەیان گرتبوو، لەئەنجامی ئەوەدا چوار ئۆتۆمۆبیلی عەسکەری و(٩) ئۆتۆمۆبیلی فوردی لۆری سەربازگوێزەرەوە زیانیان پێگەیشت و زۆر کوژراو و بریندار هەبوو».

لۆنگریک لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو هێزەی ئینگلیز کە لەشەڕی دەربەندی بازیاندا بەشداریکردبوو ئەڵێ: «٤٣»

«هێزەکەمان کە گەیشتە (تاسلوجە) نزیکی (٥)هەزار کەسێک ئەبوو کە رائد(بومان)سەرکردەی ئەو هێزە بوو، هێزەکە لە ١٩١٩/٥/٢٥دا گەیشتبوە تاسلوجە و لە بەیانی‌یەوە هەتا عەسر شەڕ درێژەی کێشا و هێزی ئینگلیز شکاو ناچاربوو بەرەو کەرکوک کشایەوە.»

جەلال تاڵەبانی لە کتێبەکەیدا دەربارەی ئەو شەڕە ئەڵێ: «١٧»

«ئەو هێزەی ئینگلیز کە لە سلێمانیدا لێی‌درا لەژێر سەرکردایەتی کۆلۆنێل(بریدجس)بوو لە ١٩١٩/٥/٢٣دا بەرەو سلێمانی کەوتەڕێ بەڵام لە ١٩١٩/٥/٢٥دا ئابلۆوقەدراو کۆلۆنێل(بریدجس)شکاو توانی بە یارمەتی ئەو هێزەی کە ئینگلیز بۆی‌ناردبو و فریای‌کەوتبو بەسەرکردایەتی کۆلۆنێل(کندی) دەربازببێت و لەو شەڕەدا مولازم (پۆڵ) لەکەتیبەی/١٢ کوژرا و کاپتن (جیشۆڵم)و مولازم (دیکسن)برینداربوون و (٨) زابت‌سەف و سەربازی ئینگلیز کوژران و (١٢)کەس برینداربوون. جگە لەوە(١٤)ئینگلیزی تر دیارنەمان و سۆراخیان نەبوو کە لەناو ئەوانەدا ئەفسەرێک ناوی(تۆمسۆن)بوو.»

ئەحمەد تەقی لە یادداشتەکانیدا دەربارەی ئەو شەڕەی تاسلوجە ئەڵێ: «٤»

«بەشکاندنی هێزەکەی ئینگلیز ناوی بەریتانیا لای خەڵک زڕا، ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی ڕێگا لە کوردەکانی دەوروبەری خانەقین و کفری بگرن و ڕێگەی ئەوەیان‌نەدەن کە یارمەتی شێخ‌مەحمود بدەن فیرقەیەکی پیادە بەسەرکردایەتی کۆلۆنێل(بودی) نێردرا بۆ دەوروبەری خانەقین.

ویلسنی حاکمی گشتی لەکتێبەکەیدا«٣٧» دەربارەی حەملەی(فرایزەر)کە ئاڕاستەی هێزەکانی شێخ‌مەحمود کرابوو بۆئەوەی بگاتە سلێمانی و ئینگلیزەکان ڕزگاربکات ئەڵێ:

جەنەڕاڵ‌فرایزەر کە سەرکردەی فیرقەی‌موسڵ بوو هێزەکانی بەرەو کەرکوک ڕۆیشتن بۆ ئەوەی لەوێوە ئاڕاستەی سلێمانی بکرێن کەبریتی‌بوو لە دوولیوای سوارە و پیادە لەگەڵ ئۆتۆمۆبیلی عەسکەری و بەرەوپێشەوە ڕۆیشتن بۆئەوەی بۆ کوردەکان دەربخەین کە هێزەکانمان لە ناوچەی بەرزایی و گردەکاندا لەهێزی کوردەکان کەمترنین و هەندێ پیادە وچەند تۆپێکی شاخیش لە خانەقینەوە بەرەوژوور بوونەوە و هێزەکانی جەنەڕاڵ فرایزەر لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیران

له چەمچەماڵ خۆیان دامەزراند و خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ.لە ١٧/ی حوزەیرانی ١٩١٩دا ئەو سەربازانەی لە(بێنجي)یەوە بەرەو فەتحە وکەرکوک ئەڕۆیشتن گەرما زەیفی لە سەربازەکان سەندبوو ژمارەیەک لەو سەربازانەی پەک‌خستبوو،بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەرەوڕووی هێزی شێخ‌مەحمود بوونەوە کە دەربەندی‌بازیانی گرتبو کە بریتییە لە زنجیرە شاخەکانی قەرەداغ کە (١٢)میل دورە لە ڕۆژهەلاّتی چەمچەماڵەوە.لەو دەربەندەدا تاقە ڕێگەیەک هەبوو کە ئەبوایە بەوێدا تێ‌پەڕی بکردایە کە بریتی‌بوو لە دیوارێکی سەختی بەرز، کە بەرزاییەکەی لە هەندێ شوێندا ئەگاتە(...٤)فوت کە دە ساڵ لەمەوبەر تورکەکانیش لەو دەربەندەدا تووشی کارەسات بوون.

ڕۆژی دوایی بەر لە ڕۆژهەلاّت، هێزەکانمان ڕوویان‌کردە بەرزاییەکان لە خۆرهەلاّتدا و تۆپەکانمان دەستیان‌کرد بە تۆپ‌بارانی گەلیی‌دەربەند.

کوردەکان لایان‌وابوو هێرشەکەمان لەجۆری ئەو هێرشانە ئەبێ کە تورکەکان وەختی خۆی ئەیان‌کرد وهەر لەو ڕێگایەوە مل‌ئەنێ‌ین کە بەناو دەربەندا ئەڕوا (دەربەندی بازیان) و نەیان ئەزانی ئێمە لە بەرزاییەکانی ژووروی ئەوانەوە هێرش ئەبەینە سەریان و لەوێوە ئاگر بارانیان ئەکەین.

لە دوای چەند دەقیقەیەک کە هێزەکانمان لەگەڵیانا تێک‌ڕژان و ڕووبەڕووی یەک بوونەوە و شەڕی دەستەویەخە دەستی پێ‌کرد، بەتالیۆنی بۆرمایی ژمارە (٨٥) ئێوارە هەموو دەربەندەکەی گرتە ژێر دەستی خۆی و شێخ مەحمود و براکەی برینداربوون (نیازی لە شێخ حەمەغەریب‌بووە کە زاوای شێخ مەحمود بووە و ئینگلیزەکان بە ژن‌برا ئەڵێن (Brother in law) کە شێخ مەحمود ژن برای شێخ حەمەغەریب بووە، شێخ قادری برای شێخ مەحمود ئەگەرچی بەشداری شەڕی کودبوو بەلاّم لە دەربەندی بازیان‌دا نەبووە)، هێزەکەی شێخ مەحمود ئەوەی لەوێدابوو کوژران یا بە دیل گیران کە لەوانە (٤٨) کوژرا و هەبوو، نزیکی (١٠٠)کەس بە دیل گیران (ئەحمەد تەقیش لە یاداشتەکانیا ژمارەی کوژراوەکانی بە ٤٨ کەس داناوە بەلاّم ئەڵێ ژمارەی دیلەکان ١٢٠ کەس بوون).

ویڵسن لە کتێبەکەیدا لەسەری ئەڕواو ئەڵێ:

«جەنەراڵ فرایزەر زۆر نا ئارام بوو دەربارەی ئەو ئینگلیزانەی لە سلێمانیدا گیرابوون، لەبەر ئەوە بەپەلە هێزی (ڕم هەڵگر)ی ژمارە (٣٢)ی نارد بۆ سلێمانی کە (٣٠) میل لەو دەربەندەوە دووربوو، خێرا و ئازایانە خۆیان گەیاندە سلێمانی و حەپسەکانیان بەردا بەرلەوەی هەواڵی شکاندنی هێزەکەی شێخ مەحمود بگاتە سلێمانی.

ڕۆژی دوایی هێزەکانی تر ڕوویان کردە سلێمانی و لەدوای شەش هەفتە دەس کرا بە سزادانی سەرکردەی ئەو چەتانەی بەشداریان کردبوو. لە هەفتەی یەکەمی مانگی ئابی/١٩١٩دا ئارام و ئاسایش بەرپاکرا و جەنەراڵ فرایزەر کشایەوە بۆ شوێنی خۆی و لە سلێمانیدا ئیدارەیەکەی مەدەنی پێکهێنرا و دەست بەسەر هەمو ناوچەکەدا گیرا و حامیەیەکی کاتی لە سلێمانیدا بەجێ هێڵرا و لە کەرکوک سەرکردایەتیەک ڕێکخرا بۆ ئەو هێزە کەمەی کە لەوێ هێڵرایەوە».

ڕەفیق حلمی لەیاداشتەکانیا دەربارەی شەڕی تاسلوجە و دەربەندی بازیان هەروەکو زۆربەی نوسەرانی تر باسی ئەو شەڕانەی کردوە و ئەڵێ: «٢»

دوای ئەوەی کە مەحمود خانی دزلی هاتە سلێمانی و دەس بەسەر سلێمانیدا گیرا و ئینگلیزەکان لە (دەبۆ) دەس بەسەر گیران، مێجەرسۆن بەر لەوەی هێزەکەی مەحمود خان بگاتە ناو شار گرینهاوسی کرد بە وەکیلی خۆی و بە ئۆتۆمبیل لە ٢١/مایسی/١٩١٩دا خۆی گەیاندە کەرکوک و بەرلەوە خەتی تەلەفونی کەرکوک بڕرابوو بۆیە هەواڵی شۆڕش و گرتنی سلێمانی و دەس بە سەراگرتنی ئەفسەرەکانی ئینگلیز لە ڕێی هەڵەبجە و خانەقینەوە دوای دوو ڕۆژ گەیشتە بەغدا و ویڵسن بە فڕۆکە هاتە سەر سلێمانی و بەسەر دەبۆکەدا گەڕا و مەنشورێکی بۆ شێخ مەحمود خستە خوارێ و داوای لە شێخ مەحمود کردبوو بۆ گفتوگۆ بچێتە بەغدا و شێخ مەحمودیش بە هۆی ئینگلیزەکانەوە کە لە (دەبۆ) گیرابوون هەندێ مەرجی (شروط)ی دانا بۆ ئەو گفتوگۆیەی کە ویڵسن داوای کردبوو.

ئینگلیزەکانی کەرکوک و مێجەرسۆن تەواو لە ئەندیشەدابوون و بەپەلە ئەمردرا بە گەورەی ئینگلیزەکان لە کەرکوک هێزێک لە ژێر پاراستنی تانک

(دەبابە) و فڕۆکەدا بنێرێتە چەمچەماڵ و لە کەرکوک هێزێکی گەورە و ڕێک‌وپێک نێررا بۆ چەمچەماڵ »

ڕەفیق حلمیش وەک یاداشتەکانی تر و نوسراوەکانی تر باسی ئەوە ئەکا کە هێزەکەی ئینگلیز لە چەمچەماڵ خۆی نەگرتبوو بەبێ پرس گەیشتبوە تاسلوجە و لەوێ لێی درابوو زیانی پێ‌گەوت، کە ئەم شکاندنەی ئینگلیز و سەرکەوتنەی شێخ مەحمود بوو بە هۆی زڕاندنی ناوی ئینگلیز و سەربەرزکردنەوەی گەلێک لە کوردەکان. لە کوردوستانی ئێرانیش جووڵە دەستی پێ کرد و لە حوکومەتی ئێران یاخی بوون و بڕیاریان دا بەیەک‌خستنی کوردەکانی عیراق و ئێران و دامەزراندنی کوردوستانی گەورە لە ژێر حوکمی شێخ مەحمودا.

ئینگلیزەکان بۆ چارەسەری ئەو بەسەرهاتە لە کەرکوکەوە لە ١٩١٩/٥/٢٣دا کۆلۆنێل بریدجس (Bridjes) بە هێزێکی گەورەوە کە دوو (ڕەعیلی مرزاقدار= ڕم هەڵگر)و سریەیەک لە فەوجی (مهرناس) و دوو (دەبابە) لەلایەکەوە و (کاپتن لۆنگریک)ی موعاونی سیاسی کەرکوک بە خۆی و لیڤی‌یەکانیەوە لە لایەکی ترەوە گەیشتنە (تاسلوجە)، لەبەیانی‌ی ١٩١٩/٥/٢٥دا لە لایەن هێزی کوردەوە دەورەدران، ئەو کوردانەی لە هێزی لیڤی‌ی ژێردەستی (لۆنگریک)دا بوون چوونە پاڵ هێزی شۆڕشگیرانی کوردەوە و بوون بەیەک، کۆلۆنێل (بریدجس) بە شپەرزەیی کشایەوە دەربەندی بازیان و دوو دەبابەشی لێ بەجێ‌مابوو وە بە پەلە بەسواری ئۆتۆمۆبیل یارمەتی نێررا بۆ بریدجس و توانی بە سواری ئۆتۆمۆبیل خۆی بگەیەنێتە چەمچەماڵ لەگەڵ ئەوەشدا دوو دەبابەی تریان لێ جێ‌ما بە نەفەرەکانیانەوە کە بە دیل گیران و مولازم (یۆڵ) لە کەتیبەی مرزقداری (٣٢) لەناو کوژراوەکان و کەپتن جیشۆلم و مولازم دیکسن لەناو بریندارەکاندا بوون و لە ظابط صف و نەفەری سەربازی ئینگلیزی (٨) کوژرا و (١٢) بریندار و (١٤) لەناوچو هەبوو و طومسن و دوو نەفەری تریش لەناوچوون.

لە دوای کۆکردنەوەی هێزێ ئینگلیز ئەو هێزە جارێکی تر بە سەرکردایەتی کۆلۆنێل (Man) لەگەڵ بریدجس‌دا نێررایەوە بۆ چەمچەماڵ.

شێخ مەحمود فەرمانی‌دا بە شێخ قادری برای کە دەس‌بەجێ بە خۆی و (٥٠٠) سواری کوردەوە بچێتە (بنە) کە ئەکەوتە (٤)میل ئەولای چەمچەماڵ

بۆ ئەوەی ڕێی هات و چۆن کەرکوک و چەمچەماڵ بپرێت و شێخ مەحمود خۆشی لە دەربەندی بازیاندا کەوتە خۆ ئامادەکردن و سوپەر هەڵکەندن بۆ لەشکرەکەی و ئەو هێزەی ئینگلیز کەلە چەمچەماڵ بوو لەلایەن کوردەوە گەمارۆ درابوو.

لە ٢٠/٥/مایسدا کاروانی چەک و خواردەمەنی لەژێر پاراستنی هێزێکی ئینگلیزدا نێررابوو بۆ ئەوەی ئەو یارمەتیانە بگەیەنرێتە گەمارۆدراوەکان بەلام لەماوەی (٢٤) میل لە کەرکوکەوە لەناو شاخەکانا تووشی هەڵمەتی کوردەکان بوون و هەمویان تالان و سەر ئەنگرێ کران.

هێزێکی تر لە ژێر سەرکردایەتی مێجەر (فەرز) (١٧)میل لەملای کەرکوکە لە نزیکی قەرە هەنجیر لەلایەن مەحمود خانی دزلی‌یەوە (٣)ڕۆژ گەمارۆدران و کوشتارێکی زۆریان لێ‌کرا. (وابزانم ڕەفیق حلمی لەوەی ٢٠/٥/مایسدا بە هەڵەدا چوە چونکە بەر لەوە ئەڵێ هێزەکە لە ٥/٢٥دا دەورەدرابوون، ناردنی یارمەتی چۆن لە ٢٠/٥ دا ئەبێ).

لەو کاتەدا فڕۆکەکانی ئینگلیز (بنە)یان دایە بەر نارنجۆک (بۆمبا) و چەند کەسێکیان لە کوردەکان کوشت، شێخ مەحمود بۆ پشکنینی دەوروپشت قۆڵێکی (کەشافە)ی تا نزیک کەرکوک نارد.

ئینگلیزەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت ئەو عەشایەرانەی تا ئەوسا بەشداری شەڕیان نەکردبوو لەگەڵ هێزەکانی شێخ مەحمودا ڕێکەون و ببن بەیەک و باوەڕیان نەبوو کە جافەکان هەتا سەر لە شێخ مەحمود بەدوور ئەبن .

ئینگلیزەکان زۆر لە پەژارەدابوون لەبەر ئەوە ئەمر درایە (ژەنەراڵ فرابزەر) کە بە هێزی فیرقەی هەژدە بگاتە کۆری شەڕ لەولاشەوە (ژەنەراڵ ساندەرس) لە هەولێر و ئالتون کۆپری‌یەوە و چەمچەماڵ چاودێری کردنی ڕێگەی پێ سپێررابوو.

شێخ مەحمود بە خۆی و هێزەکانیەوە لە دەربەندی بازیان کە یەکێکە لە دەربەندە مێژوییەکانی ڕیزە شاخەکانی قەرەداغ چاوەڕوانی لەشکرەکەی ئینگلیزی ئەکرد.

جەنەراڵ فرایزەر هێزەکانی لە چەمچەماڵدا کۆ کردبووەوە و لە ١٩١٩/٦/١٧دا خۆی ئامادە کرد بۆ پەلاماردانی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیان ... ئەم

شاخانەی دەربەندی بازیان چەشنی زنجیرە دیوارێکی بەردەڵانی‌یە کە لە رووی دەریاوە (٤٠٠٠)پیێ و لە بنکەی دەربەندەوە (١٠٠٠)پیێ بەرزە ...

لە زەمانی کۆندا پێشی دەربەندی بازیان بە دیوارێکی بەرد چنرابوو، تەنها دەرگایەک خرابوە ئەم دیوارەوە، ئیمڕۆ ئەو دیوارە نەماوە بەڵام شوێنی دیارە، تێپەڕبوون لەو ڕێگەیەوە بۆ ئینگلیزەکان شتێکی ئاسان نەبوو و شێخ مەحمودیش بەبیریا نەدەهات کە لەلایەکی ترەوە بتوانن لە دەربەندەوە تیێ ئەپڕن و هەڵمەت ئەبەرنە سەریان، چونکە لەزەمانی (ئاسوری)یەکانەوە تا ئەو ڕۆژە هەر لەشکرێکی دوژمن ڕووی کردبێتە ئەم ولاتە (واتە ولاتی کوردوستان ـ زامۆآ)هەتا لە شەڕی ئەم دەربەندەدا سەرنەکەوتبێت نەی توانیوە پیێ بنێتە ئەودیوی شاخەکانەوە، بەڵام (موشیری حەمەی سلێمان) کە یەکێک بووە لە بەگزادەکانی هەماوەند کە ساردی و ناکۆکی هەبوە لەگەڵ شێخ مەحمودا ڕێگەی نیشاندان و بە بەشێک لە لەشکرەکەی ئینگلیز بەیانی‌ی پێش هەتاو کەوتن لە ڕێگەیەکەوە کە بە بیری کەسا نە ئەهات لەلای ڕاستی دەربەندەوە بە شاخەکانا سەرکەوت و لە بەرەبەیانا کە شێخ مەحمود لە بەردەمی دەربەندا بەتەمابوو هەڵمەت ببرێتە سەری، لە پشتەوە دەوریاندا.

لەشکری ئینگلیز لەو کاتەدا بە تۆپ و شەستتیر تاوی دایە سەر دەربەند و شێخ مەحمود و لەشکرەکەی کەوتنە نێوانی دوو ئاگرەوە. ئەوانەی بە شاخەکەدا سەرکەوتبوون و چوونە ئەودیو لە هەموو (تیرە)یەک تێکەڵبوون، جگە لە (سیک) و (گورگە) بەشێکیشیان لەوانەبوون کە پیێیان ئەڵێن (کاجنیس) ئەمانەی دوایی لە مەغولەکانی (بورما)ن و بە شیر وەشاندن شۆرەتیان سەندوە.

بەرامبەر بە لەشکرێکی وا زۆر پڕ چەکی ئینگلیز، شێخ مەحمودی قارەمان بە لەشکرێکی بچووکی کوردەوە کە چەکی تازەیان تەنها دوو شەستتیری کۆنی ئەڵمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەروەکو شێر وەستا و شەڕێکی ئازانەی کرد، بەڵام ئاگری تۆپەگەورەکانی ئینگلیز زۆر بە هێزبوون و لە ناجەرگی دەربەندا هەردوو لەشکری ئینگلیز و کورد تێک ڕژان و ئیتر ماوەی شەڕی ئاگرین نەمابوو بەڵکو بوو بوو بە شەڕی دەستەویەخە.

(گورگە)بە کێردە تیژ و درێژەکانیان، (کوکریس) و (کاجنیس)ەکانی نەوەی

مەغول بە شیرە پان و قورسەکانیان، کوردیش بە خەنجەری سووک و تیژی بە جەوهەرەوە کەوتنە قەلاچۆی یەکتری ...

شێخ مەحمود لە دوولاوە بریندارکرا (گوللەیەکی بەر کەوتبوو و کەلە بەردە قارەمانیش هاتە دەرەوە سەربازێکی گورگە بە شیر قاچی بریندار کردبوو، ئەو گوللەیەی بەرشێخ کەوتبوو هەر لە لەشیا ماو دەرنەهێنرا وەکو لە باسی نیشتەجێ بوون و دەس بەسەراگرتنی شێخدا لە بەغدا لە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەکەین).

بەو جۆرە لەشکری کورد جڵەوی تەگبیری لە دەس دەرچوو شپرزەبوو، لەشکری سیک و گورگە بەسەر کوردا زاڵ بوو (٤٨) کورد کوژرا و ژمارەیەکی زۆریش بریندارو بوون و ئەوانەی بە دیل گیران (١٢٠) کەسێک ئەبوون.

حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ مەحمود و تایەر ئەفەندی (فەرخە) کە مودیری پۆلیسی شێخ مەحمود بوو لەناو کوژراوەکاندا بوون... حەمەی نیرگەلەچی پیاوماقوولی شێخ وای زانیبوو شێخ مەحمود کوژراوە لەبەر ئەمە سواری ئەسپەکەی شێخ بوو رای کرد و خۆی لە دیلی ڕزگار کرد.

شێخ مەحمود دوای بریندارکردنی کشایەوە ژێر بەردێ (کە لەوساوە بەو بەردە ئەوترێ بەردە قارەمان) و لەوێدا لێی کەوت ... ئینگلیزەکان دیسانەوە بە هۆی موشیری حەمەی سلێمانەوە شێخ مەحمودیان ناسیەوە و بە ئۆتۆمبیلێک لە ژێر پارێزگاری هێزێکی گەورەدا دەسبەجێ ناردیانە بەغدا.

جەنراڵ فرایزەر دوای ئەم سەرکەوتنە کەوتە خەمی ئینگلیزە گیراوەکانی سلێمانی و بۆ دەرهێنانیان لە بەندیخانەی بە پەلە هێزێکی سوارەی خستە ڕێ و بەندیەکانیان ڕزگارکرد کە نزیکی دوومانگ و نیو لە بەندیخانەی سلێمانیدا مابوونەوە.

رەفیق حلمی لە پەراوێزی لاپەڕە (١٢٨)دا ئەڵێ ئەو مەعلوماتە ڕاپۆرتە لە ژمارە (٢)ی ساڵی (٣)ی گۆڤاری عەسکەری وەزارەتی دفاعی ساڵی ١٩٢٦دا بڵاوکراوەتەوە»

شێخ رەئووفی شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا دەربارەی ئەو شەڕە ئەڵێ: «٢١»

«دوای ئەوەی کە باوکم چاری نەما و بڕیاری دا ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان

بیێتەوە زۆری پێ نەچوو ژمارەیەک لە چەکدارانی ناوچەی بازیان هاتنە لای باوکم و مەحمود خانی دزڵیش بە خۆی و هێزەکەیەوە لە (مەریوان)ەوە گەیشتنە شارباژێر و شێخ ئەورەحمانی داراغا گەیشتە نزیک سلێمانی و بەرزنجەییەکانیش هاتنە سلێمانی و گەنجەکانی ناوشاری سلێمانی لە ڕیزی پێشەوەدا بوون و لایەنگری شێخ مەحمودبوون بۆ ڕووبەڕووبونەوە دژی ئینگلیزەکان، حامید بەگی جاف کە ئەوسا هێشتا لەگەڵ باوکمابوو هەڵەبجەی گرت و بنەماڵەی خانمی وەسمان پاشا هەڵەبجەیان بەجێیهێشت و (کاپتن لیز) ڕای کرد بۆ خانەقین»

شێخ ڕەئووف لە یاداشتەکەیا ئەڵێ:«عیزەت نەجیب کە خۆی لەو شەڕەی دژی ئینگلیزدا بەشداری کردبوو باسی ئەو شەڕەی بۆ گێڕامەوە و وتی کە گەیشتینە نیوەی ڕێگا نامەیەک لە سەرکردەی حەملەی ئینگلیزەوە هات بۆ شێخ مەحمود و داوای لێ کردبوو ئەگەر ئەوانەی لە سلێمانی گیراون بەر بدرێن واز لە شێخ ئەهێنین و سلێمانی بۆ بە جێ ئەهێڵین چیتیائەکا بیکا. هێزەکەمان بەزۆری بریتی بوو لە گەنجەکانی سلێمانی و ئەو عەشایەرانەی دەورو پشت و خەڵکی دێهاتەکان لەگەڵ شێخانی بەرزنجە کە ئەم هێزە هەمووی لە ژێر سەرکردایەتی شێخ قادری برای شێخ مەحمودا بوو.

کە ساتێک کاغەزی سەرکردەی حەملەی ئینگلیز گەیشت و خوێنرایەوە زانیمان کە ئەوە فێڵ و پلانێکی لەدوایە، بە تاسلوجەدا سەرکەوتین و لە دوای شەڕێکی چەند سەعاتی بەسەر ئینگلیزەکانا سەرکەوتین کە لەو شەڕەدا عەشایەری سمایل عوزەیری شەڕێکی مەردانەیان کرد، باشترین شەڕکەریان (عارف بەگ)بوو کە لەو شەڕەدا کوژرا، هەروەها عەلی ئاغای پژدەری و حەمەی ڕەشیدی جوامێری هەماوەندی (کە موستەشاری باوکم بوو) و گەلێکی تری وەکو حاجی سەید حەسەن و طاهری حەمە ئەفەندی فەرخە (کە ئامۆزای عیزەت نەجیب بوو لەگەڵ جەلالی ڕەشیدی عاسیەخان و مستەفا ئەفەندی (کە لە دایکەوە خزمی شێخان بووە) هەموویان لە تاسلوجە دەربەندی بازیان شەهید بوون»

شێخ ڕەئووف لە یاداشتەکانیا لەسەری ئەڕواو ئەڵێ:

ئەو هێزەی ئینگلیز کە پێشنگەکەی لە چەمچەماڵ بوو، ماوەیەک لەلایەن هێزی شۆڕشەوە ئابڵوقە درابوو، دوای ئەوە شێخ بارەگای خۆی گواستەوە بۆ

گوندی (ئیبراهیم ئاغا) کە لە ڕۆژ ئاوای چەمچەماڵدا بوو

ئەو هێزەی ئینگلیز کە بۆ یارمەتی و ڕزگارکردنی ئەوانەی لە چەمچەماڵ دەورە درابوون لە گوندی (چیمەن) ئەو هێزە ئابڵوقە درا و ئەو کارانەی کە نێررابوو دەستی بەسرا گیرا و ئەوانەی ئەو کاروانەیان ئەبرد بەڕێوە هیندی بوون هەندێکیان کوژران و ئەوانی تر بەدیل گیران.

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا (چیم دی کە لە هەموان دوورودرێژتر باسی ئەو شەڕەی کردوە و دیارە دەقی ئەو فەرمانانەی کە لە کاتی شەڕدا لە لایەن شێخ مەحمودی حوکومدارەوە دەرچوە پاراستویەتی و لە یاداشتەکانیا بلاوی کردوەتەوەئەڵێ:«۳»

« دوای ئەوەی ئینگلیزەکانی سلێمانی دەست بەسەر کران و گیران، هەموو دانا و دەم ڕاستەکانی ناوشاری سلێمانی و سەرۆک عەشیرەتەکان لەوانەی سەر بە کورد و شێخ مەحمود بوون کۆبوونەوە بڕیاردرا بەرنگاری هێزەکانی ئینگلیز ببنەوە کە لەو ڕۆژانەدا گەیشتبوە (تاسلوجە)

بەپێی فەرمای شێخ قادری سوپا سالار نزیکی (۳۰۰) سوار عەشایەر و هەندێ لەو کوردانەی لە هێزی لیڤی جاراندا بوون لە سلێمانی و چوبوونە پاڵ هێزەکەی شێخ مەحمود، ئەمانە بەرەو (تاسلوجە) نێرران و هێزەکە بوو بە دوو بەشەوە، بەشێکی ڕووی کردە گوندی (داوودبلاغ) ئەوەی تر ڕووی کردە (کەندەکەوە). ئەو ڕۆژە هەتا پاش نیوەڕۆ تاسلوجە بوو بە گۆڕستانی هێزی دوژمن و تەنها ئەفسەرێک و موشیری حەمەی سلێمانی هەماوەندی ڕزگاریان بوو (ئەوەی باسمانکرد کە لە دەربەندی بازیاندا خیانەتی لە کورد کرد) دوای ئەوەی کە هێزەکان ڕوویان کردە تاسلوجە یەکەم فەرمانی حوکمدار بەم جۆرەی خوارەوە دەرچوو:

بسم الله الرحمن الرحيم

ژمارە ـ ١
ڕۆژی ٢٢/مایس/١٩١٩

## فەرمانی حوکومدار

---

له ژێر فەرمان و فەرماندەی گشتی حوکومداری کوردوستان، مەحمود کوڕی سەعید، سوپای کورد بەرامبەر به ناڕەوایی و بەدبەختی ئینگلیزەکان و تەفرەدانی گەلی کورد و پەیمان شکێنیان به نەدانی حەقی کورد، پەلاماری چەک درا.

ڕۆژی ۲۱/مایس/۱۹۱۹ ڕۆژی یەکەمی شۆرشی کوردە بەرامبەر به بریتانیای گەورە .

مەحمود

حوکمدار و فەرماندەی گشتی

ڕۆژی ۲۲/ی مایس سوپای کورد بەرەو کەرکوک بزووت و له دەربەندی بازیان بارەگای دامەزراند.

---

بسم الله الرحمن الرحیم

ژمارە ـ ۲

ڕۆژی ۲۲/مایس/۱۹۱۹

بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری خواردەمەنی و ئازووقەی سوپایی کوردوستان، ئەم لیژنەیەی ناویان له ژێرەوە نوسراوە دانرا و پەسەندکران.

ئەو لیژنەیە له ۲۲/ی مایسەوە دەست به ئیش ئەکا

مەحمود

حوکمدار

١ـ حاجی سەید عومەر ـ سەرۆک
٢ـ سەید کەریم سەیدئەحمەد ـ ئەندام
٣ـ شێخ عەلی سەرکار ـ ئەندام
٤ـ ئەحمەد صەبری خواجا ئەفەندی ـ ئەندام و نووسەر (کاتب)

---

بسم الله الرحمن الرحیم

ژمارە ـ ٣
ڕۆژی ٢٢/ی مایس /١٩١٩

فەرمانی حوکومداری

---

بەپێی ئەو باوەڕەی کە بەم پیاوانە هەمانە و لەپێناوی گەلەکەیانا و لە کردەوەی پەسەند دوانەکەوتون، لە ماوەی دوورکەوتنەوەی حوکومداری کوردوستان لە شاری سلێمانی‌ی پایتەخت، ئەم ناوانەی خوارەوە بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری حکومەتی کوردوستان و گەلەکەیان هەڵبژێرران

مەحمود
حوکمدار

١ـ حاجی سەید عومەر سەرۆک(ئەوسا موتەصەرفی سلێمانی بووە)
٢ـ ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ ئەندام(سەرۆک شارەوانی بووە)
٣ـ سەید کەریمی سەید ئەحمەد ئەندام
٤ـ حەمە ئاغای عەبدالرحمن ئاغا ئەندام
٥ـ صالح پاشا ئەندام
٦ـ حەمەد بەگی قادر بەگ ئەندام
ئەحمەد صەبری خواجا ئەفەندی ـ نوسەر (کاتب)ی لیژنە

لەو ڕۆژانەدا لە دەربەندی بازیانەوە هێڵی تەلەفون هەبووە بۆ سلێمانی کە (نەدیم ئەفەندی) بە ڕێوەبەری ئەو هێڵی تەلەفۆنە بووە .

---

لەدوای ئەو سێ بەیانەی کە لە سلێمانیدا بە ئیمزای حوکومدار دەرچوبوو، ئیتر دوای ئەوە بەیانەکانی تر (فەرمان) لە کۆڕی شەڕدا دەرئەچوو بڵاوکرایەوە و ئەو بەیانانەی ناو کۆڕی شەڕ زنجیرەکانی لە ژمارەی تازەوە دەستی پێ‌کردوە.

ژمارە ـ ١
ڕۆژ: ١٩١٩/٥/٢٥

ئیمشەو هێزێکی (٥٠)کەسیمان وورووژمی بردە سەر قەڵای چەمچەماڵ و لەو هێرش بردنەدا یوزباشی ڕەشید عاصیە خان و کەریم هەیدەر کوژران و دوو برینداریش هەیە

---

سەرنج ـ ئەو ڕەشیدی عاصیە خانەی ئەحمەد خواجا لەبەیانەکەدا ناوی هێناوە کە یوزباشی بووە باوکی جەلالی ڕەشیدی عاصیە خان بووە کە شێخ ڕەئووف لە یاداشتەکانیا باسی کردوە کە وابزانم شێخ ڕەئووف بە هەڵەدا چووە و هەر ڕەشیدی عاصیە خانی باوکی بووە کە ڕەفیق حلمیش لە لاپەڕە (١١٥)ی بەرگی دووهەمی یاداشتەکانیا ئەویش بە هەڵە وتوویەتی ڕەشیدی عاصیە خان لە شەڕی شاخی گزێژە کە لە نێوانی هێزی لیڤی‌ی مێجەر دانلیس و هێزی مەحمود خانی دزڵی‌دا کوژرابوو و لە بەرگی چوارەمی یاداشتەکانیا ڕاستی کردوەتەوە، وتوویەتی ئەوەی لە شەڕی شاخی گزێژەدا کوژرا (حسێنی حاجی مەلامحەمەدی عەتار بووە و ڕەشیدی عاصیە خان لە دەربەندی بازیاندا کوژراوە...
هەروەها ئەو کەریمی هەیدەرەش باوکی ڕەشیدی کەریمی هەیدەر و حەمکوڵی قەصاب بووە. بەڵام ئایا ئاخۆ ئەو بەیانەی ئەحمەد خواجا باسی کردوە ڕاستە یا

ئەوەی رەفیق حلمی راستی کرد و ئەوە راستە کە ئەو ئەڵێ لە چەمچەماڵ کوژراو ئەم ئەڵێ لە دەربەندی بازیان؟

---

ژمارە ـ ٢
١٩١٩/٥/٢٨

دوژمن هێزێکی گەورەی گەیاندە چەمچەماڵ، لە موصلیشەوە هێزێک گەیشتە کەرکوک ... پیادە و سوارە هەموو بنێرن بۆ دەربەند.

---

ژمارە ـ ٣
تأریخی لەسەر نیە

هێزی پیادەی هەورامی بە فەرماندەی عبدالله بەگی دزڵی (کوڕی مەحمود خانی دزڵی بووە کە شێخ رەئووف لە یاداشتەکانیا باسی کردوە کە چۆن لە دواییدا لەلایەن ئێرانیەکانەوە گیرا) لە (بانی مەقان) بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون و دوژمن پەرێشان کران و ئێمەش یەکێکمان بریندارە.

---

ژمارە ـ ٤
تأریخی لەسەر نیە

دوهەمین شەوە کە هێزی دزڵیی هەورامی و دوژمن لە قەرەهەنجیر لە جەنگدان، ئیمڕۆ سوارەی (مەندمی) و (هەماوەند) ئاویتەیان بوون، لە دوژمن کوشتار زۆرە، تالانی زۆر گیراوە، پێنج هەورامی و دوو کەس لە (مەندمی) کوژران و (٢٢) بریندار هاتوەتەوە.

---

ژماره ـ ۲۲
ڕۆژی لەسەرنیە

دوژمن هێزێکی زۆری ئینگلیز و هیندیی بەتۆپ و چەکی زۆرەوە لە موصلەوە هێناوە و گەیشتوەتە کەرکوک، زرێلی (ئۆتۆمبیلی زرێلی) زۆریان پێ‌یە

---

ژماره ـ ۳۸
۱۹۱۹/٦/۳

لە (چیمەن) تالانیەکی زۆر لە دوژمن کرا لەگەڵ یەک مەترەلیوز، حەمە ئەمین کۆزە ڕەقەیی و دوو چەکداری جەباری و یەک هەماوەند کوژراون و (۷) بریندارمان هەیە. لاشەی ئەفسەرێکی ئینگلیزی و (۲۵) سۆجەرماوە، بریندارەکانیان بردەوە .

---

ژماره ـ ٤۲
۱۰/حوزەیران/۱۹۱۹

دوژمن دێت بۆ چەمچەماڵ، هێزی سوارەی ئێمە بلاوە، هەر لە کفری‌یەوە هەتا ئاڵتون کۆپری ... کار باش نابینرێت، تەنها هێزی پیادە لە بارەگادا ماوە

---

ژماره ـ ٥۰
۱۹۱۹/٦/۱۸

بە فەرماندەی جەنرال فرایزەر، هێزێکی گەورە لە موصلەوە گەیشتە کەرکوک،

له کەرکوکیشەوە هێزێک گەیشتە چەمچەماڵ بە فەرمانده‌ی جەنراڵ (تۆمسن)، کار چەتوونە، سوپا و هێزی عەشایر لە سوپەردا ئامادەی جەنگی، دوژمن زۆر بە هێمن دێت.

---

ئیتر فەرمانی ژمارە (٥٠) دوا فەرمانی بارەگابوو، دوژمن ڕۆژی ١٩١٩/٦/٢٢ لە ژێر فەرماندەی جەنرال فرایزەردا گەیشتە دەربەندی بازیان، سوپای گیان بە ختکەری کورد لە سوپەردا ئامادەی فەرمانی حوکومدار بوون.
شێخ مەحمود لە ژێر بەردە قارەماندا بریندار کرا، طاهری حەمەی ئەمین ئەفەندی فەرخە و حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ مەحمود کوژران (شێخ باباعەلی بۆی گێڕامەوە کە حاجی سەید حەسەن بەر گوللەی طۆپیک کەوتبوو پارچەپارچەی کردبوو و لاشەکەیان نەدۆزیەوە)، دوژمن بە ٣٠ ـ ٤٠ هەزار چەکدار و فڕۆکەوە ڕوو بە ڕووی شۆڕشی کورد بوەوە و شێخ بە برینداری گیرا و نێررا بۆ بەغدا ....
جگە لە شێخ مەحمود ئەمانەی خوارەوەش لە شەڕی دەربەندی بازیان‌دا بە دیل گیران.
١ـ عبد القادر سعید (قالەی ئایشە خان)
٢ـ ئەدهەم ئەفەندی
٣ـ قادر ئەفەندی قەرەداغی
٤ـ عزەت طوپچی (عزەتی فاتەی خولە درێژ)
٥ـ رشید صدقی غفور
ئەحمەد خواجا لە کۆتایی باسی ئەو شەڕی دەربەندی بازیانەدا ئەڵێ:
ڕۆژی ١٩١٩/٦/٢٢، لە پاش نیوەڕۆ بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لە کارەساتی دەربەند بێت سوارەی ئینگلیز و هندی گەیشتنە ناو شاری سلێمانی بەرامبەر بەماڵی حوکومدار و لەسەر شاخی گۆیژە تۆپیان‌دابەست و گردی‌قشڵە(دەبۆ)یان کرد بە بارەگای خۆیان...ناو شار بەجارێ شڵەقا... بەهۆی چالاکی (ڕەئوف ئەفەندی) کە فەرماندەی بلۆکی سەربازی دیوانی حوکومداربوو، لەماوەیەکی

کەما خێزانی حوکمدار و کەلوپەلی پێویستیان بە(٤٠) ئینسترسوار دەرباز کرد. ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ(ساحیبقران) ئەوڕۆژە ئازایەتییەکی زۆری نواند، خۆی بەتەنیا سوارە و بە(حەمەد بەگ)ەوە بەشداری پاسەوانیکردنی ئەو خێزانانەبوو ووتی: گیانی من ئەم خێزانانە ئەپارێزێت.

ئینگلیزە گیراوەکان هێنرانە دەرەوە، گرینهاوس کە ئەو هەموو ئاشوبانەی نایەوە وەکوجاران ئەسووڕایەوە بەسەر ئەو ماڵ و خێزانانەدا کە پیاوەکانیان بەشدارییانکردبوو لە شۆڕشدا. لە هەر ماڵێکیان سەربازێکی هندی دانا و خێزانەکان سەربانەو سەربان ڕایانئەکرد و ئاوارەبوون.

ئەو ماڵ و خێزانانەی کە ئینگلیزەکان بڕیاری تالاٌنکردنیان دەرکردبوو ئەمانەبوون.

١- ماڵی حوکومدار شێخ‌مەحمود.

٢- ماڵی حاجی سەید عومەر.

٣- ماڵی حاجی سەیدحەسەن( لەگەڵ ئەوەشدا کە لاشەکەی نەدۆزرابووەوە).

٤- ماڵی تاهری حەمە ئەفەندی فەرخە.

٥- ماڵی عزەت نەجیب.

٦- ماڵی کاکە حەمەی ئەمینیعەتار(ژنبرای شێخ‌مەحمود).

٧- ماڵی ئەحمەبەگی فەتاح‌بەگی ساحبقران(شاعر و لەکاتی حوکمدارییەتی شێخ‌مەحموددا سەرۆکی شارەوانی بووە).

٨- ماڵی سەیدنوری نەقیب(ئەوەی لەباسی مێجەرسۆندا ناوی هات کە مێجەرسۆن رقیلیبووە)

٩- ماڵی سەیدکەریمی سەید ئەحمەد .

جگە لەوانەی کە ناوبران، ماڵی زۆریتر لە ئەفسەر و کاربەدەستانی دەستەی سەر بە حوکومدار کە ژمارەیان(١٠٠) ماڵ و خێزان ئەبوو ئەوانیشی گرتووە.

شێخ‌رەئوفی شێخ‌مەحمود لە یادداشتەکانیدا دەربارەی تالاٌنکردنی ئەوڕۆژانە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئەڵێ:

«دوای ئەوەی لەشکرەکەی ئینگلیز هاتە ناو شاری سلێمانییەوە، ئیتر دەست کرا بە تالاٌنی ماڵی ئەوانەی کە بەشدارییان کردبوو لەو شەڕەدا، من خۆم (شێخ

ڕەئووف) ئاگاداری ئەوەم کە دایکم لەو ڕۆژانەدا لە داریکەلی دائەنیشت پارە و ناومالێکی زۆرمان هەبوو کە پڕبوو لە فەرشی عەجەم و نزیکی (١٥٠٠)سەر مەڕمان هەبوو جگە لە گاومانگا. مێجەرسۆن اسماعیل حقی نارد بۆ داریکەلی بۆ ئەوەی دەسبەسەر هەموو ماڵەکەدا بگرێ و تالانی بکا، بەلام خەلکی ئاوایی داریکەلی ئەو هەمو پارە و ماڵ و کەل و پەلەی ماڵی شێخ مەحمودیان شاردەوە و سوێندیان بۆ یەک خوارد کە لای هیچ کەسێک باسی ئەوە نەکەن، اسماعیل حەقی کەچوە داریکەلی کارێکی زۆر مەردانەی کرد کە لەو ڕۆژانەدا مێجەرسۆن بە خوێنی سەری هەمو کەسێک تینوو بوو کە بۆنی ئەوەی لێ بهاتایە سەر بە شێخ مەحمود بووە، اسماعیل حەقی راپۆرتێک ئەنێرێت بۆ مێجەرسۆن و ئاگاداری ئەکا کە شێخ مەحمود لە داریکەلیدا هیچ شتێکی نیە، بەلام فیلی وا چۆن لەگەلّ مێجەرسۆنی داخ لە دلّدا سەری ئەگرت، لە جیاتی اسماعیل حەقی یەکێکی تری نارد (کە شێخ ڕەئووف ناوی نەهێناوە لە یاداشتەکانیا بەلام شێخ بابا عەلی شێخ مەحمود بۆی گێڕامەوەکە ئەوەی مێجەرسۆن ناردی لە دوای اسماعیل حەقی بریتی بوو لە مصطفی ئەفەندی کە لە دواییدا بوو بە مودیری مەعارف لە سلێمانیدا).

نێرراوی دوهەمی مێجەرسۆن کە ئەگاتە داریکەلی، دەست ئەکات بە دارکاریکردنی خەلکی ئاوایی و ناچاریان ئەکا هەموو کەل و پەل و ناومالی شێخ کە شاردرابوەوە لەگەلّ هەموو مەڕ و مالات و گا و مانگاکان هەمویان تەسلیم کرد».

شێخ ڕەئووف لە شوێنێکی تری یاداشتەکانیدا ئەلّێ:

«بە شهادەتی عبداللە ئاغای حاجی حمەسەعیدی خەلکی سلێمانی (ئەوەی شێخ قادری حەفیدی برای شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیدا ئەلّێ شێخ مەحمود وەکو نوێنەرێکی خۆی ناردبوی بۆلای مینۆرسکی لە کرماشان وەکو لە پێشتردا باسمان کرد)، وە بە شەهادەتی حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم (بە حاجی کەریمی ڕوقێ خان ناسرابوو کە خەزوری ماجید موستەفا بوو)، کە ساتێک شێخ مەحمود دەستی کردەوە بە شۆڕش دژی ئینگلیزەکان (٣٠٠)هەزار لیرەی خۆی هەبوە جگە لەو (١٥)هەزار روپیەیەی وەکو مانگانە بۆی تەرخان کرابوو ئەمانەی

هەموی لە پێناوی شۆڕشدا خەرج کرد و سەرباری ئەوەش ئینگلیزەکان دوای شەڕی دەربەنی بازیان باوکم هەرچیەکی هەبوو هەمویان تالأنکرد و دەستیان بەسەر موڵکەکانیا گرت»

شێخ باباعەلی بۆی گێڕامەوە وتی : دوای ئاوارە بوونمان بۆ ئێران و کە هاتینەوە بۆ سلێمانی و چوینە داریکەلی سەگێکمان هەبوو ئەو سەگە لە کاروان بەجێ مابوو لەناو مەڕ و ماڵاتەکاندا (کە ئینگلیزەکان دەستیان بە سەراگرت)، کە چوینە داریکەلی یەکسەر ناسیمانەوە و کابرای لادێی کە ئەو سەگەی لەلا مابوو ووتی قوربان لەو هەموو شتەی شێخ لێرە بەجێی هێشتبوو هەر ئەم سەگەمان بۆ دەرباز بوو لەگەڵ ئینگلیزەکان نەڕۆیشت»

ئەوەی شێخ رەئووف باسی کردوە، جگە لە عبداللە ئاغا و حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم لە زۆر کەسی تریش بیستراوە کە شێخ مەحمود هەرچیەکی بووە لە پێناوی ئەو شۆڕشەدا خەرجی کردوە و بەڵگەی راستیش بۆ ئەوە، ئەو نەبوونی و دەس کورتیەی کە لە دوای ئاواربوونیان تووشیان هات و لە دواییدا بە دوورودرێژی باسی ئاوارە بوونی ئەو خێزانانەش ئەکەین.

دوای ئەوەی باسی یاداشت و کتێبی ئەوانەمان کرد کە باسی ئەو شۆڕشەی شێخ مەحمودیان کردوە لە گۆیژە و تاسلوجە و لە چەمچەماڵ و لە دەربەندی بازیان، دێینە سەر باسی ئەدمۆندزی خوێنە خۆیی کورد کە لە کتێبەکەیدا «٤٥» بە دوورودرێژی باسی کردوە و خۆی بەشداری شەڕبووە. ئەدموندز ئەڵێ:

«کە مێجەرسۆن چوە سلێمانی شێخ مەحمود ئەیزانی دەسەڵاتی نامێنێت، لەبەر ئەوە دەستی کرد بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێک کە بە نهێنی خۆی بۆ ئامادە کردبوو.

لە ١٩١٩/٥/٢٣دا هێزەکانی شێخ مەحمود خۆیان کرد بە ناوشاری سلێمانیدا و داگیریان کرد و لە چاوتروکاندنێکدا هێزی لیڤی‌ی نیوە تەدریب کرا و لە ژێر فەرماندەی (مقدم) شێخ قادری برای شێخ مەحمودا تەفروو توونا بوون و بلأوەیان لێ کرد (ئەو هێزی لیڤی‌یە هەرچەند شێخ قادر بەناوی سوپاسالارەوە سەرپەرشتیکەری هێزی سوپابووە لە سلێمانیدا بەلأم ئەو هێزی لیڤی‌یەی کە ئەدمۆندز باسی کردوە لە ژێر سەرکردایەتی مێجەر (دانلیس)ی ئینگلیزیدا بوو

کە لەو شەڕەی لەگەڵ هێزەکەی مەحمود خانی دزلی‌دا کرا بە دیل گیرا)
شێخ مەحمود لە چەند سەعاتێکی کەما دەستی بەسەر سلێمانی‌دا گرت و خەزینەی خستە ژێر دەستی خۆیەوە و هەرچی ئینگلیزەکان هەبوو هەموویانی گرتن و ئالأی نیشتمانی هەڵگرد (عیزەت نەجیب بووە کە ئالأی ئینگلیزی داگرتوە و ئالأی شۆڕشی کوردی لە شوێنی ئەو هەڵکردوە کە لە باسی موحاکەمەی شێخ مەحمودا لیٚ‌ی ئەدوی‌ین).
ئەو ئالأی کوردە بریتی بووە لە هیلالێکی سوور لەناو قوماشێکی زەردا (ئالأی کوردوستان سپی و سوور و زەردە)، ئالأی بریتانیا هێنرایە خوارەوە لەسەر دائیرەی ئەفسەری سیاسی، بەلاٚم مێجەرسۆن بەختی هەبوو لەو کاتەدا لە سلێمانی نەبوو بەڵکو چوبو بۆ کەرکوک بە پیر ژنەکەیەوە کە لە بەسرەوە هاتبوو ( ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا ئەڵیٚ هیچ دوودڵ نیە لەوەی کە ئەگەر مێجەرسۆن لەو ڕۆژانەدا لە سلێمانی بوایە شێخ مەحمود ئەی‌کوشت چونکە بە گەورەترین دوژمنی خوێنە خۆی‌ی دانابوو).
یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە هەڵەبجە مولازمی فڕۆکەوان G.M.Lees توانی خۆی لە هەڵەبجە دەرباز بکا بەر لەوەی شۆڕشگێڕەکان لە ١٩١٩/٥/٢٦دا بنکەکەی داگیر بکەن (هەڵەبجە لەو ڕۆژانەدا بە هۆی حامید بەگی جافەوە کە هەتا ئەوسا لایەنگری شێخ مەحمود بووە داگیرکراوبوو خانمی ژنی وەسمان پاشا کە سەر بە ئینگلیزەکان بووە هەڵەبجەی بەجیٚ هێشتوە بەلاٚم ویلسن ئەڵیٚ بە هۆی هەورامیەکانەوە داگیر کرا).
لە کەرکوک هێزێکی بچووکی ئیمپرارتۆری لیٚ‌بوو، فەرمانی بۆ دەرچوو کە بە گورجی روو بکاتە چەمچەماڵ بەلاٚم ئەو هێزە گوی‌ی نەدایە ئازایەتی کورد و ئەوەی کە پی‌ی سپێررابوو کە ئەبوایە تەنها هەتا چەمچەماڵ بڕۆیشتایە ئەوەی خستبویە پشت گویٚ و بە چەند سواریەک بە هێزی لیڤی عیراق و چەند ئۆتۆمبیلێکی زرێلی و چەند ئۆتۆمبیلێکی سەر بەرەڵلاٚ کە ڕەشاشی لەسەردا بەسرابوو لە بەرزاییەکانی (تاسلوجە) کە (١٢)میل دووربوو لە سلێمانی لەویٚ لەلایەن هێزی کوردەوە پەلاماری ئەو هێزەی ئێمە درا و ناچاربوو بکشێتە دواوە و کوردەکان هەتا ماوەی (١٢)میل دوای ئەو هێزەی ئێمە کەوتن و زیانێکی

زۆریان پێ گەیاندین.

بەو جۆرە چوار زرێلی و (١٩) ئۆتۆمبیل لەکیس چوو (ویلسن لە کتێبەکەیدا وەکو باسمان کرد ووتبوی چوار ئۆتۆمبیلی عەسکەری و (٩) ئۆتۆمبیلی فۆرد بۆ گواستنەوەی سەرباز لە کیس چوبوو).

ئەو سەرکەوتنەی کورد ئاگری شۆڕشەکەی بەتواوی گەرم کرد و زۆر کەس لەوانەی دوودڵ بوون بچنە پاڵ شێخ مەحمود، ئەو سەرکەوتنە هانی‌دان و بوون بە پاڵپشتی و هەندێ لە عەشیرەتە کوردەکانی ئێران کە گوێیان نەدابوە حوکومەتەکەیان داوایان کرد بچنە سەر دەوڵەتی کوردوستان کە لە ژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودا بوو.

لە ئەنجامی ئەوەدا حوکومەتی بریتانیا بۆی دەرکەوت کەوا چارنیە ئەبێ هێزێکی گەورە بنێرێت بۆ ئەوەی دەست بەسەر هەلوێست و کاروباردا بگرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ئەمیر لیوا (سیر.تیۆدۆر.فرایزەر)ی سەرکردەی فیرقەی هەژدەهەم لە موصل کاروباری گرتەدەست خۆی و لە کەرکوک هێزێکی گەورە بۆ ئامادە کرا و لیوا (١/٥) کە بە لیوای سووری ڕۆژهەلات ناوئەبرا و پیێ ئەوترا (East Surrey) لەگەڵ فەوجی پیادەی بۆرمایی پێنجەم و هەشتەم و فەوجی (١/٨٧)ی پەنجاب‌ی و فەوجی (١/١١)ی مهرات و سریەیەکی فەوجی پیادەی بەنغالی‌ی ژمارە (٤٩) و سریەی ژمارە (٢٣٩) لە فەوجی ڕەشاشاتی هیندی ژمارە (١٨) و بطریەی شاخی هیندی ژمارە (٢٥)وە چەند پارچەیەک لە بطریەی (ب) و (د) لە کەتیبەی (طۆپی مەلیکی ژمارە ـ ٢٦٦) و جەناحی (أ) لە سربی (٣٦)ی هێزی ئاسمانی لەگەڵ وەحداتی صنفی موخابەرە و هەندەسە و ئەوانەی (لەغەم) ئەچێنن، ئەمانە هەموی سازکرا و بڕیاردرا مێجەرسۆن لەگەڵ ئەو ڕەتلەدا بێ و دەسەلاتی ئەفسەری سیاسی هەبێ.

حەملەکە چوە چەمچەماڵ، یاریدەری ئەفسەری سیاسی لە چەمچەماڵ ئەو کاتە لە سلێمانی گیرابوو (نیازی لە کاپتن بۆندە)، شەش کەس لە هەماوەندەکان بەجلی کوردیەوە کردمن بە پاسەوانی خۆم و (ئەدمۆندز خۆی لەو شەڕەدا بووە و بست بە بست ئاگاداری هەموی بووە) لە ١٩١٩/٦/١٦دا گەیشتمە چەمچەماڵ ئیستیطلاعی دەربەندی بازیانمان کرد و بۆمان دەرکەوت شێخ مەحمود خۆی لە

دەربەندا قایم کردوە و لە شمالیەوە ئەو هێزی لیڤیەی کە لە کاتی خۆیدا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە تەدریب کرابوو ئەو هێزە دانرابوو (وەکو لە پێشتریشدا باسمان کرد ئەو هێزی لیڤی‌یەی سلێمانی لە دوای هاتنی هێزەکانی مەحمود خانی دزلی بۆ سلێمانی چوونە پاڵ هێزی شۆڕش و پەیوەندی‌یان بە ئینگلیزەوە نەمابوو)، لە چەمچەماڵەوە بە ماوەی (١٨)میل بەرەو بەرزایی ڕۆیشتین. بەرزترین چیا کە بەسەر دەربەندی بازیاندا ئەڕوانێت بریتی بوو لە (١٧٠٠)پێ، کە چوم و نزیک بوومەوە روانیم (٢٠٠)سوار لە پێشمانەوە ئیستیکشافی ڕێگەیان ئەکرد ... گوێم لە چەند تەقەیەک بوو ....

ڕۆژی ١٩١٩/٦/١٧ هێرشەکەمان گەیشتە گوندی (تەکیەی کاک ئەحمەد) کە سێ میل دووربوو لە گەروی دەربەندی بازیان، ڕۆژی دوایی بە بێ دەنگی، پیادەکانمان بەسەر بەرزاییەکانا هەڵگەڕان و بەگەیشتنمان لە کاتی تاریک و ڕووندا تۆپەکانمان دەربەندی بازیانیان دایە بەر ئاگر ... چەک هەڵگرەکانمان هەر وەکو زەمانی مەغول جگە لە چەکەکانیان شیریشیان پێ بوو، سەربازەکانی (گورگە) چەقۆی زل و پانیان پێ بوو... بەو جۆرە سەربازە گورگەکان دەوری ئەو عەشایەرانەیان گرت کە ڕوو بە ڕوویان بوونەوە.

ئەو (٤٨) دوژمنەی بەجێ مابوون نەیانتوانی دەرباز بن، کە ساتێک ئەوانە بە دیل گیران بە شەڕەشەق توانیمان لە دەس گورگەکان ڕزگاریان بکەین کە ئەیان ویست کەللەی سەریان بپەڕێنن (سەیر ئەوەیە نە ویلسن و نە ئەدمۆندز هیچیان باسی خیانەتی موشیری حەمەی سلێمان هەماوەندی ناکەن کە چۆن ڕێگەی پیشان دان و هەورازەکانی ژوور شێخ مەحمودیان لێ گرت، کەلام وابوە یەکێک بووە لەو شەش کەسەی کە ئەدمۆندز باسی کردون ڕێگەی پیشان داون).

من لەگەڵ جەنەراڵ فرایزەر سواربووم و وردە وردە لە گەرووی دەربەندی بازیان نزیک بوینەوە، نزیکی (١٠٠)کەس لە ناوچەی شیمالی دەربەند بەدیل گیران و لەو ناوچەیەدا شەڕ زۆر گەرم نەبوو، ئەوانەی ناو لەشکرەکەی شێخ مەحمود لەوانەی کە وەختی خۆی لە هێزی لیڤی سلێمانیدا بوون چەکەکانیان تەسلیم کرد ... سەرکردەکەیان پێ‌ی ووتم:

شێخ مەحمود بە هەنگڵە شەلی ئەرژیشت دیار بوو قاچی پێکرابوو، یەکێکی تریان ووتی: وابزانم بێجگە لە قاچی شوێنێکی تریشی پێکراوە و دوورنیە ئێستە مردبێت ... ئەسیرێکی تری کورد ووتی: ئەگەر شێخ مابێ ڕەنگە ئێستە ڕوو بکاتە گوندی (داریکەلی) کە یەکێکە لەو (١٢) گوندەی شێخ مەحمود لەناوچەی بازیان ...

ئەسیرە کوردەکانی تر وتیان شێخ مەحمود ئەمری داوە هەرچی ئینگلیزە گیراوەکانی سلێمانی‌یە هەموویان بکوژن ئەگەر هات و لەشکرەکەی شکا، لەبەر ئەوە وایان بە باش زانی کە فریای ئەوان بکەوین بەرلەوەی بکوژرێن.

فرایزەر فەرمانی دەرکرد بۆ هێزی سوارەی ژمارە (٣٢) لەژێر سەرکردایەتی مولازم (ف.ب.گی.دینهەی) بەپەلە ڕوو بکاتە سلێمانی و لە ڕاستیدا سەعات شەش و نیو گەیشتە سلێمانی و چووە دەبۆ کە شوێنی ئەفسەرە گیراوەکان بوو هەموویان بەردران، لەدوای ئەوەش بڕیاردرا هێزێکی گەورە بچێتە ناو سلێمانیەوە.

لای فرایزەر وابوو کە هەرچەند شێخ مەحمود بریندارببووە بەڵام دوورنیە لە شوێنێکی نزیکدا خۆی حەشار دابێ، لەو کاتەدا کە سواری ئەسپەکەم بوم نامەیەکم لە لایەن (ئۆکنلیک)ەوە بۆ هات ئەڵێ: زەلامێکی کوردیان بینیوە بەرگ و پۆشتەنی باشی لەبەردایە لەوە ئەچێ زەلامێکی گرنگ و ناسراوبێ و لەسەر جادەکە کەوتوە، فرایزەر وای بە باش زانی ئەو زەلامە بریندارە بهێنرێتە لای من چونکە شوێنەکەی لە منەوە نزیک بوو، کە هێنایان جووتێک پۆتینی ڕووسی لە پێدابوو عەبایەکی شینی تۆخی بە شانەوە بوو کە گولنکەی ئاڵتونی پێوە بوو، سەرپێچێکی بە مشکی‌ی مۆری تۆخ بەستبوو، سمێڵێکی ڕەشی پڕی هەبوو تاکێک لە پۆتینەکانی هەڵتلیشابوو، خوێن لە ژێر کراسەکەیەوە ئەهات و ووتی ناوم (عەلی)یە لە عەشایەری جافی سمایل عوزێری. بریندارەکە بەدەم ئێش و ئازارەوە ئەی ناڵاند و هیچ وەرامێکی پێ نەئەدرایەوە، یەکێک لە ئەفسەرەکان دەمانچەی دەرهێنا خەریک بوو بیکوژێ من نەم هێشت، لەو کاتەدا ئۆتۆمبیلی ئیسعاف هات و بریندارەکەی برد.

دوای ئەوە ڕوومان کردە تەیناڵ بۆ ئەوەی شەو لەوێ ببەینە سەر. موعاونی

ئامیر ئینزیباتی عەسکەری ووتی برینداریکی ترمان گرتوە یەکێک لە ئەسیرەکان هاواری کرد ئەوە شێخ مەحمودە، چوم هەواڵەکەم گەیاند بە فرایزەر، بەلاسلکی ئاگاداری بازیانم کرد کە زۆر بایەخ بدەن بەو برینداره چونکە نامانەوێ نەدەربازبیێت نە بمرێت ... لە دواییدا بەهۆی کوردێکی شارەزاوە بۆمان دەرکەوت کە ئەوە شێخ مەحمود خۆی بوو.

لە ڕاستیدا هەمو جۆرە وون بونێکی شێخ مەحمود ئەبوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەفسانە و خەرافاتێکی زۆر کە لە دواییدا بە هۆی ئەوەوە تووشی گەلێک شەڕە شەق ئەبوین.

ڕۆژی ۱۹۱۹/٦/۱۹ بەرگرییەرک نەهاتە ڕێگامان، دوای چوار ڕۆژ گەیشتینە ئاوە سارد و ڕوونەکەی (سەرچنار) کە بەسەر زیخ و چەودا هەڵ ئەقولاً و لە نزیک پردی (قلیاسان) بارگەمان هەڵدا و بەر لە نیوەڕۆ چوینە ناو شاری سلێمانی و ئەوەبوو بەر لە گەیشتنمان هەموو گیراوەکان بەربوون کە یەکێک لەوانە ئەفسەری سیاسی ئەقدەم (مێجەر.ف.س.گرینهاوس)بوو کە لە کاتی خۆیدا لە (بۆشیر) یەکتریمان بینیبوو.

کاپتن (بۆند) نێررا بۆ بازیان بۆ ئەوەی بە تەواوی هەویەی ئەو برینداره‌ی کە وترابوو شێخ مەحمودە بۆی ئاشکرا بێت کە لە ڕاستیدا دەرکەوت کە شێخ مەحمود خۆی بوو.

لە ۱۹۱۹/٦/۲۳دا بەناو شاری سلێمانیدا خۆپیشاندانێکی سەربازی کرا کە هەموو هێزەکان بەشداریان تیادا کرد، ئەوانەی کە گیرابوون (لە ئینگلیزەکان) هەمویان لەگەڵمان بون و ئەشرافەکانی شاریش لەوبەرمانەوە ڕیزیان بەستبوو لە کاتی خۆیدا لە ۱۹۱۹/٦/۱٦دا ڕەتلێک لە خانەقینەوە بە کەناری ڕوباری سیروان‌دا و یەکێکی تریش لە سلێمانیەوە ڕوویان کردە هەڵبجە و ئەویشیان گرت و (لیز) لە جیٚی خۆی دانرایەوە و ناوچەی سورداشیش پشکنرا، هەروەها شارباژێڕ و بەرزنجە و خوڕماڵ و هەندێک لە شێخەکان و لەوانەی بەشداری‌یان کردبوو لەو شەڕەدا گیران و چەکەکانیان لیٚ‌سەندرا و ئەو شتانەی بە تالانی بردبویان هەمویان لیٚ سەنرایەوە (سەیر ئەوەیە باسی تالانیەکەی خۆیان ناکا کە چۆن ماڵی ئەوانەی بەشداری‌یان کردبوو هەمویان تالان کردبوو هەروەها باسی

ئەو تاوانەی ئینگلیز ناکا کە هاتنە سلێمانی هەرچی کتێبی بە نرخی ناو مزگەوتی گەورە هەبوو کە هەندێکی یادگاری میری بابانەکان بووە و مۆری ئەوانی پێوە بوو هەموویان سووتاند و لەناویان بردن).

ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا ئەڵێ: من لە سلێمانیدا مامەوە بۆ ئەوەی کاروباری ئیدارە ڕێک بخەمەوە، جەنرال فرایزەر لە کۆتایی حوزەیران‌دا ویستی بچێت بۆ هەڵەبجە بۆ ئەوەی سوپاسی خانمی وەسمان پاشای جاف بکات بۆ ئەو یارمەتیدانەی ئێمە بێجگە لەوەش هەردو کوڕەکەی ئەحمەد و عیزەت(نیازی لە ئەحمەد بەگی موختاری شاعیر و عیزەت‌بەگی برای بووە) دوای داگیرکردنی سلێمانی هاتبونە سلێمانی و پێشوازی‌یان لە خۆمان و هێزەکانمان کردبوو...

جەنەڕاڵ‌فرایزەر لە کتێبەکەیدا باسی چوونی خۆی ئەکات بۆ هەڵەبجە کە چۆن لەڕێگا ئۆتۆمۆبیلەکەی لە جۆگایەک ئەچەقێ، فرایزەر لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دائەبەزێ و وەکو ئەو خەڵکە پاڵ بە ئۆتۆمۆبیلەکەوە ئەنێ بۆ دەرهێنانی و هەموو لەشی قوڕاوی ئەبێ( فرایزەر جلی خاکی سەربازی لەبەردا ئەبێت)بەلاّم هەردو کوڕەکەی خانمی وەسمان‌پاشا هیچ دەست درێژناکەن بۆئەوەی وەکو فرایزەر و ئەوخەڵکە پاڵ بە ئۆتۆمۆبیلەکەوە بنێن بۆئەوەی لەقوڕ دەربێت،فرایزەر بە گرینهاوس ئەڵێ: بەو دوانە بڵێ کە ئەوە ڕەوشتێکی باش‌نیە وا ئەم خەڵکە پاڵ بە ئۆتۆمۆبیلەکەوە ئەنێن و ئەوانیش بێزیان‌نایە دەس درێژبکەن،یەکێک لە کوڕەکانی خانم لەوەرامدا ئەڵێ: جەنەڕاڵ ڕاست‌ئەکا بەلاّم با تۆزێ سەیری جل‌وبەرگەکانمان بکات کە هەریەکەی(٣٠٠)ڕووپیەی تێ‌چووە جگە لە عەباو سەرپێچەکانمان، جلی جەنەڕالیش(کە خاکی بووە)هەمووی (٢٠)ڕووپیە ناکات.

من لە سلێمانی مامەوە هەتا لە ٩١٩/٧/١٨دا مێجەرسۆن گەڕایەوە بۆ سلێمانی و بەپێ‌ی ئەوەی کە من ئەفسەری سیاسی حەملەی فرایزەر بووم کاروبارم دایە دەست مێجەرسۆن و لە ١٩١٩/٨/١٨دا بەیانێک دەرچوو ئەڵێ: ئارام و ئاسایش لە هەمو خوارووی کوردوستاندا بەر پایە و شێخ مەحمود چاک بوەتەوە و دراوە بە مەحکەمەی عەسکەری و حوکمی مردنی بەسەرا درا بەلاّم ئەو حوکمە گۆڕرا و کرا بە (١٠)ساڵ و دوور خرایەوە بۆ هندستان».

لەبەرگی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەوە ئەکەین کە چۆن مێجەرسۆن هاتەوە

سلێمانی و دەستی کرد بە زەبر و زەنگ نواندن و ئەو و ئەفسەرە سیاسیەکانی تری ئینگلیز و کار بەدەستان و نۆکەرانیان تەواو خەڵک بێزار ئەکەن و لە هەموو ناوچەکانی خواروی کوردوستاندا ڕاپەڕین و بێزاری بەرامبەر بە ئینگلیز پەرە ئەسێنێت هەتا وای لێ دێ جڵەویان لە دەست دەرئەچێ و جارێکی تر ناچار ئەبن شێخ مەحمود لە هندستانەوە بهێننەوە و حوکومداریەتی دووهەمی شێخ مەحمود دەست پێ ئەکا و دووبارە ئینگلیز پەشیمان ئەبنەوە لە بەڵێنەکانیان و پاشگەز ئەبنەوە و شێخ و شۆڕش گێڕانی کورد بەرەنگاری ئینگلیز ئەبنەوە و شۆڕش درێژە ئەکێشێ هەتا ساڵی ١٩٣١ کە شێخ کۆڵ ئەدا و لە ١٩٣٢دا لە بەغدا نیشتەجێ ئەبێ و هەتا هەرای ڕەشید عالی ١٩٤١ ئەوسا ئەگەڕێتەوە بۆ داریکەلی و لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆچی دوایی ئەکا کە ئەوانە باسی بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەمانە.

# ٢- محاکەمەکردنی شێخ مەحمود لە بەغدا و ئاوارەکردنی بۆ هندستان

زۆرم هەوڵدا لەناو دۆکیومێنتەکانی ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا یالەناو سەرچاوەکانی تردا دەقی(نصوص) موحاکەمەکەی شێخ مەحمودم دەستبکەوێت بۆئەوەی جۆری پرسیارەکانی مەحکەمەکەم بۆ دەربکەوێ و وەرامەکانی شێخ مەحمود بەرامبەر بەوان چیبووە، بەڵام بەداخەوە تەقەلاکەم سەری نەگرت و ناچاربووم پەنا ببەمەبەر ئەو نووسراو و یاداشتانەی کە بەشێوەیەکی گشتی باسی ئەو موحەکەمەیان کردووە یا لەدەمی ئەوانەی کە بەشاهید نێردرابوون بۆ ئەو مەحکەمەیە بیستراوە و شێخ مەحمود لە یاداشتەکانیا لەگەڵ نوری سابت(حبەزبوز) باسی نەکردووە و ئەوەش کە بیستراوە و تۆمارکراوە پچڕپچڕ بووە و لەسەر بناغەیەکی دۆکیومێنتی نەبووە کە پیاو دەقەکەی بڵاوبکاتەوە.

ئەوەی کە هەموو لایەک لەسەرین ئەوەیە کە شێخ مەحمود لەدەربەندی بازیان بەبرینداری بەدیل گیرا و نێردرا بۆ بەغدا بۆ موحاکەمەکردنی بەتاوانی ئەوەی کە ڕووبەڕووی هێزی ئینگلیز ببوەوە کە ئینگلیز گوایا بۆ ڕزگارکردنی نارچەکە هاتووەو هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە و ماڵ و گیانێکی زۆریان لەکیس چووە لە پێناوی ئەوەدا.

شێخ مەحمود کە ئەگاتە بەغدا ئەیبەنە خەستەخانە هەتا برینەکانی چاک ئەبێتەوە(هەرچەند گوللەیەک لەبەشیدا ئەمێنێت وەکو گوتمان لەباسی بوونی شێخ لە بەغدا دوای ساڵی ١٩٣٣ باسی ئەکەین).

کە شێخ مەحمود ئەدرێ بە مەحکەمە ئینگلیزەکان لە ١٩١٩/٧/٢٥دا شێخیان بەوە تاوانبارکردبو کە ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان بۆتەوە و بەیداغی حکومەتی بەریتانی داگرتووە و لەشوێنی ئەو بەیداغی حکومەتی کوردی داچەقاندووە.

ڕەفیق‌حلمی لە یاداشتەکانیدا «٢»دەربارەی موحاکەمەکردنی شێخ‌مەحمود ئەڵێ:
«شێخ‌مەحمود لە پێشدا لە خەستەخانە و لە دواییدا لە بەندیخانەی چاوەڕێی موحاکەمەکردن بوو، لەولاشەوە کوردە بەدیل‌گیراوەکان وەکو قادرئەفەندی قەرەداغی و عیزەت‌تۆپچی و قالەی‌ئایشەخان و ڕەشیدجەودەت و ڕەشیدغەفور و ئەدهەم‌ئەفەندی و عەلی‌یاوەر و گەلێکی‌تر بێگاری قورسیان پی‌ئەکردن و خشتی‌کاڵیان پی‌ئەبڕین.
ئەو تاوانانەی کەدرابوونە پاڵ شێخ‌مەحمود بریتی‌بوون لە:
١- ڕاست‌بوونەوەو ڕووبەڕوو بوونەوەی چەکدارانە بەرامبەر بەریتانیای گەورە و ڕژاندنی خوێنێکی زۆر.
٢- داگرتنی بەیداغی حکومەتی بەریتانیای گەورە ودڕاندنی و هەڵکردنی بەیداغی کوردستان...
شێخ‌مەحمود بەرامبەر بەو تاوانانەی کە درابووە پاڵی هەمیشە لە وەرامدا ئەی‌ووت :
ئەندامانی ئەم مەحکەمەیە لە دوژمنان پێک‌هاتوون و بەهیچ جۆرێک ملی‌نەئەدا بۆئەوەی کە ڕازی‌بێت موحامی بۆ دابنێن بۆ ئەوەی پارێزگاری لی‌بکا و نەی‌ئەویست موحامی بۆدابنێن چونکە ئەی‌ووت من خۆم بەتاوانبار نازانم هەتا پێویستیم بە موحامی هەبێت و بە مەحکەمەی ئەووت:
«ڕاست‌بوونەوە و ڕاپەڕینم بەرامبەر بە ڕەفتار و کردەوەی ناڕەوای ئینگلیز و بی‌بەڵێنی‌یان بووە بەرامبەر بە کورد و من بۆ پاراستنی وڵات و سەندنی مافی‌ڕەوای کورد بەرامبەر بە ئینگلیزی داگیرکەر ڕاست‌بوومەوەو و چوونم بەگژ هێزەکانی ئینگلیزدا بەئەرکی سەرشانی خۆم زانیوە و من ئینگلیزەکان بە تاوانبار دائەنێم بەرامبەر بەو خوێنەی کە ڕژاوە .
بەڵام مەحکەمەی عەسکەری بریتانی گوێی لەمانە نەگرت و بەڕاست و درۆ شێخ‌مەحمودی موحاکەمەکرد و بڕیاری خنکاندنی درا...
لە سلێمانییەوە بەناوی شایەت و ئاگاداربوون لە ڕووداوەکان کە شێخ‌مەحمودی پێ تاوان‌کرابوو تاقمێک لە پیاوە ناسراوەکانی سلێمانی بە زۆر و خوایش بەکێش‌کران کە لەو مەحکەمەیەدا ئاگاداربوون کە بریتی‌بوون لە:

١- حاجی مەلاسەعیدی کەرکوکلیزادە
٢- عزەت‌بەگی وەسمان‌پاشای جاف
٣- شێخ‌نەجیبی قەرەداغی
٤- عەونی‌ئەفەندی یوزباشی کوڕی حاجی‌گووروون
٥- حەمەبەگی قادرپاشا
٦- حاجی‌ئاغای حەسەن‌ئاغا
٧- میرزافەرەجی حاجی‌شەریف

بەڵام شێخ‌مەحمود لەو موحاکەمەیەدا ورەی زۆر بەرزبوو نەپەشۆکا، برینداربوون و بەدیل‌گرتن و بەندیخانە و مەحکەمەی عورفی ئینگلیز نەی‌پەشۆکاندبوو، بەوێنەی پڵنگی ناو قەفەس لە هەڵمەت و بردن و چەپۆک‌داهێنان ئەگەڕا،بەرامبەر بە دیوانی عورفی و ڕەوشت و گفت‌وگۆی بێ گرێ و ئازایانە بەرامبەر بە شایەتەکان سروشتی مەردانە و دلێرانە بوو، لە نیگاکانیا بەرامبەر بە شایەتەکان وا ئەخوێنرایەوە کە هیچ نرخێکیان ناداتێ و بە سووک دێنە بەر چاوی ... داخی ئەوەی ئەخوارد کە کورد لای بێگانە شایەتی لێ ئەدا ماتە مینی ئەوە گرتبووی کە کۆت و زنجیری ئینگلیز پەکی خستبوو، نەی‌ئەتوانی بیان پلێشێنێتەوە، لەبەر ئەمە دیوانی مەحکەمەی عورفی بڕیاری خنکاندنی‌دا و ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە تێ‌ی ئەڕوانین کە پڕبوو لە مانا و ستەم»

بەلای ڕەفیق حلمی‌یەوە حوکومەتی بریتانیا ئەو حوکمە قورسەی کە بەسەر شێخ مەحمودا دابوی لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەم بۆ نواندنی هەیبەت و زەبر و زەنگ و گەورەیی حوکومەتی بریتانیا

دوهەم بۆ ئەوەی ئەگەر هات و حوکمەکەی کەم کرایەوە، ئەو کەم کردنەوەیە ببێت بە بەڵگەیەک بۆ نیشانەی لێ‌بوردن و چاولێ‌پۆشینی ئینگلیز بەرامبەر بە تاوانباران، هی‌واش هەبوو ئەیووت ڕەنگە ئینگلیزەکان لە گۆڕینی حوکمدا ئەوەیان خستبێتە بەر چاو کە کوردەکان بەڕێبەرایەتی شێخ مەحمود بەرامبەر بە ئینگلیزە گیراوەکان کە لە (دەبۆ)دابوون کە چۆن ڕەفتاری باشیان لەگەڵا کرا و بە وێنەی دیلی وڵاتە پێشکەوتوەکان لەگەڵ ئەو دیلانەدا جووڵاونەتەوە کە

ئەمەش بە ئەمری شێخ مەحمود بووە کە چاودێریەکی باشیان کرابوو بە هۆی شێخ قادری برای شێخ مەحمودەوە (سوپا سالار) لە ماڵی شێخ قادرەوە حەپسە خانی نەقیبی ژنی گەلێک جار نان و خواردنی زۆر پوختەی تایبەتی‌ی بۆ ئینگلیزەکانی دەبۆ نێردرابوو، پێخەفی پاک و خاوێن و هەر پێویستیەک کە بیان ویستایە درێغیان لێ نەکرابوو، قەدەغەی هەموو جۆرە خواردنێکی کە ویستبویان لێ‌یان نەکرابوو ئەمانە هەموو کاری‌بووە لە گۆڕینی بڕیاری مەحکمەدا.

بەو جۆرە لە لەندەنەوە بڕیاری خنکاندنی شێخ مەحمود گوڕدرا بە (١٠)ساڵ گرتن و ئاوارە کردنی بۆ هندستان بۆ دورگەی Andaman کە لە هەندێ شوێندا بە (هەنجام نووسراوە )).

بێ‌گومان ویلسنی حاکمی گشتی بریتانیا لە بەغدا لەو ئینگلیزانەبوو کە شێخ‌مەحمود خۆشی‌نەویستووە و رقی لێ‌ی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە کتێبەکەیدا«٣٧» دانی بەوەداناوە کە ئەو گوڕینی حوکمەی شێخ‌مەحمودی بەدڵ‌نەبووە و ویستویەتی شێخ‌مەحمود لەناو بچێت و بەشێوەیەکی رەسمی بێزاری و ناڕەزایی خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەو گۆڕینی حوکمە و وتوویەتی مانەوەی شێخ‌مەحمود بەزیندوویی هەمیشە هیوایەک ئەبێت بۆ دۆست و لایەنگرەکانی و ترسێکی زۆرگەورەش ئەبێت بۆ دوژمنەکانی (کە بێ‌گومان ئەو دوژمنانەی ئەو مەبەستی بووە هەموو دۆستی خۆیان‌بوون) وەهەتا شێخ‌مەحمود بەزیندوویی مابێ ئەگەر دووریش‌بێت لە کوردستان ئاسایش بەرپانابێت.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو قین و رقە ئاشکرایەی ویلسن بەرامبەر بە شێخ‌مەحمود خۆی لەکتێبەکەیدا دانی‌پیاداناوە و وتوویەتی: «٣٧»

« لە نەخۆشخانەی بەغدا چوومەلای شێخ‌مەحمود و سەرێکم لێ‌دا، لەکاتی گفت‌وگۆدا بەبێ وەستان و سڵ‌کردنەوە پێ‌ی ووتم: نەک دادگای عەسکەری ئینگلیزی بەڵکو هیچ دادگایەکی تریش مافی ئەوەی نی‌یە موحاکەمەی من بکات... چونکە من تاوانبار نەبووم و نیم، من بۆ مافی‌ڕەوای نەتەوەی کورد خەباتم کردووە و تێ‌کۆشاوم کە ئەو مافە لەلایەن دەوڵەتە سوێندخوارەکانەوە دانی‌پیادانراوە و شەڕم لەگەڵ ئینگلیز لەسەر ئەوە کردووە و لە ڕێ‌ی کورد و

کوردستاندا خۆم بەختکردووە و بەختیئەکەم»، ویلسن لەباسی ئەو دیدەنیەی شێخمەحمود لە خەستەخانەی بەغدادا ئەڵێ:«شێخمەحمود مادە(١٢)هەمینی چواردە مادەکەی وودرۆ ویلسنی سەرەککۆماری ئەمریکای هێنایەوە بیرم و دەستیبرد بازیبەندەکەی قۆڵی کردەوە و بەرگێکی قورئانی کردەوە کە لەناویا مادە دوازدەی ویلسنی تیادا تەرجومەکرابوو بەکوردی و بۆی خوێندمەوە ، جگەلەوە تەرجومەی ئەو بەیانە دووقۆلیەی کە لە ١٩١٨/١١/٧دا بریتانیا و فەرەنسە بەجووت دەریان کردبوو دەربارەی مافی نەتەوە بچووکەکان ئەویشی بۆ خوێندمەوە».

بێگومان ئەو ڕاستییەی کە ویلسنی حاکمی گشتی بریتانیا لە عیراق کە دوژمنی خوێنە خۆری شێخمەحمود بووە و دانانانی ویلسن بەو سلنەکردنەوەی شێخمەحموددا کە ئەمە شتێکی بەڵگە نەویستە کە شێخمەحمود ئاشکرا و ڕوو بەڕوو ئینگلیزەکانی بە دوژمنی کورد داناوە و لەئەنجامی موحاکەمە نەترساوە و سلی لەوە نەکردووەتەوە کە ئەو وەرامە ڕەقەی ئەبێتە سەرباری ئەو قینەی کە لەدلی کاربەدەستانی ئینگلیزدا بووە بەرامبەری... ئەم دانانانەی ویلسن تۆپەلێک قوڕ ئەدا بەدەمی ئەو کەسانەی کە هەوڵیان داوە ناوی شێخمەحمود و ناوی کورد بزڕێنن بەوەی کە ڕاپەڕینی شێخمەحمود و ڕاپەڕینی کورد شتێک بووە ئینگلیزەکان خۆیان ڕێکیانخستووە و شێخمەحمود کوتەکی دەستی ئینگلیزەکان بووە... ئەم تەقەلا ناپاکانە بەزۆری لەکتێب و نووسراوەکانی نووسەرە عەرەبە ڕەگەزپەرستەکاندا دەرئەکەوێت وەکو مەحمودالدوڕە و ڕەشیدالفیل و نووسینەکانی سەلاحالدین سەباغ و ئەو کتێبەی عەزیزی کوڕی حاجیقولی بۆ زڕاندنی شۆڕشی کورد لە کتێبەکەیدا(القضیە\ الکردیە\ في العشرینات)«٤٠» بڵاوی کردۆتەوە کە بە پارەی ڕەگەز پەرستەکان دەرچووە بۆ زڕاندنی ناوی شێخمەحمود و کورد .

ویلسن لە کتێبەکەیدا جگە لەو بینینەی شێخمەحمود لە خەستەخانە، باسی موحاکەمەکردنی شێخمەحمودیشی کردووە کە ئەڵێ: «٣٧»

«کە شێخمەحمود بە برینداری گیرا و هێنرایە بەغدا و لە خەستەخانە چاکبووەوە، لەگەڵ شێخحەمەغەریب(زاوای شێخمەحمود)دا بوو، لەپێشدا

لەلایەن مەحکەمەی عەسکەرییەوە بریاری خنکاندنی درا، بەلاْم ئەوە خرایە بەرچاو کە شێخ مەحمود هەندێ خراپە هەبوو کە ئەیتوانی بیکات لەلاْم نەی‌کردبوو... بەوێنە: ئەوانەی نەکوشتبوو کە لە سلێمانی بە دیل‌گیرابوون ، هەروەها ئەو شەرەی کە کرا و ئەو دەستی‌پێ‌کرد شەڕ و هەلوێستێکی سیاسی بوو، بەوجۆرە حوکمەکەی گۆڕا لە خنکاندنەوە بۆ بەندکردنێکی درێژخایەن.

ئەگەرچی من بە دڵ لەگەڵ ئەوەدابووم کە ئەبێ رەحمی پێ‌بکرێ لەبەر ئەو هۆیانەی پێشوو، بەلاْم من دژی گۆڕینی حوکمەکەی وەستام و بەشێوەیەکی ڕەسمی دەرم‌بری و ڕوونم کردەوە کە هەتا شێخ‌مەحمود بە زیندوویی مابێ ئەوانەی کە لە خواروی کوردستاندا لایەن‌گری ئەون هەمیشە لەوە ئەترسن کە شێخ‌مەحمود ڕۆژێک لەڕۆژان بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، بۆیە ئەو کەسانە لەجیاتی یارمەتی ئارام و ئاسایشی بدەن، بەپێچەوانەوە ئەبن بەهەوێنی نانەوەی ئاژاوە و پشێوی لە ناوچەکەدا».

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیدا دەربارەی موحاکەمە کردنی‌شێخ مەحمود ئەڵێ:«٣»

«ئینگلیزەکان بۆ موحاکەمەکردنی شێخ‌مەحمود لە بەغدا داوای چەند کەسێکیان کرد کە ئامادەبن وەکو شایەت لەو مەحکەمەیەدا کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- میرزا فەرەجی حاجی‌شەریف

٢- حەمەبەگی قادرپاشا

٣- شێخ‌نەجیبی قەرەداغی

٤- عیزەت‌بەگی وەسمان‌پاشا

٥- عەونی‌ئەفەندی حاجی‌گوورەوون

٦- حاجی‌مەلاسەعیدی کەرکوکلی‌زادە

٧- حاجی‌ئاغای حەسەن‌ئاغا (کە لەجیێ تاهیری حەمەئەفەندی فەرخە کە لە شەڕی دەربەندی‌بازیاندا کوژرا،بەر لەوە ئینگلیزەکان کردبوویان بە مودیری پۆلیس).

لەکاتی موحاکەمەکردندا بە شێخ‌مەحمود وترا داوای موحامی‌یەک بکات کە

پارێزگاری لێبکات بەلاّم قبوڵی نەکرد و لە وەرامدا ووتی:

لەسەر خواهیشی گەلەکەم داوای ئازادی کوردم لە حکومەتی بریتانیا کرد ، بەو بەڵێن و پەیمانە ڕێگەی هاتنیان‌درا بۆ کوردستان وە لەلایەن حکومەتی بریتانیاوە حوکومداریەتی بەمن و ئازادی بە کورد بەخشرا، بەلاّم ڕاستییان نەکرد، ئنجا کەمن لەسەر خواستی گەلەکەم بە حوکومدار دانرام ، ئەبوایە داوای بەجێ هێنانی ئەو پەیمانە بکەم بە زبان یاخود بە چەک..من لەگەڵ ئێوەدا لە جەنگدا بووم، منتان بە دیل‌گرتو لە بەندیخانەی ئێوەدام کە دوژمنی کورد و دوژمنی منن،لە بەر ئەوە بێ‌گومان دوژمن بۆ دوژمن بڕیاری باش نادات و منیش لەبەر ئەوە بەحوکومدانی ئێوە قایل نیم و لەدوای ئەوە شێخ‌مەحمود سەروپێچەکەی گرتە گرینهاوس(کە لەو مەحکەمەیەدا دیارە ئەویش بۆ شایەتی دژی شێخ‌مەحمود ڕاوەستاوە)پێی ووت:بەدبەخت ئەمە هەمووی گزبەنگی تۆیە......

لەکاتی مەحکەمەکردنی شێخ‌دا گرینهاوس بە مەحکەمە ئەڵێ: عزەت نەجیب ئالاّی بریتانیای داگرت و دڕاندی و ئالاّی کوردستانی لە جیاتی هەڵکرد.

وەلاّمی عزەت‌نەجیب بۆ ئەوەی گرینهاوس (عزەت‌نەجیب لەدوای شکانی شێخ‌مەحمود ڕایکردبوو بۆ ئێران و لەلایەن (شەریف‌الدەولە)وە تەسلیمی ئینگلیزەکان کراو برا بۆ ئەو مەحکەمەیەی شێخ مەحمود)ئەڵێ:

من لەسەر فەرمانی حوکومداری کوردستان لە کاتی شۆڕشدا کاروباری دائیرەکان و مەئمورەکانم پێ‌سپێردرا کە ئەبوایە ئەو فەرمانە بەجێ‌بێنم... ئالاّی ئینگلیزم داگرت و ئالاّی کوردستانم هەڵکرد...... ئالاّی ئینگلیزم بە پێچراوەیی و بەڕێزەوە تەسلیمی گرینهاوس کرد، بەلاّم داخەکەم گرینهاوس خۆی بەیداغەکەی خۆتانی دڕی و بەشەق لە باڵکۆنەکەوە فڕێی‌دایە خوارەوە و جنێوی پیسی بە منیش و بەریتانیاش دا»

کە لە شێخ‌مەحمود پرسرا ئەوەی عزەت‌نەجیب ڕاست بووە؟ ووتی بەڵێ ڕاستە من فەرمانم‌دا بە داگرتنی ئالاّی بریتانیا و هەڵکردنی ئالاّی کوردستان، ئەو کوردستانەی ئێوە (ئینگلیز) ئەتان‌ووت دروستی ئەکەین و لە ڕووی زاڵمی و نەزانینی سیاسیەکانتانەوە ئالاّتان داگیرا و ئالاّی ڕاست و حەقمان هەڵکرد»

ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا ئەڵێت: ئەو گفت و گۆیانەی ناو مەحکەمە لە دەمی ئەوانەوە بیسراوە کە لە مەحکەمەکەدا داواکرابوون بۆ شاهیدی، بەڵام هیچ پرسیارێکیان لە شاهیدەکان نەپرسیبوو.

شێخ رەئووفی شێخ مەحمود لەیاداشتەکانیا «٢١» دەربارەی موحاکمەکردنی باوکی ئەڵێ:

« جگە لە موحاکەمەکردنی شێخ مەحمود و شێخ حەمە غەریب، لە سلێمانیش مەحکەمەیەکی عەسکەری تر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دانرا بۆ موحاکەمەی ئەوانەی لە دەربەندی بازیاندا یا لە دوایدا گیرابوون و یا ڕایان کردبوو لە پاشملە موحاکەمەی ئەو ڕاکردوانەی کراوە لەو مەحکەمەیەدا هەرچی موڵک و ماڵی شێخ مەحمود و ئەوانەی هاوکاری و بەشداری شۆڕشیان کردبوو دەس‌بەجێ دەس بەسەر هەموویدا گیرا ...

کە مەحکەمەی عەسکەری لە سلێمانی حوکمی‌دا بەسەر حاجی سەید عومەری مامی شێخ مەحمودا کە لە حوکومداریەتی شێخدا موتەسەرفی سلەیمانی بووە و لە ڕۆژانی شۆڕشدا کاروباری پێ سپێررابوو وە لەو لیژنانەی کە حوکومدار بەرلەوەی سلێمانی بەجێ بێڵێت و بچێت بۆ کۆڕی شەڕ دای‌نابوون، حاجی سەید عومەر حوکوم درا و بە حەپسکراوی نێررا بۆ بەندیخانەی بەصرە، پوورێکی هەبوو ناوی زەینەب خاتون بوو، ئەو پوورەی دوای حاجی سەید عومەر کەوت بۆ بەسرە بۆ ئەوەی لەوێ سۆراخی بکا ... حاجی سەید عومەر لە بەصرە کۆچی دوایی ئەکا و پوورەکەشی لە داخا ئەمرێ».

شێخ رەئووف لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: جگە لە حاجی سەید عومەر، فەقێ محەمەدی هەمەوەندیش گیرا (فەقێ مەحەمەدی هەماوەند لە سەرەتادا لەگەڵ شێخ مەحمودا بووە) بەڵام بە هۆی موشیری حەمەی سلێمان و ئەو هەمەوەندانەی تر کە سەر بە ئینگلیز بوون بۆی تێکۆشان و لێی خۆشبوون لەوەی کە دارکاری بکرێ (دیارە ئەوانەی تر کە کەسیان نەبووە بۆی تێ بکۆشێ دارکاری کراون) بەڵام شێخ سەعیدی گۆپ‌تەپە، سەرەڕای زیندان‌کردنی لە ژێر ئەشکەنجە و دارکاری ناو زینداندا لە بەندیخانە شەهیدکرا».

دوکتۆر جەمال نەبەز لە کتێبەکەیدا «١٥» ئەڵێ:

«چی لەوە ڕاستگۆ و مەردانەتر ئەبێ لەوەی کە شێخ مەحمود بە دادگای ووتبو: من تاوانبارنیم و نەهاتومەتە سەر خاکی ئێوە، ئێوە تاوان بارن و چاوی تەماعتان بڕیوەتە خاکم و لە گفت و بەڵێنی خۆتان و هاو پەیمانەکانتان پەشیمان بوونەتەوە و لاتان‌داوە».

لە دوای شکاندنی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیاندا و هاتنی لەشکری ئینگلیز بۆ سلێمانی خێزانی شێخان و زۆری تر بە پەلە سلێمانیان بەجێ‌هێشت و دوور کەوتنەوە لە سنووری دەسەلاتی ئینگلیز کە زێوەر یەکێک بووە لەوانەی کە لەگەڵ ئەو خێزانانەدا ڕوویان کردوەتە ئێران و لە یاداشتەکانیدا باسی ئەو ڕۆژانە ئەکات کە هێشتا هیچ هەواڵێکی شێخ مەحمودیان نەزانیوە و ئەڵێ: «١٣»

« گەیشتینە ئەوەی دووربکەوینەوە لەو ناوچانەی لەژێر دەسەلاتی ئینگلیزدابو ئەحمەدبەگی ساحبقڕان دەربارەی نەبوونی هیچ هەواڵێک کە شێخ‌مەحمود چی‌لێ‌هاتووە ئاخۆ ماوە یانا ووتی:

تۆ بڵێی شێخ‌مەحمود ئەگەر مابێ ئەوەندە بێ‌ویژدان‌بێ و هیچ لە ئێمە نەپرسێتەوە؟(نەی‌ئەزانی کە شێخ بریندارپووە و دیلی دەستی ئینگلیزەکان بووە لە بەندیخانەی بەغدا)».

دەربارەی ئەو پرسیارەی حەمدی‌ساحبقران کە زێوەر لە یاداشتەکانیا باسی کردووە شێخ ڕەئوفی شێخ‌مەحمود لە یاداشتەکانیدا ئەڵێ: «٢١»

«کە ئێمە ئاوارەبووین و بەناچاری ڕوومان‌کردە کوردستانی ئێران، هیچ شتێکمان دەربارەی باوکم نەدەزانی. لەپاش ماوەیەک حاجی‌ئەحمەدی حاجی‌کەریم(حاجی‌کەریمی ڕۆقیەخان)کە خەزوری ماجدمستەفا بوو، یەکێک بوو لە بازرگانە ناسراوەکانی شاری سلێمانی( لە سالی سی‌یەکاندا لە دێی باڕێبی لەسەر دێی نەوتی کوژرا)، لەکاتی موحاکەمە کردنی شێخ مەحمود و شێخ حەمە غەریبدا حاجی ئەحمەد بەڕێکەوت بۆ کاروباری بازرگانی لە بەغدا ئەبێت حاجی ئەحمەد ئەچێتە لای باوکم کە لە بەندیخانە (هێندی)ئەبێت، لەوێ چاوی بە باوکم ئەکەوێ، کە گەڕایەوە بۆ سلێمانی دەم و دەست پیاوێکی بەکرێ گرتوو و ناردی بۆلای ئێمە لە ئێران و هەواڵی گرتنی باوکم و شێخ حەمەغەریبی بۆ ناردین بۆ ئێران ئەوسا ئێمە زانیمان کە باوکم گیراوە»

هەرچەند ئەوانەی یاداشتیان نوسیوە و بلاوکردوەتەوە هیچیان دەربارەی ئەو شایەتانەی کە بانگ کرابوون باسی کەسیان نەکردوە و ئەحمەد خواجا لە یاداشتەکانیا ئەڵێ ئەوانە لەگەڵ ئەوەشدا بانگ کرابوون بۆ مەحکەمە بەلام هیچیان‌لێ نەپرسرابوو.

بەلام لە هەندێکەوە بیستراوە و خۆم جارێک لە شێخ حەمەغەریبم بیستوە کە لە سەرەتای پەنجاکاندا لە گەڕەکی کانیسکان دراوسێی بووم، لە باسی ئەو شایەتانەدا ووتی تەنها شێخ نەجیبی قەرەداغی بۆ رازی‌کردنی ئینگلیزەکان خراپ شایەتی لێ داین.

بێجگە لەوە هەندێ کەسی تری ئەوسەردەمە باسی ئەوەیان ئەکرد ئەو شایەتانە کە چوونەتە بەغدا حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی‌زادە یەکێک بووە لەوانە، ئەگەرچی لەگەڵ شێخ مەحمودا زۆر ڕێک نەبووە، بەلام وا دیارە زۆر دووربینی کردوە و بە هەندێکیانی ووتوە: من کابرایەکی ئیسلامم و ئەم‌بەنە مەحکەمەیەکی غەیرەدین کە موحاکەمەی هاودینێکمان بکات و لام وایە ئێمە ئەگەر زۆریان لێ کردین و بەزۆر سوێندیشیان داین بۆ ئەوەی بەپێی ئارەزوی ئینگلیزەکان شایەتی بدەین، ئەگەر ئێمە سوێندیش بخۆین و درۆش بکەین سوێندەکەمان ناکەوێ ...

شێخ نەجیبی قەرەداغی لێی ئەپرسێت جا باشە بڵێن چی و ئەی ئەگەر خەڵکی تر شایەتییان لێدا ئەوسا ئینگلیزەکان غەزەبمان لێ ناگرن؟ ...

حاجی مەلا سەعید پێی ئەڵێ: من وەرامم وا ئەبێ کە ڕەنگە بە ناوی شێخ مەحمودەوە پارە و سەرانە لە هەندێ کەس سەرنرابێت بۆ کاروباری حوکومداریەتەکەی شێخ مەحمود، بەلام ئەو پارانە بەشێکی زۆری خەڵکی هەڵپەرست بوون هاتوونە سەرمان و هەڕەشەیان لێ کردوین و شێخ مەحمود ئاگای لێ نەبووە.

لام وایە شایەتەکانی تریش هیچی وایان دژی شێخ مەحمود نەوتبێت بۆ نموونە میرزا فەرەجی حاجی شەریف کە لەبەغدا نیشتەجێ بوو، لەساڵی ١٩٢٧دا کە شێخ مەحمود بۆ گفتوگۆ لەگەڵ فەیسەل و مەندوبی سامی‌دا چووبووە بەغدا، شێخ مەحمود لەماوەی بوونیا لەبەغدا میوانی میرزا فەرەجی حاجی شەریف بووە

وزۆر خزمەتی کردوە کەئەمە نیشانەی ئەوە لەو شایەتیەی کە بانگ کرابوو لیێی دڵگیرنەبووە .

شێخ مەحمود و شێخ حەمەغەریب لەبەردەمی
دادگای عورفی ئینگلیزدا لە ١٩١٩/٧/٢٥

# ئاوارەبوونی خێزانی شێخان
# و ئەوانەی بەشداری شۆڕشیان کردبوو

کە هێزی ئینگلیز ڕژانە ناو سلێمانیەوە و دەستیان کرد بە موحاکەمە و تالانی و دەس بەسەرا گرتنی ماڵ و موڵکی ئەوانەی بەشداری‌یان کردبوو لەو شۆڕشەی دژی ئینگلیزەکان کرا زۆر لەوانە خۆیان دەرباز کرد و ڕوویان کردە خاکی ئێران و ماوەیەکیش لەوێوە ڕوویان‌کردە کوردستانی تورکیا و لەلایەن کوردەکانی ئێرانەوە وەکو تاقمی مەحمود خانی‌دزڵی و مەحمودخانی کانی‌ساسان وسمایلخانی شوکاک(سمکۆ)و لەکۆتاییدا ئاغاکانی ناوچەی مەنگوڕ زۆر خزماتیان‌کردن و ڕێزیان لی‌گیرا .

دەربارەی ئاوارەبوونی ئەو ئاوارانە زێوەر لە (گەنجینەی مەردان«۱۳»)دا باسی ئەو ئاوارەبوونەی کردووە کە خۆی یەکیک‌بووە لەو دۆستانەی شێخ‌مەحمود کە بەر ڕق‌و قینی ئینگلیزەکانی ئەوڕۆژانە کەوتووە و لەترسی ئەو زیندان و دارکاری و ڕەش‌بگیرەی ئینگلیزەکان لەو ڕۆژانەدا دەستیان پی‌کردبوو، ئەویش لەگەڵ ئەو خێزانانەدا ڕووی کردۆتە ئێران بەلام بەداخەوە ئەوەی زێوەر لە یاداشتەکانیا دەربارەی ئەو ئاوارەبوونە تۆماری‌کردووە بریتییە لە باسێکی نیوەچڵی کە لەنیوەی ماوەی ئاوارەبووندا یاداشتە تۆمارکراوەکەی پچڕاوە و بە ناتەواوی ماوەتەوە و لە یاداشتەکانیدا بلاو نەکراوەتەوە .

بڕواناکەم زێوەر یاداشتەکانی هەروا بەنیوەچڵی هێشتبێتەوە و لام وایە هەتا کاتی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی هەموو شتێکی تۆمارکردووە بەلام ئەوبەشەی کە لەو یاداشتانەیدا مامۆستا محەمەدی مەلاکەریم بلاوی‌کردوەتەوە لەو بەشەی تری پچڕابێت کە بلاو نەکراوەتەوە لەکاتی دووبارە نوسینەوەی ئەو یاداشتەدا لەلایەن زێوەر خۆیەوە و ئەو بەشە پچڕاوەی لەوەی کە بلاو کراوەتەوە جیا بوویێتەوە کە بەداخەوە دوور نەبوو شتی زۆر خۆش و بیرەوەری سەیری تیادا بوبێت ...

بۆ تەواوکردنی ئەو قۆناغانەی دوایی ئاوارە بوون لە سەرەتادا ناچاربووم پەنا ببەمە بەر خزمەت شێخ باباعەلی شێخ مەحمود کە بە سوپاسەوە بەدەم خواستەکانمەوە ئەهات و وەرامی هەموو پرسیارەکانی ئەدامەوە و سەرەڕای ئەوەش یاداشتە دەس نوسەکانی شێخ ڕەئووفی برای کە بە عەرەبی وەکو موسوەدەیەک نوسراوە و چاپ نەکراوە و بلاْو نەکراوەتەوە و ئەوەشی بۆ پەیدا کردم کە بە وەرامەکانی خۆی و بەو یاداشتانەی شێخ ڕەئووف توانیم زنجیرەی ئەو ئاوارەبوونە تەواو بکەم وەکو لێرەدا پێشکەشی ئەکەم ...

زێوەر لە گەنجینەی مەرداندا دەربارەی ئەو ڕۆژانەی کە ئەو خێزانانە ئاوارە بوبون ئەڵێ: «١٣»

«کە لە سلێمانی ڕامان کرد، کەس ئاگای لە حاڵی شێخ مەحمود نەبوو، چوینە (بناویلە)و لەوێوە بۆ گوندی (چنگنیان) و لەوێوە بۆ (هەوڵوو) کە تاقە زەلامێکی لێبوو، ئێمە نزیکی (١٥٠)سوارێک ئەبوین، تەنها یەک قۆری و دوو پیاڵە و یەک دوو قاپی مسمان پێ بوو هی وامان هەبوو کە سرەی بۆ چای بەیانی ئەگرت نزیکی عەسر ئەوسا چایەکەی بەرئەکەوت، بەڵامماڵی شێخ دوو سەد سەر مەڕو بزن و کارو بەرخیان دەرکردبوو، هەر ڕۆژەی، دووسێیەکمان سەر ئەبڕین. برای شێخ (نیازی لە شێخ قادر بوە) بە مقدارێک سوارەوە لە شارباژێر هێزی مەعنەوی بە هەندێکمان بە هێزکرد.

ئەحمەد بەگی ساحێبقران ووتی ئێمە ناغافلێین شێخ کوژراوە یا گیراوە، ئەگینا شێخ ئەوەندە بێ ویژدان نیە لەم خەڵکە نەپرسێتەوە. ئەحمەد بەگ ووتی من ئەچمەوە دەوری سلێمانی بۆ هەواڵ زانین، لەو کاتەدا نامەیەکی شێخ قادر هات بۆ ئەحمەد بەگ و ئەویش دوو سواری لەگەڵ خۆی بردو چوەلای شێخ قادر و نەهاتەوە.

بۆ نیوەڕۆ چوینە(دۆڵپەمو) بە هیوای ئەوەی بچینە (سەرکان) هەتا هەواڵی شێخ ئەزانین ، شێخ عەبدولی سەرکان لەوکاتەدا مدیری ناحیەی پێنجوین بووە)لە وێوە چوینە (باشماغ)کە دێی نەقیب بوو لە خاکی ئێرانا. لەوێوە کاغەزێکمان نووسی بۆ مەحمود خانی کانی سانان ،ئەویش لە وەرامدا نووسی بووی باشماغ سەر سنوورە جێگەی ئێوەی لێ نابێتەوە، وەرن بۆ کانی سانان .

که چوینه کانی سانان لەگەڵ شێخ ڕەئوف و شێخ بابا علی دا پێشکەوتین و گەیشتینە کانی سانان،محمود خان کوڕەکانی شێخ مەحمودی ماچ کردو دەستی کرد بە گریان.

مەحمود خان هەمو ڕۆژێک ڕۆژنامەکانی تاران و شوێنەکانی تری بە ڕێک و پێکی بۆ ئەهات. ئێوارە خەڵکەکەی تریش گەیشتن کە (. ١٥)کەسێک ئەبوون و (. ٨)ولاغمان بە ئەسپ و ئێسترو ماین/ەوە پێ بوو، بۆ ڕێکخستن و نوستنی خەڵکەکەش حسین نازم و سید عبداللەی حاجی سید حسن و کاکە حەمەی ئەمینی عەتارو چەند کەسێکی تر لەم ڕووەوە لەگەڵ مەحمود خاندا کەوتنە گفت و گۆ.لەوێوە کاغەزێکمان نووسی بۆ کەیخسرەوخان کە ئەوسا لەگەڵ مەحمود خانی کانی‌ساناندا زۆر نارێک بوون بۆ ئەوەی ئەویش بەشداری و هاوکاری ئەو ئاوارە بوانە بکاو ئەو نارێکیەی کەلە نێوانی هەردوو لایانداهەبوو نەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنمان. وەرامی کەیخسرەوخان هاتەوە کەوا دڵگیری و نارێکی هەیەلە نێواندا وتفەنگچی ئێمە لەناو سەنگەردان، نەوەکو لە ڕووی نەزانینەوە تەقەتان لێ‌بکەن، لەبەر ئەوە حەز ناکەم لەم ڕێگەیەوە بێن.

ئێمە تەنها ئەمان‌ویست بگەینە (وولەژێر)و هیچی ترمان نەئەویست.

حسێن نازم وەختی خۆی مودیری ناحیەی پێنجوین بوو، شارەزای ئەو ناوچەیە بوو، هەستاوسوار بوو، ئێمەش بارمان‌کرد. سوارێک دەوکەوت ووتی: بڕۆن بۆ(سەرقەلاّ). نیوەڕۆ گەیشتینە (بالک) کەیخسرەو بەگ و ئەحمەد بەگی برازای میوانداریان کردین و دوای ئەوە بەرەو (ئژمار)کە گوندی مەحمود خانی هەورامی بوو (نیازی لە مەحمود خانی دزڵی بوو) حەرەکەتمان کرد.

شەوی پێشتر لە بالک کۆبونەوەیەک کرابوو بۆ دابەش بوونی ئاوارەکان بریار درا بێن بە دوو بەشەوە، نیوەی بچێت بۆ دزڵی و ئەوانی تر لە گوندی دەرزیان کە گوندی مەحمود خانی کانی سانان بوو نیشتەجێ‌بێن.

حەرەمی شێخ (ئایشەخان)و شێخ عبداللە و سەید ئیبراهیمی برای شێخ مەحمود و شێخ لطیفی کورە بچوکی شێخ مەحمود و حسێن ناظم و قەتارچی و نۆکەران سوار بوون بۆ دزڵی و لەگەڵ مەحمود خان کەوتنە ڕێ. خێزانەکەی تری شێخ مەحمود (بەهیەخان)و شێخ ڕەئوف و شێخ باباعلی لەگەڵ کاکە حەمەی

ئەمینی عەتاری خاڵیان و من و یەک دوو خزمەتکار و خوشکێکی بێچاوی شێخ بەجێمابن بەلاّم هەموو موفلیس و بێتەدارەک. (دەم چەرمگ)ێکمان هەبوو کە کاکە حەمە بوو (مەبەستی کاکەحەمەی ئەمینی عەتار بوە)ووتی با بارکەین و بڕۆین و چوینە( دەرزیان) هەر ڕۆژەی لە ڕێگا بە جۆرێک هەواڵی شێخ مەحمودمان ئەبیست، بەلاّم کە ئینگلیزەکان گەیشتبونە پێنجوین بلاّویان کردبوەوە کە شێخ مەحمود بریندارەو گیراوە بەلاّم ئێمە هەر باوەرمان نەدەکرد .

بۆ نەگبەتی ئێمە، هەردوو خان( مەحمود خانی کانی سانان و مەحمود خانی دزڵی) لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە گیران(ئێرانیەکان هەردوکیان تەسلیمی ئینگلیزەکان کردن و مەحمود خانی دزڵی لەبەندیخانەی (هنێدی) گیراو مەحمود خانی کانیسانان لە بەغدا ماوەیەک بە دەست بەسەری هێڵرایەوە، ئیتر ئێمەش چارمان نەما رووومان کردە بانە.

شێخانی بەرزنجە ئەوانیش وەکو ئێمە دەربەدەربوون، لە رێگا پێیان گەیشتین کەلەگوندی(هەنگەژار) نیشتەجێ کرابوون، سەرکردەی شێخەکانی بەرزنجە سید ئەحمەدی حاجی مامەند بوو( ئەوسا سید ئەحمەدی حاجی مامند لەگەڵ شێخ مەحمود دا بوو بەلاّم لە حوکمدارێتی دوهەمیا لەگەڵیا نەبووە) .

بو شەو چوینە بانە، حەمە تاڵی پیاوی رۆستەم خان لە پێش ئێمەدا میواندارێتی شێخ قادرو مندالاّنی نەقیبی کردبوو ( نیازی لە حەپسەخانی نەقیب بووە )ئێمەش رووومان کردە ماڵی حەمەتاڵ و شەو لەگەڵ کاکە حەمەی ئەمینی عەتارا بووین بە میوانی ئەو .

شێخ عارفی سەقز نامەی ناردبوو کە روو بکەینە سەقزو لەوێ خۆیی و ماڵ و منداڵی لە خزمەتدا ئەبن.

بەتەمابووین بچینە (زەنبیل) لەوکاتەدا شێخ قادری حەفید بەچەند سوارێکەوە پەیدا بوو ووتی: زەنبیل حکومەتی ئێرانی تێدایە ئاگاتان لە خۆتان بێت، شێخ قادر چووە بانە و ئێمەش رووومان کردە زەنبیل.

ئیتر بەداخەوە زیوەر لێرەدا باسی ئاوارەبوونەکەی لە کتێبە چاپکراوەکەیدا {گەنجینەی مەردان } نامێنێت و ئەپچرێت.

بۆ تەواوکردنی ئەوە، وەکو لە پێشدا باسمکرد شێخ باباعلی باسی ئەو ئاوارە

بوونەی بۆ کردمبەوجۆرەی خوارەوە کەلە بیری مابوو:

«ساتێک لە سلێمانی رامان کرد، لە پێشدا چوینە گوندی (وێڵەدەر)کە بە قەد پاڵی شاخی گۆیژەوە بوو؛ لەوێوە چوینە چنگیان و ئینجا رووومان کردە ناوچەی مەریوان لە گوندی دەرزیان دانیشتین(کە تائیرە وەکو زیوەر باسی کردبوو)لە دەرزیان ئاوارەکان بوون بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەم شێخ رووفی برام و من (باباعەلی) و حەلاوەخانی خوشکم و کاکە حەمەی ئەمینی عەتاری خاڵم و زیوەر و دایکیشمان (بەهیە خان)مان لەگەڵابوو لەگەل چەند کەسێکی‌تر.

تاقمی دوهەم بریتی بوو لە ئایشەخان و لەتیف و شێخ جلالی شێخ ئەحمەدو سید عبداللەی حاجی سید حسن و سید ئیبراهیمی مامم وشێخ رەشیدی شێخ علی سەرکار.

تاقمی ئێمە هەموومان چوینە هەورامان لای مەحمود خانی[illegible] بەشەکەی دووهەم شێخ قادری مامیشمان لەگەڵیانا بوو لە ئێمە زۆرتر بوون لە هەورامانەوە چوونە لای ناوچەی {نەهری} کە هی سەید تەهای شەمزینی بوو. بەڵام شێخ قادری مامم بەرلەوەی بگاتە ناوچەی سید تەهای نەهری لایدا بۆ سەقز و ساتێک ئێرانیەکان چونە سەقزەوەو سەقزیان گرت مامە شێخ قادریشمیان گرت و تەسلیمی ئینگلیزەکانیان کرد.

بەرلەوەی ئێرانیەکان شاری سەقز بگرن، سەقز حکومەتی تێدا نەبوو(سعید بەرغەش)کە خەڵکی سلێمانی بوو لە سەقز خۆی کردبوو بە کەلانتەر(حاکم)و لە بانە/ش حەمەتاڵ خۆی کردبوو بە کلانتەری بانە و رۆستەم خانی بانەش لە ناوچەی بانەدا دەسەلاتی هەبوو و دەستی ئەرۆیی، زۆری پێ‌نەچوو ئەو رۆستەم خانەش لەلایەن ئینگلیزەکانەوە گیراوخنکاندیان (لە راستیدا رۆستەم خان ئێرانیەکان خنکاندیان بە راسپاردەی ئینگلیز وەکو لە بەرگی دووهەم دا لە باسی هەڵوێستدا دۆکۆمێنتی ژمارە (F.O.371-5068) رۆژی ١٩٢٠/٢/٤ باسی کردوە) بەڵام کە ئێرانیەکان چوونە سەقز سعید بەرغەش خۆی دەرباز کردبوو، حەمەتاڵیش دوای ئەوە دەسەلاتی نەماو کە شێخ قادری مامم لەدواییدا لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بەردراو هاتەوە؛ حەمەتاڵ بوو بە پیاوی شێخ قادر.

پاش ماوەیەک، هەردوو تاقمەکەروویان کردە (چاری)لای سمایل

خانی‌شکاک(سمکۆ )که چه‌ند رۆژێک له‌وێ گلی داینه‌وه و له وێوه هه‌ردوو تاقمه‌که‌ی ناردین بۆ (کۆنه‌شار)و که گه‌یشتینه ئه‌وێ هه‌رتاقمه خانوویه‌کی گه‌وره‌ی بۆ ته‌رخان‌کرا،به‌لأم ئێرانیه‌کان دووباره په‌لاماری سمکۆشیان داو سمکۆ شکا و به ناچاری ئێمه‌ش له‌گه‌ڵیا چوینه ناوچه‌ی هه‌کاری له کوردستانی تورکیا نزیکی (باشقه‌لاّ).

ئه‌و زستانه ئێجگار زۆر سه‌خت بوو، له پێشدا چوینه نوخته‌ی (خانه‌سوور)که‌له‌سه‌ر سنووری ئێران و تورکیایه، تورکه‌کان رێگه‌یان لێ نه‌گرتین، له‌وێوه چوینه (دێر) که ئه‌وسا به‌قه‌د شاری پێنجوین ئه‌بوو مه‌رکه‌زێکی تورکی لێ بوو، ئه‌فسه‌ره تورکه‌کان هه‌موومانیان به‌سه‌ر ئاوایی (دێر)دا دابه‌شکرد و خه‌ڵکه‌که زۆر رێزیان لێ گرتین و خزمه‌تیان کردین. ئه‌وناوچه‌یه هی ئاسوری و کورد بوو به‌لاّم به‌رله‌وه‌ی ئێمه بگه‌ینه‌ئه‌و ناوچه‌یه تورکه‌کان هه‌موو ئاسوریه‌کانیان له گونده‌کانی خۆیان ده‌رپه‌ڕاندبوو (له‌به‌رگی دوهه‌می ئه‌م کتێبه‌دا باسی ئاواره بوونی ئه‌و ئاسوریانه ئه‌که‌ین بۆ خواروی کوردستان که چۆن بوون به هۆی زیان بۆ ڕاپه‌رینه‌کانی کورد دژی ئینگلیز).

له‌دوای دێر چوینه (ئه‌سپستان ـ که گوندێکی چۆڵکراوی ئاسوریه‌کان بوو) له‌ناو ئه‌و گونده‌دا خانوو ئالیکی ولاّغ هه‌مووی به‌جێ‌هێڵرابوو، ئه‌گه‌ر ئه‌وخانوه چۆڵکراوو ئالیکی ولاّغانه‌ی ئه‌سپستان نه‌بوایه ئه‌و زستانه به‌خۆمان و ولاّغه‌کانمانه‌وه له‌ناو سه‌رماو به‌فردا ره‌ق ئه‌بوینه‌وه.

ناوچه‌ی گوندی ئه‌سپستان زۆر ڕوته‌ڵ و بێ سووته‌مه‌نی بوو، خواردن به‌زه‌حمه‌ت ده‌ست ئه‌که‌وت، ناچاربووین له دێهاته‌کانی ده‌ورو پشت به پاره خواردنمان ئه‌کڕی‌و بۆ سوته‌مه‌نیش ناچاربووین داروو په‌ردووی چه‌ند خانوویه‌ک بسوتێنین، به‌وجۆره مانگی شوبات و مانگی مارتی سالّی ۱۹۲۰مان به‌و کوێره‌وه‌ریه برده‌سه‌ر.

که‌هه‌وا تۆزێک خۆش بوو، بریار درا بگه‌رێینه‌وه بۆ ناوچه‌ی (خۆی) و(سه‌لماس) که‌له‌وکاته‌دا سمکۆ له‌گه‌ڵ ئێرانیه‌کاندا ئاشت بو بوه‌وه وئێمه‌ش گه‌راینه‌وه بۆ (چاری)، له وێوه ڕوومان کرده ناوچه‌ی (مه‌نگوڕ)لای حه‌سه‌ن ئاغای بایز پاشای مه‌نگوڕ(باوکی عه‌لی حه‌سه‌ن ئاغای شه‌روێت) که ئه‌و بایز

پاشایەش لەکاتی عوسمانلی‌دا لەقەبی پاشایەتی پێ درابوو وەکوئەو لەقەبانەی بەهەندێک سەرۆک عەشیرەتی تریش درابوو وەکو مەحمود پاشاو عوسمان پاشای جاف و هەندێکی تر).

بەرلەوە بگەینە ناوچەی مەنگوڕ بەناو مامەشەکاندا تێپەڕمان کرد بە (جلدیان)دا سالح ئاغای مامەش سێ ڕۆژ گلی داینەوەو میوانداریتی کردین بە پێچەوانەی ئەو قەرەنی ئاغای برای کەلە گوندی(پەسوێ)دا ئەنیشت بە ئاشکرا پێی وتین ناتوانن لێرە دانشن و جێگەتان نابێتەوە، ئیتر چارمان نەما ڕوومان کردە گوندی(سەیدیان)لای مەنگوڕەکان.

کە چوینە لای حەسەن ئاغای بایزپاشای مەنگوڕ، حەسەن ئاغا بە کاکە حەمەی خالمی ووت: من ٣٠٠ تفەنگچیم هەیە، ئەگەر هات و ئێرانیەکان هەولی ئەوە بدەن بێنە سەرتان لەم ناوچەیەدا، هەتا تاقە تفەنگچیەکمان مابێ ڕێگە نادەم بێنە لای ئێوە.

ئەوسالە بەهارێکی زۆر خۆشمان لای حەسەن ئاغا رابوارد و پتر لە مانگێک لای ئەو ماینەوە. لەوێوە عەریزەیەک نێررا بۆ مێجەرسۆن بۆ ئەوەی ڕێگا بدا خێزانەکان بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، مێجەرسۆن قایل بوو بە گەڕانەوەی خێزانەکان بەمەرجێک هەندێکی وەکو سید عبداللەی حاجی سید حسن و زیوەرو چەند کەسێکی‌تر نەگەڕێنەوە، بەلام زۆری پێ نەچوو لەناکاو تاقمێک سوار دەرکەوتن و وامان زانی هێزی حکومەتی ئێرانە، بەلام دەرکەوت میرزا ئەحمەدی خالم وحاجی سەید حەسەنی کانی گۆمەو کوێخاکەی تەنگی سەر لەگەڵ چەند کەسێکی تردا بوون بۆ ئەوە هاتبوون کە ئێمە ببەنەوە بۆ سلێمانی و پاش ئێمەش مێجەرسۆن موافەقەتی کرد کە ئەوانی تریش بگەڕێنەوە.

کە لە زەنبیل بووین زۆر کزو بێپارەبووین، خالە فەتاحم ئەوساکە هێشتا ئەفسەری تورک بوو بیستبووی ئێمە لە زەنبیلین بەهۆی کۆنسولی تورکەوە لە ورمێ بەخۆیو ١٠ ئێستر سوارەوە چەکەکانیان لە ورمێ بەجێ‌هێشتبوو هاتنە لامان لە زەنبیل و ٤٥٠ لیرەی ئالتونی بۆ هێنایןو ووتی هاتووم بتانبەم بۆ(وان)لە تورکیا بۆ ئەوەی منداڵەکان لەوێ بچنە مەکتەب و ئێوەش لە وان جێگیر بن هەتا خوا دەروویەکمان لێئەکاتەوە بەلام دایکم و کاکە حەمەی خالم

موافەقەتیان لەسەر ئەو چونە نەکرد).
شێخ رەئوفی شێخ مەحمودیش لە یاداشتەکانیابیرەوەری خۆی بەرامبەر بەو ئاوارە بوونە بەم جۆرە تۆمارکردوە:
«کە ئاوارە بووین پەنامان بردە بەر مەحمود خانی دزلی و مەحمود خانی کانی سانان، دوای ماوەیەک ئێرانیەکان هەردو مەحمود خانیان گرت و تەسلیمی ئینگلیزەکانیان کردن و نێرران بۆ بەغدا؛ ئێمەش ناچار بووین رووەمان کردە (بانە) کە شێخ قادری مامم و حەپسەخانی خێزانی لای رۆستەم خانی بانە بوون (شێخ رەئوف وەکو باباعەلی باسی حەمە تالی نەکردوە)پاش ماوەیەک شەریف‌الدەولە کە کرابوو بە حاکمی بانە رۆستەم خانی داواکرد بچێتە سەقز و کە چوە ئەوێ گرتیان کردیان بە سێدارەدا. بەو جۆرە ئێمەش پەرێشان و دەست کورت بووین. بەلام کەبەناو گوندەکانی ئێراندا تێپەرمان ئەکرد خەڵکەکە زۆر بە روویەکی خۆشەوە بەرەو پیرمان ئەهاتن و یارمەتیان ئەداین، دوای ئەوە رووەمان کردە لای سمکۆ و هەندێکمان لە زەنبیل ماینەوە کەتابعی مەهاباد ـ سابلاغ بوو، لەوێ ماوەیەک خۆمان شاردەوە».
لە زەنبیل خالە فتاحم بە خۆیی‌و چەند سوارێکەوە هاتن و هەندێ پارەی بۆ هێناین (وەکو باباعەلیش باسی کردوە) بەلام ئەوهاتنەی خالم دەستی خستینە روو ناچار بەپەلە پروزکێ خۆمان گەیاندە(چاری)، کە گەیشتینە لای سمکۆ لەوێ زانیمان شێخ قادری مامم کە چوە بۆ سەقز، کاربەدەستانی ئێران لەگەڵ چەند کەسێکی‌تردا کە گیرابوون شێخ قادری تەسلیمی ئینگلیزەکان کردبوو و حوکم درابوو بە ئاوارەکردن بۆ جەزیرەی هەنجام( وابزانم شێخ رووف لەوەدا بەهەڵەداچووبوو چونکە تەنها شێخ مەحمود و شێخ حەمە غەریب نیررابوون بۆ هەنجام لە هیندستان و شێخ قادر لە بەغداهێنڵرابوەوە هەتا پێش گەرانەوەی شێخ مەحمود لە ساڵی١٩٢٢دا کە بکرێت بە حوکمدار بۆ جاری دوهەم، ئەویش بەردرابوو، چوو بوەوە سلێمانی بەرلەوەی شێخ مەحمود لە هیندستانەوە بگەرێتەوە، تەنها شێخ رووف بەوجۆرە باسی شێخ قادری کردوەو شێخ قادر لە یاداشتەکانیا باسی شتی وای نەکردوە).
شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیا ئەڵێ: لەسەردەشت(سەید محمدی حەفید)ی مامم

(برا گەورەی شێخ مەحمود کەلە هیچ لایەک ناوی نەهاتووە جگەلەو یاداشتەی شێخ رەئوف نەبێت و مەلا عبدالکەریمی مودەرسیش وەکو باسمان کرد لە بنەماڵەی زانیاریدا ناوی هێناوە )کۆچی دوایی کرد کە ئەویش غەمێکی گەورەبوو بۆمان لەو رۆژە تەنگانەدا.

بەرلەوەی ئێرانیەکان شێخ قادری مامم بگرن و بینێرن بۆ لای ئینگلیزەکان، کە ماوەیەک لای سمکۆ ئەبێت قونسوڵی ئینگلیز لە تەورێز ئەچێتە لای سمکۆ و داوای لێ ئەکا شێخ قادر بگرێو تەسلیمی ئینگلیزەکانی بکا، سمایل خان بەتوڕەییەوە پێی ئەڵێ: تۆ چۆن داوای شتی وا لەمن دەکەی؟ ئەگر ئێستا لە ماڵی من نەبوتیایە لەسەر ئەو داخوازیە ئەمکوشتیت.

لەدواییدا بیستمان هەندێ لە ناسراوەکان وەکو حامید بەگی جاف و ئەحمەد بەگی ساحێبقران وشێخ عبدالقادری گۆپتەپە(گوللەنەبڕ)و کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و هەندێک لە شێخەکانی بەرزنجە و شێخ عبدالرحمانی داراغاو هەندێک لە ئەفسەرە کوردەکان وەکو ئیسماعیل حەقی شاوەیس و ژمارەیەکی تریان چوونە ئەستەمبۆڵ و نەگەراونەتەوە و پەنایان بردۆتە بەر تورک»

(لام وایە ئەوەی شێخ رووف لە یاداشتەکانیا لە رووی چونی ئەوانە بۆ تورکیا باسی کردون تەنە هەر هەواڵ و دەنگ و باسێک بووە کە لەو ڕوەوە بەوان گەیشتوە لە ئێراندا و لە راستیدا هیچیان پەنایان نەبردۆتە بەر تورکەکان).

حامید بەگی جاف کەلە زەمانی شێخ مەحمود دا دەستی بەسەر هەڵەبجە داگرتبوو لایەنگری شێخ مەحمود بووە، دوای ئەوەی شێخ ئاوارە کراو «لیز» گەرایەوەو کرا بە ئەفسەری سیاسی لە هەڵەبجە، ئیتر حامید بەگ لە هەڵەبجە رای‌کردو پەنای بردە بەر ناوچەی هەورامان، بەشی ئێران ئینگلیزەکان بۆئەوەی حامید بەگ بگرن مستەفا بەگی جافر سلطان(سان)ی هەورامی‌یانگرت و داوایان لە ئێرانیەکان کرد کە ئەگەر حامید بەگ بگرن وبیدەنە دەست ئینگلیزەکان، ئەوانیش مستەفا بەگ تەسلیمی ئێران ئەکەن(کەلەورۆژانەدا ئێرانیەکان ئەیانویست مستەفا بەگ بگرن)بەو جۆرە حامید بەگ گیراو نیررا بۆ بەغدا، بەلاّم توانی لە بەندیخانە رابکا و خۆی دەرباز کردو لەدواییدا ئینگلیزەکان لی‌ی خۆش بوون وکە شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٢٢دابۆ جاری دووهەم کرایەوە بە

حوکمدار ئیتر وەکو جاران لایەنگری شێخ مەحمود نەبووە.

شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیان لە باسی ئاوارەبونی خێزانەکاندا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێ:

« لە (چاری)تاقمەکەی خۆمان لە (کۆنەشار)بە ئەمری سمکۆ نیشتەجێ کراین لە رێگا کە چوینە لای سمکۆ لە نیوەی رێگای «ورمێ-رەزائیە»و«مەهاباد»دا گوندێک هەیە پێ ی ئەڵێن «دزە»کە عەشیرەتی دزەیی هەولێر وەختی خۆی لەو گوندەوە چونەتە هەولێرو ئەو ناوچەیەی کەلە دەوری هەولێر لێ ی نیشتەجێبوون پێ ی وتراوە«دزەیی»کە چوینە دزە لەوێ ئەسکەندەرخان/ی ئامۆزای سمکۆ بە پیرمانەوە هات و زۆر خزمەتی کردین و چەند رۆژێک لە گوندەکەی خۆی میوانداری کردین و بوژاینەوەو حەواینەوە هەتا گەیشتینە گوندی«حصار»کە ئەویش هی عبداللە بەگی برای رۆستەم بەگ بوو،لە وێوە ڕوومان کردە «چاری»کە گوندێکی سمکۆ بوو، کەلە حصار دەرچوین زۆر سارد بوو بەهەورازێکدا کەسەر ئەکەوتین زیوەری شاعیر سواری ئەسپێک بوبو بەدەم رۆیشتنەوە ڕووی کردە کاکە حەمەی خاڵم و ووتی کاکە حەمە ئەزانی ئاواتی چی ئەخوازم؟خۆزگە ئیمشەو میوانی خانە خۆی یەک ئەبووین کە بۆ ئێوارە بتوانێت چێشتێکی ساوەری بەقاورمەمان بداتێ و ژورێکی گەرم..بە رێکەوت ئەوخانە خۆی یەی ئێمە ڕوومان تێ کرد بەڕوویەکی خۆشەوە بەپیرمانەوە هات و ساوەرو قاورمەشی داینێ و ژورەکەشمان گەرم بووا.

دوای چەند رۆژێک گەیشتینە «چاری»کە گوندێکی گەورەیە لە دەشتێکی پاندار دیوەخانی ئاغا (نیازی لە سمکۆ بووە)لەقەراغ دۆڵێکی سەرەو لێژدابوو، دیوەخانێکی زۆر گەورەی هەبوو، لەباخەکەیدا درەختی لیمۆو پرتەقاڵی هەبوو.خانوەکەی ئاغا ، شێوەی نەخشەکەی وەکو هی قوتابخانەی فەیسەلیە وابوو( ئەوقوتابخانەیەی کەلە شوێنی خۆیدا باسمان کرد کە بوو بوو بە شوێنی حاکمی سیاسی لە سلێمانی و پێ ی ئەوترا مەکتەبی سیاسی) بەلام زۆر لەو قوتابخانەیە گەورەتر بوو .

ئەوکاتەی ئێمە چوبووینە لای سمکۆ لەو رۆژانەدا دەسەلاتێکی زۆری هەبوو بەشێکی زۆری ئازربایجانی گرتبوە ژێر دەستی خۆی وەکو رەزائیە-ورمێ-و

دیلمان و کۆنەشارو مەهابادو ناحیەی سەقز، هەموو ژنەکانی ئاغا لەو خانوە گەورەدا بوون.شێخ رەئوف لە یاداشتەکانیا لەباسی سمکۆدا ئەڵێ: رەشید جەودەت کەلەکاتی لیٚقەومانیا رای‌کردبوو بوو بە مورافیقی سمکۆ، بۆی گێرامەوە و ووتی:سمکۆ دوو ژنی هەبوو یەکێکیان تورکمان بوو کورێکی لیٚی هەبوو، کە وەلی عەهدی ئێران بە فێڵ براکەی سمکۆی کوشت براژنەکەی خۆی مارەکرد و کورێکی بوو ناوی(خسرەو)بوو ئەو خوسرەوە لەکاتی شەری سمکۆو تورکەکاندا لەلایەن سەعید پاشای قائیدی جەبهەی رۆژهەلاٚت خوسرەوی کوری سمکۆی گرت و نەیدایەوە بەباوکی و کردی بە کوری خۆیی‌و ناردی بۆ مەکتەب و لە دواییدا بوو بە ئەفسەر لە سوپای تورکدا کە تەقاعود کرا لە ئەستەمبوڵ نیشتەجیٚبوو.

شێخ رەئوف لەباسی سمکۆدا ئەڵێ: سمایل خان لە(چاری)وەکو سەرۆکی دەوڵەتێک ئەژیا نەک وەکو سەرۆک عەشیرەتێک...عەرەبانەیەکی جوان و رازاوەی هەبوو کە لە ئێران بەو جۆرە عەرەبانەیە ئەوترا (پایتۆل)شەش ئەسپ رایان ئەکێشا و کە ئەچوو بۆسەر لێدان لە موڵکەکانی، ژنەکانی لەو عەرەبانەیەدا سوار ئەکردو گەلێک سوار بەلۆقەو بەغار دەوری عەرەبانەکەیان ئەگرت و لەگەڵیا ئەرۆیشتن...کە گەراینەوە بۆ سلیٚمانی، زیوەر خەفەتی ئەخواردو ئەیووت: بەداخەوە لەو ناوچەیەدا خوێندەواری نەبوو، کاتبەکەی اسماعیل ئاغا پیاوێکی تورکمان بوو خەڵکی تەورێز بوو جگەلەوە کاتبەکەی ئەحمەد ئاغای برای سمکۆش کابرایەکی پیاو کوژبوو کەلە ناوچەی (کلری)یەوە رای کردبوو بۆ چاری، قازی سمکۆ پیاوێکی کورد بوو لە کوردستانی تورکیەوە گەیشتبوە لای سمکۆ(لەبەشی رۆشنبیریدا بەرلەمە باسی کاتبەکەی جەعفەر ئاغاش کراکە مینۆرسکی ئەڵێ کابرایەکی فارس بووە) لە دوای چاری چوینە کۆنە شار،بەلاٚم کە سمایل خان لەگەڵ ئێرانیەکاندا کەوتە شەرەوە ناچار ئێمەش روومان کردە تورکیا، بەو زستانە ساردو سەهۆڵبەندانە کە بەزۆر گوندی تورکیادا ئەرۆیشتین دەریان ئەکردین کەلە راستیدا ئەوانیش بەهۆی شەر و گرانیەوە برسی‌وبیٚدەرەتان بوون.

شێخ رەئوف دەربارەی کوشتنی مارشەمعون لەلایەن سمکۆوە ئەڵێ: ئەو

کوشتنەی زیانێکی زۆری بە سمکۆ گەیاندو لە زیوەرم پرسی ئایا هیچ هۆیەک ئەزانی کە بووبێ بەهۆی کوشتنی مارشەمعون لە وەرامدا پیی وتم منیش مەراقم بوو هەمان پرسیارم لە سمکۆ کردو لە وەرامدا پیی وتم: زۆر ترسابووم کە مارشەمعون دەسەلات پەیدا بکاو جێگەی من بگرێتەوە لەوناوچەیەدا .

لەبەشی دوهەمی ئەم کتێبەدا باسی سمکۆو چوونی مستەفا پاشایامولکی بۆلای سمکۆوهۆی کوشتنی مارشەمعون و ئاوارە بوونی ئاسوریەکان ئەکەین بۆئەوەی بزانین ئەو رووداوە چ زیانێکی هەبوو بۆ کورد و خوارووی کوردستان بەهۆی هاتنی ئاسوریەکان بۆ ناوچەی بادینان ، شێخ رەووفیش لە کۆتایی ئەوباسەدا هەروەکو شێخ باباعەلی باسی گەرانەوەیان ئەکا بۆ سلێمانی لە رێگەی ناوچەی مەنگورەوە بەمەرجێک لە داریکەلی دانیشن و ئەو گوندە بەجێ نەهێلن.

# کورتەی یەکەم حوکمدارێتی

## یەکەم: تەمەن و ماوەی حوکمدارێتی یەکەم

لەدوای لەناوبردنی ئەمارەتی بابان لە سلێمانی دا لە سالی ١٨٥١، جارێکی تر یەکەم حوکمدارێتی لەخوارووی کوردستاندا لە پایتەختی سلێمانیدا لە١/١١/١٩١٨دا دامەزرێنرا، لەورۆژەدا لە هەلْبژاردنێکی ئازاد دا لەلایەن کوردەوە شێخ مەحمود بە حوکمدار(مەلیک)ی کوردستان هەلْبژێررا و مێجەرنۆئیل نوێنەری حکومەتی بەریتانیا لە ١٨/١١/١٩١٨دا بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە اعلانی حوکمدارێتی شێخ مەحمودی کردلە خوارووی کوردستانداو بۆ خەلْکی بلاْوکردەوە کە ئێوە سەربەستن و ئازادن و نامەی ویلسنی حاکمی گشتی بەریتانیا کە بە فارسی نووسرابوو نێررا بۆ شێخ مەحمود، بەونامەیە ئاگاداری شێخ مەحمودی کردبوو کە بەپیێ فەرمانی حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا وای پێی گەیەنراوە کە بە شێخ مەحمود بوترێ لەم رۆژانەدا لێدوانی سەربەستی کوردستان تەواو ئەبێت، کورد بەسەربەخۆو شێخ مەحمود بەحوکمدار ناسراون، بەلاْم زۆری پیێنەچوو ئینگلیز لە بەلێنەکانی پاشگەز بووەوو لە ئەنجامی شەری دەربەندی بازیاندا لە ٢٢/٧/١٩١٩دا هێزەکانی ئینگلیز چوونە ناو شاری سلێمانیەوەو دەستیان بەسەر کاروبار داگرت و دام و دەزگایەکی تازەیان دامەزراند کە خۆیان راستەوخۆ هەموو ئیشێکیان ئەبرد بەرێوە...

ئاشکرابوونی مەبەستی ئینگلیزو بریاردانی پاشگەزبوونەوە لەو بەلێنانەی بە کوردیان دابوو وایان لە کورد و شێخ مەحمود و هاوکاری شێخ مەحمود کرد کەلەوە زیاتر سەرشۆری قبولْ نەکەن بەرامبەر بەلووت بەرزی و کەلْەگایی مێجەرسۆن و ئەفسەرە سیاسی‌یەکانی‌تری ئنگلیز کە بەئاشکرا شەریان ئەفرۆشت و ئەیان ویست حوکمدارێتی کوردستان لەناو ببەن بەو پیێیە تەمەنی یەکەم حوکمدارێتی لە خوارووی کوردستاندا لە ١/١١/١٩١٨هەتا٢٢/٧/١٩١٩کە

ئەکاتە هەشت مانگ و سێ حەفتە درێژەی کێشا، کە ئەو ماوەیە تەمەنێکی زۆر کورت بووەو رێگەی ئەوە نەدراوە دەزگایەکی حوکمدارێتی رێک و پێک دروست ببێت و بتوانێت بەسەر ئەو هەڵو کەموکوڕیو نارێکی ونەشارەزا بوونەی کەلەو رۆژانەدا هەبووە چارەسەر بکرێت و خەڵک دڵنیا بکرێ لەوەی کە دوارۆژێکی پڕ لە شادمانی بۆ کورد پێک دێت (نوئیل وەکو باسمانکرد دانی پیادا ناوە کەلەتوانادابووە ئەو هەلاتەی کە بووە راست بکرێنەوە).

## دووهەم: دەزگاکانی حوکمدارێتی

ئەوی راستی بێ دەزگاکانی حوکمدارێتی لە پێشدا زۆر سەرەتایی بوەوخەڵک بە ئاسانی نەئەخرانە سەر ئەو رێگەیەی کەبە یاساو بەریک و پێکی قایل بێن و بە ئاسانی ملیان نەئەدا بۆ ئەوشتانەی کەلەگەڵ خواستی تایبەتی خۆیانا یەکی‌نەدەگرتەوەو سروشت و رەوشتی خیلأیەتی دەورێکی کاریگەری بینیوەو ئەو حوکمداریەتە لەسەر کەلاوەی رووخاو و دەزگای رزیوو قرچۆکی پاشەبەرەی عوسمانلی دروست کرا کە بەئاسانی نەدەتوانرا لەوماوە کورتەدا لە بناغەوە ئەودەزگا کۆنە هەڵتەکێنرێو لەو ماوە کەمەدا دەزگایەکی رێک و پێک دروست بکرێ و یاسایەکی پێشکەوتوانەی شارستانیانە بۆ خەڵک دەست نیشان بکرێ بۆ ئەوەی خەڵک پێرەوی بکا.

یاسای دەولەتی عوسمانلی کەلەسەر بناغەی فیودالیو کۆچەری پێک هاتبوو تێکەڵکرابوو بە یاسای ئیسلامیو هەرناوچەیە بە جۆرێک کاروباری پێ‌ئەبرد بەرێوەوماوەیەکی زۆری ویستوە ئەو دەزگاو یاسایانە لەگەڵ بارو هەڵوێستی پێویستدا بگونجێنرێن و لەراستیدا تەنها هەستی پاکی خەڵک بووە کە لەناو ئەو کەلاوەو لە نێوانی ئەو هەموو پشێوی و پاشاگەردانیەی ئەو رۆژانەدا وای لە زۆر کەس کردوە بەوپەری دڵسۆزانەوە لەوماوە کەمەدا لەچاو خۆیا هێزی لیڤی سەربازی کورد پێک بێت و خەڵک بەوپەری شانازییەوە مەشق بکاو توانرا لە ماوەیەکی کەمدا ئارام و ئاسایش لەچاو خۆیداو لەچاو ئەو رۆژەدا بەرپابکرێو کە قوتابخانەکان کرابونەوە رۆشنبیرەکان بەوپەڕی سەرگەرمیو دڵسۆزییەوەو

هەندێ جار بەخۆڕایی خۆیان تەرخان ئەکرد بۆ خزمەتی خەڵکی ئەو رۆژە بۆ ئەوەی لە تاریکی نەخوێندەواری‌یەوە بیانگوێزنەوە بۆ رۆشنایەتی خوێندەواری و لەگەڵ ئەوەشدا کە سیاسەتی ئینگلیز هەر لەسەرەتاوە ناپاک بوە بەرامبەر بە دوارۆژی کورد و ئەو ئەفسەرە سیاسیانەی، بۆیە لەناوچەکانی کوردستاندا خۆیان چەسپاندبوو بۆ ئەوەی بێن بە هەمزەی وەسڵی کاربەدەستانی ئینگلیز و سەرکردەکانی عەشایرەکان کە ئینگلیزەکان هەریەکەیان بەجۆرێک پێوەندی‌یان پی‌یانەوە هەبووەو هەریەکەیان جۆرە موچەو خەلاتێکیان بۆ بڕی‌بوونەوە بۆ ئەوەی هەموویان بکەن بەکەمەر بەستەی خۆیان و لەهەر کاتێکدا چۆنیان ویست بەو جۆرە بیان بەن بەرێوە...بەکورتی تەمەنی کورتی ئەو حوکمداریەتە ئەوەندە کەم بو کەماوەی ئەوە نەبووە لەوماوەیەدا بایەخێکی زۆر بدرێ بەکردنەوەی قوتابخانەو دەزگای رۆشنبیری، بە پێچەوانەی حوکمدارێتی دووهەم کە لە بەرگی دووهەمدا باسی ئەکەین .

## سێهەم: دەرامەدی ناوچەی حوکمدارێتی

کەیەکەم حوکمدارێتی لەخوارووی کوردستان دامەزرێنرا، وەنەبێ رێگەی ئەوە درابێ کە بودجەیەکی سالأنە یامانگانەی بۆ تەرخان کرابێ‌و دەزگایەکی دارایی هەبووبێ و سەرپەرشتی خەرج‌و دەسکەوت بکاو سەرپەرشتی بکا، ئینگلیزەکان لەو پارەیەی تەرخانیان کردبوو بۆ بەرێوەبردن کاروباری ناوچەکە لەگەڵ ئەو دەرامەدەی لە سەنەدنی باج وەکو سەردەمی عوسمانلی، ئەمانە هەمووی بریتی بووە لەو بودجەیەی کەتوانرابۆ کاروباری ناوچەکە خەرج بکرێت.

شێخ مەحمود لەسەرەتادا مانگی١٥ هەزار روپیەی بۆ براوەتەوە، کە مێجەرسۆن لەجیاتی نوئیل کراوە بە حاکمی سیاسی ئەو مانگانەیەی کەم کردۆتەوە بو ١٠ هەزار روپیە، بەوەدا دەرکەوتووەکە حاکمی سیاسی بەریتانی لە سلێمانیدا سەرپەرشتیکەری بودجەی ناوچەکە بووە کەمەبەستیش لەوەدا دیار بووە کە بۆ ئەوە بوو ئینگلیزەکان بەپارەو موچەو خەلات خەڵک بەلای خۆیانا

بەکێش بکەن‌و بەبڕینی موچەو خەڵات هەڕەشە لە فەرمانبەرو سەرۆک عەشیرەتەکان بکەن ئەگەر لە رکێفی ئەوان لایان‌دا.

خەڵکی ئەو رۆژانە تازە لە گرانی و برسێتی و رووت‌و قوتی شەری جیهانی رزگاریان بوبو، لەبەر ئەوە رەخنەی ئەوەیان لی‌نەگیراوە کە لەدوای ئەو رۆژە رەشانە هەریەکە هەڵپەو پەلامار بدا خۆیی‌و خاوو خێزانی ببوژێنێتەوە و سیاسەتی ئینگلیزەکانیش لەوەدا بووە لە لایەکەوە بە هۆی مووچە و خەڵاتەوە سەرۆک عەشیرەتەکان بەلای خۆیانا داشکێنن و لەلایەکی تریشەوە رۆشنبیرو خوێندەواری ئەوسەردەمە والیٚ بکەن کە ببن بە وابەستەی خۆیان و ئەوانەی لە ئینگلیزەکان نزیک بوونەتەوەو پێرەوی بۆ چون و سیاسەتی ئەوانیان کردوە پێش خراون.

بەکورتی حوکمدارو هاوکارەکانی لە بەڕێوە بردنی کاروباری پارەدا دەسەڵاتێکی کەمیان هەبووە و ئەوەی کە بەوان کراوە ئەوەندە نەبووە کە زۆربەی خەڵک رازی بکەن و ئەوەی بەوان رازی بوون و لایەنگریان بوون بریتی بوون لەوانەی کە دڵسۆزی بیرو باوەڕی بوونی حوکمداریەتێکی کوردی بوون و بەو پارەو دەسەڵاتە کەمەی هەیان بووە نەیانتوانیوە چەک و جبەخانەو ئازوقەی تایبەتی خۆیان هەبێت و ئەو چەک و جبەخانەی کەلەژێر دەستی ئەواندا بووە، تەنها بریتی بوە لەو پاشەرۆکی چەک‌و جبەخانانەی کە عوسمانلی لی‌یان بەجی‌مابوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێزێکی لیڤی کوردی لە سلێمانیدا دروست بوەو مێجەر دانلیس مەشقی پی‌کردون و شێخ قادری حەفید سوپا سالار بووە، ئەوە بوو بەو چەکە کۆنانەی کەلە دواییدا پەنایان بۆ بردو شەڕی تاسلوجە و دەربەندی بازیانیان پیٚ کرد بەرگەی چەند سەعاتێکی شەری فرۆکەو تۆپ و زرێلی ئینگلیزی نەگرت کەلە دەربەندی بازیان‌دا توانیان شێخ مەحمودی پیٚ بشکێنن.

# ٤ ـ ئەو رەخنانەی گیراوە و ئەگیرێ لە یەکەم حوکمدارێتی

ئەگەرچی لەکۆتایی بەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا بەشێوەیەکی گشتی باسێکی تایبەتی تەرخان ئەکەین بۆ ئەوستایش و بۆ ئەو رەخنانەی لە شێخ مەحمود و لە هەردوو حوکمداریەتەکەی گیراوەو ئەگیرێ بەناوی شیخ مەحمود لەتای تەرازووی ستایش و رەخنەی نووسەران و شاعیراندا؛ بەلاّم لەگەلْ ئەوەشدا بەپێویستمان زانی لە کۆتایی ئەم بەرگی یەکەمەدا کورتەیەکی ئەو رەخنانەی کەلە شێخ مەحمودو حوکمدارێتی یەکەمی گیراوە باسی بکەین:

نووسەرانی سەردەمی حوکمدارێتی شێخ مەحمودو دوای ئەوەش هەریەکە بە جۆرێک رەخنەیان لە حوکمداریتی‌یەکەی شێخ مەحمود گرتووەو هەریەکەیان بە جۆرێک لیێ دواون و نووسەرانی بێگانە بەتایبەتی ئەوانەی ئینگلیزو سەر بەوان بوون زۆریان بۆ مەبەستو نیازێکی پاک رەخنەیان لە شێخ مەحمودو حوکمدارێتی‌یەکەی نەگرتووە بەلْکو تەنها بۆ ناو زڕاندنی شێخ مەحمودو کورد بووەو بەنیازی پاکانە کردن بووە بۆ ئینگلیز بۆ ئەوەی ڕوونی‌بکەنەوە کە ئینگلیز مەبەستی پاک بووە بەلاّم کورد خۆی لەباریا نەبووەو شێخ مەحمود ئەوسەرکردەیە نەبووە کە ئەو ئەرکە قورسەی پیێ‌هەلْسورێت، کەچی دەرکەوت لەپاش لابردنی دەزگاکانی شێخ مەحمود و دانانی ژمارەیەکی زۆر لەو ئەفسەرانەی کە بەناوی حاکمی سیاسی‌یەوە لە ناوچەکانی خوارووی کوردستاندا ئینگلیزەکان بلاْویان کردبووەوە کاروبارو رەفتارو هەلْەی ئەوان زۆر لەکاروبارو رەفتارو هەلْەی فەرمانبەرانی حوکمدارێتی شێخ مەحمود نزمتر و نەوی تر بووەو ئەو رەفتارو کردەوەیان بۆتە هۆی ئەوەی کەلە دوای نەهێشتنی حوکمدارێتی شێخ مەحمود لە هەموو کوردستاندا پشێوی و ئالْۆزی بلاْوبێتەوەو کارگەیشتە رادەیەک جلْەویان لە دەست دەرچوو ناچاربوون جارێکی‌تر شێخ مەحمود لە هیندستانەوە بهێننەوە بەئومێدی ئەوەی بەهۆی ئەوە بتوانن دەست بەسەر

هەڵوێستدا بگرن.
ئەو نووسەرانەی خۆمان کەلە کتێبو یاداشتەکانیانا رەخنەیان لە شێخ مەحمودو حوکمدارێتی‌یەکەی گرتبوو وورده وورده بۆیان دەرکەوت کەلە رەخنەگرتنەکەیانا لە هەندێکیا هەتا رادەیەک بەهەڵەداچوو بوون و دەرکەوت ئەو هەموو نارێکی‌و ئاڵۆزی‌و هەڵانەی کەلەسەردەمی حوکمدارێتی شێخ مەحمود روویدا هەمووی بەهۆی شێخ مەحمودەوە نەبووە بەڵکو خەڵکێکی زۆر بەشداری‌یان تیاداکردوە هەر لەدەورووپشتەکەی شێخ مەحمودەوە هەتا سەرکردەی عەشایرەکان‌ورۆشنبیرو خوێندەوارەکان جگەلەزروفی مەوزوعی و زاتی کەلەو رۆژانەدا بەهیچ جۆرێک لەگەڵ کوردو شێخ مەحمود دا نەبووە (وەکو چۆن ئیمرۆش هەر بەو جۆرەیەو نەگۆڕاوە).
بۆ هەموو کەسێک روونە کەئینگلیزەکان بەنیازو مەبەستێکی پاک نەهاتبونە کوردستان‌و ئینگلیزەکان هەرلەسەرەتاوە شێخ مەحمودیان وەکو کرێ‌گرتەیەک پێویست بوە کە وەکو (راجا)یەتی هیندی ئەوسەردەمە دەستێ بەسنگەوە بگرێ‌و بەدەستەکەی تریشی چەکی نۆکەری هەڵبگرێ‌و دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێ هەتا ئەوسەردەمەی کە مەبەستەکەیان سەرئەگرێ...
ئەورۆژانە باری ئابوری وڵاتی بەریتانیا کە شەڕ کۆتایی هاتبوو زۆر شلۆق بوو لەناو پارلەمان و رۆژنامەکانی لەندەن‌دا بەتوندو تیژی داوا لە حکومەتی بەریتانیا کراوە کە پارە خەرج‌کردنیان لە ناوچە داگیرکراوەکاندا کەم‌بکرێتەوەو هێزەکان بکشێتەوە دوای ئەو هەموو ماندوو بوون و کوشتارەی لەکۆڕی جەنگەکاندا لی‌یان کرابوو (کۆنگرەی قاهیرە کەلەبەرگی دوهەمدا باسی ئەکەین بۆچارەسەری ئەوکێشەیە بووە).
ئینگلیزەکان بە دامەزراندنی حوکمدارێتی کوردستان و بزواندنی هەستی نەتەوایەتی کورد بۆ مەبەستێکی کاتی وایان لە کوردی تینوو بە ئازادی‌و سەربەخۆیی کرد کە هێمن بێتەوەو بەوە ئینگلیزەکان پێویستیان بەوە نەما کەبە شەڕو کوشتار بچنە ناو جەرگەی خوارووی کوردستانەوە وەکو نەخشەیان بۆ کێشابوو، بەوە پارەیەکی زۆریان بۆگەرایەوەو لەخوێن رشتنێکی زۆر رزگاریان بوو (هەرچەند نرخی داگیرکردنەوەی کوردستان لە شەری دەربەندی بازیاندا زۆر

کەوت لەسەریان و خۆیان لە راپۆرت و کتێبەکانیانا دانیان بەوەدا ناوە)
ئینگلیزەکان بەبێ خوێن رشتن و بەبێ تەقەی گوللەیەک چوونە کوردستانەوەو
ویستیان خوارووی کوردستان بکەن بە بنکەیەک و کورد بکەن بە هێزێک بۆ
ڕوو بە ڕوو بونەوەی تورک کە هەتا ئەوکاتە هێشتا دڵنیا نەبوون لەوەی تورک
بە ئاسانی دەست بەرداری ویلایەتی موسڵ ئەبێت و ئاگاداری ئەوەش بوون کە
موسڵیان لە دوای مۆرکردنی پەیمانی {مودراس} داگیرکردبوو کەبەبێ ئەو پەیمانە
نەدەبوایە لەرۆژی شەڕوەستاندنا هێزەکانیان بەرەو پێشەوە بڕوات.
هەڵەی شێخ مەحمودو هاوکارەکانی لەوسەردەمەدا لەوەدا بووە کە ساتێک
ئینگلیزەکانی داواکرد بێن بۆ کوردستان ئەبوایە پەلەی نەکردایە و هەوڵی بدایە
ئەو مافانەی کە بۆ کوردی ئەخواست، وای لە بەریتانیا بکردایە پێشەکی وەکو
بەیانێکی رەسمی دانی پیادا بنایەو ئەو دان پیانانە لە شێوەی پەیمانێکی
دەوڵەتیدا بوایە (هەرچەند دووریش نەبوو ئەگەر شێخ مەحمود داوای لە
ئینگلیزەکان نەکردایە بچنە کوردستانەوە، ئەوان هەر ئەچوون و ئەو نەخشەیەی
کە دایان نابوو ئەیان خستە کار وەکو لە باسی هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان،
لیٚی دواین.
لە باسێکی پێشوودا ئەو رەخنەیەی حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ
مەحمودمان خستە بەرچاوو کەبە شێخ مەحمودی وتبوو حوکمدارێتی قبوڵ مەکە
چونکە ووشەی حوکمدار مانایەکی ئاشکرای نیەو ئاڵۆزەو داوای دەست نیشان
کردن و روونکردنەوەی بکە ئەوسا قبوڵی بکە( ئەگەرچی وەکو شێخ رووفی شێخ
مەحمود لە یاداشتەکانیا باسی کردوە ووشەی حوکمدار، ئەوسا لای خەڵک وەکو
مەلیک لێک ئەدرایەوە، شێخ مەحمود دانی بەو هەڵەیەی خۆیدانابو کەبە
گرینهاوسی ووت:
خەتای خۆمان بوو کەبە خۆرایی ئێوەمان هێنایە کوردستان..لەگەڵ ئەوەشدا
وادیار بوو ئەو رۆژانە شێخ مەحمود و هاوکارەکانی کەباری ژیانی خەڵکی
برسی‌و رەش‌و رووتی ناوچەکەیان لەبەر چاوو بوو، نەیانویستوە لەو رۆژە
ناسکەدا کە خەڵک پێویستی بە ئاسایش و بەنان و بەرگ هەبووە هەر
لەسەرەتاوە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکەونە کێشە و بەرەو لەسەر ووشەی

حوکمداری ئیشەکە لە خۆیان ئالۆز بکەن کەلەراستیدا ئەوە هەڵەیەکی مێژوویی گەورە بووەو ئینگلیزەکان لە دواییدا بە ئارەزووی خۆیان حوکمدارێتی‌یەکەی شێخ مەحمودیان لێک دایەوەو وایان لە خەڵک گەیاند کە شێخ مەحمود نوێنەری هەڵبژێرراوی میللەتەکەی نەبووە بەڵکو نوێنەری حکومەتی بەریتانیا بوەو ئەو دەزگا حوکمدارێتی‌یەش کە دانرا بوو شتێکی کاتی بوەو بۆیان هەیە بەگوێرەی پێویست بیگۆرن یا نەیهێڵن ( وەکو مس‌بیل لە کتێبەکەیدا باسی کردوە ) .

زۆر کەس سەرزەنش و رەخنەیان لە شێخ مەحمود گرتووە کە هەرچی خزمەکانی خۆی هەبووە دایمەزراندوون و زۆر کەسی‌تری کارامەو لێ‌وەشاو هەبووە کە ئەتوانرا سودیان لێ‌وەربگیرێت ئەوانە پشت گوێ خرابوون راستە شێخ مەحمود لەوەدا بەهەڵەدا چووبوو، ئەبوایە ئەو راستیەی بخستایەتە بەرچاوو بۆ نمونە لە شوێنێکی وەکو رانیەو کۆیەدا کە ویستبوی قایمقامیان بۆ دابنێت لەجیاتی ئەوەی خزمەکانی خۆی بنێرێت وەکو شێخ ئەمینی سندۆلانی دانابوو بۆ رانیە، ئەیتوانی لە خەڵکی ئەو دوو ناوچەیە لیژنەی دابنایە و بەپێی هەڵبژاردنێکی ناوخۆیان یەکێک هەڵبژێرایە کەبەوە تەقەلای ئینگلیزەکانی پوچەڵ ئەکردەوە کە خەڵکی ئەو دوو ناوچەیان لێ‌هان‌بدا .

شێخ مەحمود لەو رۆژانەدا تیادا مابوو، تەجروبەیەکی سیاسی‌و ئیداری وای نەبووە کەلەو دووریانە دەربازی بکا کە تیایا سەرسام وەستابوو لە لایەکە ئەیزانی زۆر رۆشنبیرو کارامە هەیە کە ئەبێ کاروباریان بداتێ لەولاشەوە خزم و مەلاو شیخە رووتەڵێکی زۆری لێ‌کۆبوبوەوە کە زۆریان بۆ مەرامی خۆیان شێخ مەحمودیان بەهەڵەدا بردوەو وایان کردووە گەلێک شەرەشەقی بۆ دروست بکەن کە ژمارەیەک لە رۆشنبیرو خوێندەواری ئەوسەردەمە بەهۆی ئەوەوە لە خۆی دوور بخاتەوە .

رەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی لە یاداشتەکانیا باسی ئەو خەنجەر لە پشتێن و جامانە لارو تفەنگ لەشانانەی ئەو رۆژانەیان کردووە کە بوون بەهۆی دیوارێک لە نێوانی شێخ مەحمودو رۆشنبیرو خوێندەوارو ئەفسەرە کوردەکان لەوانەی کەلە ئەستەمبوڵەوە هاتبونەوە کوردستان و هەندێکیان ئامادەبوون خزمەتی گەل وولاتەکەیان بکەن جگەلە بوونی کۆسپێکی تر کەلە کۆنەوە هەبوەو بریتی بوە

له بوونی گری‌یه‌کی نه‌فسی لای شێخ مه‌حمود به هۆی ئه‌و ڕقه‌ی که هه‌ندێک له‌وانه‌ی هه‌لگرتبوو که کاتی خۆیدا بوبون به ئه‌ندامی لقی اتحادو تره‌قی چ له سلێمانی و چ له موسلْ که‌بوبون به هۆی ئاواره بوونی شێخان له سلێمانی و ڕوودانی کاره‌ساته‌که‌ی موصلْ که شێخ سه‌عیدی حه‌فیدو چه‌ند که‌سێکی تیادا کوژرا.

ئه‌وڕۆژانه‌ی حوکمدارێتی شێخ مه‌حمود دامه‌زرێنرا، ئه‌گه‌رچی خلْته‌ی ڕه‌وشت و سروشتی خێلایه‌تی و فیودالْی ڕانه‌مالرابوو له‌ناو مێشکی زۆر که‌سدا به‌هێز بوو، به‌لام به‌شێوه‌یه‌کی گشتی هه‌ستی زۆربه‌ی خه‌لْک له‌و ڕۆژانه‌دا به‌رامبه‌ر به شێخ مه‌حمود و حوکمداریه‌ته‌که‌ی هه‌ستێکی نیشتمانی بوه‌و له‌گه‌لْ ئه‌وه‌شدا هیچ پارت و کۆمه‌لْ و جۆره ڕێکخراوێکی سیاسی نه‌بووه، به‌لام وه‌کو ئه‌و یاداشته‌ی ڕه‌فیق حلمی و ئه‌حمه‌د خواجه باسی هه‌ستی خه‌لْکی ئه‌و ڕۆژانه‌و لایه‌نگری خه‌لْکی ئه‌وڕۆژانه به‌رامبه‌ر تازه کۆرپه‌ی هیوای میلله‌تی کوردیان کردوه، گومان له‌وه‌دا نیه که زۆربه‌ی خه‌لْک ناکۆکیو نارێکیه کۆنه‌کانیان خستبوه لاوه‌و ئاواتی کوردستانێکی سه‌ربه‌خۆو میلله‌تێکی شادمان و به‌خته‌وه‌ر ناو دلْی هه‌موانی داگیر کردبوو، ئازایه‌تی و له‌خۆ بووردنی شێخ مه‌حمودیش چوو بوه پالْی ئه‌و هه‌سته پاکه‌ی ئه‌و ڕۆژه که به‌داخه‌وه زۆری نه‌خایاند و زۆری پێ‌نه‌چوو ئه‌و فریشته‌یه‌ی که وه‌کو کۆتری ئاشتی به ده‌نوکه‌کانی چلْی زه‌یتونی هێنابوو بۆ کوردستان زۆری پێ‌نه‌چوو بوو به کونده به‌بووی شووم و گورگی دڕنده‌ی سه‌رمایه‌داری ئینگلیز که‌لْبه‌و دانه تیژه‌کانی له گیانی میلله‌تی بێکه‌سی کورد گیرکرد.

ناپاکی مه‌به‌ستی ئینگلیز به‌رامبه‌ر به‌کورد و کوردستان له به‌راوردکردنی دوو هه‌لْوێستی جیاوازدا ده‌رئه‌که‌ون..هه‌لوێستیان به‌رامبه‌ر به عه‌ره‌بی عێراق و هه‌لْوێستیان به‌رامبه‌ر به کوردی خوارووی کوردستان:

هه‌لْوێستی یه‌که‌م که پڕبوو له‌لایه‌نگری و دامه‌زراندن و پته‌وکردنی ده‌زگایه‌کی عه‌ره‌بی له میسیۆپۆتامیاو به کێش کردنی فیصل و گۆش‌کردن و په‌روه‌رده‌کردنی وه‌کو جگه‌رگۆشه‌یه‌کی خۆشه‌ویست و لایه‌نگری کردنی له هه‌موو ڕوویه‌که‌وه‌و به‌ره‌نگار بوونی ئه‌وانه‌ی که به هێنانی فیصل قایل نه‌بوون و

هەرلەسەرەتاوە بەدەسەڵاتدارێتی ئینگلیز قایل نەبوون وەکو ئەو راپەرین و شۆرشەی لەلایەن عەشایرەکانی فوراتی ناوەراستەوە کرا لە ساڵی ۱۹۲۰دا دژی ئینگلیزو تەقەللای بیٚوچانی ئینگلیز بۆ مل کەچکردنی تورکەکان بۆ ئەوەی دەست بەرداری ویلایەتی موسڵ ببن و گەلێک تەقەللای سیاسی تر کە مەبەست لەهەمووی چەسپاندنی ئەو حکومەتە بووە کە خۆیان مەبەستیان بووە لە بەغدا دایڕێژن و پارێزگاری لیٚ بکەن، بە پێچەوانەی هەڵوێستی دووهەم کە بەرامبەر بە کورد هەیان بوەو بەرامبەر بەو رەفتارانەی بەرامبەر بە شێخ مەحمودی حوکمدار و کاربەدەستانی دەوروپشتی نواندویانە...

ئینگلیز لەعێراقدا بەرتیلی ئەدا بەعەشایرەکان کەلایەنگری فیصل بن و ئەوی بە فەیسەڵ رازی نەبوایە گەڕو گولی ئەکرد، بەلاٚم لە کوردستاندا عەشایری هان ئەدا کە لەگەڵ شێخ مەحمود دا نەبن و لایەنگری ئەوە نەبن کە شێخ مەحمود ئالاٚی سەربەخۆیی کوردستان هەڵبگریٚ و هەربەوە قایل بیٚ کە وەکو ئیدارەیەکی ناوچەیی سەربە ئینگلیز بمێنێتەوە کە کورد لەو رۆژانەدا بەوەش رازی بوە بەمەرجێک هەر پاشەرۆژی ئاشکرا بیٚو لەوە دڵنیا بێت کە ئینگلیز نایەوێت بە زۆرە ملی کوردو کوردستان بلکێنێت بە میسۆپۆتامیاوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندیٚ جار کاربەدەستانی ئینگلیز بەڵێنی ئەوەیان دابوو بەکورد کە رێگەنادەن کورد بخرێتە ژێر دەسەلاٚتی بێگانەوە بەلاٚم دەرکەوت لە هەموویانا بەدرۆزن دەرچوون.

ئەگەر ئینگلیزەکان هەرلەسەرەتاوە نیازیان پاک‌بوایە بروانا‌کەم نە شێخ مەحمود و نە کورد بەرەنگاری ئینگلیز ببونایەتەوە، یەکێکی وەکو مێجەرنۆئیل کە هەتا رادەیەک نەی ویستبوو ویژدانی خۆی بپلیشێنێتەوە لەو راپۆرتەی کەلە باسی مێجەرسۆندا بلاٚومان کردەوە دانی‌پیادا ئەنێت کە کورد لەسەرەتای چوونی ئینگلیز بۆ کوردستان زۆر بە رێک و پێکی کاروباری ناوخۆی بردوە بەرێوەو هیچ جۆرە پشێوی و ئاڵۆزی و نارێکییەک رووی نەداو دانی پیادا ناوە ئەگەر هەڵەیەکیش بوو بێت ئەو هەلاٚنە لەوانە نەبوون کە راست نەکرێنەوە، بەلاٚم کە کورد هەستی بەوەکرد ئینگلیز سیاسەتی خۆی گۆریوەو پاشگەز بونەوەو بۆ بەجیٚ هێنانی ئەومەبەستەی نۆئێلی لابردوەو مێجەرسۆنی هێناوەو ئیتر کورد

هیواو ئاواتی هەروەکو ئەم ڕەویوەتەوەو چاری نەبوە دەست بداتە چەک بۆ داواکردنی مافی خۆی.

هەندێ کەس ڕەخنەیان لە شێخ مەحمود گرتووە لەوەی کە دەستەیەک شارەزای بۆ خۆی دانەناوە (هەیئەتی ئیستیشاری) بۆ ڕاوێژکردن دەربارەی کاروبارە گرنگەکان کە وەکو جەلال تاڵەبانی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە.«١٧»

لەڕاستیدا شێخ مەحمود ئەو تاقمەی هەبووە کە سەرنجیان وەربگرێ لە کاروباری گرنگدا هەروەکو شێخ ڕەووف لە یاداشتەکانیا باسی کردوەو هەندێک لەو موستەشارانەی شێخ مەحمود هەتا دوا دڵۆپی خوێنیان لە شێخ مەحمود جیانەبونەوە هەروەکو حاجی سید حسنی مامی کە ڕاوێژکەرێکی دڵسۆزی بوەو لە شوێنی خۆشیدا ڕەخنەی توندی لە شێخ مەحمودی برازای گرتوە، هەروەها هەروەکو حەمە ڕەشیدی جوامێری هەمەوەند و تاهیری حەمەئەمین ئەفەندی فەرخە کە هەردوکیان لە شەری تاسلوجەو دەربەند دا شەهید بوون و هەروەکو عزەت مەدفەعی کە ئەفسەرێکی ناسراو بووە و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ شێخ مەحمود مایەوە هەتا ئەوکاتەی کە هەستی کرد ئیتر ئینگلیز لە سیاسەتیان دا گێریان گۆریوە بەرامبەر بە کوردو حسابی مانەوەی شێخ مەحمود لای ئەوان تەواو بووە، وە وابزانم شێخ مەحمودیش ڕێگەی لەکەسی تری شارەزاتر لەوانە نەگرتووە کە ببن بە موستەشاری ئەگەر ئینگلیز چەواشەی نەکردایە.

جارێک تۆفیق وەهبی باسی ئەو سەردەمەی شێخ مەحمودی بۆ کردم و ووتی: ڕاستە شێخ مەحمود تەجروبەی سیاسیو ئیداری نەبووە و تەنها لە کاروباری عەشایریدا شارەزا بووە، بەڵام هەمیشە هەوڵی داوە کە پرس و ڕاوێژ بە هەرکەسێک بکات کە بزنی ئەوەی لیێهاتووە دڵسۆز بووبێ بۆ کورد و مانەوەی حوکمدارێتی لە کوردستان و خۆم یەکێک بووم لەوانەی لایەنگری بووم و لە ڕێکخستنی کاروباری حوکمداریەتەکەیدا < حوکمدارێتی دووهەم > بەشداریم کردوە، بەڵام زۆری پێنەچوو زۆری وەکو من بۆمان دەرکەوت کە ئەو دەزگای حوکمداریەتە ئینگلیزەکان بۆ مەبەستێکی کاتی دروستیان کردبوو وەبۆ ئەوە پێکیان نەهێنابوو کە بیکەن بە بنکەیەکی بەهێزو پتەو بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە خوارووی کوردستانداو چەند نمونەیەکیتری جگەلە خۆیو

عزەت مەدفەعی و صالح زەکی ساحێبقرانی هێنایەوە وەکو حاجی مستەفا پاشا یامولکی کە لەگەلْ ئەوەشدا شێخ مەحمود لە حوکمدارێتی دووهەمیا کاروباری وەزارەتی مەعارفی پێ سپارد بەلاْم ئەویش زۆری پێ نەچوو هیوای بە ئینگلیزو سیاسەتەکەیان نەما بۆیە دەست بەرداری شێخ مەحمود بوو هەروەها ئەمین زەکی بەگ مێژوو ناسی کورد، هەرچەند درەنگ هاتەوە بۆ کوردستان، بەلاْم هەرلەسەرەتاوە لە مەبەستی ئینگلیز گەیشتبوو بۆیە بە هیچ جۆرێک بەشداری نەکرد لە کاروباری کوردستاندا چ لە زەمانی هەردوو حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود داو چ لە زەمانی مێجەرسۆن دا کە کاروباری ولاْتی یەکسەر ئەبرد بەرێوە، بەلْکو ئەمین زەکی یەکێک بوو وەکو یاسین هاشمی و جەمیل مەدفەعی و نوری سەعیدو گەلێکی تر کە دلْنیا بوون لە لایەنگری کردنی ئینگلیز بۆ عێراق لەبەر ئەوە هەرلە سەرەتاوە چوە ریزی کاربەدەستانی عێراقەوە، ئەمە جگەلەوەی کە کوردێکی ئێجگار زۆر و زیرەک و لێهاتووی لەوانە کارامەتر کەلە فیصل کۆبوبونەوە ئەوسا لە ئەستەمبولْ هەبوو کە ئەگەر ئینگلیز مەبەستی بوایە دوو ئەوەندەی ئەوانەی لای فەیسەلْ موستەشاری بۆ شێخ مەحمود پەیدا ئەکرد.

جگەلە رەخنەی سیاسی و ئیداری کەلە شێخ مەحمود گیراوە ، هەندێکیتر رەخنەیەکی راستیان لە شێخ مەحمود گرتووە لە تاکتیکی ئەوشەرەی کەلە تاسلوجەو دەربەندی بازیاندا کردبووی کە پێرەوی شەری عەشایری کردبوو، یەکێکی وەکو ئەحمەد تەقی رەخنەی لە شێخ مەحمود لەو روەوە ئەوەبوە کە نەدەبوو هێزەکانی لە دەربەندی بازیاندا کۆبکاتەوەو خۆی لە دەربەند حەشار بدا و چاوەروانی هاتنی دوژمن بکات کە دوژمن توانی لەو شوێنە تەسکەدا ئابلوقەی بداو بەسەریا زالْ بێت بەلْکو باشتر وابو هێزەکەی بکردایە بە چەند بەشێکەوەو لەچەند لایەکەوە پەلاماری هێزی ئینگلیزی بدایە کە بەوە ئەیتوانی والەو شەرە بکا کەلە زۆر لاوە بتەنێتەوە و عەشایرەکانی تری کوردیش ماوەی ئەوەیان ئەبوو هەریەکە لە کات و شوێنی خۆیدا بەشداری بکەن و ئەوەی ئەو بۆچوونەی ئەحمەد تەقی زۆرتر روون ئەکاتەوە یاداشتەکانی رەفیق حلمی‌یەکە ئەلْێ بێزاری کورد لە ناوچەکانی رواندوز و کۆیە و رانیە بەرامبەر بە ئینگلیز لەو رۆژەدا

گەیشتبوە ئەوپەڕی و هەموو چاوەڕوانی ئەوەیان ئەکرد شۆرش بتەنێتەوە بۆ ئەو بەرزیێ کۆیە بۆ ئەوەی هەموو بچنە پاڵ شۆرش. بەلاّم راپەرینەکەی شێخ مەحمود زۆر پەلەی تیا کراو ئەبوو بایەخێکی زۆر بدرایە بە پێوەندی کردن بە ناوچەکانی ترەوە و هەربەوەی مەحمود خان و ئەو چەند چەکدارانەی کە چونە پاڵی، شەر دەستی پیێ نەکردایەو نەخشەیەکی تەواوی بکێشایە ئەوسا دەستی پیێ بکردایە. کاک مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا «۲۳» باسی ئەوەی کردووە ئەڵیێ وەختێک چەکدارەکانی بارزانی گەیشتنە نزیک سلێمانی بۆ بەشداری کردن لەو شۆرشەی کە شێخ مەحمود دژی ئینگلیز کردبووی ئەوکاتە شێخ مەحمود لە دەربەند بەدیل گیرابوو هەموو شتێک تەواو بوبوو.

ئەوی ئەم راستیە زۆرتر روون ئەکاتەوە کە شێخ مەحمود پەلەی کردبوو لە روو بەرووبونەوەیدا، بەتەواوی لە هەڵوێستی ئەورۆژانەی ئینگلیز داو لەو ترسەی کە لیێان نیشتبو دەرئەکەویێ کە بە ئاشکرا لە راپۆرتی سالاّنەی ساڵی ۱۹۱۹دا لەناو دوکیومێنتی ژمارە«FO.371-5069» ئەڵیێ:

ئەوی جیێی مەترسی بوو لەو رۆژانەدا بریتی بوو لە تاقِمی پشدەری و بلباسی ناوچەی رانیە کە دژی حکومەت بوون و شکانی هێزی بەریتانیا لە تاسلوجە بوو بەهۆی ئەوەی بە ئاشکرا ئەوانە دوژمنیایەتی خۆیان دەربڕن بەرامبەر بە ئێمەو لە ئەنجامی ئەوەدا هەڵوێستی خۆشناو و هەندیێ عەشایری تر بەرامبەر بە ئێمە کەوتە گومانەوەو ئەگەر ئەوانە بچوونایەتە پاڵ شێخ مەحمود ئەوا بارەکەمان دەئاڵۆزکا، لەبەر ئەوە ناردنی هێزێکی سوپایی پێویست بوو بۆ چاوترساندنی ئەوانەی نیازی ئەوەیان هەبوو لێمان هەڵگەڕێنەوە...بەلاّم پێویستی بە ناردنی ئەو هێزە نەبوو چونکە بەهۆی ئازایەتی و لیێهاتووی کاپتن «Barken» کە ئەفسەری سیاسی بوو لە رانیە توانرا دەست بەسەر ناوچەکەدا بگیرێت و بە هۆی حەماغای کۆیە «حاکمی کۆیە» و جەمیل ئاغای حەویزی«معاونی حاکمی کۆیە» ومەلا محەمەدەوە (نیازی لە مەلای گەورە بووە کە کرابوو بە قازی کۆیە) توانرا دەست بەسەر ناوچەکەدا بگیرێت و وایان لیێبکەن دان بەخۆیانا بگرن و ماوەی ئاژاوە نەدراو ئاسایش بەرپابوو). لە هەمان دوکیومێنتدا ئەڵیێ:(هەروەها توانرا لە کۆیە هێزێک پێک بێت و مەشقی پیێ بکریێ لەلایەن مێجەر(Hills)

«وەو ئەو هێزەکران بە جەندرمەو دوو ئەفسەری گەنجی کۆیە «ناویان نەهاتۆە لە دوکیومێنتەکەدا» کەلای شەریفی مەکە ملازم بوون گەراونەتەوەو ئەوانیش سوودیان لێ وەرگیرا و توانرا هێزێکی پیادەو سوارە پێک بێت و بۆ ناوچەی تەق‌تەق و شەقلاوە و لە کاتی مارانیش توانرا هێزێک پێک بهێنرێت و ئاسایش بەرپابکرێ، هەروەها توانرا تەلگراف بە حەماغای کۆیەو جەمیل ئاغای حەوێزی و مەلای گەورە لێ‌بدرێ کە پشتگیری حکومەت ئەکەن و لایەنگری شێخ مەحمود نین».

ئەوەبوو لەباسی یاداشتەکانی رەفیق حلمی دا باسی ئەوەشمان کرد کە چۆن <بیل>لە رواندز توانی بە گونیە پارە برێژێ و سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی رواندز دەست پێوەبنێت کە روو بکەنە کوێستان و بیر لەوە نەکەنەوە کە بەشداری بکەن لە شۆرشەکەی شێخ مەحمود دا کە ئەمەش نیشانەی ترسی ئینگلیزەکان بووە لەورۆژانەدا کە نەوەکو ئەوانەش بەشداری شۆرشەکەی شێخ مەحمود بکەن .

جارێک توفیق وەهبی باسی ئەوشەرەی دەربەندی کرد ، ووتی ئەگەر شێخ لەو شەرەدا نەچوایەتە دەربەند و لەوێ خۆی حەشار نەدایە و شەری چەتەگەری بکردایە هەروا بە ئاسانی ئەوشەرەی نەدەدۆراندو دوور نەبوو ئەو شۆرشەی لە هەموو خوارووی کوردستاندا بتەنیایەتەوە ، بۆیە ئینگلیزەکانیش پەلەیان کردو ئەو هێزە زۆرەیان بەسرکردایەتی جەنەرال فرایزەر نارد بۆ لەناو بردنی شۆرشەکەی» . سەیر ئەوەیە کلۆدیس ریچ «٤٨» لە کتێبەکەیدا لە لاپەرە (٥٨-٥٩) باسی دەربەندی بازیانی کردووە کە بەوێ‌دا چووە بۆ سلێمانی وباسی شەرێکی دۆراوی تری وا ئەکا لە نێوانی تورک و بابانەکاندا. ئەو رۆژانە عبدالرحمن پاشای بابان دەسەلاتی بەسەر دەربەند دا هەبووە و سێ چوار تۆپی لە بەرزاییەکانی دەربەند دا دامەزراندووە، لەورۆژانەدا کە مەحمود بەگی کوری خالید پاشا لەگەلێ میری باباندا تێک‌چووبوو ، سلێمان پاشای ناردبوو بۆلای والی تورک لە بەغدا کە لەشکرێک بێنێت و سلێمانی داگیر بکا، ئەوهێزە تورکەی کە هات ئەو کوردانەی کە لەگەڵیا بوون لە رێگەیەکی نهێنیەوە تورکەکانیان بەسەر بەرزاییەکانی دەربەند دا سەرخست و دەستیان گرت بەسەر

تۆپەکانی عبدالرحمن پاشاو ئاراستەی خۆی کراو پاشا ناچار بوو پاشە کشەی کرد و ئەو دیوارەی کەلەناو گەرووی دەربەندەکەدا دەرگایەکی تیادا بوو داگیر کراو لەشکر پەریەوە ئەم دیوو چوونە سلێمانی... کەواتە ئەوە جاری یەکەم نەبووە کە موشیری حمەی سلێمانی هەمەوەندی خیانەتی لە کورد کردوە بەڵکو لە زەمانی باپانەکانیشدا هەمان بەزم روویداوە و موشیری حەمەی سلێمانی تریش هەبوە.

دەربارەی گردکردنەوەی ئەو ئینگلیزانەی لە سلێمانیدا گیرابوون شێخ رووف لە یاداشتەکانیا ئەڵێ:

«کە ئینگلیزەکان دەربەندی بازیانیان گرت و روویان کردە سلێمانی، حاجی سەید عومەری مامی باوکم کە متصرفی سلێمانی بوو لەگەڵ ئەحمەد بەگی ساحێبقرانی سەرۆکی شارەوانی سلێمانی هەردوکیان بریاریان دابوو ئەو ئینگلیزە گیراوانە لە سلێمانی بگوێزنەوە بۆ شارباژێر، بەلاّم باش بوو ئەو کارە نەکرا چونکە کە ساتێک ئینگلیزەکان هێزەکانیان گەیشتە سلێمانی ئەگەر ئەو گیراوانەیان لەوێ نەدیایە وایان حساب ئەکرد کە هەموو کوژراون لە تۆڵەی ئەوەدا دەستیان ئەکرد بە کوشتاری خەڵکی ناو شار».

بەلاّم وابزانم بۆچونەکەی حاجی سید عومەرو حەمدی ساحێبقران راستر بوە لەوەی کە شێخ رەووف بۆی چوو بوو چونکە ئەگەر ئەوانە بگوێزرایانەوە بۆ شوێنێکی نهێنی لە شارباژێر «کە ئەتوانرا جێگۆرکێشیان پێ بکری)و نامەیان لە ئینگلیزانەوە وەربگرتایە کەماون و نەکوژراون و جگەلەوە سیخورو سەگ و گوگی خۆشیان زۆر بووە کە دڵنیایان بکا کە ئەو ئینگلیزانە گوێزراونەتەوەو نەکوژراون و وەکو بارمتەیەک هێڵراونەتەوە، لام وابوو زۆرشت ئەگۆڕاو دوور نەبوو ئەو رەفتارەی ئینگلیزەکان لە سلێمانیدا کردیان زۆری رووی نەدایەو دووریش نەبوو هەڵوێستی ئینگلیزەکان خۆشیان بەرامبەر بە شێخ مەحمود بگۆررایە...

لە دنیای سیاسەتی ئیمرۆدا هەرچەند هێشتا ئێمە خامین و فێری ئەوە نەبووین و لیێ نازانین، بەلاّم ئاگاداری ئەوەین چۆن گرتنی چەند کەسێکی رۆژئاوایی وەک بارمتە بۆتە هۆی شڵەقاندنی ناوچەیەک و بەردانی گیراوی وەکو بارمتەی

ئیمرۆ لە زۆر کاروباری سیاسی دا بازرگانی و سیاسەتی پێوە ئەکرێ و هەندێک جار بەقەد راپەرین و شۆرشێک دەوری خۆی ئەبینێت .

پاش ئەو رەخنانەی لە شێخ مەحمود و حوکمداریەتەکەی گیرا، ئینجا مامۆستا رەفیق حلمی لە یاداشتەکانیا رووی دەمی رەخنەی ئەکاتە ئەو کوردانەی کەلە کۆمەڵ و رێکخراوەکانی ئەستەمبول دا بەشدار بوون و هەندێکیان خەڵکی سلێمانی بوون ئەوەیان بەبیر دا نەهاتووە کە نوێنەری خۆیان بنێرنە لای شێخ مەحمود بۆ پێوەندی کردن و راوێژکردن و رێکخستنی کاروباری حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود (ئەگەرچی گومان لەوەدا نیە کە ئینگلیزەکان لەو رۆژانەدا بە هیچ جۆرێک رێگەی ئەوەیان نەئەدا مەگەر سەربەخۆیان بوونایە، بەلاّم کە شۆرشەکەی شێخ مەحمو بەرپابوو ئەبوایە ئەوسا بیر لەوە بکرایەتەوە و شێخ مەحمود بە شێنەیی پێوەندی بەوانەوە بکردایە بەرلەوەی شۆرشەکەی دەستپێبکا) .

شێخ قادری شەمزینی کە سەرۆکی کۆمەڵێکی بەهێزو بە توانای ئەو رۆژەی کورد بوو لە ئەستەمبوڵ هەمووهاوکاریو خۆیو کۆمەڵەکەی بۆ شێخ مەحمود بریتی بوو لەو نامەیەی کە بە ئەحمەد تەقی‌دا ناردبووی بۆ شێخ مەحمود و وتبوی ئەگەرچی ئەزانم ئینگلیزەکان درۆی لەگەڵ ئەکەن‌و وەکو درۆش لەگەڵ ئێمەدا ئەکەن، بەلاّم باخۆی بگرێ هەتا بزانین کۆنگرەی ئاشتی چ بریارێک ئەدا دەربارەی کورد .

چی لەو هەل و دەرفەتەی ئەو رۆژانە بەنرختر بوو ئەگەر ئەو کۆمەڵەی کەبە سەدان .کوردی شارەزا هەر لە جەنەرال و ئەمیرال و یۆزباشی و هەموو جۆرەکانی‌تری سەربازی لەناویاندا هەبووە کە ئەتوانرا نەک هەر حوکمداریەتەکەی شێخ مەحمود بیەن بەرێوە بەڵکو ئەتوانرا ئەوحوکمداریەتەی شێخ مەحمود بکەن بە بنکەیەک بۆ رزگار کردنی هەموو بەشەکانی کوردستان... کەبەداخەوە هەرلایەک بەجیا بۆ خۆی تەقەلای داوەو سمایل خانی سمکۆ جارێک بەگژ ئێراندا چوەو جارێک بەگژ تورکیادا، شێخ قادری شەمزینی و بەدرخانیەکان و شۆرشگێرەکانی‌تر لە کوردستانی تورکیادا لەسەرەتادا تورکەکان و مستەفا کەمال مێشکی بەوە بەنج کردن کە دوای دوژمن دەرکردن

ئۆتۆنۆمی ئەدرێ بە کوردستان و هەرکە هەموو شتێکی بۆ تەخت بوو ئیتر کوردی یانی کردەوە....

بەکورتی هەر لایە بەجیا هەوڵی‌داوەو هیچ لایەک پێوەندی‌یەکی گورج و گۆڵی لەگەڵ لاکانی‌تردا نەبووە کەبەداخەوە ئەو هەڵوێستە هێشتا هەرماوەو تۆ بڵێی ڕۆژێک بێ ئەو پەردە بدڕێنرێت و بە هەمووان ڕێکخراوێکی سیاسی کە بتوانێت نەخشەی دوا ڕۆژی هەموو کوردستان دەست نیشان بکا دروست بکرێ ؟

- کۆتایی بەرگی یەکەم -

دوباره بە نوای لا تقنطوا ... نابێ مأیوس بین
إنّ اللّە معنا : باقی تەنهای مسرو ریەتی دینو
دنیا و آخرتتانە ئەکەم

بو مقامی برزی خلیفەی پیری روشن ضمیر
جنابی سید عبدالقادر جەنەت دەرە

لە دوای بیانی اخلاصیات کمترینی صبارکتانم وەرگرت
خوێندمەوە بوە سببی بە زیادی نوری چاوم
احوالت پرسیبوو وابی لە داریکی وە لطفیتی واله…
بەکرمی حق وە چاوەری هاتنەوەی طلبی دوعای…
ئەکەین و ثانیاً بە واسطەی دروێشیش کریەوە جوتی گور…
وجوتی دستکیشتانا ناردبو پیم گەیشت چاوی کورەکان…
ئەکەم اظهار رضا تأسفتان فرمولو لە بعضی ریگەوە…
بلیم چی بیت :

یا رب سنادی ملکی زدستی چومەلی
دادی بە بختی نی مەردی نی زنی
از کس دشی روزگار نیدە معلوم شد
پیشی تو چە دە فنری چە شمشیر زنی

١٩٤١/١٢/٢١

نامەیەکی شێخ مەحمود کە لە ١٩٤١/١٢/٢١دا دوای گەرانەوەی
لە بەغدا پاش هەرای رەشید عالی بۆ سەید عبدالقادر جەنەتدەرە بە کوردی
نووسیویەتی و بە چوار خشتەیەکی فارسی کۆتایی پێهێناوە وەکو لە باسی ژیانی
شێخ مەحمودا لێیدواین.

حضور بندگان محترم السید عبدالقادر بن یادگاری حضرت پیری روشن ضمیر
حضرت کاک احمد

این ازعرض اخلاص و ارادہ زودمندی لطف نامهٔ مبارکتان رسید زیارت
نمودم اظهاری گله از تکالیفی نمودن نه منتفی و نبوده حاشا درحین مراسله
به اولیای امور بریطانیای عظمی مراجعت شده وعده گرفتم که
ایشان قصور از بندگی ننمایند قربان بحسب حقوق دول و معاهدهٔ
بین دولتین اولیای امور بریطانیا بالفعل دست تصرف به امورات حکومت
علیهٔ ایران نمی برند امر سفارت از طهران و [illegible] و ادبحکومت
با رسیان التماس بفرمایید دولت عظمی برای شخص یا عمرو و زید
معاهدهٔ دولی پریشان نمی نمایند —. دیگر حضرت نجیب صفات
تان مسلکی شیخ التماس برای فقرا و ترتیب دادن تکیه و شکر
حضرت باری جل و علی کاری دیگر ندارند بی شک اولیای امور
بنا بخاطری مسلک هیچ نوع بد معامله نفرمایند بلکه تقدیر فرمایند
لطف و شیخ حسین؟ و شیخ محمد سعید دست بوسی مخصوص عرض...

و نوری چشمان شیخ بهاالدین و ملا کریم و حسام الدین و محی الدین
و علاالدین دیده بوسانم و برادرزاده کذا دیگر همه را بحضرت مقدس
سپردم با فائق احترام

مخلصتان

محمود

٢٤/٥/١٩٤٢

لاحقه فدای حضرت تان شیخ علی
دامن بوسی مخصوص
عرض دست

**نامەیەکی شێخ مەحمود کە بە فارسی لە مێژووی ١٩٤٢/٥/٢٤ دا لە دایکەلیەوە ناردوویەتی بۆ سەید عبدالقادر جدنەتدەرە وەکو لە باسی ژیانی شێخ مەحمودا لێی دواین.**

مقامی منیع خلیفی پیر روشن ضمیر جنابی لوی شیخ عبدالقادر افندی

جنت دره انشاالله فی جنت عالیه

پس از اهدای اخلاصیت و محبت خوی شاد تندی وازنیت التفات نامه را
به دو دست اعتزاز گرفته و به بهره ی اشتیاق خوانده به هر وقت دعای
دوام و بقای آن ذات از حق تعالی تمنا دارم .. امید دارم هیچ وقت
در حینی حضور داعی را فراموش نفرمایند و بحضوری قلبی از تند
جسمی مخدوم جان میپرسم از رب منان در طلبم بر دوام بطول عمر
بجسم زانی مرتبتی درویشی [illegible] و سرافراز گردید

انشاالله امید دارم بجا بدو رکعت ادای سنت بر سر سجاده ی
مبارک آن مرتبتی درویشی برم — به کوردی عرضت اکم
گوره وید کاکت له بیرکم له دلت نچم پشت بخوا

محمود

عرض اخلاصیت و محبت در خدمت بهاالدین به بها دارم
کاکه بهاالدین اگاهداری عالی با کاک عبدالله رجا دارم

٩٤٧/٤/٣

**نامەیەکی تری شێخ مەحمود کە بە فارسی لە ١٩٤٧/٤/٣دا ناردویەتی بۆ شێخ عبدالقادر ئەفەندی (کە نیاز لە شێخ عبدالقادری جەنەتدەرە بوە وەکو نامەکانی تری) هەر وەکو لە باسی ژیانی شێخ مەحمودا لێی دواین.**

# ناوەڕۆکی بەرگی یەکەم

# ناوەڕۆکی بەرگی یەکەم

# ناوەرۆکی بەرگی یەکەم

# سەرچاوەکان
## - بەرگی یەکەم و دوهەم -


| ناوی کتێب و سەرچاوە | ناوی نووسەر |
| --- | --- |
| ١- بەڵگەنهێنی (دۆکیومێنت)ی ئارشیفەکانی وەزارەتی دەرەو ی بەریتانیا. | |
| ٢- یاداشتەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی (کوردستانی عێراق و شۆرشەکەی شێخ مەحمود). | رەفیق حلمی |
| ٣- یادداشتەکانی ئەحمەد خواجا (چیم دی). | ئەحمەد خواجا |
| ٤- یاداشتەکانی ئەحمە تەقی- خەباتی گەلی کورد- چاپی ساڵی ١٩٧٠. | ئەحمەد تەقی |
| ٥- تێگەشتنی راستی- رۆژنامەنووسی و دۆری رۆشنبیری لە کاتی شێخ مەحمودا. | د.کەمال مەزهەر |
| ٦- دراسات عن تاریخ ایران الحدیث- عربی- چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٥. | د.کەمال مەزهەر |
| ٧- کوردستان لە ساڵەکانی شەری یەکەمی جیهانی‌دا- چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٧. | د.کەمال مەزهەر |
| ٨- صفحات من تاریخ العراق المعاصر- عربی- چاپی بەغدا ١٩٨٧. | د.کەمال مەزهەر |
| ٩- أضواء علی قضایا دولیه في الشرق الاوسط- عەرەبی- چاپی بەغدا ١٩٨٧. | د.کەمال مەزهەر |
| ١٠- چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد- بەشی یەکەم- چاپی بەغدا. ١٩٨٥ | د.کەمال مەزهەر |
| ١١- مێژووی کورد و کوردستان- بەرگی یەکەم- تەرجەمەی مەحمەد عەلی‌عەونی- چاپی دووهەم لە لەندەن ١٩٨٢. | ئەمین زەکی بەگ |
| ١٢-تاریخی سلێمانی، تەرجەمەی محەمەد عەلی عەونی، چاپی ٢ لەندەن ١٩٨٥. | ئەمین زەکی بەگ |
| ١٣- گەنجینەی مەردان- یاداشتی رۆژانی دەربەدەری- ئامادەکردنی مامۆستا محەمەدی ملاکەریم- چاپی بەغدا ١٩٨٥. | زیوەر ئەفەندی |
| ١٤- جوولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان- تەرجەمەی لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی لەلایەن(ف. ئەسەسەرد)چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ لەناو شۆرشدا چاپی١٩٨٥ | د. عەزیز شمزینی |
| ١٥- کوردستان و شۆرشەکەی- کوردۆ لە ئەلمانیەوە کردویتی بە کوردی- چاپی ستۆکهۆلم ساڵی ١٩٨٥. | د. جەمال نەبەز |
| ١٦- کوردستان والاکراد- عربی- چاپی بەیروت ساڵی ١٩٧٠. | د. عبدالرحمن قاسملو |
| ١٧- کوردستان والحرکە التحرریە الکردیە- عربی- چاپی بەیروت ساڵی ١٩٦١. | جەلال تاڵەبانی |

١٨- القضيه الكرديه- ماضي الاكراد وحاضرهم- عربي- چاپی دوهەم بەیروت لە بڵاوكراوەكانی دار النشر كاوه سالی ١٩٨٦. — بلەچ شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان).

١٩- في سبيل كوردستان- عربي- چاپی بەیروت سالی ١٩٨٧ لەبڵاوكراوەكانی منشورات كاوه. — زنار سلوپی (قەدری جمیل بەگ).

٢٠- مقالات- چاپی بەغدا سالی ١٩٥١. — رەفیق حلمی

٢١- یاداشته چاپ نەكراوەكانی شێخ رەئوفی شێخ مەحمود- عەرەبی. — شێخ رەئوف شێخ مەحمود

٢٢- كوردەكانی خوارووی كوردستان لە ماوەی ئینتدابی و ئیحتیلالی بەریتانیا بە ئەلمانی- كاك دیار خضر لە ئەلمانیەوە بۆی‌كردم بە ئینگلیزی. — بەدیعە مەحوی

٢٣- البارزاني والحركه التحرريه- انتفاضات بارزان الاولى. ١٩٣١- ١٩٣٢ چاپخانەی لەناو شۆرشدا. — مەسعود بارزانی

٢٤- شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ- چاپی بەغدا ١٩٨٥. — مستەفا نەریمان

٢٥- دۆخی جیهانی كوردستان- تەرجمەی دوركتۆر كاوس قەفطان. — لازاریف

٢٦- كۆنگرەی قاهره- گۆڤاری نووسەری كورد. ژماره ٢ سالی ١٩٨٥ خولی (٢). — د. ئەحمەد عوسمان

٢٧- شێخ مەحمود و یاداشتەكانی شێخ قادری حەفید- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ. ژماره (١١٣) سالی ١٩٨٧ بەغدا. — جەمیل رۆژبەیانی

٢٨- گفتوگۆیەک لەگەڵ شێخ مەحمودا- گۆڤاری كاروان. بەغدا ژماره٢٦ ١٩٨٤. — حزبوز (نوری ثابت)

٢٩- آ. ثوره العشرين- چاپی بەغدا- عەرەبی. ب. تاريخ العراق السياسي- چاپی بەغدا- عەرەبی. — عبدالرزاق الحسني

٣٠- الاحتلال البريطاني والصحافه العراقيه- چاپی بەغدا ١٩٨٤. — هادی طعمه

٣١- المجلس التأسيسي العراقي- چاپی بەغدا سالی ١٩٧٦. — محمد مظفر الادهمي

٣٢- مەولانا خالید- بەرگی یەكەم- گۆڤاری كۆری زانیاری- چاپی بەغدا سالی ١٩٧٣ بەشی عەرەبیەكەی. — عباس عزاوي

٣٣- تاريخ الكويت السياسي- القسم الاول- الجزء الخامس. چاپی بەیروت ١٩٧٠. — حسين خلف الشيخ خزعل

٣٤- الضحايا الثلاث- عەرەبی- چاپی موسل سالی ١٩٥٢. — عبدالمنعم الغلامي

٣٥- سلێمانی- بەرگی یەكەم- چاپی بەغدا سالی ١٩٨٧. — ئەكرەمی سالحی رەشە

٣٦- حول مسأله الاقطاع بين الاكراد- الطبعه الثانيه- بغداد ١٩٨٤. ترجمه وتعليق الدكتور كمال مظهر. — أ.شامیلوف(عەرەبی‌شامۆ)

٣٧- A- Loyalities Mesopotamia 1914- 1917
چاپی ئینگلیزی- لەندەن ١٩٣٠.
B- Mesopotamia 1917- 1920
چاپی چاپخانەی ئوكسفۆرد سالی ١٩٣١- ئینگلیزی. — ئەرنۆلد ویلسن

٣٨- الاكراد- طبعه بيروت- عربى — باسيل نيكيتين

٣٩- Mesopotamia and Kurdistan in disgiuse.
چاپى لەندەن- ئینگلیزی- سالى ١٩١٢. — میجرسۆن

٤٠- القضيه الكرديه في العشرينات- عەرەبی- چاپی بەیروت سالى ١٩٨٤. — عەزیز الحاج

٤١- Two years in Kurdistan
ئینگلیزی- چاپی لەندەن سالى ١٩٢١. — کاپتن های W.R. Hay

٤٢- Principles of social organization in south Kurdistan.
چاپی ئۆسلۆ- نەرویج- ئینگلیزی- سالى ١٩٥٣. — فردریک بات

٤٣- Iraq from 1900- 1950.
ئینگلیزی چاپی لەندەن سالى ١٩٥٣. — لونگریک

٤٤- Roads Through Kurdistan.
چاپی ئینگلیزی- لەندەن سالى ١٩٥٨. — ارشیبالد. هاملتون

٤٥- کرد. عرب. تورک، تەرجمەی جەرجیس فتح الله. چاپی بەغدا سالى ١٩٧١. — ئەدمونذز

٤٦- محاضره عن المشكله الكرديه- محاضرەی ئەدمۆندز لە جەمعیەتی مەلەکی ئاسیوی لە ٢٥/ ١/١٩٦٦. Asian Royal association لە لەندەن- تەرجمە کراوە بە عەرەبی و بە کراسێک بلأوکراوەتەوە. — ئەدمونذز

٤٧- مسئلەی کوردەکان- گۆڤاری ئینترناشنال أفیزبلادی عبدالقادر حشمت لە دەنگی گێتی سالى ١٩٦٦دا کردویتی بە کوردی و کراوە بە کراسێک. — و.ج. أیلفنستان

٤٨- Narrative of residen-ce in Kurdistan.
چاپی ئینگلیزی- لەندەن ١٨٣٦. — کلودیوس جیمس ریچ

٤٩- کرستان بین الحربین- عەرەبی- چاپی بەیروت سالى ١٩٨٥. — پرۆفیسۆر حەسرەتیان

٥٠- The conflic of tribes and stste in Iraq and Afghanstan
چاپی لەندەن سالى ١٩٨٣- ئینگلیزی. — Martin-Van Bruinessen

٥١- راپۆرتێکی تایبەتی- لە شکلی کراسدا لەناو دوکیومێنتەکانی ئەرشیفی بەریتانیادا ژمارەی دوکیومێنت C.O.730- 28 دەربارەی ماوەی ٤-٧مارتی١٩٢٢ — لیفتنانت. راولنسن

٥٢- مینۆرسکی- چاپی بەغدا. سالى ١٩٨٤- تەرجمەی دوکتۆر مارف خەزنەدار. لە روسیەوە کردویە بە عەرەبی سالى ١٩٨١. — مینۆرسکی

٥٣- گفتوگۆ لەگەڵ شێخ بابا عەلی شێخ مەحمود و عەلی کەمال و تەوفیق وەهبی

٥٤- Special Report: progres of Iraq during the period 1920- 1934.
لەلەندەن لە ١٩٣١دا بلاوکراوەتەوە.راپۆرتێکی حکومەتی بەریتانیایە بۆ عصبەالامم — حکومەتی بەریتانیا

٥٥- فصول من تاريخ العراق القريب. ترجمه جعفر خياط. چاپی بیروت. — مس بێل

٥٦- راپۆرتێکی مێجر نۆئێل دەربارەی چوونی بۆ کوردستانی تورکیا. مێجر نوئێل
دوکیومێنتی ژمارە F.O.371-5068 سالّی ١٩١٩.
٥٧- The Kurds: An Unstable Element in the Gulf. Stephen C. Pelletiere
ئینگلیزی، چاپی سالّی ١٩٨٤.
٥٨- الأصول التأريخية للنفط العراقي عبد الحميد العلوجي وجعفر عباس اللامي
٥٩- عبد المحسن السعدون- دوره في العراق المعاصر. بغداد ١٩٨٨ د.لطفي جعفر فرج الله
٦٠- The making of Modern Iraq. Henry.A. Foster
ئینگلیزی، چاپی لەندەن ١٩٣٦.

★★★★★